

# مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس

## پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان


ماریژان مۆلە – هێرتزفێلد – گیرشمەن

وەرگێڕانی

ئەردەڵان مام وسو دزەیی




٤

# مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس

## (پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان)

## (بەرگی چوارەم)

ماریژان مۆلە ـ هێرتزفێلد ـ گێرشمەن

وەرگێڕانی

ئەردەڵان مام وسو دزەیی

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **مێژووی میسۆپۆتامیا و زاگرۆس** (پێش ماد تا کۆتایی ساسانییەکان)
- نووسینی: ماریژان مۆڵە، هێرتزفێڵد، گێرشمەن
- وەرگێڕانی بۆ فارسی: زەبیحوڵڵا مەنسووری
- وەرگێڕانی: ئەردەڵان مام وسو دزەیی
- پێداچوونەوەی: کامەران تاهیر
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- نرخ: (٢٠.٠٠٠) دینار  بۆ هەر چوار بەرگ
- چاپی یەکەم : ٢٠١٤
- تیراژ:١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٢)ی ساڵی (٢٠١٣) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٥٢)**

**ماڵپەڕ**: www.mukiryani.com
**ئیمەیل**: info@mukiryani.com

**پێرست**

# کوژران و شکستی ئیمپراتۆری ڕۆم

لەو کاتەدا کە ئێمە خۆمان گەیاندە سوارەکانی پاسەوانی تایبەتی ئیمپراتۆری ڕۆم، من هەولّم دەدا بگەمە گۆردینی سێیەم، بینیم پیادە ڕۆمەکان لە ناوچەی دلّی لەشکرەکەیان وەك ئاوێك کە دەکشێتەوە، بەرەودوا دەڕون، تێگەیشتم ئەو پاشەکشەیە بە هۆی گووشاری ئەسپسوار و گالیسکەکانی ئێمەیە، دواتر هەوالّم بۆ هات کە گالیسکە و ئەسپەکانمان لە کەناری ڕووبارەکە بەیەکدی گەیشتوون.

بە هۆی هێرشی گالیسکە و سوارەکانی ئێمە، لە هەردوولای ڕاست و چەپی لەشکری ڕۆمەکان لێکترازان و پرش و بلاّوی چێ ببوو، ڕۆمەکان لەو شوێنانە ریزەکانیان تێکچوو بوو. ئەوانەی لە جەنگ بەشداریان کردووە دەزانن کاتێك ریزی سەربازەکان لێك دەترازێت، ئیدی ناتوانرێت بەرگەی دوژمن بگریت، لەو کاتانەشدا هەر سەربازێك بۆ بەرگری لە خۆی دەجەنگێت، چوونکە نەیارمەتی کەس دەدات، نەکەسیش یارمەتی دەدات. تا ئەوکاتەی سەربازەکان لە ریزەکانیاندا دەجەنگن، ریزی ئەوان وەك دیوارێك لە بەرانبەر دوژمن ڕێگر دەبێت، بەلاّم دوای تێکچوونی ریزەکان و پەرش و بلاّوبوونیان لە یەکدی، ئەو دیوارە چیدیکە ناکارێت بەرگەی دوژمن بگرێت.

ڕۆمەکان لە هەردوولای خۆیان بە ریزە تێکچووەکانی خۆیان دەجەنگان، تەنیا لە دلّی لەشکر ریزی تەواویان هەبوو، بەلاّم ئەوانیش لەبەر گووشاری زۆری گالیسکە و ئەسپسوارەکان بەرەو دوا دەکشانەوە، سەربازە پیادەکانیشمان لە دلّی لەشکری ڕۆمدا بەرەو پێشڤە دەچوون.

لە نێوان ئێمە و ئەو سوارانەی گۆردینیان خست بووە نێوان خۆیان، جەنگێکی توند بەرپا ببوو، پاسەوانە سوارە ڕۆمەکان دەیانزانی تا دوایین کەسیان دەکوژین، بۆ ئەوەی گۆردین دیل بکەین ، ئەگەر گالیسکە و سوارەکانمان لە پشتەوە هێرشیان نەکردبایە، ئەوان گۆردینیان دەسپاردە

دەست سەربازە پیادەکانیان تا لە گۆڕەپانی جەنگ بیبەنە دەرەوە، بەڵام ئەوان دەیانزانی کە پشت پیادەکان گیراوە و ناتوانن گۆردین بەرەو پشتەوە ببەن.

سوارەکانی ئێمەش لە دڵی لەشکری رۆمدا نیوە بازنەیەکیان چێ کردبوو، کە من لە نێوەندی بازنەکە بووم، هەردوو لای سوارەکانی گۆردین گیرابوون، ئەوان نەیاندەتوانی نە رێگەی باکور، نە رێگەی باشوور بگرنەبەر، تا ئەو بگەیەننە پیادەکانیان.

ئەو سوارانەی دەورەی ئیمپراتۆریان گرتبوو یەك لە دوای یەك دەکوژران، کاتێك تەنیا چوار کەس لە پاسەوانە تایبەتەکانی گوردین لە دەوری مابوونەوە، من بە دەنگی بەرز و ڕوو لە گۆردین وتم: ئەگەر تۆ خۆت بە دەستەوە بدەی، گیانت دەپارێزرێت و هەڵسوکەوتمان لەگەڵ تۆدا بەرێزەوە دەبێت، لەو دەمەدا گۆردینی سێیەم بە دەستی چەپی گۆیەکی ئاسنینی بەرەو لای من هاویشت و بەر سینگم کەوت، لێ هیچ زیانی پێ نەگەیاندم، چوونکە زرێم لەبەر بوو، گۆردین دوای هەڵدانی ئەو گۆیە ئاسنینە هەوڵیدا هەڵبێت، بەڵام رێگەی هەڵاتنی ئەو لەلایەن سەربازە پیادەکانی خۆی گیرابوو، کە بەرەو دوا دەکشانەوە، من گەیشتمە لای ئەو و شمشێرێکم بۆ لای ئەو راوەشاند، شمشێرەکەم بەر گەردنی ئەو کەوت و قورگی بڕی و ئێسکی ملی تێپەڕبوونی شمشێرەکەمی ڕاگرت، گۆردینی سێیەم لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و خوێنی شادەمارە بڕاوەکەی بەسەر ئەسپەکەیدا ڕژا، بە سوارەکانی خۆمم وت تەرمی ئیمپراتۆری رۆم لە گۆڕەپانی جەنگ نەبەنە دەرێ، سواری ئەسپەکەی بکەنەوە و رای بگرن و کاسکێتەکەی لەسەری نەکەنەوە، بۆ ئەوەی سەربازە پیادە رۆمەکان بیبینن.

وتم ئەوانەی رۆمی دەزانن هاوار بکەن و بە سەربازە رۆمەکان بڵێن کە ئیمپراتورەکەیان کوژراوە، بۆیە بەردەوامبوونی جەنگ چیدیکە سوودی نابێت، بۆیە پێویستە ئێوە خۆتان بەدەستەوە بدەن، تاکو لە مردن رزگارتان دەبێت[١].

---

(١) شاپووری یەکەم لە کەتیبەکانی خۆی لە کەعبەی زەردەشت وەك سەرکەوتوویەکی گەورە دەڵێت: "لە سنووری ئاشوورستان (سوریای ئێستە) لە می زی شە .... قەیسەری رۆم گۆردیانووس کوژرا، سوپای رۆمەکان لەبەر یەك هەڵوەشانەوە ..." نووسەری فەرەنسی لە زمانی شاپووری یەکەمەوە دەڵێت: گۆردیانووس بە دەستی ئەو کوژرا، بەڵام لە پەڕتووکە مێژووییەکاندا ئەو بابەتە پشتڕاست نەکراوەتەوە، گوایە لە کاتی جەنگی ساسانییەکان و رۆم، یاخی بوونێك لە لایەن فلیپۆسی فەرماندەی پاسەوانەکانی گۆردین (کە بە فلیپۆسی عارەبان ناسرابوو) بەرپا دەبێت، لەو یاخی بوونەدا گۆردین دەکوژرێت، هەر لەوێ فلیپۆس خۆی بە ئیمپراتۆری رۆم دەناسێنێت و داوای ئاشتی لە شاپووری یەکەم دەکات لە ٢٤٤ زایینی. گۆردیانووس لە ساڵی ٢٤٣ زایینی لە سوریا سوپای شاپووری یەکەمی شکست دابوو. "زەبیحوڵڵا"

بە هۆی کریستیانەکانەوە ئاگەداری باری ناوەخۆیی سەرکردە و ئەفسەرە باڵاکانی رۆم بووم، دەمزانی هەندێکیان لەگەڵ گۆردین پێوەندییان باش نییە، ئەگەر بزانن ئەو کوژراوە، دەست لە جەنگ هەڵدەگرن، ئەوانەش کە پێوەندییان لەگەڵیدا باشە دوای زانینی هەواڵی کوژرانی ئەو سستی دەیانگرێت، چوونکە نازانن لە سەردەمی ئیمپراتۆری جێنشینی ئەو بارودۆخ چۆن دەبێت و ئایا پلە و پایەیان دەپارێزرێت یاخۆ نا؟.

جگە لەو دوو بابەتەش، زانینی هەواڵی کوژرانی ئیمپراتۆر کاریگەریی نەرێنی دەکاتە سەر ورەی هەموویان، بە پێچەوانەشەوە ورەی سەرباز و ئەفسەرەکانی ئێمە بەرز دەکاتەوە.

بۆیە دوای ئەوەی گۆردین کوژرا، هەواڵی کوژرانی ئەوم بۆ گالیسکە جەنگییەکان و سوارەکانم نارد تا بە هەمووانی رابگەیەنن، هەموو ئەفسەر و سەربازەکان بزانن کە بە بەردەوامبوون لەسەر تێکۆشانیان لەو رۆژەدا، سەرکەوتنی جەنگ بۆ ئێمە دەبێت.

دوای تەواوبوونی جەنگ رۆمەکان لۆمەیان کردم کە پیاوێکی بێ چەکم کوشتووە، ئەوکاتەی ئەو بە دەستی من کوژرا، چەکی پێ نەبوو.

لە وەڵامدا وتم دووجاران داوام لێکرد تا خۆی بەدەستەوە بدات، جاری یەکەم پێڵا و جاری دووەم گۆی ئاسنی تێگرتم، ئەوە نیشانەی ئەوە بوو کە ئەو چەکدارە و توانای جەنگی هەیە. جگە لەوە ئەو هەڵات، منیش نەمدەتوانی بهێڵم ئەوم لە کیس بچێت، چوونکە گوردینی سێیەم دەبووایە بکوژرێت یاخۆ دیل ببێت تا جەنگ کۆتایی بێت. ئایا ئەو نەیدەویست من دیل بکات و بمبات بۆ رۆم و لە یادی هەزار ساڵەی دامەزراندنی رۆم، لە سێرکدا من بخاتە بەر تەماشا و گاڵتەجاری خەڵك؟ ئەو بەڵێنی بە رۆمەکان دابوو کە خۆی دێت، من دیل دەکات و دەمباتە رۆم یاخۆ دوای کوشتنم، پێستەکەم دادەماڵێت و پڕ لە کای دەکات و سەرمیان ئەگەر بڕی بێت، دەیخاتەوە سەر جەستەم تا رۆمەکان لە دوای مردنم بە باشی ببینن. بۆیە رۆمەکان مافیان نییە بە هیچ شێوەیەك لۆمەم بکەن، چوونکە ئەو بە سزای خۆی گەیشت.

دیتنی تەرمی گۆردینی سێیەم لەنێو دڵی سوپای رۆم پتر لەوەی من چاوەڕوانی بووم بە سوودی ئێمە شکایەوە، سێ لەگات (واتە سێ فەرماندەی لژیۆن) بە تەواوی سەرباز و ئەفسەرەکانیانەوە خۆیان بەدەستەوەدا، دواتر دوو لەگاتی دیکە لە هەردوو لای راست و چەپی لەشکرەکەیان بە پاشماوەی سەرباز و ئەفسەرەکانیانەوە، خۆیان بەدەستەوەدا و جەنگ لە کاتی رۆژئاوابووندا بە سەرکەوتنی ئێمە کۆتایی هات و ئاهورامەزدا منی بەسەر دوژمنەکانمدا سەرخست.

ئەو رۆژە هەندێ لە سەربازەکانی ئێمە لەلایەن رۆمەکانەوە دیل کرابوون، لە کۆتایی جەنگ ئازاد کران و هاتنەوە نێو لەشکرەکەمان. فەرمانم کرد گاتەکان و ئەفسەرەکان بە گشتیی لە دیلەکانی دیکە جیا بکەنەوە، تا لە شەودا مەترسیی یاخیبوون نەبێت، هەرچەندە ئەو شەوە لەبەرئەوەی هەمووان ماندووبوون مەترسیی یاخیبوون نەدەکرا، دەمزانی کە سەربازە دیلەکان بە بێ هەبوونی لەگات و ئەفسەرەکان واتە فەرماندەکانیان، هیچیان پێ ناکرێت.

ژمارەی کوژراوەکانی ئێمە و رۆمەکان هێندە زۆر بوون کە ئەو شەوە نەماندەتوانی تەرمی کوژراوەکان کۆبکەینەوە، چوونکە وێڕای ماندوویەتیی، لە تاریکی شەودا کۆکردنەوە و هەڵگرتنی تەرمەکان کارێکی سەخت بوو، بە فەرمانی من لە مەیدانی جەنگ ئاگری گەورەیان کردەوە تا تەرمەکان لە هێرشی ئاژەڵە دڕندەکان بپارێزن.

هەرچی گۆردینی سێیەم هەیبوو کەوتە دەست من کە بەشێکی خۆراك بوو و فەرمانم کرد تا لەو خۆراکە بدەنە دیلەکان تا برسی نەمێنن، دوای نان خواردن دیلەکان بخەوێنن تا بزانم لە رۆژانی دواتردا دوا بڕیارم سەبارەت بە ئەوان چ دەبێت.

رۆژی دواتر لە هەمان دەشتی می زی شە مامەوە، چوونکە ناشتنی مردووەکان و کاروباری دیلەکان منی لەوێندەر هێشتەوە.

وتم بە دیلەکانی رۆم بڵێن تا تەرمی کوژراوەکانیان بنێژن، یەکێك لە تەرمەکان کە دەبووایە بنێژرێت، تەرمی گۆردینی سێیەم بوو، بەڵام ئەو لەگاتانەی دیل بوون داوای بینینی منیان کرد تا بابەتێك لەگەڵ مندا باس بکەن.

رێگەمدا تا ئەوان بێن، ئەوان پێیان وتم هاتوون تا مۆڵەتم لێ وەربگرن کە تەرمی گۆردین لەو شوێنە نەنێژرێت و بدرێتەوە ئەوان تا لە رۆم بینێژن، چوونکە ئەو ئیمپراتۆر بووە.

وتم: ئایا دەزانن ئیمپراتۆری ئێوە چ بەڵێنێکی بە رۆمەکان دابوو، بۆچی بۆ ئێرە هات؟.

لەگاتەکان وتیان: ئەوە دەزانین، ئێستە کە خوداوەندکان یارمەتییان دای و سەرکەوتنیان بە تۆ کە پاشای ساسانی بەخشی، بەزەییت بە تەرمی دوژمنەکەتدا بێتەوە و لە ڕزاندنی ئەو خۆت بپارێزە، مۆڵەتمان بدە تا تەرمی ئەو لەلایەن ئێمەوە مۆمیا بکرێت و ببرێتەوە بۆ رۆم و لەوێندەر بنێژرێت.

وتم: من دوێنی دوای کوژرانی ئەو دەمتوانی فەرمان بکەم تا سەری ببڕن و بینێرن بۆ وڵاتەکانی ژێردەستم تا شوێنکەوتووانی من سەری ئیمپراتۆری رۆم ببینن و ببینن ئاهورامەزدا منی بە سەر دوژمندا زاڵ کرد، بەڵام خۆم لەو کارە پاراست، ئێستەش تا ئێوە جیاوازیی نێوان

پاشای ساسانی و ئیمپراتۆری رۆم بزانن، فەرمان دەکەم تا تەرمەکە بدەنە دەست ئێوە بۆ مۆمیایی کردن و ناردنەوەی بۆ رۆم. دوای ئەوەی تەرمی کوژراوەکانتان ناشت، ڕای خۆم سەبارەت بە ئێوە و ئەفسەر و سەربازەکانتان رادەگەیەنم.

ئێمە کوژراوەکانی خۆمان ناشت و دیلە رۆمەکانیش تەرمی کوژراوەکانی خۆیان ناشت، لەگاتەکان کە دیلی ئێمە بوون وەڵامیان نارد، کە ئەوان چیان بەسەر دێت، دەیانەوێت تەرمی گۆردینی سێیەم بگوازنەوە بۆ رۆم تا بنێژرێت یاخۆ دوای سووتاندن، خۆڵەمێشەکەی بنێژن.

ئەوەش یەکێك لە نەریتەکانی رۆمەکان بوو، کە تەرمەکانیان مۆمیایی دەکرد تا لە کاتی گواستنەوە بۆ رۆم تەرمەکە نەڕزێت و دوای ئەوەی لاشە مۆمیا کراوەکە دەگەیشتە رۆم، هەندێکات نەیاندەناشت، بەڵکو دوای سووتاندنی تەرمەکە، خۆڵەمێشەکەیان دەناشت.

بە لەگاتەکانم وت ئەگەر بیانەوێت تەرمی گۆردین کە مۆمیا کراوە ببەنەوە بۆ رۆم، پێویستە پارەیەك بۆ سزای خۆیان بدەن تا ئازاد بکرێن، بە پێچەوانەوە مۆڵەتی رۆیشتنەوە بۆ رۆمیان پێ نادرێت.

لەگاتەکان کە لە وڵاتی خۆیان سەرمایەیان هەبوو، وتیان ئێمە بە رۆم رادەگەیەنین تا سزای ئێمە بدەن، ئێمە ئازاد دەبین و تەرمی گۆردینی سێیەم دەبەینەوە بۆ رۆم.

وتم: بە رۆم رابگەیەنن کە بۆ ئازادی سەربازەکانیان پێویستە بەهای ئەوان بدەن، ئەگەرنا ئەوان ئازاد ناکرێن و لە ئێران دەخرێنە بەرکار. من بۆیە وتم ئیمپراتۆرییەتی ڕۆم پارەکەیان بدات تا دیلەکان ئازاد بن، چوونکە دەمزانی ئەوان توانای پێدانی ئەو پارەیەیان نەبوو.

ئیدی بە لەشکرەکەمەوە بەرەو رۆژئاوا کەوتمە ڕێ، هەندێك لە شارەکانی ئاسیای بچووك و سوریام گرت کە تا ئەوکات بەشێك بوون لە وڵاتانی ئیمپراتۆرییەتی رۆم. تۆ ئەی رێبوار کە ئەو کەتیبەیە دەخوێنییەوە و ناوی شارەکانی تێدا دەبینی، من هەر شارێکم داگیر دەکرد زەوییەکانی دەوروبەریشیم داگیر دەکرد، بەڵام کێشەم لەگەڵ جووتیاران، بازرگانان، پیشەوەران و زانایانی ئاینی نەبوو، هەریەکەیان دەیتوانی سەرگەرمی کاری خۆی بێت و سەرمایەی خۆی هەبێت، بەڵام دەستم دەگرت بەسەر هەموو ئەو سەرمایانەی لە گەنجینەی شارەکە هەبوایە، بۆ ئەوەی نەگاتە گەنجینەی رۆم. هیچ یەکێك لەو شارانە لە بەرانبەرمدا بەرگرییان نەدەکرد، چوونکە هیچیان هێندەیان سەرباز نەبوو، کە توانای بەرگریکردنی منیان هەبێت.

رۆمەکان بۆ ئەوەی لە بەردەوامبوونم لە داگیرکردنی شارەکانی ژێر دەسەڵاتیی ئەوان دەست هەڵبگرم، سێ سیناتۆریان بۆ ئاشتی ناردە لام، کریستیانەکانیش کە دەیانزانی نوێنەرانی رۆم بۆ

گفتوگۆی ئاشتیی هاتوون، داوایان لێ کردم کە لەنێو گفتوگۆکاندا داوا لە رۆمەکان بکەم چیدیی ئازاری ئەو کریستیانانە نەدەن، کە لە رۆم دانیشتوون، بۆ ناشتنی مردووەکانیانیش زەویان پێ ببەخشن.

لە رۆما نەتەنیا کریستیانەکان ئازار دەدران، بگرە بۆ ناشتنی مردووەکانیشیان زەویان پێ نەدەدرا، کریستیانەکان وەك رۆمەکان مردووەکانیان نەدەسووتاند، بگرە دەیاننناشتن. بەپێی ئەو زانیارییانەی من هەمبوو، ئەوان چوونکە زەوییان بۆ ناشتنی مردووەکانیان نەبوو، مردووەکانیان لە دەرەوەی شار لەو قولّەتە گەورانەدا دەناشت کە هەلّیان دەکەندن و ئەو قۆلّتانەیان لە زمانی خۆیاندا بە (کاتا کۆمب) نێو دەبرد.

دوای ئەوەی گفتوگۆم لەگەلّ نوێنەرانی رۆم کرد، ئەوان وتیان ئەو قۆلّتە گەورانە نهێنی نین، بگرە دەولّەت خۆی رێگەی ئەو کارەی پێداون، چوونکە لە دەوروبەری رۆم زەوی نییە تا وەك گۆڕستان لەلایەن کریستیانەکانەوە بەکار بێت، هەروەها نوێنەرانی رۆم وتیان ئەو زەوییانەی کریستیانەکان تیایاندا قۆلّت هەلّدەکەنن بۆ ئەوەی مردووەکانیان تێیدا بنێژن، لە زەوییە ئاهەکی و نەرمەکانن، هەلّکەندن تێیاندا زۆر ئاسانە، بەلّام دوای ئەوەی هەلّکەندن تەواو دەبێت، مردووەکان دەنێژرێن، چوونکە با لە زەوی دەدات ئەو زەوییانە وەك بەرد رەق دەبن.(٢)

نوێنەرانی رۆم داوایان لە من کرد تا لەگات و ئەفسەر و سەربازە دیلەکانی رۆم ئازاد بکەم و شارەکانی ئاسیای بچووك بەجێ بهێلّم و بۆ سنوورەکانی پێش جەنگی می زی شە بگەڕێمەوە، کوژرانی گۆردین و رێککەوتنی ئاشتی یەکجارەکییش لە نێوان ساسانی و رۆمەکان ببەستم، ئەوەی تا ئەوکات لە سەرمایەی گوازراوە و نەگوازراوەی رۆم داگیرم کردووە، بۆیان بگەڕێنمەوە.

وتم لە نێوان من و ئیمپراتۆری رۆم ئاشتی هەبوو، من دەستپێشخەر نەبووم لە جەنگدا، بگرە رۆم جەنگی بەرپاکرد و ئاشتی تێکدا، گۆردینی سێیەم هات بۆ جەنگی من. کەواتە

---

(٢) کاتاکۆمب بۆیە لە زەوی ئاهەکیدا هەلّدەکەندرا، چونکە دوای ئەوەی هەوای بەر دەکەوت رەق دەبوو، ئێستەش دوای دوو هەزار سالّ ئەوان ئەوەندە بێ کێماسیی ماون کە هەر کەسێك بیانبینێت واب یردەکاتەوە کە دوێنی هەلّکەندراون. بە پێچەوانەی ئەوەی هەندێ کەس بیردەکەنەوە، کاتا کۆمب شوێنی کۆبوونەوەی کریستییانەکان بۆ بەجێهێنانی ئەرکە ئایینییەکانیان نەبووە، بگرە شوێنی ناشتنی مردووەکانیان بووە. "زەبیحولّلا"

تاوانی تێکدانی ئاشتی لە ئەستۆی ڕۆمە، نەك من، ئێستەش کە ڕۆم ئاشتی لە من دەوێت، پێویستە مەرجی من پەسەند بکات.

من هەندێك لەو شارانەی داگیرم کردوون بۆ ڕۆمی دەگەڕێنمەوە، بەڵام هەندێك لەو شارانە ناگەڕێمەوە، چوونکە دەبێت هەندێك لەو شارانەم لەبەردەستدا بێت، بۆ ئەوەی ببنە گەرەنتی پاراستنی ئاشتی لەلایەن ڕۆمەوە.

ئەو دیلانەی لای منن، پێویستە لەلایەن ڕۆمەوە بکڕدرێنەوە، ئەگەر نەیان کڕنەوە، من ئەوان دەخەمە ناو کارکردن و مووچەیەك کە هاوشان بێت لەگەڵ کار یاخۆ ئەو پیشەیەی کە هەریەکە لەوان دەیزانن بە ئەوان دەدرێت.

هەموو سەرمایەی گوازراوەی دەوڵەتی ڕۆم کە تا ئێستە بەردەستی من کەوتووە، ناگەڕێنمەوە، سەرمایەی نەگوازراوەی ڕۆمیش لەو شارانەی دەبنە هی من، بۆ من دەمێنێتەوە و نایان گەڕێنمەوە. جگە لە پارەی کڕینەوەی دیلە جەنگییەکانیش، پێویستە ڕۆم دووهەزار تالآن زێڕ بداتە من لە بەرانبەر ئەو زیانانەی جەنگ بە منی گەیاندووە.

ئەو سیناتۆرانەی بۆ گفتوگۆ هاتبوونە لای من، دەسەڵاتیی تەواویان هەبوو، ئەنجومەنی سینای ڕۆم و ئیمپراتۆری تازە، دەسەڵاتیی تەواوی پێدابوون. ئەوان ماوەی پێنج ڕۆژ لە تیسفون لەگەڵ من لە دانووستاندان دا بوون، بەڵام وتیان ڕۆم لە توانایدا نییە دووهەزار تالآن زێڕ بدات، چوونکە ئەو ڕێژەیە لە زێڕ لە گەنجینەی ڕۆمدا نییە.

وتم ئەگەر ڕۆم توانای نەبێت بە یەکجار ئەو زێڕە بدات، من رازیم بە قۆناخ ئەو زێڕە بدات.

سیناتۆرەکان وتیان ڕۆم، تەنانەت بە قۆناخیش ناتوانێت ئەو بڕە زێڕە بدات، پێویستە ئەوان بۆ کڕینەوەی سەربازەکانیش پارە بدەن، داوایان لێ کردم لە ڕێژەی ئەو زێڕە کەم بکەمەوە کە وەك قەرەبوو وەری دەگرێت. من ڕەزامەندیم نواند کە ڕۆم هەزار تالآن زێڕ بە دوو قۆناخ بداتە من، بەو شێوەیە دانووستاندنەکان بەپێی ئەو مەرجانە بە کۆتاهاتن کە من دیاریم کردبوون، تەنیا لەبارەی ئەو زیانەی ئەوان دەبووایە بە منی بدەنەوە، بۆم کەمکردنەوە.

لە بەهاری ساڵی (٢٤٥ ز) ڕێککەوتننامەی ئاشتی مۆر کرا، دیلەکانی جەنگ پێشتر ئازاد کران، چوونکە ڕۆمەکان بەهاکەیان دابوون.

لە ڕێککەوتننامەکەدا نووسرا بوو، کە لەمەودوا ئاشتی لە نێوان ڕۆم و پاشای ساسانی هەمیشەیی دەبێت، بەڵام بەو شێوەیە نەبوو، دیسان ئیمپراتۆری ڕۆم هات بۆ جەنگی من.

ئەی ئەو کەسەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنییەوە، بزانە کە من خودان وڵاتێکی ئاوەدانم، داواکارم لە ئاهورامەزدا ئەو ئاوەدانییە لە سەردەمی جێنشینەکانمدا بپارێزێت.

یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئاوەدانی وڵاتەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە وڵاتی مندا هەر کەسێك سەرگەرمی ئەنجامدانی کاروباری خۆیەتی، هیچ کەس دەست ناخاتە کارێك کە پێوەندیی بەو نەبێت. جووتیاران سەرگەرمی کشتوکاڵن، پیشەوەران لەسەر پیشەکانیانن و مامۆستایان وانە دەڵێنەوە، من ڕێگە نادەم جووتیارێك بچێتە قوتابخانە تا ببێتە مامۆستا و دەست بخاتە ناو کارێك کە پێوەندیی بەوەوە نییە.

لە وڵاتی من چینەکان لە یەك جودان، خوێندن تایبەتە بە شازادەکان، زاناکانی ئاینی و مامۆستایان، ڕێگە بە چینەکانی دیکە نادەن ببنە خوێندەوار، بۆ ئەوان گرینگ نییە و زیانی بۆ وڵاتەکەم هەیە، چوونکە دەبێتە هۆکاری ئەوەی جووتیار و پیشەوەر و جەنگاوەرەکان دەست بخەنە ناو کاروبارەکانی شازادە و زانایانی ئاین و مامۆستایان، ئەمەش وا دەکات لە کاری خۆیان دوور بکەونەوە، کاتێك چینێك لە خەڵك لە کاری خۆی دوور دەکەوێتەوە و کاری خەڵکی دیکە ئەنجام دەدات، ئاوەدانی و پێشکەوتنی وڵات دەوەستێت.[٣]

من لە سەرەتاوە هۆگری مانی بووم، بەڵام سێ بابەت ئەویان لەبەر چاوم خست، یەکێك لەو سێ بابەتانە بریتی بوو لەوەی ئەو جەختی دەکردەوە جووتیار و پیشەوەر و جەنگاوەران پێویستە وەك شازادە و زانایان و مامۆستایان خوێندەوار بن، لە کاتێکدا من دەمزانی خوێندەواربوونی هەموو خەڵك، وڵات لە پێشکەوتن و ئاوەدانی رادەگرێت و خەڵك لە کارکردن دەوەستێنێت.

دوو بابەتەکانی دیکە کە وتەی مانی بوون، بوونە مایەی ئەوەی لەبەر چاوم بکەوێت ئەوەبوو کە ئەو دەیوت: هۆکاری بەردەوامبوونی جیهان هێزی راکێشان و پاڵدانەوەیە، هەموو شتێك لە دنیا لەلایەن یەکدییەوە رادەکێشرێن، هاوکات پاڵدەدرێتەوە. ئەو وتەیە وێڕای پێچەوانەبوونی لەگەڵ باوەڕی مەزداپەرەستی من و شوێنکەوتووانم، بە پێچەوانەی ئەقڵیش بوو، چۆن ئەقڵ ئەوە پەسەند دەکات کە دوو شت یەکدیی کێش بکەن و هاوکات یەکدیی پاڵ بدەنەوە.

---

(٣) لە سەردەمی هەخامەنشییەکان خوێندن بۆ هەموو خەڵك بوو، بەڵام لە سەردەمی ساسانییەکان خوێندن بۆ هەندێك لە چینەکان بە تاوان دادەنرا و سزای لەسەر بوو. "زەبیحوڵڵا"

بابەتی دوایین کە مانی دەیوت و بە تەواوەتی پێچەوانەی ئەقڵ بوو، ئەوەبوو کە جیهان کە لە خۆڵ و ئاوە بە دەورەی هەتاودا دەسوڕێتەوە، ئەوە هەتاو نییە کە بە دەورەی زەویدا دەسووڕێتەوە. کاتێك مانی ئەو وتەیەی باس کرد، گومانم لە راستبوونی کرد، چوونکە کەسێکی ئاقڵ کە بە چاوەکانی خۆی دەبینێت هەتاو بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە، ناڵێت زەوی بە دەوری هەتاودا دەسووڕێتەوە.

لەوی رۆژێ کە لە جیاتی باوکم بوومەتە پاشا، بۆ ئاوەدانی دەڤەرە جیاکانی سنووری پاشایەتییەکەم بەردەوام کۆششم کردووە، هەر ساڵێك دە کەناڵی گەورەی ئاو گەیاندنم بۆ جووتیاران لە پارەی خۆم هەڵدەکەندووە، خاوەن زەوییەکانیشم هانداوە کە بۆ جووتیاران کەناڵ هەڵکەنن، بەو شێوەیە خۆشیان پتر سوودمەند دەبن.

من ڕووەکە سوودمەندەکانم لە سندی هیندستانەوە هێنا بۆ سنووری پاشایەتییەکەم، بە جووتیارانم وت ئەو ڕووەکانە لە شوێنە گەرمەکانی ناوچەکانی گدرۆزیا (بلوچستان) و کارمانیا (کرمان) و پارس شووشیا (خوزستان) و میزۆپۆتامیا بچێنن، ئێستە ئەو ڕووەکانە وەك ڕووەکەکانی سندیان لێهاتووە، جووتیاران و شوێنکەوتووانی من لێیان سوودمەندن و میوەی بەتامیان دەست دەکەوێت.

ئەوەی من بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیی پاشایەتییەکەم ئەنجامم داوە، تەنیا بە هەڵکەندنی کەناڵەکان و چاندنی ڕووەکی تازە کۆتایی نایەت، شاری نوێم لە گدرۆزیا و فارس و ئاترۆپاتێن و پارتیا بینا کردووە، ئەو شارانەم لەو شوێنانە دروست کردووە کە بۆ کشتووکاڵ زۆر باشن.

من وێڕای ئەوەی سەرەنجم دەدا کە شارەکان لەو شوێنانە بن کە ئاوی زۆری لێ بێت، وردبینیم دەکرد کە شوێنی شارەکە هەوای خۆش بێت، شوێنێك بێت کە خەڵکی شارەکە لە مێشوولە، مەگەس، مار، دووپشك و...پارێزراو بن و نەخۆش نەکەون.

شارە نوێیەکانم بۆ جوانی دروست نەدەکرد، بگرە بۆ ئەوەم بوو لە هەر شارێك ژمارەیەك لە شوێنکەوتووانم نیشتەجێ بکەم و سەرگەرمی کشتووکاڵ بن، لە دەوروبەری شارەکان لەوەڕگە و باخ دروست بکەن، لەنێو لەوەڕگەکان مانگا بەخێو بکەن کە لە بەخششەکانی ئاهورامەزدایە بۆ مرۆڤەکان، جگە لە گا، مەڕیش پەروەردە بکەن تا سوود لە گۆشت و پێست و خورییەکەی وەربگرن.

له هەریەکە لە شارەکاندا خانووەکان بە شێوەیەك دروست دەکران کە بۆ جووتیاران بە سوود بێت و ئەوان بتوانن بە ئاسانی تیایاندا بژین، لە وەرزی زستاندا گا و مەڕ و باڵندە خۆماڵییەکان بەخێو بکەن. هەندێ لە شارەکانم بە ناوی باوکم ناونا، هەندێکیشیان بە ناوی خۆم.

پێنج ساڵ دوای ئەو رێککەوتننامە ئاشتییەی لە نێوان ئێمە و رۆم بەسترا، شەڕ ئەنگێزی رۆم دەستی پێکرد، پاشای ئەرمەنستانیان هاندا تا هەڵسووکەوتی خراپ لەگەڵ ئەو شوێنکەوتووانەی مندا بنوێنێت کە لەو ولاتەدا دەژیان.

کاتێك هەواڵی هەڵسوکەوتی خراپی پاشای ئەرمەنم بەرانبەر بە شوێنکەوتووەکانم بیست، ئەز لە شاری شووش بووم، نامەیەکم بۆ پاشای ئەرمەنستان نووسی، لە نامەکەدا بۆم نووسی کە فریوی رۆمەکان نەخوات، بۆ ئەوەی ئەو پێوەندییە دۆستانەی لە نێوان ئێمە و ئەواندا هەیە خراپ نەبێت.

لە نامەکەدا پێموت ئەگەر ئەو پشتیوانی رۆم دەکات، ناتوانێت متمانە بە بەڵێنی ئەوان بکات، رۆم هەمان ئەو ولاتەیە کە پێش پێنج ساڵ رێککەوتنامەی ئاشتیی لەگەڵ مندا مۆر کردووە، ئێستە هەندێ ئاماژە دیارن کە نیشانی دەدەن دیسان شەڕیان دەوێت، چوونکە ئەگەر کەسێك بە دووی جەنگ نەگەڕێت، بیانۆ ناهێنێتەوە و خەڵکی دیکەش لە دژی ئەو لایەنە هان نادات کە ئاشتیی لەگەڵدا کردووە، بەلام نامەکەم کاریگەریی لەسەر پاشای ئەرمەن نەبوو، ئەو بەردەوام بوو لەسەر هەڵسووکەوتی خراپی خۆی بەرانبەر بە شوێنکەوتوانی من، تا من ناچار بکات بۆ پاڵپشتی لە شوێنکەوتووەکانم، بیان گوازمەوە بۆ سنووری پاشایەتیم، یاخۆ بەرەو ئەرمەنستان بچم، بەلام هاتنی نەخۆشی تاعوونی رەش لە شاری شووش رێگربوو لەوەی من بتوانم لەشکر بەرەو ئەرمەنستان ببەم، چوونکە تاعوون سەربازەکانی لەشکرەکەمی دەکوشت، ناچار فەرمانم کرد لە شووش بەرەو ناوچە شاخاوییەکان بڕۆن، تا نەخۆشی تاعوون کۆتایی دێت، لەو ناوچانە بمێننەوە.

پزیشکەکان پێیان وتم رەنگە دووچاری تاعوون ببم، بۆیە پێویستە لە شووش بڕۆم، منیش چووم بۆ شاری (گیی) لە کەناری (زندە ڕوود)، ماوەیەك لەوێ مامەوە، کاتێك ویستم لەو شارە بڕۆم، هەواڵیان پێدام کە دەستەیەکی گەورە لە خێڵەکانی باکوری رۆم هێرشیان کردووە بۆ ئاسیای بچووك، دوای ئەو هێرشە ئێستە لە ئاترۆپاتێن نێزیك دەبنەوە، ئەوان خەڵکانێکن نیمچە دڕندە و پێستی ئاژەلانیان لەبەر دەکرد و گۆشتی خاویان دەخوارد، بە (گۆت) ناسرا بوون.

من دوای ئەوەی زانیم ئەو خێلانە لە باکوری رۆم دەژین، وام بیرکردەوە ئیمپراتۆری رۆم هەروەك چۆن پاشای ئەرمەنستانی لە دژی من هانداوە، بە هەمان شێوەش ئەوانی هانداوە تا هێرش بکەنە سەر من، بەلام دواتر بۆم دەرکەوت وا نییە، ئەوان بێ پرسی ئیمپراتۆر و لە

خۆیانەوە هێرشیان کردووە تا خێڵەکانی دیکە تالآن بکەن، ئەوان لە گەرووی بسفۆر پەڕینەوە و چوونە نێو ئاسیای بچووك، لەسەر ڕێگەیاندا هەرچی بەردەستیان کەوت، تالآیان کرد، هەموو ئەوانەشیان کوشت کە بەرگرییان دەکرد.

گۆتەکان لە جەنگدا کاسکێتی گەورەیان دەکردە سەر، گەورەیی هەموویان وەك یەك بوو، ئەوەی لە دوورەوە ئەو کاسکێتانەی دەبینی، دەیزانی ئەوانەی کاسکێتەکانیان لەسەر کردووە، مرۆڤن. پیاوانی گۆت بۆ هەر شوێنێك چووبان ژنەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد، بەڵام داوایان لێ نەدەکردن کە خواردنیان بۆ ئامادە بکەن، چوونکە گۆشتیان بە خاوی دەخوارد، ژنەکانیشیان هێندە بەهێز بوون کە بەبێ یارمەتی مامان، منداڵیان دەبوو. ئەو ژنانە هەرگیز بەشداری جەنگ نەدەبوون، لە کاتی جەنگدا لە دواوە دەمانەوە، ئەگەر هاوسەریان لە جەنگدا کوژرابووایە، لە مەیدانی جەنگیان دەهێنایە دەرەوە تا بینێژن، ئەگەر لە کاتی بردنی تەرمەکە ڕێگەیان لێ گرتبان، هێندە دەجەنگان تا دەکوژران.

هەرچەندە گۆتەکان لە ناوچەیەك دەژیان کە بەردەوام بارانی لێ دەباری، بەڵام خانوویان دروست نەدەکرد، تەواوی تەمەنیان لەنێو خێوەتدا دەژیان، چوونکە بەهای خانوویان نەدەزانی، بۆیە دەگەیشتنە هەر شوێنێك، خانووەکانیان دەڕووخاند. ئەوان لە جەنگدا بوونەوەرێك بوون کە لە خێو دەچوون، وەك بەراز سەریان شۆڕ دەکرد و دەڕۆیشتنە پێش، نەدەتوانرا ڕێگەیان لێ بگیرێت تا نەکوژرابوان یاخۆ بە شێوەیەك بریندار‌بووانەیە کە توانای ڕۆیشتنیان نەمابووایە، بەڵام ئەو پیاوە نیمچە دڕندانە زۆر سادە بوون، کاتێك گەیشتنە وڵاتی (پافلاکۆنی) کە لە کۆتایی ڕووباری هالیس (قزل ئایەرماق کە لە تورکیایە)، گەنجەکانی ئەو ناوچەیە سوودیان لە سادەیی ئەوان وەرگرت، بە هۆی ئەوەی دەیانزانی ئەوان کەسانی سادەن، چەند دانەیەك زەیتونیان پێدەدان، لە بەرانبەردا خەنجەرەکانیان لێ دەستاندن.

مانەوەی من لە گێی (ئەسفەهان) درێژەی کێشا، لەوێوە فەرمانم بۆ فەرمانڕەواکانی ویلایەتەکان نارد تا لەشکر بنێرن، ورمێشم بۆ شوێنی کۆبوونەوەی لەشکر دەست نیشان کرد، دەمەویست لەوێوە بۆ پێشگرتنی گۆتەکان بچم.

پێش ئەوەی بەرەو چیچەست بچم، هەواڵم پێگەیشت کە لە (کیلیکی) سککەی ئەردەشێری باوکم و سککەی شاپووری، هیچیان مامەڵەیان پێ ناکرێت، پارەی ئەو سنوورە هەمان (ناریۆس) پارەی ڕۆمە کە لە زیو دروستکراوە و دەکاتە ڕۆژانەی وەستایەکی شارەزا. ساتراپەکانی من بۆیان هەبوو کە سککە لێ بدەن، بەڵام دەبووایە وێنەی من لە سەری

هەبووایە. ئەو سککانەی ساتراپی من لە وڵاتی کیلیکی دروستی دەکردن، لەلایەن خەڵکەوە وەرنەدەگیرا، ئەوان سککەی رۆمیان وەردەگرت.

لە هەر ویلایەتێك ساتراپ بەرپرس بوو لە لێدانی سککە، ساتراپی من لە کیلیکی ناوی (هۆرێندۆس) بوو، بێ ئاگەداری ئەو پشکنەرێکی نهێنیم دیاری کرد و پێم گوت لێکۆڵینەوە بکات لە ئەوەی بۆچی خەڵك سککەی ئەردەشێری باوکم کە لە رابردوو ماوەتەوە و سککەی منیش وەرناگرن، تەنیا سککەی رۆمیان دەوێت.

نەریتی پاشاکان لە کۆن وابوو کە دوای مردنی هەر پاشایەك، سککە بە ناوی پاشای تازە لێ دەدرا، من بۆ رێزگرتن لە ئەردەشێری بابم کە ئاهورامەزدای دەپەرست، فەرمانم کرد تا ماوەی دە ساڵ لە دوای پاشایەتیی من، سککەی ئەو بەردەوام بێت، چوونکە ئەو دە ساڵە هێشتا تەواو نەببوو، بۆیە لەو شوێنانەی پارەمان لێ دەدا، لەنێویشیاندا لە کیلیکی سککەی باوکم بەردەوام بوو لە دروستکردن و لێدران.

پێش رۆیشتنی پشکنەرەکە، فەرمانێکم پێدا کە برێتی بوو لە بانگهێشتی هۆرێندۆسی ساتراپی کیلیکی و پێم وت بە شێوەیەك بچێتە نێو کیلیکی کە کەس نەیناسێت، هەروەها بە شێوەیەك لێکۆڵینەوە لەو سککانە بکات کە لە کارگەی سککە لێدان دێنە دەرەوە کە کەس نەزانێت ئەو پشکنەرە، ئەگەر بۆی دەرکەوت کە وەرنەگرتنی پارەکە لەلایەن خەڵکەوە بە هۆی ساختە بوونییەتی، پێویستە بچێتە لای هۆرێندۆس و فەرمانی منی پێ بدات. بە پشکنەرەکەم وت من لە نامەکەمدا ئەوم بانگهێشت کردووە و تۆم لە جیاتی ئەو دیار کردووە تا بە کازێی دەوڵەت ڕابگەی، پێویستە بزانی کە دەبێت نموونەی سککە ساختەکانی کیلیکیش بۆ من رەوان بکەی.

پشکنەر رۆیشت، دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت هۆکاری وەرنەگرتنی سککەکان لەلایەن خەڵکەوە، هەمان ساختەبوونیانە، پشکنەرەکەی من دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت ئەوە هۆکارەکەیەتی، لە کارگەی سککە لێدانەکانەوە ژمارەیەکی زۆر لە سککە ساختەکانی بۆ من رەوان کردن، دواتر چوو بۆ لای هۆرێندۆس و فەرمانی منی بەو گەیاند، هۆرێندۆس لە ترسیی من هەڵات و پەنای بردە بەر رۆم، چوونکە دەیزانی دوای ئەوەی تاوان و ناپاکییەکەی دەسەلمێت، دەکەوێتە بەر چ سزایەك، منیش دوای ئەو ڕووداوە لە هەموو کارگەکانی سککە لێدانی تەواوی وڵاتەکانی ژێر پاشایەتیم، وەستاکانی ئەو بوارەم کردە بەرپرس لە عەیاردانی پارەکان، ئەوان لە هەموو ویلایەتەکان خۆیان راستەوخۆ بەرپرسی ئەو کارە بوون و بەرفەرمانی

ساتراپ نەدەبوون، بەڵام دەبووایە بۆ ڕێژەی ئەو پارەیەی پێویست بوو دروستی بکەن، ساتراپ فەرمانی دەدا، دوای ئەو بەرواره لە هیچ یەکێك لە وڵاتەکانی ژێردەستی من، هیچ ساتراپێك نەیتوانی پارەی ساختە بخاتە بازاڕ و پارەی من لە برەو بخات.

دوای تێپەڕبوونی پازده ڕۆژ لە بەهاری ساڵی (٢٥٢ ز) بە لەشکرێکی بەهێز کە لە وڵاتەکانی ژێر دەستم هاتبوون و لە چیچەست دامەزرابوون، کەوتمەڕێ، هەندێ لە کریستیانەکانیش سەربازی من بوون.

من ڕێگەی دیاربەکرم گرتەبەر، چوونکە دەمزانی گۆتەکان خۆیان گەیاندووەتە ئەو شارە و دەیانەوێت لەوێوە بچنە نێو ئاترۆپاتێن.

دوو ڕۆژ دوای ئەوەی کەوتمەڕێ خەونێکم بینی کە بوو بە مایەی سەرسووڕمانم، لە خەودا بینیم ژمارەیەکی زۆر لە عارەبان هێرشیان کردەسەر تیسفونی پایتەختی من و سەربازەکانم ناتوانن پێشیان پێ بگرن، جەنگ لە نێوان سەربازەکانم و عارەبان ماوەیەکی زۆری خایاند، ماوەی سی ڕۆژی پێچوو، ئەوان توانیان بەشی ڕۆژئاوای پایتەختی من داگیر بکەن کە لە کەناری ڕۆژئاوای دیجلە بوو، دواتر بەشی ڕۆژهەڵاتی پایتەختەکەمیان داگیرکرد کە لە ڕۆژهەڵاتی ڕووبارەکە بوو، هاتنە نێو کۆشکەکەم و هەرچی لێی بوو بردیان، سێ کچەکانم بە ناوی (مەرز، شەهر و کەیهان) بە دیل گیران، هەرچەندە هاوارم دەکرد دەنگم نەدەگەیشتە سەربازەکانم تا ڕێگە لە عارەبان بگرن و نەهێڵن کچەکانم ببەن، بۆ خۆم نەمدەتوانی لە شوێنەکەم بجولێم و بڕۆم کچەکانم لە ئەوان وەربگرمەوە.

لەو خەونە ترسناکە بەئاگا هاتم، ناوەکانی (مەرز، شەهر و کەیهانم) دەوتەوە، دەمزانی من کچانێکم نییە بەو ناوانە، ئەو دەمەی لە ماڵ هاتمە دەرێ، چاوم لە ئەستێرەکان کرد تا بزانم چ کاتێکی شەوە. بەرەبەیان زۆر نێزیك نەبوو، تا بەئاگاهاتنی سەربازەکانم، ماوەیەکمان کات هەبوو. تێگەیشتم کە ئەو خەونە دوور و درێژ و سێ شەو و ڕۆژم، لە ماوەیەکی کورت، لەوانەیە لە دەمژمێرێکدا بینی بێت.

ئەو خەونە بە ڕادەیەك دووچاری سەرسووڕمانی کردبووم کە دوای ئەوەی لە خەو ڕابووم، تا ئەوکاتەی سەربازەکان بە ئاگا هاتن، دووان لە ئەفسەرەکانم گازکرد کە لە خەوگرتنەوە شارەزا بوون، خەونەکەمم بۆ گێڕانەوە و وتم من هیچ کچێکم بە ناوەکانی (مەرز، کەیهان و شەهر) نییە.

جگە لەوەش عارەبان لەوە بێ تواناترن کە بتوانن هێرش بکەنە سەر پایتەختی من و بگەنە ناو کۆشکەکەم، ئەو کچانەی کە من نیمن بە دیل بگرن و بیانبەن.

یەکێك لە خەوگرەوەکان وتی: ئەی خەسرەو، تۆ لە ئێستەدا هیچ کچێکت بەو ناوانە نییە، بەڵام لەوانەیە لە داهاتوو ببیە خاوەنی کچانێك بەو ناوانە.

وتم: ئەگەر لەمەودوا ببمە خاوەنی هەندێ منداڵی کچ، ناوی وەك مەرز و شەهر و کەیهانییان بۆ دانانێم و ناوی دیکەیان لێ دەنێم.

خەوگرەوەکەی دیکە وتی: ئەی خەسرەو تۆ بە یارمەتی ئاهورامەزدا لەوە گەورەتر و بەهێزتری کە دەستەیەك عارەبان بتوانن هێرش بکەنەسەر پایتەختی تۆ و کۆشکەکەت داگیر بکەن، ئەوەی هەتە تالآنی بکەن و کچەکانت دیل بکەن.

وتم: گومانم نییە کە عارەبان هاتنە ناو پایتەختی من و جەنگ بۆ ماوەی سی رۆژ و لەوانەشە پتری خایاند، ئەوان سەرەتا لای رۆژئاوای شار، دواتریش رۆژهەڵاتیان داگیرکرد.

خەوگرەوەیەکیان وتی: ئەی خەسرەو هەندێ لەو خەوانانەی مرۆڤ دەیانبینێت هی ئەو نین، بگرە هی باپیران یاخۆ نەوەکانی ئەون، ئایا لە نێوان باپیرانی تۆ کەسێك هەیە کە ئەو ڕووداوانەی بەسەردا هاتبێت؟.

وتم: نەخێر.

خەوگرەوەکە وتی: کەواتە لەوانەیە بۆ یەکێك لە نەوە و جێنشینەکانت ڕوو بدات.

ئەو ڕووداوە بووە مایەی ئەوەی من بەردەوام لە بەرانبەر ئەواندا خۆپارێزیم هەبێت، هەرچەندە تا ئێستە لەلایەن عارەبانەوە هیچ کێشەیەك بۆ من نەنراوەتەوە.

دوایین هەواڵ سەبارەت بە گۆتەکان بۆ من هات ئەوە بوو کە ئەوان لە ناوچەی ئابیدان کە کەوتووەتە سنووری دیاربکر.

ساڵی رابردوو لەو کاتەی ئەوان گەیشتنە ئاسیای بچووك، وەرزی پێگەیشتنی میوە بوو، ئەوان لە جیاتی میوەکان لێ بکەنەوە، دارەکانیان بە تەور دەبڕییەوە تا بەرببێتەوە و بە ئاسانی بتوانن میوەکانی لێ بکەنەوە و بیخۆن، تەنیا دار مێوەکان لە بڕانەوە پارێزراو بوون، چوونکە لە رەزەکاندا داری مێو کورتە، ئەو پیاوە نیمچە دڕندانە بە ئاسانی دەستیان دەگەیشتە هێشووەکانی ترێ. ئەوان بێ ئەوەی مێوەکە ببڕنەوە، هێندەیان ترێ دەخوارد تا نەخۆش دەکەوتن.

ئەوان لە هەر شوێنێك دەگەیشتنە مێگەلێك، وەك گورگ دەکەوتنە ناویان، هێندەی لە توانایاندا بووایە مەڕیان دەکوشت، هێندەیان ئەقڵ نەبوو کە بەپێی پێویست گا و مەڕ بکوژن، لانی کەم بۆ پێداویستیی خۆیان ڕایان بگرن.

من کاتێك گەیشتمە ناوچەی ئابیدا بە خێرایی بەرەو سوپای گۆتەکان چووم، کاتێك گەیشتمە لای ئەوان کە خێوەتگەکەیان لە بناری شاخی (نی فاتس) دامەزراند بوو.

خێوەتەکانی ئەوان پانییان کەم و بەرز بوون، لەژێر زەردەی تیشکی خۆری ئێوارەدا، سوور دەچوونەوە. ئەوان خێوەتەکانیان بە مۆم و کەتیرە دادەپۆشی تا کاتی بارینی بەفر و باران ئاو و شێ نەیەتە ناوەوە، رەنگە سوورەکەی خێوەتەکانیشیان دەگەڕایەوە بۆ (قێرمزی).(٤)

شێ، بەفر و باران نەدەچووە نێو خێوەتەکان، بەڵام بە منیان وت بە زوویی ئەو خێوەتانە ئاگر دەگرن.

بەپێی ئەو راپۆرتانەی بە من گەیشتبوو، ئەو پیاوانەی لەو خێوەتانەدا بوون، پیاوانێکی سەرسەخت وەك ئاژەڵە جەنگەڵی و بیابانییەکان بوون، تەنیا رێگە بۆ سەرکەوتن بەسەریاندا، کوشتنی ئەوان بوو.

هەرچەندە کاتی جەنگ بەسەر چووبوو، شەو راکشابوو، بەڵام من هەوڵمدا هەر ئەو شەوە لەگەڵیاندا بجەنگم، چوونکە بیرم کردەوە کە باشترین کات بۆ لەنێوبردنی ئەو پیاوە سەرکێشانە، ئەوکاتەیە کە ئەوان لە خەودا بن.

بە سەردارەکانی خۆمم وت دەبێت ئەمشەو پەلاماری خێوەتگەکەی دوژمن بدەین، بە سەربازەکانتان بڵێن ئەمشەو کاتی پشوودانتان کورتە و لە بەرانبەردا دوای ئەوەی بەسەر دوژمندا سەرکەوتن، ماوەی چەند شەو و رۆژێکیان بۆ پشوو پێ دەدرێت.

وتم ئەسپسوار و گالیسکەکان هێندەی دەتوانن تێر بکەن، خۆیان بپارێزن لە دامەزراندنی ئۆردووگە، چوونکە کۆکردنەوەی ئۆردووگە ماوەیەك دەخایەنێت.

ئێمە لە کەناری ڕووبارێکی بچووك وەستابووین کە سەرچاوەکەی لە شاخی (نی فاتس) بوو، بەرەو باکور، دواتر بەرەو رۆژهەڵات دەڕۆیشت، کەوتبووینە هەردوولای ئۆردووگەی گۆتەکان.

فەرمانم کرد بە فەرماندەی مەشخەڵ هەڵگرەکانی لەشکرەکەم کە هێندەی لە توانایاندایە مەشخەڵ هەڵبکەن، چوونکە ئەو شەوە بۆ هێرشکردنە سەر دوژمن مەشخەڵی زۆرمان پێویست بوو، دەبوایە گالیسکە جەنگییەکان بەشێك لە مەشخەڵەکان لەگەڵ خۆیاندا ببەن و سوار و پیادەکانی لەشکرەکەشم هەندێکی دیکە لە مەشخەڵەکان ببەن، تا بە ڕووناکی

---

(٤) قێرمزی جۆرە مێشوولەیەکە وشکیان دەکردەوە و دەیانکوتا تا بۆ رەنگکردنی کوتاڵ سوودیان لێ ببینن، هەڵبەت ئەو رەنگە نێزیك سوور بوو. "زەبیحوڵڵا"

مەشخەڵەکان بتوانین گۆڕەپانی جەنگ ڕووناك بکەینەوە، لە لایەکی دیکە خێوەتەکانی دوژمن ئاگر بدەین، بە ئاگری زۆریش، ئەوان پتر بترسێنین.

فەرماندەیی گالیسکە جەنگییەکانم بۆ هێرشکردنە سەر ئۆردووگەی گۆتەکان بە براکەم سپارد و پێموت کە پێویستە لە باکور و ڕۆژهەڵاتەوە هێرش بکات، منیش لەگەڵ سوارەکانم لە باشوورەوە هێرش دەکەم، پیادەکانیش لە دوامانەوە هێرش دەکەن، ئێمە لە بناری شاخ و لە ڕۆژئاوای ئۆردووگەکە دەگەینەوە یەکدی.

دوو برای من لە جەنگ بوون، یەکیان فەرماندەی گالیسکە جەنگییەکان و ئەوی دیکە فەرماندەی پیادەکان بوو، خۆشم فەرماندەی سوارەکانمان بووم.

بە هەردوو براکانم وت من گومان ناکەم ئەو پیاوە نیمچە دڕندانە لەکاتی دامەزراندنی ئۆردووگە وەك لژیۆنی ڕۆمەکان ئامادەیی خۆیان وەربگرن و ئۆردووگەکەیان بە شێوەیەك توند بکەن کە پەلامارداني ئاسان نەبێت.

وێڕای ئەوەش نابێت خۆپارێزی خۆمان لەبیر بکەین، پێویستە چەند کەسێکی چوست و چالاك و وریا بنێرین بۆ دەوروبەری ئۆردووگەکە، بۆ ئەوەی بزانن ئایا بەربەست لە دەوروبەری ئۆردووگەکەیان هەیە یاخۆ نا؟.

لەگەڵ دنیا تاریك داهات، چەند کەسێکم لە هەموو لایەکەوە نارد بۆ ئۆردووگەی دوژمن، ئەوان ماوەیەك پێش ئەو کاتەی بۆ دەستپێکی هێرش دیاریم کردبوو، گەڕانەوە و وتیان هیچ بەربەستێکیان نەبینیوە لە دەوروبەری ئۆردووگەی دوژمن، بەڵام ئۆردووگەکە پاسەوانی هەیە، ناکرێت ئەوان ئاگەدار نەبنەوە کاتێك هێرش بکرێتەسەر ئەو ئۆردووگایە.

بە هەر دوو فەرماندەی گالیسکە جەنگییەکان و لەشکری پیادەکانم وت کە لادان و لەنێوبردنی هەر بەربەست و ڕێگرێك ئەگەر هەبێت، کاری ئێوەیە، دەبێت بە هەر شێوەیەك دەتوانن لایان بدەن. پێش ئەوەی نیوەشەو بێت، فەرمانی هێرشم دەرکرد، هەموو سوپاکەم، جگە لەو بەشەی کە یەدەگ بوو بە یەکپارچەیی کەوتنە جووڵە.

پێموتن بۆ دۆزینەوەی ڕێگە سوود لە تریفە و ڕۆشنایی مانگ وەربگرن، مەشخەڵەکان بەکار نەبەن تا دوژمن درەنگتر لە هێرشی ئێمە بە ئاگا بێت، کاتێك گەیشتنە ئۆردووگەی گۆتەکان و جەنگ دەستی پێکرد، مەشخەڵەکان هەڵ بکەن و ڕووناهی مانگ بۆ دۆزینەوەی ڕێگە باش بوو، بەڵام بۆ هێرشەکەمان کەم بوو.

گالیسکە جەنگییەکانمان کە لە باشوور و رۆژهەڵات لە هێرشدا بوون، پێش ئێمەی سوار و پیادەکانمان گەیشتنە ئۆردووگەی دوژمن، ئەو بابەتەم لە دەنگی کەڕنای پاسەوانەکانی دوژمن لە دەنگی گا دەچوو بۆ دەرکەوت، هەر کە ئەو دەنگانە هاتن، من بە سوارەکانی خۆمم وت تا مەشخەڵەکان پیێ بکەن.

لە هەردوو لای باکور و رۆژهەڵاتیش، گالیسکەکانمان مەشخەڵەکانیان پیێ کرد، ئێمە لە باشوورەوە بێ ئەوەی رێگریمان بکرێت، گەیشتینە نێو ئۆردووگەی دوژمن، چوونکە لە باشوورەوە هیچ رێگرێك لە پێشمان نەبوو، وام گومان برد کە لە باکور و رۆژهەڵاتیش هیچ رێگرێك نەبێت، تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە دەگەنە خێوەتەکانی دوژمن.

ئۆردووگەی گۆتەکان وەك ئێمە لە دوورەوە بە رۆژ بینیبوومان، وەك هەر ئۆردووگایەکی دیکە هەندێ رێبازی هەبوو، چوونکە ئەگەر وانەبێت، هەر بەشێکی خێوەتگە بۆ هەندێ لە سوپاییەکان نەبێت، فەرماندەی سوپا نازانێت کە بەشە جیاکانی لەشکرەکەی لە کوێن و ناتوانێت لە لایەکی ئۆردووگە بۆ لاکەی دیکە بڕوات، بۆیە دەمزانی دوای ئەوەی گالیسکەکانمان دەگەنە نێو خێوەتگەکە، دەتوانن بەنێو رێبازەکاندا بڕۆن، لە هەر شوێنێك لە بەرانبەر خۆیاندا خێوەت ببینن، یان دەبێت بەرەو لای راست یاخۆ لای چەپ بڕۆن یاخۆ بە هاویشتنی ئاگر خێوەتەکە بسووتێنن.

نەخشەی من وابوو کە ئەو شەوە لە رۆژئاوای خێوەتگەکە بگەینە یەکدی، بەڵام نەك بە دەوروبەری خێوەتگەکەدا بڕۆین، بگرە دەبووایە ئۆردووگەی دوژمن تێك بشکێنین و سەربازە گۆتەکان ناچار بکەین تا لە بارودۆخێکدا لەگەڵمان بجەنگن کە دڵنیا بم لە شکستخواردنیان.

بەشی سوارەکان دوای ئەوەی گەیشتینە نێو ئۆردووگەکە ، خێوەتەکانمان لە هەردوو لای راست و چەپمان ئاگر دەدا و دەڕۆیشتینە پێشەوە، سەربازەکانی دوژمن کە هێشتا خەو بەری نەدابوون، کاتێك دەکەوتنە بەرانبەرمان دەبوونە ئامانجی گورز و تیرەکانمان، زۆرینەی ئەوان لەبەر ئەوەی پەشۆکابوون فریا نەکەوتن کڵاوە گەورەکەی کە لە شێوەی مەنجەڵ وابوو، بکەنە سەریان.

بە لەوەی هێرش بکەین بۆ سەر گۆتەکان بە سەردارەکانی خۆمم وتبوو هێندەی دەتوانن دیل بگرن تا من بتوانم بارمتەم هەبێت، دەمزانی کە دەستەیەکی دیکە لەو خێڵە وەحشیانە کەوتوونەتە باکوری ئێمە و دەیانەوێت خۆیان بگەیەننە ئاترۆپاتێن، دەمویست کە بارمتەی زۆرم هەبێت تا ئەوانیدیکە ناچار بکەم خۆیان بە دەستەوە بدەن، بەڵام ئەوان پیاوانی زۆر

سەرسەخت بوون، لەوانەبوون خۆیان بەدەستەوە نەدەدا، براکەم و سەردارەکانی دیکە دەیانزانی ئەگەر ئەوان خۆیان بە دەستەوە نەدەن، دەبێت تا دوایین کەس بیان کوژن.

مەشخەڵەکانمان ئاگر تێبەردانی خێوەتەکانی گۆتەکانی ئاسانتر کرد، بە نێزیککردنەوەی ئاگری مەشخەڵەکان لە خێوەتەکان، راستەوخۆ خێوەت ئاگری دەگرت، ئەگەر خێوەتی دیکەی لە نێزیك بووایە، ئاگر بۆ ئەویش دەپەڕییەوە و دەسووتاند، لە ئۆردووگەکەدا هیچ ئامرازێك بۆ ئاگر کوژاندنەوە نەبوو.

گالیسکەکانمان لە رۆژئاوا و باکور، ئێمەش لە باشوورەوە ئەو خێوەتگەیەمان دەورەدا، کە لە ئاگردا دەسووتا، ئاگرەکە بە رادەیەك بە خێرایی گەشەی سەند کە خۆشمان لێی دەترساین، لەوانە بوو گالیسکە و لێخوورەکانیان و ئەو سەربازانەی لەنێویاندا بوون، بسووتێن، ئێمەش کە لە باشوورەوە هێرشمان کردبوو، هەمان مەترسیی ڕووبەڕوومان بوو.

سەربازەکانی دوژمن توانای جەنگ لەگەڵ ئاگریان نەبوو، نەیاندەتوانی بیکوژێننەوە، چوونکە تاکە رێگە بۆ هەڵاتنیان رۆژئاوا بوو، بەرەو ئەوێ هەڵدەهاتن، چوونکە ئێمە لە سێ لاوە هێرشمان دەکردنە سەر، تەنیا لە رۆژئاوا بە هۆی شاخی نی فاتس نەماندەتوانی هێرشیان بکەینەسەر، پیاوە نیمچە وەحشییەکان بۆ هەڵاتن لە ئاگر بەرەو بناری شاخەکە رۆیشتن، ئێمەش لە بناری شاخەکە گەمارۆماندان.

ئەو شەوە بۆم دەرکەوت کە گۆتەکان هەر وەك دڕەندەکانن لە بەرانبەر ئاگردا، لە هیچ شتێك ناترسن، تەنیا ئاگر نەبێت، ئەگەر ئاگرمان لە خێوەتگەکەیان بەرنەدا بووایە، نەماندەتوانی ئەو شەوە ئەوان بە هەڵاتن بدەین و لە بناری شاخەکە گەمارۆیان بدەین.

لە هەموو شوێنێکی ئۆردووگەکەوە دووکەڵ بەرز دەبۆوە، چوونکە نێزیك بەرەبەیان بوو، شنەبای بەیانی لە باکورەوە هەڵی کرد و دووکەڵەکەی بەرەو باشوور دەبرد، ئێمە کە شاخەکەمان لە سێ لاوە گەمارۆ دابوو، دووکەڵەکە زۆر ناڕاحەتیی نەکردبووین. ئاگری خێوەتگەکە لەگەڵ بەرەبەیاندا بەرەبەرە کوژایەوە، چوونکە هەموو ئەوانەی بۆ سووتان دەشیان، سووتا بوون، تەنیا لێرە و لەوێ هەندێ وردە شت هێشتا تازە دەسووتان.

من زمانی گۆتەکانم نەدەزانی، بەڵام چوونکە ئەوان زمانی رۆمیان دەزانی، دەمانتوانی لەگەڵیاندا بئاخڤین.

کاتێك دنیا ڕووناك بۆوە، بە هۆی براکەم پەیامم بۆ ناردن کە بۆ زیندوو مانەوەیان، پێویستە خۆیان بە دەستەوە بدەن.

پیاوێکی باڵابەرز کە بسکەکانی درێژ و زێڕین بوون، سمێڵی درێژ و لە دوولاوە شۆڕ ببوونەوە، دوای ئەوەی بە نیچو سەربازەکانی دوژمندا تێپەڕ بوو گەیشتە شوێنێك کە دەیتوانی لەوێوە لەگەڵ براکەم بئاخڤێت و هاواری کرد: من دەمەوێت لەگەڵ پاشاکەتان بدوێم.

براکەم لێی پرسی: تۆ کێیت و لەنێو گۆتەکاندا چ پلەیەکت هەیە؟.

ئەو پیاوە وتی: من ناوم کارڵ مانە، فەرماندەی گشتیی ئەو لەشکرەم، ئەی تۆ کێی؟.

براکەم وتی: من فەرماندەی گالیسکە جەنگییەکانی ئەو لەشکرە و برای پاشای ساسانیم، دواتر براکەم لێی پرسی: چ کارێکت بە پاشای ساسانییە؟.

کارل مان وتی: دەمەوێت لەبارەی ئاشتییەوە لەگەڵ ئەودا بدوێم.

براکەم وتی: من دەتوانم تۆ ببەم بۆ لای پاشا، وەرە با بڕۆین.

کارل مان وتی: چۆن متمانە بکەم و بێمە لای پاشاکەتان، چوونکە لەوانەیە من بکوژێت.

براکەم وتی: ئەگەر تۆ لەو کەسانە بپرسی کە دەزانن ئێرانییەکان و بە تایبەتی پاشای ساسانی ڕاستگۆن، پێت دەڵێن کە دەتوانی متمانە بە بەڵێنی ئەوان بکەی، لە یەکەمین کاردانەوەدا وتەی پاشای ساسانی زۆر بە متمانەترە لە وتەی خەڵکی دیکە.

کارل مان وتی: بەڵام من مەترسیم هەیە بکوژرێم، دەمەوێت بێ ئەوەی لێرە بێمەدەر لەگەڵی بدوێم.

هۆکاری ئەو شێوە دوانەی ئەو پیاوە لەوکاتەدا ئەوە بوو کە دەیزانی گالیسکە و ئەسپەکانمان لە داوێنی ئەو شاخە ناتوانن هێرش بکەنەسەر ئەو و سەربازەکانی، بەڵام من دەمتوانی لەگەڵ پیادەکانمدا هێرش بکەم، وەك دواتر باسی دەکەم ئەوکارەم نەکرد، چوونکە بیستم ئەو باسی ئاشتیی دەکات، بە براکەمم وت ئەو بێنێت بۆ لام.

کارل مان پیاوێکی باڵابەرز و چاوشین بوو، جلوبەرگەکانی لە پێستە بوون، شمشێرێکی پان و درێژی لە کەلەکەی شۆڕ کردبۆوە. ئەو لەنێو سەربازەکانیدا وەستابوو و پێموت: من پاشای ساسانیم، دەتەوێت چ بڵێیت، پێم بڵێ.

کارل مان وتی: هاتووم تا پێت بڵێم بۆ ئاشتیی ئامادەم.

وتم: ئەگەر مەبەستت لە ئاشتیی ئەوەیە کە من، تۆ و سەربازەکانت ئازاد بکەم تا بگەڕێنەوە و بڕۆن، هەر وەك چۆن لە هاتنتاندا لەسەر ڕێگەتان هەموو ئەو وڵاتانەتان تاڵان کردووە کە لەژێر دەستی مندان و خەڵکەکەتان کوشتووە، لە گەڕانەوەشدا هەمان کار بکەن، ئەو جۆرە ئاشتییەم ناوێت.

کارل مان پرسیاری کرد: ئەی چ جۆرە ئاشتییەکت دەوێت؟.

وتم: بەو شێوەیە رازیم کە تۆ و دوا سەربازی گۆت ببنە دیلی من تا ئەوکاتەی ئاسیای بچووك بەجێ دەهێڵن، پێویستە بگەڕێنەوە بێ ئەوەی کەس ئازار بدەن و ماڵی کەس تاڵان بکەن، ئەوەی تا ئێستە تالآنتان کردووە، بیگەڕێننەوە.

کارل مان وتی: ئەوەی بە تالآنمان بردووە، دوێنێ شەو هەمووی لە ئاگردا سووتا.

وتم: دەستەیەکی دیکە لە سەربازەکانت کە بەرەو باکور دەڕۆن، هێشتا بەردەوامن لە تالآنکردن، ئەوان پێویستە دەسکەوتەکانیان بگەڕێننەوە، تۆ و سەربازەکانیشت پێویستە قەرەبووی ئەو شتانە بکەنەوە کە تالآنتان کردووە و دەڵێن سووتاوە.

کارل مان وتی: ئێمە چۆن دەتوانین ئەو شتانەی سووتاون و لەنێو چوون، بگەڕێنینەوە؟.

وتم: ئێوە لە سەرمایەی خۆتان دەتوانن ئەوانە بدەنەوە.

کارل مان وتی: من و سەربازەکانم هیچ شتێکی تایبەت بە خۆمانمان نییە.

وتم: تۆ و سەربازەکانت دەتوانن بە شێوەییەکی دیکە ئەو زیانانەی بە من و بە نەتەوەکانی منتان گەیاندووە، قەرەبوو بکەنەوە، ئەویش ئەوەیە کە ماوەیەك بۆ من کار بکەن.

کارل مان وتی: چۆن بۆ تۆ کار بکەین.

وتم: من لە وڵاتەکەم زۆر کاری وەك دروستکردنی شار و بەربەست و کەناڵەکانی ئاوم هەیە، چوونکە تۆ فەرماندەی گشتیی ئەو لەشکرەی لە کارکردن دەتبەخشم، بەڵام سەربازەکانت دەتوانن لەو شوێنانەی بۆیان دیاری دەکەم کار بکەن، بە کارکردنیان ئەو زیانانەی لە نەتەوەکانی ژێردەستی منیان داوە، قەرەبوو بکەنەوە.

کارل مان وتی: ئێمە ناتوانین بۆ تۆ کار بکەین، بەڵام ئامادەین خۆمان ڕادەست بکەین، بەو مەرجەی ئازاد بین و بۆ رۆژئاوا بگەڕێینەوە.

وتم: من ناتوانم لێ بگەڕێم ئێوە ئازاد بن و بۆ رۆژئاوا بگەڕێنەوە، چوونکە دیسان نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتیی من دەخەنەوە بەر تالآن و کوشتار، جگە لەوەش ئێوە پێویستە لە بەرانبەر ئەو تاوانانەی کردووتانە، سزا بدرێن.

کارل مان وتی: کەواتە ئێمە بەردەوام دەبین لەسەر جەنگ.

ئەوکات فەرمانم کرد تا گالیسکەکانم لە باکورەوە بە شێوەیەك گەمارۆی شاخەکە بدەن، کە گۆتەکان نەتوانن ئاویان دەست بکەوێت. دەمزانی ئەو ناوچەیەی کارل مان و سەربازەکانی لێی وەستاون رێگەی بەرەو رۆژئاوا نییە و ئەوان ناتوانن لەو شاخە سەر بکەون و خۆیان رزگار

بکەن، ڕێگەی ڕزگاربوونی ئەوان لە باکور و باشوور بوو، ئەو دوو شوێنەش وەك لای ڕۆژهەڵات بە دەست ئێمەوە بوو، ئەوان نەیاندەتوانی بە هیچ لایەکدا هەڵبێن.

دەمتوانی پیادەکانی خۆم ناچار بکەم تا لەو بنارە بەردەڵانییەی شاخدا هێرش بکەنە سەر گۆتەکان، بەڵام نەمدەویست لە جەنگێکدا کە بە دڵنیاییەوە سەرکەوتن بۆ من بوو، سەربازەکانم بە کوشت بدەم.

سەربازەکانی دوژمن لە بەردەڵانەکانی دامێنی شاخ هیچیان بۆ خواردن و خواردنەوە نەبوو، نەشیان دەتوانی بۆ هیچ شوێنێك هەڵبێن، دەمزانی برسییەتیی و تینوویەتیی و گەرمای هەتاو ئەوان ناچار بە خۆ بەدەستەوەدان دەکات، بۆیە بڕیارمدا ئەوان بخەمە ناو گەمارۆ تا بە ناچاری خۆ بە دەستەوە بدەن، من دەمزانی ئەو خەڵکە کە وەك دڕندەکان گۆشت بە خاوی دەخۆن وەك سەربازەکانی من نین کە ئەگەر خۆراك و ئاویان پێ نەگات، توانای خۆڕاگری لە بەرانبەر برسییەتیی و تینوویەتیان هەبێت و بە زوویی خۆیان بە دەستەوە دەدا.

پێشبینی من ڕاست دەرچوو، ڕۆژی دواتر کە هەتاو دەرکەوت، گەرما بووە سەربار بۆ برسییەتیی و تینوویەتیی گەمارۆدراوەکان، کارل مان داوای خۆ بەدەستەوەدانی کرد، سەربازەکانی من، ئەو و سەربازەکانی ئەویان چەك کرد و بە دیلیان گرتن، جەنگی بناری نی فاتس بەم شێوەیە کۆتایی هات، فەرمانم کرد تا براکەم کارل مان لەگەڵ خۆیدا ببات و بە لەشکرێکەوە بچێت تا گۆتەکانی لای باکور خۆیان بە دەستەوە بدەن.

براکەم فەرمانی منی بەجێ گەیاند، ئەو پیاوەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ پێش گۆتەکانی لە لای باکور بوون، هەندێ لە گۆتەکان کە بینیان فەرماندەکەیان داوایان لێ دەکات بۆ ئەوەی خۆیان ڕادەست بکەن، خۆیان بە دەستەوە دا، هیندێکیشیان کە فەرماندەکەیان بە دیلی لە لای ئێمە بینی، نەیانویست خۆیان بە دەستەوە بدەن و هەڵاتن، براکەم بە دوویان کەوت، هەندێکیانی کوشت و هەندێکیان توانیان دەرباز بن و هەڵبێن، بەڵام چوونکە بە بەربڵاوی هەڵدەهاتن، بە دەست دانیشتووانی ناوچەکە کە زۆر کینەی ئەوانیان لە دڵدا بوو، دەکوژران، بەو شێوەیە جەنگی من و گۆتەکان کۆتایی هات.

ئەی ئەو کەسەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنیتەوە، بزانە لەو کاتەوە تا ئەو کاتەی ئەو کەتیبەیە دەنووسرێتەوە، گۆتەکان نەیانوێراوە هێرش بکەن بۆ وڵاتانی ژێر دەسەڵاتیی من و خەڵك بخەنە بەر کوشتار و تاڵان.

دوای جەنگی نی فاتس من ماوەیەك لە دیاربەکر مامەوە، براکەمم نارد تا ئەو گۆتانەی لە باکور بوون، دیل بکات و خۆم بەرەو ئاترۆپاتێن چووم تا لەوێوە بەرەو ئەرمەنستان بچم.

هەر کەسێك بیەوێت بچێتە ئەرمەنستان پێویستە لە ڕووباری (ئاراس) بپەڕێتەوە، کوروش پردێکی بەهێزی لەسەر ئەو ڕووبارە دروست کرد، بەڵام ئەو پردە لە ڕۆژهەڵات بوو، ڕێگەی من دوور دەکەوتەوە. پێش ئەوەی بڕیاری خۆم یەکلا بکەمەوە کە لەو ڕووبارە دەپەڕمەوە یاخۆ بە شێوەیەکی دیکە لەو ڕووبارە کە لەو وەرزەدا ئاوی زۆر بوو دەپەڕمەوە، هەواڵم بۆ هات کە تیری داتس (تیردادی سێیەم) پاشای ئەرمەنستان، پردی کوروشی ڕووخاندووە تا من نەتوانم لە ڕووبارەکە بپەڕمەوە.

پردی کوروش بۆ دانیشتووانی هەردوو لای ئەو ڕووبارە زۆر بە بایەخ بوو، دوای ئەوەی تیری داتس ئەو پردەی وێران کرد، هاتوچۆی خەڵکی هەر دوو لای ڕووبارەکە زۆر سەخت ببوو بە تایبەتی لە وەرزی بەهاردا کە ڕووبارەکە ئاوی زیاد و بەخوڕتر دەبوو سەررێژی دەکرد. هەر کە هەواڵی ڕووخانی ئەو پردەم بیست، یەکێك لە ئەندازیارەکانی خۆمم بە ناوی (مارۆیە) کە خەڵکی ڕاقس بوو، ڕاسپارد تا بە زووترین کات پردێك چێ بکات تا دانیشتووانی هەردوو بەری ڕووباری ئاراس بتوانن لێی بپەڕنەوە.

دوای گەڕانەوەم لە دیاربەکر، چووم بۆ چیچەست و ڕێوڕەسمی نزام لەو ئاگرخانەیە بەجێ گەیاند، پێش ئەوەی بەرەو باکور بڕۆم تا بچمە ئەرمەنستان، ئازارێکی توند بەلەکی قاچی راستمی گرت، مووغی ئاگرخانەی چیچەست پێی وتم ئەی خەسرەو لە ئاوی دەریاچەی ئێرەدا مەلە بکە، بە تایبەت دوای مەلەکردن لاقی راستت بە لمەکانی کەناری دەریا داپۆشە، ئازارەکە بە تەواوەتی نامێنێت. چوونکە جگە لە مووغی ئەو ئاگرخانەیە، خەڵکی دیکەیش ئەو بابەتەیان پێوتم، وەرزیش بۆ مەلەکردن شیاو بوو، من مۆچیاریی ئەوانم لە گوێ گرت، بۆ مەلەکردن لە ئاوی دەریاچەی چیچەست کە زۆر سوێرە و ماسی تێدا نییە، ئامادە بووم.

ئاوی دەریاچەکە هێندە سوێر بوو کە من لەنێو ئاوەکە رۆنەدەچووم، دوای کەمێك لە مەلەکردن، هاتمە دەرێ قاچم ڕاگرت، خزمەتکارەکانم کەوتنە داپۆشینی قاچم بە لم، لە ماوەیەکی کەمدا قاچم داپۆشرا.

بە منیان وت سێ ڕۆژ دەبێت مەلە بکەی، دواتر بە لم قاچت داپۆشی تا ئازارەکە بە تەواوەتی لەنێو بچێت. لە سێیەم ڕۆژدا کە قاچم لەنێو لمدا بوو، سێبەریان لەسەر سەرم کردبوو تا لە تیشکی هەتاو بمپارێزن، هەستم کرد ئازارم نەماوە، کاتێك قاچم لە لم دەرهێنا بۆم

دەرکەوت کە هیچ ئازاری نەماوە، پاش ئەوە بۆ ماوەی چەند ساڵێك هیچ ئازارم لە قاچەکانم هەست پێ نەکرد.

دوای ئەوەی ئازاری قاچم بە تەواوەتی نەما، لە چیچەستەوە کەوتمەڕێ بەرەو باکور ڕۆیشتم. کاتێك گەیشتمە شاری ماکو، کریستیانەکانی ئەو شارە هاتنە پێشوازیم، وەك گەیاندنی ئەمەکداری خۆیان بەرانبەر بە من، بردیانم بۆ کڵێسای خۆیان کە ماوەی نێزیکەی سەد و پەنجا ساڵ پێشتر لەو شوێنە دروستیان کرد بوو، لەو کڵێسایە پیرە پیاوێکی بە تەمەن نزای بۆ کردم و وتی: هەموو کریستیانەکان نزا بۆ تۆ و بنەماڵەکەت دەکەن، چوونکە لێرە پارێزراون، بەڵام ئەگەر ڕۆژێك پاشای ئەرمەنستان دەسەڵاتیی بەسەر ئێرەدا هەبێت، هەموو کریستیانەکان دەکوژێت.[(٥)]

بەو پیرە پیاوەم وت: نازانم دوای من چ ڕوودەدات، بەڵام تا ئەو ڕۆژەی من هەم ڕێگە نادەم پاشای ئەرمەنستان ئێوە بخاتە بەر ئازار، ئێستەش دەڕۆم تا ئازار و مەینەتییەکانی ئەو لەسەر شوێنکەوتووانی خۆم نەهێڵم.

دوای دوو ڕۆژان لە ڕێ ڕۆیشتن، گەیشتمە کەناری ڕووباری ئاراس، کاتێك گەیشتم بە هۆی وەرزەکەوە هێشتا ئاو لە ڕووبارەکە زۆر بوو، خێراییەکەیشی هەر زۆر بوو، چوونکە ڕێڕەوی ڕووباری ئاراس زۆر لێژە و ئاو لە ڕۆژئاوا بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات، لە کاتی لێشاوی ڕووبارەکە هیچ کەس توانای پەڕینەوەی نابێت و ئاو دەیبات.

ئەوکاتەی گەیشتمە ڕووباری ئاراس، چیدیکە ڕووبارەکە سەرکێشیی نەبوو، بەڵام هێشتا ئاو زۆر بوو، من نەمدەویست سەربازەکانم دووچاری مەترسیی ئاو بکەمەوە، لەو نێزیکانەش هیچ بوارێکی لێ نەبوو کە سەربازەکانم لێی بپەڕنەوە.

دەبووایە من تەواوی گالیسکەکان، سوارەکان، پیادەکان و هەموو پێداویستی و کەرەستە جەنگییەکانم لە ڕووبارێکی بێ بوار بپەڕێنمەوە، بە دڵنیاییەوە دووچاری ئاوی بەخوڕ و تیژڕۆ دەبوون، دوور نەبوو پاشای ئەرمەنستان کە لە باکوری ڕووباری ئاراس چاوەڕوانی من بوو، کاتێك منی بە لەشکرێکی نارێك و ناتەکووزە کە بەشێك لە گالیسکە و سوارەکان و پیادەکانی ئاو بردوونی، گەیشتبامە ئەوبەری ڕووباری ئاراس، لەشکری منی شکستدابووایە، من دەبووایە بە لەشکرێکی بەهێزەوە لە ڕووبارەکە بپەڕمەوە.

---

(٥) ئەوکات کە ساڵی ٢٥٢ زاینی بوو، خەڵکی ئەرمەنستان هێشتا نەهاتبوونە سەر ئاینی عیسا و نەببوون بە کریستییان. "زەبیحوڵڵا"

بۆیە بە وەستاکانی لەشکرەکەی خۆمم وت تا بەلەم چێ بکەن و لە بەلەمەکان پردێك دروست بکەن و پانتایی پردەکە دەبێت هێندە بێت کە گالیسکەکان بتوانن لێی بپەڕنەوە. ئەوکات بە فەرمانی من دوای ئەوەی پارەیان دا بە خاوەنەکانیان، ئەو دارانەیان بڕییەوە کە بە کەڵك دەهات بۆ دروستکردنی بەلەم و پردەکە.

کۆمەڵێك بەلەمیان دروست کرد، هەر بەلەمێك کە تەواو دەبوو دەیانخستە نێو ئاو، لە تەنیشت بەلەمێکی دیکە دایان دەنا، لە نێوان هەر دوو بەلەمدا هێندە مەودا دەهێشترایەوە کە ئاو بە ئاسانی پیایدا بڕوات و دروستکردنی پرد بە خێراییەکی پتر لەوەی من چاوەڕوانم دەکرد تەواو بوو. دوای تەواوبوونی پردەکە دەستەیەك سەربازم وەك پێشەنگ نارده ئەوبەری پردەکە تا بزانم ئایا لەشکری پاشای ئەرمەنستان لە ڕووبارەکە نێزیکە یان نا؟، بەڵام لە نێزیك ڕووبارەکە، جگە لە چەند گوندێك کە دانیشتووانەکانیان جووتیار بوون، هیچی دیکەی لێ نەبوو، پێشەنگەکانی من لە گوندییەکانیان پرسیار کردبوو، ئەوان وتبوویان لەو نێزیکانە لەشکریان نەبینیوە، لەوانە بوو کە پاشای ئەرمەنستان خۆپارێزی دەکرد، لە ڕووبارەکە نێزیك نەدەبۆوە تا خۆی دەرنەخات، دوای ئەوەی دڵنیا بووم لە نێزیك ڕووبارەکە و لە سەرەوە و لە خوارەوەی ڕووبارەکەش، لەشکری پاشای ئەرمەنستان نییە، فەرمانی پەڕینەوەی لەشکرەکەمم بە سەر پردەکەدا دەرکرد.

# لە ئارارات بۆ شاری ئارماویر (ئیرەوان)

من هێندەم خۆگرت تا تەواوی لەشکرەکەم لە پردەکە پەڕییەوە، دوای ئەوەی کەس لە کەناری باشووری ئاراس نەمایەوە، خۆم لە پردەکە پەڕیمەوە و گەیشتمە ئۆردووگەی سوپاکەم لە کەنارەکانی باکوری ڕبارەکە و پێوەستبووم بە ئەوانەوە.

کاتێك ئێوارە لە پردەکە پەڕیمەوە، شەو گەیشتمە نێو ئۆردووگەکەم، بەرەبەیان کاتێك لە خەو ڕابووم، لە ئاراستەی باکور شاخێکم بینی کە هەتاو تازە بەر لووتکە سپیەکەی دەکەوت.

ئەو دەمەی ئەو شاخەم بینی ناسیمەوە، زانیم ئەوە شاخی نووحە. لە پەڕتووکەکانی جوولەکەکان کە بەشێکن لە شوێنکەوتووانی من، لە شاری گێی (ئەسفەهان دەژین، نووسراوە کە کەشتیی نووح دوای کۆتایی تۆفان لە شوێنێکی ئەو شاخە نیشتەوە، جوولەکەکان ناوی ئەو شاخەیان نا (شاخی نووح)، بەڵام ئەرمەنییەکان ئەو شاخەیان بە ناوی دیکە ناو دەبرد، ئێستە ئەو شاخە ناوی ئاراراتە.

من دەمزانی لە ئۆردووگەی ئێمە تا شاخی نووح پتر لە (١٨ کم) ڕێگەیە، بەڵام ئەو شاخە هێندە نێزیك دەهاتە بەرچاو کە وام بیر دەکردەوە ئەگەر دەستەکانم درێژ بکەم، دەگەنە ئەو شاخە. لە تەنیشت ئەو شاخە شاخێکی دیکە هەبوو، پێی دەوترا شاخی بچووکی نووح، لووتکەی ئەو شاخە بەفری پێوە نەبوو، بەڵام لووتکەی شاخی نووح لە تەواوی وەرزەکانی ساڵ بە بەفر دادەپۆشرا بوو.

هەوای ئەو کات بە پێچەوانەی وەرزی گەرما، فێنك بوو، چوونکە ئەو ناوچەیەی هەردوو شاخی گەورە و بچووکی نووحی لێ بوو، کوێستان بوو. کاتێك هەتاو بە تەواوەتی دەرکەوت، بەشەکانی دیکە شاخی نووح دیارکەوت، هەستم کرد شاخەکە لە ئۆردووگەکەمان نێزیکتر بۆتەوە، دوای ئەوەی هەتاو تەواوی شاخەکەی ڕووناك کردەوە، گەورەیی و شکۆی ئەو شاخە بووە مایەی سەرسووڕمانم.

بە ئاوایەك بوو کە شاخی گەورەی نووح تاشەبەردێکی گەورە بێت کە سەرێکی لە زەوی و سەرەکەی دیکەی بە ئاسمان بەسترابێتەوە، مرۆڤ لە بەرانبەر مەزنی و شکۆی ئەو شاخە دووچاری سەرسووڕمان دەبوو، ستایشی ئاهورامەزدام کرد بۆ ئەفراندنی شاخێکی ئاوا مەزن.

من لە وڵاتەکانی خۆمدا شاخی بەرزم بینی بوو، بەڵام هیچ شاخێکم بەو بەرزی و شکۆیەی شاخی گەورەی نووح نەبینی بوو. شاخەکە هێندە بەرز و ڕێك بوو کە مرۆڤ تا سەری بۆ پشتەوە نەسووڕاندبایە، نەیدەتوانی لووتکەکەی ببینێت. لە خوارەوە تا بەشێك لە شاخەکە سەوز بوو، دیار بوو کە دارستانە، بەڵام لەوە بە دواوە لە شاخەکە دار نەدەبینرا تا دەگەیشتە ئەو شوێنەی بە بەفر داپۆشرا بوو. بە منیان وت کەشتیی نووح هێشتا لەو بەشە ماوەتەوە، کە بە بەفر داپۆشراوە، بەڵام بە هۆی بەرزی و ڕێکی شاخەکە کە وەك دیوارێکی ڕاست بەرەو ئاسمان بوو، هەموو کەس نەیدەتوانی خۆی بگەیەنێتە ئەو شوێنەی بە بەفر داپۆشرابوو. وێڕای ئەوەش لە نێوان دانیشتووانی ناوچەکە خەڵکانێك هەبوون، کە لە سەرکەوتنی شاخ شارەزا بوون، توانیبوویان خۆیان بگەیەننە لووتکەکە و کەشتییەکە ببینن.

بەرزی شاخەکە هێندە کاریگەری هەبوو لەسەر من، کە نەمدەتوانی چاومی لەسەر هەڵبگرم. پێیان وتم کە لەو شاخەدا نێچیر زۆرە و تیری داتس پاشای ئەرمەنستان زۆر جاران بۆ ڕاووشکار دێتە ئەو شاخە، ئەو بابەتە سەرەنجی ڕاکێشام کە لەوانەیە پاشای ئەرمەنستان یاخۆ بەشێك لە لەشکرەکەی ئەو لە شاخی گەورەی نووح بێت، بۆ زانینی ئەو بابەتە بڕیارمدا لەگەڵ چاوساخەکانی ناوچەکە بچم بۆ ئەو شاخە.

دەمتوانی پێشەنگێك بۆ ئەو شاخە بنێرم تا بزانم ئایا پاشای ئەرمەنستان لەو شاخە لەشکری هەیە یاخۆ نا؟، بەڵام حەزی من بۆ بینینی شاخەکە لە نێزیك و سەرکەوتن لە بەشێکی، بووە هاندەر بۆ ئەوەی خۆم بچم و لە کاتی بەدواداگەڕان، هێندەی بتوانم مەترسیی سەرکەوتن لە شاخم نەبێت، لە شاخەکە سەربکەوم.

پێیان وتم تا بەرزی پێنج سەد گەز دەتوانرێت لە شاخەکە سەرکەون، ناوچەی دارستانی شاخەکەش هەر هێندە بەرزییە، دواتر چڕی دارەکان نامێنێت تا دەگاتە ئەو شوێنەی چیدیکە دار و ڕووەکی لێ ناڕوێت، دوای ئەو ئەستووری شاخ وەك دیوارێکی ستوونی لێ دێت، بە شێوەیەکە، تەنانەت باڵندەکان ناتوانن هێلانەی لێ بکەن، بەڵام لە بەشەکانی سەرەوە کە شاخ بە بەفر داپۆشراوە، بەفر هەرگیز ناتوێتەوە، دەتوانرێت هەندێ پانتایی تەخت بدۆزرێتەوە، کەشتیی نووح لە یەکێك لەو شوێنانەیە و هێلانەی هەڵۆش لەوێندەر هەیە.

وام بیر نەدەکردەوە کە هەڵۆ لەسەر شاخێك هێلانە بکات، کە بەردەوام بە بەفر داپۆشرابێت، بێچووەکانی لەوێندەر گەورە بکات و فێری فڕینیان بکات، بەپێی زانیاریی من هەڵۆ لە لووتکەی ئەو شاخانەی گەرم بوون هێلانەی دەکرد، بەڵام چاوساخەکانی ئەو ناوچەیە

وتیان کە هەڵۆ لەسەر شاخەکە هێلانەی هەیە، لەوانەیە ئەوکاتەی لە شاخەکە سەردەکەوین، فڕینی هەڵۆکان ببینین، چوونکە گریمانی ئەوە دەکرا کە تیری داتس و بەشێك لە لەشکرەکەی لەسەر شاخەکە بن، هێندەی پێویست بوو هێزم لەگەڵ خۆم برد، بە براکەمم وت بۆ ناردنی هێزی یارمەتیدەر ئامادە بێت. پێش ئەوەی خۆم بگەمە شاخەکە، پێشەنگم نارد تا بگەڕێن، ئەوانیش نە تیری داتس و نە لەشکرەکەیان لە داوێنی شاخەکە نەبینی.

وێڕای ئەوەی لە بەرەبەیاندا کەوتمەڕێ و بە خێرایی دەڕۆیشتم، کاتێك گەیشمە دامێنی شاخەکە نیوەڕۆ بوو، ڕێپێشاندەرەکان پێیان وتم ئەگەر لە شاخەکە سەربکەوین، ئەمڕۆ ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ ئۆردووگەکەمان، چوونکە تا لە شاخ سەربکەوین و بێینەوە خوارەوە، شەو رادەکشێت.

وتم تا لە دامێنی شاخ ئۆردووگەیەك دامەزرێنن، چوونکە ڕووبارێك لە دامێنی شاخەکە شۆڕ دەبووەوە نێو ڕووباری ئاراس، وتم ڕەنگە ئۆردووگەکە لە تەنیشت ئەو ڕووبارە بێت، ئەوکات لەگەڵ هەندێ لە سەربازەکانم و ڕێپێشاندەرەکانم لە شاخ سەرکەوتم.

هەوا دڵنشین و دارەکانی دامێنی شاخەکە زۆر بوون، لە هەر شوێنێك دۆڵایی یاخۆ قووڵییەکم دەبینی، سەرم بەرز دەکردەوە و شاخێکی گەورە و بە شکۆم لەبان سەری خۆم تا ئاسمان دەبینی.

کاتم بۆ راوکردن نەبوو، دەبووایە بەر لە رۆژئاوابوون بگەڕێینەوە، بۆیە تا ئەو شوێنەی شاخەکە بە دار داپۆشرا و دارەکان زۆر بوون، رۆیشتم، لەوێ ماوەیەك پشوومدا. کاتێك چاوم لە باشوور دەکرد، ڕووباری ئاراسم لەبەر پێی خۆمدا دەبینی، لە کاتێکدا ڕووبارەکە لە شاخەکە دوور بوو.

لە هەندێ لە شوێنەکانی داوێنی شاخەکە، دووکەڵ بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا، وتیان ئەو دووکەڵانە لەو کورانەوە هەڵدەستن کە بە خەڵووز کار دەکەن، خەڵووزی شاری (ئارماوێر) و گوندەکانی دەوروبەری لەو شاخە ئامادە دەکرا، سووتەمەنی زستانی هەموو ئەو ناوچەیە برێتییە لە خەڵووز، لە بەهار و هاویندا لەو ناوچەیە خەڵووز ئامادە دەکەن و دەیگوازنەوە بۆ شوێنەکانی دیکە.

دوای ئەوەی پشوومدا و حەسامەوە، گەڕامەوە بۆ ئۆردووگەکەمان لە داوێنی شاخ، ئەو شەوە لە کاتی وتووێژ لەگەڵ ئەفسەرەکانم لەبارەی شکۆ و گەورەیی شاخی گەورەی نووح، شتێکم بۆ ئاشکرا بوو کە تا ئەوکات بۆم دەرنەکەوت بوو.

لەنێو قسەکاندا وترا ئەو شتەی بۆتە گەورەتر و بە شکۆتر دەرخستنی شاخی گەورەی نووحە، وا دەکات مرۆڤ دووچاری سەرسووڕمان و ترس بێت، ئەوەیە کە هیچ شاخی دیکەی لە

پەنا نییە، تەنیا شاخی بچووکی نووحی لێیە، ئەویش لە شاخی گەورەی نووح دوورە، بۆیە زۆر بەرز دەردەکەوێت و بە شێوەیەکە کە مرۆڤ ناتوانێت بە یەکیان بپێوێت.

وترا شاخی ئەلبورز (دەماوەند) بەرزترە لەو شاخە، بەڵام وەك ئەو بەرز دەرناکەوێت، چوونکە لە دەوروبەری ئەودا شاخی دیکە دەبینرێت، مرۆڤ دەتوانێت ئەوان پێکەوە پێوانە بکات، بەڵام لە دەوروبەری شاخی گەورەی نووح هیچ شاخێکی دیکەی گەورەی لێ نییە کە بتوانرێت بە یەکدیی بپێورێن و شاخی نووح کەوتووەتە پێدەشتێکی تەخت، بۆیە ئاوا بەرز دەردەکەوێت، مرۆڤ لە بینینی بەرزی ئەو شاخە دووچاری سەرسووڕمان، تەنانەت ترسیش دەبێت.

دوای ئەوەی گەیشتمە نێو شاری ئارماوێر (ئێرەوان) بۆم دەرکەوت کە ئەو شاخە تەنیا لە لای جوولەکەکان پیرۆز نییە، بگرە ئەرمەنییەکانیش رێزی لێ دەگرن، ئەوان دەیانوت یەکەم نەتەوە کە هاتووەتە سەر زەوی نەتەوەی ئەرمەنییەکانە، کە لە داوێنی شاخی نووح ژیاون، ئەرمەنەکانی ئێستە لە نەوەکانی ئەوانن، نەتەوەکانی دیکەش پاشان لە ئەرمەنییەکانەوە هاتوونەتە کایەوە.

بەیانی رۆژی دواتر لە داوێنی شاخ گەڕامەوە و گەیشتمەوە ئۆردووگەی سەرەکیمان لە نێزیك ڕووباری ئاراس. لەوێندەر چوار رۆژی دیکە مامەوە تا ئامراز و پێداویستییە جەنگییەکانم کە لەوبەری ئاراس مابوونەوە بپەڕێندرێنەوە، دوای پەڕاندنەوەیان، فەرمانم کرد تا لەشکرەکەم بەرەو ئارماوێر بکەونەڕێ. ئارماوێر کەوتبۆوە باکوری رۆژهەڵاتی شاخی نووحی گەورە، لەگەڵ ئەو شاخە پەنجا و چوار هەزار گەز (٥٤ کم) مەودای هەبوو.

دەمزانی کە تیری داتسی پاشای ئەرمەن ئاگەدارە لە بوونی ئێمە لە باکوری ڕووباری ئاراس، دەیزانی کە من هاتووم تا ئارماوێر و شارەکانی دیکەی ئەو داگیر بکەم، چوونکە نێردەی منی کوشت بوو، سزای پێویستی دەدەم.

لە دووەمین رۆژی جووڵانم لە کەناری ڕووباری ئاراس، پێشەنگەکانی لەشکرەکەم هەواڵیان پێ دام، کە لە دوورەوە سوپایەك دەبینن، بۆیە کە گەیشتمە یەکەمین شار لەسەر رێگەکە دەتواندرا پێداویستییەکانمی لێ دەستەبەر بکەم، فەرمانی وەستانمدا و وتم تا ئاخووڕ بە سەری ئەسپەکاندا بکەن و سەربازەکان بە شێوەی کاتی پشوو بدەن، تا هەواڵی دیکەمان لەلایەن پێشەنگەکانمانەوە پێ بگات.

جاران پاشای ئەرمەنستان شوێنکەوتووەکانی منی ئازار نەدەدا، پێوەندیی نێوانمان تێك نەچوو بوو، ئاسن و پۆڵای ئەرمەنستان دەهاتە وڵاتەکانی ژێر دەستم بە تایبەتی ئاترۆپاتێن و کارامسین (کرماشان) و گێی، لەو شوێنانەش لە ئاسن و پۆڵا شتی دیکەیان چێ دەکرد،

پیشەوەرەکانی کارامسین لە پۆڵای ئەرمەنستان باشترین شمشێریان چێ دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی پێوەندیمان تێکچوو، تیری داتس ڕێگەی نەدا ئاسن و پۆڵای ئەرمەنستان بگاتە وڵاتەکانی من، بیستم وتبووی ئەگەر ئاسن و پۆڵای ئەرمەنستان بگاتە وڵاتەکانی شاپوور، پیشەوەرەکانی وڵاتەکانی ئەو لە پۆڵا و ئاسنەکان، هەموو جۆرەکانی شمشێرن نێزە، پەیکان، گورز و تەور چێ دەکەن، ئەو چەکانە لە جەنگ لە دژی سەربازەکانی مندا بەکار دێنن، بۆیە ناردنی پۆڵا و ئاسن بۆ وڵاتەکانی شاپوور وەك ئەوە وایە، کە من خۆم سەربازەکانی شاپوور لە دژی خۆم چەکدار بکەم.

منیش لە وڵاتەکانی خۆم بەتایبەتی لە کارمانیا و کاسی (کاشان) هەندێ پیشەوەرم هەیە، کە بەردی ئاسن لە کانەکان دەردێنن، دوای تواندنەوە، پۆڵای لێ چێ دەکەن، بەڵام پۆڵای وڵاتەکانی من وەك هی ئەرمەنستان باش نییە، وەستاکانی ئەرمەنستان بۆ چێکردنی پۆڵا شێوازێکی تایبەتیان هەیە، کە خەڵکی دیکە فێر ناکەن، چوونکە لە ئەرمەنستان ئاسن و پۆڵا زۆر بوو، دوور نییە کە تیری داتس بە لەشکرێکی پڕ چەك کە سەربازەکانی هەموویان زرێیان لەبەر بێت، بێتە جەنگی من، چوونکە ئەو سەربازانەی زرێیان لەبەر بوو کەمتر بریندار دەبوون و دەکوژران، بۆ لەشکر بە سوود بوون، بەڵام یەك خاڵی لاوازیان هەبوو، برێتی بوو لەوەی لەبەر گەرما زوو ماندوو دەبوون، هێندەیان ئارەقە دەکرد کە ناچار بوون کاسکێت لە سەریان بکەنەوە و زرێیەکەیان دوور بخەنەوە، تەنانەت ئەگەر هەوا گەرمیش نەبووایە، سەربازەکان بە هۆی قورسی کاسکێت و زرێیەکانیان زووتر ماندوو دەبوون، بۆیە کاتێك بیستم سەربازەکانی تیری داتس زرێیان لەبەرە، دووچاری ترس نەبووم.

لەشکری تیری داتس لە ئێمە نێزیك کەوتەوە، بەڵام وێستان. پێشەنگەکانم هەواڵیان پێ گەیاندم کە پاشای ئەرمەنستان لە کەناری ڕووبارێك وەستاوە، کە ئێمەش لە کەناری وەستابووین. ئەو ڕووبارە بە چل کانی (چهل چشمە) ناسرابوو، لە ئارماویرەوە دەهات، شاری ئارماویر بە دوو ڕووباری گەورە ئاودێری دەکرا کە یەکیان چل کانی و ئەوی دیکەشیان بە زەنگان (دواتر بە زەنگی) ناسرا بوو، ئەو ڕووبارە بۆ لایەکی دیکە دەڕۆیشت، بەڵام ڕووباری چل کانی بەرەو لای ئێمە دەهات، تیری داتس لە سەرەوەی ئەو ڕووبارە و لە سەرووی ئێمەوە بوو، ئێمەش کەوتبووینە خوارەوە.

هەرکە تیری داتس لە کەناری ڕووبارەکە ئۆردووگەی دامەزراند، من لەگەڵ سەردارەکانم کۆبوومەوە، پێیانم ڕاگەیاند کە پاشای ئەرمەنستان هێندە لە ئێمە نێزیك بووەتەوە و لە

سەرووی ڕووبارەکە ئۆردووگەی دامەزراندووە، لەوانەیە خەیاڵێکی بۆ خۆی هەبێت، ئێوە پێویستە تەواوی ئامراز و پێداویستییەکانی هێرشی لە ناکاو ئامادە بکەن، تا ئەگەر ئەمشەو پەلامارمان بدرێت، بتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین. بە سەربازەکانتان بڵێن بە شێوەیەك بخەون کە ئەگەر تیری داتس پەلاماری داین، بتوانن بە خێرایی خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن و مەشخەڵەکان ئامادە بکەن تا دەست بەجێ دوای هێرشی دوژمن هەڵ بکرێن و سەربازەکانمان دوژمنی خۆیان ببینن.

گالیسکە و سوارەکانی ئێمە دەبێت ئامادە بن، تا لەو کاتەی پەلامار دەدرێین، دەستبەجێ ڕووبەڕوویان ببینەوە، بە دژە پەلامار دەتوانن دوژمن بگەڕێننەوە، چوونکە ئۆردووگەی دوژمن لە سەرەوەی ئێمەیە، پێویستە ئاگەدار بن کە ئاوەکە ژەهراوی نەکرێت و سەربازەکانمان دووچاری نەخۆشی نەبن.

هەر کە رۆژئاوا بوو، هەرچەندە وەرزی گەرما بوو، بەڵام هەوا سارد بوو، چوونکە لەو ناوچەیە دەوەنی زۆری لێ بوون، سەربازەکانمان ئاگریان کردەوە، ئێمەش لە دوورەوە ئاگری ئۆردووگەی دوژمنمان دەبینی، لە دەوروبەری ئۆردووگەکەمان پاسەوانی زۆرمان دانا، من پێشبینیم دەکرد ئەگەر تیری داتس بیەوێت پەلامارمان بدات، ئەو کارە بە سوارەکانی دەکات، ئەوکاتەی بیر دەکاتەوە کە ئێمە لە خەوداین و ئاگامان لە دەوروبەرمان نییە، هێرش دەکات، هەر وەهاش بوو، تیری داتس بە سوارەکانییەوە هێرشی کرد، بەڵام ئێمە بۆ ئەو هێرشە خۆمان ئامادە کردبوو، نەپەشۆکاین، هەر کە کەڕنای ئاگەدارکردنەوەی لەشکرەکەمان لێدرا، من کە بە جلوبەرگەوە لە خێوەتەکەم راکشابووم، هاتمەدەر و سواری ئەسپەکەم بووم، بەڵام شوێنی خۆمم بەجێ نەهێشت تا سەردارەکانم بۆ گەیاندنی راپۆرت و وەرگرتنی فەرمان بتوانن بێنە لام.

تیری داتس لە دوو لاوە هێرشی بۆ ئێمە کردبوو، دەستەیەك لە سەدارەکانی لە باکور، دەستەیەکیش لە رۆژهەڵات هاتبوون، هەر کە هێرشی ئەوان دەستی پێکرد، گالیسکەکانی من کە لە رۆژئاوا بوون بەرەو دوژمن واتە رۆژهەڵات رۆیشتن. بەپێی زانیاریی من دامەزراوەی سوپای تیری داتس وەك دامەزراوەی لژیۆنی رۆمەکان بوو، تەنانەت ناوی پلەی جیاوازەکانی ئەفسەرەکانیش ناوی رۆمی بوون، فەرماندەی سەد سەرباز بە ناوی رۆمی (سێنتۆریۆن) فەرماندەی یەك لژیۆن لەگاتە، بەڵام کەرەستەی جەنگی سەربازەکانی تیری داتس باشتر بوو لە هی رۆمەکان، هەموویان کاسکێت و زرێیان هەبوو.

دەمزانی هەرچەندە سەربازەکانی تیری داتس کاسکێت و زرێیان لەبەرە، بەڵام خاڵی لاوازیان هەیە کە برێتییە لە قاچەکانیان کە بێ پارێزە، سەربازەکانی من دەیانزانی کاتێك لەگەڵ سەربازەکانی تیری داتس ڕووبەڕوو دەبنەوە، پێویستە بە گورز لەنێویان ببەن یاخۆ قاچیان بە گورز یان شمشێر بە شێوەیەك بریندار بکەن کە توانای بەردەوام بوونی جەنگیان نەبێت.

لەنێو سەربازەکانمدا هەندێکیان خەڵکی باختەر بوون، لە کەمەند هاوێژی زۆر شارەزا بوون، کاتێك کەمەندیان بۆ یەکێك هەڵدەدا، دەیان خستە نێو کەمەندکەوە، رزگاربوونی نەبوو، تەنانەت ئەگەر شمشێریشی لە دەستدا بووایە و هەوڵیدابووایە بە شمشێر بەنەکە ببسێنێت. ئەگەر بازنەی پەتی کەمەندەکە کەوتبایە سەر گەرووی کەسەکە، هێندە توند دەبوو کە توانای هەناسەدانی لێ دەستاند و بێ هۆش دەبوو، دوای ئەوە کەمەند هاوێژەکە دەیتوانی دیلی بکات یاخۆ بیکوژێت.

ئەگەر بازنەی کەمەند لە سینگ یان کەمەری بئالآیە و ئەو کەسەش هەوڵی بۆ خۆرزگارکردنی دابووایە، نەیدەتوانی بە شمشێر کەمەندەکە بپسێنێت، چوونکە لە باختەر پەتەکەیان بە دەزووەکانی لۆکە و مس دروست دەکرد، ئەو جۆرە دەزووانە رێگر دەبوون لە پسانی پەتەکە بە شمشێر، تەنیا ئەگەر دوو یاخۆ سێ زەربەی شمشێر لە یەك شوێنی پەتەکە درابووایە تا بپسێت.

وتم کە گالیسکەکانم بەرەو رۆژهەڵات رۆیشتن، هەرچەند مەشخەڵیان هەبوو، دایان گیرساند تا گۆڕەپانی جەنگ ڕووناك ببێت و سەربازانی دوژمن و خۆمان لە یەك دیار بن. هەرچەندە جلوبەرگی سەربازەکانی من و تیری داتس جیاواز بوون، لە لایەکی دیکە سەربازەکانی ئەو وەك رۆمەکان ریش و سمێڵیان دەتاشی، دوور بوو لێك بچن، ڕووناکی مەشخەڵەکانیش یارمەتیدەر بوو لەو بارەوە.

بە زوویی دەرکەوت تیری داتس پێشبینی کردبوو کە لەوانەیە گالیسکە جەنگییەکانم لە دژی بەکاربێنم، چوونکە کاتێك گالیسکەکانمان لە رۆژهەڵات گەیشتنە سەربازەکانی تیری داتس، ئەوان تەواوی کەرەستە پێویستەکان بۆ جەنگی گالیسکەکانیان پێ بوو.

سوپای پاشای ئەرمەنستان خاوەنی مەنجەنیقی بچووك و تیژڕۆ بوون، ئەوانیان لە بەرانبەر پیادەکانمان خستەکار، کاتێك گالیسکەکانمان نێزیك کەوتنەوە، بەردیان بەسەر گالیسکە و سەرنشینەکانیاندا باراند.

دوای ئەوەی گالیسکەکانمان وێڕای زیانی زۆر توانیان خۆیان بگەیەننە مەنجەنیقەکانی ئەوان و پەکیان بخەن، ڕووبەڕووی نێزە درێژەکانی سەربازەکانی تیری داتس ببنەوە کە زرێیان لەبەر بوو، ئەوان بەو نێزانە ورگی ئەسپەکانیان دەدڕاند و گالیسکەکانیان دەوەستاند.

لە باکوری ئۆردووگەکەمدا جەنگێکی توند لە نێوان سەربازەکانی من و سەربازە هێرشبەرەکاندا هەبوو، سەربازەکانی تیری داتس لەو بەشەدا هەوڵیان دەدا بەرەو نێو ئۆردووگەکەم پێشڕەوی بکەن.

تا ئەوکات تەنیا سەربازە پیادەکانی تیری داتس لەگەڵ ئێمە لە جەنگدا بوون، سوارەکانیان دیار نەبوون، منیش نەمدەتوانی بزانم کە ئەوان سواریان هەیە یاخۆ نیانە. ئەو راپۆرتانەی لە بارودۆخی گالیسکەکانمان لە رۆژهەڵات و دۆخی سەربازە پیادەکانمان لە باکور دەگەیشت، نیشانی دەدا کە دۆخەکە بۆ ئێمە بەرەو سەختی دەڕوات.

بە رادەیەك بارودۆخی جەنگم بە توند دەهاتە بەرچاو کە وتم: "ئەس شەم و هۆ"[(١)] (واتە خوداوەند پەنا دەبەمە بەر تۆ)، دواتر وتم: "ئەی خوداوەندی مەزن ماوەیەکە من بیر دەکەمەوە کە لە دوورگەی لیان، ڕوو لە دەریای گەورەی فارس، شارێك بە ناوی بابم چێ بکەم، لەوێندەر ئاگرخانەیەك چێ بکەم تا خوداوەندپەرستانی کەنارەکانی دەریای فارس ناوەندی پەرستگەیەکیان بۆ تکا و نزا هەبێت، ئەگەر ئەمشەو من بەسەر دوژمندا زاڵ ببم، بە زوویی ئەو شارە بینا دەکەم و پەرستگەیەکی گەورە و بە شکۆی تێدا دادەمەزرێنم و شارەکە بە ناوی بابم (رۆ ئەردەشێر) دەکەم.[(٢)]

هێشتا ماوەیەك لە نزا و ئەو نیازەی لە دڵم گرتبوو، تێنەپەڕی بوو کە سەربازێکی من ئەو سەربازەی بە کەمەند گرتبووی، هێنایە لام و وتی ئەی خەسرەو ئەو پیاوە لە ئەفسەرەکانی دوژمنە، دەمتوانی بیکوژم، بەڵام بە باشترم زانی ئەو بهێنمە لای پاشا تا زانیاریی لێ وەربگرێت.

---

(١) ئەس شەم و هۆ، نزای مەزداپەرەستە کۆنەکان بوو، بەو نزایە داوای یارمەتی و بەزەییان لە یەزدان دەکرد. "زەبیحوڵڵا"

(٢) نیمچە دوورگەی لیان ئەو شوێنەیە کە ئێستە بە نیمچە دورگەی بوشەهر دەناسرێت (رو ئەردەشێر) دواتر بە هۆی زۆری بەکارهێنان، سوا و بوو بە (ری شەهر)، بە لێکدانەوەیەکی دیکە بوشەهر هەمان ری شەهرە، بەڵام لەم بارەوە پێویستە ورد بین و چاوەڕوان بین تا لێکۆڵینەوەی چەند رۆژهەڵاتناسێکی ئەورووپایی لەبارەی سەرچاوەی ئەو ناوە دەرکەوێت. خوا مامۆستاکەم ببەخشێت کە دەیووت: بوشەهر لە بنەڕەتدا ئەبو شەهر واتە باوکی شارەکان بووە، دواتر بۆ ئاسانترکردنی خوێندنەوە (ئەلف) کەوتووە و بۆتە بۆشەهر. "زەبیحوڵڵا"

ئەو دیلە کە هێشتا بە کەمەند بەسترابۆوە، کاسکێتی لەسەر و زرێی لەبەر بوو، بەڵام لە کالانەکەیدا شمشێری تێدا نەبوو، سەربازەکەی سوپای من ئەوی چەك کردبوو. لە کاسکێت و زرێیە گرانبەهاکەی دەردەکەوت کە ئەفسەرە و لێم پرسی: ئایا زمانی رۆمی دەزانی؟.

ئەو وتی: بەڵێ.

پرسیارم کرد ناوت چییە. لە وەڵامدا وتی: ئەرداواتز.

پرسیارم کرد کە پلەی لە سوپای تیری داتسدا چییە.

وەڵامی دایەوە کە سێنتۆریۆنە، ئەو سەربازەی ئەوی دیل کرد بوو، پرسیارم کرد ناوی تۆ چییە؟

وتی ناوم (ئەردەوانە). پێنج لیرەی زێڕم دایە و وتم ئەو برە زێڕە پاداشتی تۆیە، دوای جەنگیش پاداشتی دیکە وەردەگری.

بەو ئەفسەرانەم وت کە لەگەڵمدا بوون تا ناوی لە ریزی ئەو کەسانە بنووسن کە پلەیان بەرز دەکرێتەوە.

دوای ئەوەی ئەردەوان پاداشتی وەرگرت، دەرفەتمدا تا بڕوات و بگەڕێتەوە نێو جەنگ، ئەو وتی ئەی خەسرەو ئایا دەتوانم کەمەندی خۆم بکەمەوە، چوونکە ئەمشەو دیسان پێویستم بەو کەمەندە دەبێت.

وتم: کەمەندەکەت بکەوە و برۆ دیسان هەوڵ بدە تا سێنتریۆنەکی دیکە بگری.

دوای ئەوەی کەمەندەکەیان کردەوە، ئەردەوان رۆیشت، بە ئەرداوارتزم وت: هەرچەندە جەنگ بەردەوامە و دەستەکانی تۆ کراوەیە، بەڵام فەرمان ناکەم دەستەکانت ببەسترێتەوە، چوونکە تۆ ئەفسەری و چاوەڕوانم کە تۆش رێزی پلەکەت بپارێزی، کارێك نەکەی کە دەست و قاچەکانت ببەستنەوە.

ئەرداواتز وتی: من دیلم و دەزانم ئەگەر دیل بەرگری بکات، دەکوژرێت.

پرسیارم کرد: پاشاکەت چەند سەربازی هەیە، چەندیان پیادە و چەندیان سوارەن؟.

ئەرداواتز وتی: ئەی خەسرەو، بیستوومە کە یەکێك لە وتەکانت ئەوەیە کە لەگەڵ ئەفسەرەکاندا نابێت بە شێوەیەك هەڵسوکەوت بکرێت کە پێچەوانەی کەسایەتیی ئەوان بێت، بۆیە دوای ئەوەی ئیمپراتۆری رۆمت کوشت، ئەفسەرەکانیت دیل کرد، ئەوانت ناچار بە کاری زۆرەملێ نەکرد.

وتم: بۆیە ئەوانم نەخستە ناو کاری زۆرەملێ، چوونکە دەمزانی ئەوان خۆیان دەکرنەوە تا ئازاد بن، ئەو پرسیارەی لە تۆی دەکەم، هەر ئەو پرسیارەیە کە لە هەموو دیلێك دەکرێت.

ئەرداواتز وتی: من لە ژمارەی سەربازەکانی پاشای خۆم ئاگەدار نیم، بەڵام دەزانم کە لەشکری سوارەی نییە. ئەو وتەیەم پەسەند کرد، چوونکە دەمزانی دامەزراوەی سوپای تیری داتس لەسەر بنەمای دامەزراوەی لژیۆنی رۆمەکان دامەزراوە، رۆمەکان سەربازی پیادەیان لا باشترە لە سەربازی سوارە، ئەویان تەنیا لەلا وەك جوانکارییە.

لە ئەرداواتزم پرسی: پاشاکەتان ئێستە لە کوێیە؟.

ئەو بە دەست لای رۆژهەڵاتی نیشاندا و وتی: کاتێك من بۆ جەنگ بەرێ کەوتم، ئەو لە ئەوێ بوو، ئێستە نازانم لە کوێیە؟.

فەرمانم کرد تا ئەفسەرە دیلەکەیان برد، زۆرم حەز دەکرد خۆم لە جەنگدا بەشداری بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی دۆخی ئێمە باش نەبوو، فەرماندەیی من باشتر بوو، لە بەشداربوونی راستەوخۆم لە جەنگ، بۆیە لە باشووری ئۆردووگە مامەوە، بەڵام سوارەکانم راسپارد تا هێرش بکەن بۆ لای رۆژئاوا، هەر چۆنێك بێت بە یارمەتیی پیادەکان دوژمن لە باکور بشکێنن و خۆیان بگەیەننە گالیسکە جەنگییەکان، چوونکە سەربازەکانی دوژمن کاسکێتیان لەسەرە و زرێیان لەبەر بوو، ئامۆژگاری سوارەکانمان کردن تا لە جیاتی شمشێر، بە گورز لە سەربازەکانی دوژمن بدەن و بیانخەنە سەر زەوی. تا ئەوکات نیشانەی ماندوویەتیی لە سەربازەکانی دوژمن نەدەبینرا، فێنکی هەوای شەو نەیدەهێشت سەربازەکانی تیری داتس لەنێو بەرگە ئاسنینەکانیاندا هێندە ماندوو بن کە نەتوانن بەردەوام بن لە جەنگ یاخۆ بۆ بەردەوامبوونیان، ناچار بن جلوبەرگەکانیان فرێ بدەن.

فێنك بوونی هەوای شەو بۆ سەربازە پیادەکانی ئێمەش بە سوود بوو، رێگر دەبوو لە ماندووبوونی ئەوانیش، بەڵام ئەگەر جەنگ درێژەی کێشابایە لە دوای بەرەبەیان و هەڵکشانی هەتاو، بە دڵنیاییەوە سەربازەکانی تیری داتس بە گەرمای هەتاو دەکەوتنە ئازارەوە و ناچار دەبوون بەرگە ئاسنینەکانیان دوور بخەنەوە، بۆم دەرکەوتبوو کە لەو ناوچەیە لەکاتی شەودا هەوا زوو فێنك دەبێت، بە رۆژیش دوای هەڵکشانی هەتاو، زوو گەرم دەبێت.

ئەستێرەی بەیان دەرکەوت، هیچ داشکانێك لە هێرشی تیری داتس دەرنەکەوتبوو، ئەوکات من پتر لە هەزار ئەسپ سوار و پاسەوانی تایبەتم نەمابوو، هەموو گالیسکە و پیادە و سوارەکانم سەرگەرمی جەنگ بوون، لە رۆژهەڵات و باکور دەنگی گۆرەپانی جەنگ بەرگوێ دەکەوت.

بێ ئەوەی هیچ راپۆرتێکم بۆ هاتبێت لە سەرەتای رۆژهەڵاتدا بۆم دەرکەوت کە لە باکور بە هۆی ئەوەی سوارەکانم چوونە نێو جەنگ، تەرازووی جەنگ بە سوودی من تا رادەیەك جووڵا،

چوونکە هات و هاواری سەربازە ئەرمەنییەکان لە باکور کەم بۆوە و هات و هاواری سەربازەکانی من ڕوو لە هەڵکشان بوون، بیستم سەربازەکانم لە باکور هاواریان دەکرد (ئەسشەم و هو). کەمبوونەوەی دەنگی سەربازەکانی ئەرمەن، نیشاندەری ئەوە بوو کە سوارەکانی من بە هاوکاری پیادەکانم، ئەوانیان شکاندووە و ناچار بە پاشەکشەیان کردوون.

لە لای ڕۆژهەڵات هێشتا هاواری سەربازەکانی تیری داتس (تیردادی سێیەم) دەهاتەبەر گوێ، بۆ ئەوەی هێزی بەرگریی ئەوان لە ڕۆژهەڵات کەم بکەمەوە، ئەو هەزار سوارەی کە لەگەڵ مندا بوون بۆ یارمەتی ئەوانم نارد، دوای ئەوە جگە لە پاسەوانە تایبەتەکانم لە لای من کەس نەمابوو، بەڵام دەمزانی سەربازەکانی تیری داتس ناتوانن خۆیان بگەیەننە ئەو شوێنەی منی لێم، چوونکە بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بە من دەگەیشتن، دەردەکەوت توانای سەربازەکانی تیری داتس هێندە نییە، کە بتوانن خۆیان بگەیەننە لای من کە لە باشوور بووم.

هەزار سوارەکەی من کاتێك گەیشتنە ڕۆژهەڵات، بە یارمەتی گالیسکەکان هێرشیان کردە سەر پیادە ماندووەکانی تیری داتس، ئەو هێرشە لەسەر ئەوان کاریگەریی هەبوو، کاتێك هەتاو دەرکەوت، چیدیی نەیانتوانی لە شەڕکردن بەردەوام بن و پاشەکشەیان کرد. هەرچەندە گالیسکەکانم ماندوو بوون، بەڵام ئەو گالیسکە و سوارانەم کە توانایان مابوو بە براکەمم سپارد، تا بە دووی تیری داتس بکەون و نەهێڵن دەرفەتی کۆکردنەوەی لەشکری دیکەی هەبێت.

جەنگی سەربازانی تیری داتس دەریخست کە ئەوان پیاوانێکی خۆڕاگر و ئازان، ئەو شەوە و دواتر لە بەرەبەیاندا، ئەگەر باڵادەستی گالیسکە و سوارەکانم نەبوونایە، توانای شکاندنەوەی هێرشی ئەوانم نەدەبوو، جگە لە ئەوەش بەرگە ئاسنینەکانیان ئەوانی ماندوو کردبوو، لەوانە بوو ئەوان توانیبایان باشتر بجەنگن.

بە براکەمم وت ڕێگە نەدات تیری داتس لەشکرە شکاوەکەی خۆی کە لە پاشەکشەدایە، ڕێك بخاتەوە و بەهێزی بکاتەوە، بۆیە هەوڵ دەدەم تا نیوەڕۆ کاروباری ڕێکخستنەوەی لەشکرەکەم کۆتایی بێت، ئەوکات لەگەڵ پیادەکانم بۆ یارمەتی ئێوە دێم.

بە پچڕانی هێڵی پێوەندیی سەربازەکانی پاشای ئەرمەنستان و پیادەکانی من لە گۆڕەپانی جەنگدا، فەرمانم کرد تا خواردن بدەنە سەربازە پیادەکانم و دەرفەتی پشوویان پێ بدەن. شەوی پێشتر ئەوان نەیان توانی بوو بخەون، بە ئەفسەرەکانم وت تا ئاگەداریان بکەنەوە کە دەتوانن تا

نیوەڕۆ بخەون، بزانن کە دوای نیوەڕۆ دەکەوینەڕێ، بۆیە پێویستە خۆیان لە کارە لاوەکییەکان بپارێزن و بخەون.

هەندێ لە پیادەکانیش کە راسپێردرابوون بۆ ناشتنی کوژراوەکان و گواستنەوەی بریندارەکان، لەو شوێنە دەمانەوە تا بە کارەکانیان رابگەن، لە کاتی مانەوەیان لە کەناری ڕووباری چل کانی، هیچ مەترسیان لەسەر نەبوو، چوونکە لەشکری تیری داتس کە ئەو شوێنەی بەجێ هێشتبوو نەدەگەڕایەوە بۆ ئەوێ تا سەربازەکانی من کە بۆ ناشتنی مردووەکان و گواستنەوەی بریندارەکان مابوونەوە، بکەونە مەترسی.

سەربازەکانی تیری داتس تەرمەکانی خۆیان لە گۆڕەپانی جەنگ بەجێ هێشت، چوونکە سەربازەکانی من ماوەی چەند رۆژ بۆ کاری ناشتنی کوژراوەکانی خۆمان دەمانەوە، وتم تا کوژراوەکانی دوژمنیش بنێژن بۆ ئەوەی سەربازەکانی من دووچاری نەخۆشی تا و تاعوون نەبن، بەهۆی بۆگونبوونی لاشەکانەوە.

کاتی نیوەڕۆ دوای ئەوەی سەربازە پیادەکانم لە خەو هەستان، فەرمانم کرد ئۆردووگەکەمان کۆبکەنەوە، جگە لەو کەسانەی دەبووایە لەوێ بمێننەوە، ئەوانی دیکە بە فەرماندەیی من بەرەو ئارماوێر کەوتنەڕێ، چوونکە دەمزانی گالیسکە و سوارەکانی من لەوێندەر سەرگەرمی جەنگن بۆ داگیرکردنی شارەکە، بەڵام کاتێك لە شارەکە نێزیك بوومەوە، براکەم وەڵامی نارد کە تیری داتس هەڵاتووە و شار هیچ بەرگریکاری نییە، ژمارەیەکیش لە کەسایەتییەکانی شارەکە هاتوون تا بەرفەرمانی خۆیان دەربڕن و بڵێن کە نایانەوێت بجەنگن. وەڵامم بۆ براکەم نارد کە نابێت هیچ کەس لە خەڵکی ئەوێ دەستدرێژی بکرێتەسەر، لە ئەمڕۆ بە دواوە، ئەوان بە شوێنکەوتووی من هەژمار دەکرێن.

لە بەرەبەیانی رۆژی دواتر، پێش ئەوەی بچمە ناو شاری ئارماوێر (ئێرەوان)، کەسایەتییەکانی ئەو شارەم بینی، چوونکە هەندێ لە ئەوان دەیانزانی بە رۆمی بدوێن، بە ئەوانم وت من نەمدەویست لەگەڵ تیری داتس بجەنگم، ئەو منی ناچار کرد بۆ ئەو کارە، ئەو هەڵسووکەوتی لەگەڵ شوێنکەوتووانی من خراپ بوو، نێردراوی منی کوشت و منی ناچار کرد تا لەشکرکێشیی بکەم بۆ ئێرە، چوونکە من ئەو شارەم داگیرکردووە، لەمەودوا ئێوە دانیشتووانی ئەو شارە پێویستە خۆتان بە شوێنکەوتووی من بزانن، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و وتیان ئێمە ئەمڕۆ خۆمان لە شوێنکەوتووەکانی تۆ دەزانین، ئەی خەسرەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانت دەبین.

لە رۆژی سێیەمی گەیشتنم بە ئارماوێر، هەواڵم پێگەیشت کە تیری داتس سەربازەکانی خۆی دەرفەتداوە تا بلاوبن و بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان، تەنیا ژمارەیەکی کەمی لەگەڵ خۆیدا هێشتووەتەوە و رۆیشتووە بۆ لای رۆمەکان تا پەنایان بباتەبەر. هەر هەمان رۆژ هەواڵم پێ گەیشت کە (هەپتاڵ) لە باکورەوە نێزیك دەبنەوە و مەبەستیان هاتن نییە بۆ ئەرمەنستان و دەیانەوێت بچنە ولاتە باشوورییەکان.

لە سەردەمی باوکم و پێشتر، هەرکاتێك هەپتاڵەکان هێرشیان دەکرد، دوای پەڕینەوە لە رووباری کوروش دەگەیشتنە رووباری ئاراس و لەسەر پردی کوروش دەپەڕینەوە و دەگەیشتنە ئاترۆپاتێن، لە رابردوودا کەمتر روویدا بوو کە ئەوان هێرش بکەنەسەر ئەرمەنستان.

ئەوان خەڵکانێکی بیابانشین بوون، لە ناوچەکانی باکوری رۆژهەلاتی دەریای کاسپین دەژیان، ژیانی ئەوان جگە لە هێرشکردن بۆ سەر ولاتانی دیکە، لە رێگەی بەخێوکردنی ئەسپ و ماین بەڕێوە دەبرا. چوونکە لە منداڵییەوە سواری ئەسپ دەبوون، قاچەکانیان بە شێوەی سرووشتی کەمێك دەچەمایەوە، دوای ئەوەی گەورە دەبوون، توانایان نەبوو وەك خەڵکی دیکە بە ئاسایی بڕۆن، بەلەکە چەماوەکانی قاچەکانیان رێگر دەبوون لە رۆیشتنی ئاسایی و راکردنی ئەوان، بەلام لەسەر پشتی ئەسپ زۆر ئاسوودە بوون، ئەگەر ئەسپەکانیان ماندوو نەبووبان، دەیانتوانی لەسەر پشتی ئەوان بخەون و نان بخۆن. خواردنی ئەوان شیر و ماست و کەشکی ماین بوو، خواردنە باشەکەیان بریتی بوو لە گۆشتی ئەسپ و ماین، کاتێك ئەسپ یاخۆ ماینەکانیان پیر دەبوون، دەیانزانی دەمرن، بۆ خواردنی خۆیان سەریان دەبڕین، چوونکە ئەوان کەڵکی زۆریان لە ماین وەردەگرت، سەرەڕای خواردنی شیری ئەو ئاژەڵە، سوودمەند دەبوون لەو رۆنە کەرانەی کە لە شیرەکەی دەمایەوە.

هەپتاڵەکان لە کۆمەڵێك تیرە پێکدەهاتن، هەر تیرەیەك ناوی خۆی هەبوو، هەرچەندە ئەوان بەقەد گۆتەکان دڕندە نەبوون، بەلام کاتێك هێرشیان بۆ ولاتێك دەکرد لە ولاتەکەدا ئاوەدانی نەدەما، تەنیا ئەگەر خەڵکێك بیاتوانیبایە هەڵبێن.

کاتێك بیانەوێت هێرش بۆ رۆژهەلات بکەن، ناوچەی خارەزم یاخۆ پارتیا (خوراسان) یان هێرکانیا (گۆرگان) دەخەنە بەر تالان و کوشتار، ئەگەر بەرەو رۆژئاوا بکەونەڕێ، دێنە نێو قەوقازیا، ئەگەر بەرەو باشوور بچنە پێش، پتر ئاترۆپاتێن دەخەنە بەر تالان و کوشتار، کەمتر وابوو کە هێرش بکەنە سەر ئەرمەنستان. ئەوان بۆ گەیشتن بە ئاترۆپاتێن، دەبووایە لە بەربەستی کوروش بپەڕنەوە و هیچ رێگەیەکی دیکەیان بۆ ئەو کارە نییە.

من بۆ ئەوەی پێش بە هێرشی هەپتاڵەکان بگرم دەسەڵاتیی ئەرمەنستانم بە براکەم سپارد و هێزی پێویستم بۆ بەجێ هێشت تا ئەگەر تیری داتس گەڕایەوە، بتوانێت دەستگیری بکات یاخۆ دەری بکات، لەگەڵ بەشەکەی دیکەی لەشکرەکەم بەرەو بەربەستی کوروش کەوتمەڕێ، داوام لە هەریەکە لە ولاتەکانی (شەکی، شەماخی و شێروان) کە لەژێر دەسەڵاتیی من بوون کرد تا یارمەتیم بدەن، دەمزانی ئەوان نایانەوێت بکەونە بەر هێرشی هەپتاڵەکان، ئەوان بە ئارەزووی خۆیان بە سەربازەکانیانەوە پێوەست بوون بە لەشکرەکەمەوە.

بەربەستی کوروش بە هۆی ئەوەی لە رابردوو کەس گرینگی پێنەدابوو، لە هەندێ شوێنەوە ڕووخابوو، نەیدەتوانی رێگە لە هێرشی هەپتاڵەکان بگرێت. بڕیارمدا ئەو بەربەستە نۆژەن بکەمەوە، بەڵام لەو کاتەدا هەپتاڵەکان بەرێوە بوون بۆ تالان و کوشتن، ئەو دەرفەتەم نەدەبوو، وێڕای ئەوەش فەرمانم کرد کەرەستەی پێویست ئامادە بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن زووتر ئەو بەربەستە نۆژەن بکەنەوە، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا هەپتاڵەکان نەتوانن لەو بەربەستە نیمچە وێرانە بپەڕنەوە و ولاتەکانی من بخەنە بەر تالان و کوشتار.

بە هۆی وێرانبوونی هەندێ لە بەشەکانی بەربەستی کوروش کە کاتی خۆی ئەویش بۆ رێگرتن لە هێرشی نەتەوە بیابانشینەکان بینای کردبوو، هەپتاڵەکان دەیانتوانی لە نێوان (باد کووبە) لە کەناری دەریای کاسپین تا (شەماخی) لە هەندێ شوێنی ئەو بەربەستە بپەڕنەوە، بۆیە بڕیارمدا دیوارێکی بەرگری لە سەربازەکانی خۆم و سەربازەکانی پاشا خۆجێیەکانی ئەوێ، پێك بهێنم کە لایەکی لە بادکوبە و لاکەی دیکەی لە شەماخی بوو.

هێڵی بەرگریی من لە شەماخی بە شاخێکەوە پێوەست بوو، کە هەپتاڵەکان نەیاندەتوانی لێی بپەڕنەوە و خۆیان بگەیەننە باشوور، بۆیە کوروش بە پێویستی نەزانی بەربەستەکە لە لای شەماخی بەرەو رۆژئاوا بکات.

بۆ دامەزراندنی هێڵە بەرگرییەکە، چوومە بادکوبە و ئاگرخانەی مەزدا پەرەستەکانی ئەوێم بینی، ئەو رۆژە بینیم کە پۆلو ناخەنە ناو ئاگرخانەکە، بگرە ئاگر لەنێو زەوییەوە دێتەدەر و هەرگیز ناکوژێتەوە.

مووغەکانی ئەو ئاگرخانەیە پێیان وتم ئەو ئاگرە نیشانەی ڕووناکی مەزدایە، بۆیە هیچ کات ناکوژێتەوە. من زۆر کەوتمە ژێر کاریگەریی ئەو ڕووناکی و ئاگرە هەمیشەییە، سوپاسی مەزدای گەورەم کرد کە سەرکەوتووی کردم بە سەر تیری داتسدا و ئەو شکستی لە من خوارد.

داوام لێ کرد کە بە سەر هەپتالّەکانیشدا سەرم بخات و بتوانم بە شێوەیەك دەمیان بشکێنم کە جارێکی دیکە نەوێرن هێرش بکەن بۆ وڵاتەکانی ژێر دەستی من.

لە بادکووبە گەڕامەوە، ئامادە بووم بۆ رێگرتن لە هێرشی هەپتالّەکان، ئەوان چەند جارێك هەولّیاندا لە بەربەستی کوروش بپەڕنەوە و خۆیان بگەیەننە باشووری بەربەستەکە، بەلاّم بەهۆی ئەوەی سوپای من رێگری دەکردن، نەیانتوانی، بەلاّم نەشگەڕانەوە. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە هەپتالّەکان برێتین لە سەد هەزار سوار، ئەوان ئەگەر بشتوانن خۆراکی سەد هەزار کەس دابین بکەن، ناتوانن ئالیکی سەد هەزار ئەسپ دابین بکەن.

دەسەلاّتدارانی ناوچەکە دەیانگوت ئەگەر ئێمە تا وەرزی زستان رێگە لە پەڕینەوەی ئەوان بگرین، دوای ئەوەی وەرزی سەرما هات، ئەوان دەگەڕێنەوە، چوونکە ناتوانن بەرگەی سەرمای سەختی زستانی ئەو شوێنانە بگرن.

وتم: ئەوان ئەگەر ئەمسالّ نەتوانن لەو ناوچانە کوشتار و تالاّن بکەن، لە بەهاری سالّی داهاتوو دێنەوە، نۆژەن کردنەوەی بەربەستەکەش تا بەهار کۆتایی نایەت تا بە رێگەی بەربەستەکەوە رێگەیان لێ بگرین، بۆیە ئەمسالّ کە لێرەم پێویستە بە شێوەیەك ئەوان تەنبێ بکەم کە جارێکی دیکە نەوێرن هێرش بکەنە سەر وڵاتەکانی (ئەلّبانیا، ئیبیریا و ئاترۆپاتێن).[٣]

ئەوان وتیان: ئەی خەسرەو هەرکە بتەوێت هێرش بکەیە سەر ئەوان، هەلّدێن و دەڕون و ناوەستن تا تۆ ئەوان لەنێو ببەی.

وتم: من وادەکەم کە ئەوان توانای هەلاّتنیان نەبێت. دواتر فەرمانم کرد هەموو ئەو کەشتییانەی لە کەنارە رۆژئاواییەکانی کاسپیەنن لە باد کووبە[٤] کۆ بکەنەوە، ئەوکات دەسەلاّتدارانی ئەوێ تێگەیشتن کە من دەمەوێت سوپای خۆم بە کەشتیی لە رێگەی دەریای ڕەش بگوازمەوە بۆ پشت ئەوان تا رێگەی هەلاّتن و گەڕانەوەی ئەوان دوابخەم، ئەوان بە

---

(٣) لە کۆندا ناوچەکانی (شێروان، بادکوبە و داغستان) بە ئەلبانیا دەناسران و ناوچەکانی (شەکی و گورجستان) بە ئیبیریا ناسرابوون. "زەبیحوللّا"

(٤) بادکوبە لە کۆندا بە ئالبانۆ ناسرابوو و پایتەختی وڵاتی ئالبانیا بوو. "زەبیحوللّا"

شێوەیەك سزا بدەم كە چیدیكە نەوێرن هێرش بكەنە سەر ئەو وڵاتانەی لە باشووری شاخەكانی مووشیك و كولاشیكن.(٥)

بە خێرایی كەشتییەكان ئامادە كران، من بەشێك لە لەشكرەكەمم گواستەوە بۆ نێو كەشتییەكان، چوونكە رێگە نێزیك بوو، لەو وەرزەدا دەریای كاسپێن ئارام بوو، دەمزانی كە هیچ ڕووداوێكی نەخوازراو ڕوونادات، ئەگەر لە وەرزێكی دیكەدا سەربازەكانم لە رێگەی دەریاوە بردبایە، بە تایبەتی ئەگەر رێگە درێژ بووایە، هەموویان نەخۆش دەكەوتن، بەڵام لەو وەرزەدا دەریا ئارام بوو، دەمزانی دوای سێ شەو و رۆژان دەگەینە شوێنێك كە دەتوانین سەربازەكانمان پیادە بكەین.

بەروارێكم بۆ پاشا و میر و سەردارەكانی خۆم دیار كرد، تا لەو بەروارەدا لە باشوورەوە هێرش بكەنە سەر هەپتاڵەكان، منیش لە باكورەوە هێرشیان دەكەمە سەر، چوونكە گواستنەوەی گالیسكە جەنگییەكان بە هۆی كەشتیی كارێكی سەخت بوو، من نەمتوانی ژمارەیەكی زۆر لەگەڵ خۆمدا ببەم و بیانگوازمەوە بۆ وشكانییەكانی ئەلبانیا.

ئەگەر توانیبام ژمارەیەكی زۆر لە گالیسكەكان ببەم و لە پشت هەپتاڵەكان لە وشكی دایانبەزێنم، یەك كەس لە هەپتاڵەكان بە زیندوویی نەدەمان و هەموویان دەكوژران، بەڵام چوونكە ژمارەی گالیسكەكان كەمبوون، كاتێك هێرشمان كردە سەریان، بەشێك لە هەپتاڵەكان كە سواری ئەسپ بوون توانیان رابكەن.

وێڕای ئەوەش چوونكە لە دوو لاوە لێماندان، سوپای من لە باشووریش هێرشی كردە سەریان، زۆرینەی هەپتاڵەكان بەهۆی هێرشی گالیسكەكانی من و نێزە و تەور و گورزی ئەو سەربازانەی لە باشوورەوە هێرشیان كردبوو، كوژران لەوانەیە دە یەكی سوارەكانی ئەوان رزگاریان بووبێت.

ئەی ئەو رێبوارەی ئەو كەتیبەیە دەخوێنییەوە، من ئەوكات بە شێوەیەك لووتی هەپتاڵەكانم لە زەوی كوتا كە تا ئەمڕۆش نەیان وێراوەتەوە هێرش بكەنە سەر وڵاتانی (ئەلبانیا، ئایبیریا، ئەرمەنستان و ئاترۆپاتێن).

---

(٥) ئەو شاخانەی لە بەشەكانی رۆژهەلات و ناوەندی شاخەكانی قەوقازیا بوون لە رابردوودا بە مۆشیك و كوولشیك ناو دەبران. "زەبیحوڵلا"

# رۆم دەیویست شاپوور لە خاچ بدات

بەربەستی کوروش کە دواتر بە (بابلئەبواب) ناسرا، دەبووایە بە شێوەیەك نۆژەن بکرێتەوە کە چیدکە خێڵە بیابانشینەکان توانای پەڕینەوەیان لە شاخەکانی موشیك و کوول شیکیان نەبێت، هێرش نەکەنە سەر شوێنکەوتووەکانم یاخۆ ئەو وڵاتانەی لەژێر دەستی مندان.

وتم بەربەستەکە بە شێوەیەك نۆژەن بکەنەوە کە تا ماوەیەك وێران نەبێتەوە، چوونکە ئەو بەربەستە دەکەوتە شوێنێکەوە کە بەفر و بارانی زۆری لێ دەباری و وەرزی بەستەڵەك و سەرما لەو شوێنە درێژە، بەستەڵەك بەردەکان لە یەکدیی دادەبڕێت، ئەو دیوارانەی بە خشتی سوورکراوە بیناکراون، وێران دەکات. وتم بۆ ئەوەی تەمەنی بەربەستەکە درێژ ببێت لە مس و سووربی تواوە سوود وەربگرن، بەردەکان بە شێوەیەك بە یەك ببەستنەوە کە گۆڕانی وەرزەکان و بەستەڵەکی درێژخایەن نەتوانن بەردەکان لەیەك جیا بکەنەوە، بیناسازەکانی من بەردەکانیان بە هەندێ تواوەی مس و سووربی بەیەك دەبەستایەوە، دەیانوت ئەو تواوەیە تا سەد ساڵ لە بەرانبەر هەر گۆڕانکارییەکی کەشوهەوا بەرگە دەگرێت بۆیە بە جێنشینەکانم رادەسپێرم تا هەر سەد ساڵ جارێك ئەو بەربەستە نۆژەن بکەنەوە کە لە بەرانبەر خێڵە بیابانشینەکان چێ کراوە و کەوتووەتە وڵاتەکانی ئەلبانیا و ئایبیریا، بۆیە پێویستە نۆژەن کردنەوەکە بە تەواوەتی بێت.

لە ناوچەی زەرەوەند (زەرەند) سووربی و لە کارمانیاش (کرمان) مس بەرەو ئەلبانیا و ئایبیریا دەگواسترایەوە، کاروانەکانی گواستنەوەی ئەو دوو کانزایە بێ پسانەوە لە ڕێدا بوون.

لە ساڵی (٢٥٤ ز) راستۆ کە دۆزەرەوەی کانەکانی مس بوو، ئەو هەواڵەی ڕاگەیاند کە لە زەوەند کانێکی زێڕ دۆزراوەتەوە، سۆربیش بە رێژەی زۆر هەیە، بەڵام تا ئەوکات زێڕ لە ئەوێ دەست نەکەوتبوو، بە راستۆم وت تا لەو کانەدا زێڕ دەربهێنێت، هەوڵ بدات زێڕی زۆرتر دەربهێنێت بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگیرێت بۆ دروستکردنی سککە.

ئەو ساڵە هەوڵمدا وردە وردە تەواوی سککە کۆنەکان کۆبکەمەوە، لە جیاتی سککەی زێڕ و زیوی شاپووری لێ بدەم. پێش ئەویش پارەی من چێ دەکرا، بەڵام پارەی دیکە و لەنێویشیان پارەی رۆم لە وڵاتەکانی (ئاترۆپاتێن، ئاشوورستان، کارامسین، ئەکباتان، خۆزستان و فارس)

برەوی هەبوو، من دەمویست لە تەواوی وڵاتەکانی من تەنیا یەك جۆرە پارەی زێڕ و زیو و مس برەوی هەبێت، بۆیە ویستم پارەی (ئێلێکترۆم)[1] لەنێو ببەم، چوونکە ئەو پارانە کە لەلایەن رۆمەکانەوە خرابوونە بازاڕ، لەلایەن خودی رۆمەکانیشەوە ساختەی تێدا دەکرا و نەدەزانرا رێژەی چەند لەو پارەیە زیوە و چەندی زێڕە.

نموونەی سککەکانی (زێڕ و زیو و مس)ی شاپووری خۆمم بۆ ساتراپەکانم نارد تا لەسەر ئەو نموونانە سککە لێ بدەن، ئەو سککە تازە شاپوورییانە درێژی و پانیان لە سککە کۆنەکان کەمتر و ئەستووریان پتر بوو. من وتم سککەکانی زێڕ و زیو ئەستوورتر لە جاران چێ بکەن تا سەرەڕای ئەوەی ناوی من لەسەر ڕووی سککەکان هەڵدەکەنرێت لەسەر دەورەکانی واتە لە ئەستووریشی هەڵکەندرێت، ئەگەر ناوی من لە تەنیشتەکانی نووسرابووایە، رێگر دەبوو لە ئەوەی نەتەوە نا ئێرانییەکان زێڕەکە لە تەنیشتەکانییەوە بتاشن و هەندێکی بدزن، ئەو رێگەیە ئاستەنگ دەبوو لەوەی ئەوان بە کارتیخ زێڕەکە داتاشن و لە کێشی ئەو سککە مس و زێڕینانە کەم بکەنەوە. عەیاری دە لە یەك بۆ زێڕ و بۆ زیویش (یەك و نیو) لە (دە بەش) واتە (پازدە لە سەد) وەك عەیار دیار کرد.

سککەکانی مس ئەستوورییەکەیان وەك جاران مایەوە، بە پێویستم نەزانی بۆ هەڵکەندنی ناوم لە سەریان، ئەستوورتر بکرێن، چوونکە کەس مسی نەدەتاشی تا سوود بە خۆی بگەیەنێت.

راستۆ (دۆزەرەوەی کانەکانی من) ژمارەیەکی زۆر کرێکاری لە کانەکانی ناوچەی (زەروەند) خستبووە سەر کار، دەمارە باریکەکانی زێڕیش زۆر لە زەوی رۆدەچوون، بۆیە کرێکارەکان ناچاربوون بۆ گەیشتن بە زێڕ، کۆمەڵێك ناعووری درێژ و قووڵ هەڵکەنن، ئەو بیرانەش هەوایان نەدەگەیشتێ، بۆیە دووچاری کەمی هەوا دەبوونەوە، ئەگەر زۆر لە ئەوێ مابانەوە، دووچاری خنکان دەبوون، لە لایەکی دیکە ئەوێ هێندە بە زێڕ دەوڵەمەند بوو کە نەمدەتوانی چاوپۆشی لێ بکەم، بۆیە فەرمانم کرد کە هەر کرێکارێك، رۆژانە لە ماوەی یەك (پەنگان)[2] پتر کار نەکات.

---

(١) جۆرە پارەیەك بوو کە لە تێکەڵەی زێر و زیو چێ دەکرا. "زەبیحوڵڵا"

(٢) پەنگان یەکسان بووە بە دوو کاتژمێر، ئێستە بە فنجانی ناو دەبرێت، برێتی بووە لە قاپێك کە کونێك لەژێریدا هەبووە، ئەو قاپەیان دەخستە سەر تەشتێکی پڕ لە ئاو، ماوەی دوو کاتژمێری دەویست تا پڕ ببێت. "زەبیحوڵڵا"

بەو شێوەیە تا ماوەیەك لە کانەکانی زەروەند، زێڕ دەردەهێنرا، بەڵام دواتر کرێکارەکان تەنانەت نەیان دەتوانی بۆ ماوەی دوو کاتژمێریش کار بکەن، چوونکە پێش ئەوەی بتوانن بگەنە کۆتایی یەکێك لەو تونێڵە درێژ و قووڵانە و دەست بەکار بکەن، دەخنکان، بۆیە بە ناچاری بە ڕاستۆم وت کارکردن لەو کانە زێڕانە ڕابگرێت، تا چیدیکە گیانی بەندەکانی ئاهورامەزدا و لایەنگرانی من، نەکەوێتە مەترسییەوە.

* * *

لە سەردەمی دەسەڵاتداری باوکم ئەردەشێری ئاهورامەزدا پەرستدا، بە هۆی ئەوەی ناوی بابم (شێر) بوو، لە تەواوی ئەو وڵاتانەی لەژێردەستی بوون، راوی شێر یاساخ بوو، کەس بۆی نەبوو شێرێك راو بکات، ئەگەریش کەسێك ئەو کارەی ئەنجامدابایە، سزای کوشتنی بەسەردا دەچەسپا، ئەمەش بووە هۆی بەرەو زیادبوونی ژمارەی شێرەکان، رەگەزی ئەو ئاژەڵە بە تایبەتی لە خۆزستان و ئیلام بەرەو زیاد بوون رۆیشت، بە تایبەت لە خۆزستان شێر بە ژمارەی زۆر بەرچاو دەکەوت.

دووجاران شێرەکان لە خۆزستان و لە کەنارەکانی رووباری کارۆن هێرشیان دەکردە سەر ڕەوە ئەسپەکەی من، کۆمەڵێك لە ئەسپەکانیان دەخوارد، دوای ئەوەی ئاگریان بە دەورەی گەلە ئەسپەکاندا دەکردەوە ئیتر هێرشی شێرەکان وەستا، بەڵام لە ساڵی (٢٥٥ ز) ئاگەداریان کردمەوە کە هەرچەندە ئاگر لە دەورەی لەوەڕگەی ئەسپەکاندا هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا شێرەکان لە کاتی شەودا هێرشیان کردووەتە سەر ئەسپەکان، دەرکەوت کە برسییەتی بە رادەیەك تینی بۆ ئەوان هێناوە کە ترسیان لە ئاگر نەماوە و هێرش دەکەنە سەر گەلە ئەسپەکانم.

لەوکاتەدا من بەرەو ئیلام و خۆزستان دەڕۆیشتم، چوونکە مەبەستم بوو بەنداوێك لەسەر ڕووباری کارۆن ساز بکەم. دوای ئەوەی گەیشتمە خۆزستان، بۆ ئەوەی بزانم چ شوێنێك بۆ دروست کردنی پردەکە باشە، لە کەناری کارۆنەوە بەرەو باشوور دەستم بە رۆیشتن کرد، هەموو شەوێك دوای نیوەشەو دەنگی شێرەکان دەهات، دانیشتووانی ناوچەکە وتیان شێرەکان دوای نیوەشەو بە مەبەستی راوکردن دەردەچن، دوای ئەوەی راو دەکەن، بە مەبەستی ئاو خواردنەوە دێنە سەراو، دوای ئەوەی تێرئاو دەبن جارێکی دیکە نەعرەتە دەدەن، ئەوە دوایین

نەعرەتەیانە، دواتر دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی بخەون. دانیشتووانی ناوچەکە سکاڵایان لە ئاریشەکانیان لە بەرانبەر شێرەکان هەبوو، دەیانوت کە لە تەواوی ناوچەکەیاندا، جگە لە شاخەکان، کەس ناتوانێت مەڕ و مانگا بەخێو بکات، چوونکە شێرەکان ئاژەڵە ماڵییەکان دەکوژن.

من تا ئەوکات نەمدەزانی ئەگەر لە ناوچەیەك شێر زۆر ببێت، دانیشتووانی ناوچەکە ناتوانن مەڕ و مانگا بەخێو بکەن، وێڕای ئەوەی ڕێزگرتن لە باوکم ئەردەشێری ئاهورامەزداپەرستم بە پێویست دەزانی، تێگەیشتم کە دەبێت ئەو مەترسی و ئاریشەیە لە دانیشتووانی ناوچەکە دوور بخەمەوە. بۆیە لە ماوەی بیست ڕۆژدا، دووجار ڕێوڕەسمی راوی شێرەکان ڕێکخرا، لەو راوکردنانەدا ژمارەیەك شێر کوژرا.

دەسەڵاتداری خۆزستانم ڕاسپارد دوای ڕۆیشتنی منیش راوکردنی شێرەکان بەردەوام بێت، ئەوان لەو ناوچەیە دووربخەنەوە، تا چیتر نەبنە مایەی سەرئێشە و کێشە بۆ دانیشتووانی ناوچەکە، ئەوان بتوانن بە ئاسانی مەڕ و مانگا بەخێو بکەن.

یەکێکی دیکەش لەو بەڵایانەی کە هەڕەشە بوو بۆ گوندنشینەکانی خۆزستان، کوللە بوو کە بەردەوام لە وەرزی بەهاردا ئەو بەڵایە دەهات و هێرشی دەکردە سەر هەموو شینابییەکان، لەنێویشیاندا کێڵگەکانی قامیشی شەکری لەنێو دەبرد. خەڵك دەیانوت کوللە زیندەوەرێکە کە لەنێو ئاودا گەشە دەکات، چوونکە بەردەوام دەیانبینی کە لە ڕێگەی دەریاوە دێت، هەندێ لە ساڵەکان هێندە کوللە لە لای دەریاوە دەهات کە بەری خۆریان دەگرت و دنیا تاریك دەبوو، هیچ ئامرازیك بۆ ڕێگرتن لەو زیندەوەرە نەبوو، هەر ساڵێك کە هێرشی هێنابووایە، ئەوە بەرهەمی قامیشی شەکر لەنێودەچوو کە بەرهەمی سەرەکیی خەڵکی خوزستان بوو، ژیانی زۆرینەیان لەو ڕێگەیەوە دابین دەبوو. ئەگەر کوللە زووتر هێرشی کردبایە، بەرووبوومی گەنم و جۆش لەنێودەچوو، ئەو ساڵانەی کوللە هێرشی دەهێنا، بەردەوام ساڵی کۆچکردنی ئەو کرێکارانە بوو کە لە کێڵگەکانی قامیشی شەکر کاریان دەکرد، چوونکە هێرشی کوللە تەواوی قامیشەکانی لەنێو دەبرد و خەڵك داهاتیان نەدەما و ناچار دەبوون کە کۆچ بکەن بۆ شوێنێك کە تیایدا بتوانن بە ڕێگەی کاری بازووەکانیان، بژێوی خۆیان دابین بکەن.

هەر ئەوساڵە کە من لە خۆزستان بووم، جارێکی دیکە کوللە هێرشی کرد، بەشێك لە کێڵگەکانی خەڵکی خوارد. هێرشی کوللە لەو ساڵەدا هێندەی ساڵانی پێشوتر نەبوو، بەڵام وێڕای ئەوەش بەهۆی خورانی بەشێك لە کێڵگەکان، هەندێ لە کرێکارەکان بێکار بوون، بۆیە

منیش کە دەمویست بەنداو دروست بکەم، فەرمانم کرد تەواوی ئەو کرێکارانەی بێکار بوون و ناچارن کۆچ بکەن، لە دروست کردنی بەنداوەکە بخرێنەکار.

لەو ساڵەدا لە نێوان من و دەوڵەتی رۆم ئاشتی هەبوو، منیش لەو ساڵانەی کە ئاشتی دەبوو، سوودم لە پیشەسازکارە رۆمەکان وەردەگرت لە کارەکانی دروست کردنی بەنداو و شار.

ئەوکاتیش بیناسازێکی رۆمی بە ناوی (کلۆدیۆس) لە کاری بەنداوەکە لە خۆزستان کاری بۆ دەکردم، من فەرمانم بە کلۆدیۆس کرد، بە هەموو ئەو وەستایانە کە کاریان دەکرد، کە هەموو ئەو کرێکارە بێکارانەی کە حەز دەکەن کار بکەن بخرێنە سەر کار، تەنانەت ئەگەر کرێکارەکان خاوەن موڵك بن یاخۆ کرێکاری ئاسایی. چوار بەنداوم بە ناوی چوار پێکهاتەی پاك لەسەر ئاوی کارۆن لە ئیلام و خوزستان دروست کرد، لەمەودوا هەر کاتێك کوللە هێرشیان دەهێنا، ئەوانەی بێکار دەکەوتنەوە دەیانتوانی لەو بەنداوانەدا کار بکەن، کە من لە ئیلام و خۆزستان دروستم دەکردن، کرێی رۆژانەی باشم بۆ دابین دەکردن، کرێکەیان هێندە هەبوو کە بتوانن بۆ رۆژانی دواتر، برێکی لێ پاشکەوت بکەن.

هاوکات لەگەڵ ئەو کارانەی دەمکردن، کۆکردنەوەی پەڕتووکم لەبیر نەکرد.

پەڕتووکی زەردەشتی گەورە پەیامبەر بە هۆی ڕووداوە نەخوازراوەکانەوە، بڵاو ببوو، وێنەیەکی تەواو و یەکگرتووی دەست نەدەکەوت.

باوکم ئەردەشێری ئاهورامەزداپەرست، بڕیاریدابوو کە ئەو پەڕتووکە کۆبکاتەوە کە بە پەراگەندەیی لە سینەکاندا مابوو، بۆ ئەو کارە مەزنە، تەنسەری راسپارد کە یەکێك بوو لە مووغە زاناکان، هەندێ لە مووغەکانی دیکەی ڕاسپارد تا لەژێر چاوەدێری تەنسەردا کار بکەن بۆ ئەو مەبەستە.

ئەوان ڕاسپێردران تا لە وڵاتانی باوکمدا بگەڕێن، هەموو ئەو کەسانەی بەشێك لە پەڕتووکەیان لە سینگیاندا هەڵگرتووە، بدۆزنەوە ئەوەی لایانە بینووسنەوە. لەو بیست و یەك بەشی پەڕتووکە تەنیا سێ بەش بە نووسراوی، بەڵام بە پەراگەندەیی هەبوو، بەشەکانی دیکەیش لە سینەی خەڵکدا هەبوو.

ناوی سەرەتایی پەڕتووکەکە (ئاڤێستا) بوو، دوای ئەوەی باوکم تەنسەری بۆ کاری کۆکردنەوەی پەڕتووکەکە راسپارد، سەبارەت بە ناوی تازە ڕاوێژی بەو و مووغەکانی دیکە کرد. باوکم وتی لە مانەوی ناوی (ئاڤێستا) لەسەر پەڕتووکەکە هیچ گومانمان نییە، بەڵام ئەمڕۆ ناوەرۆکی ئاڤێستا بە تەواوەتی نەماوە، تەنیا بەشێکی کەمی بە نووسراوی ماوەتەوە،

که کەمترین گومانمان لێ نییە، بەشەکانی دیکەی ئاڤێستا پێویستە لە سینەی ئەو کەسانە وەربگیرێتەوە کە لەبیریان ماوە، ئایا ئێوەی مووغ دڵنیان لەوەی کە ئەو بەشانەی ئاڤێستا کە ئەزبەرکراون، لە بیری ئەوانەوە بۆ ئێوە دەگوازرێنەوە تا بنووسرێتەوە، هەمان ئەوانەن کە پەیامبەری گەورە زەردەشت وتوویەتی و نووسیویەتی؟.

ئایا لە سەردەمی گەجستەك (مەبەست لە گەجەستەك هەمان ئەسکەندەرە کە ئێرانییەکان بەو ناوە بانگیان دەکرد کە بە واتای نەفرەت لێکراو دێت) تا ئەمڕۆ کە پێنج سەد و پەنجا ساڵی بەسەردا رۆیشتووە، ناتوانرێت بیر بکرێتەوە کە ئەوانەی بەشەکانی ئەو پەڕتووکەیان ئەزبەر کردووە، بۆ نەوەی دوای خۆیان گواستووەتەوە، توانیویانە کە وەك زەردەشت وتوویەتی ئەو پەڕتووکە بگوازنەوە؟، ئایا مندالەکانی ئەوان توانیویانە ئەوەی لە باوانیانەوە وەری بگرن، وەك خۆی بگەیەننە نەوەکانیان بێ ئەوەی هیچ هەڵەیەکی تێدا بکەن؟. ئەگەر بابەتێك لە سینەی پیرەکانەوە بێتەدەر و لەسەر پێستە بنووسرێتەوە، بە تەواوەتی وەك وتەی زەردەشت نەبێت، ئایا درۆ و لادان نییە؟.

وتەی باوکم کاریگەریی کردە سەر تەنسەر و مووغەکانی دیکە کە کاری کۆکردنەوەی پەڕتووکەکەیان ئەنجام دەدا، تەنسەر بە باوکمی وت ئەی خەسرەو (پاشا) هێندەی کە ئەقڵ و هزری مرۆڤ رێگەمان بدات، وردبینی دەکەین تا ئەوەی کۆی دەکەینەوە و دەینووسینەوە، وەك ئاڤێستا واتە وتەکانی زەردەشت بێت. هێندەی بە هزر و ئەقڵمان بکرێت رێگە نادەین، تەنانەت یەك وشەش هەڵە بێت، بەڵام لەبەرئەوەی بە درێژایی پێنج سەد و پەنجا ساڵە سینە بە سینە لە باوان بۆ نەوەکان هاتووە، نابێت بە تەواوەتی متمانە بە دروست بوونی بکەین، تا لە لای ئاهورامەزدا و زەردەشت درۆزن و گوناهبار نەبین. دوای ئەوەی هەموومان کۆکردەوە، ناوی لێ دەنێن (زەند ئاڤێستا)، کە بە واتای (شیکار و واتای ئاڤێستا) دێت، بەو شێوەیە چیدیکە لەبەردەم ئاهورامەزدا و زەردەشت شەرمەزار نابین، ئەو مەزداپەرستانەش، کە دواتر پەڕتووکەکە دەخوێننەوە، دەزانن کە درۆمان لەگەڵ نەکردون و بانگەشەی ئەوەمان نەکردووە، کە ئەوەی لەو پەڕتووکەدا هەیە، هەمان ئەوەیە کە زەردەشت وتوویەتی.

گەجەستەك واتە ئەسکەندەر پەڕتووکی ئاڤێستای سووتاند، بەڵام دوای ئەوەی کۆدەکرێتەوە، ناوی (زەند ئاڤێستا) دەبێت، نابێت چیدیکە لەنێو ببرێت.

من فەرمان دەکەم تا زەند ئاڤێستا لەسەر ژمارەیەکی زۆر لە چەرمی مانگا بنووسنەوە، لە ئاگرخانەکاندا بیانپارێزن تا ئەگەر یەکێك لە ئەوانیش سووتا یاخۆ بە هۆکارێك لەنێوچوو، ئەوانی دیکە بمێننەوە و وەك جاری پێشوو بە تەواوەتی و لەپڕ لەنێو نەچێت.

ئەی ئەو کەسەی کە لێرەوە دەڕۆی و ئەو کەتیبەیە دەخوێنیتەوە، ئاگەدار بە کە ئێستە تەنسەر مردووە، بەڵام ئەو مووغانەی کە بۆ کۆکردنەوەی ئاڤێستا و نووسینەوەی (زەند ئاڤێستا) لەگەڵ ئەودا کاریان دەکرد، ئێستە زیندون و بەردەوامن لە کارەکەیان. من وەسیەت بە کوڕەکەم دەکەم کە ئەگەر تەمەنی من بەشی کۆکردنەوە و نووسینەوەی زەند ئاڤێستا لەسەر یەکێك لە شاخە بەرزەکانی نەکرد، هەموو ئەو پەڕتووکە لەسەر قەدی شاخێکی بەرز و لەو شوێنە کە دوژمنانی ئاهورامەزدا دەستیان پێی نەگات، بنووسێتەوە، تا ئەگەر تەواوی پەڕتووکەکانی دیکەی ئاڤێستا لەنێوچوون، ئەو نووسینەی سەر شاخەکە بمێنێتەوە. ئەگەر (داراکۆ) لە تیرەی (کیامەنش) کە ژیاننامەی خۆی لە شاخی بێستون نووسیوەتەوە، بەو کارە هەستابووای، ئیدی گەجەستەك نەیدەتوانی ئاڤێستا لەنێو ببات.[٣]

من لە سەرەتادا نەمدەزانی ئەوەی لەسەر شاخی بێستون هەیە، لە داراکۆی کیامەنشەوەیە، چوونکە کەس نەبوو کە بتوانێت ئەوەی لە قەدی ئەو شاخە نووسراوە، بخوێنێتەوە.

ساڵانێك تێپەڕی و کەس دەرنەکەوت کە توانای خوێندنەوەی ئەو بابەتەی هەبێت، تا هەواڵیان پێدام کە لە ناوچەی (سوور) پیاوێکی زانا هەیە، توانای خوێندنەوەی ئەو رێنووسانەی هەیە کە لە کۆندا نووسراون. وتم بچن و ئەو پیاوە ببەن بۆ کارامسین تا بزانن ئایا توانای خوێندنەوەی ئەو نووسراوانەی هەیە یاخۆ نا؟.

---

(٣) مەبەست لە داراکۆ کیامەنش، داریوشی هەخامەنشیی دامەزرێنەری کەتیبەی بێستونە، بۆ تێگەیشتن لەوەی شاپوور وتوویەتی، پێویستە بزانین (نەقشی رۆستەم) کە لە لایەن ژان گاژەی لێکۆڵەری فەرەنسی کراوەتە بنەمای ئەو بەسەرهاتە، لە لایەن شاپووری یەکەمەوە هەڵکەندراوە، بۆیە ئەو ترساوە کە تەمەنی بەشی نووسینەوەی زەند ئاڤێستا بەسەر قەدی شاخێك نەکات، تا لە دەست هێرش بەرەکان بپارێزرێت، وتوویەتی وەسیەت دەکەم تا کوڕەکەم ئەو کارە ئەنجام بدات. نەقشی رۆستەم بە سێ زمانی پەهلەوی ئەشکانی، پەهلەوی ساسانی و یۆنانی نووسراوەتەوە." زەبیحوڵڵا"

پێش ئەوەی ئەو ببەنە کارامسین، لە شاری تیسفون (مداین کە پایتەختی شاپوور بوو) هێنایان بۆ لای خۆم، بینیم کە پیاوێکی بە تەمەنە و ریشی سپی بووە، ئەو زمانی رۆمی دەزانی، بۆیە بەو زمانە لێم پرسی ناوت چییە؟

وەڵامی دایەوە کە بە (پەتاووك) ناوم دەبەن.

وتم کام لە زمانە کۆنەکان دەزانی؟.

وەڵامی دایەوە کە زمانی میسری کۆن و بابلی کۆن دەزانێت.

وتم بێگومان دەزانی بۆچی تۆم بانگهێشت کردووە؟، لە کارامسین کە لە وڵاتەکانی منە، لەسەر قەدی شاخ نووسینێك هەیە، کە تا ئەمڕۆ کەس نەیتوانیوە بیخوێنێتەوە. چەندین جار بە فەرمانی من ئەو کەسانەیان بردووە بۆ ئەو شوێنە، کە پێیان وابووە دەتوانن بیخوێننەوە، بەڵام هیچ کامیان نەیانتوانیوە ئەو کارە ئەنجام بدەن. تا ئەوکاتەی بە منیان وت تۆ دەتوانی ئەو نووسراوانە بخوێنییەوە کە بە رێنووسی بزماری نووسراون، بۆیە وتم تۆ بێنن بۆ کارامسین، ئەگەر ئەو نووسراوە بخوێنییەوە ئەوا خەڵاتی گەورە لە منەوە وەردەگری.

پەتاووك وتی ئەی پاشا لە رابردوودا جگە لە زمانی بابلی، زمانی دیکەیش هەبوون کە بە رێنووسی بزماری دەنووسران، ئەگەر ئەو نووسراوە بە رێنووسی بابلی بێت، ئەوا من دەتوانم بیخوێنمەوە و ناوەرۆکەکەی بۆ تۆ باس بکەم، بەڵام ئەگەر بە زمانی دیکە بێت ناتوانم بیخوێنمەوە.

وتم تاقی دەکەمەوە، ئەگەر بە زمانی بابلی نەبوو، تۆ توانای خوێندنەوەی ئەوت نەبوو، هیچ گلەیی ناکەوێتە سەر تۆ. دواتر وتم تا پێداویستیی پشوودانی ئەو پیاوە بێنن، بە شێوەیەك لە شاخەکەی سەر بخەن کە هیچ زیانی پێ نەگات، چوونکە تەنانەت گەنجانیش بێ داربەست نەیاندەتوانی بچنە شاخی بێستون و خۆیان بگەیەنن بە کەتیبەکە، چجای پیاوێکی بە تەمەن.

پاش ماوەیەك هەواڵیان پێدام کە پەتاوەك توانیویەتی ئەو نووسینە بخوێنێتەوە، بە هۆی هاوینەوە من چووبوومە هەکماتانە (هەمەدان) کە پایتەختی هاوینەم بوو، پەتاوەك لەوێندەر هاتە لام و وتی ئەی پاشا، ئەو کەتیبەیە بە دوو زمان نووسراوە کە یەکیان زمانی بابلییە کە

من توانیم بیخوێنمەوە، ئەوی دیکە وێڕای ئەوەی بە ڕێنووسی بزمارییە، بەڵام نەمتوانی بیخوێنمەوە.[٤]

وتم ئایا توانیت ئەوەی بە زمانی بابلی نووسراوە، بە دروستی بیخوێنییەوە؟.

وتی بەڵێ ئەی پاشا من ئەوەی نووسرابوو بە وردی خوێندمەوە و ناوەڕۆکەکەم بۆ نووسیویەوە و بۆم هێناوی.

ئەوکاتە من زانیم ئەو کەتیبەیە لەلایەن داراکۆی شای شایان کوڕی گەشتاسێب[٥] کیامەنش نووسراوە و زانایی و ئەقڵی ئەوم بەرز نرخاند، چوونکە مێژووی ژیانی خۆی لە شوێنێك نووسی کە گەجەستەك نەیتوانی دەستی بگاتێ و لەنێوی ببات.

لە نووسینەکەی داراکۆ زانیم کە ئەو مەزداپەرست بووە، ئەگەر هاوشێوەی ژیاننامەی خۆی، ئاڤێستای لەسەر قەدی شاخێك نووسیبایەوە کە دەستی کەسی پێ نەگەیشتبایە، ئەوا ئەویش لەنێو نەدەچوو.

جارێکی دیکە پەتاوەکم ناردەوە بۆ بێستون، تا وردتر ئەو کەتیبەیە بخوێنێتەوە کە پێشتر خوێندبوویەوە، ئەو بۆ جاری دووەمیش هەر هێندە تێگەیشت کە جاری یەکەم تێگەیشت بوو، نەیتوانی تێ بگات کە ڕێنووسەکەی دیکەی کەتیبەکە چ زمانێکە. ستایشی داراکۆم کرد کە کەتیبەکەی بە دوو زمان نووسیوە، تا ئەگەر نەتوانرا یەکیان بخوێندرێتەوە، ئەوی دیکە بزانرێت.

من پەتاوەکم خەڵات کرد و بە دڵخۆشییەوە ناردمەوە بۆ وڵاتی خۆی، دوای دوو ساڵ بیستم کە کۆچی دوایی کردووە.

* * *

---

(٤) ئێستەکە دەزانین کە کەتیبەی بێستوون بە سێ زمانی پەهلەوی هەخامەنشیی، بابلی و عیلامی نووسراوە. "زەبیحوڵڵا"

(٥) کوڕی وێشتاسێپی هەخامەنشیی. "زەبیحوڵڵا"

تیردادی سێیەم دوای ئەوەی ڕۆیشتە ئەرمەنستان و پەنای بردەبەر ڕۆمەکان، هەوڵیدا تا ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم لە دژی من بورووژێنێت و ئەوان ناچار بکات تا بۆ جەنگی من بێن.

ئیمپراتۆرەکان لە ڕۆم بە زوویی دەگۆڕان، هەر کەسێك کە ئیمپراتۆرێکی دەکوشت، تا ئەو کاتەی بە دەست یەکدیی دەکوژرایەوە لە جیاتی ئەو دەبووە ئیمپراتۆر. زۆرینەی ئەو کەسانەی دەبوونە ئیمپراتۆر (لەگات) واتە فەرماندەی لژیۆنەکان بوون، دوای ئەوەی دەگەیشتنە سەر تەخت لەگاتێکی دیکە دەیکوشتن و لە جیاتیان دەبوو بە ئیمپراتۆر. یەکێك لەو لەگاتانەی گەیشتە تەختی ئیمپراتۆری ناوی (ئامە لیانووس) بوو.

ئامە لیانۆس نامەیەکی بۆ نووسیم کە دوور لە ڕەوشت بوو لە نامەکەدا بۆی نووسیبووم کە من ئیمپراتۆری ڕۆمم، پێتان ڕادەگەیەنم کە ئەگەر دەتانەوێت لەسەر دەسەڵات بمێنن، دەبێت ئەو مەرجانەی من پەسەند بکەن:

یەکەم: تەواوی ئەو شارانەی ڕۆم کە لە ئاسیای بچووکن و داگیرت کردون، بۆم بگەڕێنەوە.

دووەم: ئەو باجەی بۆت دیاری دەکەم بە شێوەی ساڵانە بۆم کۆبکەوە و بۆم ڕەوانە بکە، ئەو باجەش کە بۆ تۆم دیاری کردووە بریتییە لە پێنج سەد تاڵان زێڕ و پێنج هەزار ئەسپ و ماین و سێ هەزار گا و مانگای شیردەر.

ئەگەر ئەو مەرجانەی من پەسەند نەکەی، دەستگیرت دەکەم و دەتهێنم بۆ ڕۆم، لە ئەوێ لەسەر گردی (گیری ناڵ) کە بەرزترین گردی ئەو شارەیە، لە خاچت دەبەستم. ئەگەر نازانی کە شارەکەم لەسەر حەوت گرد دروست کراوە، بیزانە و بزانە کە گیری ناڵ لە هەموو ئەوانی دیکە بەرزترە، دوای ئەوەی کە لە خاچم بەستی و لە ترسانا مردی، فەرمان دەدەم تا لاشەکەت بێننە خوارەوە و لە گۆشتەکەت، گۆشتی پەستراو دروست بکەن و دەرخواردی ئەو سەربازانەی تۆی بدەن کە بە دیلی دەیانهێنم بۆ ڕۆم.

لە وەڵامی ئەو نامەیەی ئامەلیانووسدا، بۆم نووسی کە ئەگەر لە ڕاستیدا تۆ پاشا بووایەی، نامەی بەو شێوەیە دوور لە ڕەوشتت بۆ من نەدەنووسی. لە نێوان من و ڕۆم ئاشتی هەبوو، من ئاشتییم تێك نەدا، بگرە گۆردینی سێیەم بوو کە ئاشتی تێکدا و بە لەشکرێکی بەهێزەوە هات بۆ جەنگی من، دواتر لە (می زی شە) کوژرا و لەشکرەکەی شکستی خوارد. وێڕای ئەوەی دەمتوانی لاشەکەی لەنێو ببەم، بەڵام ڕەزامەندیم نواند بەرانبەر بە داوای سەردارەکانی کە هەموویان دیلی من بوون تا لاشەکەی دوای مۆمیایی کردن، بگەڕێننەوە بۆ ڕۆم تا لەوێندەر بە خاك بسپێردرێت. دوای ئەوەی ئاشتییمان لەگەڵ ڕۆم کرد، من بەشێك لەو

شارانەم گەڕاندنەوە بۆ رۆم کە گرتبوومن و جێنشینەکەی گۆردین لە ئاشتی نێوانمان کە تا هاتنی تۆ بۆ دەسەڵات بەردەوام بوو، ڕازی بوو.

ئێستە تۆ دەتەوێت ئاشتی لەنێو ببەی و ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنی، ئەگەر من ناناسی لەو رۆمیانە بپرسە کە لە جەنگی می زی شە بوون بە دیلی من، من ئەوانم ئازاد کرد، بپرسە تا بزانی کە من لە جەنگ ناترسم، بەڵام لەبارەی ئەوەی کە وتوتە من بە دیل دەگری و دەمبەی بۆ رۆم و لەسەر بەرزترین گردی ئەو شارە لە خاچم دەدەی، ئاگەدار بە کە لەو رۆژەوە کە ئاهورامەزدا منی ئافراندووە و باپیرانمی خستووەتە سەر دەسەڵات تا دەگاتە ئەمڕۆ، هیچ پاشایەك لە رەچەڵەکی من دیل نەبووە.

هەندێك لە باپیرانم لە جەنگدا کوژراون، بەڵام هیچ کامیان دیل نەبوون و تۆش هەرچەندی بەهێز بی ناتوانی من بە دیل بگری، بەڵام لەوانەیە من لە گۆڕەپانی جەنگدا بکوژرێم. وێڕای ئەوەی من هەروەك چۆن لە پێشینانی تۆ نەترساوم، لە تۆش ناترسم، بەڵام ئامۆژگاریەکت دەکەم، ئەویش برێتییە لەوەی کە ئەگەر هێزی شێریشت هەبێت، هەر ئاشتی لە شەڕ باشترە.

ئامەلیانۆس ئامۆژگاری منی وەرنەگرت و خۆی بۆ جەنگ سازدا، داوای لە وڵاتانی رۆژئاوای دەریای سپی (مەدیتەرانە) کرد، کە بەشێك بوون لە ویلایەتەکانی رۆم تا لەشکر ئامادە بکەن. ئەوکات کریستیان لە رۆم نەبوو، هەموو کریستیانەکانی رۆم بە فەرمانی ئیمپراتۆر پێش ئەو بەرواره کوژرا بوون، تەنیا لە بەشێك لەو ویلایەتانەی بە ویلایەتە دەرەکییەکانی ئەو وڵاتە دادەنران، هەندێ کریستیان هەبوون، چوونکە ئامەلیانۆس دەیزانی وڵاتانی من بوونەتە پەناگەی کریستیانەکان و ئەوان منیان خۆش دەوێت، بۆیە دوای ئەوەی لە دژی من بڕیاری جەنگیدا، هەر کریستیانێکی دەست دەکەوت، دەیکوشت، ئەو کریستیانانەش کە توانیان ڕابکەن، خۆیان گەیاندە ئەو وڵاتانەی لەژێر دەسەڵاتیی من بوون.

ئەوان دوای ئەوەی لە رۆم دەردەچوون گیانیان پارێزراو دەبوو، بۆ ئەوەی بتوانن قووتیان دەست بکەوێت، دوای گەیشتنیان بە وڵاتانی من، رێگەی ئاترۆپاتێنیان دەگرتەبەر، چوونکە لەوێندەر بە هاوکاری من وەك هاوکاری بۆ ئەو کریستیانانەی لە رۆم هەڵدەهاتن و هیچیان نەبوو، شوێنێك بۆ خێرات و هاوکاری ئەوان دانرابوو کە لەلایەن دوو قەشەی کریستیان و نوێنەرێکی من بەڕێوە دەبرا، لەو شوێنە کەلوپەلی کار بە ئەوانە دەدرا کە دەیانەویست لە وڵاتەکانی مندا بمێننەوە.

ئەگەر جووتیار بووانە زەوی و پێداویستییەکانی کشتوکاڵ و برێك زێڕیان پێ دەدرا تا بتوانن کاتی هەڵگرتنەوەی یەکەم بەرهەمیان، قووتی رۆژانەیان دابین بکەن. ئەگەر پیشەگەر

بووانە لە شوێنی خێرات بڕە پارەیەکیان پێ دەدرا تا بتوانن لە پیشەکەیان دەست بەکاربن، ئەگەر پیشەوەرەکان ویستبایان بۆ من کار بکەن، ئەوکات مووچەی خۆیان لە من وەردەگرت. هەندێك لە گەنجە کریستیانەکانیش ئارەزوویان دەکرد تا لە سوپای مندا ببنە سەرباز، منیش ئەوانم هەروەك سەربازە ئێرانییەکان وەردەگرت، لە ڕووی مووچە و خانەنشین جیاوازییان لەگەڵ سەربازەکانی دیکە نەدەبوو، لە کاتی جەژنەکانی خۆشیاندا مۆڵەتیان بۆ پشوو پێ دەدرا.

هەر ئەوکاتەی وەڵامی نامەی ئامەلیانۆسم دایەوە خۆم بۆ جەنگ ئامادە کرد، چوونکە نامەی ئەو بە ڕادەیەك بێ شەرمانە بوو، کە بڕوام نەدەکرد ئەو سوود لە ئامۆژگاری من ببینێت و لە جەنگ کردن پاشگەز ببێتەوە، بەڵام نەمدەزانی لە چ ڕێگەیەکەوە بۆ جەنگی من دێت. ئایا وەك گۆردینی سێیەم لە ڕێگەی سوریا و بە درێژایی ڕووباری فورات بۆ جەنگی من دێت یاخۆ لای باشترە کە لە ڕێگەی ئاسیای بچووك بێتە جەنگی من؟.

ئەگەر ئامەلیانۆس لە ڕێگەی وشکانییەوە لەشکرەکەی هێنابووایە، لە ڕێگەی ئاسیای بچووك دەهاتە جەنگی من، بەڵام ئەگەر لە ڕێگەی دەریاوە هاتبایە، دوای گەیشتنی بۆ سوریا دەبووایە لەوێوە خۆی بگەیەنێتە میزۆپۆتامیا.

بیرم نەدەکردەوە کە ئامەلیانۆس لەشکرەکەی لە ڕێگەی ئاسیای بچووکەوە بێنێت، چوونکە دوای ئەوەی لە ڕۆم دەردەچوو، دەبووایە بە هەندێ وڵاتدا تێپەڕ ببێت کە پێوەندییان لەگەڵ ڕۆمدا باش نەبوو، لەوانە بوو لەو وڵاتانە لە نێوان لەشکرەکەی و پاشاکانی ئەو شوێنانە جەنگ ڕووبدات، بەڵام ئەگەر لەشکرەکەی لە ڕێگەی دەریاوە گەیاندبایە سوریا، چوونکە دەگەیشتە نێو خاکی یەکێك لە ویلایەتەکانی ڕۆم، لەشکرەکەی دەیتوانی بە بێ گرفت بەردەوام بێت لە هاتن و ڕۆژئاوای سوریا بە بەشێك لە سنووری ئیمپراتۆرییەتی ئامەلیانۆس هەژمار دەکرا.

ئامەلیانۆس جگە لە ڕێگەی ئاسیای بچووك و سوریا هیچ ڕێگەیەکی نەبوو بۆ لەشکرکێشیی بۆ سەر من و منیش دەبووایە ئارام بگرم تا بۆم دەردەکەوێت کە لە کوێوە دێت، بۆ ئەوەی شێوازی جەنگی خۆم لە بەرانبەری دابڕێژم و ناچار بووم کە ئەگەر لە ئاسیای بچووکەوە بێت شێوازێکی دیکە بۆ جەنگ دیاری بکەم.

دەرکەوت ئیمپراتۆر هەمان ڕێگەی بۆ جەنگی من هەڵبژارد کە گۆردینی سێیەم هەڵی بژارد بوو، دەیویست بە درێژایی ڕووبار خۆی بگەیەنێتە ئاشوورستان، بۆ ئەو مەبەستەش دەبووایە لە بواری (می زی شە) بپەڕێتەوە و خۆی بگەیەنێتە ئەو دەشتە، می زی شە ئەو شوێنە بوو کە من تیایدا بەسەر گۆردینی سێیەم سەرکەوتم و کوشتم.

ئەگەر ئامەلیانووس دوای تێپەڕبوونی لە ڕووباری فورات، هاتبایە نێو دەشتی می زی شە، من دەمتوانی ئەو بشکێنم، بەڵام دەمزانی کە ئەو لەگات بووە و لە رابردوودا فەرماندەی لژیۆنیش بووە، لە هونەرەکانی جەنگ شارەزایە و دەزانێت هاتنە نێو ئەو دەشتە بۆ ئەو مەترسیدارە.

منیش دەمتوانی لە ڕووبار بپەڕمەوە و بە درێژایی کەنارەکانی رۆژئاوای ڕووبارەکە بچمە پێشوازی ئەو، بەڵام بە باشم زانی لە دەشتی می زی شە کە کەوتبووە رۆژهەڵاتی فورات و لەو شوێنەی کە دووری نێوان دیجلە و فورات دەگاتە کەمترین ئاستی خۆی، چاوەڕوانی ئامەلیانۆس بم، چوونکە ئەو پێدەشتە تەخت بوو، بۆ بەکارخستنی گالیسکە جەنگییەکانی من زۆر باش بوو، بە هەمان شێوە کە گۆردینی سێیەمم کوشت، دەمتوانی ئامەلیانۆسیش بە چۆکدا بدەم. لە کاتێکدا کە ئەگەر بە درێژایی ڕووبارەکە بەرەو رۆژئاوا بەرەو ڕووی ئەو چووبام، لەوانەبوو ناچار ببم لە شوێنێك لەگەڵ ئەودا بجەنگم کە گالیسکەکانم سوودیان نەبێت و پیاوی زانا نابێت ئەو گۆڕەپانەی جەنگ وەلا بنێت کە تاقی کردووەتەوە و لێی شارەزایە و بچێتە شوێنێك کە شارەزای نییە و لەوێندەر لەگەڵ دوژمن بجەنگێت.

سیخووڕەکان ئاگەداریان دەکردمەوە لە پێشڕەویکردنی لەشکری ئامەلیانۆس، بەڵام رۆژێك هەواڵیان پێدام کە ئەو کوژراوە و ئەفسەرێکی رۆمی بە ناوی (ڤالەریەن) فەرماندەیی لەشکرەکەی گرتۆتە ئەستۆ، بە هەمان رێگەدا گەڕاوەتەوە کە پیایدا هاتبوون. هەرچەندە لە رۆم ماوەی دەسەڵاتیی ئیمپراتۆرەکان کورت بوو، بەڵام من بیرم نەدەکردەوە کە ئامەلیانۆس لە کاتی لەشکرکێشیی بۆ سەر من بکوژرێت.

کاتێك هەواڵی کوژرانی ئەو بۆ من هات، پیاوەکانم نەیانتوانی بوو ناوی بکوژی ئامەلیانۆسم بۆ بدۆزنەوە، دواتر من ئاگەدار کرامەوە کە (پۆنتۆس تۆریۆس) ئامەلیانۆسی کوشتووە، چوونکە کوژرانی ئامەلیانۆس بە سوودی من بوو، هەندێ لە نێردراوەکانی من وایانزانی کە من هەندێ کەسم ناردووە تا بچنە نێو ئۆردووگەکە و ئەو بکوژن، ئەوان نەیاندەزانی کەس ناتوانێت لە کاتی شەودا بچێتە نێو ئۆردووگەی سوپای رۆم و فەرماندەکەی بکوژێت، چوونکە سوپای رۆم تەنانەت ئەگەر یەك لژیۆن بێت، لە کاتی وەستانی لە هەر شوێنێك، تەنانەت ئەگەر بۆ یەك شەویش بێت، ئۆردووگە بۆ خۆی دادەمەزرێنێت و لەو شوێنە قەڵایەکی کاتی چێ دەکەن، واتە دیوارێك دادەمەزرێنن و لەوێوە هیچ کەس شەوانە ناتوانێت بچێتە نێو ئۆردووگەکەیانەوە.

کاتێك هەواڵی کوشتنی ئامەلیانۆسیان لە کاتی شەودا پێدام، من دڵنیابووم کە لەنێو ئۆردووگەکە رۆمەکان خۆیان ئەو کارە ئەنجامداوە، بە زوویی دەرکەوت کە بیرۆکەی من ڕاستە و ڤالەریەن بەهاندەری پۆنتۆس تۆریۆس ئیمپراتۆری کوشتووە.

ڤالەریەن هاندەری کوشتنی ئامەلیانۆس، پێش ئەوەی لەژێر سەرکردایەتیی ئەودا بۆ جەنگی من بکەوێتەڕێ، فەرماندەی لژیۆنەکی رۆمی بوو لە سەرووی ئالپ و ئالپ برێتی بوو لەو زنجیرە شاخەی باکوری رۆم، ئەو وڵاتانەی دەکەوتنە ئەودیوی ئەو زنجیرە شاخە و لەژێر دەسەڵاتیی رۆمەکان بوون، لەلایەن ئەوانەوە بە وڵاتانی سەرووی ئەلپ ناودەبران. کاتێك ئامەلیانۆس ویستی لە دژی من لەشکرکێشیی بکات، لژیۆنی ڤالەریەنی لە سەرووی ئەلپەوە هێنایەوە و ڤالەریەن بە لەشکرەکەیەوە پێوەستی لەشکری ئامەلیانۆس بوو.

لە رابردوودا رێك کاری لەنێو لەشکری رۆم زۆر توند بوو، ئەگەر یەکێك لە لەگاتەکان بەردەوام سەرخۆش بووایە لە کارەکەی لادەدرا، بەڵام دوای ئەوەی بە هۆی کوژرانی بەردەوامی ئیمپراتۆرەکان، رێك کاری لەشکری رۆم کەم بۆوە، هەندێ لەو لەگاتانەی لە سەربازگە دوورەکان بێ ئیش بوون، لە لاوازبوونی رێك کارییەکان سوودیان وەرگرت و بۆ سەرگەرمکردنی خۆیان شەرابیان دەخواردەوە.

ڤالەریەن یەکێك لەو کەسانە بوو، کە بە هۆی مانەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە وڵاتانی سەرووی ئەلپ و بۆ بەسەربردنی کاتەکانی بێکاری خۆی شەرابی خوارد بۆوە، دوای ئەوەی ئامەلیانۆس بۆ مەبەستی جەنگ لەگەڵ من داوای دەکات، هەر بەردەوام دەبێت لەو کارەی، دوای راکشانی شەو لەنێو ئۆردووگە دەستی بە خواردنەوە دەکرد.

مەی خواردنەوەی ئەو دوو کەموکورتی تێدا بوو، یەکەم سەرباز و ئەفسەرە رۆمەکانی فێردەکرد کە لە کاتی سەفەرە جەنگییە دوورەکان دەتوانرێت شەراب بخۆنەوە، دووەمیش ئەوەی کە ڤالەریەن تا بەشێك لە شەو دەڕۆیشت، سەرگەرمی شەراب خواردنەوە دەبوو، بەرەبەیان نەیدەتوانی وەك ئەوانی دیکە بە تووندوتۆڵی هەستێت و بە خوماری هەڵدەستا، بۆ ئەوەی خوماری بەری بدات جارێکی دیکە چەند جامێکی دەخواردەوە و دەکەوتەوە نێزیکە سەرخۆشی، ئەوکاتیش توانای فەرماندەیی دادەبەزی.

نازانم مەی خواردنەوەی ئەو چەندە کاریگەریی هەبووە لەو پیلانەی بۆ کوشتنی ئامەلیانۆس داینا بوو، بەڵام بیستم ئامەلیانۆس پێی وتبوو شەراب نەخواتەوە، ئەویش نەیدەتوانی دەست لە شەراب هەڵبگرێت.

دوای ئەوەی ئامەلیانۆس کوژرا و لەشکری رۆم گەڕایەوە، چیتر ئاگەداری ڤالەریەن نەبووم. لە ساڵی (٢٥٩ ز) بیستم کە ئەو دەستی لە مەی خواردنەوە هەڵگرتووە، هەر ئەو ساڵە هەواڵم پێگەیشت کە بە جووڵاندنی تیردادی سێیەم پاشای ئەرمەنستان کە پەنای بردبۆوە بەر رۆمەکان، کەوتە کۆکردنەوەی لەشکر تا بێت بۆ جەنگی من.

من بیرم دەکردەوە کە ئەگەر ڤالەریەن دەستی لە مەی خواردنەوەی هەڵنەگرتبایە، بیری لە جەنگ لەگەڵ مندا نەدەکردەوە، چوونکە پیاوی مەیخۆر تا نیوەی شەو بە خواردنەوە سەرگەرم دەبێت و لەبەر خوماری تا نێزیك نیوەڕۆ هەڵناستێت، ئەگەر رۆژەکانیش زستانی و کورت بن، ئەوا تا نێزیکەی تاریك بوون خومارن، دوای هەستانیش بۆ دوورکەوتنەوە لە خوماری دەبێت کەمێکی دیکە بنۆشن.

بۆیە ئەگەر ڤالەریەن بەردەوامبووایە لەسەر مەی نۆشین، بۆ جەنگی من لەشکری کۆنەدەکردەوە و خواردنەوەی شەو و خوماری رۆژ دەرفەتی کۆکردنەوەی لەشکر و هاتن بۆ جەنگی منی پێنەدەبەخشی.

ڤالەریەن بۆ جەنگی من و بۆ بەدەستهێنانەوەی ئەو وڵاتانەی ئاسیای بچووك کە دوای جەنگی می زی شە داگیرم کرد بوون، هەوڵی کۆکردنەوەی لەشکر و بەڕێکەوتن بەرەو وڵاتانی منیدا، تا ئەوکات هیچ یەك لە ئیمپراتۆرەکان لەشکری بەو رادەیە گەورەیان بەڕێ نەخستبوو.

ڤالەریەن هەوڵیدا بیست لژیۆن لەنێوخۆ و دەرەوەی رۆمەوە ئامادە بکات، چوونکە نەیدەتوانی ئەو لەشکرە بە رێگەی وشکانیدا بێنێت بۆ سەر من، ناچار بوو لە رێگەی دەریاوە بکەوێتەڕێ. ئەو بۆ بەڕێ خستنی بیست لژیۆن بە تەواوی پێداویستیی جەنگییەوە، دەبووایە کەشتیی پێویست ئامادە بکات، بۆ بەڕێ خستنی کەشتییەکانیش پێویستی بە سەوڵچی هەبوو، ئەوان ماوەیەك بوو هیچ شوێنێکیان نەگرتبوو، بۆیە نەیاندەتوانی دیلی پێویست دابین بکەن، ناچاریان بکەن بۆ سەوڵ لێدان. ئەو کارەش هێندە سەختە کە هیچ کرێکارێك بۆ وەرگرتنی مووچە ئەو کارە ئەنجام نادات.

ڤالەریەن کە نەیدەتوانی بە پێدانی مووچە کرێکاری پێویست بۆ سەوڵلێدان دەستەبەر بکات، ئەو کەسانەی بۆ کەشتییەکان دەنارد کە سزای لە سێدارەدانیان بەسەردا سەپابوو، ئەو ژمارەیەش هێندە زۆر نەبوون کە پێداویستیی ئەو دابین بکەن.

ڤالەریەن بۆ بەدەستهێنانی ژمارەیەك سەوڵچی کەوتە فێڵکردن، هەندێ بەکرێگیراوی خۆی نارد تا لاوە بێ ژنەکان بەرەو خانەی ژنان (شوێنی رابواردن) ببەن، دوای ئەوەی شەرابیان پێ

دەدەن، پێیان بڵێن ئەگەر ببنە سەوڵچی دەتوانن بۆ ماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژان لەسەر خەرجی ئیمپراتۆر لەو خانانە بخۆنەوە و ڕابوێرن. بەم شێوەیە ئەوان ڕەزامەندیان دەنواند کە دوای سێ ڕۆژ لە رابواردن و خواردنەوە ببنە سەوڵچی، بەکرێگیراوەکانی ڤالەریەنیش بە پەلە پەنجەمۆری رەزامەندییان لەسەر ئەو رێککەوتنانە پێ دەکردن کە پێشتر ئامادەیان کردبوون. لەگەڵ تەواو بوونی سێ ڕۆژەکە، یەکڕاست ئەوانیان لە خانەی رابواردنەوە دەبرد بۆ کەشتییەکان، ئەوان چیدیکە نەیاندەتوانی هەڵبێن، چوونکە قاچەکانیان بە زنجیر دەبەسترایەوە.

یەکێك لە فێڵەکانی دیکەی ڤالەریەن ئەوە بوو کە بەکرێگیراوەکانی خۆی دەنارد بۆ قومارخانەکان تا پارە بە قەرز بدەن بەو کەسانەی دۆڕابوون بەو مەرجەی ئەوان ڕۆژی دواتر پارەکە بدەنەوە، ئەوانیش بە ئۆمێدی بردنەوە بڕێکی باش پارەیان قەرز دەکرد، زۆرینەیان ڕۆژی دواتر نەیاندەتوانی بیدەنەوە و لەلایەن پیاوانی ڤالەریەن دەگواسترانەوە بۆ کەشتییەکان و قاچەکانیان زنجیر دەکرا تا نەتوانن هەڵبێن، بەڵام لە خانەی ژنان و لە قومارخانەکان تەنیا ئەو گەنجانەی کە چوارشانە و سینگ پان بوون و ئەندامیان جوان بوو دەکەوتنە بەرچاو، چوونکە دەیانزانی ئەوانەی لاواز و بێ توانان بۆ سەوڵلێدان نابن، لە دە ڕۆژی یەکەمی سەفەردا لەبەر قورسی کارەکەیان دەمرن، تەنیا لاوە بەهێزکان دەتوانن لە پشت سەوڵ بمێننەوە و بەرگەی ئەو کارە سەختە بگرن و لە ماندوویەتیی نەمرن.

بەو فرتوفێڵانە ڤالەریەن توانی سی هەزار سەوڵچی بۆ کەشتییەکانی کە دەبووایە سەربازەکانی بە دەریادا ببەن و لە وڵاتانی منی نێزیك بکەنەوە، دابین بکات. سەرەڕای ئەو کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانی، ڤالەرین کۆمەڵێك کەشتیی چارۆکەداریشی خستەڕێ، چوونکە ئەو دەیزانی بیست لژیۆن کە هەریەکەیان شەش هەزار سەربازی هەیە پێویستیان بە خواردەمەنی و پێداویستی دیکە هەیە و پێویست دەکات کە ئەو پێداویستییانەش بۆ ئەوان بگوازرێتەوە. کەشتییەکانی خۆراك زووتر کەوتنەڕێ، چوونکە هێواشتر لە ئەوانی دیکە دەڕۆیشتن، ڤالەریەن دەیویست هەموو کەشتییەکانی پێکەوە بگەنە جێی دیاریکراو.

دوای کەشتییە چارۆکەدارەکان، کەشتییە سەرباز هەڵگرەکان کەوتنەڕێ، ڤالەریەن توانی لەشکری خۆی بگەیەنێتە سوریا. کاتێك سەربازەکانی لە کەشتیی دابەزین، سەوڵلێدەرەکانیشی دابەزاند و شمشێر و نێزەی پێدان تا ژمارەی سەربازەکانی لە سەد و بیست هەزار کەس بۆ سەد و پەنجا هەزار کەس زیاد بکات.

ڤالەریەن دەیزانی سەوڵچییەکانی لە کاتی جەنگ و تا گەڕانەوەیان بێ کار دەبن، بۆیە وەك دواتر لە خۆیم بیست، بیری کردەوە کە هەرچەندە ئەوان بایەخی جەنگیان نییە، بەڵام دەتوانن بەرگەی ماندووبوون و ئازار بگرن، چوونکە سەوڵچییێك کە بە هۆی سەوڵلێدان لە کەشتیدا لەنێو نەچێت، دوای ماوەیەك بەهێزتر دەبێت و سینگی پانتر و ماسوولکەکانی باسکی بەهێزتر دەبن، سەوڵچی ئەگەر نەمرێت لە ئامرازە بە سوودەکانی زەرەر لێدانە.

ڤالەریەن دەیویست سوود لە هێزی بازوو و توانای ماندوو نەبوونی سی هەزار سەوڵچی وەربگرێت کە دەبووایە چەندین مانگ بێ کار بمێننەوە، یەکێك لە هۆکارەکانی شکستی ڤالەریەنیش هەمان ئەوە بوو کە سەوڵچییەکانی پێوەست کرد بە سەربازەکانی خۆی.

لە هەر لەشکرێك هەندێ سەرباز هەن کە دەبێت سەرەڕای گواستنەوەی کەلوپەلی جەنگی، خۆراك و خێوەت بگوازنەوە، ئەگەر هێزی سوارەش هەبێت، دەبێت ئالیك بۆ ئەوان دابین بکەن.

دوای ئەوەی سیخووڕەکانم زانیارییان لەبارەی دابەزاندنی سەوڵچییەکان و پێوەست کردنیان بە لەشکرەکەیەوە لەلایەن ڤالەریەن پێدام، زانیم ژمارەی لەشکرەکەی بووە بە سەد و پەنجا هەزار کەس. ئەو لەشکرە گەورەیەش سەرەڕای خۆراك، بۆ دابینکردنی ئاو پێویستە بەو شوێنانەدا بڕوات کە بە ڕێژەی پێویست ئاوی هەبێت، ئەگەر راستەوخۆ بەو رێگەیەدا هاتبایە کە لە سوریا دێتە قادسیە، دووچاری بێ ئاوی دەبێتەوە.(٦)

بە درێژایی ساڵ کاروانەکان لە قادسیە دەهاتنە سوریا، بە پێچەوانەوە دەڕۆیشتن، لە هەموو وەرزەکاندا ئاو بۆ ئەوان لەو رێگەیە دەست دەکەوت، بەڵام لەشکرێکی گەورە نەیدەتوانی بە هەمان رێگەدا بڕوات، چوونکە ئاوی پێویست بۆ ئەوان دەست نەدەکەوت، تەنیا مەگەر فەرماندەی لەشکرەکە، لەشکری خۆی بەسەر چەندین گرووپی بچووك دابەش کردبایە و رۆژانە یاخۆ دوو رۆژ جارێك، دەستەیەکی بەرەو قادسیە ناردبایە، لەشکرەکە دەگەیشت، بەڵام بە هۆی ئەوەی ئەو لەشکرانە لاواز بوون، بە زوویی لەنێو دەبران، ڤالەریەن کە پێشتر ئەزموونی جەنگی هەبوو، ئەو کارەی نەدەکرد، ئەگەر ویستی بۆ ئەو کارەش هەبووایە، ئەو لەگاتانەی لەگەڵی بوون، رێگەی ئەو کارەیان پێ نەدەدا.

---

(٦) هەندێ لەو شارانەی لەو بەشەدا باسیان دەکرێت، لە سەردەمی شاپووری یەکەم ناوی دیکەیان هەبووە، لەوانەش شاری قادسیە کە کەوتووەتە میزۆپۆتامیا، ئەوکات ناوی دیکەی هەبووە. بۆ ئەوەی سەر لە خوێنەر نەشێوێت خۆمان لە ناوهێنانی ناوەکانی دیکەی قادسیە دەپارێزین. "زەبیحوڵڵا"

بەپێی ئەو هۆکارەی کە باسکرا پێشبینیم دەکرد ڤالەریەن بۆ گەیشتنی بە من، بە درێژایی کەنارەکانی ڕووباری فوراتدا بێت، چوونکە پڕ متمانەترین سەرچاوە بۆ دابینکردنی ئاو بۆ لەشکرێکی سەد و پەنجا هەزار کەسی، هەر ئەو ڕێگەیە بوو، لەو ڕێگەیەدا نەتەنیا ئاوی بەردەوامی دەبوو، بگرە دووچاری ناوچەی شاخاویش نەدەهات، چوونکە زێی فورات دوای دەرچوونی لە ئاسیای بچووك و گەیشتنی بە سوریا، چیدیکە بە ناوچە شاخاوییەکاندا نەدەڕۆیشت. هەرچەندە لە هەندێ شوێن بە ناوچەی نارێکدا دەڕوات، بەڵام بە شاخدا تێپەڕ نابێت تا ببێتە مایەی گرفت و ڕێگر بێت لە لەشکرێکی گەورە کە بە کەنارەکانیدا ڕێگە دەبڕێت، چوونکە کەنارەکانی زێی فورات تەخت بوون، سەرەڕای ئەوەی ڤالەریەن بەردەوام ئاوی دەست دەکەوت بۆ لەشکرەکەی، لەلایەکی دیکەوە ڕێگەی باش بوو بۆ گواستنەوەی هەموو پێداویستییەکانی جەنگی لەشکرەکەی ئەو بەو ڕێگەیەدا.

ڕۆمەکان حەزیان بە گالیسکەی جەنگی نەبوو، لەشکری سوارەشیان نەبوو، بەڵام لە بەرانبەردا گرینگیان بە مەنجەنیق دەدا و بە چەکی کاریگەریان لە جەنگدا دەناسی. ڤالەریەن ژمارەیەکی زۆری مەنجەنیقی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و بە ئاسانی دەیتوانی بە کەنارەکانی فوراتدا بیانهێنێت. لەشکری من پەڕینەوە بۆ کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەو ڕووبارە، دەمەویست بزانم ڤالەریەن چ دەکات، ئایا هەر وەك گۆردینی سێیەم بۆ گەیشتن بە ئاشوورستان، لە بواری می زی شە دەپەڕێتەوە یاخۆ شوێنێکی دیکە دەستنیشان دەکات؟، دواجار بینیم کە ئەو بە لەشکرەکەیەوە لە (ئەدەس) بە ڕووبارەکەدا پەڕییەوە.(٧)

لە توانامدا هەبوو لەوکاتەدا کە ڤالەریەن لە ڕووبارەکە دەپەڕێتەوە و دەگاتە کەناری ڕۆژهەڵات، هێرشی بکەمەسەر، بەڵام شاری ئەدەس کەوتبووە ئەو شوێنە و یەکێك بوو لە شارە ئاوەدانەکانی سەردەمی دەسەڵاتیی من. دەمزانی ئەگەر لەو شوێنە لەگەڵ ڤالەریەن بجەنگم، ئەگەر شارەکەش وێران نەبێت، بە دڵنیاییەوە ڕەزەکانی شارەکە لەنێو دەچێت.

خەڵکی ئەدەس جووتیار و پیشەوەر بوون، گرینگترین بەرهەمی کشتوکاڵی ئەوان ترێ بوو، گرینگترین بەرهەمی پیشەسازیشیان ڕستنی کوتاڵی ئاوریشم بوو. ڕەزەکانی ئەدەس لە

---

(٧) ئەدەس یەکێك لە شارە کۆنەکانی جیهانە کە کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی فۆرات و باکوری میزۆپۆتامیا، ئەو شارە ئێستە بە (ئورفە) دەناسرێت، دوای ئەوەی عارەبان شارەکەیان داگیرکرد ناوی شارەکەیان گۆڕی و کردیان بە (ئیم). "زەبیحوڵڵا"

تەواوی ئاشوورستاندا وێنەیان نەبوو، لەو شارەدا تاکە ماڵێك نەبوو کە رەزی نەبێت، بەشێك لە ترێکانیان بۆ پێداویستیی خۆیان بەکار دەهێنا، ئەوەی زیادیش بوو، دەیانفرۆشت.

دانیشتووانی ئەدەس وێڕای ڕەزەکانیان، بە کاری پەروەردەی کرمی ئاوریشمیش سەرگەرم بوون، ئاوریشمی ئەوان ناوبانگی لە هەموو شوێنێك هەبوو. ئەگەر من لەگەڵ ڤالەریەن لەو شوێنە جەنگم بکردایە، هەموو ڕەز و شوێنەکانی پەروەردەکردنی کرمە ئاوریشمەکانیان لەنێو دەچوون. چوونکە نەدەزانرا جەنگەکەمان چەند دەخایەنێت، بەم هۆیەشەوە سەربازە رۆمەکان کاتێك بە پێویستیان زانیبووایە، ناچار دەبوون رەزەکان لەنێو ببەن و دار تووەکانیش کە بۆ پەروەردەی کرمی ئاوریشم بەکاردەهات، بۆ سووتاندن ببڕن. بۆیە بە پێویستم زانی تەنانەت ئەگەر ڤالەریەن ئەمە بە هەڵاتن تێ بگات، لە ئەدەس دوور بکەومەوە، ئەو بەدووی خۆمدا ببم تا بە تەواوەتی دوور دەکەوینەوە.

بیرم لەوکاتەش کردەوە کە ڤالەریەن لە جەنگی مندا بشکێت و پاشەکشە بکات یاخۆ هەڵبێت، بۆیە ویستم ئەو بە رادەیەك بە دووی خۆمدا رابکێشم کە لەوکاتەدا نەتوانێت بە ئەدەسدا بڕوات، چوونکە ئەگەر ئەوە ڕوویدابووایە، بێگومان شارەکەی تاڵان دەکرد و دەسووتاند، کوڕان و کچانی لاوی شارەکەشی بە دیل دەگرت و دەیبردن.

دەمزانی رۆمەکان لە کاتی هەڵاتن یاخۆ پاشەکشەدا تەواوی ئەو شار و ئاوایییانەی دەکەوتە سەر رێیان لەنێویان دەبردن و تاڵانیان دەکردن. تەنیا ئەوکاتە نەیاندەتوانی ئەوکارە بکەن، کە بەردەوام بەدوویان کەوتباینە و دەرفەتی ئەو کارەمان پێنەدابووانە، ئاشکراش نەبوو کە لە کاتی پاشەکشەی ڤالەریەندا من ئەو توانایەم دەبێت بۆ بەدووکەوتنی یاخۆ نا.

ئاکامی هیچ جەنگێك پێش ڕوودانی جەنگەکە ناتوانرێت دیار بکرێت، بۆیە پێویستە هێندەی لە توانادا بێت خۆپارێزی بکرێت.

هەرچەندە لە سوپای رۆمدا رێك کاریەکی باش هەیە، بەڵام مووچەی ئەوان هێندە کەمە کە سەربازی رۆمی ناتوانێت ئومێدی هەبێت، دوای تەواوبوونی سەربازی، ژیانی باش بەسەر ببات و دوای خانەنشین بوونیش هەر ئەو مووچەیەی پێ دەدرێت کە لە کاتی سەربازی پێی دەدرا، ئەو خۆراکەی رادەگیرێت کە پێی دەدرا، بۆیە لە کاتی خانەنشین بوونی کەمتر دەتوانێت سوود لە پیشەکەی ببینێت تا لەوکاتانەی کە لە سەربازیدایە. بەو هۆیەوە سەربازانی رۆمی بۆ دەستەبەرکردنی ئایندەی خۆیان، لە جەنگدا بەردەوام بیریان لە تاڵان دەکردەوە،

ئەفسەرەکانیشیان ئەو ڕاستییەیان دەزانی و ڕێگریان نەدەبوون و دەرفەتیان پێ دەدان لە کاتی جەنگدا شار و گوندانی دوژمنانیان تالان بکەن.

بەو نەخشەی کە باسم کرد، توانیم ڤالەریەن بەدووی خۆمدا ڕابکێشم و لە شاری ئەدەسی دوور بخەمەوە، کاتێك دووری نێوان ئێمە و ئەدەس زۆر بوو، جووڵەی خۆمانم هێواش کردەوە تا لەشکری ڤالەریەن بگاتەوە من.

ئەو کریستیانانەی لای من بوون، زانیارییان لەمەڕ کردەوەکانی ڤالەریەن لە رۆم پێدام و وتیان ئەو بەر لە هاتنی لە رۆم تەواوی پێشەوا ئاینییەکانی ئەوانی کوشتووە، دەوڵەمەندەکانیشی دوای ستاندنی پارە ئازاد و ناچار بە رۆیشتن لە رۆم کردووە. ئەو کریستیانانەشی توانای پارەدانیان نەبووە، لەگەڵ خۆیدا هێناون و بە زۆر لە کەشتییەکاندا سەوڵی پێ لێداون، دوای گەیشتنیشیان بە سوریا شمشێری بە ئەوان داوە تا بەشداری جەنگ بن، بەڵام ئەوان حەز ناکەن بۆ ڤالەریەن بجەنگن و سەوڵچییەکانی دیکەیش بە هەمان شێوە حەز ناکەن بۆ ڤالەریەن بجەنگن، چوونکە ئەو کارەیان بە زۆری پێ ئەنجامدراوە.

هەوڵمدا ئەو بابەتەم لە بیر بێت تا لە کاتی پێویست، هەوڵ بدەم سوود لە نارەزایی سەوڵچییەکان بە تایبەتی کریستیانەکان ببینم و هانیان بدەم تا خۆیان بە دەستەوە بدەن، بەڵام هێشتا نەمدەزانی چۆن کریستیانەکان و سەوڵچییەکانی دیکە ناچار بە خۆبەدەستەوەدان بکەم.

کاتێك وێستام، خێوەتگەی لەشکرەکەمم مەودایەك دوورتر لە ڕووبارەکە دامەزراند، چوونکە لەو وەرزە بووین کە ئاوی ڕووباری فورات بەرەو زیادبوون دەچوو، لەوانەبوو لافاو لە ڕووبارەکەوە هەستێت، هەرچەندە شوێنی وەستانی من ئارام بوو، کەشیش خۆرەتاو بوو.

زۆر جار بێ ئەوەی باران بباریێت، ئاوی ڕووبارەکە بە رادەیەك زیادی دەکرد کە لە ڕێڕەوی خۆی دەردەچوو و لافاو بەسەر هەردوو کەنارەکاندا سەردەکەوت و هەندێ لە زەوییەکانی کەنارەکەی دادەپۆشی.

هۆکاری لافاوەکان دەگەڕایەوە بۆ ئەو بارانە زۆرانەی لە سەرچاوەی ڕووبارەکەوە دەباری و خەڵك لە ئاشوورستان ئەو هەور و بارانانەیان نەدەبینی، بۆیە گومانیان نەدەکرد کە ئاوی ڕووبارەکە زیاد بکات و لافاو بێت، ئەوان لە کەنارەکانی زێ دەخەوتن، لەپڕ کاتێك بەخۆ دەهاتنەوە کە هەرچوار لایان بە ئاو داپۆشراوە و ئەگەر پەلە نەکەن، ئەوا دەبنە خۆراکی ئاو. ئەو لافاو و سەرکێشیانەی ڕووبارەکە زۆرتر لە وەرزی بەهار و هەندێ جاریش لە وەرزی پایزدا ڕوویان دەدا.

هەرچەندە بە هۆی دووری نێوان خێوەتگەکەم و رووبارەکەوە تا رادەیەك هێنانی ئاو لەلایەن سەربازەکانم ناخۆش بوو، بەڵام لە بەرانبەردا ئاسوودە بووم و دەمزانی تەنانەت ئەگەر لافاویش بێت، خێوەتگەکەم لە مەترسیدا نابێت.

شوێنی وەستانی من، ناوچەی توور بوو، دانیشتووانی ناوچەکە دەیانزانی (سەگ ماسییەکان) لە کەنداوی فارسەوە تا ئەوێ دێن، بەڵام بەرەو باکور ناڕۆن، هەرچەندە هەندێ جار لە چەندین کیلۆمەتر لە سەرووتری ئەو ناوچەیەیان بینی بوون، بەڵام سەگ ماسییەکان هەرگیز لە ناوچەی ئەدەس نەبینرابوون و کەس نەیدەزانی بۆ ئەوان بەرەو باکور واتە ئەدەس ناڕۆن و تەنیا تا توور دێن.

خاڵێکی دیکە کە لای ئێمە و دانیشتووانی ناوچەکە ڕوون بوو، ئەوە بوو کە لەو کاتانەی کەسانی زۆر لە نێزیك ڕووبارەکە بن، سەگ ماسی زۆر لەو شوێنە کۆدەبنەوە، لەوانەیە هۆکارەکە ئەوە بوو بێت ئەوان بە دووی خواردندا دەگەڕان، ئەگەر کەسانی زۆر لە کەنارەکان بووانە، پاشماوەکانیان فڕێدەدایە ڕووبارەکە، بەو شێوەیە ئەوان لەو شوێنە کۆدەبوونەوە. بۆیە سەربازانی ئێمە بە زانینی ئەو خاڵە لە کاتی چوونیان بۆ کەناری ڕوبار و هێنانی ئاو، خۆپارێزی تەواویان دەکرد و سەربازانی رۆمی ئەو زانیارییانەیان نەبوو.

رۆمەکان زانیارییان لەبارەی سەگ ماسییەکان نەبوو، بۆیە نەتەنیا خۆپارێزیان نەدەکرد، بگرە ئەسپەکانیان، تەنانەت خۆشیان دەچوونە نێو ئاو و مەلەیان دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی ژمارەیەکیان بەو هۆیەوە لێ کوژرا، ئەزموونیان وەرگرت و زانیان دەبێت بە تەواوەتی لەو بارەوە خۆپارێز بن.

ناوچەی توور کە بووە شوێنی ئۆردووگەی من، بەرز و نزمی نەبوو، بۆ بەکارخستنی سوارکار و گالیسکە جەنگییەکانم زۆر باش بوو، خێوەتگەکەم بە شێوەیەك دامەزراند کە پیادەکان لە باکور و گالیسکەکان و سوارەکان لە باشوور بن، خۆشم لە نێوەڕاستی خێوەتگەکەم بووم.

ڤالەریەنیش خێوەتگەی خۆی لە باکوری خێوەتگەی من دابەستا، کاتێك لەسەر بەرزاییەك دەوەستام، دەمتوانی خێوەتە ئەرخەوانییەکەی ئەو ببینم کە لەسەر خێوەتەکە هەڵۆیەکی گەورەی شین رەنگ و لەسەر ئەویش هەڵۆیەکی بچووکتر هەڵواسرابوو.

ڕەنگی خێوەتی فەرماندەکانی (کۆهۆرت)[٨] زەرد بوو، هەڵۆیەکی بچووکتر لە هەڵۆی لەگاتەکانی لەسەر بوو. خێوەتەکانی دیکە ڕەنگەکانیان درەوشاوە نەبوو، جگە لە خێوەتی ڤالەریەن هیچ خێوەتێکی دیکە بە ڕەنگی ئەرخەوانی نەبوو، چوونکە ڕۆمەکان ڕەنگی ئەرخەوانیان تایبەت بە ئیمپراتۆر دەزانی، جگە لە ئیمپراتۆر کەس بۆی نەبوو جلوبەرگی ئەرخەوانی بکاتە بەری و لە خێوەتی ئەرخەوانیدا پشوو بدات.

کاتێك سوپای ڕۆم گەیشتنە نێزیك خێوەتگەی من، نەختێك لە نیوەڕۆ لایدابوو، سەربازەکانیان زۆر بە خێرایی دەستیان بە دروستکردنی دیواری دەورەی خێوەتگەکەیان کرد. من نەمدەتوانی کاری دروست کردنی دیوارەکە لە لای باکوری خێوەتگەکەیان ببینم، بەڵام ئەوانەم دەبینی کە لە باشوور سەرگەرمی دیوارەکە بوون. ئەوان بە خێرایی سەرگەرمی دیوار دروستکردن بوون و خشتیان بەکار نەدەهێنا، تەنیا خۆڵەکەیان ئاوپرژێن دەکرد و دەیانکردە قوڕ و لەسەر یەکیان دادەنا و دیوارەکە بەرەبەرە بەرز دەبۆوە لە هەندێ شوێن بۆ هاتوچۆی خۆیان دیواریان نەدەکرد و بۆشاییان دادەنا. لە خێرایی زۆری سەربازەکان، دەردەکەوت کە ئەوان زۆر لە کارەکەیان کارامەن.

لەو شوێنەوە کە قوڕەکەیان دەهێنا تا دەگەیشتە ئەو شوێنەی دیواری لێ دەکرا، مەودایەك هەبوو کە چەند کەسێك دەوەستان و دەستاودەست قوڕەکەیان دەگەیاندە دەست ئەوکەسەی دیوارەکەی دەکرد.

بە خێرایی دیوارەکە بەرز دەبۆوە، دوای بەرزبوونەوەی دیوارەکە، وەستای دیوار دەچۆوە سەر چوار پێچکەیەك تا دەستی بگاتە سەر دیوارەکە. ئەگەر هەندێ وەستای کارامە ویستبایان دیوارەکە دروست بکەن، نەیاندەتوانی بەو خێرایییەی ئەو سەربازە کارامانە ئەو کارە ئەنجام بدەن و کارامەیی سەربازەکان لەوان پتر بوو.

هێشتا ڕەنگی خۆرەتاوەکە لە ئاسمان نەگۆڕابوو، کە دیوار تەواو بوو، سەربازە وەستاکان دەستیان لەکار هەڵگرت. بۆم دەرکەوت ئەوان لە ڕۆژئاوای خۆیان دیواریان نەکردووە، چوونکە

---

(٨) هەر لژێۆنەکی ڕۆم لە شەش هەزار سەربازە پێ‌دەهات، کە بەسەر سێ بەشدا دابەش کرابوون، هەر یەکێك لەو بەشانە بە کۆهۆرت ناو دەبران، هەر کۆهۆرتێکیش لە دە بەش پێك هاتبوو، بەشەکان کە لە دووسەد سەرباز پێکدەهاتن بە (مانی پۆل) ناو دەبران، مانی پۆل لە دوو سەنتۆری پێکدەهات کە هەریەکەیان سەد سەرباز بوو. "زەبیحوڵڵا"

دەیانزانی کە لە کەناری ڕووبارن و مەترسییەك ڕووبەڕوویان نییە، ئێمەش دەمانزانی کە لەو لاوە ناتوانین پەلاماری ئەوان بدەین، چوونکە وەرزی بەهار بوو، ئاوی زێی فورات زۆر بوو.

دوای تەواو بوونی دیوارەکە وازم لە بیرۆکەی پەلاماری لەناکاوی ئەوان هێنا، لەوانەیە ئەگەر دیوارەکە کورت بووایە ئەو بیرۆکەیە لای من بەهێزتر بووایە، بەڵام بە بوونی ئەو دیوارە بەرزە ئێمە نەماندەتوانی پەلاماریان بدەین، هاوکات لەوانە بوو ئەوان هێرشمان بکەنە سەر، هەرچەندە ئێمەش دوای بینینی رۆمەکان کەوتینە پتەو و توونددتۆڵکردنی خێوەتگەکەمان، بەڵام ئێمە لە دەورەی خێوەتگکەمان دیوارمان نەبوو، لەوانە بوو شەوێکی سەختمان هەبێت.

# جەنگی گەورە لە کەناری فورات

ئەو شەوە شەوی چل و پێنجەمین بوو لە بەهاریساڵی (٢٦٠ ز)، خێوەتگەی من لەلایەن فەرماندە (ئارم تی) کە خەڵکی (گیل) بوو، بەڕێوە دەبرا. خەڵکی گیل وەك خۆشی نواندن بە خەڵکی (سوور خۆر) ناو دەبران (واتە ئەوانەی برنج بە رەنگی سوور دەخۆن و خواردنی سەرەکیی خەڵکی گیلان لەوکاتدا برنجی سوور بوو کە لەوێندەر دەچێندرا.) ئارم تی پیاوێکی ئازا و تێگەیشتوو بوو، دەیزانی لەو شەوەدا بەرپرسیارییەتی مەزنی لەسەر شانە، دوور نەبوو لەو شەوەدا ڤالەریەن پەلامارم بدات. بڕوام بە ئارم تی زۆر بوو، دەمزانی ئەوەی لە توانایدایە دەیکات ئەگەر هێرشمان بکرێتەسەر.

فەرماندەی گالیسکە جەنگییەکانم ناوی (شاندەر کاهەن) بوو، دەیزانی ئەو شەوە دەبێت بۆ جووڵاندنی گالیسکەکان لە ئامادەباشیدا بێت. ئەو وێڕای ئەوەی فەرماندەیەکی لێهاتوو بوو لە پەروەردەکردنی ئەسپی گالیسکەکان و بەڕێ خستنیان زۆر کارامە و لێهاتوو بوو.

فەرماندەی سوارکارەکانم ناوی (ئەردەشێر مای مەن) بوو، ئەویش لەو شەوەدا هەر وەك فەرماندەی گالیسکە جەنگییەکانم، گونی کردە سەری ئەسپەکان و دەیزانی ئەگەر ڤالەریەن لەو شەوەدا هێرش بکات، پێویستە ئەسپەکان بخاتە کارەوە.

هەرچەندە ئەو شەوە چاوەڕوانی هێرشی دوژمن بووین، بەڵام سەربازەکانم بە بێداری نەهێشتەوە و مۆڵەتم دان تا بخەون، چوونکە دەمزانی گەر ئەوان نەخەون بۆ رۆژی دواتر لەبەر ماندوویی ناتوانن بجەنگن، بەم هۆیەشەوە خۆم و ئەفسەرەکانم بێدار بووین و چاوەڕوانی هێرشی ڤالەریەنمان دەکرد تا بۆمان لە ناکاو نەبێت. تا ئەو کاتەی گومانی هێرشی رۆمەکانم دەکرد، بە دەورەی خێوەتگەکەمدا دەگەڕام تا لە بارودۆخی پاسەوانەکان ئاگەدار بم و بزانم باشە یاخۆ نا؟.

هەرچەندە ئەو شەوە زۆر هەوڵماندا تا دیل لە دوژمن بگرین و بەو رێگەیەوە زانیارییەکانمان لەبارەی لەشکری دوژمن پتر بکەین، بەڵام لەو کارەمان سەرکەوتوو نەبووین. کریستیانەکان زۆر زانیارییان لەبارەی لەشکری ڤالەریەن پێدابووم، بەڵام وێڕای ئەمەش دەمەویست لە رێگەی دیلەکانەوە زانیاریی زیاترم دەست بکەوێت، بەڵام رۆمەکان کە دیواریان

بە دەورەی خێوەتگەکەیاندا هەبوو، دەیانزانی ئێمە توانای پەلاماری لەناکاوی ئەوانمان نابێت، بە پێویستیان نەدەزانی بۆ خۆپارێزی خۆیان، سەربازەکانیان بۆ گەڕان بە دەوری خێوەتگەکەیان بخەنە مەترسییەوە.

سەربازە گەڕۆکەکانی ئێمە تا بەرەبەیان لە نێوان هەردوو خێوەتگەدا لە گەڕان بوون، بۆ ئەوەی ئەگەر سەربازەکانی ڤالەریەن هێرشیان کرد، ئاگەدارمان بکەنەوە، ئەگەر توانیشیان دیلیان لێ بگرن.

ئەی رێبوار کە بە ئێرەدا تێپەڕدەبیت و ئەو کەتیبەیە دەخوێنیتەوە، ئەگەر لە هونەری جەنگ شارەزا بی پرسیار دەکەی کە بۆچی دوای ئەوەی رۆمەکان دیواریان لە دەورەی خۆیان دروست کرد، من ئەوانم گەمارۆ نەدا تا ئەوان لەنێو بچن و ناچار بن خۆیان ڕادەست بکەن؟، من بە دوو هۆکار ئەو کارەم نەکرد:

**یەکەم:** رۆمەکان لە دروستکردنی دیوار خاوەن ئەزموون بوون، دەیانزانی دوای چێکردنی دیوار بە دەورەی خۆیاندا، لەوانەیە لەلایەن دوژمنەوە گەمارۆ بدرێن و رێگەی هەڵاتنیان بگیرێت و لە برسییەتی و تینوویەتیی بمرن، بۆیە دیوارەکەیان بە شێوەیەك دادەمەزراند کە لە کاتی پێویستدا زۆر بە خێرایی دیوارەکە تێك بشکێنن و بە شێوەی لژیۆن بکەونە نێو جەنگ و هەموو لژیۆنەکانی رۆم کەرەستەی تایبەت بە ڕووخاندنەوەی دیواریان هەبوو.

**دووەم:** من تەنیا لە توانامدا بوو کە لە سێ لاوە لەشکری ڤالەریەن گەمارۆ بدەم، لە رۆژئاوای خێوەتگەکەی ئەودا دیوار نەبوو، زێیی فورات رێگەی گەمارۆی دەگرت، ئەگەر ئەوان نەیانویستبایە دیوارەکە وێران بکەن، بە ئارایشی جەنگییەوە لەگەڵمدا بجەنگن، دەیانتوانی بە رێگەی فوراتدا بپەڕنەوە.

سەرەنجام ئەو شەوە سەختە کۆتایی هات و رۆژ بۆوە، ئەو شەوە بۆ من و ئەفسەرەکانم قورس بوو، چوونکە لە چاوەڕوانیدا بووین، ئەگەرنا پیاوی جەنگاوەر لە نەبەرد ناترسێت و بە هاتنی رۆژ، چاوەڕوانی ئێمەش کۆتایی هات و زانیمان کە رۆژی جەنگ هات.

دەنگی کەڕنای جەنگی رۆمەکان بەر لە هی ئێمە بەرز بۆوە، بەپێی ئەو زانیارییانەی لەسەر رۆمەکان هەمبوو، دەمزانی لژیۆنەکانی ئەوان دوای ئەوەی لە خەو هەڵدەستن لە دیوارەکە دێنە دەرەوە، چاوەڕوان نەبووم ئەوان بەو خێراییە لە دیوارەکە دەربچن و ریزەکانیان رێك بخەن.

لە دوورەوە دەمبینی سەربازەکانی ڕۆم ئەوانەی لە لای ڕاستی ڤالەریەن وەستاون، بێلایان بە دەستە، ئەوانەی لای چەپیش چەکێکیان لە لا بوو کە تا ئەو ڕۆژە من لە لای ڕۆمەکان نەمبینی بوو، دوای ئەوەی لە سەربازە ڕۆمەکان نێزیك بووینەوە، دەرکەوت کە ئەو چەکەی دەستیان برێتییە لە پەیکانی سێ سەر.

لە هەردوولای ڕاست و چەپی ڤالەریەن سەربازانی لژیۆن دیار بوون، لە جلوبەرگە هاوشێوە و یەکگرتووەکەیان دەزانرا کە لژیۆنن، بەڵام لە نێوەڕاستی لەشکرەکە سەربازانێك هەبوون کە جلەکانیان یەك نەبوو، نێزەیان بە دەستەوە بوو، دەرکەوت کە ئەوان هەر ئەو سەوڵڵێدەرانن کە ڤالەریەن ئەوانی چەکدار کردووە و وەك سەرباز هێناوینی بۆ جەنگ.

نەمتوانی لەوە تێ بگەم کە بۆچی ڤالەریەن سەربازە نافەرمییەکانی لە نێوەڕاستی لەشکرەکەی داناوە، وام بیرکردەوە کە بۆیە ئەوانی لەو شوێنە داناوە تا نەتوانن هەڵبێن. لەشکری ڤالەریەن بە زوویی ریزەکانی یەکخست، بۆیە وامزانی دەست بە هێرش دەکەن، بەڵام ئەوان دوای ئەوەی ریزەکانیان ڕێك خست و مەنجەنیقەکانیان خستە پێش خۆیان، هێرشیان نەکرد.

ئارایشی جەنگی منیش بەم شێوەیە بوو، گالیسکە جەنگییەکان لە لای ڕاستمەوە بوون و (شاندەر کاهەن) فەرماندەیان بوو، سوارەکانیش بە فەرماندەیی (ئەردەشێر مای مەن) لە لای چەپمەوە بوون، خۆم و پیادەکانیش لە نێوەڕاست لە دڵی لەشکر بووین، برێك لە سوار و پیادەکانیشم وەك هێزی یەدەگ لە پشت لەشکرەکەمەوە دامەزراند بوو.

لەشکری ڤالەریەن لە باکوری من بوون، ئەو بەیانییە هیچ کاممان بە دەست خۆرەوە لە ئازاردا نەبووین.

لە دوورەوە لە پشت هەر مەنجەنیقێك گردۆڵکەیەکی بچووك دەبینرا، دەمزانی ئەو گردۆڵکەیە لەو بەردانە دروست بووە کە بە مەنجەنیقەکە دەهاوێژرێن، لەشکری ڕۆم ڕۆژی پێشتر ئەو بەردانەیان کۆکردبۆوە، ئەو بەیانییە لە بەرانبەر گۆڕەپانی شەڕیان دانابوون.

لە هەردوو لاوە تا چاو بڕی دەکرد مەنجەنیق هەبوون، بە بڕوای من ئەوان ژمارەیان پێنج سەد دەبوو، وام بیر کردەوە کە هەر لژیۆنەك بە بیست و پێنج مەنجەنیق هاتووەتە نێو شەڕ.

دوای ئەوەی ناوی (ئەشەم وەهۆ) هاتە سەر زمانم، بە سوارەکانم وت وا پێشان بدەن کە بە نیازی هێرشن، مەبەستیشم لەوکارە زانینی توانا و بایەخی جەنگی مەنجەنیقەکان بوو، بۆم دەرکەوت کە بەردی مەنجەنیقەکان بەر لەوەی جەنگی ڕاستی دەست پێ بکات بەشێکی زۆر لە سوار و پیادەکانی من دەکوژێت.

لەگەڵ سوارەکانم توانای سووڕانەوە بە دەوری ڕۆمەکان و خۆگەیاندن بە پشت ئەوانم نەبوو، چوونکە لای ڕاستی ئەوان لە کەناری ڕووبارەکە بوو. گالیسکەکانیشم نەیاندەتوانی بە لای چەپدا بچنە پشت لەشکری دوژمن، چوونکە ڤالەریەن لای چەپی لەشکرەکەی (واتە لای ڕۆژهەڵاتی لەشکرەکەی) گەیاند بۆوە هەندێ گرد و تەپۆڵکەی نەوی و درێژ و پێکەوە نووساو.

بێگومان ئەو لە رابردوو لەگات و فەرماندەی لژیۆن بووە و زانیاریی هەبوو کە ئەگەر گالیسکەکانی من بکەونە جەنگەوە، کاریگەریی باشیان دەبێت، کاتێك گالیسکەکانی منی لە بەرانبەر لای چەپی خۆی بینی، سەربازانی ئەو لایەی خۆی بە گردەکانەوە لکاند بوو تا گالیسکەکانم نەتوانن دەورەی بدەنەوە و بچنە پشتیانەوە.

جارێك باسم کرد کە دوو نەبەرد هەرگیز وەك یەك نابن، هەر جەنگێك جیاوازیی لەگەڵ ئەوەی دیکەدا هەیە. ئەگەر گۆڕەپانی جەنگ جیاوازیی نەبێت، ئەوا ئەو لەشکرەی جارێك لەگەڵ لەشکری دووەم دەجەنگێت بۆ جاری دووەم پلانە جەنگییەکەی دەگۆڕێت.

ڕۆمەکانیش ئەو ڕۆژە لە لایەك خۆیان گەیاند بووە گردەکان، لە لایەکی دیکەیش خۆیان بە کەنارەکانی زێ گرێ دابوو تا گالیسکەکانمان نەتوانن بە تەنیشتیاندا بسووڕێنەوە و پشتیان لێ بگرن.

ئەی ئەو ڕێبوارەی ئەو نووسینەی من دەخوێنیتەوە، لەوانەیە وابیر بکەیتەوە ئەگەر ڕۆمەکان بایەخی جەنگی گالیسکەکانی منیان بۆ دەرکەوت، بۆ ئەوجارە هەوڵیان نەدا کە لەو گالیسکانە دروست بکەن، دیسان تەنیا بوونی هێزی پیادەی لێژیۆنەکانیان لا بەس بوو؟.

نەبوونی گالیسکەی جەنگی لە لەشکری ڕۆم دەگەڕایەوە بۆ کورتی تەمەنی دەسەڵاتیی ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم، ئەوان دوای ئەوەی دەگەیشتنە دەسەڵات، پێش ئەوەی فریای دروستکردنی شتێك یاخۆ دەست پێکردنی کارێك بکەون، دەکوژران و یەکێکی دیکە جێگەی دەگرتنەوە. لە نێوان ئەو ئیمپراتۆرانەی هاوکات لەگەڵ دەسەڵاتداری من بوون تەنیا یەکیان هەوڵیدا گالیسکەی جەنگی دروست بکات، ئەویش جالینۆسە کە لە کاتی نووسینی ئەو کەتیبەیە هێشتا لە ژیاندایە. چوونکە ماوەی دەسەڵاتیی ئەو تا ڕادەیەك درێژتر بووە، توانیویەتیی بۆ لەشکری ڕۆم گالیسکەی جەنگی دروست بکات.

ئەو ڕۆژە وەك باسم کرد سووڕانەوە بۆ پشت مەیدانی جەنگی ڤالەریەن ئەستەم بوو، من دەبووایە ڕووبەڕوو هێرش بکەمەسەر گۆڕەپانی جەنگی ئیمپراتۆری ڕۆم و تێکی بشکێنم، بۆ ئەو کارەش سەرەتا دەبووایە مەنجەنیقەکان لەنێو ببەم.

سەربازەکانی من لە نەتەوە جیاوازەکانی سنووری پاشایەتیی من بوون، لە ئاترۆپاتێن (ئازەربایجان) تیرهاوێژی بەهێز لەنێو لەشکرەکەم بوون، لە تالچ (تالێش) پیاوانی بەهێزم هەبوون کە لایان باشتر بوو کە بە گورز شەڕ بکەن. ژمارەیەك لەوانەی گالیسکەکانیان لێدەخووڕی، خەڵکی گدرۆزیا (بلوچستان) بوون، بەشێکی دیکەیشیان خەڵکی سکستان (سیستان) بوون، هەموویان بە پاڵەوان دەژمێردران، چوونکە کەسێکی بێ هێز ناتوانێت هەشت زنجیرە لە چەرمی گا کە بۆ ڕێشمەی چوار ئەسپی سەرکێش دانرا بوون بە دەستەوە بگرێت. چجای ئەوەی بتوانێت ئەو ئەسپانە کە درێژی هەریەکەیان پێنج گەزە، بخاتە ژێر رکێفی خۆی.

لە لەشکری مندا ژمارەیەکی زۆر لە پیادەکانی ناوچەی هۆ (ئارن) هەبوون کە ناوچەی ناوەندی ئێرانە، پایتەختەکەی (ئیوان کەی) بوو، سوارەکانیش لە (ئەنژیان) کە کەوتبۆوە باشووری خۆراسان، سوارەکانی پارس و کارامسینیش لە لەشکری مندا هەبوون. لەنێو پیادەکانی من پیاوانی مازەندەران و هێگان (گورگان) هەبوون، شمشێر وەشێن و تیرهاوێژە کوردەکان و سوارە کەمەند هاوێژە باختەرییەکان (باکوری خوراسان) و کۆشانییەکان لەنێو ئەو لەشکرە دەجەنگان.

ئەوانە هەموویان چەکە ئاساییەکانی لەشکری منیان هەبوو، بەڵام بە گشتیی پێیان باشتر بوو کە بە چەکەکانی خۆیان بجەنگن، منیش ئەوانم ناچار نەدەکرد بەو چەکە بجەنگن کە پێچەوانەی ویستی خۆیانە.

ئەی ئەو ڕێبوارەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنییەوە، ئەگەر پیاوی شەرزان نی، بزانە کە ئەو لەشکرەی لە پیاوانی ناوچە جیاکان پێکدێت، هەموو سەربازەکانی خاوەنی یەك بایەخی جەنگی نین و هەمووشیان لە بەکاربردنی یەك جۆرە چەك شارەزا نین. لە لەشکرەکەی منیش وەهایە، نە بایەخی جەنگی هەمووان وەك یەك بوو، نە هەموویان لە یەك جۆرە چەك شارەزا بوون.

سەرجەم سەربازەکانی من لەوکاتەدا سەد و چل هەزار کەس بوون، کە سی هەزاریان وەك یەدەگ لە پشتەوە بوون و سەد و دەهەزاریان لە مەیدانی شەڕ ئامادە بوون.

داوام کرد تا ئەردەشێر مای مەن بێتە لام و ڕام سپارد تا پێنج سەد سوار لە سەربازە سەرسەخت و دلێرەکانی بۆ دەستەی هێرش و دووسەد و پەنجای دیکە بۆ هێرشی دووەم ئامادە بکات. پێنج سەد کەسی دەستەی هێرش پێویست بوو هێندەی دەتوانن ئامێری تێك شکاندن و

ئاگر لەگەڵ خۆیاندا ببەن. دارەکانی مەنجەنیق، چوونکە وشك بوون، لەوکاتەدا بە ئاسانی دەسووتان. بۆیە بڕیارمدا لەسەر پشتی هەر ئەسپێك و لە پشت سوارەکە، سەربازێکی دیکە سوار ببێت، ڕۆن و بابەتی ئاگرینی لابێت، تا ئەوکاتەی دەگاتە مەنجەنیقەکان، ڕۆنیان بەسەردا بکات و ئاگریان تێبەر بدات، سوارەکانیش بە تیر هێرش بکەنەسەر مەنجەنیقەکان.

دوای هێرشی پێنج سەد سوارەکان، دووسەد و پەنجا سوارەکانی دیکە بە پەلە ڕەوان بکە تا بتوانن بە تەواوەتی مەنجەنیقەکان تێك بشکێنن، دەستبەجێ دوای ئەوان تەواوی لەشکرەکە دەست بە جووڵە دەکات و پێویستە مەودای نێوان دەستەی هێرش و دەستەی دووەم و تەواوی لەشکرەکە کەم بێت، تا لە کاتی تێك شکانی تەواوی مەنجەنیقەکاندا سوود لە سەرسووڕمانی ڕۆمەکان وەربگرین کە بە دیار مەنجەنیقە شکاوەکانیانن و نەهێڵین ئەوان توانای لەنێوبردنی تەواوی سوارە و پیادەکانی ئێمەیان ببێت.

لەشکری ڕۆم هێشتا وەستابوون و وایان دەردەخست کە نایانەوێت هێرش بکەن و چاوەڕوانی هێرشی ئێمەن، هەڵۆیە ڕەنگاوڕەنگەکان بەسەر سەری سەربازەکانیانەوە دیار بوون.

چاوەڕوان بووم تا هێمای ئامادە باشی ڤالەریەن لە نێوەڕاستی لەشکرەکەی ببینم، بەڵام نەمبینی، دوای بەدواداچوون لە لای ڕاستی لەشکرەکەیدا بینیم، لەوانەیە ئەو نەیویست بێت لە نێوان سەوڵچییەکان بێت کە وەك سەرباز هێنابوونی بۆ گۆڕەپانی شەڕ و لای باشتر بووبێت کە لەنێو سەربازانی لژیۆن بێت.

فەرمانم بە فەرماندەی بەشە جیاکانی لەشکرەکەم کرد کە لەگەڵ هێرشی سوارەکان بۆ سەر مەنجەنیقەکان، ئامادە بن بۆ هێرش، گومانم نەبوو دوژمن سوارە خۆبەخشەکانم دەداتە بەر تیر، بۆیە فەرمانم کرد تا بەرگی ئاسنین بکەنە بەریان.

لە پشت هەر ئەسپسوارێك، سەربازێکی پیادە سوار کرابوو، کە قاپێك ڕۆن و مەشخەڵێکی لا بوو. ئەرکی ئەوان ئەوە بوو کە بێ گوێدان بە دۆخی ئەو سوارکارەی لەگەڵی بوون، مەجەنیقەکانیان بسووتێنن، ئەگەر پێوست بووبایە، دەبووایە لە ئەسپ دابەزن و بەو چەکەی بە دەستیانەوە بوو، بجەنگن تا ئەو کاتەی ئەوانەی دیکە دەکەونە هێرش بردن و لە پشتەوە پێیان دەگەن، یارمەتی سوارەکان بدەن.

کاتێك سوارەکانی ئێمە وایان پێشاندا هێرش دەکەن، بینیم مەنجەنیقەکانی ڕۆمەکان بە چ خێراییەك بەرد بارانی سوارەکانیان دەست پێکرد، ئەوە تەنیا لەو کاتەدا بوو کە ئێمە بەو خۆدەرخستنە ویستمان کاردانەوەی ئەوان تاقی بکەینەوە. ئەگەر سوارەکانی ئەردەشێر

نەگەڕابوونایەوە، کوژراوی زۆریان لێ دەکەوتەوە. بۆیە کاتێك سوارە خۆبەخشەکانم دەستیان بە هێرش کرد، پێشبینیم دەکرد بەر لەوەی ئەوان بگەنە ئامانجەکانیان، نیوەیان لەنێو بچن، بەڵام بەو شێوە نەبوو، زیانەکانیان بەر لە گەیشتن زۆر کەمتر بوو لە پێشبینی من، زانیم بۆ زیانەکانیان کەمتر بوو لەو رێژەیە.

کاتێك سوارەکانمان وایان دەردەخست کە هێرش دەکەن، بە شێوەی تایبەت بە هێرش خۆیان رێك خست و دەستیان بە جووڵە کرد، نێوانی دوو سوار تەنیا هێندە بوو کە بتوانن ئەو چەکانەی لایانە لە شمشێر و تیر بە ئاسانی بیجووڵێنن و بەریەك نەکەون. بۆیە هەر بەردێك کە لە منجەنیقەکانەوە دەردەچوو بەر یەکێك لە سوارەکان دەکەوت، وەك ئەوە وابوو کە مەنجەنیقچییەکان دیوارێك ببینن لەبەر چاویان و هەر بەردێك کە ئاراستەی ئەو دیوارەی دەکەن بەر دیوارەکە دەکەوێت، بەڵام کاتێك سوارە خۆبەخشەکان کەوتنەڕێ بە شێوەی بەربڵاو دەڕۆیشتن و مەودای نێوان دوو سوار زۆر بوو، هەندێك لە بەردەکان بەر زەوی دەکەوتن، لە لایەکی دیکە هەندێ لە سوارەکان بە فەرمانی ئەردەشێر لە جیاتی راستەوڕاست بەرەو ڕووی مەنجەنیقەکان بچن، بە شێوەیەکی لار دەڕۆیشتن، مەنجەنیقەکان نەیاندەتوانی بە خێرایی سوارەکان خۆیان بەرەو چەپ یاخۆ راست بجووڵێنن، بۆیە توانایان نەدەبوو کە ئەوان بکەنە ئامانجی بەردەکانیان.

کاتێك سوارەکانمان گەیشتنە مەنجەنیقەکان و دەستیان کرد بە تێك شکاندنیان، رۆمەکان هەوڵیاندا تا لەنێویان ببەن و ئەسپەکانیان بکوژن و هێرشیان دەکردە سەریان، دەرکەوت رۆن و مەشخەڵی ئەو سەربازانەی لە پشت سوارەکان سوار ببوون زۆر کاریگەرتر بوو لەو تەورانەی سوارەکان بۆ تێك شکاندنی مەنجەنیقەکان هێنابوویان، چوونکە دوای ئەوەی رۆنەکە دەڕژێندرایە سەر مەنجەنیقەکان، تەنیا پێویست بوو تا ئاگریان لێ نێزیك بکرێتەوە و ڕاستەوخۆ دەسووتا، زێی فورات دوور بوو لە مەنجەنیقەکان، تا ئەوان دەگەیشتنە زێ ئاو بێنن و بیکەنە سەر ئاگرەکە، تەنیا خۆڵەمێش دەمایەوە و ئاگری مەنجەنیقەکان بە ڕادەیەك بەهێز بوو کە پێویست نەبوو دەستەی دووەمی سوارەکان بکەونەڕێ و پیادەکان لەگەڵ خۆیان ببەن، تێگەیشتم مەنجەنیقەکان بە تەواوەتی تێك شکاون، بۆیە فەرمانی هێرشی لەشکرەکەمم دەرکرد.

تا ئەو رۆژە پێکدادانی بەو رادەیە بەهێزم لە نێوان دوو لەشکر نەبینی بوو. گالیسکەکانمان وەك با بەرەو لای چەپی لەشکری ڤالەریەن جووڵان، بەڵام لەوێندەر ڕووبەڕووی چەکێك بوونەوە کە پێشتر لای رۆمەکان نەبینرا بوو، برێتی بوو لە نێزەی درێژی سێ سەر.

دەرکەوت ڤالەریەن بە بینینی گالیسکەکان لە لای راستی لەشکری من، نێزە بە دەستەکانی لە لای چەپی خۆی دانابوون تا بەو رێگەیە رێ لە گالیسکەکان بگرن. (سۆرین) فەرماندەی کریستیانەکانی نێو لەشکرەکەم پێی راگەیاندم ئەو نێزانە لە جەنگی گلادیاتۆرەکان لە سێرکدا بەکار دەهێنرێن، بەڵام ئەوان هێندەی ئەو نێزانەی دەست ئەو سەربازانە درێژ نین.

ئەوان ئەو نێزە درێژە سێپەڕانەیان لە سینگ و سکی ئەسپەکان گیرکرد و گالیسکەکانیان لەکار دەخست، هەرچەندە سەربازەکانی سەر گالیسکەکان تیریان دەگرتە ئەوان تا رێگە بۆ خۆیان بکەنەوە، بەڵام نەیاندەتوانی رێگە بۆ رۆیشتنی گالیسکەکان بکەنەوە، بەڵام ئەوان هیچ چارەیەکی دیکەیان نەبوو لەوە زیاتر کە راست بڕۆن و رێگە بۆ گالیسکەکان بکەنەوە، چوونکە وەك باس کرا زەوییەکانی لای چەپی ڤالەریەن کە دەکەوتە بەرانبەر لای راستی من بە شێوەیەك بوون کە تەخت نەبوون، تا دەگەیشتە گردەکان سەربازی لێ بوو، ئەمەش رێگر بوو لەوەی گالیسکەکانمان بتوانن بسووڕێنەوە بۆ پشت سەربازە رۆمەکان.

لە لای چەپم سوارەکانی لەشکرەکەم ڕووبەڕووی بەرگری توندی سەربازەکانی لژیۆنی رۆم بوونەوە، ئەوان بە پێلا واتە نێزە کە هەندێ کات کاری زووبینی ئەنجامدەدا، پێشیان بە سوارەکانمان گرتبوو یاخۆ بە شمشێر رێگەیان لە رۆیشتنی سوارەکانم دەگرت، هەرچەندە لێیان دەکوژرا. وێڕای ئەوەش هەندێ لە سوارەکانم کە خەڵکی کۆشان یان باکتریا بوون، لە هاویشتنی کەمەند کارامە بوون، دەیانتوانی سەربازە رۆمەکان بخەنە کەمەند و دەستبەجێ ڕووی ئەسپەکانیان دەسوڕاندەوە و سەربازەکەیان بە دووی خۆیاندا ڕادەکێشا و سەربازە رۆمەکانیش کە تێدەکۆشان بۆ رزگاربوونیان لە کەمەند، بە سەر زەویدا رادەکێشران.

ئەوان هەوڵیان دەدا بە خەنجەر یاخۆ شمشێر پەتی کەمەندەکە بپسێنن، بەڵام بۆیان نەدەکرا، چوونکە لە کۆشان و باکتریا بەنی کەمەندەکانیان بە ریشاڵەکانی کانزایی تایبەت چێ دەکرد تا ئەو کەسەی دەکەوێتە داوی کەمەند نەتوانێت بە خەنجەر و شمشێر ئەو پەتانە بپسێنێت. تەنانەت لە هەندێ لە بەشەکانی نیشتمانی من پەتەکانیان تەنیا لە کانزاکان و بێ سوود وەرگرتن لە ریشاڵەکانی ئاوریشم و خوری چێ دەکرد، بە شێوەیەکیش بوو کە توانای گرێدان و بازنەکردنیان دەبوو.[1]

---

([1]) تا ئێستەش لە شاری یەزد ئەو شێوە پەتانە چێ دەکرێن و وەك هەر پەتێکی ئاسایی توانای کۆکردنەوە بە شێوەی بازنە و گرێدانیان هەیە، تا ئەو دواییانە بە زنجیری یەزدی دەناسران. "زەبیحوڵڵا"

ئەو سوارەی دەیتوانی سەربازێك لە رۆمەكان بخاتە نێو كەمەندەكەیەوە، بە دوو هۆكار پەلەی دەكرد تا ئەو لە گۆڕەپانی جەنگ بیباتە دەرێ، یەكەم ئەوە بوو كە ئەو بابەتە هەم كاریگەریی هەبوو لەسەر بەرزكردنەوەی پلەی ئەو شەڕڤانە، هەمیش بە ئازایەتیی بۆ ئەو جەنگاوەرە هەژمار دەكرا، دووەم ئەوە بوو كە دەیەویست بیباتە پشت گۆڕەپانی شەڕ تا زانیاریی بە سوودی پتری لەبارەی لەشكری دوژمن لێ وەبگیرێت، بەڵام لەنێوەندی لەشكر كە خۆم لەوێندەر بووم، پیادە بەهێزەكانی من بە شێوەیەكی بەرچاو بەرەو پێشڤە دەچوون، چوونكە ڤالەریەن سەوڵچییەكانی لە نێوەڕاست دانابوو، ئەوانیش هێزێكی تەكووز و رێك نەبوون، هەروەسا توانا و لەسەرخۆیی سەربازەكانی لژیۆنیان نەبوو، لە لایەكی دیكە بەشێك لەوان كریستیان بوون، دەیانزانی كە من ئەوان دەپارێزم، بۆیە هەر كە چاوی فەرماندەكانی رۆمیان لێ ون دەبوو، خۆیان ڕادەستی من دەكرد، منیش ڕام سپاردبوو هەر سەربازێكی كریستیان كە خۆی ڕادەست دەكات، بەپەلە بیكشێننەوە بۆ پشت مەیدانی جەنگ و بیاندەنە دەست ئەفسەرەكانی سەر بە سۆرین (فەرماندەی كریستیانەكانی لای من) كە بەشێكیان لە بەشەكانی یەدەگی لەشكرەكەم بوون. سەربازەكانی من دەیانزانی كە ئەو كریستیانانەی دیل دەبن، نابێت وەك دیل سەیر بكرێن، بگرە پێویستە ئەوان وەك میوان ڕێزیان لێ بنرێت.

لەپڕ لە لای راستی منەوە دەنگی خوێندنی سروودی لژیۆن هات، دواتر لە لای راستیشمەوە ئەو سروودە خوێندرا، من زانیایم هەبوو كە لژیۆنە رۆمەكان لە كاتی جەنگدا ئەو سروودە دەخوێنن و موزیكیش لێ دەدەن، هەر لژیۆنێكی رۆمی موزیكی تایبەتی هەبوو.

هەرچەندە لە مەیدانی جەنگ بووم، بەڵام سروودەكەیان كاریگەریی دەكردە سەرم، چوونكە زمانی رۆمەكانم دەزانی، تێدەگەیشتم كە سروودەكەی ئەوان دەڵێت: "هەڵۆكان هێمای سەركەوتنن، لە هەموو شوێنێك دوژمنانی رۆم دەخرێنە ژێر پێكانمان".

سروودی لژیۆن زۆر كۆنە، لە (٢٥٠ پ. ز) ئەندامێكی ئەنجومەنی سینای رۆم كە فەرماندەی لژیۆنیش بووە، وتوویەتی و ناوی ئەو (كاتۆ) بوو، ئێستە لە سەردەمی وتنی ئەو سروودەوە (٥١٠) ساڵ تێپەڕ بووە. لە رابردووی كۆندا تەواوی سیناتۆرەكانی رۆم دەبووایە لەگات بن تا هونەرەكانی جەنگ بزانن، لژیۆنە رۆمەكان بەر لە دەستپێكی جەنگ ئەو سروودەیان دەوت، دوای ئەوەی جەنگ دەستی پێدەكرد چیدیكە ئەو سروودە نەدەبیسترا، چوونكە سەرقاڵبوون بە جەنگ دەرفەتی ئەو كارەی پێنەدەدان، بەڵام ئەگەر لە جەنگدا دۆخەكەیان بەرەو سەختی رۆیشتبایە، ئەوا بۆ بەهێزكردنەوەی وورەی ئەوانەی سست ببوون، ئەو سروودەیان پێكەوە دەوتەوە، وورەیان پێی

بەرزدەبۆوە و خۆڕاگریانی پتر دەکرد، دەرکەوت گووشاری ئێمە بۆ سەر ئەوان بەرەو زیادبوون دەڕۆیشت، بۆیە ئەوانیش ئەو سروودەیان دەخوێندەوە.

فەرمانم بە شاندەر کاهەنی فەرماندەی گالیسکەکان و ئەردەشێر مای مەنی فەرماندەی سوارەکانم کردبوو تا بە هەر ڕێگەیەك دەتوانن، خۆڕاگری دوژمن تێك بشکێنن. بە ئەوانم وتبوو کە ئێوە سوارەن و سەربازانی رۆم پیادەن، ئێوە یەکەمجار نییە جەنگی رۆمەکان دەکەن، بایەخی جەنگی ئەوان دەزانن، ئەگەر نەتوانن بەسەریاندا سەربکەون، بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئێوە نەتان توانیوە سەربازەکان هان بدەن بۆ فیداکاری. من دەزانم ئێوە لێخووڕی گالیسکە و تیرهاوێژ و سواری دلێرتان هەیە، بەڵام هەرچەندە سەربازەکان دلێر بن، دەبێت ئەفسەرەکان هانیان بدەن و ورەیان بەرز بکەنەوە تا لە مەیدانی جەنگدا بە تەواوەتی ئازایەتیی بنوێنن.

ئەوانیش سەرباز و فەرماندەکانیان هاندا و گووشاری گالیسکە و سوارەکانیان بۆ سەر لژیۆنە رۆمەکان زیادی کرد، لێخووڕی گالیسکەکانیش بە شێوەیەك گالیسکەکانیان کە سەربازی تیرهاوێژی تێدابوو، ئاراستە دەکرد و بەرەو پێشڤە دەچوون کە گومان دەکرا ئەگەر دیواری ئاسنینیش بێت، بە ئاسانی بە ناویدا دەڕۆن.

لە پڕ هەستم کرد ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو لە لای راستی ڤالەریەن کە سوارەکانمان بۆ تێك شکاندنی تێدەکۆشان، ڕوودەدات، بوویەرەکە ڕووداوێکی جەنگی نییە، دواتر راپۆرتی ئەردەشێر فەرماندەی سوارەکانم بۆ هات کە ئاوی رشووبارەکە دەستی بە هەڵکشان کردووە. هەرچەندە شەوی رابردوو گریمانی زیاد بوونی ئاوم دەکرد، بۆیە خێوەتگەکەمم دوور لە فورات دابەستا، بەڵام چاوەڕوان نەبووم ئەو رۆژە ئەوە ڕوو بدات.

هێندەی بە چاو دەبینرا، ئاسمان بێ هەور بوو، هەمووان دەیانزانی لەو نێزیکانە باران نەباریوە، ئەو بارانە بە خوڕەی لە سەرچاوەی ڕووباری فورات و لە شاخەکاندا باریوە، ئاوی ڕووبارەکەی بەو خێراییە زیاد کردووە. ئاوی زێ بە ڕادەیەك بە خێرایی دەهاتە خوارەوە کە سوارەکانی من و لژیۆنەکانی رۆم ناچار بوون لە کەنارەکانی زێیەکە دوور بکەونەوە.

هەڵکەوتەی ناوچەی ئەدەس بە شێوەیەك بوو کە لە کاتی لافاودا ئاو زۆرتر بەرەو کەنارەکانی رۆژهەڵات دەهات کە گۆڕەپانی جەنگی لێ بوو. زێی فورات هەموو ساڵێك لە وەرزی بەهار لە ناوچەی ئەدەس سەرڕێژی دەکرد، هەندێك لە کەنارەکانی رۆژهەڵاتی دادەپۆشی، بەڵام بە شێوەیەك نەبوو کە بار قورسی بنێتەوە، ئەو بەشەش لە کەنارەکانی فورات کە لە بەهاردا دەکەوتە ژێر ئاو بە زوویی دەبۆوە قوڕئاو یاخۆ لیتاو.

لافاو و سەرڕێژی ئەو ڕۆژە ئاسایی نەبوو، چوونکە بە هۆی تێپەڕبوونی چل و پێنج ڕۆژ لە وەرزی بەهار ئاوی فورات کەمی کردبوو، بەڵام لەگەڵ هەڵکشانی ئاوی ڕووبارەکە، ئەو بەشەی کەنارەکان کە کەوتبۆوە ژێر ئاو وەك زۆنگاوی لێهات، سوارەکانی ئێمە و پیادەکانی ڕۆمی نەیاندەتوانی لەو ناوچەیەدا بجەنگن.

شەڕگەی ڤالەریەن کە تا ئەو دەمە تا ڕووبارەکە بەردەوامی هەبوو، بەرەو ڕۆژهەڵات کۆبۆوە سەریەك، سوارەکانی منیش وەك پیادەکانی ڕۆم بەرەو ڕۆژهەڵات هەڵگەڕانەوە، ناچار بووم ناوەندی سوپاکەم بەرەو ڕۆژهەڵات ببەم تا سوارەکانم شوێنیان بۆ جەنگ کردن دەست کەوێت.

ئاو بە ڕادەیەك خێرا سەردەکەوت کە ئەو قەڵایەی ڕۆژی پێشتر سەربازە ڕۆمەکان بە پەلە لە کەنارەکانی ڕووبار دروستیان کردبوو، گرتە خۆی و بینیم ڕێڕەوی ئاو لە باکورەوە بۆ باشوور، بە خێرایی دیوارە گڵینە بێ هێزەکانی هەڵتەکاند.

تا بەرلە زۆربوونی ئاوی ڕووبارەکە و دوای زیادبوونی گووشاری گالیسکە و سوارەکانمان، ئێمە لە دۆخێکی باشدا بووین، بەڵام دوای تەسك بوونەوەی گۆڕەپانی جەنگ بە هۆی سەرکەوتنی ئاو، دۆخی لەشکری من بە چەشنێك گۆڕا کە گالیسکەکانم توانای سوود لێ وەرگرتنیان نەما، ناچاربوون لە گردوولکەکانەوە هێرش بکەنەسەر لژیۆنەکانی ڕۆم. ئەمەش بۆ ئێمە بێ سوود بوو، چوونکە لە لایەك گالیسکەکان جووڵەیان لەو زەوییە نارێکانەدا هێواش و سەخت بوو، لە لایەکی دیکەیش سەربازانی ڕۆمی سوودیان لە کەند و کۆسپەکانی زەوی وەردەگرت و خۆیان حەشار دەدا و لەپڕ بە نێزە سێ پەڕەکانیان جووڵەی گالیسکەکانیان دەوەستاند.

سوارەکانیشم بە هۆی لەیەك کۆبوونەوەی سەربازەکانی لژیۆن و چڕبوونەوەی ئەوان و سنوورداربوونی گۆڕەپانی جەنگ، لە توانایان نەبوو ریزەکانی ئەوان تێك بشکێنن و نەشیاندەتوانی لە ڕووبار بپەڕنەوە و خۆیان بگەیەننە پشت لژیۆنەکانی ئەوان، چوونکە دوو چینی دیاری لەشکرەکەم کە من پاڵپشت بە ئەوان دەمەویست لەشکری دوژمن بشکێنم، کەوتبوونە تەنگەتاوی، بۆیە بڕیاری پاشەکشەی گشتیم دەرکرد و ویستم بەرەو باشوور بڕۆین تا دەگەینە شوێنەك کە نە ئاوی زێ و نە گردەکان بۆ من کێشە دروست بکەن و نەبن بە ڕێگر بۆم.

فەرمانم بە فەرماندەی گالیسکە و سوارەکانم کرد کە پاشەکشە بە ڕێکوپێکی بکەن، چوونکە لەوانەیە دوای پاشەکشە و لە هەمان ڕۆژدا لەگەڵ دوژمن بجەنگینەوە.

زانیاریم هەبوو کە ئەگەر لەو ناوچەیە بەرەو باشوور بڕۆم، دەگەمە شوێنێك کە قووڵیی ڕووبارەکە زیاد دەکات و سەرکێشی ئاو نامێنێت، هەرچەندە هێشتا هەندێك لە کەنارەکانی

ڕۆژهەڵات تەڕ دەکات، بەڵام بەو ڕادەیە نابێت کە ناوچەیەکی فرەوان بخاتە ژێر ئاو و هێرشی سوارەکانی من ڕابگرێت.

گریمانی ئەوەم نەدەکرد ڤالەریەن دوای پاشەکشەی من وا بزانێت کە هەڵدێین، چوونکە ئەو پێش ئەوەی ببێتە ئیمپراتۆر ماوەیەك لە لەشکری ڕۆمدا لەگات بووە، تێدەگەیشت کە پاشەکشە و هەڵاتن لەیەك جودان. وێڕای ئەوەش گومانم نەبوو کە ئەو لەوکاتەدا بە شوێنمدا دێت، کاتێك گەیشتبامە شوێنێك کە بۆ جەنگ گونجاو بووایە، دەوەستام و جەنگم دەست پێ دەکردەوە.

کاتێك دەستمان بە پاشەکشە کرد، لە دڵی لەشکرەکەم بووم و لەگەڵ پاسەوانەکانم، لەگەڵ دواین دەستە لە سەربازە پیادەکان کەوتمەڕێ، لەوکاتەدا پێلایەك کە لە بازووی بەهێزی سەربازێکی ڕۆمی دەرچووبوو بەر ئەسپەکەم کەوت و کوشتی. منیش بەرلەوەی بکەومە ژێر لاشەی ئەسپەکەم، خۆم هەڵدا و ئەسپێکی دیکەیان بۆ هێنام و سوار بووم، بینیم سەربازە ڕۆمەکان لە پشت ئێمەوە لە جووڵەدان.

ڕێگەی ڕۆیشتنی منیش هەروەك ڕێگەی ڤالەریەن، دەکەوتە کەناری ڕووبار، منیش وەك ئەو نەمدەویست لە ڕووبارەکە دوور بکەومەوە، چوونکە تەنیا سەرچاوەی ئاو لەو ناوچەیە ئەو ڕووبارە بوو، ئەگەر لەشکرەکەمم بەرەو دەشتە بەرینەکانی ڕۆژهەڵات بردبایە، هەمووان لە تینوویەتیی دەخنکان، چوونکە لەشکری دوژمن بەدووی ئێمەوە بوون، بە شێوەیەك دەڕۆیشتم کە لەکاتی هێرشی ڤالەریەن بۆ سەر لەشکرەکەم، بتوانم بەرگری بکەم و ئاریشی لەشکرەکەم هی ڕێپێوان نەبوون، هەر بە ئارایشی جەنگی دەڕۆیشتم، بۆیە بە هێواشی ڕێگەم دەبڕی، لەگەڵ ئەوەشدا بەر لەوەی ڕەنگی تیشکی خۆر بە هۆی نێزیك بوونەوەی ڕۆژئاوابوون ببێتە ئەرخەوانی، گەیشتمە شوێنی مەبەست، فەرمانم بە فەرماندەکاندا تا ئارایشی جەنگی خۆیان بپارێزن، هەر بەو ئارایشەوە ڕێگە بە سەربازەکانیان بدەن تا پشوو وەربگرن. فەرمانم کرد تا ئالیك بدەنە ئەسپی ئەسپ سوارەکان و ئەسپی گالیسکەکان و بزانن ئێمە ئەو شەوە دوای پشوودان هێرش دەکەینە سەر خێوەتگەی دوژمن، چوونکە لەوانەیە لە مێژووی ئەواندا یەکەمجار بێت کە نەتوانن لە دەورەی خێوەتگەکەیان دیوار دروست بکەن، ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ درەنگی کاتەکە، ئەو کاتەی ئەوان دەگەیشتن، بەرلەوەی بتوانن دیوار دروست بکەن، شەو دەگات و ئەوان دەرفەتیان نابێت لەو شوێنە کە هەمووی خیزەڵێنە، گڵی پێویست بۆ دیوار دروست کردن دەستەبەر بکەن. ئەگەر بشیانەوێت لە ڕۆژهەڵاتەوە گڵ بۆ ئەوکارە بێنن، چوونکە گڵی زۆریان پێویستە، بۆ ئەوەش کاتی زۆریان دەوێت و ناتوانن بەرلەوەی پەلاماری ئێمە بۆ سەریان دەست پێ بکات، دیوارەکە دروست بکەن.

هەروەها ئەگەر هەوڵ بدەن بۆ بە دەستهێنانی گڵ، زەوی هەڵبکەنن، دیسان کاتی زۆریان پێویستە، بۆیە بەر لەوەی دیوارەکە دروست بکەن، پەلاماری ئێمە دەست پێ دەکات، تەنانەت لەو ناوچەیە بەردیشیان دەست ناکەوێت تا بیکەنە کەڵەکە بەرد و رێگەی پەلاماری ئێمە بگرن. بۆیە پێویستە ئێمە سوود لەو دەرفەتە تایبەتی و دەگمەنە وەربگرین، هەر ئەو شەوە پەلاماری خێوەتگەکەیان بدەین.

فەرماندەکانم وتەکانی منیان پشتڕاست کردەوە، منیش وتم ئەگەر ئەسپ و سەربازەکانمان ماندوو نەبوونایە هەر ئێستە فەرمانی هێرشم دەردەکرد، بەڵام هەمووان برسی و تینوون و پێویستیان بە ماوەیەك پشوودان هەیە. ئۆردووگەمان دانەمەزراند، چوونکە دامەزراندن و کۆکردنەوەی کەلوپەلەکان پێویستی بە کات هەبوو، بۆیە هەرچەندی لە توانامانداهەبوو، دەبووایە دەست بە کاتەوە بگرین تا سەربازەکانمان پتر بخەون، ئەسپەکانیش ئالیکی پتر بخۆن، پێداویستییەکانی ڕووناك کردنەوە دەبووایە بە تەواوەتی ئامادە بکرێت تا لە کاتی پەلامارەکەماندا بتوانین بە باشی دوژمن ببینین.

فەرماندەکانم دڵنیایان کردمەوە کە تەواوی پێداویستییەکان بۆ پەلامارەکە دەستەبەر و ئامادە دەکرێت.

بیرم نەدەکردەوە کە رۆمەکان ئەو رۆژە بتوانن پێداویستیی لە بەرد یاخۆ گڵ دەستەبەر بکەن تا دیوار بە دەورەی خۆیاندا دروست بکەن، بەڵام بینیم هەموو ئەو مەنجەنیقانەی ئەو رۆژە لە جەنگدا لێیان تێك شکێندرا بوو یاخۆ ئەوانەی مابوون، لە لایەکی خێوەتگەی خۆیان دانا، بەڵام مەنجەنیقەکان ژمارەیان هێندە نەبوو کە بتوانن دەورەی هەموو ئۆردووگەکە بگرنەوە.

لەو شوێنەش ئاوی فورات لە ڕێڕەوی خۆ دەرچوو بوو، بەشێکی کەم لە کەنارەکانی گرتبۆوە، سەربازەکانم کە خێوەتگەیان نەبوو بە زوویی لەسەر زەوی خەوتن، منیش کە هەر وەك ئەوان خێوەتم هەڵنەدابوو، لەسەر زەوی راکشام. هەوا گەرم و خیزی کەنار زێیەکە فێنك بوو، بۆیە ڕاکشان لەو جێگەیە فێنك و نەرمە خۆشی پێبەخشیم و دڵ خۆش بووم کە سەربازەکانم کە ناچارم کردوون لەسەر زەوی بخەون، هەموویان جێگەیان نەرمە، لە کاتی هاویندا شوێنیان فێنکە، لەو ناوچەیەشدا هیچ زۆنگاوێك نەبوو تا سەربازەکانم بە دەست مێشوولەوە هەراسان بن.

دەمزانی ئەو شەوە رۆمەکان هەوڵ نادەن پەلامارمان بدەن، چوونکە رۆژی پێشتر ئەوانم بەپێی پێویست ماندوو کردبوو، ئەوانیش پێویستیان بە پشوودان هەبوو، دوای ئەوەی خێوەتگەی خۆیان دامەزراند، دڵنیاتر بووم لەوەی ئەوان هێرش ناکەن، چوونکە ئۆردووگەی ئەوان بە شێوەیەك

دادەمەزرا کە ماوەیەکی پێویست بوو تا ریزەکانی ئەوان دوای دەرچوون لە خێوەتگەکەیان، ئامادە بن بۆ پەلاماردانمان. بۆیە بە فەرماندەکانی خۆمم وت تا سەربازەکانم ماندوو نەکەن بە گەڕان لە نێوان خێوەتگەی دوژمن و لەشکرەکەم، چوونکە ئەگەر ئەوان هەوڵی پەلاماریشیان دابووایە، ئێمە بۆ جەنگ ئامادە بووین و دەمانتوانی بێ دواکەوتن بچینە نێو جەنگ.

بڕوام وابوو هەڵکشانی ئاوی فورات و سەرکەوتنی بەسەر کەنارەکاندا، بۆتە هۆی فێنك بوونی هەوای ئەو شەوە لەو وەرزەی ساڵدا.

پێش ئەوەی بخەوم بە شاندەر کاهەنی فەرماندەی گالیسکەکان و ئەردەشێر مای مەن فەرماندەی سوارەکانم وت کە پێویستە جەنگی ئەم شەومان یەکلاکەرەوە بێت و بەسەر دوژمندا سەرکەوین.

شاندەر کاهەن وتی بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمندا تا دوایین گالیسکەم فیدا دەکەم.

پێم وت: هەرچەندە پاشەکشەی رۆمەکان سەختە، بەڵام ئەگەر ئەوان پاشەکشە بکەن دەگەنەوە ئەو ناوچەیەی کە لافاو لێی دابوو، پێویستە تۆ سەرەتا رۆمەکان گەمارۆ بدەی تا نەتوانن پاشەکشە بکەن، دواتر ئەوان لەنێو ببەی.

ڕاسپاردەیەکی دیکەم بۆ فەرماندەی گالیسکە و فەرماندەی سوارەکانم ئەوەبوو کە ئەگەر رۆمەکان ویستیان ڕا بکەن، رێگەیان پێبدەن، بەڵام رێگەدانەکە بەو شێوەیە نەبێت کە بتوانن بە شێوەی یەکەی تەواو و بە رێکی رابکەن، دواتر ئامادە ببنەوە بۆ بەرگری، بگرە ئەگەر بینیمان ئەوان بە پەراگەندەیی و تاك تاك ڕادەکەن، رێگەیان بدەن تا لەشکری ڤالەریەن لاواز ببێت. دەمزانی سەربازەکانی لژیۆنەکانی رۆم ڕاناکەن، بەڵام ئەوانەی ڕەسەنیان رۆمی نییە و لە وڵاتانی ژێردەستەی رۆمەوە هاتوون، ڕادەکەن.

هەروەها پێموتن سوود لە هەموو دەرفەتێك وەربگرن و بەردەوام بە سەربازانی رۆمی بڵێن ئەگەر خۆیان بەدەستەوە بدەن، دوای جەنگ ئازاد دەکرێن و بە ناوی من ئەو بەڵێنەیان پێ بدەن، سەربازەکانی رۆم دەیانزانی پاشای ئێران بەڵێنی خۆی ناشکێنێت و ئەمەکی بەرانبەر بە وتەکانی هەیە. دەمزانی ئەو بەڵێنە بۆ لەگاتەکانی رۆم بێ سوودە و ئەوان لەو کەسانە نین، خۆیان بە دەستەوە بدەن، تەنیا ئەوکاتەی بزانن جەنگ کۆتایی هاتووە و بەرگری و خۆڕاگری بێ سوودە.

وەك وتم ئەو ناوچەیەی ئێمەی لێ بووین خیزەڵێن بوو، بەڵام لە لای راستەوە ئەو خیزەڵێنەی کەناری فورات بە دەشتێکی ئاسایی دەبەسترایەوە و بەشێك لە گالیسکەکانیشمان دەبووایە لەو شوێنەوە هێرش بکەنەسەر ئۆردووگەی رۆمەکان.

ئەی ئەو ڕێبوارەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنیتەوە، لەوانەیە بە بڕوای تۆ پەلاماردانی دوژمنێك کە لە خێوەتگەکەی خۆیدا خەوتبێت کارێکی ئاسان بێت و بیر بکەیەوە لەشکری هێرشبەر دەتوانێت بە ئاسانی و لەپڕ هێرش بکاتە سەری، بەڵام لە پەلامارداندا گرینگترین بابەت ئەوەیە کە لەشکری پەلاماردەر نەکەوێتە ناو نارێکی و سەرلێ شێوانەوە، ئەمە وادەکات کە توانای خۆی لەدەست بدات.

لە کاتی ڕۆژدا بە هۆی ئەوەی هەمووان دەبینرێن، دووچاری هەڵە نابین و دۆست و دوژمن لە یەکدیی جودا دەکرێتەوە، بەڵام لە شەودا تەنانەت ئەگەر مەشخەڵەکانیش داگیرسێنرێن، جیاکردنەوەی دوژمن و خۆیی ئاسان نابێت، هەندێ جار دوژمنی زیرەك پێداویستیی بۆ گۆڕینی هەندێ لە سەربازەکانی بۆ شێوەی دوژمن دابین دەکات، ئەوکات جەنگ لەنێو بەرەی خۆیی دروست دەبێت، ئەو دەمەی فەرماندەی یەکەکان ئەوەیان بۆ ڕوون دەبێتەوە، ئاکامی جەنگ دەگۆڕێت و ئەو جەنگە لە جیاتی سەرکەوتن بە شکست کۆتایی دێت، بۆیە ئەو لەشکرەی بە شەو پەلامار دەبات و دەیەوێت لەشکری دوژمن لەنێو ببات، پێویستی بە فەرماندەی لێهاتوو و زیرەك هەیە، ئەفسەرەکانی خوارەوە پێویستە تێ بکۆشن، تەنانەت لە سەختترین کاتەکانی هێرشدا، سەربازەکانی یەکەکانیان تێکەڵ نەبن لەگەڵ سەربازانی یەکەکانی دیکە.

ئەگەر دوژمن هەوڵ بدات فێڵ بکات، ئەفسەرە پلەبەرز و پلە نزمەکان پێویستە فێڵی دوژمن بزانن، بەر لەوەی جەنگی سەربازەکانی خۆیان بکەن، هەمووان لەو فێڵ تەڵەیە ئاگەدار بکەنەوە.

ئەو کەسەی دەیەوێت هێرشی لەپڕ بکات، نابێت لە سەرەتای شەو ئەو کردەیە ئەنجام بدات، واتە ئەو کاتەی هێشتا سەربازەکانی دوژمن نەخەوتوون، هێرش بکات، نابێت هێرشەکەش هێندە بە درەنگ بخات تا لە شەوەکانی بەهار و هاویندا سێ ئەستێرە هەڵبێن.(٢)

لەو کاتژمێرەی پێویست بوو پەلامارەکەمان دەست پێ بکەین، پێش ئەوەی کەس من لە خەو هەستێنێت، هەستام و من لە دڵی لەشکردا بووم و فەرماندەیی ڕاستەوخۆی سەربازە پیادەکانم لە ئەستۆ بوو. دوای هەستانم لە خەو، سەربازە پیادەکانیان هەستاند، ئەوان هەموویان بۆ جەنگ ئامادە بوون و جلی شەڕیان لەبەردا بوو، دوای هەستانیان هیچ کارێکیان نەبوو، تەنیا پێویست بوو ڕیزەکانیان ڕێك بخەن و بکەونە ڕێگە بۆ شەڕکردن.

---

(٢) سێ ئەستێرە ئەوانەن کە لەسەر یەك هێڵی ڕاستن و لە شەوانی هاوین و بەهاردا دوای یەك یاخۆ دوو دەمژمێر لە دوای نیوەشەو هەڵدێن. "زەبیحوڵڵا"

دەمزانی کە لە لای راست و چەپی لەشکرەکەشم هەموو سەربازەکان وەك ناوەندی لەشکرەکەم هەستاون و ئامادەن بۆ پەلاماردان، گوێم هەڵ خست تا بزانم هیچ دەنگێك دێت یاخۆ نا، جگە لە دەنگە نادیارەکان کە کزبوون و نەدەگەیشتنە رۆمەکان، دەنگی دیکەم بەر گوێ نەکەوت. لە کاتێکدا کە لە بەرەبەیاندا و ئەوکاتەی سەربازان هەڵدەستن تا خێوەتگەکەیان کۆبکەنەوە و ئامادەی جەنگ بن، کەرەنا و موزیکی جەنگیش لێ دەدرێت، بەڵام ئەو شەوە چوونکە دەمانەویست لەپڕ پەلاماری دوژمن بدەین، هیچ دەنگێك لە لەشکرەکەمەوە نەدەهات، تەنانەت مەشخەڵەکانیش پێ نەکرابوون، چوونکە هەمووان دەیانزانی کاتێك دەگەنە دوژمن دەبێت مەشخەڵەکان پێ بکەن، دوای ئەوە دەستبەجێ پەلامارەکە دەست پێ دەکەن. ئەگەر زووتر مەشخەڵەکان پێ بکرێن، دوژمن ئاگەدار دەبێتەوە.

ئەگەر ئەو شەوە سەربازەکانم ماندوو نەبووانە، بەر لەوەی رۆمەکان خێوەتگەی خۆیان ئامادە بکەن، پەلامارم دەدان، هەر بۆیە ماندوویەتیی سەربازەکانم بووە مایەی دواخستنی پەلامارەکە بۆ ئەوەی بە تەواوەتیی دڵنیا بین لە نووستنی سەربازە رۆمەکان.

ئەگەر ئەو رۆژە لەگەڵ نێزیکبوونەوەیان، هێرشم کردبایە سەر رۆمەکان، ڕووبەڕووی بەردبارانی مەنجەنیقەکانیان نەدەبوومەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئەو یەکەی لەگەل مندا بوون واتە لەشکری پیادە لە رۆمەکان نێزیك بوونەوە، ئەوان بەردبارانیان دەست پێکرد.

گالیسکەکانم کە لە لای راستم بوون، دوای ئەوەی هێرشیان کرد، لەلایەن رۆمەکان بەرد باران نەکران، چوونکە رۆمەکان لەسەر رێگەی ئەوان مەنجەنیقیان دانەنابوو. سوارەکانیش کە لە لای چەپ هێرشیان کرد بە هەمان شێوە بوون، چوونکە رۆمەکان مەنجەنیقیان لەسەر رێگەی سوارەکان دانەنا بوو.

رۆژی پیشتر ئێمە بەشێکی زۆر لە مەنجەنیقەکانی ڤالەریەنمان لەنێوبرد، ئەو بە رێژەی پێویست مەنجەنیقی نەبوو تا لە هەموو لایەك جێگیریان بکات، بۆیە هەموویانی لە باشووری خێوەتگەکەی دانابوو تا ببنە دیواری خێوەتگەکەی.

وێڕای ئەوەی دڵنیا بووم لە رێك کاری لژیۆنەکانی رۆم، بەڵام پێشبینی ئەوەم نەدەکرد کە لە کاتی نێزیك بوونەوەم لە ئەوان، بتوانن بەرد بارانمان بکەن، تەنیا گریمانم دەکرد کە ئەوان مەنجەنیقەکانیان وەك رێگر و دیوار لە بەرانبەر خێوەتگەکەیان دانابێت، لەلایەکی دیکە لەو ناوچەیەدا جگە لە خێز هیچی دیکەی لێنەبوو، رۆمەکان نەیاندەتوانی بەردی پێویست بۆ بەردباران کردنمان دەستەبەر بکەن، بەڵام دوای کۆتایی هاتنی جەنگ لە لەگاتە رۆمەکانم بیست کە ئەوان

لەگەڵ خۆیاندا برێك بەردیان هێنا بوو، چوونکە پێشبینی ئەوەیان کرد بوو کە ڕەنگە بەردیان لەسەر رێگە دەست نەکەوێت.

بەرگەی بەردبارانی سەخت و چاوەڕوان نەکراوی رۆمەکانم گرت و ژمارەیەك لە پیادەکانم کەوتنە سەر زەوی، خۆشبەختانە بەردبارانەکان ئەوکاتە دەستی پێکرد کە لە دڵی سوپادا هێشتا مەشخەڵەکانمان پێ نەکردبوو. ئەو شەوەش مانگ زوو هاتەدەر و ون بوو، کاتێك ئێمە بەرەو خێوەتگەی رۆمەکان رۆیشتین، شەو تاریك بوو، ئەگەر ئێمە مەشخەڵەکانمان پێ کردبووایە، ئەوان ئێمەیان باشتر دەبینی و بە دروستی نیشانەیان دەگرت.

من تا ئەوکات، مەنجەنیقم بە چەکێکی قورس و ئازاربەخش و بێ سوود دەناسی و هیچ بایەخی جەنگیم بۆ دانەدەنا، بەڵام لە ڕووداوەکانی ئەو شەوە بووم دەرکەوت کە ئەگەر مەنجەنیق بە باشی بەکار بهێندرێت، چەکێکی باش دەبێت، بۆیە لەوکات بەدواوە کردم بە بەشێك لە پێداویستیی جەنگی خۆم، ئێستە تەواوی یەکەکانی سەربازی من مەنجەنیقیان هەیە.

هەرچەندە من لەناکاو هێرشم بۆ سەر ڤالەریەن کرد، بەڵام کاتێك گالیسکەکانم گەیشتنە لەشکری ئەوان، ڕووبەڕووی بەرگری سەخت بوونەوە و خۆیان بەرانبەر بە ئامرازێکی بەرگری چاوەڕوان نەکراو بینییەوە کە برێتی بوو لە ئاگر.

سەربازەکانی رۆم گۆزەی گەورەی پڕ لە رۆنیان لابوو کە پلیتەی ئەستووریان هەبوو دوای ئەوەی پلیتەکەیان پێدەکرد، بەرەو گالیسکەکانی ئێمەیان هەڵدەدا و دەکەوتنە نێو گالیسکەکان، گۆزەکان دەشکان و لەنێویانەوە جۆرە ئاگرێك کە لە شلە دەچوو، لە گۆزەکە دەهاتەدەر کە هەموو شتێکی دەسووتاند و سەرنشینی گالیسکەکانی ئێمە چەندی دەیان کرد نەیاندەتوانی ئاگرەکە بکوژێننەوە. دوای جەنگ من زانیم ڤالەریەن ئەو شەوە بە رادەی پێویست لەو ئاگرەی نەبوو، ئەگەر نا یەك گالیسکەمان نەیدەتوانی بگاتە خێوەتگەی رۆمەکانەوە.

پیادەکانم لە نێوەندی لەشکرەکەم توانیان مەنجەنیقەکان بەجێ بهێڵن، منیش بە سواری ئەسپ لەگەڵ ئەواندا بووم و دەمبینی سەربازە رۆمەکان بە چ توانایەکەوە هەوڵیان دەدا تا بە تیری سێ پەڕە کە بە دەستیانەوە بوو، پاشەکشە بە پیادەکانی من بکەن و هێرشەکە بوەستێنن.

رۆژی پێشتر سەربازەکانی رۆم کە تیری سێ پەڕیان بەدەستەوە بوو، لەگەڵ گالیسکەکانمان دەجەنگان، ئەو شەوە لەگەڵ پیادەکانی ئێمە ڕووبەڕوو ببوونەوە، بەڵام لەنێو ئەو سەربازانە هەندێ سەربازی دیکە دەبینران کە پێلا واتە نێزەی رۆمیان لابوو، هەندێ جار دەنگی تێپەڕینی نێزەم

دەهاتەبەر گوێ. سەربازەکانی هەردوولا هێندە چاونەترسانە دەجەنگان کە ڕەنگی سپی خێزەڵێنەکانی ئەو کەنارانە لەو شەوەدا لە ماوەیەکی کەم لەبەر ڕووناکی ئەستێرەکان ڕەش دەچوو.

هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر لە سەربازە پیادەکانم دەکوژران، بەڵام بەردەوام بوون لە جەنگ.

هەندێ کات لە ڕووناکی مەشخەڵەکاندا چاوم دەکەوت بە دەموچاوەکان و جلوبەرگە خوێناوییەکان، ئەوانەی بریندار دەبوون هێندە لە جەنگ بەردەوام دەبوون تا دەکەوتن و هیچ برینداریك نەیدەویست بۆ دواوە بکشێتەوە تا تیمار بکرێت.

لە ڕاست و چەپ و پێشەوە دەنگی شەڕ دەهاتە بەر گوێ، هەر پیاوێکی ئازا بەشداری لە جەنگی گەورەدا نەکردبێت، نازانێت ئەو هاوار و هەندامە و نەعرەتەی جەنگاوەران چۆنە و ناڵەی برینداران و هاواری بەرزی ئەو ئەفسەرانە کە سەربازەکانیان هان دەدەن بۆ جەنگ چییە، دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان و دەنگە تایبەتەکەی دەرچوونی تیر و کەوان لە ژێ و دەنگی پێکانی ئەسپی یەرغە، دەنگی تایەی گالیسکەکان و...هتد پێکەوە دەهات، دەنگێکی مەزنیان لێدەکەوتەوە کە تەنیا لە مەیدانی جەنگدا ئەو دەنگە دێت.

هاوکات لەگەڵ گوێ گرتنم لەو دەنگانە، هەستم بە دەنگێکی دیکە کرد، دەنگێکی دیکە هاتە بەر گوێم کە وەك دەنگی تێکەوتن و هاتنەدەری پێیەکانی ئەسپە لەنێو قوڕ و لیتەدا، بۆم دەرکەوت بە هۆی ڕژانی خوێنی زۆر و هەڵمژینی لەلایەن خیزەکانەوە، جۆرە لیتەیەك پێکهاتووە کە مڵچەی پێیەکانی ئەسپ لەنێویاندا دێت، لە کاتێکدا کە ئەگەر ئاو لەو کەنارانە هەبووایە و بەسەر ئەو خیزانەدا هاتبایە، بەهۆی خیزەکەوە هەڵدەمژراو و ئەو دەنگەی لێوە نەدەهات، بەڵام وەك دەزانن خوێن دوای دەرچوونی لە لەشی مرۆڤ، ڕاستەوخۆ دەمەیێت، هێندە خوێن ڕژا بوو کە توێژاڵێکی ئەستووری لەسەر خیزەکە دروست کرد بوو، ببووە هۆی دروستبوونی ئەو دەنگە لە کاتی ڕۆچوونی پێی ئەسپەکان تێیاندا.

کەمێك دوای هەست کردنم بە بوونی ئەو دەنگە تازەیە، لەپڕ پێڵایەك لەو بەشەی ڕانم ڕۆچوو کە ڕانبەند واتە پارێزەری لەسەر نەبوو. ڕانبەندی سوارە جیایە لە هی پیادە و ڕانبەندی پیادەش تەواوی ڕانی دادەپۆشێت، هی سوارە تەنیا سەر ڕانی دەگرێت، چوونکە ئەگەر بەشی خوارەوەی ڕانیش ڕانبەندی لەسەر بێت، سوار ناتوانێت لەسەر زینی ئەسپ دانیشێت.

نێزەکەم لە ڕانم دەرهێنا و دوورم هەڵدا، پاسەوانەکانم کە هەستیان بە برینداربوونم کرد داوایان لێ کردم تا لە مەیدانی جەنگ دەرچم، بەڵام من وتم لە گۆڕەپانی جەنگ دەرناچم دوای ئەوە خوێن لە ڕانم دەچۆڕایەوە و بە لاقمدا دەهاتەناو ئاوزنگی ئەسپەکەم. ماوەیەك دوای بریندار بوونم، لەلایەن

ئەفسەرێکی یەکەی گالیسکەکانم بە ناوی (تالیت) هەواڵم پێگەیشت کە شاندەر کاهن فەرماندەی گالیسکەکانم و سوارەکانم بەیەك گەیشتوون و لەشکری ڤالەریەن گەمارۆ دراوە. فەرمانم کرد تالیت کە دوای شاندەر کاهەن گەورەترین ئەفسەری ئەو یەکەیە بوو، ببێتە فەرماندەی گالیسکەکان، ئەو فەرمانانەی بە شاندەر کاهەن درابوو، ئەویش ئاگەداریان بوو، جێبەجێی بکات.

لەو شوێنەی من دەجەنگام، بەشێك لە سەولچییەکانی رۆم دەجەنگان، ئەوانەی کریستیان بوون، خۆیان ڕادەستی سەربازە پیادەکانی من دەکرد. خۆبەدەستەوەدانی کریستیانەکان، سەولچییەکانی دیکەیشی خستە بیر بۆ هەمان کار، ئەوان دەبووایە ئاگەدار بن تا هیچ ئەفسەرێکی رۆمی لە پشتیانەوە نەبێت، چوونکە هەرکە زانیبایان ئەوان خۆبەدەستەوە دەدەن لەلایەن ئەفسەرەکانەوە لە پشتەوە دەکوژران. سەربازەکانی من هەر کریستیانێك کە خۆی بەدەستەوە دەدا، دەیانگواستەوە بۆ پشت مەیدانی جەنگ، ئەمەش لەبەرئەوە بوو کە ئەگەر لە گۆڕەپانەکە مابووایەوە، بە هۆی هەڵکشان و داکشانی شەڕگەکە لەوانەبوو بەردەستی رۆمەکان دەکەوتن و دەکوژران.

فەرمانم بە سەردارەکانم کردبوو تا رێگە بەڕووی هەڵاتنی سەربازە لژیۆنەکاندا ئاوەڵا بکەن، چوونکە سەربازە لژیۆنەکانی رۆم هەڵ نەدەهاتن، بەڵام سەربازەکانی لژیۆنەکانی دەرەوە کە لەگەڵ ڤالەریەن بوون، لەوانە بوو ڕابکەن، هەڵاتنی ئەوانیش یارمەتیدەر بوو بۆ کەم بوونەوەی هێزی ڤالەریەن.

پێشبینییەکەم هاتەدی، لە هەردوو لای راست و چەپ، هەندێ لە سەربازانی لژیۆنەکانی دەرەوە کە لەگەڵ ڤالەریەن بوون، هەڵاتن، بەڵام سەربازە لژیۆنەکانی رۆم زۆر بە سەختی دەجەنگان، ئەوان دەجەنگان و دەکوژران، بەڵام هەڵنەدەهاتن و خۆیان بەدەستەوە نەدەدا.

من بە تەور دەجەنگام، پێموابوو کە تەور باشتر لە شمشێر دەتوانێت قەڵغانی سەربازە رۆمەکان کە هەندێکیان هەیانبوو، ببڕێت و بیانخات، بەڵام شمشێر لەوانەیە بەر بەشە کانزاییەکانی قەڵغانەکە بکەوێت و بشکێت یا خود لێوە تیژەکانی تێك بچن.

هەرچەندە بەپێی نەخشەی من، دەبوو مەیدانی جەنگ فرەوان نەکرێت تا بتوانم چاوەدێری هەموو مەیدانەکە بکەم، بەڵام بەهۆی فرەوانی خێوەتگەی ڤالەریەن، ناچار مەیدانی جەنگ دیسان فرەوان بوو.

تالیت فەرماندەی تازەی گالیسکەکانم، هەواڵی بۆ ناردم کە لەگەڵ ئەردەشێر مای مەنی فەرماندەی سوارەکان پێك گەیشتوونەتەوە، سوارەکان و گالیسکەکان پێکەوە بە نیوە بازنەیەك کە

چەند شوێنێکیان بەجێ هێشتووە، دوژمنیان گەمارۆ داوە، ئەو شوێنانەشیان بۆ ئەو کەسانە هێشتووەتەوە کە دەیانەوێت ڕابکەن، هەروەها ئەو هەواڵی پێدام کە گالیسکەکانی ئەو و سوارەکانی ئەردەشێر لەنێو خێوەتگەی دوژمن سەرگەرمی هێرش بردنن تا بتوانن توانای بەرگری دوژمن کەم بکەنەوە.

لەگەڵ سەربازە پیادەکانم بەردەوام بەرەو پێش دەڕۆیشتین، چوونکە بەردەوام و بێ پسانەوە تەورم رادەوەشاند، ئەو شەوە هەرچەندە هەوا فێنك بوو، بەڵام ئارەقەیەکی زۆرم کردبوو، هەستم کرد دەسکی تەورەکە لە دەستمدا دەخزێ، لەوانەبوو دەربچێت. بۆیە زرێیەکەمم دانا، کاتێك ئەو کارەم کرد، بای فێنکی شەو لە جەستەی دام و هەستم بە فێنکی و ئاسوودەیی کرد، فێنك بوونەوەم توانای تازەی پێ بەخشیم تا بتوانم سەرلەنوێ تەور بوەشێنم.

هەرچەندە کاسکێتەکەم بێزاری دەکردم، بەڵام ئەوم دانەنا، چوونکە لە سەرووییەوە گۆیەکی هەبوو کە بە هۆیەوە سەربازەکانم لە دوورەوە منیان دەناسیەوە، ئەو گۆیە هێمای پاشایەتیی بوو. بە دووری نازانم هەر ئەو گۆیە، منی بە سەربازانی دوژمن ناساندبێت، هێشتا لەژێر کاریگەریی هەستی فێنکایەتیمدا بووم کە تیرێك بە لای چەپی سینگم کەوت، بەڵام رۆنەچوو، تەنیا هەندێ لە پێست و ئێسکەکەی بریندار کرد، سەری تیرەکە کەوتەوە. ئەگەر ئەو تیرە بە شێوەی ستوونی بەر سینگم کەوتبایە، لەوانەبوو بمکوژێت، چوونکە لە سینگم رۆدەچوو و بەر بەشەکانی ناوەوە دەکەوت.

تیرەکەم لە سینگم دەرهێنا، لەبەرئەوەی کاتی پێویست بۆ تیمارکردنم نەبوو، کراسەکەمم لەبەر خۆم دادڕی و دوو پارچەم کرد، هەر پارچەیەکم خستە ناو یەك لە کونەکانی تیرەکە کە لە جەستەمی دروست کردبوو تا ڕێ لە ڕژانی خوێنەکە بگرم.

ئەردەشێر مای مەن فەرماندەی سوارەکانم پەیامی بۆ ناردم کە ئەگەر بەشێك لە سوارەکانم کە یەدەك بوون بۆی رەوان بکەم، دەتوانێت دووبارە هێز بکاتەوە بە بەر خۆیدا و هێرشی تووند بکاتەسەر دوژمن و هێزی بەرگری لژیۆنەکان تێك بشکێنێت. بەشێك لە سوارە یەدەگەکانم نارد بۆ یارمەتی ئەو و بە زوویی هەرایەکی گەورە لە لای چەپی منەوە هەستا، زانیم ئەوە نیشانەی هێز وەرگرتنەوەی ئەردەشێرە.

فەرمانم بۆ فەرماندەکانی لای راست و چەپم نارد تا بەو کەسانە بڵێن کە زمانی رۆمی دەزانن، بەرانبەر بە سەربازەکانی رۆم هاوار بکەن و بڵێن کە ئەوان لە گەمارۆدان و رێگەی ڕزگار بوونیان نییە، ئەگەر دەیانەوێت نەکوژرێن، پێویستە خۆیە دەستەوە بدەن، هەر سەربازێك خۆی ڕادەست

بكات، دوای جەنگ بە دیل ناژمێردرێت و ئازاد دەکرێت. خۆشم کە زمانی رۆمیم دەزانی هەندێ جار هاوارم دەکرد و سەربازانی دوژمنم بۆ خۆبەدەستەوەدان بانگهێشت دەکرد، بەڵام هەراو و هۆریای جەنگ کەمتر رێگەی بە گەیشتنی دەنگی من بە سەربازانی دوژمن دەدا.

ئەگەر ساتێك دەرفەتم هەبووایە و توانیبوامە لە ڕووناکی مەشخەڵەکاندا چاوێك لە خۆم بکەم، دەمبینی کە تەواوی جەستەم ئەرخەوانی بووە، ئەو خوێنەی لە سینگم دەچۆڕێتەوە زینی ئەسپەکەم و بەشێك لە گەردنی سوور کردووە، ئەو خوێنەش کە لە رانی راستم دەچۆڕایەوە، سینگ و ڕانی ئەسپەکەمی ئەرخەوانی کردبوو. نەمدەویست بۆ پێچانی برینەکانم بکشێمەوە پشت مەیدانی جەنگ و دەمویست سەربازەکانم و ئەوانەی لە دەورەم دەجەنگان، ببینن منیش وەك ئەوان بریندار دەبم و لەوانەیە بکوژرێم.

لەپڕ لە رۆژهەڵاتەوە چاوم کەوت بە ئەستێرەی بەرەبەیان، لەوکاتەدا ئەو وتەیەی باوکە مەزداپەرستەکەمم بیرهاتەوە کە وتی: "لە بەرەبەیاندا لە یەك کاتدا چاوم کەوت بە (تەنسەر) و ئەستێرەی بەرەبەیان، بەڵام سەرەتا سڵاوم لە تەنسەر کرد، ئەوکات بەرانبەر بە ئەستێرەی بەرەبەیان وتم (ئەی جوانترینی ئەستێرەکانی ئاسمان، لە من ببوورە کە بەر لە تۆ سڵاوم لە تەنسەر کرد)."[٣]

(٣) ئەو وتەیەی شاپوور دەرخەری ئەو راستییەیە کە لە زەمانی باوکیدا، تەنسەر کە بەرپرس بووە لە کۆکردنەوە و نووسینەوەی ئاڤێستا، چەندە جێگەی رێز و پێزانین بووە. "زەبیحوڵڵا"

# ڤالەریەن دیل دەبێت

دوای ئەوەی سلاوم لە ئەستێرەی بەرەبەیان کرد کە مزگێنی بەخشی هاتنی خۆر بوو، سەربازێکی رۆمیم لە بەرانبەر خۆم بینی کە هەڵۆیەکی لەگەڵ خۆیدا هەڵ گرتبوو، بۆ کوشتنی ئەو تەورەکەمم راوەشاند و تەور بەر ئەو دەسکە دارە کەوت کە هەڵۆکەی بە سەرەوە بوو، هەڵۆکە کەوتە سەر خاك، کەوتنی هەڵۆی رۆمی بۆ سەر خاکم بە بەخت باشی دانا.

لەوکات بەدواوە پێشڕەوی سەربازە پیادەکانی من ئاسانتر بوو.

پێموایە تا ئەوکات زۆرینەی سەوڵچییە کریستیانەکان و بەشێکی زۆر لە ئەوانی دیکە خۆیان ڕادەستی ئێمە کرد بوو.

دوای ئەوە سەربازە لژیۆنەکانی دەرەوەی رۆم، دەستە دەستە خۆیان ڕادەست دەکرد، دەستبەجێ دوای خۆبەدەستەوەدانیان، لەلایەن سەربازەکانمەوە دەگوازرانەوە بۆ پشت شەڕگە تا مەیدانی جەنگ لە سەربازەکانم تەنگ نەکەن یاخۆ نەکەونە دەست سەربازە لژیۆنەکانی نێو رۆم و نەکوژرێن.

چەندە سەربازە لژیۆنەکانی دەرەوەی رۆم پتر خۆیان بەدەستەوە دەدا، پتر سەربازە پیادەکانم و من کە لە نێوەندی لەشکرەکەم بووین، بەرەو پێش دەڕۆیشتین تا ئەوکاتەی بەرەبەیان هات و بە هۆی ڕووناك بوونی دنیاوە، مەشخەڵەکانمان پێویست نەمان. لەوکاتەدا دەمتوانی خۆم و دەوروبەرەکەم باشتر ببینم و ڕووم لە هەر لایەك دەکرد، رەنگی خوێنم دەبینی و زەوی بە خوێنی مەیو و لاشەی مرۆڤەکان داپۆشرا بوو، لە دەورەی من هیچ کەس نەبوو کە بە هۆی برینی سەر جەستەی، خوێناوی نەبوو بێت.

لە دوورەوە لە لای راست گالیسکەکان و لە لای چەپم سوارەکانم دەبینی، لەگەڵ یەکەم دەرکەوتنی تیشکی خۆر و لە دوورەوە هەڵۆ زێڕینەکەی سەر خێوەتە ئەرخەوانییەکەی ڤالەریەنم بینی، بە بینینی ئەو خێوەتە دووچاری سەرسووڕمان بووم، چوونکە ئەو تاکە خێوەت بوو کە هەڵدرابێت و هیچ خێوەتێکی دیکە لەوێندەر نەدەبینرا. دەمزانی رێك کاری لەنێو رۆمەکان زۆر پتەوە، لەگەڵ یەکەم هێرشدا کە بکرێتە سەریان، ئەوان هەموو خێوەتەکان

کۆدەکەنەوە، بەڵام نەمدەتوانی تێ بگەم کە بۆچی خێوەتی ڤالەریەنیش وەك ئەوانی دیکە کۆنەکراوەتەوە.

دوو گریمان لە مێشکمدا هەبوون، یەکێك ئەوە بوو کە بیرم کردەوە لەوانەیە ڤالەریەن بریندار بێت یاخۆ هێندە نەخۆش بێت، نەتوانیت بەسەر پێیەکانییەوە بوەستێت، بۆیە خێوەتی ئەویان هەڵ نەگرتووەتەوە.

دووەمیش بە خەیاڵمدا هات کە ئەو کوژراوە و لاشەکەیان بردووەتە نێو خێوەتەکە، چوونکە رۆمەکان زۆر هۆگری پارێزگاری لە تەرمی ئیمپراتۆرەکانیان بوون، دوای مردنیان دەیانەویست بە هەمان شێوەی سەردەمی ژیانیان بیانپارێزن تا ئەوکاتەی بە خاکیان دەسپاردن. بۆیەش ئەو کاتەی گۆردینی سێیەم لە جەنگ بەدەستی من کوژرا، لەگاتەکانی لەشکرەکەی، داوایان لێ کردم تا رێگە بدەم ئێمپراتورەکەیان مۆمیایی بکەن و بینێرنەوە بۆ رۆم، منیش رەزامەندیم نواند، بەڵام دوای دەمژمێرێك لە هەڵاتنی خۆر، خێوەتگەی دوژمن بە تەواوەتی شڵەژا و پەرت و بڵاو بوو، بۆم دەرکەت کە شەوی رابردوو ڤالەریەن لە خواردنەوەی شەراب زێدەڕۆیی کردووە، کاتی پەلامارەکەی من بۆ سەریان توانای نەبووە هەستێت. کاتێك هەواڵی دەست پێکردنی پەلامارەکەیان پێداوە، فەرمانی کردووە تا واز لە خۆی و خێوەتەکەی بێنن تا ماوەیەکی دیکە بخەوێت، لە خێوەتەکەدا تا بەرەبەیان خەوتووە، کاتێك داوای هێنانی ئەسپی کردووە تا سوار ببێت، خێوەتگەکەی لەبەر یەك ترازا بوو.

ڤالەریەنم لە بەرانبەر خۆم و لەسەر پشتی ئەسپ بینی، بینیم ڕەنگی ڕووخسارە بێ سمێڵ و ریشەکەی بە هۆی خواردنەوەی شەرابەوە لە شەوی رابردوو گۆڕاوە بۆ ئەرخەوانی، لە کاتێکدا ڕووخساری سەربازەکانی من بە هۆی خوێنەوە بەو ڕەنگە گۆڕابوو.

هەرچەندە من زرێم لەبەر نەبوو، لەسەریشم تا دەگەیشتە قاچی خۆم و ئەسپەکەم بە خوێن سوور ببوو، بەڵام ئەو لەو گۆیەی لەسەر ماسکەکەم بوو منی ناسی و بە دەنگێکی سەرخۆش و خومار وتی: تۆ شاپوور یاخۆ پاشای ئێرانی؟ منیش وتم من شاپووری ئێران و ئەنێرانم (واتە ئەو وڵاتانەی لەژێر دەستی ئێران بوون)، هەرچەندە ئەسپەکەم ماندوو ببوو، بەڵام بۆ لای ئەو تاومدا و بەرەو ڕووی رۆیشتم. بێ ئەوەی ئەسپەکەی بجووڵێنێت، شمشێری بۆ لای من راوەشاند و بەر تەورەکەی من کەوت، شمشێر لە دەستی کەوتە خوارەوە، هەوساری ئەسپەکەمم ڕاکێشا و گەڕامەوە، بە گریمانی زۆر بە هۆی سەرخۆشی شەوی رابردووی نەیتوانی هیچ کاردانەوەیەکی ببێت، بەرلەوەی ئەسپەکەی بە تەواوەتی بسوورێنێتەوە، تەوری من بەر کاسکێتەکەی کەوت و درزی پێدا،

ڤالەریەن کەوتەسەر زەوی. لێی نێزیك کەوتمەوە و قۆڵی چەپیم گرت و تۆزێك بەرزم کردەوە، لە ڕووخساریم ڕوانی و بینیم هێشتا ڕووحی تێدایە و خوێن لە سەری نەدەهات، بۆم دەرکەوت ئەو گورزەی تەورەکەم کە بەر کلاوەکەی کەوتبوو، گێژی کردووە.

ڤالەریەنم بە پاسەوانی خۆم سپارد و وتم بیبەنە دواوەی گۆڕەپانی جەنگ تا بێتەوە هۆش خۆی، دوای هاتنەوە هۆش، شەرابی بدەنێ تا خوماری لە لەشی دەربچێت.

بە سەربازەکانم وت خێوەتی ڤالەریەن کۆبکەنەوە تا سەربازەکانی بزانن چیدیکە ئەو پیاوە ئیمپراتۆری ئەوان نەماوە و بەرگری بێ سوودە. ئەگەر ڤالەریەن لەسەر هۆشی خۆی بووایە، من ناچارم دەکرد تا فەرمان بە سەربازەکانی بکات تا دەست لە بەرگری هەڵبگرن، بەڵام چوونکە ئەو بێهۆش بوو جەنگ تا نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بەردەوام بوو. دوایین لژیۆنی ڕۆمی کە لە دوا ناوچە بەرگری دەکرد، لە کەناری ڕووباری فورات لە نیوەڕۆ دەستی لە جەنگ هەڵگرت.

هەفتا هەزار سەربازی لژیۆنەکانی دیکە (جگە لە ئەوانەی ڕایان کردبوو)، پازدە لەگات و یازدە سیناتۆری ڕۆمی بوونە دیلی من، هەندێکیشیان هەڵاتن، ئەوانەی دیکەیش بە گشتیی یاخۆ کوژران یان بە ڕادەیەك برینەکانیان کاری بوو کە توانای جووڵەیان نەبوو، هەموو پێداویستی و کەرەستە جەنگییەکانی لەشکری ڕۆمیش کەوتە دەستی من.

هەستم کرد بە زوویی توانای وەستانم نامێنێت و لە هۆش خۆم نامێنم، بۆیە ئەردەشێر مای مەن و فەرماندەکانی دیکەم داوا کرد، پێموتن شەوی رابردوو بریندار بوومە و کاتم بۆ تیمارکردنی نەبووە و خوێنی زۆرم لەبەر ڕۆیشتووە، هەست دەکەم بە زووترین کات لە هۆش دەچم یاخۆ دەمرم. هەمووتان بزانن کوڕە گەورەکەم دەبێتە جێنشینی خاوەن مافی من، دوای من پاشای ئێران و ئەنێران دەبێت، تەواوی میرات و دەسکەوتەکانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیە دەبێت بە هی ئەو. ئێوەش ئاگەداری دیلەکان بن تا یاخی بوون نەکەن لە ئەو کاتەی من لە بێهۆشی یاخۆ لە سەرە مەرگم، بچووکترین هەوڵی یاخی بوون بە گەورەترین شێوە سزا بدەن تا بۆ هەمووان ببنە پەند و پێش ڕۆیشتنتان لێرە، هەموو کوژراوەکان بشارنەوە، ڕۆمەکانیش ناچار بکەن تا کوژراوەکانیان بشارنەوە.

ئەی فەرماندەکانی من: ئێوە دەزانن ئەو سەربازانەی دوژمن کێن کە ئاگەداری ئێمەیان پەسەند کرد و خۆیان بەدەستەوەدا، بۆیە دوای ئەوەی تەرمی کوژراوەکانیان شاردەوە، هەموویان لێرە ئازاد بکەن، دەزانم ئەوان خەرجی ڕێگەیان نییە، بۆیە کەمێك خەرجیان لە دەسکەوتەکانی لەشکری ڤالەریەن پێ بدەن تا بگەڕێنەوە، بەڵام فەرماندەکان و سیناتۆرەکان

پێویستە بۆ ئازادی خۆیان سزای دیاری کراو بدەن، ئەو پارەیەش دەبێت لەلایەن ئەو ئیمپراتۆرەوە بدرێت کە دەبێتە جێنشینی ڤالەریەن، بە دڵنیاییەوە کوڕەکەیەتی. ئەگەر ئیمپراتۆر ڕازی بە بەخشینی ئەو پارەیە نەبوو، ئەوان بخەنە سەر کاری بەزۆرەملێ تا لەو ڕێگەیەوە داهاتیان دەست بکەویت و خەرجی ئەوان نەکەوێتە ئەستۆی ئێمە. بە کوڕەکەم بڵێن ئەگەر ڤالەریەن زیندوو مایەوە، پێویستە تا دوا ڕۆژی تەمەنی لە ئێران بمێنێتەوە و دەرنەچێت. دوای ئەو ئامۆژگارییانە لە کاتی نیوەڕۆ لە هۆش خۆم چووم.

ماوەی سێ ڕۆژان لە بێ هۆشیدا بووم، کوڕەکەم کە وەك جێنشینی خۆمم دانابوو، سەرپەرشتی کارەکانی بە هاوکاری فەرماندەکان کردبوو، سیناتۆر و لەگاتەکانی کشاندبۆوە پشتەوەی گۆڕەپانی جەنگ، دیلە ڕۆمەکانی ناچار بە ناشتنی کوژراوەکانیان کردبوو، دواتریش دەسکەوتەکانی گواستبۆوە دەرەوەی گۆڕەپانی جەنگ.

پێش ئەوەی بێمە سەر باسی ڕووداوەکانی دیکەی سەردەمی ژیانم، بە پێویستی دەزانم شێوەی حکوومەتداری ڕۆم لە سووریا و بەشەکانی ئاسیای بچووك باس بکەم.

ئەی ئەو ڕێبوارەی دوای سەدان ساڵ ئەو کەتیبانە دەخوێنیتەوە، لەوانەیە دووچاری سەرسووڕمان ببی کە بۆچی زۆرینەی ئەو جەنگانەی من لە سەرەتای بوونم بە پاشا تا بە ئێستە کردوومە، کەوتووەتە کەناری ڕووباری فورات. ئێستە باس لە هۆکارەکەی دەکەم تا بزانی لە سەردەمی پاشاکانی پێشوو تا گەیشتووەتە سەردەمی باوکم (ئەردەشێری مەزداپەرست) شێوەی پاشایەتیی ئەشکانییەکان برێتی بووە لە پاشایەتیی خێڵەکان.

ئەمەش برێتی بوو لەوەی لەو دیو زێی فورات و لە هەریەکە لە وڵاتەکان پاشایەك هەبوو، کە پاشایەتیی لەسەر خاکەکەی دەکرد، تەنیا مافی گەورەیی بۆ پاشای ئەشکانی دادەنا، جگە لەوە مافێکی دیکە بۆ پاشاکانی ئەشکانی نەبوو.

دەوڵەتی ڕۆم لە ئاسیای بچووك و کەنارەکانی ڕۆژئاوای فورات، زنجیرەیەك قەڵای سەربازی بینا کردبوو، بەردەوام کۆمەڵێك سەربازیان تێدابوو، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی زێی فورات لە سەرچاوەکەیەوە تا دەگەیشتە کەنداوی فارس ببێتە سنووری نێوان ڕۆم و ئەشکانییەکان، هەندێکات بە هۆی جەنگەوە لەشکری ئەشکانییەکان لە فورات دەپەڕینەوە، هەندێ لە قەڵاکانی ڕۆمەکانیان داگیر دەکرد.

بەو شێوەیە هەندێ لە شارەکانی ئەودیوی فورات دەبووە خاکی ئەشکانییەکان، پاش ماوەیەك بارودۆخی سنوورەکان وەك خۆی لێ دەهاتەوە، بۆیە نێزیکەی چوار سەدە ڕۆمەکان

فوراتیان بە سنووری خۆیان و ئەشکانییەکان دەناسی، بەڵام لە رۆژهەڵاتی ڕووبارەکە دەسەڵاتدارانی ناوچەکە پاشا بوون و مافی گەورەییان بۆ ئەشکانییەکانیان دەپاراست.

بە درێژایی چوار سەدە، دراوسێیەتی دانیشتووانی رۆژهەڵاتی فورات لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی ڕووبارەکەوە هەبوو، ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی ئەوان زمانی رۆمی فێر بن و پێی بئاخڤن. رۆمەکانی کەوتبوونە ئەودیو فوراتیش ئاشنا ببوون بە زمانی فارسی. هەر ئەو سەردەمە و لەو رۆژەوە کە ئاینی مسیح لە رۆم پەرەی گرت، ئازار و مەینەتییەکانی ئەوان لەو وڵاتە دەستی پێکرد، ئەو ناوچانەی کەوتبوونە رۆژهەڵاتی فورات لە ئاسیای بچووك و سووریا، ببوونە پەناگەی کریستیانەکان و رۆژئاوای ڕووبارەکەش ببووە کوشتارگەی ئەوان.

کەموکورتی گەورەی حکوومەتداری ئەشکانییەکان ئەوە بوو کە حکوومەتە خۆجێییەکانی ئەوان لە ئەو شوێنە، ئەو کاتانەی دەرفەتیان بە سوودی خۆیان دەبینی لەگەڵ حکوومەتی رۆم و لە دژی پاشا ئەشکانییەکان دەبوونە یەك بەرە، هەروەها کاتێك هەستیان بە بەهێزی دەکرد هێرشیان دەکردە سەر یەکدی.

دوای ئەوەی ئەردەشێری بابم هەوڵیدا حکوومەتی فەرمانڕەوایی خۆجێیی نەهێڵێت و لە جیاتی ئەوە بۆ سیستەمی پێش خۆی بگەڕێتەوە، بۆیە بۆ هەر ناوچەیەك خشترە پاوەن یاخۆ ساتراب (والی) دیاری بکات، تا پاشا ناوچەییەکان نەتوانن لەوکاتانەی بەهێز دەبن هێرش بکەنەسەر یەکدی یاخۆ لەکاتی بەرژەوەندیدا لەگەڵ رۆمەکان هاودەستی بکەن.

بابم نەیتوانی ئەو ئەرکە تەواو بکات، ئەز وی ئەو کارەم ئەنجامدا، جگە لەو فەرمانڕەوایانەی لە ئەمەکداریان دڵنیابووم، هەموو ئەوانی دیکەم لابردن، لە جیاتیان ساترابم دانا، ئێستە لە تەواوی سنوورەکەم ساترابەکانی خۆم دەسەڵاتدارن، ئەو فەرمانڕەوایانەش کە لە دەسەڵات ماون ئەمەکدارن بەرانبەر بە من.

هۆکاری ڕوودانی تەواوی جەنگەکانی من و رۆم لە کەناری فورات هەر ئەوەیە کە ئەوان فوراتیان بە سنووری خۆیان دەزانی، لە لایەکی دیکە لە هەر لەشکرکێشییەك بۆ ئەوەی دووچاری بێ ئاوی نەبن، ناچار خێوەتگەیان لە کەناری ئاو دادەمەزراند.

دوای سێ رۆژان لە بێ هۆشی، بە هۆش خۆم هاتمەوە، بە هۆی تیماری بەردەوامی برینەکانم لەلایەن پزیشکەکانەوە، نیشانەکانی باش بوونی تەندروستیم دەرکەوتن.

هەرکە باشتر بووم، بەڕێوەبردنی کارەکانم گرتەوە ئەستۆ، فەرمانمدا ڤالەریەن بەرەو شاری نیشاپوور لە ویلایەتی فارس ببەن، سیناتۆر و لەگاتەکانیش لە شارانی دیکە دابنێن تا پێوەندیی لە نێوانیان نەبێت و نەتوانن هەوڵی پیلانگێڕی بدەن.

ئەو کریستیانانەی سیخووڕی من بوون و ئەو کریستیانانەی خۆیان ڕادەستی من کرد، هەواڵیان پێدام کە ڤالەریەن بەر لە ئەوەی بۆ جەنگ بکەوێتەڕێ، جالینۆسی کوڕی کردووەتە جێنشینی خۆی و کارەکانی تا گەڕانەوەی بۆ ڕۆم داوەتە دەست ئەو. بەو شێوەیە لە ئێستەدا کە ڤالەریەن دیل کراوە، جالینۆس بۆتە ئیمپراتۆر و دەتوانێت پارەی کڕینەوەی دیلەکانی بدات، منیش فەرمانم کرد تا ئەوکاتەی جالینۆس ئەو پارەیە دەدات، هەموو ئەو دیلانە لە دروستکردنی بەنداوەکانی خۆزستان و گدرۆزیا (بلوچستان) بخەنەکار، لەکاتی گەیشتنی پارەکان ئازادیان بکەن، بەڵام سەبارەت بە لەگات و سیناتۆرەکان وتم پێویستە ئەوان خۆیان پارەکانیان بدەن، ئەگەر نەیانتوانی پێویستە ئیمپراتۆری ڕۆم ئەو کارەیان لە جیاتی بکات، هەرچەندە بە دوورم دەزانی ئەوان نەتوانن خۆیان پارەکەیان بدەن.

دوای ئەوەی ڤالەریەن لە جەنگی ئەدەسدا لە بەرانبەر من شکستی خوارد، هەموو شارەکانی ئاسیای بچووك کە لە دەست ڕۆم بوون، کەوتنە دەست من، دوای ئەوکاتە ئەو باجەی ڕۆم لە ئەو وڵاتانەی دەستاند، بوو بە هی من و من باجم لێ وەردەگرتن.

جالینۆس ئیمپراتۆری تازەی ڕۆم پەیامێکی ئاراستە کردم لەبارەی سەربازە دیلەکان و شارە داگیرکراوەکانیانەوە، پێشنیازی کردبوو تا چەند کەسێك لە ڕۆمەوە بۆ مەبەستی دانووستاندن لەسەر رادەست کردنەوەی دیلەکان و گەڕاندنەوەی شارە داگیرکراوەکان، بۆ لای ئێمە بنێرێت.

کاتێك پەیامی جالینۆسم پێگەیشت دووچاری سەرسووڕمان بووم، چوونکە تەواوی لەگات و سیناتۆرەکانی ڕۆم تا ئەوکات پارەی خۆیان دابوو و ئازاد ببوون، تەنیا ڤالەریەنی کۆنە ئیمپراتۆر واتە باوکی ئازاد نەببوو، ئەو دەبووایە پێش هەموو شتێك باس لە ئازادی باوکی لەگەڵ من بکات، نەك هەر بابەتێکی دیکە لەمەڕ دیل و شارە داگیرکراوەکانیان.

هەواڵی ئەوەم پێگەیشتبوو جالینۆس بە پێچەوانەی باوکییەوە، کە ئەو تەنیا بەهرەی جەنگی هەبوو، بەهرەی مەعنەوی نەبوو، بەڵام جالینۆس زانا و فەیلەسووف بوو، ڕۆمەکان ئەو کەسانەیان بە فەیلەسووف ناودەبرد کە خودان زانست بووانە و هەوڵی بەهێزکردنی مەعنەوی خۆیان دابووایە.

ئەگەر جالینۆس تەنیا جەنگاوەر بووایە، لەوانەبوو دووچاری سەرسووڕمان نەبم، چوونکە ڕۆمەکانم دەناسی و دەمزانی پیاوەکانی ئەوان وەك ئێرانییەکان خاوەن هەستی بەرز نین، زۆر جاران ڕووی دابوو کوڕ باوکی دەکوشت و باوك کوڕەکەی لەنێو دەبرد، بەڵام جالینۆس بەراورد بە ڕۆمەکانی دیکە ئەو خاڵە بەهێزەی هەبوو کە خودان زانست بوو، بۆیە نەدەبوو باوکە دیلەکەی خۆی لەبیر بکات.

لە وەڵامی جالینۆس وتم: سەبارەت بە دیلەکان دوای بەخشینی بڕە پارەی کڕینەوەی خۆیان، ئازاد دەکرێن، بەڵام سەبارەت بە شارە داگیرکراوەکانی ئاسیای بچووك، ناتوانم بۆتان بگەڕێنمەوە و بۆ من دەبن، چوونکە بۆم دەرکەوتووە کە ڕۆمەکان خاوەن بەڵێن نین بەرانبەر بە ئاشتی. لە کاتی گۆڕانی هەر ئیمپراتۆرێکدا، ئیمپراتۆری تازە دێتە جەنگی من و ئیمپراتۆرەکانیش هێندە بە خێرایی دەگۆڕێن، تەنانەت لەبیرمانەوەی ناوەکانیشیان سەختە.

لە ڕاستیدا تاکە گرێنتی بۆ ئاشتی لە نێوان من و حکوومەتی ڕۆم ئەو شارانە بوون کە بە دەست منەوە بوون، ئەگەر بەردەستی ڕۆم بووانە، ئەوان بەردەوام ئۆمێدیان دەبوو کە بتوانن بێن و تیسفون داگیر بکەن. ئەگەر ئەو شارانە بە دەست منەوە بن، ڕێگەی لەشکرکێشیی ڕۆمەکان بۆ سەر من و بە تایبەتی بۆ تیسفون دەگیرێت، منیش ڕێگە نادەم لەشکری ڕۆم بتوانێت لە کەشتییەکانیان دابەزن و بەرەو وڵاتانی من بکەونەڕێ.

دوای ئەوەی وەڵامی من بە جالینۆس گەیشت، وەڵامی بۆ ناردم کە زۆر حەز بە ئاشتیی لە نێوان خۆی و مندا دەکات و دەیەوێت ئەو شارانەی سووریا و ئاسیای بچووك بگەڕێنمەوە.

دوای گەیشتنی وەڵامەکەی، وەڵامم بۆ نارد کە حکوومەتی ڕۆم هێندە پەیمانشکێنی کردووە کە چیدیکو ناتوانم لە پەیمانەکانی سەبارەت بە ئاشتی دڵنیابم و بزانم کە ئەو یاخۆ ئیمپراتۆرێکی دیکە نایەتە جەنگی من، تەنیا هۆکار بۆ مانەوەی ئاشتی، مانەوەی ئەو شارانەن لە بەردەستی من.

جالینۆس وەڵامی دایەوە کە ئەو لە ئیمپراتۆرەکانی دیکە جیایە و بەرانبەر بەڵێنی خۆی ئەمەکدار دەبێت، ڤێجا بۆ یەکەمجار سەبارەت بە باوکی وەڵامی بۆ ناردم و وتی ئایا من ڕازی دەبم کە دوو کەس لەلایەن ئەوەوە بێن بۆ لای باوکی تا بزانن پێداویستییەکانی چین؟، ئەمجارەش لەبارەی ئازادکردنی باوکی هیچی نەوت و تەنیا داوای ناردنی دوو کەسی بۆ لای باوکی کرد.

داواکەی جالینۆسم پەسەند کرد و تەنیا ڕام سپارد ئەو دوو کەسە بپشکێنرێن پێش ئەوەی بچنە لای باوکی، چوونکە لەوانەبوو چەك بگەیەننە ئەو. هەروەها وتم ئەفسەرێك لە کاتی قسەکردنی ئەو دوو کەسە و ڤالەریەن لەوێندەر ئامادە بێ تا بزانێت چ کاریان بە ڤالەریەن

هەیە، ئاساییە ئەگەر تەنیا لەبارەی پێداویستییەکانی بدوێن. ئەگەر وتەکانیان بۆ پیلان بوو، پێویستە ئەفسەرەکە قسەکانیان ڕابگرێت و دەستگیریان بکات و بۆ لای من ڕەوانیان بکات تا سزا بدرێن.

نێردەکە هاتن و لەگەڵ ڤالەریەن بە ئامادەبوونی یەکێك لەو ئەفسەرانەی پارێزگاری لە ڤالەریەن دەکرد و ڕۆمی دەزانی، چوونە لای ئەو و دەستیان بە وتووێژ کرد، ئەفسەرەکەش گوێی گرتبوو، لەپڕ ئەوان بە زمانێك دەدوێن کە ئەفسەرەکە تێ ناگات، بۆیە پێیان دەڵێت پێویستە بە زمانی ڕۆم بدوێن، ئەوانیش دوای پۆزش هێنانەوە، بە ڕۆمی بەردەوام بوون لە وتووێژ تا کۆتایی دانووستاندن دواتر هاتنە دەرێ.

قسەکانیان بە تەواوەتیی لەبارەی باری بنەماڵەکەیان و ئەو پێداویستییانە بوو کە لە پۆشاك و زێڕ هەیەتی، نێردراوەکە بەڵێنیاندا ئەوەی ڤالەریەن پێویستیی پێیەتی بۆی بێنن.

من دوای دیلکردنی ڤالەریەن تا ڕادەیەك ئاگەداری بارودۆخی ڕۆم نەمابووم، چوونکە جالینۆس دوای گەیشتنی بە دەسەڵات لەگەڵ کریستیانەکان بە باشی هەڵسوکەوتی دەکرد و چیدیکە ئەوان لە ڕۆم ڕایان نەدەکرد و نەدەبوونە پەنابەر لە لای من تا بارودۆخی ڕۆمم پێ ڕابگەیەنن، ئەو هەڵسوکەوتە باشانەی جالینۆس دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی ئەو فەیلەسووف بوو.

ئەوەی من ئەوجار لەبارەی ڕۆم باسی دەکەم، دواتر زانیاریم پێگەیشت.

جالینۆسی فەیلەسووف هەوڵیدا بوو کارێك بکات کە ئیمپراتۆرەکانی پێش ئەو نەیانکردبێت، ئەویش برێتی بوو لەوەی ئەو کەسانەی پێویستیان بە مووچە نەبوو، مووچەکانی بڕین، لە لایەکی دیکە بڕیاریدا کۆیلایەتیی لە ڕۆم نەمێنێت، کە زیاتر لە هەزار ساڵ پێش ئەوکاتە هەبوو، ڕەگەزنامەی ڕۆمی بە تەواوی کۆیلەکاندا، ئەمەش بووە هۆی ناڕەزایی زۆری ئەو خەڵکانەی ڕۆم کە خودان ڕەگەزنامە بوون و تووڕەی کردن.

ئەی ئەو ڕێبوارەی کە ئەو کەتیبانە دەخوێنیتەوە، ئەوە بزانە کە باری چینایەتی لە ڕۆم جیاوازە لەو بارەی لە وڵاتانی من هەیە.

لە وڵاتی من هەموو کەس لە چینی خۆیدا کار دەکات و کرێ و مووچەی کارەکەی وەردەگرێت و کەس نییە کە بەبێ کار مووچە وەربگرێت، بەڵام لە ڕۆم ئەوانەی ڕەگەزنامەی ڕۆمیان هەبوو، لە سەرەتای ژیان تا مردن کار ناکەن و مووچە وەردەگرن، لە ڕۆم هەموو کارەکان لەلایەن کۆیلەکانەوە ئەنجام دەدرێن کە خاوەن ڕەگەزنامەی ڕۆم نین و وەك کاڵا کڕین و فرۆشتنیان پێ دەکرێت.

هەندێکات ڕوویداوە کۆیلەیەك کارێکی گەورە بۆ خاوەنەکەی ئەنجام دەدات، لە بەرانبەردا خاوەنەکەی ئازادی دەکات، ئیتر دەسەڵاتی بەدەست خۆی دەبێت و کڕین و فرۆشتنی لەسەر نامێنێت، بەڵام ڕەگەزنامەی ڕۆمی پێ نادرێت.

لە تەنیشت ڕۆم وڵاتێك بە ناوی گیل (فەرەنسای ئێستە) هەیە کە بەرنامە داڕێژەری ڕۆمە، یەکێك لە لەگاتەکانی ڕۆم بە ناوی (پۆستۆمۆس) بەڕێوەی دەبات. کاتێك ئەو بیستوویەتیی ڤالەریەن دیل بووە، ڕاستەوخۆ خۆی بە ئیمپراتۆر ڕاگەیاندووە.

جالینۆس کە لە جیاتی ڤالەریەنی باوکی بووە بە ئیمپراتۆر، یەکێك لە سەرکردەکانی خۆی بە ناوی (ڤیکتۆری تۆس) نارد بۆ جەنگی پۆستۆمۆس.

ڤیکتۆری تۆس کە یەکێك لە خانەدانەکان بوو، سێ هەزار کۆیلە لە کارگەکانی کوتاڵ و چەرمەکانی کار دەکەن، بە سەرکردایەتیی لەشکرێك دەچێتە سەر پۆستمۆس و شکستی دەدات و دەیکوژێت. ئەو ڕووداوە هاوکات بوو لەگەڵ ئەوکاتەی جالینۆس بڕیاری بڕینی مووچەی ئەو کەسانەیدا کە پێویستیان بە مووچە نییە، لەنێویشیاندا ڤیکتۆری تۆس، ئەو بڕیاریدا مووچەی ئەوانەی دیکەیش کەم بکاتەوە تا هەمووان ناچار بە کارکردن بن، هەروەها دوای بڕیاری ئازادکردنی کۆیلەکان، بڕیاریشیدا ئەوان لە هەمان ئەو شوێنانەی بە خۆڕایی کاریان دەکرد کار بکەنەوە و مانگانە وەربگرن لە خاوەن کارەکەیان.

ڤیکتۆری تۆس کە خۆی خاوەن سێ هەزار کۆیلە بوو، زیانی پێگەیشت، بە هاندان و پاڵپشتی خانەدانەکانی دیکە کە هەموویان خاوەن کۆیلەی زۆر بوون، بە لەشکرەکەیەوە لە ڕۆم گەڕایەوە و هەوڵی کوشتنی جالینۆسیدا، جالینۆسیش کە ئەو کات توانای بەرگری نەبوو، بەرەو ویلایەتە ڕۆژهەڵاتییەکانی ڕۆم ڕۆیشت، لە هەر شوێنێك کە دەگەیشت، ژمارەیەك خەڵکی بۆ سەربازی بە کرێ دەگرت تا ببێتە خاوەن لەشکرێك کە توانای جەنگ لەگەڵ ڤیکتۆری تۆسی ببێت، سەرەنجام گەیشتە بیزەن تیۆم، ئەو پەیامەی سەبارەت بە ناردنی دوو کەس بۆ لای باوکی بۆ زانینی پێداویستییەکانی بۆ منی نارد لە بیزەن تیۆمەوە بۆ من هاتبوو.

ئەوکات من ئاگەدار نەبووم کە جالینۆس لە دەست ڤیکتۆری تۆس رایکردووە و هاتووەتە ئەو شوێنە، هەندێجار ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم سەردانی شارەکانی خۆیان دەکرد، منیش وامزانی کە ئەو بۆ سەردان هاتووەتە بیزەن تیۆم.

دوو ڕۆژ دوای سەردانی ئەو دوو کەسە بۆ لای ڤالەریەن، فەرماندەی پاسەوانەکانی ڤالەریەن کە ناوی (ئۆزتات) بوو، هەواڵی پێدام کە دیلەکە داوای کردووە تا پۆشاکی وەرزشی بدرێتێ و مۆڵەتی کڕینی ئەسپ و سوارکاری پێ بدرێت. ڕەزامەندیم بەرانبەر بە کڕینی پۆشاکی وەرزشی نواند، چوونکە دەمزانی ئەو لە ڕابردوو لەگات بووە، ڕاهێنانی وەرزشی نەریتێکی لەگاتەکان بووە، بەڵام بۆ هەبوونی ئەسپ تایبەت بە ئەو ڕەزامەندیم نەنواند.

دوای ئەوەی پۆشاکی وەرزشی پێدرا، هەموو ڕۆژێك ڕاهێنانی دەکرد و بە ئۆزتاتی دەوت ئەگەر یەك ڕۆژ ڕاهێنان نەکات، نەخۆش دەکەوێت.

دواتر پەیامێکی لە جالینۆسەوە بۆ من هات کە دوو داوای تێدا بوو، یەکەم ئەوە بوو کە ئەو دوو پیاوە ڕۆمەی چوونەتە لای باوکی بەردەوام لەگەڵ ئەودا بن و خزمەتی بکەن، هەروەها داواکەی دیکەی جالینۆس ئەوە بوو کە بڕە پارەی کڕینەوەی حەفتا هەزار دیلە ڕۆمەکان دیاری بکەم، وتبووی بۆ ئەو حەفتا هەزار دیلە ڕۆمەی لە شوێنە جیاکانی وڵاتەکەم لە کارکردندان، پێویستە چەند پارە بدات تا ئازاد بکرێن و بگەڕێنەوە.

من هێشتا نەمدەزانی جالینۆس لە دەست ڤیکتۆری تۆس ڕای کردووە، ڤیکتۆری تۆس ئیمپراتۆری ڕاستەقینەی ڕۆمە. هەروەها نەمدەزانی ئەو مەبەستی لە ئازادکردنی حەفتا هەزار سەربازی ڕۆمی کە کرێکاری من بوون، ئەوەیە حەفتا هەزار سەربازی لژیۆنی دەست بکەوێت، من نەمدەزانی ئەو سەربازانەی ئەو بە کرێی گرتوون لە ڕووی جەنگییەوە بایەخی سەربازانی لژیۆنیان نییە و هەموویان بە سەربازی تازە هەژمار دەکران، بەڵام ئەگەر حەفتا هەزار سەربازی لژیۆن ئازاد کرابووان و ببوونایە بەشێك لە لەشکری ئەو، لەشکرەکەی هێندە بەهێز دەبوو کە دەیتوانی ڤیکتۆری تۆس بشکێنێت و ببێتەوە بە ئیمپراتۆر.

سەبارەت بە مانەوەی ئەو دوو کەسە لەگەڵ ڤالەریەن ڕەزامەندیم نواند، بۆ ئازادکردنی سەربازەکانیش ساتوسەودایم ڕەق نەبوو وتم بۆ هەر پێنج سەد سەرباز دوو تالاَن زێڕ بدات، بەم پێوەرەش بۆ هەر لژیۆنێك پێویست بوو بیست و چوار تالاَن زێڕ بدات.

دواتر جالینۆس وتی بۆ بابەتی پارەی ئازادکردنی دیلەکان، پێویستە لەگەڵ خۆیان دانووستاندن بکات، بۆ ئەو مەبەستەش لەو دوو کەسە کە لە لای ڤالەریەنن پتری نییە، بۆیە داوای کرد تا ئەوان ڕێگەیان پێ بدرێت ڕاستەوخۆ بکەونە دانووستاندن لەگەڵ سەربازەکانی بۆ ئەوەی جالینۆس دوای ئازادکردنیان لە ئەوانی دەوێت، پێیان بوترێت و جالینۆس دەیوت ئەوەی لە پێناو ئازاد کردنی دیلەکاندا دەیدات، دەبێت لەگەڵ خۆیاندا باس بکرێت.

ئەو وتەیەی جالینۆس بۆ من جێگەی ڕامان بوو، تەنانەت ئەگەر جالینۆس ویستبای ئەو پارەیە دواتر لە ئەوان وەربگرێتەوە، دەیتوانی لە مووچەکانیان ببڕێت. چوونکە وام بیر دەکردەوە سەربازانی رۆمی لەوکاتەی دیل دەبن مووچەکانیان بەردەوام دەبێت، بەڵام پێدەچوو جالینۆس نەیدەویست ئەوکاتەی ئەوان دیلن، مووچەیان بۆ خەرج بکات و نیازی وابوو لەو رۆژەوە کە سەربازەکان دەگەڕێنەوە مووچەیان بۆ ئەژمار بکات.

دووجاران نێردراوەکانی جالینۆس چوونە لای سەربازەکان کە کاریان دەکرد، دوای هەر جارێك لە گەڕانەوەیان بۆ نەیشاپوور، نامەیەکیان ئاراستەی جالینۆس دەکرد.

رۆژێك راپۆرتم پێگەیشت کە ئەو کرێکارە رۆمانەی لە بەنداوی دیالەدا کاریان دەکرد یاخیبوونە و چەند پاسەوانێکیان کوشتووە و خۆراکی ئەو شوێنەیان بردووە و ڕایان کردووە. تا ئەو رۆژە ڕووی نەدابوو کە دیلە رۆمەکان کە لە وڵاتانی مندا کرێکاریان دەکرد لە کارەکەیان ناڕازی بن و دواتر یاخی بوو بن.

فەرمانم کرد تا بکەونە دوای یاخی بووەکان و ئەوان دەستگیر بکەن.

ژمارەی ئەوانەی هەڵاتبوون زۆر نەبوون، هەندێکیان دەستگیر کران، هەندێکیانیش توانیان ڕابکەن. دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت ئەوان لەلایەن ڤالەریەن پارەیان پێدراوە و پێیان وتراوە تا یاخی بن و خۆیان بگەیەننە (ئەدەس)، ئەوکات لەوێندەر ڤالەریەن دەگاتە ئەوان و پێکەوە بەرەو رۆم دەڕۆن و لە ڕێگەدا هێندە ڕاوەڕووت و تاڵانی خەڵکی دەکەن تا هەریەکەیان لە لەگاتێکی رۆمی دەوڵەمەندتر بن.

بە دوورم دەزانی دیلە هەڵاتووەکان درۆ بکەن، لە لایەکی دیکەیش بە دوورم دەزانی ئەو دوو کەسەی لای ڤالەریەن بوون بە بێ فەرمانی ئەو و سەربەخۆ هانی یاخیبوونی ئەو کرێکارانەیان دابێت. ئەوکات تێگەیشتم ڤالەریەن بۆ داوای پۆشاکی وەرزشی کرد بوو، ئەو دەیویست جەستەی ئامادە بکات تا لە کاتی هەڵاتندا بتوانێت بەرگەی ڕێپێوانی دوور بگرێت. هەرچەندە لێکۆڵینەوەکان وایان دەردەخست ڤالەریەن و دوو پیاوەکەی هاندەر بووبن بۆ ئەو یاخیبوونە، بەڵام نەمدەویست هیچ بڕیارێك بدەم بێ ئەوەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو دوو کەسە و خودی ڤالەریەن بکەم.

ئۆزتاتی فەرماندەی پاسەوانەکانی ڤالەریەنم راسپارد، بێ ئەوەی ڤالەریەن ئاگەدار بێت، لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەواندا بکات و ئەوان ڕووبەڕووی ئەو دیلانە بکاتەوە کە یاخی ببوون، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەی تەواو کرد، ئاکامەکەی بە ئەرێنی و نەرێنی بە من ڕابگەیەنێت.

لێکۆڵینەوەی ئۆزتات کە تەواو بوو، بابەتێکی دیکە ئاشکرا بوو، ئەویش ئەوە بوو کە ئەو دوو پیاوە دانیان نابوو کە جالینۆس لە ڕێگەی ئەوانەوە ڤالەریەنی باوکی راسپاردووە تا دیلە رۆمەکان کە لە وڵاتانی منن یاخی بن، دەرکەوت کە داواکەی جالینۆس بۆ دیاریکردنی بڕە پارەی پێویست بۆ ئازادکردنی دیلە رۆمەکان بۆ ئەوەی ئەو بۆ منی رەوان بکات، هەروەها رۆیشتنی ئەو دوو پیاوە رۆمە بۆ لای دیلەکان، بۆ خەڵەتاندنی من بووە، من بێ ئەوەی بزانم هۆکاری یاخیبوونی دیلەکان و ڤالەریەنم ئامادە کردووە.

لە مەبەست و کردەوەی جالینۆس تا ئێستەش کە ئەو کەتیبەیە دەنووسم لە سەرسووڕماندام، وا بیر دەکەومەوە جالینۆس کە فەیلەسووفیش بوو، دەیەویست باوکی لەنێو ببات. ئەو دەیزانی من خاوەنی بەخشینم، هەرکات ڤالەریەن داوای بەخشین بکات و بڵێن بدات کە دوای بەخشینی بەردەوام دۆستی من دەبێت، ئازادم دەکرد و ڕێگەم دەدا بڕوات و ببێتەوە بە ئیمپراتۆر.

ئەو دەیزانی ئەگەر باوکی بگەڕێتەوە بۆ رۆم، چوونکە لایەنگری گەڕانەوەی کۆیلایەتی و خانەدانەکانی رۆم بوو، هەمووان ڕازی دەبوون بەوەی ببێتەوە بە ئیمپراتۆر. لە کاتێکدا خۆی نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ رۆم، تەنیا ئەو کاتە دەیتوانی بگەڕێتەوە کە ڕێڕەوی سیاسەتەکەی بگۆڕێت و بەڵێن بەدات کە لەگەڵ خەرجکردنی مووچەی خانەدانەکان دەبێت و کۆیلەکانیش دەگەڕێنێتەوە بۆ دۆخی خۆیان. ئەگەر جالینۆس خوازیاری لەنێوبردنی باوکی نەبووایە، ئەوی هان نەدەدا تا هەڵبێت و دیلە رۆمەکانیش هان بدات بۆ یاخی بوون.

دوای ئەوەی دوو پیاوە رۆمەکەیان بەرەو ڕووی دیلە هەڵاتووەکان کردەوە، دەرکەوت کە ئەوان لەلایەن ڤالەریەنەوە پارەیان بە ئەوان داوە و هانیان داون تا یاخی بن. فەرمانم کرد تا لێکۆڵینەوە لەگەڵ ڤالەریەن بکەن و بزانن ئایا هیچ نووسین هەیە یا نا؟.

دوای لێکۆڵینەوە دوو نامەی جالینۆس دۆزرایەوە کە بۆ باوکی ناردرا بوو، لە نامەکاندا داوای لێ کرد بوو دیلە رۆمەکان بۆ یاخی بوون لە دژی من هان بدات، ئەگەر بتوانێت من بکوژێت و ئەگەر نەشیتوانی ئەو کارە بکات، لەگەڵ ئەواندا ڕابکات.

تەنانەت دوای بەردەست کەوتنی ئەو دوو نامەیەش نەمدەویست ڤالەریەن سزا بدەم، چوونکە لێکۆڵینەوە لەگەڵ خۆیدا نەکرابوو، دوای ئەوەی ڕووبەڕوو کرایەوە لەگەڵ دوو پیاوە رۆمەکە، دەرکەوت کە ڤالەریەن ئامۆژگاری کوڕەکەی بەجێ هێناوە و لە ڕێگەی ئەو دوو کەسەوە پارەی بۆ دیلەکان ناردووە تا یاخی بن.

هەرچەندە تاوانی ڤالەریەن بە تەواوەتی سەلمابوو، بەڵام ویستم لە بەرانبەریدا دادپەروەر بم، داوام کرد بیهێنن تا چەند پرسیارێکی لێ بکەم.

هەرچەندە ئەو دیل بوو، بەڵام نەتەنیا لاواز نەببوو، بگرە قەڵەوتر ببوو ڕووخساری سوور و سپی بوو. چوونکە لە یەکەم ڕۆژەوە کە ببوو بە دیلی من، فەرمانم کردبوو تا پێداویستیی ئاسوودەیی بۆ دابین بکریت. راستە ئەو دیلی من بوو ، بەڵام پێش ئەوکات ئیمپراتۆر بوو، نەریت وایە لەگەڵ هەر دیلێك بەو پلەیە ساتوسەودایی بکرێت کە پێش دیلکردنی هەیبووە.

کاتێك ڤالەریەنیان هێنا، ئەو نەتەنیا نەکەوتە سەر زەوی، بگرە بە نەریتی رۆمەکانیش رێزی بۆ نەنواندم، ئەو بێ رێزییەش نیشاندەری لەخۆباییبوونی لە رادە بەدەری ئەو بوو.

پێموت: ئەی ڤالەریەن کەللەیەکی تژی لە لووتبەرزیت هەیە.

ئەو وتی: ئەو کەسەی تاجی ئیمپراتۆرییەت و وڵاتانی پان و بەرینی لەدەستچوو بێت، جگە لەخۆباییبوون هیچ شتێکی دیکەی هەیە؟.

وتم: دەتوانێت ئەدەبی هەبێت، چوونکە هەبوونی رێز، نیشانەیە بۆ ئەوەی ئەگەر ئێستەش مەزن نەبێت لە رابردوودا مەزن بووە.

دواتر لێم پرسی: ئایا پێوەندیت بە دەسەڵاتدارانی دەرەوە هەیە؟.

ڤالەریەن وتی: کاتێك جالینۆسی کوڕم منی فەرامۆش کرد بێت، چۆن دەتوانم پێوەندیم بە دەسەڵاتدارانی دەرەوە هەبێت.

وتم: جالینۆسی کوڕت تۆی فەرامۆش نەکردووە دوو کەسی ناردووە تا هەموو پێداویستییەکانت بۆ دابین بکەن.

ڤالەریەن وتی: ئەگەر لە بیری نەکردبووامە، لە جیاتی ناردنی دوو کەس بۆ دابینکردنی خۆراك و شەراب بۆ من، هەوڵی ئازاد کردنی دەدام.

وتم: پاشای کادس نامەیەکی بۆ داوای لێ خۆشبوون لە تۆ بۆ من نووسیوە و داوای کردووە ئازادت بکەم.

ڤالەریەن وتی: ئاگەداری ئەو بابەتە نیم.

پرسیارم کرد: ئایا دەزانی ناوی ئەو چییە؟

ڤالەریەن وتی: پیری و دیلی بیریان کوێر کردوومەوە.

وتم: ناوی ئەو ڤەلەنۆسە، ئایا حەز دەکەی نامەکەی ئەو پێشانی تۆ بدەم؟.

ڤالەریەن وتی: نامەی ئەو چ کەڵکێکی بۆ من هەیە.

وتم: ئارتاباد دەناسی.

ڤالەریەن وتی: ئەو ناوەم بیستووە، بەڵام بە بیرم نایەتەوە.

وتم: ئەو پاشای ئەرمەنستانە و نامەیەکی سەبارەت بە تۆ بۆ من نووسیوە، بە جالینۆسی کوڕی تۆ و سەردارە رۆمەکان هەڕەشە و ترسی پێداوم و دەڵێت ئاگەدار بە، چوونکە رۆم ئەوکاتەی شکست دەخوات زۆر مەترسیدارە، هێندە فرەوان و پڕ دانیشتووانە کە دەتوانێت لەشکرێك تا پێنج سەد هەزار کەس ئامادە بکات. ئایا دەتەوێت بزانی چیم وەڵام ئارتاباد داوەتەوە؟.

ڤالەریەن وتی: نازانم.

وتم: بۆم نووسیوە ئەوەی تۆ باسی دەکەی لەوانەیە ببێتە ڕاستی، لەوانەشە نەبێتە ڕاستی، ئەگەر نەبێتە راستی، لە رۆم ناترسم، ئەگەر ببێتە ڕاستیش، چوونکە ڤالەریەن و دیلەکانی رۆم لە لای من بارمتەن، دیسان هەر ناترسم، رۆم ناوێرێت لەشکری خۆی بهێنێتە ناو خاکی وڵاتانی من. ئایا وەڵامەکەم بە رای تۆ باشە.

ڤالەریەن وتی: وەڵامێکی زیرەکانەت داوەتەوە.

پرسیارم لێ کرد ڕات بەرانبەر بەو دوو نامەی ئەو دوو پاشایە چییە؟.

ڤالەریەن وتی: هەردوو نامەکە نیشاندەری ئەوەن ئەوان نایانەوێت هیچ کارێك بۆ ئازادکردنی من ئەنجام بدەن، چوونکە ئەگەر ویستبایان کارێکم بۆ بکەن، ئەو نامانەیان بۆت نەدەنووسی، نامەکانیش نیشانی دەدەن کە هەوڵی ئەوان لە چوارچێوەی قسە دەرنەچووە.

وتم: ڤالەریەن، کاتێك تۆم بۆ ئێرە بانگ کرد، مەبەستم بوو تۆ بە تۆمەتی هاندانی دیلە رۆمەکان بۆ یاخی بوون و کوشتنی ژمارەیەك سەربازی من، بکوژم.

ڤالەریەن وتی: ئەگەر من بکوژی، کۆتایی بە مەینەتی و دیلی من دێت.

وتم: ئایا قسەکانم پشتڕاست دەکەیەوە کە دەتەویست ڕابکەی؟.

ڤالەریەن وتی: کام زیندانی نایەوێت ڕابکات؟، تەنانەت ئاژەڵەکانیش لە کاتی زیندانی بوون دەیانەوێت ڕابکەن، چۆن مرۆڤ کە خاوەن ئەقڵە ئەو هەستەی نییە؟.

پرسیم: پیلانی تۆ لەگەڵ ئەو دوو پیاوە رۆمیە چ بوو.

ڤالەریەن وتی: بە هەمان شێوە کە وتت من دەمەویست لەگەڵ ئەواندا ڕابکەم.

پرسیارم کرد: ئەگەر لە هەڵاتن سەرکەوتوو بووبای، دەتەویست چ بکەی و بچی بۆ کوێ؟، ئایا دەڕۆیشتی تا ئیمپراتۆری لە کوڕەکەت وەربگریەوە؟.

ڤالەریەن وتی: نا، ئەگەر توانیبام ڕابکەم، دەچوومە (ئیلی ڕێی)[1]، لەوێندەر لەو گوندەی کە هی خۆمە، دوا ساڵەکانی تەمەنم بەسەر دەبرد.

پرسیارم کرد: چیت بۆ ئەو دوو ڕۆمیە دەکرد کە هاوکاریان دەکردی لە هەڵاتنەکەت.

وتی: هیچم نەبوو و نییە تا بیدەم بە ئەوان، جگە لە ئەوەی داوایان کرد بوو؟.

پرسیم: ئەوان چییان داوا لێ کردی؟.

ئەو وتی: ئەوان داوایان کرد لە کاتی هەڵاتن، ئەوان لە پێشەوە بن و منیش لە دوایان بڕۆم.

پرسیم بۆچ.. ڤالەریەن وتی: ئەوان وتیان لە کاتی هەڵاتنمان ئەگەر بگیرێین، تۆ دەگەڕێندرێیەوە بۆ نەیشاپوور، بەڵام ئەگەر ئەوان دەستگیر بکرێن بە تاوانی ڕزگارکردنی من، لە سێدارە دەدرێن، بۆیە دەیانەویست لە پێشمەوە بڕۆن.

وتم: ئەی ڤالەریەن بە هۆی ئەوەی وەڵامی ڕاستگۆیانە و سادەت دامەوە، تۆ دەبەخشم، تەنیا شوێنی دیل بوونت دەگۆڕم و دەتگوازمەوە بۆ خۆراسان، بەڵام ئەو دوو کەسە هەر وەك چۆن پێشبینیان کردبوو، لە سێدارەیان دەدەم، چوونکە ئەوان هۆکاری یاخیبوونی سەربازە ڕۆمەکان و کوژرانی ژمارەیەك سەربازی من بوون.

دوای ئەو وتەیە ڤالەریەنم مۆڵەتدا، ئەو دوو کەسەشم لە سێدارە دا.

## • راستکردنەوەی هەڵەیەکی مێژوویی

لێرە بە پێویستی دەزانم سەربردەی شاپووری یەکەم رابگرم و بابەتێکی گرینگ کە بریتییە لە راستکردنەوەی هەڵەیەکی گەورەی مێژوویی و لەلایەن نووسەری فەرەنسی (ژان گاژە) باس دەکرێ، بخەمە بەردیدی خوێنەری بەڕێز: لە بەشێك لە سەرچاوە مێژووییەکانی ڕۆژهەڵاتدا باسکراوە کە شاپوور فەرمانی کرد تا پێستی ڤالەریەنی ئیمپراتۆر دامالْن، دوای رەنگ کردنی، پڕی بکەن لە پووش و کا، ئەو دەمانەی شاپوور دەیویست سواری ئەسپ ببێت، قاچی دەختەسەر پێستە ئاخنراوەکە،ئینجا سواری ئەسپەکەی دەبوو. هەروەها نووسیویانە تەنانەت ئەوکاتەی کە ڤالەریەن زیندووش بووە، هەر بە هەمان شێوە ڤالەریەنیان هێناوە و ناچاریان کردووە تا بچەمێتەوە، دواتر قاچی خستووەتە سەر پشتی و سواری ئەسپەکەی بووە.

---

(١) (ئیلی ڕێی وڵاتێك بوو لە کەناری دەریای ئادریاتیك، کە بەشێك بوو لە یۆگۆسلاڤیا. "زەبیحوڵڵا"

ئەو نووسینانە ڕاست نین و لەلایەن (لاك تانس) کە لە ساڵی (٢٥٠ ز) لە وڵاتی تونس لە دایك بووە و لە سەردەمی قوستەنتین کۆچی دوایی کردووە، ئەو بابەتە دروستکراوە، مێژوونووسەکانی دیکە ئەو بابەتانەیان لەو وەرگرتووە. لاك تانس قەشەی کریستیانەکان بوو، ئاپۆلۆژیست بووە، ئاپۆلۆژیست لە ئاینی کریستیان بەو کەسە دەوترێت کە ژیانی بۆ ئاینەکەی تەرخان بکات و تەنیا بانگەشە بۆ ئاینی کریستیان بکات، واتە بانگخوازی ئاینی کریستیان بێت.

زانیمان ڤالەریەن دوژمنی کریستیانەکان بوو، لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەودا ئەو کریستیانانەی توانای هەڵاتن لە رۆمیان نەبوو، لەلایەن ڤالەریەن قڕکران یاخۆ لە شوێنی دوور و شاراوە دەژیان، ئەگەر بینرابووانە، بێگومان دەکوژران.

لاك تانس بە هۆی کینە و ڕقی زۆری بەرانبەر بە ڤالەریەن ئەو سەربردەیەی بۆ ڤالەریەن هۆنیوەتەوە و وتوویەتی ئەو سزای ئەو تاوانانەی لێ کراوەتەوە کە بەرانبەر بە کریستیانەکانی ئەنجامی داون، لە سەردەمی دیل بوونیدا بەردەوام لە کۆیلەیەك کەمتر بووە، ئەو بە فەرمانی شاپووری یەکەم پێستی داماڵرا و پڕ لە کا کرا، بەڵام کۆمەڵێك بەڵگە هەیە کە ناڕاستی و ساختەبوونی ئەو سەربردەیە دەسەلمێنێت و بریتین لە:

**یەکەم:** شاپوور سێ کەتیبەی لە سەردەمی ژیانیدا نووسیوەتەوە و سێ کەتیبەکان بریتین لە ئەوانەی خوارەوە:

١) کەتیبەی نەقشی رۆستەم لە ئێران.

٢) کەتیبەی نەقشی رەجەب لە ئێران.

٣) کەتیبەی پایکۆڵی کە لە وڵاتی (ئادباین) لە کۆتایی میزۆپۆتامیا بەردەست کەوتووە.[1] لەم سێ کەتیبەیە کە ماوەیەك دوای مردنی ڤالەریەن نووسراون، شاپوور ناڵێت کە ئەو کارەی بەسەر ڤالەریەن هێناوە.

---

(١) ئەو کەتیبەیە بەم دواییانە لە پایکۆڵی دۆزراوەتەوە، پایکۆڵی لە رابردوو لەژێر دەسەڵاتی ئێران بووە و کەوتووەتە رۆژئاوای کوردستان، ئێستە بەشێکە لە میزۆپۆتامیا. ئەو کەتیبەیە بە دوو زمانی پەهلەوی ئەشکانی و پەهلەوی ساسانی نووسراوە، هێرتزفێڵدی ئێرانناس کە ماوەیەك لە ئێران کاری کرد، باسی ئەو کەتیبەی کردووە، هەر ئەویش وەریگێڕا، ئێستە یەکەم وەرگێڕدراوی ئەو کەتیبەیە لە مۆزەخانی (فری گالەری) لە شاری واشینگتۆنی پایتەختی ئەمەریکایە، هێرتزفێڵدی ئێرانناس بە وردی لە پەڕتووکەکەی بە

شاپووری یەکەم ئەو کەسە نەبوو، کە لە کەتیبەکانیدا بابەتەکانی بشارێتەوە و ناڕاستگۆیانە بجوولێتەوە و خۆی بە شێوەیەك دەربخات کە وانەبێت. ئەو لە کەتیبەکانی باسی ئەوە دەکات کە هەندێ وڵاتی دوای داگیرکردن، تالان کردووە و دانیشتووانەکەی کوشتووە. ئەگەر ئەو ڤالەریەنی کوشبایە، لە یەك لەو کەتیبانەدا باسی دەکرد، هەروەك چۆن باسی لە شکستدان و دیلکردنی کردووە.

**دووەم:** کاتێك ڤالەریەن لە ساڵی (٢٦٠ ز) بە دەست شاپوور دیل کرا، لاك تانسی قەشەی کریستیان تەنیا دە ساڵان بوو، هاوکات هەندێ کریستیان (٣٠ تا ٤٠) ساڵان هەبوون کە بە دڵنیاییەوە باشتر لە منداڵێکی دە ساڵان ڕووداوەکانی ڤالەریەنیان دەزانی، کریستیانەکانیش دژی ڤالەریەن بوون، بۆیە ناتوانرێت بڵێین لایەنگری ڤالەریەن دەبوون.

ئەوان نووسیویانە ڤالەریەن بە مردنی ئاسایی لە دوای یازدە ساڵ لە دیل بوون (هەندێك دەڵێن هەشت ساڵ) مردووە و تەرمەکەی بە ڕێزەوە لەلایەن شاپوور بۆ ڕۆم ناردراوەتەوە. ئەگەر بەراورد بکەین لە نێوان ساڵی مردنی ڤالەریەن کە (٢٧١ یاخۆ ٢٧٢ ز) بووە و ساڵی دیلکردنیشی یازدە ساڵ دەکات.

**سێیەم:** دوای بەخشینی ڤالەریەن و گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوونی لەلایەن شاپوورەوە، ئیتر بیانوویەك بۆ کوشتنی ئەو و ئەو بابەتانەی دوای مردنی نەمابوو.

**چوارەم:** بێ دەنگی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان، بەڵگەیەکە لەسەر ئەو بابەتە. شاراوە نییە کە لە سەردەمی ساسانییەکان و بە تایبەتی لە سەردەمی شاپووری یەکەمدا، پێوەندیی ئەرمەن و ئێران باش نەبوو، بە پێچەوانەوە پێوەندیی ئەوان و ڕۆم باش بوو. ئەگەر شاپووری یەکەم، ڤالەریەنی کوشبووایە و پێستەکەی پڕ کا کردبایە، ئەوا ئەرمەنییەکان لە نووسینی ئەو بابەتە بێ دەنگ نەدەبوون، بە دڵنیاییەوە بۆ ئەوەی ڤالەریەن بە ستەملێکراو بناسێنن، ئەو

---

ناوی (پایکۆڵی) باسی ئەو کەتیبەیەی کردووە کە ئێرانناسەکانی دیکەی وەك (کریستیەن سێنی دانیمارکی) کە مێژووی ساسانییەکانی نووسیوەتەوە، باسیان نەکردووە.

دوای هێرتزفێڵد چەند ئێرانناسێکی دیکە بۆ نموونە (ریچارد فرای) ئەمەریکایی باسی ئەو کەتیبەیان کردووە، لەمەودواش هەر کەسێك بیەوێت باسی ساسانییەکان بکات، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەتیبەیە. پرۆفیسۆر ئارتوور کریستیەن سێنیش لە چاپی دووەمی پەڕتووکەکەی بە ناوی (ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا) کە لە ساڵی ١٩٤٤ لە لایەن دەزگەی چاپەمەنی ئیبن سینا بە پێداچوونەوەی تەواو چاپ کرا، سوودی لە کەتیبەی پایکۆڵی وەرگرتووە. "زەبیحوڵڵا"

بابەتەیان گەورە دەکرد و لێی بێ دەنگ نەدەبوون، تەنانەت لە پەڕتووکەی بە هی (قوستەنتین) ناوزەد دەکرێت، ئەو بابەتە باس ناکرێت، ئەمە لە کاتێکدایە کە لەو پەڕتووکەی بە هی قوستەنتین دادەنرێت، دەبووایە بابەتی کوشتن و پێست داماڵینی ڤالەریەن هاتبایە، چوونکە قوستەنتین کەسێك بوو کە ئاینی کریستیانی کردە ئاینی فەرمی ڕۆمەکان، لە بەرانبەریشدا ڤالەریەن کریستیانەکانی دەکوشت.

لەو یادداشتانەی لە "مانی"یشەوە بە جێ ماون ئەو بابەتەی قەشە لاك تانس ڕەتکراوەتەوە، چوونکە مانی لە نووسینەکانیدا باس لە جوامێری شاپوور یەکەم دەکات و دەڵێت بەرانبەر بە پاشا شکست خواردووەکان بە شێوەیەك هەڵسوکەوتی دەکرد کە ڕێزی ئەوان بپارێزێت، شاپووری یەکەم لەوانەیە بۆ پارێزگاری لەنێوەکەشی بووبایە، ڤالەریەنی نەدەکوشت یاخۆ بەو شێوازە نەدەکوشت.

- **بەردەوامی سەربردەی شاپووری یەکەم**

ئەی ئەو کەسەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنیەوە، ئێستە کە لە نووسینی ئەو کەتیبەیەدام سی ساڵ لە تەمەنی پاشایەتیم تێپەڕ بووە، لەو ماوەیەدا ڕووداوی زۆر لە وڵاتەکەم و وڵاتانی دیکەش ڕوویان داوە، بەڵام لەو ماوەیەدا ئەوەی لە ڕۆم ڕوویداوە زۆر مایەی سەرسووڕمانە، لەو ماوەیەدا هیچ ساڵێك نەبووە کە ئیمپراتۆرێکی ڕۆم نەکوژرێت و یەکێکی دیکە نەیەتە سەر تەختی دەسەڵات، لەنێوەوە و دەرەوەی ڕۆمیش، بەردەوام دوو یاخۆ سێ کەسان بانگەشەی ئیمپراتۆربوونیان بۆ خۆیان ڕاگەیاندووە، ئەوەی پتر مایەی سەرسووڕمانە، ئەوەیە کە هەموو ئەو ئیمپراتۆرانە بە دەست سەربازەکانی خۆیان کوژراون.

لە یەکەم ساڵی پاشایەتیی من کە بەرانبەر ساڵی (٢٤٠ ز) بوو، (سابی نیاتۆس) کە فەرماندەی لژیۆن بوو، ئەرکی لە کارتاژ بوو، خۆی بە ئیمپراتۆر ناساند، ماوەی بیست ڕۆژی نەخایاند کە لەلایەن سەربازەکانییەوە کوژرا.

لە ساڵی دووەمی پاشایەتی مندا و لەنێو ڕۆم، کەسێکی دیکە بە ناوی (ئی می تۆس) کە لەگات بوو، خۆی بە ئیمپراتۆری ڕۆم ناساند. ئەو جگە لەوەی فەرماندەی لژیۆن بوو، سەرۆکی دادگەیەکی ڕۆم بوو بە ناوی (پرتوار)، دوای سەد ڕۆژ لە بە ئیمپراتۆربوونی، بە دەست یەکێك لە لەگاتەکانی خۆی بە ناوی (ژولیۆس فلیپۆس) ناسراو بە (ئارەب) کوژرا، فلیپۆس خۆی بە ئیمپراتۆر ناساند و لەسەر تەختی ئیمپراتۆری دانیشت.

هەر لە هەمان ساڵدا گۆردینی سێیەم خۆی بە ئیمپراتۆر ناساند و فلیپۆس دوای ئەوەی شکستی خوارد، هەڵات و ئەو گۆردیۆنە هەر هەمان گۆردیۆنی سێیەمە کە من لە ساڵی (٢٤٤ ز) بە دەستی خۆم کوشتم.

لە ماوەی نێوان ساڵانی (٢٤٥ تا ٢٥٢ ز) لە رۆم و وڵاتە ژێردەستەکانی، دە کەس ئیمپراتۆربوونی خۆیان ڕاگەیاند، هەموویان بە دەست سەربازەکانی خۆیانەوە کوژران، دوایین کەسی ئەوان ئیمیلیانووس بوو، وەك باسم کرد بە لەشکرەکەیەوە هات بۆ جەنگی من و لەلایەن یەکێك لە لەگاتەکانی خۆیەوە کوژراو و لەشکرەکەی بەبێ جەنگ گەڕایەوە.

دوای ڤالەریەنیش، جالینۆسی کوڕی بۆوە ئیمپراتۆر، هاوکات لە وڵاتی گوڵ (فەرەنسا) یەکێك لە فەرماندەکانی لژیۆن بە ناوی (پۆستۆمۆس) بانگەشەی بە ئیمپراتۆربوونی کرد، کە فەرماندەی لژیۆنێکی دیکەش بە ناوی (ڤیکتۆری تۆس) کە بۆ جەنگی ئەو رۆیشت بوو، لەگەڵ ئەودا یەکیان گرت و بوونە ئیمپراتۆری گوڵ.

لە ساڵی (٢٦٧ ز) بە هەمان شێوەی جاران لەلایەن کریستیانەکانی رۆمەوە هەواڵم بۆ هات و زانیم جالینۆس یەکێك لە فەرماندەکانی لژیۆنی بە ناوی (ئۆرە ئۆلۆس) ڕاسپارد تا بچێت بۆ جەنگی ئەو دوو ئیمپراتۆرە، بەر لە گەیشتنی ئۆرە ئۆلۆس بە فەرەنسا، یەکێك لە دوو ئیمپراتۆرەکە لەلایەن سەربازەکانییەوە کوژرا و لەگاتێکیش بە ناوی (ماریۆس) هەستا بە کوشتنی ڤیکتۆری تۆس و خۆی بە ئیمپراتۆر ناساند، بەڵام ئۆرە ئۆلۆس کە ڕاسپێردرا بوو بۆ جەنگی هەردوو ئیمپراتۆر، دوای ئەوەی زانی ئەوان کوژراون، گەڕایەوە بۆ رۆم و خۆی بە ئیمپراتۆر ناساند، ماوەیەکی کەم لە دوای ئەویش، یەکێك لە لەگاتەکانی دیکە بە ناوی (تێت ری کۆس) تاجی لەسەر نا و خۆی بە ئیمپراتۆر ناساند، بەم شێوەیە لە ساڵی (٢٦٨ ز) لە یەك کاتدا رۆم سێ ئیمپراتۆری بە ناوەکانی (جالینۆس، ئۆرە ئۆلۆس و تێت ری کۆس) هەبوو.

تێت ری کۆس دوای هاتنی بۆ سەر دەسەڵات، جالینۆسی کوڕی ڤالەریەنی کوشت و خۆشی بە دەست فەرماندەیەکی دیکەی لژیۆن بە ناوی (کلۆد) کە خۆی بە (کلۆدی دووەم) ناساند، ئەوی کوشت، دواتر هەردوو ئیمپراتۆریتر واتە (تێت ری کۆس) و ئۆرە ئۆلۆسی)یشی کوشت تا بە تەنیا لە دەسەڵات بێت، بەڵام بەر لەوەی ئەو کەتیبەیە بە کۆتایی بگات، ئەویش بە نەخۆشی تاعوون کۆتایی بە ژیانی هات و براکەی بە ناوی (کێن تی لۆس) بووە ئیمپراتۆر، تەنیا بیست رۆژ لە دوای بە ئیمپراتۆربوونی لەلایەن (وی تۆس ئۆرە لیانۆس) کوژرا و بۆوە ئیمپراتۆر و ئێستە ئەو ئیمپراتۆری رۆمە، بەڵام لەوانەیە ئەویش لە ماوەیەکی نێزیك لەلایەن

یەکێکی دیکەوە بکوژرێت. بە بڕوای من بەهۆی ئەوەی گەورەکانی رۆم هەموویان بت دەپەرستن و ستەمیان گەیاندۆتە لووتکە، کەوتوونەتە بەر رِق و تووڕەیی خوداوەندی مەزن، خوداوەند ئەوانی بە نەفرەت کردووە، بۆیە ئاوا کەوتوونەتە بەر کوشت و بڕینی یەکدی.

نەفرەتی مەزدا تەنیا بۆ گەورەکانی رۆمە و بەسەر خەڵکی ئاسایی رۆم نایەت، ئەوان بە گشتیی تەمەن درێژن، بەڵام تەمەنی دەسەڵاتدارانی رۆم کەمە، منداڵەکانیانیش زوو دەمرن، سەبارەت بەو بابەتە (کارتیەر) کە (هێربێد)ـە[1] بابەتێکی بۆ باس کردم کە ئێستە باسی دەکەم.

ئەو دەیوت زوو مردنی گەورەکانی رۆم و منداڵەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ سورب (قەڵا)، ئەوان خواردنەکانیان لە مەنجەڵی دروست کراو لەو کانزایە دەکوڵێنن.

گەورەکانی رۆم ئاوی باران و شەراب تێکەڵاو دەکەن و لەو جۆرە مەنجەڵانەدا دەیانکوڵێنن تا سێ بەشی ببێتە هەڵم و تەنیا یەك بەشی بمێنێتەوە، ئەو شەرابە زۆر بە بەهێز دەژمێرن.

ئەوان جۆرێکی دیکەی شەراب بە رێگەی دڵۆپاندن ئامادە دەکەن، دوای ئەوەی مەنجەڵە قەڵاییەکان پڕ شەراب دەکەن و سەرەکانیان دادەخەن، دەست بە کوڵاندنیان دەکەن و بۆڕییەکی باریك شەرابی بە هەڵم بوو لەو مەنجەڵەوە دەگوازێتەوە بۆ یەکێکی دیکە، بەو شێوەیە جۆرێك لە شەرابی تازە ئامادە دەبێت کە زۆر بەهێزە و تاکە جامێك لەو شەرابە بەسە تا یەکێك بخات، گەورەکانی رۆم لەو جۆرە شەرابە دەخۆنەوە. هەروەها ئەوان ئەو رۆنەی بۆ ئامادەکردنی خواردن بەکاری دەبەن لە دەبەی ئامادەکراو لە قەڵادا هەڵدەگرن، کارتێر دەڵێت مەزدا بڕیاریداوە کانزای قەڵا تایبەت بێت بە ئەستێرەی زووحەل و دەسەڵاتیی ئەو کاڵایە لای ئەو بێت، بۆیە هەرکەسێك شەراب یاخۆ رۆن یان خواردن لە دەفری قەڵاییندا ئامادە بکات، دەکەوێتە بەر نەفرینی زوحەل، بەڵام گەورەکانی رۆم تەنیا سوود لە دەفرە قەڵایینەکان وەردەگرن بۆ چێشت لێنان و تەنیا شەراب دەکەنە ئەو دەفرانەوە، هەر لەنێو ئەو دەفرانەشەوە شەراب ئامادە دەکەن، بۆیەش منداڵەکانیان زوو دەمرن و خۆشیان جوانەمەرگ دەبن.[2]

---

(١) هێربێد واتە مامۆستای زانستە ئاینییەکان لە سەردەمی ساسانییەکان و ئەو کارتیەرە یەك لە دیارترین مامۆستاکانی بواری زانستی ئاینی بوو، لەسەردەمی بەهرامی دووەم واتە پاشای ساسانی، گەیشتە پلەی سەرۆکایەتیی تەواوی زانا ئاینییەکانی هەموو وڵاتانی ژێر دەستی ئێران. "زەبیحوڵڵا"

(٢) دەردەکەوێت کارتێر تەنها زانا یاخۆ پێشەوایەکی ئاینی نەبووە، هەندێ زانیاریی لە بارەی کانزای قەڵاش هەبووە، تەنیا یەك سەدە بەر لە ئێستە زانراوە، کە قەڵا دەبێتە هۆی ژهراویبوون، ئێستەش ئەو کانزایە

چەند جارێك سەبارەت بە مانی لەگەڵ کارتێردا دەدوام، بۆم دەرکەوت کە ئەو دژی مانییە، دەیوت ئەو پیاوە هۆکاری بەهەڵەداچوونی لایەنگرانی تۆیە و پێویستە تۆ ئەو کەسە لەنێو ببەی تا نەبێتە مایەی گەندەڵ بوونی لایەنگرانت. تەنانەت ڕۆژێك پێی وتم مانی زنجیرەی پاشایەتیی تۆ لەنێو دەبات و دەبێتە هۆکاری کەوتنی تۆ ئەگەر تۆ ئەو لەنێو نەبەی، ئەوا ئەو دەبێتە هۆی لەنێوچوونی تۆ.

بنەماکانی ئاینی مانی سێ بابەت بوون و ئەو دەیوت:

**یەکەم:** بناخەی جیهان لەسەر یەکدیی کێشکردن و پاڵنان دامەزراوە، هەندێ شت یەکدیی کێشن دەکەن و هەندێکیش پاڵ دەدەن، بەو هۆیەشە کە مرۆڤ هەندێك کەسی خۆش دەوێت و هەندێکی دیکەی بەلاوە پەسەند نییە. ئەو دەیوت هەرچەندە لە جیهاندا بوونەوەرەکان یەکدیی کێش دەکەن یاخۆ پاڵ دەنێنەوە، بەڵام دوو دەورەی بەدوایەکدا هەیە کە یەکەمیان کێشکردن و ئەوی دیکەش پاڵ نانەوەیە.

لە دەورەی پاڵناندا هەموو شتێك پەراگەندە دەبێت و لە چەقی دنیا دوور دەکەونەوە، ئەو دەورەیە هەزاران ساڵ دەخایەنێت. دوای ئەو دۆخە ڕاکێشان دەست پێدەکاتەوە و هەموو شتێك بەرەو چەقی دنیا ڕادەکێشرێتەوە، تا هەموو شتەکان دەگەنە چەق، ئەوکات تەنیا یەك شت دەمێنێتەوە، بۆیە دەست بە پاڵنانەوە دەکرێتەوە و ئەو ناوەندە پەرە دەگرێت و شتەکان لەیەك بڵاودەبنەوە، ئەو دۆخە تا هەزاران ساڵ بەردەوام دەبێت، دواجار دیسان ڕاکێشان دێتەوە.

**دووەم:** یەکێك لە باوەڕەکانی دیکەی مانی ئەوەیە کە تەنیا کەسانی بەهێز پێویستە زیندوو بمێننەوە، ئەوانی دیکە پێویستە لەنێو بچەن، چوونکە هیچ سوودیان بۆ کەس نییە و کەسە بەهێزەکان کار دەکەن و لە کارکردنی ئەوان سوود بۆ هەمووان دێت.

**سێیەم:** دوایین بنەمای مانی کە لە دوو بنەماکەی دیکەی سەیرترە برێتییە لەوەی خۆر لە ئاسماندا بێ جووڵەیە و زەوی بەدەوری ئەودا دەخولێتەوە.

وتەی یەکەم و دووەمی مانی گریمانێکن کە لەوانەیە یەکەمیان ڕاست بێت، دووەمیش من ناتوانم پەسەندی بکەم، چوونکە مرۆڤ هەرچەندە بەهێز بێت، ڕۆژێك دێت کە بە هۆی ماندوویەتی و نەخۆشی دەکەوێت، ئایا ئەوکات نابێت لەبەر بێ هێزی ڕێگەی پێ بدەین

---

هەروەك سەردەمی کارتێر بە هی زوحەل دەناسن، لە پزیشکیدا ئەو نەخۆشییەی لە ڕێگەی ژەهراویبوون بە قەلا دێتە پێش بە ساتۆرنین واتە نەخۆشی گرێدراو بە زوحەل دەناسن. " زەبیحوڵڵا"

بەردەوام بێت لە ژیان. جگە لەوەش ئەوەی بێ هێزە، خۆ خەتای نەکردووە تا بە هۆیەوە سزای بدەن. ئەو بە ویستی خۆی لاواز نەبووە، ئەوە ویستی مەزدایە کە بەو شێوەیە ئافرێندراوە، تا ئەو رۆژەی نەکەوێتە هەڵەوە، ناتوانرێت سزا بدرێت و لەنێو ببرێت. تەنانەت ئەگەر هەڵەشی کرد، دەبێت بە پێوەری هەڵەکەی سزا بدرێت، بەڵام وتەی سێیەمی مانی زۆر ئەستەمە و کەس ناتوانێت باوەڕی پێ بکات، هەر ئەو وتەیەشە کە منی لەو بێزار کردووە. تا ئەو رۆژەی مانی نەیوت خۆر جێگیر و زەوی بە دەورەیدا دەخولێتەوە، من سەرەنجم دەدایە، بەڵام دوای ئەو وتەیە لێی بێزار بووم، ئەگەر رابردووی دۆستایەتیمان نەبووایە، لەوانەیە وتەی کارتێرم پەسەند کردبا و کوشتبامە.

سێیەم بنەما لە وتەکانی مانی بە دوو هۆکار بێ واتا بوو:

لە لایەك وتەیەکی دەوت کە وەك شێتەکان وابوو ئەو وێڕای ئەوەی دەیزانی هەموو جیهانیان دەبینن کە خۆر بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە، جەختی دەکردەوە کە خۆر ناجوڵێت و زەوی بە دەورەیدا دەسووڕێتەوە. لە لایەکی دیکە وتەکەی ئەو ناڕاستەوخۆ دەربڕی ئەوە بوو کە من جووڵەی خۆر بە هەڵە دەبینم، ئەم بابەتەش بێ ڕێزی بوو بەرانبەر بە من، چوونکە ئەگەر بیری من هەڵەش بووایە، ئەوا چاوەکانم هەڵەیان نەدەبینی و سەدان هەزار لە شوێنکەوتووانی من لە ئێران و وڵاتانی ژێردەستی ئێران جووڵانەوەی خۆریان دەبینی و ئەو پیاوە نەزانە خۆری بە جێگیر و زەوی بە جووڵاو دەزانی، ئەگەر وتەی ئەو راست بووایە، دەبووایە هەموو شاخەکان لەیەك پرژا بووانە و ئاوی دەریاکان لە کەنارەکانیانەوە دەڕژانە سەر وشکانییەکان و داگیریان دەکردن.

کارتێر دەیوت چوونکە مانی لە تافی لاوەتیدا لە هیندستان ژیاوە، ئەو وتە نەزانانەیە لە هندییەکان فێر بووە.

بەشی یەکەمی وتەکانی مانی لەوانەیە لە بودا وەرگیرا بێت، چوونکە ئەو دەڵێت پایەی دنیا لەسەر هەناسەدان دامەزراوە، هەرچەند هەزار ساڵ جارێك زەوی هەناسە هەڵدەمژێت و لە کاتی هەناسە هەڵمژیندا هەموو شتەکان قووت دەدات و دنیا بچووك دەبێتەوە.

دواتر هەناسە دەردەدات، لەوکاتەدا هەموو شتەکان دەست دەکەنەوە بە دوورکەوتنەوە لە یەکدیی. وتەی مانی سەبارەت بە هێزەکانی کێشکردن و پاڵنانەوە زۆر لە بابەتی هەناسە مژین و هەناسەدانی بوداییەکانی هیندستان دەچێت، بەڵام بوداییەکان ناڵێن مرۆڤە بێ هێزەکان پێویستە لەنێو بچن، تەنانەت لە کوشتنی ئاژەڵە زیان بەخشەکانیش خۆیان دەپارێزن، لە کاتێکدا بە باوەڕی ئێمە پێویستە تەواوی ئاژەڵە زیان بەخشەکان لەنێو ببردرێن.

وتەی سێیەمی مانی هی هیندەکان نییە، ئەوانیش وەك تەواوی مرۆڤە خاوەن ئەقڵەکان دەزانن (چوونکە بە چاوی خۆیان دەیبینن) خۆر لە جووڵەدایە و ئەوە بە چاو دەبینن.

رۆژێك لەو کاتەدا کە کارتێر هانی دەدام بۆ کوشتنی مانی، بە ئەوم وت ئایا پێتوانییە ئەو پیاوە لە ڕووی ئەقڵییەوە تێك چوو بێت و ئایا ئەو پیاوەی بە هەردوو چاوەکانی خۆی دەبینێت خۆر لە جووڵەدایە و زەوی جێگیرە، وێڕای ئەوەش بە پێچەوانە دەدوێت، شێت نەبووە؟، بەو هۆیەوە کە لەوانەیە ئەو شێت بووبێت، کوشتنی دروست نییە.

کارتێر زۆر حەز دەکات هەموو ئەو نەتەوانەی لە وڵاتەکانی ژێر دەسەڵاتیی مندا دەژین ببنە زەردەشتی و مەزدا بپەرستن، بەڵام من نامەوێت دانیشتووانی ئەو وڵاتانە بە زۆر بکەمە زەردەشتی، بۆیە بە کارتێرم وت کە نامەوێت تەنانەت یەك کەسیش بە زۆر بکرێتە زەردەشتی.

# كارتێر و دادگایی کردن و کوشتنی مانی

پێش ئەوەی کەتیبەی کارتێر کە وەك کەتیبەی شاپوور لە زمانی خۆیەوە نووسراوەتەوە، بخەینە بەر دیدەی خوێنەری ئازیز، بە پێویستی دەزانین کەمێك باسی ناوبراو بکەین.

تا ساڵی (١٩٣٧ ز) هەرچەندە ناوی کارتێر لە هەندێ پەڕتووکی مێژوویيدا هاتبوو، بەڵام کەس ئەوی نەدەناسی و نەیدەزانی کێیە؟.

هەندێك بیریان وابوو کە کارتێر پلەیە و ناوی کەسێك نییە تا ئەوکاتەی ئەو کەتیبەیەی کارتێر لە کەعبەی زەردەشتدا داینابوو، لەلایەن ئێرانناسە دەرەکییەکانەوە دۆزرایەوە و خوێندرایەوە. دوو کەس لە ئێرانناسە دیارەکان کە یەکێکیان (هینینك) بوو لێکۆڵینەوەیان لەبارەی ئەو کەتیبەیە کرد هەندێك لە مامۆستایانی زانکۆکانی ئێران سوودیان لە لێکۆڵینەوەکانی هینینك وەرگرت.

دوای هینینك ئێرانناسێکی دیکە بە ناوی (ئەسپرین گیلینك) بەردەوامیدا بە کارەکانی لێکۆڵینەوەی ئەو لەبارەی کارتێر و ئەو کەتیبەیەی لە دوای ئەو لە (کەعبەی زەردەشت) لە فارس نووسی بووی، ئەو پشتڕاستی کردەوە کە کارتێر ناوی کەسێکی زانای ئاینی بووە، کە لە سەردەمی شاپووری یەکەم ژیاوە و پلە نەبووە، کارتێر دوای مردنی شاپوور و لە سەردەمی کوڕەکەی واتە (هورمز) دواتریش لە سەردەمی (بەهرامی یەکەم) کە برای هورموز و کوڕی شاپووری یەکەم بووە، ژیاوە و بەردەوام بووە لە ژیان لە سەردەمی بەهرامی دووەم کوڕی بەهرامی یەکەم و لە سەردەمی دەسەڵاتیی هەر چوار پاشای ناوبراو، خاوەن رێز بووە و لێیانەوە نێزیك بووە و بە تایبەتی لە سەردەمی بەهرامی دووەم گەیشتە پلەیەك کە بە (ئارامی گیانی بەهرام) دەناسرا.

ئێرانییەکان بە گشتیی لەبارەی سەربردەی کارتێر و باسی کەسایەتیی ئەو لەو کەتیبەیەدا بێ ئاگابوون و ئێرانناسە ئەورووپی و ئەمەریکاییەکان ئەویان ناساند، وەرگێڕدراوی کەتیبەی کارتێر بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٦٠ ز) لە رۆژنامەی فەرەنسی (ژۆرناڵ ئازیاتیك) بڵاو کرایەوە و پەردەی لەسەر نهێنییەکی مەزنی مێژوویی لا برد. هێشتا دەبێت بڵێم زانا ئێرانناسە دەرەکییەکان کار لەسەر کەتیبەی کارتێر دەکەن، لەبەر ئەو چەند وشەیە لە

کەتیبەکە هێشتا توانای وەرگێڕانیان نەبووە و لە کاتی باسی کەتیبەکەدا، باسی ئەو چەند وشەیە دەکەین.

ئەو کەتیبەیە لە کەعبەی زەردەشت و لەژێر کەتیبەی شاپووری یەکەم هەڵکەندرابوو، ئەمەش دەرخەری پلە و پایەی بەرزی کارتێرە و ناوەرۆکی کەتیبەکەش ئەمە دەسەلمێنێت.

باسمان کرد کە شاپووری یەکەم وتی کارتێرم ڕاسپارد تا ئاینی زەردەشتی پەرە پێ بدات، دیارە لە سەردەمی شاپووری یەکەمدا کارتێر پلەی هێربێدی بووە، ئەو پلەیە لە سەردەمی ساسانییەکاندا بچووکتر بووە لە موبێد (مووغ)، وێڕای ئەوەش شاپووری یەکەم ئەوی ڕاسپارد بۆ پەرەپێدانی ئاینی زەردەشت، چوونکە بایەخی زۆری لای شاپوور هەبوو. دیارە کارتێر سەرەڕۆ بوو، بەردەوام کارتێر ڕێگەی لە سەرەڕۆییەکانی دەگرت و ڕێگەی نەدەدا ئەو بە زۆر ئاینی زەردەشتی لە ئێران و وڵاتانی ژێردەستی ئێران پەرە پێبدات.

لە لایەکی دیکە گریمانی نێزیکە کە بە هاندانی کارتێر و لە سەردەمی شاپووردا مانی کوژرا بێت، تەنانەت کەتیبەکە وا دەردەخات کە کارتێر بەشداری دانیشتنەکانی دادگایی کردنی ئەو بووە، بڕیاری کوشتنی مانی لە ساڵی (٢٧٦ ز) دەرچووە.

بابەتێکی دیکەی تایبەت بە کارتێر کە لە کەتیبەکەدا دیارە، نووسیویەتی: "هاوسەرگیری لە نێوان خزم و نێزیکانی یەکدیم ئازاد کرد."

پێش ئەوەی دەقی کەتیبەکەی کارتێر کە لە ڕۆژنامەی ژۆرناڵ ئازیاتیکی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە، بخەینە بەردیدەی خوێنەری بەڕێز، پێویستە ئەو بابەتە بخەینە ڕوو کە ئەوەی لێرە بڵاوکراوەتەوە لە ڕووی نووسینەوە لەوانەیە جیاوازیی هەبێت لە دەقی ناو ڕۆژنامەکە، بەڵام لە ڕووی واتا و ناوەرۆك هەمان ئەو نووسینەیە کە لە ئەوێیە.

ئەو دەقەی لە ڕۆژنامەکە بڵاوکراوەتەوە وشەی دووبارەی زۆرە، لە ڕۆژهەڵاتی کۆندا دووبارە کردنەوەی هەندێ وشە و نووسین باوبووە، ئێستەش دووبارەکردنەوە کارێکی باش نییە و خوێنەر لای باشترە بە زوویی دەقە سەرەکییەکە بخوێنێتەوە. بۆیە تەنیا واتای ڕاستەوخۆی بابەتەکەمان پوخت کردوتەوە، ئەمەی خوارەوە دەقی ناوەرۆکی کەتیبەی کارتێرە کە لە ژۆرناڵ ئازیاتیك وەرگیراوە:

"من کارتێر لە سەردەمی پاشایەتیی شای شایان شاپووردا دەژیام، ئەو پاشایەکی گەورە بوو، لە سەردەمی ئەودا من پایەی هێربێدم هەبوو، لە تەواوی وڵاتانی ژێردەستی ئێران تێکۆشام بۆ پەرەپێدانی ئاینی مەزداپەرستی، ژمارەیەکی زۆر ئاگرخانەم دروست کرد، لە

سەردەمی ئەو پاشایەدا چینی زانایانی ئاینی بوونە خاوەن پایەی باش، دوای ئەوەی شاپوور مرد، کوڕەکەی کە ناوی هورمز بوو، بووە شای شایان و ئەو پلەی (مگوپەت ئۆرمۆزد) واتە پەرستیاری ئۆرمۆزدی بە من بەخشی و پێی وتم تا بۆ پەرەپێدانی ئاینی مەزداپەرستی تێبکۆشم، دیسان من ژمارەیەکی زۆرتر لە ئاگرخانەم بیناکرد، لە هەر شوێنەك کە دەمزانی (یوزەندکە) هەیە، لە دژی جەنگام.[١]

لە سەردەمی پاشایەتیی هورمزیشدا زانایانی ئاینی بوونە خاوەن پایەی باش و منیش لە وڵاتانی ژێر دەستی ئێران ئاگرخانەی دیکەم دروست کرد، تا ئەوکاتەی هورمز مرد و براکەی واتە (وەرهەرام، بەهرام) کوڕی شاپوور بوو بە پاشا تێکۆشام بۆ پەرەپێدانی ئاینی مەزدا پەرەستی، لە سەردەمی ئەویشدا من هەر مگوپەت بووم، تا ئەوکاتەی ئەویش مرد و بەهرامی کوڕی واتە بەهرامی دووەم هاتەسەرکار و بوو بە پاشا. بەهرامی دووەم پاشایەکە لایەنگری مەزداپەرستی و پەرەپێدانی ئاینی مەزدایی، ئەو دەسەڵاتیی تەواوی پێ بەخشیم بۆ لەنێوبردنی دێوزەندەکان و لە سەردەمی ئەودا من پلەم بەرز کرایەوە و بوومە (کارتێر ئارام گیانی بەهرام).[٢]

لەبەرئەوەی دەسەڵاتیی تەواوم پێدرابوو، جەنگێکی توند و بێ بەزەییانەم لە دژی زەندکە و (گۆمەرزەك)[٣] دەست پێکرد.

لەوکاتەدا کە من بە توندی جەنگی زندیق و گۆمەرزەك و ئەوانی دیکە بووم کە بوونیانم بە خراپکار بۆ زەوی دەزانی، تاقمێکی دیکە بە ناوی (رەت پەزەك)[٤] بەرەو زۆر بوون هات.

---

(١) (مەبەست لە زەند هەمان پەیڕەوانی مانی بوون کە دواتر بە زەندیق ناسران. "زەبیحوڵڵا".

(٢) ئارامی گیان بە واتای رزگاری بەخشی روح بووە، ئەو نیشانە لەبەرئەوە بەو بەخشراوە کە بەهرامی دووەم کارتێری بە ئارام بەخشی رۆحی خۆی زانیوە. "زەبیحوڵڵا"

(٣) وشەی گۆمەرزەك لەو وشانەیە کە تا بە ئێستە ئێرانی و ئێرانناسەکان نەیانتوانیوە ماناکەی بزانن و نازاندرێت چ گرووپێك یاخۆ تاقمێکی ئاینی بوون، تەنها یەك لە ئێرانناسەکان گومانی ئەوە دەکات کە ئەو ناوە بۆ میترا یاخۆ میهرپەرستەکان بەکارهاتبێت و باس لەمەڕ ئەوان زۆر دەخایەنێت و لەسەردەمی ساسانییەکان بە خۆرپەرستەکان ناو دەبران. "زەبیحوڵڵا"

(٤) رەت پەزەکیش هەر وشەیەکە لە کەتیبەی کارتێر هاتووە تا ئێستە واتاکەی لێك نەدراوەتەوە و نازانن کە چ بووە، تەنها زانراوە کە قوربانی نەبوونە و شتی دیکە بوونە. "زەبیحوڵڵا"

من تەواوی پەرستگەکانی زندیق و ئەوانی دیکەم وێران دەکرد و لە جێگەیان ئاگرخانەم دروست دەکرد، لە هەر شوێنێك زەندیقێك دەدۆزرایەوە، دەکوژرا و سەرەنجام سەرۆکی زەندیقەکان دەستگیر کرا، دوای دانپیانان، کوژرا. تۆ ئەی ئەو رێبوارەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنییەوە، ئاگەدار بە کە ئێستە نە زەندیق و نە سەرۆك و کەسیان نەماوە و من تا زیندووبم رێگە نادەم هیچ شتێك پێچەوانەی ئاینی مەزداپەرەستی هەبێت. لەو سەردەمەدا تەواوی ئەوانەی لە ئاگرخانەکاندا کار دەکەن و ئەوانەی زانای ئاینین، هەموویان بە باشی دەژین و پایەی باشیان هەیە، ئێستە وڵاتانی ژێردەستی ئێران خاوەنی شازادە و زانای ئاینی و پیشەوەر و بازرگانن.

ئەی ئەو رێبوارەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنییەوە، ئەوە بزانە کە من لە سەردەمی شاپووردا پلەم (هێربێد) بوو، لە سەردەمی هورمزی کوڕیدا پلەم بۆ (مەگۆپەد ئۆرمەزد) و لە سەردەمی بەهرامی کوڕی بەهرام بۆ (ئارامی گیانی بەهرام) بەرز بۆوە. ئێستە لە ئێران و تەواوی وڵاتانی ژێردەستی ئێران لەنێو زانایانی ئاینی هیچ کەس پلەی لەمن بەرزتر نییە و ئەو پلەیە لەلایەن مەزداوە بۆ من بە دیاری هاتووە. من لە (کاپادۆکی، کیلیکی، سوریا، ئەلبانیا، ئەرمەنستان و تەواوی وڵاتانی دیکە) کە ناوهێنانی هەموویان زۆری پێویستە، ئاگرخانەم دامەزراندووە و لە هەموویان ئاگر کراوەیە و لە دەورەی ئەو ئاگرخانانە خەڵك سەرگەرمی ئاینی مەزداپەرستین و من هاوسەرگیری لە نێوان کەسانی نێزیك یەکدییم ئازاد کردووە".

ئەوەی باسکرا برێتی بوو لە کەتیبەی کارتێر و یەك لەو بەڵگەنامانەیە کە سەبارەت بە سەردەمی ساسانی لە شاپووری یەکەم تا بەهرامی دووەم بەردەوام بووە و سەرەنجام کارتێر بووە هۆکاری کوشت و بڕی هەموو مانییەکان و دواجار خودی مانی.

تا پێش خوێندنەوەی ئەو کەتیبەیە تەواوی مێژوونووسان وایاندەزانی کە کارتێر بە فەرمانی بەهرامی دووەم کوژراوە، دوای دۆزرانەوەی ئەو کەتیبەیە، دەرکەوت هاندەری سەرەکیی بۆ کوشتنی مانی هەمان کارتێر بووە، ئەمە جگە لەوەی ئەو دوژمنایەتییەی نێوانیان لە سەردەمی شاپووری یەکەمەوە هەبووە، بۆیە لە رێگەی ئەو کەتیبەیە دەزانرێت کە کارتێر دەسەڵاتیی تەواوی بۆ کوشتنی مانییەکان لە بەهرامی دووەم وەرگرتووە، دوای دەستگیرکردنی مانی، هانی بەهرامی داوە تا بیکوژێت.

تایبەتمەندیەکانی کارتێر نازانین ، تەنیا هەندێ گێڕانەوە لەبارەی ئامادەبوونی کارتێر لە دانیشتنی دادگایی کردنی مانی هەیە کە باسیان دەکەین، لەنێو ئەو گێڕانەوەیەشدا هیچ تایبەتمەندیی ئەو باس نەکراوە و نازانین کە خاوەنی چ باڵا و جەستە و ڕووخسارێك بووە، چوونکە لە

سەردەمی پاشایەتیی بەهرامی دووەمی ساسانیدا ناوی کارتێر لەنێو مێژوودا نایەت، بۆیە پێم وایە کە ماوەیەکی کەم پێش سەردەمی بەهرامی دووەم کۆتایی بە ژیانی هاتووە و مردووە.

* * *

پێش ئەوەی بچینە ناو ئەو بەشەی تایبەتە بە مانی، پێویستە بڵێین مێژوونووسانی رۆژئاوا و رۆژهەڵات تا ساڵی (١٩٣٣ ز) مانی ـیان لە رێگەی بەڵگە مێژووییەکان نەدەناسی.

مەبەستمان لە بەڵگەنامە مێژووییەکان ئەوەیە کە مێژوونوسێکی ئەو سەردەمە پەسەندی بکات و بە بەڵگەنامە بیناسێت، ئەگەر نا ناو و سەربردەی مانی لە هەندێ لە پەڕتووکە مێژووییەکانی رۆژهەڵات و لە هەندێ پەڕتووکگەلی رۆژئاوادا هەیە، بەڵام تا ساڵی (١٩٣٣ ز) ئەوەی سەبارەت بە مانی دەخوێنرا، تێکەڵەیەك بوو لە نێوان مێژوو و ئەفسانە.

ئیبن ئەلنەدیمی وەرراق، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی کۆچی مانگیدا یەکەم فەرهەنگنامەی زانیاریی جیهانی ئیسلامی بە ناوی (ئەلفەهرەست) نووسیوە، لە بەغداد و چاپخانەی هەبووە، ئەوەی لەبارەی مانی دەڵێت لەگەڵ ئەوەی ئێستە دەزانرێت بە تەواوەتی لێك ناچن.

ئیبن نەدیم وێڕای چاپکردنی پەڕتووکەکان، ئەوانی خوێندوتەوەش، رۆژێك بڕیار دەدات ناوی ئەو پەڕتووکانەی چاپیان دەکات و ناوی نووسەر و کورتەیەك لە نێوەڕۆکی پەڕتووکەکان لە پەڕتووکێکدا کۆبکاتەوە، بەو شێوەیە پەڕتووکی (ئەلفەهرەست) هاتەکایەوە، ئەگەر ئەو پەڕتووکەش نەبووایە، ئێستە لێتۆژان ناوی زۆر زانا و لێکۆڵەریان نەدەزانی، لە جیهانی ئیسلامدا هەر کەسێك بیۆگرافیا یاخۆ فەرهەنگنامەیەکی نووسی بێت، بۆ کۆکردنەوەی ناوی پەڕتووکەکان سوودی لە ئیبن نەدیم بینیوە.

ئیبن نەدیم خۆی هیچی نەنووسیوە، تەواوی ئەوانەی نووسیویەتی لە پەڕتووکەکانی دیکەدا هەبووە، زۆرێك لەو پەڕتووکانەی باسی کردوون، لە ئێستەدا نەماون، ئەگەر ئەو لە ئەلفەهرەستدا ناو و کورتەیەك لە نێوەڕۆکەکەی نەنووسیبووانە، نها لە بوونی ئەو پەڕتووکانە و نووسەرەکانیان هیچ زانیاریمان نەدەبوو.

ئیبن نەدیم سەبارەت بە مانی دەڵێت ئەو کەسێك بووە کە لە چینەوە هاتووە و ماوەی چل ساڵ لە جیهان گەشتی کردووە، ئەوکات هاتووەتە لای شاپوور و داوای لە فەیرۆزی برای

شاپوور کردووە تا بێتە سەر ئاینی ئەو، فەیرۆز بانگەشەکەی پەسەند کرد و هاتەسەر دینی مانی، ئەوکات ئەو دینە لە بەشێك لە جیهان بۆ نموونە لە چین و هیندستان و بەشێك لە ئێران و وڵاتانی رۆژئاوا پەرەی گرت.

ئەو ژیاننامەیەی ئیبن نەدیم لەبارەی مانی باسی دەکات لەگەڵ ڕاستییە مێژووییەکان کۆك نییە، چوونکە بەپێی وتەی ئەو ئەگەر مانی دوای چل ساڵ لە گەشت لە جیهان هاتبێتە لای پاشای ساسانی شاپووری یەکەم و پێش ئەوەی دەست بە گەشتەکەی بکات، ئەگەر تەنیا بیست ساڵی بوو بێت، ئەوا بێگومان ئەوکاتەی هاتووە بۆتە شەست ساڵ.

لە کاتێکدا کە ئەو لە کاتی هاتنی بۆ لای شاپوور لاو بووە، بەڵام هەر لەو بیبلۆگرافیایەی ئیبن نەدیمدا کە لە پەڕتووکێکی دیکەوەوە نووسراوە، ڕاستینەیەکی مێژوویی هاتووە کە باس لە پەرەگرتنی ئاینی مانی لە چین و هیندستان و بەشێك لە ئێران دەکات و دەڵێت لە ئاراستەی رۆژئاوا نەتەنیا تا ئەفریقا بگرە تا ئەورووپاش رۆیشتووە.

لەو پەڕتووکانەی لەلایەن مێژوونووسانی رۆژهەڵات سەبارەت بە مانی نووسراون باسی پەڕجۆی ئەو کراوە کە برێتی بووە لە پەڕتووکێك کە وێنەکانی زۆر جوان بوونە.

ئەو بابەتە بەپێی بەڵگەنامە مێژووییەکانی ئەمڕۆ لە بەردەستن و پەسەندکردنی ئاساییە. چوونکە مانی وێڕای ئەوەی زانا بووە، موزیکژەن و نیگارکێشەکی بە توانا بووە، بەڵام ئەو بابەتە کە ئەو وێنەکانی خۆی بە پەڕجۆ باس کردبێت، راستینەی مێژوویی نین. ئەو پیاوێکی هونەرمەند و وێنەکێش بووە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی نییە بیسەلمێنێت ئەو بانگەشەی پەڕجۆبوونی وێنەکانی ناو پەڕتووکەکەی کردبێت.

لە سەرچاوەکانی مێژوونووسە رۆژهەڵاتییەکان سەبارەت بە مانی و بیروڕاکانی بابەتێك نەهاتووە کە لە ڕووی مێژووییەوە سوودی هەبێت. هەندێك کەس ئەویان بە زندیق ناوبردووە، هەندێك کەسیش ویستوویانەی بێ لایەنی بپارێزن و ئەویان بە دژی ئاینی زەردەشتی ناسیوە، بێ ئەوەی هیچیان بچنە ناو بابەتەکە و باس لە بیروڕاکانی ئاینەکە بکەن.

ناوەرۆکی ئاینی مانی تا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ڕوون نەبوو، لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەدا لە دوو ناوچەدا دوو دۆزینەوەی گەورە لەبارەی ئەو ئاینە هاتەکایەوە، کە برێتی بوون لە ناوچەکانی (تۆرفان) لە تورکستانی چین واتە هەر ئەو شوێنە کە پێشینیان بە چینیان دەناسی و شارەکانی (خەتا و خۆتەن) لەو ناوچەیە لەلای مێژووناسە رۆژهەڵاتییەکان زۆر ناسراون. هەروەها لە ناوچەی (فەیۆم) لە میسر و نێوانی ئەو دوو دۆزینەوەیە تەنیا چەند ساڵێك بوو.

لە ناوچەی تۆرفان لە تورکستانی چین هەندێ بەڵگەنامەی نووسراو بە چەند ڕێنووسێکی ئێرانی دۆزرایەوە، لە ناوچەی (فەیۆم) لە میسریش پەڕتووکێکی ئەستوور لە بەڵگەنامەکانی تایبەت بە ئاینی مانۆیی دۆزرایەوە، هەموویان لەسەر پاپی ڕۆس نووسرابوون.

پەڕتووکە کۆنەکان لە شێوەی تۆمار و پێچراوە بوون، بوونی پەڕتووك بە شێوەی ئێستە نەبووە، ئەو پەڕتووکەی لە میسریش دۆزرایەوە لە چوارچێوەی چەند تۆمارێکی تایبەت و بە زمانی قیبتی بووە، لە نیوەڕۆکیان دەردەکەوێت ئەو تۆمارانە لە یۆنانییەوە وەرگێراون.

وێڕای ئەوەی دوو تاقم لە بەڵگەنامەکان لەبارەی ئەو ئاینە کەوتنەبەر دەست، بەڵام دیسان ماوەیەکی پێچوو تا ئەوانەی هۆگری وەرگرتنی زانیاریی لەبارەی ئاینی مانی بوون بتوانن زانیاریی لەبارەی ئەو ئاینە لەو بەڵگەنامانە وەربگرن کە لە فەیۆم و تۆرفان بەردەست کەوتبوون، چوونکە کاتێك بەڵگەنامەیەك لەژێر خاك دێتەدەر ناتوانرێت دەست بەجێ بڵاو بکرێتەوە.

زۆرینەی ئەو بەڵگەنامانەی لەژێر زەوی دەردەهێنرێن، لەوح یاخۆ کاغەزەکانیان زیانی بەرکەوتووە و ناتوانرێت تەواوی وشەکانیان بخوێندرێتەوە، ئەگەر گریمانی خوێندنەوەشی بکەین، دەبێ بزانین کە لە زمانە کۆنەکانن کە بە زمانە مردووەکان ناسراون و پێویستیان بە وەرگێڕانە، وەرگێڕانی ئەو زمانانەش کەسی تایبەتمەندی پێویستە، بەم هۆیەشەوە تا ساڵی (١٩٣٣ ز) جیهان لە نێوەڕۆکی ئەو بەڵگەنامانە بێ ئاگا بوو.

لە ساڵی (١٩٣٣ ز) پرۆفیسۆر (هینینك) کە وانەی بە هەندێ لە مامۆستایانی زانکۆکانی ئێران وتوتەوە، بەشێك لەو بەڵگەنامانەی لە (تۆرفان) دۆزرانەوە، بە (بەشی ٣) ناسرابوون لە بڵاوکراوەی (ئێسکۆف ئۆف ئۆرینتال ئێستۆدی) بڵاوکردەوە، هەرچەندە ئەوەی بڵاوی کردەوە برێتی نەبوو لە تەواوی بەڵگەنامەکان، بەڵام لەنێوەندە زانستی و مێژووییەکاندا هەرای نایەوە، چوونکە لە ڕووی مانی ناسیەوە بە کارێکی مەزن دەزانرا و ماوەیەکی زۆری نەخایاند کە هەر دوو پرۆفیسۆری مێژووناس (ئێشمیدێت و بۆلۆتسکی) وەرگێڕانی بەڵگەنامەکانی ناوچەی فیۆمین ـیان بڵاوکردەوە.

وەرگێڕانەکەی پرۆفیسۆر (هینینك) بە زمانی ئینگلیزی و هی ئەوانی دیکە بە زمانی ئەڵمانی بڵاو کرایەوە، هەردوو پرۆفیسۆر دانیان نا بەوەی نەیانتوانیوە دەقەکان بە تەواوەتی وەرگێڕن، لە کاتێکدا کە لە میسر قیبتی زۆر بوون، لە نێوانیاندا خەڵکی زانا زۆر بوو، بەڵام ئەوانیش لە هەندێ لە بەشەکانی بەڵگەنامەکان تێ نەگەیشتبوون.

یەکێك لە گرفتەکانی زمانە کۆنەکان ئەوەیە کە هەموو وشەکانی ئەو زمانانە بۆ تێگەیشتن ناشێن، ئەوانەی لە (٢٠٠٠ یاخۆ ١٥٠٠) ساڵ پێش ئێستە بابەتیان بە زمانێکی وەك قیبتی نووسیوە، نەیانزانیوە لە داهاتوودا کەس وشەکانی ئەوان تێ ناگات. ئەگەر ئێستە، دوای هەزار ساڵ نووسینی شانامەی فیردەوسی بخوێنینەوە، دەبینین کە وەك نامەی برادەرەکمان دێت کە لە یەکێك لە شارەکانی ئێرانەوە بۆی نووسی بێ، ئەمەش بەو هۆیە بووە کە زمانی فارسی یەکێك لەو زمانانە بووە کە لە زۆر شوێنی جیهان قسەی پێکراوە، لە بەندەرەکانی ژاپۆن تا بەندەری تەنجە لە جەبەل تاریق، تا کۆتایی رۆژئاوای ئەفریقا خەڵکانێك توانیویانە بە فارسی بدوێن.

هەرچەندە ئەو دوو زانایە ئەڵمانییە نەیانتوانی بەڵگەنامەکان بە تەواوەتی وەرگێڕن، بەڵام وەرگێڕانی ئەوان کە لە دوای وەرگێڕانی هینینك بە زمانی ئینگلیزی خرایەڕوو، بووە هۆی بەرچاو ڕوونی بۆ لێکۆڵەران لە ئاینی مانی و زانرا کە ئاینی مانی لە سەدەی سێیەمی زاینی و لەو سەردەمەی شاپووری یەکەم و کوڕەکانی و نەوەکەی دەسەڵاتدار بوونە، بۆتە ئاینێکی جیهانی، بە فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتیی مەزن دادەنرا. وێڕای ئەوەی ئەو ئاینە هیچ گووشارێکیان نەدەخستە سەر خەڵك بۆ پەسەندکردنی یاخۆ هیچ ئامرازێکیان بۆ گووشار نەبوو، بەڵام بەپێی کەتیبەی کارتێر تا ئەوکاتەی لە ئێران و وڵاتانی ژێردەستی ئێران قەڵاچۆکردنی لایەنگرانی ئەو ئاینە دەستی پێ نەکرد، ئەو ئاینە بەردەوام لە پەرەگرتن بوو، لە وڵاتی چین تا باکوری ئەفریقا، هەروەها لە یۆنان و رۆم لە ئەورووپا بڵاوبۆوە.

لەو بەڵگەنامانە مێژووی کوژرانی مانی دیاری نەکراوە.

سەبارەت بە مێژووی کوژرانی مانی جیاوازیی زۆر هەیە، هەندێك نووسیویانە مانی لە سەرەتای ساڵی (٢٧٦ ز) کوژراوە، ئەوکات سەردەمی پاشایەتیی بەهرامی یەکەمی کوڕی شاپووری یەکەم بووە، کە دوای براکەی واتە هورمزی کوڕی شاپووری یەکەم هاتەسەر تەخت.

خوالێخۆشبوو (سەید حەسەن تەقی زادە) سەرنووسەری یەکەم دەورە لە گۆڤاری کاوەی چاپی لەندەن، لەو باوەڕەدایە ئەو لە سەرەتای ساڵی (٢٧٧ ز) کوژراوە.

ئەگەر ئەو وتەیە پەسەند بکەین، مانی لە سەردەمی بەهرامی دووەم کوڕی بەهرامی یەکەم و نەوەی شاپووری یەکەم، بە شێوەیەکی دڕندانە کوژراوە. دادگەیی کردنی ئەو بە گریمانی زۆر بە سەرۆکایەتیی کارتێر کراوە، لەو دادگەییانەیە کە ئازایەتیی تاوانبار دیاردەخات.

مانی پێش ئەوەی بچێتە دادگەکە دەیزانی دەکوژرێت، چوونکە تەواوی ئەوانەی لە دادگەبوون دوژمنی بوون. وێڕای ئەوەش زۆر بە ئەدەب و بەوپەڕی ئازایەتیی دواوە، ئەمڕۆ هەرکەسێك وتەکانی بخوێنێتەوە، دەست خۆشانەی لیٚ دەکات.

لە دانیشتنی دادگەکەدا هەوڵیاندا ئەو بە درۆزن بناسێنن و دانپیانانی لێوەربگرن، بەڵام کاتێك نەیانتوانی ئەو وەك پەیامبەرێکی درۆزن بناسێنن.

ویستیان ئەو بە جادووگەر بناسێنن، چوونکە لە ئاینی زەردەشتدا جادووکردن لە گوناهە گەورەکانە و سزای توندی لەسەرە، بەڵام مانی رەتی کردەوە کە جادووگەر بێت و وتی وتەکانی من تەنیا ڕاستینە، بۆیە لە دڵی خەڵکدا کاریگەریان هەیە، موزیکەکانم بۆیە دڵنشینن و گوێگرەکانم ڕادەکێشن، چوونکە من هونەرمەندم. وێنەکانی من بۆیە کاریگەریان لەسەر ئەو کەسانە هەیە کە دەیانبینن، چوونکە من وێنەکێشم و ئەوانەی هونەری منیان نییە، کاریگەریی وێنەکانم دەبینن، من بە جادووگەر ناو دەبەن، ئەگەر ئێوە سەفەر بۆ یۆنان بکەن، ئەو پەیکەرە جوان و ناوازانە دەبینن کە پەیکەرتاشە یۆنانییەکان کە لە من هونەرمەندتر بوون، دروستیان کردون و کەس ئەوان بە جادووگەر ناناسێت.

ئایا دەکرێت ئەو وتەیەی مانی بەو واتایە هەژمار بکەین کە ئەو سەفەری بۆ یۆنانیش کردووە؟، خۆ ئەگەر سەفەریشی نەکردبێت، گومانمان نییە کە ئاینەکەی گەیشتووەتە یۆنان.

یەکێك لە مێژوونووسە کۆنەکان سەبارەت بە مانی هەندیٚ وتەی بەرچاوی هەیە بە ناوی (ئۆزێپ دوو سیزارە) ناسراوە، لە رابردوو (ئۆزێپ) بە واتای (لوقمان) و (سیزارە) بە (قەیسەر) هاتووە، بەو پێیە دەتوانین بە لوقمانی سیزارە ناوی ببەین و تێکەڵی نەکەین بە (لوقمانی حەکیم) کە تا ئێستە لە ئەفسانەکاندا ناوی هەیە.

قەیسەریە شارێکی تورکیایە، ئۆزێپ لەو شارە قەشەی کریستیانەکان بووە و لە ساڵی (٢٦٥ ز) هاتووەتە دنیا، لە ساڵی (٣٤٠ ز) کۆچی دوایی کردووە، ئەگەر بەرواری مردنی مانی بە (٢٧٧ ز) دیاری بکەین، ئەوکات ئۆزێپ منداڵێکی دوازدە ساڵان بووە. ئۆزیپ پەڕتووکێکی بە ناوی مێژووی ئاینەکان نووسیوە، لەو پەڕتووکەدا باسی مانی کردووە.

پەڕتووکی مێژووی ئاینەکانی لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا نووسیوە، بەو پێیەش ئەوکاتەی ئۆزیپ ئەو پەڕتووکەی نووسیوە تەنیا سی و حەوت ساڵ دوای مردنی مانی بووە، بە داخەوە چوونکە مەبەستی ئۆزیپی قەشەی کریستیانەکان لە قەیسەریە بە پلەی یەکەم مێژووی ئاینی کریستیان بووە، سەبارەت بە ئاینەکانی دیکەش، جگە لە جوولەکان (کە ئەویش وەك پایەیەك

بۆ ئاینی مەسیح دێت) زۆر بە تیژی تێپەڕ بووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو کەمە باسە کە ئەو نووسیویەتی بۆ ئێمە باش و بە سوودە.

لە نووسینەکەی دەردەکەوێت کە مانی لە ئازەربایجانەوە هاتووە و سەفەری هیندستانی کردووە، بەڵام نووسەری مێژووی ئاینەکان باس ناکات کە لە چ ساڵێك چووە بۆ هیندستان و ماوەی مانەوەی لە هیندستان چەند بووە و کەی گەڕاوەتەوە!.

ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەبارەی مانییەوە کردووە، پێیان وایە مانی بنەمای ئاینەکەی خۆی لە هیندستان وەرگرتووە، کاتێك لەو سەفەرە درێژەی لە هیندستان گەڕاوەتەوە، زانیارییەکانی خۆی فرەوان کردووە، وەك ئاینێکی لێ کردووە، بەڵام ئۆزێپ پێی وایە کە باوەڕی مانی باوەڕێکی ئێرانی بووە، ئەو هەرچی باسکردووە لە ئێرانییەکانی وەرگرتووە، بەپێی وتەی ئۆزێپ مانی وتوویەتی: "پێویستە بۆ بەهێزکردنی دەروونمان ڕوو لە جەستەمان وەرگێڕین، بەو ڕێگەیە بگەینە پلە بەرزەکان"، زانا ئاینییەکان ئەوکات ئەو باوەڕەیان پێ پەسەند نەدەکرا، بۆیە بەهرامی یەکەم کوڕی شاپووری یەکەمیان هاندا تا بیکوژێت، بەڵام تاکە هۆکاری دژایەتیی کارتێر و زانا ئاینییەکانی زەردەشت لەگەڵ مانیدا نابێت ئەو وتەیە بێت کە وتوویەتی: تەنیا بیر لە جەستەتان مەکەنەوە تا ڕۆحتان بگاتە پایە بەرزەکانی پێشکەوتن. ئەگەر مانی تەنیا ئەوەی وتبایە نەدەکەوتە بەر ڕق و تووڕەیی و کوشتن، ئەگەر مانی ئەوەشی وتبایە ئاینەکەی لە ماوەیەکی کەمدا نەدەبوو بە ئاینێکی جیهانی.

ئێستە کۆمەڵێك بەڵگەنامەمان بەردەستە کە سەلمێنەری پەرەگرتنی ئەو ئاینەن لەوپەڕی چین بۆ ئەوپەڕی ڕۆم، هەرچەندە لە تەواوی ئەو ناوچە بەرینەدا ئاینەکە بڵاونەبووە، بەڵام لە تەواوی ئەو شوێنانە ناوچەگەل، بە وتەی ئۆزێپ جەزیرە هەبوون کە تەواوی دانیشتووانیان لەسەر ئاینی مانی بوون.

بەپێی بەڵگەنامە مێژووییەکان بەردەوام ژمارەی پێڕەوانی ئاینی مانی لە ڕۆم لە زیاد بوون بووە، ئیمپراتۆری ڕۆم (دیۆکلسین ٢٤٥- ٣١٣ ز) لە ڕۆم جەنگێکی توندی لە دژی ئەوان ڕاگەیاندووە. ئەگەر ئەو باوەڕە پەسەند بکەین کە خەڵکانی جیهان بۆ پەروەردەی ڕەوانیان دەستیان لە پەروەردەی لاشەیان هەڵگرتووە، بۆیە ئاینی مانی یان پەسەند کردووە، ڕۆمەکان ئەو نەتەوەیە نەبوون کە ئەو کارە بکەن و ئاینی مانی وەربگرن. چوونکە ڕۆمەکان ژیانیان تەنیا بۆ گەیشتن بە ئارەزووە جەستەییەکانیان دەویست، ئەستەم بوو لەنێو خەڵکی ڕۆم ئەو ئارەزووە لایەنگری هەبێت.

خەڵکی ڕۆم لە سەدەی سێیەم و کاتی هاتنی مانی گەیشتبوونە لووتکەی مادە پەرستی و بە دەستهێنانی خۆشییە جەستەییەکان، بە وتەی مێژوونووسان هەر ئەو بابەتە بۆوە هۆی ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆم.

کەسێکی ڕۆمی لە سەدەی سێیەمدا، بەیانیان لە نێزیك کاتژمێر دە لە خەو هەڵدەستا، بۆ دەرکردنی ماندوویەتیی شەوی پێشوو لە جەستەی دەڕۆیشت بۆ گەرماو، گەرماوەکانی ئەوکات هەموو ئامرازەکانی پێشوازی لە میوانی لێ بوو، بۆیە نانی نیوەڕۆیان لەوێ دەخوارد، دوای نیوەڕۆ دەڕۆیشتن بۆ سێرك، ئەگەر ئەو ڕۆژە سێرك نەبووایە، ئەوا تا ئێوارە لەوێ دەمانەوە، تا شەو دەهات و کاتی خواردنەوە و ڕابواردن دەگەیشت، ئەوان تا نێزیکەی نیوەشەو دەمانەوە، دواتر دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان.

ئەوە بەرنامەی ژیانی ئاسایی خەڵکی ئاسایی ڕۆم بوو، چ جای دەسەڵاتداران کە لە کۆشکەکانیان دەکەوتنە میوانداری، هەموو ڕۆمەکان بە درێژایی تەمەنیان مووچەیان لە دەوڵەت وەردەگرت و هیچ کارێکیان نەدەکرد، تەنیا کۆیلەکان تەواوی کارەکانیان ڕادەپەڕاند، لە کۆمەڵگەیەکی ئاوا لەشپەروەر و مادە ویستدا چۆن بە هۆی دروشمی (جەستە جێ بهێڵە تا دەوووون ئاسوودە بێت) دەتوانێت خەڵك لە دەورەی ئاینێك کۆبکاتەوە.

بیرۆکەیەکی دیکە کە ئۆزیپ لە پەڕتووکەکەیدا باسی کردووە، لە ئاینی مانیدا هەبووە، هەمان بابەتی گریمانی (هێزی کێش کردن و پاڵ نانەوەیە)، ئەو بیرۆکەیەش کە بنەمایەکی هیندی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ یاسای گرژبوون و ئاسانی زەوی لە سووڕی دیاری کراو کە ماوەکەی سەدهەزار ساڵە، تێگەیشتنی ئەو بیرۆکەیەش بۆ هەمووان ئاسان نییە، تەنیا چینێکی تایبەت و زانا دەتوانن لێی تێ بگەن، بۆیە ئەو بابەتەش ناتوانێت ببێتە هۆی کۆبوونەوەی خەڵك لە ماوەیەکی ئاوا کەمدا لە دەورەی ئەو ئاینە.

هەزاران ساڵ پێش ئێستە ئەو بیرۆکەیە لە هیندستان سەریهەڵدا، لە سەدەی بیستەمیشدا (ئابە لیمەتر) مامۆستای زانکۆی (لیونی) ئەورووپا و زۆرێك لە ئەستێرەناسان بوونە لایەنگری ئەو بیرۆکەیە و دەڵێن دووربینە ئەستێرە ناسیەکانی بینین و بیستن کە بە (ڕادیۆ تێلێسکۆپ) ناو دەبرێن، بە گشتیی ئەوە دیاردەخەن کە تەواوی کاکێشانەکان کە هەریەکەیان خاوەنی سەدان هەزار ملیۆن هەتاوە، لە هەڵاتندان و دەردەکەوێت ئێمە لە سەردەمی لێك دوورکەوتنەوەداین.

بابەتی سووڕانەوەی زەویش بە دەورەی خۆردا کە لەلایەن مانییەوە باس کراوە، لە سەدەی سێیەمدا نەتەنیا یارمەتیدەری ئەو نەبوو بۆ پەرەگرتنی ئاینەکەی، بگرە وەك دەبینین ئەو بیرۆکەیە لە سەدەی شازدەهەمیش کاتێك لەلایەن گالیلەوە باس کرا، لەلایەن کۆی خەڵکەوە بە هەڵە زانرا و دەیانەویست لەسەر ئەو بابەتە دادگەیی بکەن و سزای بدەن، چجای ئەوەی لە سەدەی سێیەم بتوانێت پەسەند بکرێت لەلایەن خەڵکەوە.

بۆیە لێکۆڵەرانی وەك پرۆفیسۆر (هینینك، ئێشمیدێت و بۆلۆتسکی) کە وەك باسکرا کاریان لەسەر ئەو بەڵگەنامە تازانە دەکرد کە لە تورکستانی چین و میسر دۆزرابوونەوە، کەوتنەخۆ بۆ زانینی ئەو بابەتەی لە ئاینی مانیدا بۆوە هاندەر و پاڵپشت تا لەو ماوە کەمەدا لەنێو خەڵکی ئاسایی پەرە بستێنێت و ئاینی مانۆی یاخۆ بە وتەی ئەورووپاییەکان ئاینی (مانۆ خێن) ئاوا بە زوویی بڵاوببێتەوە. ئێستە باس لە بیرۆکەی زانای ئیسلامی (سەعالبی) دەخەینەبەر دیدەی خوێنەر کە باس لە کوژرانی مانی لە سەردەمی پاشایەتیی بەهرامی یەکەمی کوڕی شاپووری یەکەم دەکات.

بە باوەڕی سەعالیبی کە سوودی لە پەڕتووکی مێژوونووسی سەدەی سێیەمی کۆچی (نۆیەمی زاینی) واتە (مەقدێسی) وەرگرتووە، مانی کەسێکی زندیق بە تەواوی ئاینە ئاسمانییەکان بووە، ( ئەو دەمە ئاینی ئیسلام  هێشتا نەهاتبوو، ئیسلام لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی زاینی هات).

سەعالیبی دەڵێت پێڕەوانی مانی لە سەردەمی ئەویشدا هەبوون، بەڵام بە ناوی (باتنی) دەروونییەکان ناسرا بوون.

ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و سەختە لەلایەن مێژوونووسێکی مەزنی وەك سەعالیبی کرا بێت، بوونی ئەو هەڵە مەزنە لە پەڕتووکەکەیدا ئەو دەردەخات کە ئەو نەیزانیوە مانی چ دەڵێت، هەروەها نەیزانیوە کە دەروونییەکانیش کێن و چیان وتووە، چوونکە دەروونییەکان (باتنییەکان) تاقمێکن لە ئاینزایی ئیسماعیلیە و موسوڵمان بوون، دوای ئەوەی (حەسەن سەباح) کە ماوەیەك لە میسر بوو، گەڕایەوە بۆ ئێران و لە شاری (ئەلەموت) نیشتەجێ بوو، ئەو ناوە هاتەکایەوە، وەك دەزانرێت کە ئیسماعیلییەکان ماوەیەك بە ناوی فاتمییەکان لە میسر خەلافەتی ئیسلامیان بەڕێوەبردووە. ئەو ناوە ناوی ئەو تاقمەیە کە دوای حەسەن سەباح بۆ خۆیان دیاریان کرد، ئەمەش بەو هۆیە بوو کە ئیسماعیلییەکان دوای حەسەن سەباح بوون بە چەند فرقەیەك کە بابەتی باسی ئێمە نییە. ئەو بابەتە گومانی لێ ناکرێت کە باتنییەکان

موسوڵمان و لە تاقمی ئیسماعیلی بوون و نابێت مانۆییەکان کە موسوڵمان نەبوون و ئەوان بە هەڵە بەیەك تیرە بناسێنین.

وەك سەعالیبی باسی دەکات لە سەرەتای ساڵی (٢٧٧ ز) مانی دەستگیر دەکەن و دەیبەن بۆ ئەو کۆڕەی بەهرامی یەکەم پاشای ساسانی لێ بووە هەر لەو کۆڕە مووغیش هەبووە، مەبەستی ئەو لە مووغ هەمان کارتێرە. لەو کۆڕەی مانی تێدا دادگەیی کرا.

بەهرامی یەکەم لە مانی دەپرسێت لەلایەن چ کەسێکەوە هاتووی؟.

مانی وتی: من لەلایەن خوداوە هاتووم.

بەهرامی یەکەم پرسیاری لێکر: خودا چی بە تۆ وتووە؟.

مانی وتی: خودا منی راسپاردووە تا خەڵك بۆ رێگەی ڕاست بانگهێشت بکەم.

بەهرامی یەکەم وتی: من پاشای ئێران و زۆر وڵاتی دیکەم، بۆچی خودا منی بۆ ئەو کارە رانەسپارد و داوای لە تۆ کرد بۆ ئەو کارە؟.

مانی وتی: من ناتوانم لەکاری خودا بپرسمەوە و بزانم بۆ ئەو کارەی بەو شێوەیە کرد و بەو شێوەیەی نەکرد.

بەهرامی یەکەم پرسیاری کرد: تۆ چۆن دەتەوێت خەڵك بۆ رێگەی ڕاست بانگهێشت بکەی؟.

سەعالبیی دەڵێت: مانی وتی: من بە خەڵکی خۆم دەڵێم بیر لە جەستە نەکەنەوە و لە بیری رۆحایندا بن، بۆ ئەوەی ڕۆح بگاتە پایەی بەرز، بلا بیر لە جەستەیان نەکەنەوە.

هەر بە وتەی ئەو لەو دەمەدا کارتێر دێتە قسان و دەبێژێت: ئەی پاشا، ئەو پیاوە دەڵێت بۆ ئەوەی ڕۆح بگاتە پایە بەرزەکان، پێدڤییە واز لە جەستەیان بێنن، منیش داوا لە پاشا دەکەم بەپێی ئاینی خۆی لەگەڵ ئەودا بجووڵێتەوە.

پاشا پرسی: مەبەستت چییە.

مووغەکە دەڵێت: ئەی پاشا بۆ ئەوەی ڕۆحی ئەو بگاتە پایەی بەرز، داوادەکەم تا جەستەی لەنێو ببرێت، چوونکە ئاینی ئەو پیاوە هەر ئەوەیە.

دواتر (بە وتەی سەعالیبی) بکوژەکان بانگ کران و بە فەتوای خودی مانی، پێستیان داماڵی و پڕیان لە کایان کرد و لەسەر دەروازەی (گەندی شاپوور) هەڵیانواسی، ئەو دەروازەیە لە سەردەمی سەعالیبیش بە دەروازەی مانی ناسرا بوو.

یەکێك لەو کەسانەی سەبارەت بە ئێران لێکۆڵینەوەی کردووە، رۆمێن گێرشمەنە کە بەشێك لە مێژووی ساسانییەکانی لە دڵی خاك دەرهێناوەتەوە و ئەو نەهاتووە تا بە سوود وەرگرتن لە

چەند پەڕتووکێك، پەرتووکێکی نویٚ بنووسێتەوە و خۆی بە مێژوونووس بناسێنێت، یەکێك لەو کارانەی ئەو کردوویەتی، دوای هەڵکەندنی گردی (گیان) لە نەهاوەند و گردی سێلك لە کاشان، هەڵکەندنی شاری بێشاپوور (بەشاپوور) لە فارس بووە.

پێش ئەو کەسی دیکە ئەو شوێنەی هەڵ نەکەند بووە، ئەوانەی لە ساڵی (١٩٧٤ ز) لە بێشاپوور سەرگەرمی هەڵکەندنن، رێباز و رێکاری ئەویان گرتبووەبەر.

بیروڕای گێرشمەن کە بەشێك لە مێژووی ساسانییەکانی لە خاك دەرهێناوە، پێویستە بە گرینگ بزانرێت، چوونکە ئەو بە گریمان و لێکدانەوە کاری نەدەکرد. ئەو زانایە دەڵێت هۆکاری پەرەسەندنی خێرای ئاینی مانی لە ماوەیەکی کورتدا لە تەواوی ئێران و وڵاتانی دیکە ئەوە بوو کە بڕوای بە یەکسانی کۆمەڵایەتی و چینەکان هەبوو، وێڕای ئەوەش وەك مەزدەك لێهاتوویی تاکەکانی ڕەت نەدەکردەوە.

مانی لە دوای کوروش لەوانەیە کە یەکەم کەس بووبێت کە ئەو بیروڕایەی لەبارەی ئازادی هەبێت، ئەوەش بەو مەرجەی نەگوترێت ئازادی و یەکسانی چەند سەدەیەد پێش زاین و لە یۆنان هەبوو، چوونکە لە یۆنان نە ئازادی هەبوو، نە یەکسانی، خودی ئەفلاتوونی مامۆستای ئەرستۆ خودان پەڕتووکی (کۆمار) کە لە رۆژهەڵاتدا پتر بە پەڕتووکی (شاری نموونەیی یاخۆ بیٚ وێنە) ناسراوە، کۆیلەی هەبوو، کۆیلەکان لە یۆنان ئازاد نەبوون و یەکسان نەبوون لەگەڵ چینەکانی دیکەدا، بەڵام مانی ئاینی خۆی لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی هەموو تاکەکانی مرۆڤ دارِشتبوو، لێهاتوویی و توانای تاکەکانیشی رەت نەدەکردەوە، ئەو بیرۆکەیە لە جیهانی ئەوکات و بە تایبەتی لە ئێران زۆر لایەنگری لێکەوتەوە.

وەك دوزانرێت کە لە سەردەمی ساسانییەکان ئێران خاوەنی سیستەمی چینایەتی بوو، چینەکان لەگەڵ یەکدیی جیاواز بوون و هیچیان نەیاندەتوانی هاوسەرگیری لە نێوان یەکدیدا ئەنجام بدەن و ژن و ژنخوازی لەگەڵ یەکدیی بکەن. تەنیا ئەوە هەبوو کە هەندیٚ کات لاوێك لە چینە باڵاکان ئاشقی کچێك لە چینەکانی خوارەوە دەبوو و هاوسەرگیری لەگەڵدا دەکرد، ئەو ڕووداوانەش کەم بوون، بۆیە دەبوونە چیرۆك و نەوە بە نەوە بۆ یەکدی دەگێڕدرانەوە.

ئەو دابەشبوونەوەی چینەکانی کۆمەڵگە، لەلایەن شاپووری یەکەم و بە نیازی باش بۆ رێکخستنەوەی کۆمەڵگە دامەزرێندرا، بە راستی نیازی باشی لەدوا بوو. شاپووری یەکەم وای بیر دەکردەوە کە ئەگەر هەر چینێك کاری خۆی تەندروستانە بکات و دەست نەخاتە نێو کاری چینەکانی دیکە، هەموو خەڵك بە خۆشی دەژین و هیچ کات ئاژاوە ڕوونادات، هەموو باوك و

دایکێکیش دوای ئەوەی منداڵەکەیان لە دایك دەبێت، دەزانن پێویستە ئەو منداڵە بۆ چ کار و مەبەستێك پێویستە پەروەردەی بکەن.

دەبێت ئەو بابەتەش پشتڕاست بکەینەوە کە ئەوە باوەڕی شاپوور بۆ کۆمەڵگەی کشتووکاڵی و ئەو کات بوو، کەواتە بۆ ئەو سەردەمە بیرۆکەیەکی ئاقڵانە بووە، وەك دەبینرێت لە سەدەی هەژدەهەم بەدواوە لە کۆمەڵگەی پیشەسازی ئەورووپا هیچ کێشە و گرفتی کۆمەڵایەتی نەدەهاتەکایەوە کە بە هۆی هەژاری و نەبوونییەوە سەریهەڵدا بێت.(٥)

کریستیەن سێن لێکۆڵەری دانیمارکی لە پەڕتووکەکەیدا (مێژووی ساسانییەکان) نووسیویەتی لە ئێرانی ئەوکاتدا سواڵکەر نەبوو، هۆکاریش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە کەس بێکار نەبوو تا لەبەر بێکاری دووچاری نەبوونی و سواڵ کردن ببێت.

لە بنەماڵەی جووتیاردا هەرکە کوڕێك دەگەیشتە تەمەنی هەرزەکاری و توانای کاری دەبوو، دەیاننارد بۆ کێڵگە، لە ماڵی ئاسنگەریشدا لە هەمان تەمەن کوڕەکانیان فێری ئاسن کوتان دەکرد و کوتکێکی ئاسنیان دەدایە دەستی.

بۆیە لە کۆمەڵگەی کشتووکاڵی کۆندا کە پیشەسازی تەنیا لە چوارچێوەی دروستکردنی کەرەستە سەرەتاییەکاندا بوو، بازرگانی کردنیش بریتی بوو لە گۆڕینەوەی کاڵا بە کاڵا، لەو روانگەوە هەر چینێك کاری خۆی دەکرد و لەسەر بنەماکان بە کارێکی زانایانە دەزانرا، بەڵام وەك هەر کارێکی دیکەی باش لەوانە بوو بە دەست جێبەجێکارانەوە کارەکە خراپ کرابووایە، یاخۆ بە تێپەڕبوونی کات ژیان بۆ هەندێ لە چینەکان نەتەنیا سەخت، بگرە ئەستەم دەبوو.

بەو پێوەرەش ئەگەر کەسێك دەرکەوتبایە و وتبای تەواوی مرۆڤەکان یەکسانن و هەموو کەس بۆی هەیە ئەو کارە بکات کە خۆی ئارەزووی دەکات و کەسیش ناتوانێت رێگەی ئەو ئارەزووانەی لێ بگرێت، بە دڵنیاییەوە لایەنگری زۆر دەبوو.

---

(٥) نەمانی کۆیلەداری کارێکی مەزن بوو، یەکێك لە مەرجەکانی نەمانی کۆیلەداری ئازادی و یەکسانییە، بەڵام زەبیحوڵڵا لەم پەڕتووکەدا خۆی وەك دوژمنێکی سەرسەختی یۆنان نیشان دەدات و هەوڵی سەندنەوەی هەموو لایەنێکی ئەرێنی لە ئەوان و بەخشینیان بە چەند پاشایەکی ئێران دەکات، ئەگەرنا کۆیلەداری لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش هەیە، ئەمەش نابێتە نیشانەی نەبوونی یەکسانی و ئازادی لە ئیسلامدا. سیستەم و بیری هەر سەردەمێکیش جیایە، ئەوەی ئەوکات هەبووە لە یۆنان شێوەیەکی جوانی لە ئازادی تێدا بووە. دواتریش دەبینرێت کە پاساو بۆ ئەو کارانە دێنێتەوە کە پاشا ئێرانییەکان کردوویانە، هاوشێوەی ئەوان بووە، ئەو کارانە بە باش و ئاقڵانە و...هتد دادەنێت لە راستیدا دەبێت پێناسی وشەکانی بەپێی کاتەکان بۆ هەمووان وەك یەك بێت. "وەرگێڕی کوردی"

مانی جگە لە ئەمە شتێکی دیکەیشی دەوت کە برێتی بوو لە ئەوەی پێویستە هەموو خەڵك مافی خوێندن و نووسینیان هەبێت تا بتوانن ئاڤێستا بخوێننەوە و تێی بگەن، نابێت خوێندنی ئاڤێستا تەنیا بۆ مووغەکان بێت.

مێژوونووسی ناسراو (ماری ژان مۆڵە) کە لە نووسینەوەی ئەو پەڕتووکە زۆر سوود لە بیروڕاکانی وەرگیراوە، لەو باوەڕەدایە کە هۆکاری سەرەکیی بەربەرەکانی و دژایەتی کارتێر و مووغەکان بۆ مانی هەر ئەو بابەتەیە کە ئەو دەیوت پێویستە هەمووان خوێندەوار بن تا بتوانن ئاڤێستا بخوێننەوە.

ئاڤێستا لە سەردەمی پاشایەتیی ئەردەشێری یەکەم و لە سەردەمی شاپووری یەکەمی کوڕی، بە کۆششەکانی تەنسەر و بە هاوکاری کۆمەڵێك لە زاناکانی زەردەشتی کۆکرایەوە و بە زمانی ئەوسا واتە پەهلەوی ساسانی نووسرایەوە. پێویستە زانیاریمان لەو بارەوە هەبێت کە سەرەتا ئاڤێستا بە ڕێنووسی (دین دەبیرە) واتە ڕێنووسی ئاڤێستا نەنووسرا، بەڵکو بە ڕێنووسی ساسانی دانرا، دواتر لە هەمان سەردەم خرایە سەر ڕێنووسی (دین دەبیرە).

لە سەرەتای دەسەڵاتیی ساسانییەکان بەپێی ئەو بەڵگەنامانەی وەك کەتیبەی شاپوور و کەتیبەی کارتێر بەردەست کەوتوون، زمانی پەهلەوی ئەشکانی باوبوو، هەردوو کەتیبەی ناوبراو بەو زمانە نووسراونەتەوە. ئەشکانییەکان بە لای ساسانییەکانەوە بێزراو بوون، بۆیەش ئەوان تەواوی نووسراو و شوێنەوارەکانی زمانی پەهلەوی ئەشکانیان لەنێو برد و بوونە هۆی ئەوەی ئێمە تەنیا ناوی ئەشکانییەکانمان لەبەر بێت و هیچ زانیاریی گشتیمان لەبارەیانەوە نییە.

یەکەمین ئاڤێستا بە ڕێنووسی ساسانی نووسرا، دواتر ڕێنووسی دین دەبیری واتە ڕێنووسی تایبەت بە نووسینی ئاڤێستا هاتە کایەوە.

بە گومانی ئێمە هاتنە کایەی ئەو ڕێنووسە وەك کاردانەوەیەك بووە بۆ بانگەشەی مانی لەبارەی بوونی مافی خوێندن و نووسین بۆ هەمووان، تا بتوانن ئاڤێستا بخوێننەوە. هەڵبەت ئەوە تەنیا گریمانەیە، بەڵام گریمانەکی بابەتییە، چوونکە ئاڤێستا تایبەت بوو بە مووغەکان، ئەگەر هەمووان خوێندەوار بووانە، ئەو بابەتە لە دەست مووغەکان دەردەچوو، بۆیە ئەو زمانە هاتەکایەوە.

بانگەشەکانی مانی بوونە هۆی بەخۆدا هاتنەوەی مووغەکان، ئەوان زانیان گەرچی خەڵکی ئاسایی خوێندەواریان نییە، بەڵام مامۆستایان خوێندەوارن و دەتوانن خاوەنداری خوێندنەوە و لێکدانەوەی ئاڤێستا لە دەست ئەوان دەربێنن، بە تایبەتی کە ئەوان مامۆستای خەڵکانی

دیاربوون، لە توانایاندا بوو ئەو کارە بکەن. بۆیە زمانێکی تازەیان بە نێوی (دین دەبیرە) هێنایە کایەوە تا مامۆستایان نەتوانن ئاڤێستا بخوێننەوە.

هەندێ لە مێژوونووسان وتوویانە یاساخبوونی خوێندن بۆ هەموو خەڵك، جگە لە مووغەکان بە رادەیەك توند بووە، تەنانەت شازادەکانی ساسانیش هەر وەك شازادەکانی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بۆیان نەبووە خوێندەوار بن، بەڵام گومان لەبارەی ئەو وتەیە هەیە، بەڵگەنامە هەیە لەبارەی ئەوەی هەندێ لە دەسەڵاتدارەکانی ساسانی وەك خەسرەو ناسراو بە ئەنۆشیڕوان و شاپووری دووەم ناسراو بە زووالاکتاف خوێندەوار بوون، تەنانەت فیردەوسیش لە شانامەدا باس لە خوێندەواربوونی پاشا ساسانییەکان دەکات، فیردەوسی لە گێڕانەوەکانیدا دەستپاك بووە، لەوانەیە هەندێ لە نووسینەکانی لەگەڵ ئەقڵدا کۆك نەبن، بەڵام ئەویش وەك (محەمەد بن جەریری تەبەری) هەرچی لە خەڵکی بیستووە، نووسیویەتیەوە، بۆیە ناتوانین بیرۆکەی هەندێ لە مێژوونووسە ئەورووپاییەکان لەبارەی نەخوێندەواربوونی پاشا ساسانییەکان بە دروست بزانین.

مانی دەیوت هەمووان دەبێت ئازاد بن و هەمووان لە ڕووی مافەکانی ژیانەوە یەکسانن، هەر کەسێك هەرجۆرە کارێك حەزی پێ بکات، بۆی هەیە بیکات و نابێت خەڵکانی دیکە ڕێگریان بن لەو بوارەدا، چوونکە لەوانەیە توانای کاری دیکەیان نەبێت، هەر کەسێك لەو بوارانانەی تێیدا بەهرەمەندە، دەتوانێت باشتر سەرکەوتوو بێت. لە لایەکی دیکە هەمووان دەتوانن خوێندەوار بن تا بتوانن ئاڤێستا بخوێننەوە.

باس لە ئاڤێستا کرا، ئەو پرسیارە دێتە پێش کە ئایا مانی ئاڤێستای پەسەند دەکرد یاخۆ بە هێنانی ئاینی تازە، ئەوی رەتدەکردەوە؟ تا ئێستە مێژوونووسان نەیانتوانیوە ئەو بابەتە یەکلابکەونەوە، بەڵام نابێت لەو بابەتە کە لە مانی ناسیدا بابەتێکی بەرچاوە، نائومێد بین.

سەرزەوی ئێران لە ڕووی کەڤنارناسییەوە کەوتووەتە بەر لێکۆڵینەوە، سەدان گرد و تەپۆڵکە ماون کە گومان دەکرێت لەنێویاندا شوێنەواری کەڤناری و شارستانیی هەبن و هێشتا لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە نەکراوە، بۆیە ئەو ڕۆژەی لێکۆڵینەوەکان بە دوای دۆزینەوەی ئەو پاشماوانەدا برەو بگرێت، لەوانەیە لە داهاتوودا هەندێ بەڵگە لە خاك بێتەدەر و بتوانێت یارمەتیدەرمان بێت لە ناسینی پتری مانی، ئێستە تەنیا دەتوانین بڵێین کە مانی لە ڕووی ئازادی و یەکسانی وەك فەیلەسووفانی سەدەی هەژدەیەم و لەوانەش (ڤۆڵتێر و ڕۆسۆ) بووە.

ئەگەر لە داهاتوودا لە ڕێگەی دۆزینەوەی بەڵگەنامە لەژێر خاك، نەمانتوانی بڕوای مانی بە ئاڤێستا بسەلمێنین، ئەوا هەروەك ئێستە زانیارییەکانمان لەو بارەوە بە داخراوی دەمێننەوە، بەڵام دادگەییکردنی مانی لەلایەن کارتێر و دەستەیەك لە زانایانی زەردەشتی، دەرخەری ئەو باوەڕەیە کە مانی باوەڕی بە ئاڤێستا نەبووە، چوونکە ئەگەر باوەڕی بە ئاڤێستا هەبووایە، لەلایەن ئەوانەوە بڕیاری کوشتنی نەدەدرا، دواتریش نەدەکوژرا، بەڵام ئەو بابەتە کە مانی پێی وابووە هەمووان بۆ ئەوەی بتوانن ئاڤێستا بخوێننەوە، پێویستە مافی خوێندەوار بوونیان هەبێت، ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو هەستی بەرانبەر بە ئاڤێستا هەبووە، بۆیە ئەو راسپاردەیەی هەبووە.

لە لایەکی دیکە مانی هیچ پەڕتووکی ئاینی نەبوو تا بانگەشەی رەتکردنەوەی ئاڤێستا بکات. بۆیە دەتوانین بڵێین روانینی مانی سەبارەت بە ئاڤێستا و ئاینی زەردەشتی هاوشێوەیە لەگەڵ روانینی (لۆسەر) لەبارەی ئاینی کریستیان و ویستوویەتی ئاینی زەردەشتی ئاسانتر بکات، هەر بۆیە کەوتووەتە بەر رك و کینەی کارتێر و ئەوانەی لایەنگری ئەو کولتوورە ئاینە بوون، بەڵام هەر ئەو پیاوەی بانگەشەی بۆ ئازادی و یەکسانی دەکرد، لایەنگری هێز بوو، دەیوت دەبێت یاسای مانەوەی بەهێزەکان بەهەند هەڵبگیرێت و نابێت بارودۆخێك بێتە پێش کە کۆمەڵگەی مرۆیی لە خەڵکانی بێ هێز چێ ببێت.

کەواتە مانی لە سەدەی سێیەمی زاینیدا بیرۆکەیەکی خستووەتەڕوو کە لە بیرۆکەی نیچەی فەیلەسووفی ئەڵمانی دەچێت کە لە (١٩٠٠ ز) کۆچی دوایی کردووە.

بابەتی بەهێزبوونی تەواوی تاکەکانی مرۆڤایەتی لە دیدی مانیدا بە دوو هۆ پێویستە بەدواداچوونی بۆ بکرێت، کە برێتین لە:

یەکەم: بە وتەی مێژوونووسان مانی بەشی زۆری تەمەنی لە هیندستان بەسەر بردووە، زۆر کاریگەریی ئاینی بوودای بەسەرەوە بووە، کە هەموو جۆرە توندوتیژی و ئازاردانی مرۆڤ بە نەشیاو دەزانێت. چۆن پیاوێك بە فەلسەفەی هیندی پەروەردە بووبێت، دەتوانێت لایەنگری هێز بێت و دەڵێت پێویستە تاکەکانی مرۆڤ هەموویان بەهێز بن.

دووەم: مانی بە توندی لایەنگری یەکسانی و ئازادی بووە، بۆی لە ماوەیەکی کەمدا ئاینەکەی لە بەشێکی زۆری جیهان هەر لە چین تا دەگاتە ئەورووپا پەرەی سەند. چۆن ئەو جۆرە مرۆڤەی بە گشتیی لایەنگری یەکسانی و ئازادیە، بەو شێوەیە دەتوانێت لایەنگری نەمانی تاکە بێ هێزەکان و مانەوەی بەهێزەکان بێت لە کۆمەڵگە؟ خۆ ئەو دەزانێت هەموو

تاکەکانی کۆمەڵگە لە تاکی بەهێز و بێ هێزیش مافی ژیانیان هەیە، چوونکە ئەو دوو باوەڕە دژ بەیەکە و لەگەڵ بیروڕای بنەڕەتیدا ناگونجێت، بۆیە بابەتی مانەوەی بەهێزەکان لە باوەڕی مانی دەکرێت بە بەهێزکردنی جەستە لە رێگەی وەرزش دیاری بکەین، بەو پێیەش کە مانی بیرۆکەی وەرزشی لە یۆنان وەرگرتووە، بۆیە ئاینەکەی لە یۆنان بە زوویی پەرەی سەند. مەبەستی مانی لەو بابەتە پەروەردەی جەستە بە هۆی وەرزشەوە بووە، لەوانەیە مانی ئەو شێوە بیرکردنەوەیەی لە دوای بینینی گۆڕەپانە وەرزشییەکانی یۆنان بۆ هاتبێت و بیری کردبێتەوە وەرزش بۆ بەهێزبوونی تەواوی کۆمەڵگەکان پێویستە.

لەو بەڵگەنامانەی لە میسر و تورکستانی چین کەوتنەدەست، دەردەکەوێت مانی هیچ کات باسی لە پەڕجۆ نەکردووە، چوونکە ئەوانە بەڵگەن، پشت بەستنیش بە بەڵگە گرینگترە لەوەی مرۆڤ بێ هۆکار لەسەر وتەی ئەم و ئەو باس لەو بابەتە بکات، چوونکە بەڵگەنامە جیاوازە و هێزی زۆرتری هەیە لەو وتانەی نازانرێت خاوەنەکانیان کێن.

لەو گێڕانەوانەی لەبارەی مانی کراوە، وتراوە کە ئەو پەڕتووکێکی هەبووە کە پڕی بووە لە وێنەی جوان و رەنگاورەنگ، پەڕتووکەکەش ناوی (نگارستانی مانی) واتە (وێنەخانەی مانی) بووە.

لە دادگاییکردنی مانیدا بینیمان کاتێك بە مانی وترا تۆ جادوو دەکەی، جادووەکەت برێتییە لەو وێنە جوانانەی لە پەڕتووکەکەتدایە و سەرنجی خەڵك بۆ خۆیان ڕادەکێشن، وەڵامی دایەوە و وتی ئەوە هونەری منە و جادوو نییە، ئەگەر ئێوە بچنە یۆنان، دەبینن ئەو پەیکەرانەی ئەوان کردوویانن، زۆر جوانترن، وێڕای ئەوەش هیچ کەسێکی یۆنانی بە جادوویان هەژمار ناکات.

کەواتە وەك لە سەربردەی دادگایی کردنەکەدا مانی باسی پەرجۆ واتە پەڕتووکەکەی دەکات، دوورە لە راستی. بە تایبەتی ئەوکات کە سەدەی سێیەم بوو، بە هۆی جەنگی بەردەوامی ئەشکانییەکان و رۆم و شاپووری یەکەم و رۆمەکان، هەموان لە ئێران پەیکەر و وێنە جوانەکانی رۆژئاوایان بینی بوو، کەسێك بە ناوی مانی یاخۆ هەر ناوێکی دیکە نەیدەتوانی بە نیشاندانی ئەو وێنانە کە خۆی کێشابوونی بە پەرجۆ بیانخاتەڕوو و بانگەشەی پێغەمبەرایەتیی بۆ خۆی بکات.

مانی وێنە کێشان و موزیك و سروود وتنی بە هونەر دەزانی و هیچ کام لەو بابەتانەی بە پەرجۆی خۆی نەناساند.

دوای کوشتنی مانی، ئاینەکەی ئەو لەنێو نەچوو، بگرە ئاینەکەی لە رۆژهەڵات بە مانۆی و لە رۆژئاوا بە مانیخن ناسران، ئێمە دڵنیاین لەوەی لە دوای کوژرانی، ئەوەی بووە هۆی شێواندن و ناشیرین و بێزراوکردنی ئاینەکەی، هەمان مەزهەبەکانی ئاینەکەی بوون.

هەموو ئارمانجی مانیش لەم بیرۆکەیەی رزگارکردنی مرۆڤەکان بوو.

هەرچەندە بابەتەکانی تایبەت بە ئەستێرەناسی کە لەلایەن ئەوەوە باس کران، نەتەنیا لەلایەن خەڵکی ئاسایی، بگرە لەلایەن کەسێکی وەك شاپووریش نەدەتوانرا پەسەند بکرێت. ئەو مەبەستی چاکە بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بوو، لەو پێناوەشدا خۆی بەخت کرد، بەڵام ئەو لقانەی بە ناوەکانی مانۆی و مانیخن لە دوای مردنی هاتنەکایەوە، لانی کەم تا سەدەی دەیەمی زاینی مانەوە، پتر بازاڕێك بوون بۆ داهاتی مادی.

ئەوانەی بۆ سوودی مادی ئەو بازاڕەیان گەرم دەکرد، هەر بابەتێك کە ببوایە هۆکاری ڕاکێشانی خەڵك بۆ لایان، بەپێی کات و شوێن لە ئاینەکەیاندا دەیانگونجاند، جا لە بت پەرەستی و بێ دینی تا دەگەیشتە رێکارەکانی دوور لە ئاکاری مرۆڤ. هەر یەکە لەو لقانەی لە ئاینی مانی دروست کران، دوای ئەوەی ماوەیەك سوودیان لە سادەیی خەڵك دەبینی، دووچاری تووڕەیی دەسەڵاتدار و پاشاکانی سەردەمی خۆیان دەبوونەوە و لەنێو دەبران.

لە میسر فاتمییەکان بە رادەیەك دژی مانۆی وەستانەوە، کە هەرکەسێك باسی بکردایە، دەکوژرا، لە ئەورووپاش مانیخن جیاوازیی نەبوو لەگەڵ هەڵگەڕانەوە لە دین، بەڵام لە سەدەی دەیەم بەدواوە ئاینی مانۆی لە دۆخی دووکانداری دەرچوو، لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا هەندێ فیرقە دەرکەوتن کە ئەو ئاینەیان بە لایەنگری ڕووناکی و دژی تاریکی دەناساند، دەیانوت ڕووناکی ئاهورامەزدا و تاریکی ئەهریمەنە، هەندێ لەو فیرقانە لایەنی عرفانیان وەرگرت، تایبەتمەندییەکی دیکەش برێتی بوو لەوەی ئافرەتان مافی بوونیان لەو ئاینە نەبوو، تەنیا پیاوان هەبوون.

تایبەتمەندیەکی دیکەیش، کە لە هێماکانی مانۆیەت بوون ئەوە بوو کە پیاوانی مانۆیی هاوسەرگیریان نەدەکرد، بگرە تا کۆتایی ژیان بە ڕەبەنی دەمانەوە، دواتر ئەو فیرقانە هەندێ دامەزراوەی تایبەتیان بۆ خۆیان دیاری کرد و بوونە فراماسۆنێری، بەڵام لەو رێکخراوانەی دواییدا پێکهاتەکانی مانۆیی گۆڕا و دامەزرێنەری فراماسۆنێری بە (بیناسازی مەزن) ناونرا، دابەشکاری مانۆیەت لە فراماسۆنێری لەو پێکهاتە تازانەدا گۆڕا بە (بیناسازی گەورە) و پێکهاتەکەش بوون بە (بیناساز).

ئەو لقە تازانەی لە دوای سەدەی دەیەمەوە لە مانۆیەت جیابوونەوە، جگە لەوەی بوونە تێکەڵەیەك لە عیرفان و دوورکەوتنەوە لە خۆشییەکانی ژیان، تەنانەت ژن نەهێنان، هەروەها ئەندامەکانیان خۆیان ناچار بە سەختییە توندەکانیش دەکرد. یەکێك لە لقە بەناوبانگەکانی مانۆیی لە ئەلجەزایر لە کاتی هاتنی فەرانساییەکان بۆ ئەو وڵاتە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، بە (خان) ناسرا بوون، زۆر سەرسەختانە بەرگریان کرد و ماوەیەك رێگربوون لە پێشرەوی لەشکری فەرەنسا و فەرەنسییەکان لە ئەندامانی (خان) کە کورتکراوەی (خوداوەند) بوو، بە توندی دەترسان، ئەندامانی ئەو لقەی مانۆیەت خۆیان زۆر دەخستە ناو سەختییەکان و ئاسنی داخیان دەخستە سەر جەستەیان و خەنجەریان دەکردە ناو لەشیان و جەستەیان دەبوو بە کالانی خەنجەرەکانیان.

لە سەدەی یازدەیەمدا ئاینی مانۆیەت گەیشتە ئیسپانیا و لەو وڵاتەدا پەرەی سەند و لەلایەن موسوڵواتانی ئەو وڵاتەوە هیچ دژایەتی نەکران، تەنانەت ئەوکاتەی دەسەڵاتیی ئیسلامی لەو وڵاتەدا هەبوو، چەند کەسێك لە زانایانی دیاری ئیسپانیا بوونە ئەندامی ئەو ئاینە.

لە سەدەی هەژدەیەم بە دواوە ئاینی مانۆی لایەنی ئاینی نەما و نەیتوانی چیدیکە وەك ئاینێك رەفتار بکات، تەنانەت شۆڕشی فەرەنساش کە هات و ئازادی و یەکسانی ڕاگەیاند و تەشەنەی کرد بۆ وڵاتانی دیکەی ئەورووپاش، نەیتوانی ئەو ئاینە بسڕێتەوە و تا سەرەتای سەدەی بیستەمیش ئەو ئاینە لە ئەورووپا بوونی هەبوو، بەڵام گۆڕانکارییە گەورەکانی سەدەی بیستەم و شەپۆلی هزرە نوێیەکان لەو سەدەیەدا، مانۆی لەلایەنی کۆمەڵایەتیی داماڵی، چیتر لە ئەورووپا و لە ئاسیادا کۆمەڵگەیەك نەمایەوە کە مەبەستی مانۆیەت بێت، بەڵام هێشتا لە ئەورووپا و لە ئاسیا کەسانێك هەن کە سەر بەو ئاینەن و ترسیان نییە لەوەی بە ناوی ( مانۆ یاخۆ مانیخن) بناسرێن، چوونکە چیدیکە لەسەر ئەو ناوانە ئازار نادرێن.

هەر یەکە لە پرۆفیسۆر (هینینك، ئێشمیدیت و پۆلۆتسکی) لە سەدەی بیستەمدا توانیان هەندێ بەڵگە لەژێر خاکەوە بدۆزنەوە کە ببنە بنەما بۆ ناسینی مانۆیەت، هەرچەندە (ئێشمیدێت و پۆلۆتسکی) دانیان بەوە ناوە کە نەیانتوانیوە هەندێ بەش لەو بەڵگەنامانەی لە (فەیۆم) لە میسر دۆزیویانەتەوە، وەربگێڕن، بۆیە هەندێ بەش بە شاراوەیی ماوەتەوە.

وێڕای ئەوەش ئەوان خزمەتێکی مەزنیان کرد، چوونکە تا ئەوکات کەس نەیدەزانی مانی بە تەواوەتی کێ بووە و چی کردووە بۆ مرۆڤایەتی، تەنیا لە بابەتی خێرایی بڵاوبوونەوەی

ئاینەکەی لە سەدەی سێیەمدا دووچاری سەرسووڕمان هاتن، چوونکە نەدەزانرا بە لەبەرچاوگرتنی کەمی پێوەندیی نەتەوەکانی ئەوکات و هێواشی و ساکاری ئامرازەکانی گواستنەوە لەوکاتدا، چۆن بەو خێراییە ئەو ئاینە لە جیهان پەرەی سەند، بەڵام ئێستە و بەپێی ئەو بەڵگەنامانە زانرا کە مانی ئەفسانە نییە و هەبووە و خاوەنی بیرۆکەیەکی بە نرخی کۆمەڵایەتی بووە کە ئێستە نرخەکەی دەزانرێت.

لە سەردەمی ساسانییەکان، پاشاکان و زۆرینەی خەڵك بیروباوەڕی زەردەشتیان هەبوو کە ئاینێکی یەکتاپەرستی بوو، لەسەر بنەمای پەرستنی ئاهورامەزدا واتە خوداوەندی مەزن دامەزرا بوو.

لە ئاینی زەردەشتی بە پێچەوانەی وتەی هەندێ مێژوونووسان، دوو خوداوەندیی بوونی نییە، زەردەشتییەکان باوەڕیان بە دوو خوداوەند نییە، بگرە خوداوەندی تاکانە دەپەرستن و باوەڕی زەردەشتییەك بەرانبەر بە ئەهریمەن وەك باوەڕی موسوڵمانێکە بە شەیتان، هەرچەندە موسوڵمان باوەڕی بە بوونی شەیتان هەیە، بەڵام ئەو بە خودا نازانێت.

لە ئاینی زەردەشتدا کەسانی دیکەی وەك (میترا و ئاناهیتا) هەن، ئەو مێژوونووسانەی تەنیا ڕووکاری بابەتەکانیان بینووە، ئەوانیشیان بە خودای زەردەشتییەکان ناساندووە، لە کاتێکدا کە نە میترا (میهر) و نە ئاناهیتا خودا نەبوون.

میترا و ئاناهیتا هەردووکیان لە ئافرێندراوەکانی ئاهورامەزدان و هیچیان لایەنی بە خودایی بوونیان نییە.

ئاناهیتا بەر لە هاتنی ئاینی زەردەشت، لای ئێرانییەکان بە ناوی (عەشتار) دەناسرا، لەوانەیە ئەوکات خودا بووبێت، بەڵام دوای هاتنی ئاینی زەردەشت عەشتار یاخۆ ئاناهیتا چیدیکە وەك خودا (خوداوەندی مێینە) نەما و بۆوە یەکێك لە ئافراندراوەکانی ئاهورامەزدا.

لە کۆتایی دەسەڵاتیی شاپووری یەکەم پاشای ساسانیدا لە ئێران گرووپێکی دیکەی ئاینی هاتە کایەوە بە ناوی (زووروان یاخۆ زەروان) دەناسران.

پێڕەوانی ئەو ئاینە لەو بڕوایەدان کە لە سەرەتای ژیان، جگە لە (زووروان یاخۆ زەروان)، ئەوانی دیکە واتە (ئاهورامەزدا، ئەهریمەن، میترا و ئاناهیتا) و تەواوی ئەوەی لە زەوی و ئاسماندا هەیە لەلایەن ئەو ئافراندراوە، زەروان هەردەم هەبووە و دەبێت و شوێن و کاتی نییە و ناتوانرێت ببینرێت و هاوبەشی نییە. ئەو بڕوایەی ئەوان هاوشێوەی بڕوای گرووپێکی دیکەی ئاینی کە هاوکاتی ئەوان لە میسر هەبوون، پێیانوابوو سەرەتا تەنیا (دیل) هەبووە، هەموو شتێك لە لای ئەو ئافراندراوە. سەدەیەك دوای ئەویش هەر لە ئەسکەندەریەدا تاقمێکی دیکە

دەرکەوتن کە دەیانوت تەنیا (ئەستەقس) هەبووە و هەموو شتێك لەلایەن ئەوەوە دروست بووە.

سەدەی سێیەمی زاینی هاوکات بوو لەگەڵ پاشایەتیی شاپووری یەکەم و باوکی و جێنشینەکانی، ئەوکات ئێرانییەکان بە گشتیی بێ ئاگا بوون لەو وانانەی لە ئەسکەندەرییەی میسر دەوترایەوە، ئێستە ئێمە زانیاریمان هەیە کە ئەوکات لە ئەسکەندەرییەی میسردا فەلسەفەی (مەشایی) دوای کۆمەڵێك گۆڕانکاریی کە بە گۆڕانەکانی (ئەفلاتوونییە نوێیەکان) دەناسران، زۆر پەرەیان سەند.

ئەرستۆی قوتابی ئەفلاتوون وەك نەریتی خۆی لە کاتی وانە وتنەوەدا، هاتوچۆی دەکرد، بۆیە فەلسەفەی ئەویان بە فەلسەفەی مەشایی ناودەبرد. ئەو فەلسەفەیە بە چەند وشەیەك دەڵێت: "مادە بەردەوام لە پەرەسەندندایە، بەو پێیە بەردەوام دەپاڵێورێت تا ئەوکاتەی دەگاتە پلەی ئەقڵ و هۆش هاتنەبەر".

ئەو فەلسەفەیەی ئەرستۆ کاریگەریی کردە سەر هەموو قوتابخانە فەلسەفییەکان و بەشێك لە گرووپە ئاینییەکان کە لە دوای ئەرستۆ لە جیهان هاتنەکایەوە، بە رادەیەك کە تا ئێستەش ناتوانرێت فەلسەفەیەك بدۆزینەوە کاریگەریی فەلسەفەی ئەرستۆی بە سەرەوە نەبێت.

جەلالەدینی رۆمی لە سەدەی حەوتەم پەڕتووکی ناسراوی مەسنەوی دانا و ئەوکاتەی دەڵێت:

"از جمادی مردم و نامی شدم ـ از نما مردم به حیوان سرزدم" تا ئەو کاتەی دەڵێت: انچه اندرز و هم ناید شوم) هەر ئەوە دەڵێت کە ئەرستۆ باسی لێوە کردووە.

واتە تەنێکی بێ گیان بە هۆی بوونی خۆیەوە (بە وتەی ئەرستۆ) پێش دەکەوێت و قۆناخەکانی پەرەسەندن یەك بەدووی یەك دەبڕێت و دەبێتە ڕووەك، دواتر شێوەی بۆ مرۆڤ دەگۆڕێت، دواتر پایەی بەرزتر دەبێتەوە و بە وتەی نووسەری مەسنەوی دەگۆڕێت بۆ فریشتە، بەڵام لەو قۆناخەدا ناوەستێت و لە قۆناخی فریشتەکانیش بەرەو بەرزتر دەڕوات تا دەگاتە پلەیەك (کە بە وتەی نووسەری مەسنەوی) لە خەیاڵیشدا جێی نابێتەوە و دەبێتە ئەو شتە، بەڵام فەلسەفەی ئەرستۆ لە ئەسکەندەرییە تا رادەیەك دووچاری گۆڕانکاریی هات، پێی وابوو مرۆڤ لە سەرەتادا لە فریشتەکان باڵاتر بوو، بە هۆی ئەوەی بۆ ژیانی زەوی تەرخان کرا، پلەی دابەزی، لە داهاتووشدا دەگەڕێتەوە بۆ پلەی خۆی. ئەو بیرۆکەیە لە هەمان بنەمای بیری ئەرستۆ وەرگیراوە، تەنیا پایەی بەرزی سەرەتای بۆ زیاد کراوە، بە ناوی ئەفلاتوونییە نوێیەکان ناسرا، دیسان جەلالەدینی رۆمی دەڵێت: "هر کسی کو دوور ماند از اصل خویش — باز جوید

روزگار وصل خویش" جەلالەدین لەو شیعرەدا باس لە ناڵەی شمشاڵ دەکات، مەبەستی ئەوەیە کە هاتوهاواری شمشاڵ بۆ گەڕانەوەیەتیی بۆ قامیشەڵان و مەبەستی سەرەکیشی هەمان ئەو واتایەیە کە هەر کەسێك لە بنەچەکەی خۆی دوور کەوێتەوە جارێکی دیکە دەیدۆزێتەوە.

مەبەستمان لە باسی ئەو بیرۆکەیە ئەوە نییە خوێنەر ماندوو بکەین، بە پێچەوانەوە دەمانەوێت بیر و وتەی زەروانییەکان کە لە سەردەمی ساسانییەکان بوون، بە تەواوەتیی شی بکەینەوە.

ئەوان دەیانوت: ئاهورامەزدا و ئەهریمەن و هەموو ئەو شتانەی لە ئاسمان و زەوی هەنە، لەلایەن زەروان ئافراندراون ، ئەو مرۆڤی لە تەنی بێ گیان دروست کردووە و بەرەبەرە پێشکەوتنی پێ دەدات و هێندە بەرزی دەکاتەوە تا دەگاتە پلەی فریشتەکان. کەواتە ئەوەی جەلال الدین وتوویەتی زیاتر لە هەزار ساڵ پێشتر کەسانیتر کە لە ئێران ژیاون، باسیان لێوە کردووە. باوەڕی زەروانییەکان لەگەڵ زەردەشتییەکاندا لە دوو خاڵ بەریەك دەکەوتن و بڕێتی بوون لە:

یەکەم: ئەوان پێیانوابوو ئاهورامەزدا و ئەهریمەن لەلایەن زەروان ئافراندراون، زەردەشتییەکان دەیانوت هەموو شتێك تێکەڵە لەگەڵ ئاهورامەزدا.

دووەم: زەروانییەکان دژی پارێزگاریکردن لە ئاگر بە شێوەی بەردەوام لە ئاگرخانەکاندا بوون و پێیان وابوو پێویستە ئاگرخانەکان داخرێن، لە کاتێکدا پارێزگاری لە ئاگر لەنێو ئاگرخانەکاندا لە نەریت و ڕێوڕەسمە چەسپاوەکانی زەردەشتییەکانن.

ئەمڕۆ هەندێ لە مێژوونووسان هەڵکردنی ئاگر لە ئاگرخانەکان و پاراستنی لەوێندەر بۆ سەردەمی هاتنی ئاینی زەردەشت دەگەڕیننەوە، بەڵام مێژوونووسە دیارەکانی وەك (گێرشمەنی فەرەنسی، ئۆمیستید و ریچارد فرای ئەمەریکی) پێیان وایە هەڵکردنی ئاگر لەنێو ئێرانییەکاندا، پێشینەیەکی کۆنتری هەیە لە هاتنی ئاینی زەردەشتی.

بە گشتیی دژایەتی زۆرانییەکان لە بەرانبەر پێکردنی ئاگر و پاراستنی لە ئاگرخانەکاندا بۆ موبیدە زەردەشتییەکان بە گشتیی نەخوازراو بوو. لەو کەتیبەیەی لە شاپووری یەکەم بەجێ ماوە، ناوی هەندێ کەس هاتووە کە بۆ هەر یەکەیان بۆ بەخشینی گیانیان، ئاگرخانەیەکیان چێ کردووە، ئەوان لە خزم و خوێش لەو کەسانە بوونە کە خزمەتی زۆریان بە شاپوور کردبوو. هەریەکە لەو ئاگرخانانەی لەلایەن شاپوورەوە چێ کرابوون، شوێنی داهاتیان هەبوو، داهاتەکانیان بۆ بەڕێوەبردنی ئاگرخانەکان بوو، هەر ئاگرخانەیەك لەلایەن کۆمەڵێك لە مووغەکان و خزمەتکارێك بەڕێوەدەبران، مووغەکان پێویست بوو بەردەوام لەژێر زمانیانەوە نزا بکەن، ئەوان هاوکات دەبووایە بە پەڕۆییەکی پاکژ بەر زاریان بگرن تا لەوکاتەدا

هەناسەیان بەر ئاگر نەکەوێت، هەروەها دەبووایە دەستەیەك شولکە داری تەڕیان بە دەستەوە بێت و بە ئارامە رایبوەشێنن.

شێوازی چێکردنی ئاگرخانەکان لە سەردەمی ساسانییەکان چوون یەك بوون و هەموویان لەسەر یەك نەخشەسازی چێ دەکران، تەنیا بچووکی و گەورەیی و پانتاییان جیاواز بوو، لە تەواوی ئاگرخانەکان و لە سەرووی ئاگردانەکەدا گومەز چێ دەکران، کە هێماش بۆ ناسینی هەموو ئاگرخانەیەك لە سەردەمی ساسانییەکاندا، برێتی بوو لەو گومەزانە، رێبوارەکان لە دوورەوە بە بینینی ئەو گومەزانە دەیانزانی ئاگرخانەیە. لە ئاگرخانەکاندا داری بەری نەدەسووتێنرا، تەنیا دارە جەنگەڵییە بێ بەرەکان نەبێت. هەروەسا داری خۆماڵی نەدەسوتێنرا، تەنانەت ئەگەر وەك چنار بێ بەریش بووانە. لە ئاگرخانەکانی فارسیش داری بادامی جەنگەڵی دەسوتێنرا.

ئاگرخانەکان لە سەرەتای ژیانی کۆمەڵگە تەنیا بۆ ئەوە بوو کە ئاگر نەکوژێتەوە، لە کاتی پێویستدا دانیشتووانی گوند یاخۆ شارەکان دەچوون بۆ پێکردنی ئاگر لە ماڵەکانیان، لە ئاگرخانەکانەوە ئاگریان دەهێنا. ئێستە لەبەرئەوەی بە ئاسانی و بە دەنکە گرەکێك ئاگر دەکرێتەوە، پێدڤییە ئەوە بزانین ئاگرکردنەوە لە سەردەمانەدا چەند سەخت بووە، لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکانی ئێراندا ئاگرخانە یەکێك لە دامەزراوەکان بووە بۆ سوودی گشتیی و وەك ئاو بووە بۆ هەمووان، تەنانەت بەپێی گێڕانەوەی خەڵکی بە تەمەن، تا نێزیکەی حەفتا ساڵ بەر لە نها (مەبەست لە کاتی نووسینی ئەم پەڕتووکەیە، کە پتر لە سەدەیەك دەکات) خەڵکی گوندەکان هەموویان لە یەك دەرگەوە ئاگریان دەبرد و نەیاندەتوانی خۆیان ئاگر بکەنەوە، لە کاتێکدا کە تەواوی دانیشتووانی گوندەکانی ئێران موسڵمانن و لە ئیسلامدا ئاگرخانە بوونی نییە و کەس ئاگر ناپەرستێت، بەڵام بوونی ئاگر یەکێك بوو لە پێداویستی و پێویستییەکانی ئەوی ڕۆژان.

ئاخۆ زەروانییەکان کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا دژی بوونی ئاگرخانەکان بوون، گرینگی ئەو دامەزراوەیان لە ژیانی خەڵکی ئێراندا نەدەزانی؟.

ئایا نەیاندەزانی بابەتی نزاکردنی مووغەکان لەژێر لێویانەوە و لە بەرانبەر ئاگردا، ئەگەرچی لە نەریتەکانی ئاینی زەردەشت بووە، بەڵام فەلسەفەیەکە سوودی یەکجار زۆری هەبووە، بۆیە ئەو بابەتەیان لەنێو ئاگرخانەکاندا بە بەشێك لە ئەرکیان دەزانی کە موبیدەکان رۆژانە چەند جارێك سەر لە ئاتەشکەدە بدەن و بەردەوام ئاگەداری نەکوژانەوەی ئاگر بن، تا نەکوژێتەوە؟، تەنانەت سووتاندنی

داره جەنگەڵییەکان لە جیاتی داره خۆماڵییەکان، ئەگەر تەناتەت وەك داری چناریش بێ بەر بووبن، هۆکاری خۆی هەبوو، برێتی بووه لە پتر مانەوەی ئاگر لە ئاگرخانەکاندا. ئەوانەی ئاگریان زۆر کردووەتەوه دەزانن داری جەنگەڵی لە کاتی سووتان خۆگرتره، دارێکی وەك بادامی جەنگەڵی دوو بەرانبەر و نیوی کاتی دەوێت بۆ سووتان، لە بەرانبەر داری هاوتای خۆی لەنێو دارستانە دەست کردەکاندا، مەبەست لە سووتاندنی داره جەنگەڵییەکان ئەوه بوو کە ئاگر زیاتر لە ئاگرداندا بمێنێتەوه، لە هەمان کاتیشدا دار کەمتر بسووتێنرێت، بەڵام لەوه دەچوو زەروانییەکان ئاگەداری هیچ یەکێك لەو سوودانە نەبووبن و بوونی ئاگرخانەکانیان ناکۆك بە ئاینی خۆیان زانیبێت و هەوڵی وێرانکردنی ئاگرخانەکانیان دابێت.

بە وتەی یەکێك لە پیاوە سیاسییەکانی فەرەنسا لە سەدەی نۆزدەیەم بە ناوی (تالێران)، هێرشکردنە سەر ئاگرخانەکان لەلایەن زەروانییەکان و وێرانکردنیان کارێك بوو خراپ و خراپتر لە تاوان و بە هەڵە و گوناهێکی مەزن دەزانرێت، چوونکە ئەوان بەو باوەڕەیان سەرەڕای ئەوەی دژی باوەڕی هەموو ئێرانییەکان دەبوون، یەکێك لە پێداویستییە گرینگەکانی ئەوانیان لەنێو دەبرد کە وەك ئاو بۆ ئەوان پێویست بوو.

زەروانییەکان بەپێی نەخشەیەکی پێشینە و لە یەك شەودا لە سێ ناوچەی جیای ئێران واتە لە خۆراسان و کرمان و پارس هێرشیان بۆ سەر ئاگرخانەکان کرد و وێرانیان کردن، ئەو کارە و ئەو کەسانەش نەتەنیا لەلایەن مووغەکانی ئاینی زەردەشتی، بگرە لای تەواوی خەڵکی ئاسایی بە تاوانبار ناسران، بۆیە لە تەواوی ئێران دەسەڵاتداران بە هاریکاری مووغەکان و دانیشتووانی ناوچەکانیان دەستیان کرد بە لەنێوبردنی ئەوان، هەر یەکێك لەوانە کە دەستگیر دەکران، دەست بەجێ دەکوژران، هەندێکیش لەوی کەسان هەڵاتن و توانیان خۆیان لە مردن قووتار بکەن، ئەمەش بووه هۆی ئەوەی چیدیکە ئاینی زەروانی وەك ئاینێکی خودان پێڕەوانی زۆر نەمێنێتەوه.

# میری پالمۆر

لە رۆژئاوای سنووری پاشایەتیی من و لە دەڤەری شام، ولاَتێکی بچووك بە ناوی تەدموور یاخۆ پالمیر هەبوو، دەکەوتە باکوری رۆژهەلاَتی دیمەشق، دانیشتووانی ئەویَ سەرگەرمی کشتووکالَ و ئاژەلَداری بوون، دەسەلاَتدارانی ئەو دەڤەرە لە سەردەمانی کۆنەوە، باجیان بە پاشاکانی ئێران دەدا.

کاتێك باوکم ئەردەشێری مەزداپەرست هاتە سەر تەختی پاشایەتیی و بەشێك لەو ولاَتانەی داگیرکرد کە من لەو کەتیبەیەدا باسم کردوون، پەیامێکی بۆ پاشای پالمیر نارد و وتی مەزدا ولاَتی زۆری بە من بەخشیوە و پێویستم بە ولاَتەکەی تۆ نییە، تەنیا بە مەرجێك کە تۆ نەریتێکی بچووك بەجیَ بگەیەنی و باجمان بۆ بنێری.

پاشای (تەدموور) وەلاَمی دایەوە و وتی ئەی پاشای مەزن، ئێمە لەم ولاَتە بچووکەی خۆمان لە رێگەی کشتووکالَ و ئاژەلَدارییەوە بەهەزار حالَ ڤێجا دەکارین خۆراك بۆ مندالَەکانمان دابین بکەین و توانای باج دانمان بە ئێوە نییە، داوا دەکەین لە وەرگرتنی باج لێمان چاوپۆشی بکەن، باوکیشم چاوپۆشی لە ئەوان کرد.

پاشاکانی ئەو ولاَتە سەدەیەك بەر لە ئێستە لە بنەمالَەیەك بوون بە ناوی (سەعبە) کە ناوی یەکێك لە ئیمپراتورەکانی رۆم بوو، ئەوان لە سەردەمی باوکم و پێش ئەویش هەولَی پاوانخوازی و دەرچوون لە سنووری خۆیان نەدەدا، تا ئەوکاتەی (ئۆدی نات) بوو بە پاشای تەدموور یاخۆ پالمیر.

"ئۆدی نات" یاخۆ "ئازینە" پیاوێکی بەهێز و چوار شانە بوو، هێندە بەهێز بوو کە توانای ملانێی لەگەلَ گادا هەبوو، هەردوو قۆچی گای دەگرت، بە شێوەیەك دەیسوورِاندەوە کە ئاژەلَەکە چۆکەکانی دەکەوتنە سەرزەوی. توانا جەستەییەکانی ئەو بووە هاندەری و دەستی بە سەرکێشی کرد بۆ دەستدرێژیکردنە سەر ولاَتانی دیکە و لەشکرێکی ئامادە کرد و هێرشی کردە سەر ولاَتی (سوور) لە کەناری دەریای سپی کە لەژێر دەسەلاَتیی مندا بوو.

ئەی ئەو کەسەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنییەوە، ئەوە بزانە کە ئەوکاتەی ئۆدی نات دەستی بە لەشکرکێشیی کرد، من نەخۆش بووم و زراوم تینی بۆ هێنا بووم، هێندە نەخۆش بووم،

تەنانەت توانای سواربوونی ئەسپم نەبوو، نەمدەتوانی بچم بۆ جەنگ. کاتێك هەواڵی داگیرکردنی وڵاتی سووریان بۆ هێنام، فەرمانم کرد تا یەکێك لە سەردارەکانم بە ناوی (تاویانووس) لەشکر ببات و بچێت سوور بگرێتەوە و ئۆدی نات بگرێت و بیهێنێت بۆ لای من، بەڵام خەڵکی تەدموور ئازار نەدات، کە شوان و جووتیارن و خوداوەندکانیشیان لەنێو نەبات، تەنانەت ئەگەر لەبەر چاوی بیزراویش بن.

من زانیاریم هەبوو کە خەڵکی ئەو وڵاتە یەکتاپەرست نین، کۆمەڵێك خوداوەندیان هەیە، خوداوەندی گەورەی ئەوان مێیە و بە (بەعل) ناسراوە، پەرستگەیەکی مەزنیان لە شاری تەدموور بۆ چێ کردووە.[1] لەو پەرستگەیەدا کچانی گەنج دیاریان وەردەگرت و نیوەی دیارییەکانیان دەدایە سەرۆکی پەرستگە و نیوەکەی دیکەیان دەکرد بە تێچووی هاوسەرگیریان.

سەردارەکەی من تاویانووس بە سوپایەکەوە بەرەو تەدموور کەوتەڕێ و ئاگەدار نەبوو کە ئۆدی نات دوای ئەوەی سووری داگیرکردووە، پیشەوەرەکانی ناچار کردوون تا گالیسکەی جەنگی بۆ چێ بکەن و سەردارەکەی من زانیاریی نەبوو کە ئۆدی نات بۆتە خودان گالیسکەی جەنگی.

ئۆدی نات ئاگەدار بوو کە بە فەرمانی من لەشکرێك بۆ جەنگی ئەو دەچێت، بۆیە بە گالیسکە جەنگییەکانییەوە هاتە جەنگی تاویانووس و جەنگ لە پێدەشتێك ڕوویدا، کە دەکەوتە شوێنی بەیەك گەیشتنی ڕووباری شاپوور و فورات.[2]

تاویانووسی سەرداری من پیاوێکی ئازا بوو، بەڵام گالیسکە جەنگییەکان بۆ ئەو چاوەڕوانکراو نەبوون، گالیسکەکانی ئۆدی نات سوپای تاویانووسیان لێك پرژاند، وێڕای ئەوەش خۆڕاگری نواند و لەگەڵ سەربازەکانی بەرگری کرد تا تەواوی سەربازەکانی کوژران، دواتر تاویانووسیش کوژرا و سەری لە جەستەی کرایەوە، سەری ئەویان لەسەر دەرگەی پەرستگەی بەعل هەڵواسی.

ئەو سەرکەوتنەی ئۆدی نات پاشای تەدموور وایکرد تا ئەو مکووڕتر بێت لەسەر پاوانخوازی، پاشان هێرشی کردە سەر وڵاتی تەرابلۆس بۆ ئەوەی ئەویش وەك سوور داگیر بکات، کە لە کەناری

---

(١) تا ئێستە پاشماوەی وێرانەکانی ئەو پەرستگەیە لە پالمیر لە باکوری رۆژهەلاتی دیمەشق ماون. "زەبیحوڵڵا"

(٢) زێی فورات کە لە شاخەکانی ئاسیای بچووك واتە تورکیای ئێستەوە سەرچاوە دەگرێت، دوو لقی سەرەکیی هەیە کە یەکیان ناوی شاپوور و ئەوی دیکەیان فوراتە، هەردوو لق لە ئاسیای بچووکەوە دێن و لە سوریای ئێستە تێکەڵ دەبنەوە و زێی فورات پێك دێنن. "زەبیحوڵڵا"

دەریای سپی بوو، بەڵام خەڵکی ئەو شارە وەك خەڵکی شاری سوور پیشەوەر نەبوون، زۆرتر لە ڕێگەی بازرگانی و باخداری بە تایبەتی باخەکانی لالەنگی و پرتەقاڵ بەڕێوە دەچوون، باشترین پرتەقاڵەکانی کەناری دەریای سپی لەو شوێنە بەرهەم دەهاتن.[٣]

نەخۆشییەکەم ڕێگر بوو لەوەی خۆم بەرەو شام بچم و ئۆدی نات تەنبێ بکەم، بۆیە لەشکرێکی دیکەم بە فەرماندەیی (هۆر) نارد و ڕامسپارد تا گالیسکەی جەنگیش لەگەڵ خۆیدا ببات، چوونکە ئۆدی ناتیش گالیسکەی هەبوو، لەشکری من کەوتەڕێ، هۆر خۆی گەیاندە شام و لە ڕووباری فورات پەڕییەوە و زانیاریی نەبوو کە جالینۆسی ئیمپراتۆری ڕۆم بۆتە پاڵپشتی پاشای تەدموور.

جالینۆس بەو هۆکارانەی لەو کەتیبەیەدا هاتوون بەرانبەر بە من ڕقی هەڵگرتبوو، دوای ئەوەی بینی ئۆدی نات دژم وەستاوەتەوە و لەشکرەکەمی شکاندووە، بڕیاریدا هاوکاری بکات و پارەی بۆ نارد، تەنانەت دوو لژیۆن لە سەربازانی خۆی خستە ژێر فەرماندەیی ئۆدی نات تا بکارن سوود لە ئەزموونی سەربازە ڕۆمەکان وەربگرن.

ئەو بە هاوکاری ئیمپراتۆری ڕۆم توانی تەواوی وڵاتانی ژێردەستی من لە شام داگیربکات. دانیشتووانی ئەو شوێنانەی ناچار کرد تا خوداوەندی تەدموور واتە بەعل بپەرستن و پەرستگەی بۆ چێ بکەن. ئەی ئەو کەسەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنییەوە، خۆت ئەوە لێکبدەوە کە خەڵکی ئەو ناوچەیە چیان بەسەر هاتووە تا ئاینی بەعل پەسەند بکەن.

کاتێك هۆری سەرداری من لەگەڵ سوپاکەی لە زێی فورات پەڕییەوە، تەواوی وڵاتانی شام لەژێردەستی ئۆدی ناتدا بوون، ئەو بۆ جەنگ کردن لەگەڵ مندا لە پیاوانی هەموو ئەو وڵاتانەی داگیری کرد بوون، سەربازی گرت و لەم کارەشدا زێڕەکانی ئیمپراتۆری ڕۆم یارمەتیدەری بوون تا سەرباز لە وڵاتە داگیرکراوەکان بە کرێ بگرێت.

هەرچەندە لەو وڵاتانە تەواوی خەڵك لە ئۆدی نات تووڕە بوون، بەڵام لە هەموو شوێنێك کەسانێك هەن کە لە بەرانبەر وەرگرتنی زێڕ بەرفەرمان دەبن، لە شامیش ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان لە بەرانبەر وەرگرتنی زێڕ هاتنە نێو سوپای ئۆدی نات و بەهێزتریان کرد.

هۆریش وەك تاودیانووس سەردارێکی ئازا بوو، بەڵام کەوتە بەرانبەر لەشکرێك کە بە لانی کەم دوو هێندەی لەشکرەکەی ئەو سەربازی هەبوو، جگە لەوەش سەربازانی ئۆدی نات شارەزاییان لە لژیۆنەکانی ڕۆم وەرگرتبوو، وەك ئەوان دەجەنگان. کاتێك گالیسکەکانی هۆر

---

(٣) ئێستە بەو شوێنە دەوترێت تەرابلۆس و جیاوازە لەو ترابلۆسەی لە لیبیایە. "زەبیحوڵڵا"

کەوتنە هێرشکردن، ئەوان بە تیر و کەوان و زووبین کەوتنە کوشتنی ئەسپی گالیسکەکان و کۆمەڵێك بەربەستیان بۆ ڕێگری لە ڕۆیشتنی گالیسکەکان دانا، ئۆدی نات سوودی لە بەهێزتربوونی لەشکرەکەی وەرگرت و هۆری گەمارۆدا.

هۆری بە ئەفسەرەکانی خۆی ڕاگەیاند بوو تا بە سەربازەکانیان بڵێین کە بە هەر شێوەیەك بێت، گەمارۆکە بشکێنن، تەنانەت ئەگەر هەموویان بکوژرێن، تا دوایین کەسیان لاشەکانیان لە گۆڕەپانی جەنگ بکەویێت، باشترە لەوەی بە سەرشۆڕی هەواڵی شکستیان ببەنەوە بۆ پاشاکەیان.

سەربازەکانی هۆر گیان فیدابییان کرد و تێکۆشان تا گەمارۆکە بشکێنن، بەڵام دوژمن زۆر بەهێز بوو، سەربازیشی زۆری هەبوو، ئەوان سەربازەکانی هۆریان دەکوشت و ڕێگەی دەربازبوونیان پێ نەدەدان.

هۆر بە سەختی بریندار بوو، نەیتوانی بەردەوام بێت لە جەنگ و سەربازانی ئۆدی نات بە پاڵپشتی سەربازەکانی دوو لژیۆنە ڕۆمەکە بەردەوام بوون لە هێرش تا ئەو کاتەی دوا سەربازی هۆریان کوشت یاخۆ دیلیان کرد.

هۆر کە بریندار ببوو بە دیلی گیرا و بردیان بۆ تەدموور، بێ ئەوەی چارەسەر بکرێت، لەو شارە بە هۆی سەختی برینەکانییەوە مرد، دووەم لەشکری من بەو شێوەیە لە شام لەنێو چوو، ئۆدی نات بە دیلەکانی وت ئەگەر دەتوانن سزای خۆیان بدەن و خۆیان ئازاد بکەن، تەنانەت ئەفسەرەکانیش هێندە زێڕەیان نەبوو کە ئۆدی نات بۆی دیاری کرد بوون، بۆیە داوایان کرد تا دەرفەتیان پێ بدرێت ڕێگەیان بدات زێڕیان لە ئێرانەوە بۆ بێت.

ئۆدی نات ڕێزی ئەوانی نەگرت و ناچاریکردن لەگەڵ سەربازەکان وەك کۆیلە بکەونە کارکردن، بورجێکی حەوت نهۆمی بۆ بکەن بە ناوی بورجی سەرکەوتن، ئەو بورجە پلیکانی مارپێچی بە دەورەدا هەبوو، ئۆدی نات بیستبووی لە ڕابردوودا لە بابل بورجی بەو شێوەیە هەبووە و بۆ یادگاری سەرکەوتنەکانی خۆی، بورجێکی لەو شێوەیەی چێ کرد.

ئەو کاتەی هەواڵی شکستی لەشکری هۆرم پێگەیشت، بەپێی ڕاسپاردەی پزیشکەکانم، بۆ هەڵمژینی هەوای پاکتر لە هەکماتانە بووم تا باشتر ببم. پزیشکەکانم هەوای هەکماتانەیان بە باشترین هەوای وڵاتانی من دەناسی و دەیانوت ئاوەکەشی لە باشترینی ئاوەکانە، چوونکە ئەو ڕووبارەی دەهاتە هەکماتانە، ماوەی (١٥٠ کم) بە ناوچەی شاخاویدا دەڕۆیشت و بە درێژایی ڕێگەکە بەر بەردە گەورەکان دەکەوت و هەوای تێکەڵ دەبوو و ئاوەکەی سووك و خۆش دەبوو.

دەرمانی سەرەکیی من وەك جاران سرکە و هەنگوین بوو، پزیشکەکان دەیانوت هیچ دەرمانێك وەك خۆشاوی سرکە و هەنگوین کاریگەر نییە، ئەگەر لە شوێنێك هەنگوین دەست نەکەوێت، دەبێت خۆشاوی سرکە و شیلەی ترێ بخورێت تا نەخۆشی زراو نەمێنێت.

دوای ئەوەی ماوەیەك لە هەکماتانە مامەوە، هەستم کرد تەندروستیم بەرەو باشتر چووە. هەواڵی شکستی هۆر لە دوای هەواڵی شکستی تاویانووس، منی بە توندی تووڕە کرد، هاوکات لەلایەن پاشای ئاترۆپاتێن هەواڵێکم پێگەیشت کە نیشانی دەدا پاشای ئەرمەنستان هاوکار و پاڵپشتی ئۆدی نات بووە. پاشای ئەرمەنستان لە دوای ئەوەی ڤالەریەن بە دەستی من شکستی خوارد، هیچ کارێکی دژی من نەکرد، بەڵام لەوکاتەی ئۆدی نات شامی داگیرکردووە و دەزانێت من نەخۆشم، دۆستایەتی منی فەرامۆش کردووە و لەگەڵ دوژمنەکانم هاوکارە. هەرچەندە باری تەندروستیم باش نەبوو و نەخۆش بووم، بەڵام بەو هۆکارانەی باسم کردن بە پێویستم زانی کە خۆم بچمە جەنگی ئۆدی نات.

جالینۆسی ئیمپراتۆری رۆم بە رادەیەك لە هەواڵی سەرکەوتنی ئۆدی نات خۆشحاڵ ببوو، کە نازناوی (کۆر کتۆر ئۆریان تیس)ی بەسەردا بڕی، واتە ئەو کەسەی رۆژهەڵاتی تەنبێ کرد، ناوی برد و خەڵکانی ئاسایی رۆم کە نەیاندەتوانی ئەو ناوە بڵێنەوە، ئەویان بە (قارەمانی رۆژهەڵات) ناوبرد.[٤]

لە بەهاری ساڵی (٢٦٧ ز) دوای ئەوەی نەخۆشییەکەم تا رادەیەك باشتر بوو، بڕیارمدا بەرەو وڵاتی پالمیر بڕۆم و ئۆدی نات لەنێو ببەم، ئەگەر ئاهورامەزدا بڕیاری وابێت کە من بە دەستی ئەو بشکێم، دەبووایە بکوژرێم و دەمزانی کە من خۆم بە دەستەوە نەدەدا و دیل نەدەبووم، بۆیە یاخۆ تەواوی سەربازانی دوژمنم دەکوشت یان دەکوژرام.

---

(٤) سەبارەت بە بەسەرهاتی ئۆدی نات یاخۆ ئەزینەی عارەبان میری پالمیر، گێڕانەوەی دیکەیش هەیە کە لە زۆرینەی پەرتووکە مێژووییەکاندا هاتووە و پرۆفیسۆر (ئارتۆر کریستیەن سێن)یش لە پەرتووکەکەی بە ناوی (ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا) دەڵێت:ی"شاپوور دوای هەندێ جەنگ و پەیکار لە سوریا و کاپادۆکی، لە کاتی گەڕانەوەی بەرەو ئێران، لە رێگەی گەڕانەوە کەوتەبەر هێرشی ئەزینە میری عارەبان کە حوکمڕانی شاری پالمۆر لە بیابانی شام بوو... سەبارەت بە سەرکەوتنی ئەزینە بێگومان مێژوونووسان زۆر زیادەڕۆییان کردووە، بەڵام ئەو بە دڵنیاییەوە بۆ ماوەی چەندین ساڵ حوکمڕانی سوریا و بەشێکی زۆری ویلایەتەکانی رۆم لە ئاسیای کردووە. هەرچەندە بە روالەت سەر بە رۆم بوو، بەڵام لە راستیدا تا رادەی زۆرتر سەربەخۆ بوو، لە لایەن جالینۆسی قەیسەری رۆم نازناوی ئیمپراتۆری پێ بەخشرا، ئێرانییەکان بێ هیچ سوودێك تا ساڵی ٢٦٥ زاینی بەردەوامیان بە جەنگی خۆیان و پالمۆردا. "زەبیحوڵڵا"

لە ئەکباتان دەرچووم و ڕێگەی تیسفونم گرتەبەر، دەبووایە بە کرماشاندا بڕۆم، لەوێندەر وەستام و چاوم کەوت بەو کەتیبەیەی داریوش کە لەسەر قەدی شاخەکە هەڵکەنراوە، ئەو کاتەی من چاوم لێ دەکرد، نێزیکەی (٧٦٧) ساڵی بەسەردا تێپەڕ دەبوو. بینینی ئەو کەتیبەیە زۆر کاریگەریی لەسەر من کرد و پەیمانم بە خۆمدا نەگەڕێمەوە تا ئەو کاتەی ئۆدی نات لەنێو دەبەم.

پێش ئەوەی لە کرماشان دەربچم، ئۆواتیسی پەیکەرتاشی یۆنانی کە هاتبۆوە ئەوێ، هاتە لام و پێی ڕاگەیاندم پەیکەری من کە سواری ئەسپم تەواو بووە، زۆری پێخووش بوو بچم بۆ شارێکی دیکە و پەیکەری خۆم ببینم، پێموت تۆ پەیکەرتاشی و هونەرمەندی، منیش ڕێزم بۆ هونەرمەندان هەیە، بەڵام دڵنیام کرد کە ناچارم بچم بۆ جەنگ، لەبەر ئەوەی چوونم بۆ جەنگ گرینگترە لە هاتنم بۆ بینینی پەیکەری خۆم لە شارێکی دیکە، تەنانەت ئەگەر پەیکەرەکە زۆر جوانیش بێت. ڕێگەم بەرەو وڵاتێکی دیکە گرتووەتەبەر، دوای ئەوەی خەڵاتم کردن ڕێگەم بە پەیکەرتاشەکەدا تا بڕوات.

دوای ئەوەی گەیشتمە تیسفون، فەرمانم کرد تا لەشکرێکی بەهێز بە هەموو جۆر چەکێکی کاریگەرەوە ئامادە بکرێت بۆ جەنگ.

ئۆدی نات لە دوو جەنگدا سەرکردەکانی منی شکست دابوو، بۆیە دەمزانی خۆی و ئەفسەر و سەربازەکانی خودان ورەی بەهێزن و سەرکەوتن بە سەر ئەوان بە هەبوونی ئەو ورە بەهێزەیان، پێویستی بە لەشکری بەهێز هەیە. بۆیە بە لەشکرێکی هەشتا هەزار کەسی کە تەواوی پێداویستی و کەرەستەی جەنگیان لابوو، کەوتمەڕێ، حەوت سەد گالیسکەی جەنگی پلە یەکیشم لەگەڵ خۆمدا برد.

پزیشکەکانم ڕایان سپاردبووم تا پتر پشوو بدەم و ئاگەداری خۆم بم تا ئەو کاتەی بە تەواوەتی چاك دەبمەوە، بەڵام من ڕاسپاردەکەیانم لە گوێ نەگرت، چوونکە ئەو کەسەی دەڕواتە جەنگ و بە نیازی کوشتن و کوژرانە، گوێ بە تەندروستی خۆی نادات.

لە تیسفون دەرچووم و لە گۆڕەپانی جەنگی جارانی (می زی شە) پەڕیمەوە بۆ ئەوبەری فورات، بێ ئەوەی تاکە سەربازێك یاخۆ ئەسپێکمان ئاو بیبات. دوای پەڕینەوە لە ئاوەکە، دەستەیەك لە لەشکرەکەی خۆمم کردە پێشەنگ، ئەوان لە پێشەوە دەڕۆیشتن و توانای بەرگری لە خۆیان هەبوو.

دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك ڕێگەمان بڕی، کاتی نیوەڕۆ بۆ پشوودان وەستاین، دەستەیەك لە پیاوانی دانیشتووی ناوچەکە هاتنە لام و وەك ژنان دەگریان. پرسیارم کرد کە بۆچی دەگرین؟..

وتیان: ئەی پاشا، رزگارمان بکە لە دەست ستەمی ئۆدی نات، ئەو زۆر ستەمکارە و ئێمە چیدیکە بەرگەی ستەمی ئەو ناگرین.

وتم: ئاسوودە بن، چوونکە لەمەودوا تا ئەوکاتەی من هەبم، ئۆدی نات توانای ئازاردانی ئێوەی نابێت. دوای ئەوکاتە ئیتر هەر شوێنێك کە بۆی دەچووین، دانیشتووانەکەی دەهاتن و داوایان دەکرد تا لە دەست ئۆدی نات ڕزگاریان بکەم، منیش دڵنیاییم دەدانێ و دەموت: دەڕۆم تا ئۆدی نات بکوژم یاخۆ لە گۆڕەپانی جەنگدا بکوژرێم.

پێشەنگی من هەر بەردەوام بوون لە رۆیشتن، لە پێشمەوە هیچ شوێنەواری لەشکری ئۆدی نات نەبوو.

من پتر خۆپارێزیم دەکرد، چوونکە بێ دەنگی و نەجووڵانی ئۆدی نات نیشانە بوون بۆ ئەوەی من بۆ کوشتارگە ببات، لەو شوێنەی بۆ خۆی بۆ جەنگی هەڵبژاردووە، جەنگم لەگەڵدا بکات و بتوانێت بە هەموو شێوەیەك سوودی تەواو لە سرووشت بە سوودی خۆی وەربگرێت.

کاتێك بێدەنگی و نەجولانی ئۆدی نات لە رادە دەرچوو، لەشکرەکەمم وەستاند، هەندێ سیخوڕم بۆ وەرگرتنی هەواڵ و زانیاریی نارد تا بزانن بۆچی هیچ شوێنەواری ئۆدی نات دیار نییە.

بە دوورم دەزانی ئەو لەنێو شاری تەدموور لەگەڵم بجەنگێت، سەردارێك دووجار لە جەنگدا لەشکری دوژمن شکست بدات، پەنا ناباتە پشت دیوارەکانی شار. سیخوڕەکانم هەواڵیان پێدام کە شارەکە دیواری باش و بەهێزی نەبوون تا ئۆدی نات لە پشتیانەوە بجەنگێت.

رۆژێك لە یەکێك لە سیخوڕەکانمەوە هەواڵێکم بۆ هات کە برێتی بوو لە هەواڵی کوژرانی ئۆدی نات کە منی بە توندی راچڵەکاند، منیش بڕوام نەکرد، پێموابوو ئەوەش فێڵە و دەیانەوێت من پشت بکەمەوە و لەپڕ هێرشم بکەنەسەر، بەڵام هەواڵەکە لەلایەن هەندێ سیخوڕیتریش بۆم پشتڕاست کرایەوە، سەیر لەوەدا بوو کە ئەو بە دەست ژنەکەی خۆی کە ناوی (زەنوویی) بوو، کوژرا بوو.

دواتر لەلایەن سیخوڕەکانمەوە هەواڵی دیکەم بۆ هات کە باسی ئەوەی دەکرد کە زەنوویی دوای کوشتنی هاوسەرەکەی، بۆ خۆی دەسەڵاتی گرتووەتەدەست و وتوویەتی ئێستە من خێزانی خوداوەندکانم، دواتر خۆی بە خودا ناساندووە و وتوویەتی پێویستە لەمەودوا خەڵك ئەو بپەرستن.

کاتێك دڵنیابووم کە ئۆدی نات بە دەست ژنەکەی خۆی کوژراوە، زانیم هێشتا لەژێر پاڵپشتی ئاهورامەزدام، فەرمانم کرد تا بیست و یەك ئاگرخانەی دیکە وەك هێما بۆ بیست و

یەك بەشی ئاڤێستا لە وڵاتانی ژێردەستی مندا چێ بکەن، لەو پارەیەی لە بەردەستمدا بوو بۆ هەریەکە لە ئاگرخانەکان بەشێکم دیاری کرد تا وەگەڕی بخەن و دوای مردنم لە وەبەرهێنانی ئەو پارانە، ئاگری پیرۆز لە ئاگرخانەکان بەردەوام بکەن.

بەرەو شاری تەدموور کەوتمەڕێ، پێش ئەوەی بگەمە شارەکە، زەنووبی (زەنووبیا) نامەیەکی بۆ ناردم، تیایدا دەڵێت ئەوەی لەگەڵ تۆدا دەجەنگا، ئێستە مردووە، من نامەوێت بجەنگم، ئەگەر وەك میوان دێنە نێو شاری تەدموور، ئەوا پێشوازیتان لێ دەکەم.

لە وەڵامدا بۆم نووسی، ئەو زیانانەی بەر من و شوێنکەوتووەکانم کەوتووە، هەروەها ئەو زیانانە ببژێرێت، کە بەر لەشکرەکەم کەوتووە لە هەردوو جەنگی پێشوو کە تیایاندا لەشکرەکەم شکستی خواردبوو، بۆ ئەوەی ئەو نەڕوات و پارە و سامانی ئۆدی نات نەبات، بە پەلە بەرەو شارەکە ڕۆیشتم و بە بێ بەرگری ڕۆیشتمە نێوشار.

زەنووبی منی بانگهێشت کرد بۆ کۆشکی خۆی، من ئەو بانگهێشت کردنەم پەسەند نەکرد، چوونکە ئاکاری خەڵکی تەدموورم دەزانی، دەمزانی پیاوێکی وەك من یەزدان پەرست، نابێت بچێتە کۆشکی ژنێك کە هاوسەری نییە.

لە دەوروبەری شار زۆر پاسەوانم دانا تا زەنووبی نەتوانێت سامانی مێردەکەی لە شارەکە بباتە دەرەوە، فەرمانم کرد بورجی سەرکەوتنی ئۆدی نات وێران بکەن، لەنێو شار بە فەرمانی من جاڕیاندا کە هەمووان ئازادن لەوەی ئاینی جارانیان واتە بەعل بپەرستن و من کارم بە ئاینی ئەوانەوە نییە، تەنیا تا ئەو ڕۆژەی لەو شارەم نابێت کچانی گەنج بۆ خزمەتکردن بچنە پەرستگە.

تەواوی زێڕ و خشڵە گرانبەهاکان و مافوور و کەلوپەلەکانی کۆشکی ئۆدی ناتم داگیرکرد، هەروەها تەواوی ئەو وڵاتانەی ئەو داگیری کردبوون، ئازادکران، فەرمانم کرد، کە لەو وڵاتانە جاڕ بدەن هەمووان ئازادن لە جێبەجێکردن و ئەنجامدانی سرووت و ڕێوڕەسمە ئاینییەکانی خۆیان، چوونکە لەمەودوا کەس ناکارێت زۆریان لێ بکات بۆ پەرەستنی بەعل، تەواوی ئەفسەر و سەربازە دیلە ئێرانییەکانم ڕزگار کرد و بە هۆی ئەوەی لە سەردەمی دیل بوونیاندا زۆر ئازار و ئەشکەنجەیان بینی بوو، لە زێڕ و سامانی ئۆدی نات و زەنووبیای هاوسەریدا، بۆ هەر دیلێك مووچەیەکم دابین کرد کە بەرانبەر مووچەی پێنجساڵیان بوو.

زەنووبی چەندین جار هات بۆ لام و منی بانگهێشت کرد بۆ کۆشکی خۆی، من ڕەتم کردەوە و پێموت: شادبە کە بەرانبەر پاشایەکی یەزدان پەرستی، ئەگەر پاشایەکی دیکە بووایە، ئەوا بە دڵنیاییەوە بە هۆی ئەوەی هاوسەرەکەت جەنگی بەرپاکرد بوو، ئەوا خۆت و

کوڕە گەنجەکەت و دەستوپێوەندەکەتی دیل دەکرد و دەیبردنە وڵاتانی خۆی، بەڵام من نە تۆ و نە کوڕەکەت بە دیل ناگرم، تا ئەوکاتەی کارەکانم لە وڵاتەکەت تەواو دەکەم لێرە دەبم، دواتر دەگەڕێمەوە، بۆیە لێ دەگەڕێم تا چۆنت دەتەوێت، ئاوا وڵاتەکەت بەڕێوە ببەی، بەڵام هۆشداریتان دەکەم ئەگەر رۆژێك خۆت یاخۆ کوڕەکەت بتانەوێت وەك ئۆدی نات بکەن و وڵاتانی من بخەنە ژێردەستی خۆتان، ئەوا هەردووکتان دەکوژم و وڵاتەکەتان دەکەم بە بەشێك لە وڵاتانی ژێردەستەی خۆم.

زەنووبی وتی تا ئەو رۆژەی من زیندوو بمێنم، لە نێوان من و تۆدا جەنگ نابێت و هێرش ناکرێتە سەر وڵاتەکانی تۆ.

ئەو رۆژەی خەریکی ئەوە بووم تەدموور جێ بهێڵم و بگەڕێمەوە، زەنووبی بۆ خواحافیزی هاتەلام و لێم پرسی ئایا راستە کە تۆ هاوسەری خۆتت کوشتووە، ئەویش وتی کوشتنی ئەو بە دەستی ئەنقەست نەبوو، من لە کاتی بەرگریکردن لەخۆم، ئەوم کوشت.

بە سەرهاتی هەردوو جەنگی من و ئۆدی نات و کوژرانی ئەو، بەو شێوەیە بوو، تەواوی ئەو زیانانەی لێم کەوتبوون لەو گەشتە و لە تەدموور دەستم کەوتنەوە، گەڕانەوەم بەرەو شاری تیسفون تا ساڵی (٢٦٨ ز) خایاند.

مانگێك دوای گەڕانەوەم، دووبارە نەخۆشییەکەم سەری هەڵدایەوە، پزیشکەکان ئەویان بۆ هۆکارەکانی جاران گەڕاندەوە و بە هەمان دەرمانەکانی جاران چارەسەریان دەکردم، لە کاتی چارەسەرکردنم، هەواڵی کوژرانی جالینووسی ئیمپراتۆری رۆم و پشتیوانی ئۆدی ناتم پێ گەیشت.

❊ ❊ ❊

زانیاریان پێ گەیاندم پیاوێك بە ناوی (کلۆد) کە ئەویش لەگات واتە فەرماندەی لژیۆن بوو لە جیاتی جالینۆس بۆتە ئیمپراتۆر، رۆم لە دۆخێکدا بوو، جگە لە لەگاتەکان کەسی دیکە نەدەبوو بە ئیمپراتۆر، هەر کە یەکێك لە لەگاتەکان دەبوو بە ئیمپراتۆر، یەکێکی دیکە ئەوی دەکوشت و لە جیاتی دەبوو بە ئیمپراتۆر، تا ئەو کاتەی بە دەستی یەکێکی دیکە دەکوژرا و جێگەی دەگیرایەوە.

کاتێك کلۆد بە ناوی (کلۆدی دووەم) بوو بە ئیمپراتۆر، بە منداڵەکانم وت کە ئەو لە دوو ساڵ پتر لەسەر تەختی دەسەڵات نامێنێتەوە و بە زوویی دەکوژرێت و جێگەی دەگیرێتەوە.

ئەو دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتەدەست، جۆرە جەنگێکی دیکەی داهێنا، لە ئاکامدا منی ئاگەدار کردەوە کە ئاگەداری وڵاتەکانی خۆم بم.

جەنگە تازەکەی کلۆدی دووەم بریّتی بوو لەوەی کاتێك هێرش بۆ وڵاتێك دەکرا، دەبووایە تەواوی شارەکان وێران بکرێن و تەواوی پیاوەکان و ژنەکان و منداڵەکان بکوژرێن، دارەکان ببڕدرێن و بەروبوومی زەوییە کشتووکاڵییەکان لەنێوببردرێن و هەموو کانیاوەکان کوێر بکرێنەوە، کاتێکیش لەشکر دەگەڕێتەوە کە لەو وڵاتە هیچ شتێك نەمابێت.

بە تەواوەتی نەفرەتم لەو جۆرە جەنگانە دەکردەوە، ئەگەر کلۆدی دووەم کە لایەنگری ئەو جۆرە جەنگانە بوو، ئاهورامەزدای پەرەستبایە، ئەو جەنگانەی نەدەویست، ئاهورامەزدا فەرمانی کردووە مرۆڤ تەنانەت بەرانبەر بە ئاژەڵەکانیش نەرم و نیان بێت، چجای لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆی.

من لە تەواوی جەنگەکاندا، هەر کە دوژمن خۆی بە دەستەوە دەدا، دەستم لە جەنگ هەڵدەگرت، دوای ئەوە هەوڵی کوشتن و وێرانکردنم نەدەدا، تەنیا باجم لە دوژمن وەردەگرت.

ئەی ئەو کەسەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنیتەوە، ئەوە بزانە کە من لەو ڕۆژەوە کە هاتوومەتە سەر تەختی پاشایەتیی تا ئەمڕۆ، بە مەبەستی تالاّن و کوشتن و بڕین، هێرشم بۆ هیچ وڵاتێك نەکردووە.

هەر جارێك کە هێرشم بۆ وڵاتێك کردبێت، وەڵامدەرەوە بووە، بۆ هێرشی پاشایەك کە هێرشی کردووەتە سەر وڵاتەکەم یاخۆ یەکێك لەو وڵاتانەی لەژێر دەستم بوونە، دوای ئەوەی خۆشیان بە دەستەوە داوە، جەنگم ڕاگرتووە، بەڵام کلۆدی دووەم دەیوت دەبێت وڵاتی دوژمن بە تەواوەتی وێران بکرێت و هیچ ماڵ و باخ و کێڵگە و کارێز و گیانلەبەرێکی تێدا نەمێنێت، هەر بەو مەرامەش هێرشی بۆ سەرزەوی گوتەکان کرد.

لە دەڤەری گوتەکان بەراز بە ڕێژەی زۆر هەبوو، کاتێك کلۆدی دووەم هێرشی بۆ ئەو وڵاتە کرد، بەرازەکانی ڕاونا، ئەوانیش بۆ وڵاتانی دەوروبەریان پەراگەندە بوون، گوتەکان لە جەنگەڵەکان دەژیان و میچی خانووەکانیان لە شێوەی قووچەکی و لە گالی بوو، کەرەستەی خانووەکانیان بە تەواوەتی لە دار بوون، ئەوەش بۆ زۆری دار دەگەڕایەوە لە سنوورەکەیاندا.

کلۆدی دووەم کاتێك گەیشتە گوندەکانی گوتەکان، خانووەکانی ئاگر دەدان، تەنیا سووتانی خانوویەك دەبووە هۆی سووتان و گڕگرتنی تەواوی خانووەکان و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە گوندەکە، جگە لە خۆڵەمێش هیچی دیکە بەرچاو نەدەکەوت. لە هەندێ لادێدا ئاگر هێندە بە

بلەز تەشەنەی دەسەند، ئەو ژنانەی لەنێو جەنگەڵ بوون، نەدەگەیشتنەوە ماڵەکانیان تا منداڵە شیرخۆرەکانیان کە لە ماڵەکاندا بوون رزگار بکەن و منداڵەکان لەوێدا دەسووتان.

کلۆدی دووەم هەر کەسێك لە ژن و پیاو، پیر و گەنجی بەردەست کەوتبایە، دەیکوشت و دەستی لە کەس نەدەپاراست، سەربازەکانیشی خۆیان لە دەستدرێژیکردنە سەر نامووسی خەڵك نەدەپاراست.

کلۆدی دووەم هێندەی خەڵکی گرت کوشت و لادێکانی سووتاندن تا ئەوان چیدیکە توانای وەستانیان نەما و پاشماوەی گوتییەکان بڕیاریاندا تۆڵە لە کلۆد بکەونەوە، ئەوان بەدووی سوپای ئەو کەوتن، شەوێك لەشکرەکەی لە جەنگەڵ پشوویاندا بوو، لە هەموو لایەکەوە جەنگەڵیان ئاگردا.

وتم کە نەریتی لژیۆنەکان وابوو، تەنانەت ئەگەر بۆ شەوێکیش لە شوێنێك مابووانایەوە، دیواریان بۆ پارێزگاریکردن لە خۆیان بە چوار دەوریاندا چێ دەکرد تا نەکەونە بەر پەلاماری لەناکاوی دوژمن. ئەوان ئەگەر لە جەنگەڵبووانە، دارەکانیان دەبڕی و بە قەدی دارەکان دیواریان چێ دەکرد، ئەگەر لە جەنگەڵ نەبووانە بە بەرد و گڵ دیواریان دەکرد، ئەگەر بەرد دەست نەکەوتبایە، بە قوڕ و لم دیواریان هەڵدەچنی، ئەوان بۆ ئەو کارەیان تەنانەت خشتیان دەبڕی. دیواری دەورەیان بە هۆی ئەوەی لە جەنگەڵ بوون، ئەو شەوە لە قەدی دارەکان بوو، لەگەڵ زۆربوونی ئاگردا، دیوارەکەشیان سووتا و ئاگر گەیشتە ئۆردووگەکەیان.

سەربازانی لژیۆنەکان بە بینینی ئاگر کە گەمارۆی دابوون، دووچاری شڵەژان هاتن و ویستیان خۆیان رزگار بکەن، ئەوەش بووە هۆی لەنێوچوونی رێککاری لژیۆنەکانیان. پیاوانی گوتیش تەوری قورسیان بە دەستەوە بوو، لە پشت ناوچەی ئاگرەکە چاوەڕوانی سەربازانی هەڵاتوویان دەکرد، هەر سەربازێك کە لە ئاگرەکە دەردەچوو، بە یەك لێدانی تەوری ئەوان دەکوژرا.

کلۆدی دووەم بە پاڵپشتی پاسەوانەکانی گاردی تایبەتی خۆی توانی ڕزگاری ببێت، بەڵام زۆرینەی سەربازەکانی یان بە ئاگر سووتان یاخۆ لەلایەن گوتەکان کوژران، هەندێکیشیان پەراگەندە بوون، دواتر لەلایەن گوتەکان دەکوژران.

هەرچەندە کلۆد لە وڵاتی گوتەکان شکستی خوارد و زۆرینەی سەربازەکانی لەنێوچوون، بەڵام لەلایەن کاسەلێسەکانی دەوروبەری خۆی، لە دوای گەڕانەوەی ناوی (گوتیکۆس)ی پێ بەخشرا واتە (ئەو کەسەی بەسەر گوتەکاندا سەرکەوت).

لە کۆتایی وەرزی هاویندا، کلۆد لەگەڵ چەند لژیۆنێك لە سەربازەکانی بەرەو وڵاتی (گوڵ) فەرەنسا کەوتەڕێ، لەو وڵاتەش هەر کەسێکی بەردەست دەکەوت، دەیکوشت و هەموو گوندەکانی دەسووتاند یاخۆ وێران دەکرد.

دانیشتووانی گوڵ بە گشتیی جووتیار بوون، ڕەزی ترێیان زۆر پێ باشتر بوو لە درەختەیلی دیکە، بۆیە بەشی گەورەی وڵاتەکەیان بە ڕەزی ترێ داپۆشراو بوو.

لەو وەرزەی کە کلۆدی دووەم گەیشتە فەرەنسا (گوڵ)، لە رەزەکاندا ترێ گەیشتبوو، کوارگیش (قارچك) بە رێژەی زۆر لە تەواوی وەرزەکان، جگە لە وەرزی زستان دەست دەکەوت.

سەربازە رۆمەکان کە ڕەزەکانیان بە بێ خاوەن بینی (چوونکە خودان ڕەزەکان لە ترسی کوژران، هەموویان هەڵات بوون)، ترێی زۆریان خوارد، هێندەیان خوارد کە هەندێکیان نەخۆش کەوتن، هەندێکی دیکەیشیان بە هۆی خواردنی کوارگ مردن، چوونکە هەندێ لە کوارگەکان ژەهراوی بوون.

یەکێك لە سەرکردەکانی فەرەنسا بە ناوی (کارل) بۆ بەربەرەکانی کلۆد خۆی ئامادە کرد، پیاوانی وڵاتی لە خۆی کۆکردەوە و لە ناوچەیەك بە ناوی (شامپانی) هێرشی کردە سەر کلۆدی دووەم.

ئەو و پیاوەکانی بە نەعرەتە لێدانەوە هێرشیان کردە سەر لەشکری کلۆد و دەرکەوت کە لەشکری کلۆد سستن، هەندێ لە سەربازەکان بە هۆی زۆر خواردنی ترێ نەخۆش و هەندێکیشیان سست ببوون. ئەو رۆژە دەرکەوت کە زۆر خواردنی ترێ، تەنانەت سەربازە دلێرەکانیش سست دەکات، ئیمپراتۆری رۆم کە پێشتر فەرماندەی لژیۆن بووە، نەدەبوو رێگەی لەش پەروەری و تەنبەڵی و زۆر خۆری لە ڕەزەکانی گوڵ بە سەربازەکانی خۆی بدات.

جارێکی دیکە لەشکری کلۆدی دووەم شکستی خوارد و سەربازەکانی پەرش و بڵاو بوون و کلۆدی دووەم بە پاڵپشتی گاردی پاسەوانی خۆی توانی هەڵ بێت و رزگاری ببێت.

کاتێك کە پیاوانی گوڵ هێرشیان کردە سەر لەشکری رۆم، ئەوان کەلوپەلی تالاّنکراوی زۆریان هەبوو، پیاوانی (گوڵ) توانیان دەست بەسەر تەواوی ئەو کەلوپەل و کەرەستانەدا بگرن، کە بە تالاّن لە وڵاتی ئەواندا بەدەستی هێنا بوو، بەپێی نەریتی خۆشیان و بۆ دەربڕینی سوپاسگوزاری بەرانبەر بە (کارل) کە توانی رۆمەکان لە فەرەنسا ڕامالێت، ئەویان لەسەر قەڵغان بەرز کردەوە، ئەمەش وەك نەریتێك بوو بۆ سوپاسگوزاری لە بەرانبەر ئەو، تاکە

جیاوازیی پاشای گوڵ لەگەڵ خەڵکەکەی تەنیا ئەوە بوو کە لە جەژنەکانیاندا بەسەر قەڵغانەکاندا بەرزدەکرایەوە.

کلۆدی دووەم بە شکست خواردوویی گەڕایەوە بۆ رۆم و نێزیکەکانی دیسان بۆ خۆبردنە پێش ناویان نا (گولدیس) واتە (ئەو کەسەی گوڵی گرت).

هەواڵی هەردوو شکستی کلۆدی دووەم چ لە وڵاتی گوتەکان و چ لە رۆم بە هۆی کریستیانەکانەوە پێم گەیشت، وەك باسمکرد ئەوان رۆمیان خۆش نەدەویست، بۆیە هەموو ڕووداوە نەخوازراوەکانی رۆمیان بە من دەگەیاند، دەتوانم بڵێم من بە هۆی ئەوانەوە ئاگەداری تەواوی ڕووداوەکان بووم.

رۆژێك هەواڵیان پێدام کە کلۆدی دووەم وتوویەتی پێویستە بەرەو رۆژهەڵات بێت و تەواوی ئەو وڵاتانەی لەژێردەستی (خەسرەو)دان داگیر بکات و ئەویش بە دیلی ببات بۆ رۆم.

رۆمەکان منیان بە خەسرەو ناودەبرد، کاتێك ئەو هەواڵم پێگەیشت بیرم کردەوە کە کلۆد دەبێت ئەقڵی هەبێت و وەك مرۆڤێکی ئاقڵ ئەوە بزانێت دوای دوو شکستی بەدوا یەکدا کە لە هەریەکەیاندا لەشکرێکی خۆی لە دەست دابێت، نابێت بۆ جاری سێیەم بیر لە هێرش بکاتەوە، پێویستە ماوەیەکی پێ بچێت تا هەتوان بخاتە سەر برینی شکستەکانی و بە تەواوەتی سارێژیان بکاتەوە.

وێڕای ئەوەی دەمزانی کلۆدی دووەم گێلە، بەڵام نەدەبوو وریایی خۆم لەدەست بدەم، چوونکە ئەو هەر بەو هۆکارە کە نەزان بوو، دەیتوانی هێرش بکات بۆ وڵاتەکانی ژێردەستم، پێویستە پتر لە مرۆڤی نەزان بترسین، نەك لە مرۆڤی زانا، چوونکە دەتوانرێت پلانی مرۆڤی زانا پێشبینی بکرێت کە چ دەکات، بەڵام پێشبینی و زانینی پلانی کەسی نەزان زۆر ئەستەمە.

هەواڵ و زانیاری دیکەم لەلایەن کریستیانەکانەوە پێگەیشت کە کلۆد دەستی کردووە بە کۆکردنەوەی لەشکر، چەند لژیۆنێکی لە وڵاتەکانی دەوروبەر کشاندووەتەوە، واتە لەو وڵاتانەی کە لەژێر دەستی رۆم بوون، چوونکە ئیمپراتۆری رۆم پێویستی بە پارەیە بۆ ئەو لەشکرکێشییە و پارەی نییە، بۆیە هەوڵیدا بوو تا پارە بە قەرز لە بازرگانەکان وەربگرێت.

رۆمەکان بازرگانیی خودان متمانەی زۆری هەیە، ئەوان لە تەواوی ئەو وڵاتانەی ژێردەستی رۆمن کاری بازرگانی دەکەن و نووسینگەیان هەیە، هەندێ لەوان تا نێزیکەی سەد کەشتیی بازرگانیان هەیە، لە دەزگە بازرگانییەکانیان نێزیکەی پێنج هەزار کەس کار دەکات، بەڵام

ئەوان متمانەیان بە کلۆد نەبوو، دەترسان کە ئەو نەتوانێت قەرزەکانیان بۆ بگەڕێنێتەوە، لە لایەکی دیکە ترسیان هەبوو لەوەی ئەویش هەر وەك ئیمپراتورەکانی دیکەی رۆم بکوژرێت و ماوەی دەسەڵاتیی هێندە کورت بێت کە نەتوانێت قەرزەکانیان بداتەوە.

کاتێك کلۆدی دووەم زانی ئەوان نایانەوێت قەرزی بۆ دابین بکەن، بڕیاریدا بیانخاتە ژێر گووشار، ئەوەش بازرگانەکانی خستە بارێکی ناخۆش، ئەوان نەیاندەتوانی هەڵبێن و بڕۆن، چوونکە تەواوی ئەوەی لە رۆم هەیانبوو دەکەوتە دەست کلۆد، ئەگەریش هەڵنەهات بووان، ناچاربوون داواکەی بەجێ بگەیەنن.

بازرگانەکانی رۆم بۆ ئەوەی پارە نەدەن بە ئیمپراتۆر، لەگەڵ (کێن تی دیۆس) کە برای کلۆدی دووەم بوو، بوونە هاوپەیمان و مەبەستیان لەو هاوپەیمانییە ئەوە بوو کە کێن تی دۆس لە جیاتی کلۆدی دووەم بکەنە پاشا، تا چیدیکە لە مەترسی ئەودا نەبن و ئاسوودە بن، بەڵام لەپڕ نەخۆشی تاعوون هاتە رۆم.

بە بڕوای من تاعوون لەلایەن ئەهریمەنەوە دێت، ئاهورامەزدا کە میهربانە، ئافرێندراوەکانی خۆی ئازار نادات و بەڵایان بۆ نانێرێت. ئەهریمەنیش تا ئەو کاتەی زەمینە بۆ ناردنی بەڵا خۆش نەبێت ناوێرێت بەڵایان بۆ رەوانە بکات و زەمینەی ناردنی تاعوونیش خراپەکاری بوو، رۆمەکان خەڵکانەکی باش نەبوون، خراپەکار بوون، ئەو یاسایانەی ئاهورامەزدا بۆ پاکوخاوێنی دیاری کردبوون، نەیاندەپاراست، بیستبووم کۆڵانەکانی رۆم بۆتە شوێنی کۆبوونەوەی خۆڵ و خاشاك، لە لایەکی دیکە جگە لە خانەدانەکان، لە رۆم کەس خۆی ناشوات، هەندێ لە کۆیلە و خەڵکی هەژار هەن، کە لە تەواوی تەمەنیان خۆیان ناشۆن. خانەدانەکانی رۆمیش هەفتەی جارێك یاخۆ دووجاران، بە درێژایی ئەو رۆژە لە گەرماوەکاندا بەسەریان دەبرد.

لە رۆژانی سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئەو پەتایەدا، خانەدان و دەڵەمەندەکان وایاندەزانی پەتاکە بە تەواوەتی تەشەنە ناکات و بە زوویی لەنێو دەچێت، بەڵام بە ماوەیەکی کەم پەتا گەیشتە نێو ماڵە گەورە و کۆشکە جوانەکانیان کە لە بەردی مەڕمەڕ و جوانکاری چێ کرابوون، ئەوانیش لە ترسی ئەو پەتایە، ماڵەکانیان جێهێشت و پەنایان بردەبەر بیابانەکان.

تاعوون پزیشك و یارمەتیدەرەکانی ئەوانی لەنێوبرد، ئیدی کەس نەبوو بۆ چارەسەری خەڵکی رۆم هەنگاو بنێت یاخۆ تەرمی مردووەکان بنێژێت.

خووخدەی خەڵکی ڕۆم وابوو کە خانووی بەرزی حەوت و هەشت و تا دە نهۆمی چێ بکەن، بۆ ئەوەی سوود لە کرێیەکانیان وەربگرن، چوونکە لە ڕۆم زەوی نیشتەجێ زۆر گران بوو، بۆیە کرێی نهۆمەکانی سەرەوە زۆر کەمتر بوو لە نهۆمەکانی خوارەوە، چوونکە سەرکەوتن بۆ نهۆمەکانی سەرەوە خەڵکی ئازار دەدا، ئەمەش وای کردبوو هەژاران لە نهۆمەکانی سەرەوە بن. بە هۆی ئەو پەتایە ئەوان دەمردن، ئیدی کەس نەبوو لاشەکانیان لەو نهۆمانە دابگرێت و بیان نێژێت و لەوێ بۆگەنیان دەکرد.

ئەو ڕۆژەی بڕیارمدا شارەکان (بە شاپوور) دروست بکەم، یەکێك لەو کریستیانانەی پەنای بۆ من هێنا بوو، هاتە لام و داوای کرد تا خانووی چەند نهۆمی چێ بکەم، منیش ئەو وتەیەم ڕەت کردەوە و وتم لە ڕۆم بە هۆی گرانی زەوی خانووی چەند نهۆمی چێ دەکەن، بەڵام ئاهورامەزدا زەوی زۆری داوەتە من و شوێنکەوتووەکانم، بۆیە من واناکەم کە خەڵکی من بە سەرکەوتن لە پلیکانەکان دووچاری ناڕاحەتی ببن. لە هەموو ئەو شارانەی من دروستم کردوون خانووی چەند نهۆمی لێ نییە، تەنیا چەند خانوویەکی دوو نهۆمیان لێ دروست کراوە.

بۆنی گەنینی تەرمی مردووەکان لە باڵەخانەکان بە ڕادەیەك تەشەنەی کرد و تێکەڵ بە پیسی کولانەکان ببوو، تەنینەوەی نەخۆشییەکەی خێراتر کردبوو.

ڕادەیەك هەوای ڕۆم پیس ببوو، هەر کەسێکی تەندروست و ساخیش، تەنانەت بە تەنیشت شارەکەشدا ڕۆیشت بووایە، بە هۆی ئەو بۆنە دووچاری نەخۆشی دەبوو.

نەخۆشییەکە لە ڕۆم بەرەو شارەکانی دیکە ڕۆیشت، ئەو خانەدانانەی بۆ سەر موڵکەکانیان چووبوون، لەوێندەر دووچاری نەخۆشی بوون، دەرکەوت کاتێك بەڵا دێت، هیچ جیاوازیی لە نێوان خانەدان و کۆیلە ناکات. سەیر لەوەدا بوو کە پیاوان زۆرتر بەو نەخۆشییە دەمردن و ژنان دوای تووشبوونیان هەندێ جار چاك دەبوونەوە، بەڵام لە نێوان پیاواندا کەم کەس هەبوون کە چاك ببنەوە.

لە شاری ڕۆم فەیلەسوفێك بە ناوی تلانووس دەژیا، ئەویش بەو نەخۆشییە گرفتار ببوو، بەڵام یەکێك بوو لەو ژمارە کەمەی بەو نەخۆشییە نەمردن، ئەو تا دە ڕۆژ دوای چاك بوونەوەش هێندە بێ توانا بوو، کە نەیدەتوانی هەنگاو هەڵبێنێت، کاتێك زانی توانای ڕۆیشتنی بۆ گەڕاوەتەوە و هەناسەی هێندە بەهێز بووە کە بتوانێت کەڕەنا لێ بدات، کەڕەنایەکی بەدەستەوە گرت و بەنێو کۆڵانەکانی ڕۆمدا دەستی بە گەڕان کرد، لە تەواوی ئەو شوێنانەی دەیزانی توانای گەیاندنی دەنگی کەڕەنای بە خەڵکی هەیە، فووی بە کەڕەناکەیدا دەکرد تا دەنگی بەرز ببێتەوە، دەنگی کەڕەناکە بووە هۆی ئەوەی ئەوانەی توانای جووڵەیان

هەبوو لە تلانووس نێزیك دەبوونەوە، ئەویش بە دەنگێکی نزم پێی دەوتن: ئەی ئەو کەسانەی لەو نەخۆشییە ڕزگارتان بووە، ئەوە بزانن کە ئێوە جارێکی دیکە دووچاری ئەو نەخۆشییە نابنەوە، بۆیە وەرن و هەوڵ بدەن تا پێکەوە تەرمی مردووەکان لە خاکدا بنێژین، چوونکە ئەگەر ئەوکارە نەکەین، تەنانەت ئێوەش کە لەو نەخۆشییە بە زیندوویی رزگارتان بووە، گرفتاری نەخۆشی دیکە دەبن و دەمرن، بەو ئاوایە تەنانەت یەك کەسیش لە رۆم لە دەست مردن ڕزگاری نابێت.

تلانووس دەیوت: ئەوانەی چاك بوونەتەوە دەتوانن لە تەرمەکان نێزیك ببنەوە و نەترسن کە دووبارە دووچاری تاعوون دەبنەوە.

ئەو پیاوە فەیلەسووفە هەروەها دەیوت: هەرچەندە من حەفتا ساڵم و لاو نیم، بەڵام لەگەڵ ئێوە لە ناشتنی لاشەکان بەشدار دەبم، تا ئەوانەی بە هۆی تاعوونەوە نەمردون، بە هۆی نەخۆشیی دیکەوە نەمرن.

لە رۆژانی یەکەم و دووەمدا هەوڵەکانی تلانووس هیچ کاریگەریی لە خەڵك نەکرد، بەڵام لە رۆژی سێیەمدا خەڵکی بە دوای تلانووسدا کەوتنەڕێ، کاتێك دەگەیشتنە ماڵێك کە لاشەی تێدابوو، تلانووس کە توانای سەرکەوتنی نەبوو، دەوەستا و بە ئەوانی دەوت تا سەربکەون و لاشەکان بێننە خوارێ، دواتر لە گالیسکەکانیان بار دەکردن و بەرەو و دەرەوەی شاریان دەبردن.

هاوکات لەگەڵ ئەوەی ژمارەیەك خەڵك سەرگەرمی بردنی تەرمەکان بۆ دەرەوەی شار بوون، ژمارەیەکیش لە خەڵکی رۆم لە دەرەوەی شار سەرگەرمی هەڵکەندنی گۆڕی بە کۆمەڵ بوون بۆ ناشتنی تەواوی تەرمەکان.

ئەوکات دەرکەوت بوونی ئەو فەیلەسووفە پیرە لە بوونی تەواوی لەگات و سیناتۆر و تەنانەت لە ئیمپراتۆریش بۆ خەڵکەکە گرینگترە، چوونکە ئەوان لە ترسی گیانی خۆیان هەڵاتبوون و رۆم و خەڵکەکەیان دابۆوە دەست تاعوون، ئەو پیرە پیاوەش شار و خەڵکەکەی لەو نەخۆشییە رزگار دەکرد.

پێویستە بوترێت وێڕای ئەوەی خەڵکی رۆم کەسانێکی پیس بوون، بەڵام لەو شارەدا دزی نەبوو، کەس ماڵی ئەو کەسانەی نەدەبڕی کە مردبوون، لە کۆمەڵگەی رۆم سێ چین هەبوون، چینی یەکەم خانەدانەکان بوون، هێندە سەرمایەیان هەبوو کە پێویستیان بە دزی نەبوو، چینی دووەم لە دانیشتووانی رۆم، ئەوانە بوون کە رەگەزنامەی رۆمیان هەبوو، بە درێژایی تەمەنیان

مووچەیان لە حکوومەت وەردەگرت، چینی سێیەمیش کۆیلەکان بوون کە بە شێوەیەك پەروەردە کرابوون، کە دەیانزانی ئەگەر دزی بکەن لە خاچ دەدرێن، بۆیە لە ترسی ئەو سزا ترسناکە کەس نەبوو لەوان دزی بکات، بۆیە لە رۆم دزی نەدەکرا.

تلانووس دەیوت تەنیا ترس لە نەخۆشییەکان ناتوانێت هاندەر بێت بۆ ناشتنی تەواوی مردووەکان، پێویستە ئەوانەی ئەو کارە ئەنجام دەدەن پاداشتیش بکرێن، لەبەرئەوەی لە رۆمدا حکوومەت نەبوو، کەس نەیدەتوانی ئەو پاداشتەیان بداتیّ، بڕیاریدا هەرکەسێك مردوویەك بنێژێت، دەتوانێت ببێتە خاوەنی سامانی بەجێماوی ئەو کەسە مردووە.

ئەوەی لە دوای مردووەکانەوە مابۆوە هێندە زۆر نەبوو، چوونکە ئەوانەی لە رۆم مابوونەوە و مرد بوون، هەموویان لە خەڵکی ئاسایی و کەمدەرامەت بوون، ئەوانەی خاوەن سەرمایە بوون، هەموویان رۆیشتبوون، ئەوەی هەیانبوو لەگەڵ خۆیاندا بردبوویان. وێڕای ئەوەش ئەوەی مابۆوە بۆ کەسانی زیندووی دانیشتووی رۆم زۆر بوو، لە لایەکی دیکەیش کەس وەك میراتگری مردووەکان نەمابۆوە تا ئەوەی دەستیان دەکەوێت، لێیان وەربگرێتەوە.

نەخۆشی تاعوون بە شێوەیەك ئەو شارەی لە دانیشتووان ڤاڵا کردبوو کە زۆرێك لە خانووە چەند نهۆمییەکانی رۆم ڤاڵابوون و ببوونە پەناگەی ئاژەڵەکان، بە تایبەتی سەگەکان، وەك دواتر کریستیانەکان پێیان راگەیاندم، هێندە سەگ هاتبوون بۆ ئەو شارە وەك ئەوەی تەواوی سەگەکانی وڵاتی رۆم زانیبیان کە ئەو شارە ڤاڵایە و هاتبن بۆ ئەویّ.

ژمارەی سەگەکان هێندە زۆر بوو، کە چیدیکە دوای هاتنی شەو، کەس نەیدەوێرا لە ماڵ بێتەدەر، هەر کەس هاتبایەدەر لەلایەن سەگەکانەوە پەلامار دەدرا. خەڵکی رۆم دوای ئەوە ناوێکی دیکەیان بەسەر شارەکەیاندا بڕی کە برێتی بوو لە (شاری سەگە کێوییەکان).

دوای تەواوبوونی ناشتنی تەرمی مردووەکان، تلانووسی فەیلەسووف داوای لە خەڵك کرد، پێکەوە سەگەکان لە شار دەربکەن، وتیشی مەترسی سەگە کێوییەکان لە مەترسی تاعوون کەمتر نییە لەسەر دانیشتووانی شار، لە کاتی شەودا کەس نەیدەوێرا هێرش بکاتە سەر سەگەکان، بۆیە بەپێی ئامۆژگاری تلانووس لە رۆژدا و بە شمشێر و نێزە و بەرد، خەڵکی شار بە کۆمەڵ هێرشیان دەکردە سەر سەگەکان و دەیانکوشتن و لە شاریان دەردەکردن، دواتر لاشەی ئەو سەگانەی دەکوژران وەك تەرمی مردووەکانی تاعوون بە گالیسکە دەگوازرانەوە بۆ دەرەوەی شار و لە گۆڕ دەنێژران.

کلۆدی دووەم کە پێشتر بۆ جەنگی من گووشاری دەخستە سەر بازرگانەکانی رۆم تا پارەیان لێ وەربگرێت و بێت بۆ جەنگی من، لە ترسی تاعوون رۆیشتبوو بۆ باشووری رۆم، دوای ئەوەی تاعوون لەوێش دەرکەوت، رۆیشت بۆ باشووری رۆم و لە شارێکی بچووکی بە ناوی (سی ویتا- وەچیا) مایەوە، ( ئەو شارە هێشتا لە رۆم ماوە). ئەو دەیوت خوداوەندیان پێیان راگەیاندووم کە ئەگەر من لەو شارە نیشتەجێ ببم، دووچاری نەخۆشی تاعوون نابم.

رۆژێك کلۆدی دووەم دووچاری لەرز دەبێت، کاتێك پزیشکەکەی پشکنینی بۆ دەکات، بۆی دەردەکەوێت کە دووچاری نەخۆشی مەلاریا بووە، هۆکەی بۆ مانەوەی ئیمپراتۆر لە باشوور و خواردنەوەی ئاوی ئەو شوێنە دەگەڕێنێتەوە، بەڵام دوای چەند ساتێك دووچاری تا دێت، پزیشکەکەی پێی دەڵێت ئەو تایەش نیشانەی نەخۆشی مەلاریایە. دووەم ڕۆژ تای کلۆد دانەبەزی، هاوکات ئێسکەکانیشی دووچاری ئازاری توند هاتن، کلۆد بە پزیشکەکەی وت کە ئەگەر ئازارەکەم چارەسەر نەکەی ئەوا دەتکوژم، چوونکە کاری پزیشك چارەسەرکردنی نەخۆش و نەهێشتنی ئازارەکەیەتی، ئەگەر پزیشکێك نەتوانێت ئازاری نەخۆشەکەی ببڕێ، ئەوا هەر بەناو پزیشکە و پێویستە بکوژرێت.

پزیشکەکەش لە ترسی گیانی خۆی کەمێك تریاکی دەرخواردی کلۆدی دووەمدا، بەو شێوەیە ئازاری ئێسکەکانی ئەوی چاك کرد.

لە سێیەمین ڕۆژی نەخۆشییەکەیدا، کلۆد دووچاری توندی هەناسەدان بوو، پزیشکەکەی پێی وت، ئەمەش هەر نیشانەی مەلاریایە و هەندێ لە تووشبووان بەو نەخۆشییە، دووچاری تەنگی هەناسەدان دەبن، پزیشك بە هەندێ لە جۆرەکانی بخوور، توانی ئەو خراپ هەناسەدانەشی چارەسەر بکات.

چوارەمین ڕۆژ کاتێك کلۆد بە هۆش خۆی هاتەوە بینی کە ئازاری توند لە ئەستوورایی رانی هەیە، کاتێك دەستی بۆ برد، بینی کە ئەو شوێنە ئاوساوە و دووچاری هەوکردن بووە، وەك ئارۆێك ئەستوور و ڕەق ببووە.

ئەوکاتە بەو نیشانەیە زانی دووچاری تاعوون بووە، چوونکە ئەو ئازارە توندە و دروستبوونی ئەو ئاوساوییە لە ڕانی نیشانەی تاعوون بوو، هێندە لە پزیشکەکەی تووڕە بوو کە درۆی لەگەڵدا کردبوو، وتبووی ئەوە نەخۆشی لەرزوتایە، بۆیە بڕیاریدا پزیشکەکە بکوژێت، بەڵام پزیشکەکە رۆژی پێشتر، لە توندی هەناسەدانی کلۆد، بۆی دەرکەوتبوو کە ئەوە نیشانەکانی تاعوونە و هەڵات و خۆی رزگار کرد، بۆیە نەیان توانی ئەو بدۆزنەوە و

پزیشکێکی دیکەیان هێنایە لای ئیمپراتۆر. پزیشکە تازەکەش بۆ دامرکاندنەوەی ئازاری ڕانی، تریاکی بە کلۆد دا.

دوای ئەو ڕۆژە بە خێرایی نەخۆشی کلۆد تەشەنە کرد و دۆخی تەندروستی خراپتر بوو و ڕەنگی زەرد و دواتر ڕەش هەڵگەڕا، لە شەشەمین ڕۆژدا و لە کاتی بێ هۆشیدا مرد، من کە هەرگیز لە مردنی دوژمنەکانم شادیم دەرنەبڕیوە، بەڵام گومانم نەبوو کە ئاهورامەزدا جارێکی دیکە منی لە پەنای خۆیدا پاراستووە و نەیهێشت کلۆدی دووەم بتوانێت بێتە جەنگی من.

# کێشەی شاژنی پالمیر

دوای ئەوەی کلۆد مرد، ئیمپراتۆرێکی تازە بە ناوی (ئۆرلین) هاتە سەر تەخت، ئەویش وەك پێشینانی خۆی لەگات بوو، پێش ئەوەی ببێتە ئیمپراتۆر، فەرماندەی لژیۆن واتە لەگات بوو.

لە رۆم بۆ وەرگرتنی سەرباز لە لژیۆنەکان هەندێ مەرج لەسەر بالا و ئەندامی سەربازان هەبوو، و کورتەبالاکان وەرنەدەگیران، بەڵام لەبەرئەوەی فەرماندەی لژیۆنەکان لە خانەدانەکان بوون، مەرجی بالا بۆ ئەوان رەچاو نەدەکرا.

ئۆرلین وەك پێشتر وتمان وەك ئیمپراتۆرەکانی دیکەی پێش خۆی لەگات بوو، بالایەکی کورتی هەبوو، داوای لە زەنووبی شاژنی تەدموور (پالمیر) کرد بۆ هاوسەرگیری.

ئەوکات زەنووبی لە تافی لاوی نەبوو، کوڕێکی گەنجی بە ناوی (واهیلات) هەبوو. وێڕای ئەوەش ئۆرلین ئەوی دەویست، چوونکە ئەو ژنێك بوو وێڕای ئەوەی تەمەنی بەرەو سەر دەچوو، بەڵام هیچ جوانییەکەی نەدەشێوا و وەك خۆی دەمایەوە.

وێڕای ئەوەی خەڵکی تەدموور دەیانەویست شاژنەکەیان هاوسەرگیری بکات، بەڵام شاژن پێی خۆش نەبوو، پێشنیازەکەی رەتکردەوە، بە شێوەیەکی ئاسایی کاتێك ئافرەتێك هاوسەرگیری پیاوێك رەتدەکاتەوە، پەنا بۆ نەخۆشی دەبات و دەڵێت نەخۆشی رێگەی نادات، بەڵام زەنووبی بە شێوەیەکی شکاندنەوە وەڵامی ئەوی دابۆوە و وتبووی:"من هاوسەرێکی وەك ئۆدی ناتم هەبوو، کە زۆرانبازی لەگەڵ گادا دەکرد، ئێستە چۆن دەکارم پیاوێکی وەك تۆ پەسەند بکەم؟، تۆ تەنیا بۆ رۆمەکان باشی و شایستەی ئەوە نیت، هاوسەرگیری لەگەڵ مندا بکەیت.

ئیمپراتۆری رۆم بە رادەیەك لەو وەڵامە پەست ببوو، بۆیە وەڵامی بۆ نارد کە بە زووترین کات هێرشی دەکاتە سەر و بە دیلی دەگرێت، دواتر دەستی کرد بە کۆکردنەوەی لەشکر بۆ مەبەستی هێرشکردنە سەر پالمیر تا زەنووبی بگرێت و بیباتە رۆم.

تاعوون ژمارەی دانیشتووانی رۆمی زۆر کەم کرد بوو، هاوکات ئابووری ئەو وڵاتەشی بە توندی لاواز کرد بوو، لە سەروبەندی ئەو ڕەوشەدا زۆرێك لە شوێنە بازرگانییەکانی رۆم داخرا

بوون، دامەزراوەکانی کەشتیڕانی ئەو وڵاتە زۆریان پەکیان کەوتبوو، چوونکە نەتەنیا زۆرینەی کرێکارەکان، بگرە بەشێك لەوانەی بەڕێوەبەر و خودان ئەو دامەزراوانە بوون بە هۆی تاعوونەوە مردبوون و کەس نەبوو بەڕێوەیان ببات، بۆیە ماوەیەکی باشی پێویست بوو تا ئەو دۆخە چاك ببێتەوە، بەڵام ئۆرلین لە وەڵامی شاژنی پالمیر هێندە پەست ببوو، کە توانای خۆڕاگرتنی نەبوو تا بارودۆخ بەرەو باشی بڕوات و ڕۆم بگەڕێتەوە بۆ دۆخی ئاسایی خۆی.

ئەو دەیویست لەشکرکێشیی بۆ پالمیر بکات و وەك ئیمپراتۆرەکانی پێش خۆی پێویستی بە پارە هەبوو. پێشینانی ئۆرلین لە کاتە نائاساییەکاندا پارەیان لە بازرگانەکان وەردەگرت، بەڵام ئۆرلین لە کاتێکدا دەیویست ئەو کارە بکات کە هەندێ لە بازرگانەکان نەمابوون، ئەوانەی هەشبوون نەیان دەتوانی کارەکانیان بەڕێوەببەن و تەنیا دەیانتوانی ژیانی ڕۆژانەیان دەستەبەر بکەن، لەشکرکێشیی ئۆرلین چەندین کرۆر زێڕی پێویست بوو، ئەو دەبووایە ئەو تێچووە بۆ لەشکر دەستەبەر بکات، جگە لەوەش خەرجی چوون و هاتنەوەی پێویست بوو.

تێچووی لژیۆنەکانی ڕۆم لە کاتی جەنگدا زۆر پتر بوو تا لە کاتی ئاشتی، ئەو ڕۆژەی سەربازەکانی لژیۆن دەکەوتنە ڕێگە بۆ جەنگ تا ئەو ڕۆژەی دەگەڕانەوە، مووچەی پتریان دوو هێندە وەردەگرت.

لەبەر ئەو هۆیانە ئیمپراتۆر ناچار پەنای بۆ زیاد کردنی عەیاری زێڕ و زیو برد تا لەو ڕێگەیە ڕێژەیەکی زۆر زێڕی دەست بکەوێت، ئەوەش دەبووە هۆی شکستهێنانی پارەی ڕۆم. بۆیە لە هەموو ئەو شوێنانەی پارەی ڕۆمیان دروست دەکرد، کەوتنە تواندنەوەی زێڕ و زیو و عەیارەکانیان تا (٩) بەرانبەر زیاد کرد، لە ئاکامدا پارەیەکی تازە هاتەکایەوە لە جیاتی زێڕ یاخۆ زیو ، کە پتر لە پارچەیەك قەڵای جوان نەکراو و نەتاشراو دەچوو. کەس ئامادە نەبوو ئەو پارە ساختەیە وەربگرێت و لە تەواوی وڵاتانی ژێردەستی ڕۆم کەس نەیدەویست بە گەنم و جۆ و خوری و ...هتد ئەو پارەیە بگۆڕێتەوە.

کاتێك هەواڵیان بە ئۆرلیندا کە خەڵك ئەو پارە ساختەیە وەرناگرن، وتی من لەمەودوا پارەی پاك کراوەیان دەدەمێ، فەرمانی کرد پارە تەنیا لە قەڵا دروست بکەن و وتیشی هەر کەس ئەو پارەیە وەرنەگرێت، دەکوژرێت.

هەموو وردە بازرگانەکان کە کاڵایان هەبوو لە ترسی ئەوەی کاڵاکانیان بەو پارەیە نەگۆڕنەوە، شوێنەکانی خۆیان داخست، خەڵك لە ڕۆم و شارەکانی دیکەی ئەو ئیمپراتۆرییەتە بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی ڕۆژانەیان کەوتنە گرفت و چیدیکە نان و هەویر دەست نەدەکەوت.

ئۆرلین بانگەشەی کرد کە هەمووان دەبێت کار بکەن، بە پێچەوانەوەشەوە دەکوژرێن، بۆیە ئەگەر پیشتر خەڵکی رۆم لە ترسی تاعوون کۆچیان کردبوو، ئەمجارە لە ترسی کوشتن بە دەستی ئۆرلین دەستیان بە کۆچ کردەوە، تەنیا ئەوانەی توانای کۆچیان نەبوو، مانەوە، لەوانیشدا ئەو کەسانەی کۆیلەبوون خرانە کار، ئەوانی دیکەیش لەلایەن ئۆرلین بە کۆیلە ناسێنران و خرانەبەر کار.

ئەمە یەکەمجار بوو کە رۆمەکان کار بکەن، بۆیە زۆر سەخت لەلایان، ئەو رۆمانەی خاوەن رەگەزنامە بوون لە تەواوی تەمەنیان تەنیا ئەو کارانەیان دەکرد کە خۆیان ئارەزوویان کردبایە.

ئەوەدەمە خەڵکی رۆم ئەو بیرەیان بۆ هات کە رێگەی ڕزگاربوونیان لە دەست ئۆرلین ئەوەیە کە ئەو دووربکەوێتەوە و لەگەڵ کێ دەیەوێت بکەوێتە جەنگ، چوونکە دوای رۆیشتنی ئەو، دەیانتوانی دۆخەکە ئاسایی بکەنەوە و کار نەکەن، ئەوانەی کاریش دەکەن مافی خۆیان وەربگرن، ئەگەر پارە نەبوو، کاڵا و پێداویستیی باش وەربگرن، بازرگانەکانیش بە پارە یاخۆ بە بە گۆڕینەوە کاڵاکانیان بفرۆشن، بەم شێوەیە دۆخەکە باش دەبێتەوە.

هەموو خاوەن کارەکان ئارەزوویان دەکرد ئۆرلین زوو بکەوێتەڕێ، ئەویش کە توانی بووی تەواوی خەڵك ناچار بکات تا پارەی ساخت وەربگرن، نەیتوانی سەربازەکانی بۆ ئەو کارە ناچار بکات. چوونکە دەیزانی ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی لە کاتی گەیشتنیان بۆ مەیدانی جەنگ، خۆیان بە دەستەوە بدەن یاخۆ جەنگ نەکەن و ئۆرلین دووچاری شکست بکەن، بۆیە پارەی ئەوانی لە پارەی پێشوو دابین کرد.

ئەو هەواڵانە وەك جاران لە رێگەی کریستیانەکانەوە بە من گەیشتن، دوو رۆژ دوای ئەوەی ئۆرلین کەوتەڕێ، کەسێك بە ناوی (کێن تیۆس) بووە دەسەڵاتداری رۆم و دۆخەکەی ئاسایی کردەوە. ئەو خەڵکەی کۆچیشیان کردبوو بە بیستنی هەواڵی رۆیشتنی ئۆرلین، گەڕانەوە بۆ رۆم و چوونەوە سەر کارەکانی خۆیان.

ئۆرلین رێگەی سوریای گرتەبەر تا هێرش بکاتە سەر وڵاتی تەدموور (پالمیر).

رۆژێك هەواڵیان بۆ هێنام کە نێردراوێك لەلایەن وڵاتی پالمیرەوە هاتووە، ئەوکات من لە تیسفون بووم، کاتێك نێردراوەکە هات، دەرکەوت کە ئۆهبالاتی کوڕی شاژنی پالمیرە و نامەیەکی لەلایەن دایکییەوە بۆ من هێناوە. لە نامەکەدا زەنووبی دیاری کردووە کە ئیمپراتۆری رۆم بە لەشکرێکی بەهێزەوە بۆ جەنگی ئەوان دێت و وتبووی کە ئەو و کوڕەکەی

توانای جەنگیان لە بەرانبەر ئەو نییە، داوایان دەکرد کە دەست بەجێ بە لەشکری بەهێز و گالیسکەکانمەوە بگەمە ئەو جەنگە.

دەمزانی هۆکاری جەنگی ئۆرلین و شاژن چییە، بۆیە بە کوڕەکەی شاژنم وت ئەگەر دایکت لەو وەڵامەی دەبووایە بۆ ئیمپراتۆری رۆمی بنێرێت، شێوازێکی کەمێك نەرمی هەبووایە، جەنگ نەدەهاتە کایەوە و ئەمڕۆ تۆ لێرە نەدەبووی تا داوای یارمەتیم لێ بکەی.

ئۆهبالات وتی ئەی پاشا: دایکم زۆر ئازایە و بە خۆشەویستی و داوای هاوسەرگیری کە لەلایەن ئۆرلین ئاراستەی کرابوو زۆر دڵگران بوو، ویستی ئەو سزا بدات.

لە بەردوو هۆکار داواکەی ئەوانم پەسەند کرد،

یەکەم ئەوە بوو کە زەنووبی ژن بوو، دەبووایە داوای یارمەتییەکەی پەسەند بکەم و یارمەتی بدەم.

دووەم خاڵیش ئەوە بوو کە ئەگەر ئۆرلین هاتبووایە و پالمیری داگیرکرد بایە، لەوانە بوو وەك ئەوانەی پێش خۆی چاوچنۆکی و فرەوانخوازی وای لێ بکات بەرەو وڵاتەکانی دیکەی ژێردەستەی من بێت، بە زیرەکییەوە بە خۆمم وت کە حەزی خواردن لە دانەکاندایە، ئەوەی زۆرتر دانەکانی بجوڵێنێت زۆرتر حەزی بۆ خواردن دەڕوات، ئەگەر ئۆرلین پالمیر بگرێت وەك ئیمپراتۆرەکانی پێش خۆی دەکەوێتە گرتنی وڵاتەکانی دیکەی من و ئارەزووی گەیشتن بە شاری تیسفون دەکەوێتە سەری، بۆیە باشترە کە نەتوانێت پالمیر بگرێت.

لە نێوان سەردارەکانی لەشکرەکەم سەردارێکم هەبوو بە ناوی (سلاپۆر) کە زۆر ئازا بوو، منیش لەبەر ئەو ئازایەتییەی هەیبوو هەرگیز نەمدەویست وەك فەرماندەی راستەوخۆ بۆ جەنگی رەوانە بکەم، ئەو هەردەم ئامادەی گیان فیدایی بوو، بۆیە بایەخی بە گیانی سەربازەکانی نەدەدا، لەوانە بوو لە ماوەی نیو رۆژدا تەواوی سەربازەکانی بە کوشت بدات.

کاتێك لە جەنگدا ئەوم بۆ هێرش دەنارد، رام دەسپارد تا لە بە کوشتدانی سەربازەکانی خۆپارێزی بکات، ئەویش بە ناچاری پەسەندی دەکرد و لە فەرمانم دەرنەدەچوو.

ئەوکات چوونکە دەمەویست ئیمپراتۆری رۆم بشکێت، ئەوم بۆ یارمەتیی دەنارد، بۆیە بە ناچاری ئەوم پەسەند کرد و بۆ ئەو جەنگم دیاری کرد. لەبەرئەوەی ئەو فەرماندەی راستەوخۆی جەنگ دەبوو، منیش ئاگەداری دۆخی شەڕگەکان نەدەبووم، نەمدەتوانی راسپاردەی بدەمێ تا لە بە کوشتدانی خۆی و سەربازەکانی خۆپارێزی بکات، وێڕای ئەوەش ئەوکاتەی سلاپۆر بۆ وەرگرتنی مۆڵەت رۆیشتن بۆ ئەو جەنگە هاتە لام، پێموت کە من تۆ بۆ سەرکەوتن دەنێرمە پالمیر، تۆش ئاگەدار بە کە تەنیا خۆت و سەربازەکانت بە کوشت نەدەی.

سەرجەمی سەربازەکانی لەشکری سلاپۆر بە پیادە و سوارەوە نێزیکەی حەفتا هەزار کەس بوو، حەوت سەد گالیسکەشی لا بوو، واتە نێزیك ئەو ژمارەیە بوو کە من بۆ جەنگی ئۆدی نات بۆ پالمیرم برد.

بە پێویستم نەدەزانی بە سلاپۆر بڵێم تا ورە بە سەربازەکانی ببەخشێت و پێیان بڵێت کە ئەوان دەچن بۆ جەنگی لژیۆنەکان کە باشترین سەربازەکانی رۆژئاوان ئەو خۆی وەك من ئەو بابەتانەی دەزانی، تەنیا بە سلاپۆرم وت کە ئێستە تۆ دەچی بۆ وڵاتێکی دۆست و بۆ یارمەتیدانی شاژنی پالمیر و کوڕەکەی، وریا بە سەربازەکانت دەستدرێژی نەکەنە سەر هیچ کەسێك لەو وڵاتە، بۆ کڕینی هەر شتێك پێدڤییە نرخەکەی بدەن، کارێك نەکەن کە بیروڕای ئاینی و نیشتمانی خەڵکی ئەو وڵاتە بریندار ببێت، دوای ئەو موچیاریانە دەرفەتی رۆیشتنم بە سلاپۆر بەخشی.

ئۆرلین دە لژیۆنی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کە تەنیا سێ لژیۆنیان سەربازەکانیان هی رۆم بوو، ئەوانی دی هی وڵاتانی ژێردەستی رۆم بوون و بایەخی جەنگیان وەك سێ لژیۆنەکە نەبوو. پێش ئەوەی سلاپۆر بگاتە پالمیر ئەو زانیارییەم بۆ هات، وێڕای ئەوەی دەمزانی سلاپۆر کەسێکی لێهاتووە، بەڵام ئەو زانیارییەم پێگەیاند تا سەردارەکەی من وا نەزانێت لەبەرئەوەی تەنیا سێ لژیۆن لە لەشکرەکەی ئیمپراتۆری رۆم خەڵکی رۆمن، ئەوان بە کەم بزانێت و وابیر بکاتەوە کە سەرکەوتن بەسەریاندا ئاسان دەبێت.

سلاپۆر دەیزانی پێویستە لەوێ بجەنگێت، بۆیە کاتێك گەیشتە تەدموور، رۆیشت بۆ لای شاژن و وتی من بۆ یارمەتیدانی تۆ هاتووم، ئەگەر تۆ لەشکری جیات هەبێت، ئەوا شکست دەخۆین، پێویستە لەشکرەکەمان یەك بخەین و لەژێر یەك فەرماندەییدا جەنگ بکەین، من پێداگری ناکەم کە ببمە فەرماندەی هەردوو لەشکر و ئامادەم لەژێر فەرمانی ئێوەدا بجەنگم، مەبەستم ئەوەیە کە دوو لەشکر دەبێت یەك فەرماندەی هەبێت.

زەنووبی وتی من لەشکری خۆم دەخەمە ژێر سەرکردایەتیی تۆ، دوای ئەوە لەشکری من و زەنووبی تەنیا یەك فەرماندەیان هەبوو.

لە یەکەمین راپۆرت کە سلاپۆر بۆی ناردم، وتبووی کە سەربازانی شاژن بایەخی جەنگی باشیان هەیە و یارمەتیدەر دەبن لە سەرکەوتنمان لە جەنگدا. دوای ئەو راپۆرتە سلاپۆر لەگەڵ لەشکرەکەی کە لەشکری زەنووبیش بەشێکی پێك دەهێنا، بەرەو ئەو شوێنە رۆیشتن کە دەبووایە لەگەڵ ئیمپراتۆری رۆم بەیەك بگەن.

کاتێك ئۆرلین لەسەر ڕێگەی خۆی گەیشتە شاری ئەنتاکیە کە لە بناری چیای (سیل پیۆس) بوو، لەوێندەر وێستا و سەربازە لژیۆنەکانی خۆی لەنێو سەربازگەکانی ئەو شارە جێ کردەوە.

ئەی ئەو کەسەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنیتەوە، بزانە کە (٥٦٨) ساڵ پێش ئێستە واتە لە ساڵی (٢٦٨ ز) شاری ئەنتاکیە لەلایەن پاشایەکی یۆنانی بە ناوی سلۆکۆسی یەکەم کە لە سەردارەکانی ئەسکەندەر بوو، دەسەڵاتیی ئێرانی بەدەستەوە بوو، دامەزرا و ئێستە یەکێکە لە بەندەرە گەورەکان.

هۆی وەستانی ئەو لە شاری ئەنتاکیە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەو شارە کۆمەڵێك بازرگان و دامەزراوەی گەورەی کەشتیرانی لێ بوو، ئیمپراتۆری ڕۆم دەیەویست لە کاتی مانەوەی لەو شارە هەندێ زێڕ و خشڵی گرانبەهای دەست بکەوێت.

شەوێك لە کاتی نیوەشەودا بوومەلەرزەیەکی بەهێز لە شاری ئەنتاکیەیدا و بە هۆیەوە بەشێك لە شاخی (سیل پیوس) کە ئەنتاکیە لە بناری ئەو شاخە بوو، داڕما و ژمارەیەکی زۆر لە خانووەکان و بەشێك لە سەربازگەکان ڕووخان، بە هۆیانەوە ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانی ئۆرلین کوژران.

ئیمپراتۆری ڕۆم لە ڕوانگەی جەنگییەوە هیچ پێویستی بە مانەوە لەو شارە نەبوو، ئەگەر چاوی نەبڕیبایە سامان و زێڕ و زیوی بازرگانەکان و دامەزراوەکانی گواستنەوە و کەشتیرانی ئەوشارە، ئەوا سەربازەکانی نەدەکوژران.

هەر هەمان شەو سەرداری من واتە سلاپۆریش بوومەلەرزە لێیدان، بەڵام ئەو لە خێوەتگەکەی خۆی بوو، تەنانەت یەك سەربازیشی هیچی لێ نەهات. سپێدەی بەیانی هەمان ڕۆژ سلاپۆر و لەشکرەکەی بەڕێکەوتن تا گەیشتنە ناوچەیەکی تەخت کە دەیانتوانی تیایدا سوود لە گالیسکە و ئەسپەکانیان ببینن.

ئەگەر لەو ناوچەیە دەرچووبایە، دەگەیشتە ناوچەیەکی نارێك کە بۆ بەگەڕخستنی ئەسپ و گالیسکەکان نەدەشیا، بۆیە ماوەی چەند ڕۆژێك لەو شوێنە مایەوە، سەربازەکانی دەنارد بۆ ئەوەی زانیاری سەبارەت بە ئیمپراتۆر وەربگرن، بەڵام هیچ شوێنەواری لەشکری ئیمپراتۆری ڕۆم دیار نەبوو.

سلاپۆر وابیردەکاتەوە کە لەوانەیە ئۆرلین لە ڕێگەیەکی دیکە ڕۆیشت بێت، بۆیە کەوتە لێکۆڵینەوە، سەرەنجام بۆی دەرکەوت ئۆرلین تێپەڕ نەبووە و جووڵەی لەشکرێکی دە لژیۆنی بە

نهێنی ناکرێت، ئەگەر ئەو کارە ڕووبدات، دانیشتووانی سنوورەکە ئاگەدار دەبن، ئەوکات بۆ ئەو کەسانەی باس دەکەن کە پرسیاری لە بارەوە دەکەن، ئەو زانی ئۆرلین دووچاری بوومەلەرزەی شاری ئەنتاکیە بووە و ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکانی لەنێو چوون، بۆیە جووڵەی بەرەو پالمیر بە درەنگ کەوتووە.

سلاپۆر سەرەنجیدا کە دوای لەنێوچوونی ژمارەیەکی زۆری سەربازی ئۆرلین بە هۆی بوومەلەرزەوە، ئاسانترە کە ئەو لەنێو شاری ئەنتاکیەدا شکست بدات، ئەوکات لەوانەیە ئەویش دەستگیر بکات، دواتر بیری کردەوە کە ئەنتاکیە یەکێکە لە دوو ناوەندەکانی ژیانی کریستیانەکان لە دەرەوەی سنووری ڕۆم و لە سنووری وڵاتانی ژێردەستی مندا. ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم لە وڵاتی خۆیان کریستیانەکانیان ئازار دەدا، بەڵام توانایان نەبوو لە ئەنتاکیە ئەوان بخەنە هەمان دۆخ.

ئەگەر سلاپۆر هێرشی بۆ ئەنتاکیە کردبایە، لەوانەبوو ئۆرلین کریستیانەکان ئازار بدات یاخۆ ئەوان بگرێت و وەك بارمتە بەکاریان بێنێت بۆ گووشار خستنەسەر سلاپۆر یاخۆ هەموویان بکوژێت تا سەرداری من لە هێرش ڕابگرێت. سلاپۆر نەیدەتوانی لە بیابان چاوەڕوان بێت، دوای ناردنی راپۆرتێك لەو بارەوە بۆ من، بۆ شاری تەدموور گەڕایەوە و لەوێندەر لە چاوەڕوانی فەرمانی تازەی مندا مایەوە.

هێرش نەکردنی سلاپۆر بۆ شاری ئەنتاکیەم پەسەند کرد و وەڵامم بۆ نارد کە با چاوەڕوان بێت، چوونکە ئۆرلین زۆر قینی بەرانبەر زەنووبی هەبوو، بۆیە هەوڵی دەدا تا زیانی بوومەلەرزەکە لەسەر لەشکرەکەی تۆڵە بکاتەوە و ئینجا بەرەو پالمیر بکەوێتەڕێ، پێم ڕاگەیاند کە لەوانەیە ماوەیەکی زۆر بخایەنێت، بۆیە فەرمانم کرد تەواوی لەشکرەکەی خۆی و ئەگەر پێویست بوو لەشکرەکەی زەنووبیش بخاتە ڕاهێنانی سەربازی و جەستەییەوە، چوونکە هەر لەشکرێك ماوەیەکی زۆر بێ مەشق و راهێنان بێت، بایەخی جەنگی خۆی لە دەست دەدات و پشتی سارد دەبێتەوە و ناتوانێت بجەنگێت.

راپۆرتێکی سلاپۆر بۆ من هات کە دووچاری سەرسووڕمانی کردم، بریێتی بوو لە ڕووداوێك کە تیایدا ژمارەیەك لە سەربازانی من کوژرابوون، سەرسووڕمانی من لەوە بوو کە بۆچی ڕووداوەکە هاتووەتە پێش و بۆچی سەربازەکانی من کوژراون.

ڕووداوەکە وەك لە راپۆرتەکەدا هاتبوو بەو شێوەیە بووە: ڕۆژێك یەکێك لە سەربازەکانم دێتە لای ئەفسەرەکەی خۆی و پێی رادەگەێنێت کە ئەفسەرێکی لەشکری زەنووبی سووکایەتی پێکردووە،

ئەفسەرەکەی من تووڕە دەبێت و داوای هاتنی ئەفسەرەکەی زەنووبی دەکات تا بێتە لای، ئەویش هاتنەکەی ڕەت دەکاتەوە و وەڵام دەنێرێت کە ئەو بە فەرماندەی خۆی نازانێت تا بێتە لای، ئەگەر پلەشی گەورەتر بووایە دیسان بەرفەرمانی نەدەبوو، چوونکە خەڵکی وڵاتەکەی نییە.

ئەفسەرەکەی لەشکری من ژمارەیەك سەرباز ڕەوان دەکات تا ئەو ئەفسەرە بێنن، ئەویش بە هاوکاری سەربازەکانی بەرگری دەکات، شمشێرەکان لە کالان دەردەچن و چەندین کەس دەکوژرێن، ئەگەر لێهاتوویی سلاپۆر نەبووایە، هەردوو لەشکر تا دوایین سەربازیان دەکەوتنە نێو جەنگ و جەنگەکە گەورە دەبوو. زانایی سلاپۆر بەجێ بوو، ئەو سەردارە کە لە کاتی جەنگدا تا دوایین سەربازی خۆی بە کوشت دەدا لە کاتی ئاشتی و لە شار و بیابان کەسێکی زانا و لێهاتوو بوو.

سلاپۆر زانی ئەگەر بیەوێت ئەفسەرەکەی زەنووبی سزا بدات، دیسان جەنگ ڕوودەدات، بۆیە تەنیا داوای لە زەنووبی کرد تا ئەفسەرەکەی خۆی سزا بدات، ئەفسەرەکەی منیش کە بێ گەڕانەوە بۆ فەرماندەکەی خۆی، ژمارەیەك سەربازی بۆ هێنانی ئەو ئەفسەرە ناردبوو، کەوتە بەر سزا، چوونکە بەڵگەی تایبەتی ئەوە بوو کە بە هۆی ڕووداوەکەوە تووڕە بووە و لێکدانەوەی بۆ کارەکەی نەبووە، سزاکەی سووك بوو.

سلاپۆر بە بەرژەوەندیی زانی تا هاتنی ڕۆژی جەنگ یاخۆ بەرێکەوتن بۆ جەنگ لەشکرەکان پێکەوە نەبن، چوونکە بە هۆی ڕژانی خوێنەوە، ئامادەیی بۆ دووبارە هەڵگیرسانەوەی جەنگ هەبوو، ئەگەر پێکەوە بووانە ئەوە ڕوویدەدا.

من پێشتر چووبووم بۆ پالمیر و ئەوێم بینی بوو، دۆخی ئەو وڵاتەم دەزانی و دەمزانی هەڵسووکەوتی سەربازانی پالمیر جیایە لە سەربازانی من.

سەربازەکانی من هی هەر وڵاتێك بوونایە، هەڵسوکەوتیان نەرم و ساتوسەوداییان خۆش بوو، سەربازانی پالمیر لەو بابەتە بەدەر بوون و لەگەڵ خەڵکانی دیکە هەڵیان نەدەکرد، تەنیا لەگەڵ خۆیاندا باش بوون. جیاوازیی ئاکار و تەنانەت ورەی سەربازەکانیش بە پێویستی دادەنا کە دوو لەشکرەکە تا ڕۆژی جەنگ لە یەکدیی دوور بن.

مانەوەی ئۆرلین لە ئەنتاکیە پتر لەو ماوەیەی خایاند کە چاوەڕوانمان دەکرد، منیش فەرمانم بە سلاپۆر کرد بوو کە هێندە چاوەڕوان بێت تا بۆی یەکلا ببێتەوە کە ئیمپراتۆر لە هێرشکردن بۆ پالمیر پەشیمان بۆتەوە.

هەرچەندە سلاپۆر بە تەواوەتیی جێگەی متمانەی من بوو، بەڵام لە لەشکرەکەیدا سیخوورِم دیاری کردبوون، چوونکە بە پێویستم دەزانی، کە پێدڤییە لە هەموو بابەتێکی نێو لەشکر ئاگەدار بم. ئەزموونی جەنگ بە منی سەلماندبوو کە فەرماندەی لەشکر هەرچەندە دڵسۆز بێت، بەڵام لەبەرئەوەی هەندێ بابەت بە بچووك بوونەوەی خۆی دەزانێت، هەندێ بابەتیش بە گرینگ دانانێت، بۆیە هەموو شتێك بۆ من نانێرێت، ئەمە وای دەکرد پێویست بکات سیخوورِم لەنێو لەشکردا هەبێت، لەنێو هەموو لەشکرێکدا بەردەوام سیخوورِم دادەنا تا بەردەوام لە رێگەی راپۆرتەکانییەوە ئاگەداری هەموو زانیاری و هەواڵەکانم بکەن

لەلایەن سیخوورِەکەمەوە، هەواڵم بۆ هات کە سلاپۆر زۆرتر لەوەی پێویستە سەردانی زەنووبی دەکات، منیش دەمزانی چوونی ئەو بۆ لای شاژن بۆ باس و لێکۆڵینەوە و برِیار لە هەندێ بابەت پێویستە، ئەو پێویستی بەوەیە کە رەزامەندیی شاژن وەربگرێت.

دڵنیابووم سیخوورِەکەم راپۆرتی هەڵەم ئاراستە ناکات، چوونکە ئەو دەیزانی ئەگەر درۆم لەگەڵدا بکات، دەیکوژم، بۆیە تەنانەت ئەگەر دوژمنی فەرماندەی سوپاش بووایە، نەیدەوێرا درۆ بکات. چوونی سلاپۆر بۆ لای شاژنیش بابەتێك نەبوو، کە سیخوورِێك بیەوێت بەو رێگەیەوە فەرماندەی سوپا لە لای من بە تاوانبار بناسێنێت.

دوای چەند رۆژێك راپۆرتی دیکەم لەلایەن سیخوورِەکەوە بۆ هات کە سلاپۆر هۆگری زەنووبی بووە، منیش ئەوەم پێچەوانەی رێککاری جەنگ نەدەزانی، بەڵام دەمزانی لەوانەیە هەندێ سەرگەرمی بۆ دروست بکات کە لە کاری سەرەکیی خۆی بێ ئاگای بکات.

ئۆرلینیش لە رێگەی سیخوورِەوە لە ئەنتاکیە هەواڵی ئەو بابەتەی زانی بوو، بە رێگەی تەتەرێکەوە وەڵامی بۆ سلاپۆر نارد بوو، وتبووی تۆ لە خۆشەویستی بردتەوە، بەڵام لە جەنگدا دەیدۆرِێنی.

سلاپۆر دوای ئەو بابەتە بە سەختی ترسی لێ نیشت و ئەو بابەتەی بە زەنووبی راگەیاند. زەنووبی بۆ ئەوەی ترسی سلاپۆر برِەوێنێتەوە، رایسپارد تا بچێتە لای ژنێك کە لە پەرستگەی بەعل بوو، پێشبینی ئەو بابەتانەی دەکرد کە لە داهاتوو دەهاتنە کایەوە، لەو بپرسێت تا بزانێت لە جەنگ لەگەڵ ئیمپراتۆری رۆمدا سەردەکەوێت یاخۆ دەشکێت.

ئەو هەواڵانە لە رێگەی سیخوورِەوە گەیشتە من، زانیم سلاپۆر چووە بۆ لای ئەو ژنەی پەرستگە و داوای کردووە تا ئاکامی جەنگەکەی بۆ روون بکاتەوە. ئەویش مریشکێکی سەربرِیوە و دوای ئەوەی

چاوی لە بەشەکانی جەستەی مریشکەکە کردووە، بێ دەنگ بووە. سلاپۆر پرسیویەتیی بۆ بێ دەنگی و هیچ نالێی؟، ئایا لە جەنگ لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆم من سەرکەوتوو دەبم یاخۆ شکست دەخۆم؟.

ژنەکە وتی تۆ سەردەکەوی، بەڵام...

سلاپۆر پرسیاری کرد مەبەستت لە بەڵام چییە؟.

ژنە غەیب بێژەکە وتی: بەعل ناڵێت مەبەستی لە بەڵام چییە، بەڵام دەڵێت سەردەکەوی.

سلاپۆر دوای ئەوەی لە پەرستگە هاتەدەرێ، بۆ لای زەنووبی ڕۆیشت و وەڵامەکەی بۆ باس کرد، ڕۆژی دواتر ئەویش بۆ پەرستگە ڕۆیشت تا ئەو ژنە ببینێت. ئەو نەیدەتوانی فەرمانی پێ بکات تا ئەو ژنە بێتە لای، ئەگەر فەرمانیشی کردبایە، پەسەندی نەدەکرد. بۆیە چوو بۆ لای و پرسیاری لێ کرد کە بۆچی بە تەواوەتیی وەڵامی نەداوەتەوە؟.

ژنەکە وتی: چوونکە بەعل بە تەواوەتیی وەڵامی ئەوی نەداوەتەوە.

زەنووبی وتی: ئێستە داوا لە بەعل بکە تا بە تەواوەتیی وەڵامی بداتەوە.

ژنەکە مریشکێکی دیکەی سەربڕی و چاوی لە بەشەکانی لاشەکەی کرد و وتی ئیمپراتۆرێکی گەورە بە لەشکرەکەیەوە بەرەو ئێرە دێت، لە نێوان ئەو و ئەو پیاوەی دوێنێ هاتە ئێرە جەنگ ڕوودەدات، ئەو پیاوەی دوێنێ تیایدا سەرکەوتوو دەبێت، بەڵام دوای دوو سێ ڕۆژ دەمرێت.

زەنووبی پرسیای کرد بۆچی دوو سێ ڕۆژ دوای ئەوە دەمرێت.

ژنەکە وتی: ئەو لە جەنگدا بە سەختی بریندار دەبێت و دوو سێ ڕۆژ دوای جەنگ بە هۆی سەختی برینەکەیەوە دەمرێت.

ئاشکرایە من تا کۆتایی جەنگ نەمزانی ئەو ژنە چی بە شاژن گوتووە و سیخوورەکەی من نەیدەتوانی بزانێت ئەو چی پێ وتووە.

سەرەنجام ئۆرلین کە لە ئەنتاکیە بوو، دوای پڕکردنەوەی ئەو زیانانەی لە بوومەلەرزەکەوە بەر سەربازەکانی کەوتبوو، کەوتەڕێ و هاتە نێو وڵاتی پالمیر. سلاپۆریش بە فەرماندەیی لەشکری من و لەشکری شاژن زەنوبی کەوتەڕێ تا ڕێگەی بگرێت و لە دەشتێکی تەخت بە ناوی (تالێب) چاوەڕوانی هاتنی ئەو بوون.

لەو دە لژیۆنەی ئیمپراتۆر تەنیا سێیان هی ڕۆم و ئەوانی دیکە هی دەرەوەی ڕۆم واتە وڵاتە ژێردەستەکانی ڕۆم بوون، لە سەربازانی سێ لژیۆنەکەش ژمارەیەکی زۆر بە هۆی بوومەلەرزەوە لە ئەنتاکیە مردن و شوێنی ئەوان بە سەربازی وڵاتەکانی دیکە پڕ کرایەوە.

ئەگەر من لە جیاتی ئیمپراتۆری رۆم بوومایە، دوای ئەوەی دەمبیست سوپای ئێران لە پالمیرەیە، بەو لەشکرە بێ هێزە بۆ جەنگ نەدەهاتم و لام باشتر دەبوو یەك دوو ساڵ جەنگەکە دوابخەم و نەچم بۆ جەنگێك کە تیایدا گریمانی شکست خواردنم زۆرتر بێت لە گریمانی سەرکەوتنم.

ئەردەشێری بابم کە خوداوەند ئاهورامەزدای دەپەرست، هەردەم ئامۆژگاری دەکردم کە کاتێك بۆ جەنگ دەچم، لەشکرێك ببەم کە دڵنیا بم لە سەرکەوتن، نەوەك بڵێم لەوانەیە سەربکەوم. ئەو کەسەی بە ئومێدەوە دەچێتە جەنگ وەك ئەو کەسە وایە کە خانوو لەسەر رێگەی لافاو چێ دەکات و دەڵێت لەوانەیە لافاو نەیبات و خانووەکەم لەنێونەچێت بەڵام لافاو دێت و خانووەکە رادەماڵێت.

سلاپۆر پیاوێکی ئازا و بێ باك بوو، ئەگەر من لەوێندەر نەبوومایە و رێگەم نەگرتبایە، بێ سڵ کردنەوە، خۆی و سەربازەکانی لە جەنگ لەگەڵ ئۆرلین بە کوشت دەدا. ئەو بە بینینی لەشکری دوژمن لە بەرانبەری بە تەواوی تواناوە هێرشی کرد، تەنیا هێزی یەدەگی نەبرد، ویستی لە ماوەیەکی کەمدا دوژمن لەنێو ببات.

کاتی دەست پێکردنی جەنگ تەواوی بەشەکانی لەشکری من شەنگ و بە توانا بوون، چوونکە سلاپۆر لە کاتی مانەوەی لە پالمیر ئەوانی لە راهێنان و وەرزش بە دوور نەگرتبوو. ئەو دەیزانی نەتەنیا پێویستە سەربازەکان رۆژانە راهێنان و وەرزش بکەن، بگرە دەیزانی کە ئەسپەکانیش دەبێت رۆژانە غاریان پێ بدرێت، دەنا لە رۆژی جەنگ توانایان نابێت.

کاتێك جەنگ دەستی پێکرد، دەرکەوت کە هۆگر بوونی سلاپۆر بۆ زەنووبی رێگر نەببوو لە کازیی سەربازی ئەو و نەیتوانی بوو لە بایەخی جەنگی ئەو کەم بکاتەوە و ئەو دابرێت لە کاروباری لەشکرەکەی.

گالیسکە جەنگییەکانم لە کاتژمێرەکانی سەرەتای جەنگ بە شێوەیەك لای چەپی ئۆرلینیان لاواز کردبوو کە ئەو پاشەکشەی لەو بەشەی مەیدانی جەنگ لا باشتر بوو لە بەردەوامبوونی جەنگ.

بە رێژەیەکی باش هەست دەکرا کە سەربازەکانی ئەو لژیۆنانەی کە رۆمی نەبوون، نازانن چۆن رێگە لە گالیسکەکان بگرن و بەرگری لە خۆیان بکەن، تەنانەت هێندە لێهاتوو نەبوون کە ئەو پێڵاڵیانەی (رم) بە دەستیانەوە بوون، بە جوانی ئاراستەی ورگی ئەسپەکان بکەن تا بیاندرن و گالیسکەکان بوەستێنن، ئەوان رمەکانیان بەرەو پێشەوە هەڵدەدا و بەر ئەو قەڵغانانە دەکەتن کە بە سەر و مل و پشتی ئەسپەکانەوە بوون و کاریگەریان نەدەبوو.

ئۆرلین دەرفەتی نەبوو سەربازەکانی دەرەوەی رۆم بخاتە بەر دەستی فەرماندە رۆمەکان تا پەروەردەیان بکەن و ئامادەیان بکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گالیسکەکان و ئەسپ سوارەکان و ئامادەیان بکەن تا بزانن چۆن بەرگری لە خۆیان دەکەن، تەنانەت ئەوان نەیاندەزانی یەکەم مەرجی جەنگ ئەوەیە کە مرۆڤ زاڵ ببێت بەسەر ترسی خۆیدا. من ناڵێم پیاو نابێت لە مەیدانی جەنگدا بترسێت، بەڵام ترسیش وەك تینوویەتیی لە پێکهاتەی مرۆڤدایە و هەمووان دەترسێن، بەڵام جیاوازیی پیاوی ئازا و ترسنۆك لەوەدایە کە پیاوی ئازا هەرکە مردنی لە بەرانبەر خۆیدا بینی، گەرمی و چاونەترسییەکی وا دەخاتەبەر خۆی کە بەو ڕێگەیەوە پێشوازی لە مردن دەکات و ئەو کارەشی وا دەکات تا بەسەر ترسەکەیدا زاڵ ببێت. سەربازەکانی دەرەوەی رۆم کە لە لژیۆنەکانی ئۆرلین بوون، نەیاندەتوانی ئەو هەستە چێ بکەن تا بەسەر ترسدا زاڵ بن و پێشوازی لە مەرگ بکەن.

لە لای ڕاستی لەشکری ئۆرلینیش، سەربازە نارۆمەکان هەبوون و نەیاندەتوانی بەرگرییەکی شیاو لە بەرانبەر ئەسپ سوارەکانی من پێشکێش بکەن، وەهاش نەبوون کە هەڵبێن، بەڵام بەرەبەرە خەریك بوو لە بەرانبەر ئەسپ سوارەکانم پاشەکشەیان دەکرد. لە بەرانبەردا جەنگێکی سەخت لە نێوەڕاستی لەشکرەکان لە نێوان سەربازانی رۆمی و سەربازانی مندا هەبوو، ئەوان بە سەختی بەرگریان دەکرد، سلاپۆر بێ ترس سەربازەکانی بۆ جەنگ و مردن دەنارد و خۆشی لەگەڵ ئەواندا شمشێر یاخۆ تەوری رادەوەشاند و بیری نەدەکردەوە کە ئەگەر بکوژرێت، یەکێکی دیکە ناتوانێت وەك ئەو فەرماندەیی جەنگ بگرێتە ئەستۆ.

سلاپۆری دلێر هاوکات لەگەڵ بەردەوامبوونی لەسەر جەنگ، لە سەرکردایەتیی جەنگیش بێ ئاگا نەدەبوو، بەردەوام هەواڵی هەردوولای مەیدانی جەنگی وەردەگرت و فەرمانی پێویستیی دەردەکرد و دەیزانی دۆخی لای ڕاستی لەشکری ئۆرلین زۆر خراپە و پاشەکشە دەکەن و زۆری نەماوە لەنێو بچن، هەروەها دەیزانی لای ڕاستیش لە پاشەکشەدان و تەنیا نێوەڕاستە کە سەربازەکانی ئیمپراتۆر بە سەختی بەرگری و جەنگ دەکەن.

سلاپۆر کە بە تەواوەتیی لە دۆخی لای چەپی ئۆرلین یاخۆ لای ڕاستی خۆی دڵنیا ببوو، بڕیاریدا هەندێك لە گالیسکەکان بگەڕێنێتەوە تا لە نێوەڕاست و لەگەڵ سەربازەکانیدا، هێرش بکەن بۆ سەر سەربازە رۆمەکانی ئۆرلین و ناوەڕاستی لەشکرەکەی تێکبشکێنن. چەند ساتێك دوای دەست پێکردنی هێرشی گالیسکە جەنگییەکانم بۆ ناوەڕاستی لەشکری دوژمن، ڕمێك لە چاوی ڕاستی فەرماندەی مندا نیشتەوە.

ئەگەر رمەکە لە نێزیکەوە هاوێژرا بووایە، چوونکە بەر سەری کەوتبوو، بە دڵنیاییەوە فەرماندەی دەکوشت، بەڵام باش بوو لە کۆتایی ڕێڕەوی خۆیدا تیرەکە بەر سلاپۆر کەوت و توانای کەم ببۆوە و تەنیا چاوی کوێر کرد.

سلاپۆر نێزەکەی لە چاوی دەرکرد و هێندە ئازا بوو کە پارچەیەك لە کراسەکەی لێکردەوە و خستیە جێی چاوی تا چیدیکە خوێنی لێ نەیێت، لە دوای گالیسکەکان و لەگەڵ سەربازەکانیدا کەوتە هێرشکردن بۆ سەر دوژمن تا زەوی لە سەربازەکانی رۆم پاك بکاتەوە.

لەو کاتەی سلاپۆر بەردەوام بوو لە هێرشکردن بۆ سەر سەربازانی رۆم کە ریزەکانیان دووچاری شڵەژان ببوون، چوونکە قۆڵپۆششی نەبوو، تەورێك بەر سەرووی قۆڵی کەوت، قۆڵی بە ئاسن دانەپۆشرا بوو، لێدانی تەورەکەش زۆر بەهێز بوو، بۆیە قۆڵی سلاپۆر لە لەشی جیا بۆوە و دەستی کەوتە سەر زەوی.

ئەگەر ئەو زەربەیە بەر من کەوتبایە، لەبەر ئازاری تووند دەکەوتم، بەڵام سلاپۆر نەکەوت، ئەو داوای لە پزیشکی لەشکرەکەی کرد تا قۆڵی بە کەتیرە بپێچن تا خوێنی لێ نەیێت. پزیشك دوای ئەوەی قۆڵی سلاپۆری پێچا، دەستەکەی کە لەسەر زەوی کەوتبوو هەڵگرتەوە.

سلاپۆر وتی دەتەوێت چ لەو دەستە بکەی؟.

پزیشك وتی: ئەو دەستە زۆر بەنرخە و پێویستە بپارێزرێت.

سلاپۆر وتی: تازە دەستی بڕاو بۆ من هیچ بایەخی نییە و بە دەستەکەی دیکەی لە شەڕکردن بەردەوام بوو، بەڵام نێزیکەی نیو کاتژمێر دوای ئەو ڕووداوە، زەربەی تەورێکی دیکە بەر ڕانی راستی کەوت و لە لەشی دابڕی و ئەو پیاوە ئاسنینە، چیدیکە نەیتوانی لەسەر قاچ بوەستێت و کەوت، بەڵام لەوکاتەدا نەتەنیا لە هەردوولای مەیدانی جەنگی ئۆرلین، بگرە لە نێوەڕاستیشدا شکستی رۆمەکان دەرکەوتبوو.

١. ئەوانەی لەگەڵ سلاپۆردا بوون، توانیان ئەو لە مەیدانی جەنگ دەربکەن، پاش دەمژمێرێکی دیکە لە شەڕکردن، جەنگ بە شکستی ئۆرلین کۆتایی هات و ئۆرلین بۆ ئەوەی دیل نەکرێت، لەگەڵ بەشێك لە لەشکرەکەی لە مەیدانی جەنگ هەڵات و بەشێکی زۆری سەربازی لژیۆنەکانی دەرەوەی رۆم بە دیل گیران، بەڵام سەربازە لژیۆنە رۆمەکان، هەندێکیان کوژران و ئەوانی دیکە توانیان خۆیان لە کوژران رزگار بکەن و تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەمیان بە دیل گیران.

ئەگەر سلاپۆر نەکەوتبایە، بەدووی ئۆرلین دەکەوت تا دیلی دەکرد، ئۆرلین لە دۆخێکدا هەڵاتبوو کە نەیدەتوانی بە خێرایی دوورکەوێتەوە، ئەگەر سەردارێکی لێهاتووی وەك سلاپۆر

هەبووایە، دەیتوانی بەدووی ئەو پیاوە بکەوێت تا دیلی دەکات، بەڵام لە نێوان ئەفسەرەکانم لە پالمیر پیاوێکی لەو چەشنە نەبوو، بۆیە ئۆرلین توانی رابکات.[1]

سلاپۆر پێش ئەوەی توانای خۆی لە دەست بدات، داوای کرد تا نووسەرێك هات و راپۆرتێکی لەبارەی جەنگەکەی و شکستی ئیمپراتۆری رۆم نووسی.

لە کۆتایی راپۆرتەکەیدا سلاپۆر نووسی بووی: من لە تەواوی تەمەنم تەنیا خزمەتی تۆم کرد، هیچ پاشکەوتم نەبوو، بۆیە ئێستە کە دەمرم هیچم نییە و منداڵەکانم بە ئێوە کە پاشای ئێران و دەرەوەی ئێرانن، دەسپێرم.

چەند رۆژێك دوای ئەوەی پەیکی هەڵگری نامەکەی سلاپۆر کەوتەرێ، سلاپۆر کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەوەی هەواڵی مردنی سلاپۆرم بۆ هات، فەرمانم کرد تا تەرمەکەی بێتەوە بۆ ئێران و لە شوێنی لە دایکبوونی بنێژرێت و کورە گەورەکەی لە خزمەت مندا ئەفسەر بوو، ئەو منداڵانەشی کە تەمەنیان گەورە بوو، دەیانتوانی کار بکەن، ئەرکم بە هەموویان سپارد و فەرمانم کرد تا پەنجا ساڵ مووچەی سلاپۆر بەردەوام بکرێت و بدرێتە منداڵەکانی، دەزانم ئەوانەی دوای من دەبنە دەسەڵاتداری ئێران و وڵاتە ژێردەستەکانی، لە کوڕانی من دەبن و فەرمانی منیان لەلا دروستە و مووچەی سلاپۆر تا پەنجا ساڵی دیکە دەدەن بە میراتگرەکانی.

تۆ ئەو کەسەی کە ئەو کتێبەیە دەخوێنییەوە، من پێت رادەگەیەنم کە دەزانم دوای ئێستە چیم بەسەر دێت. تەمەنی من زۆر لە لاویەتیی دوور کەوتووەتەوە، دەزانم کە پێویستە خۆم ئامادە بکەم بۆ رۆیشتن بۆ نیروانا (واتە بەهەشت) و بگەمە خزمەت ئاهورامەزدا.

ناتوانم بڵێم لە تەواوی تەمەنم کاری هەڵە لەلایەن منەوە ئەنجام نەدراوە، چوونکە بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەموو وڵاتانەی بەڕێوەیان دەبم، پێویستم بە سزا و پادشتی زۆر کەس

---

(١) کریستیەن سێن لە بارەی زەنووبی و کوڕەکەی و وڵاتی پالمیر دەڵێت: "کاتێك ئازینە یاخۆ ئۆدی نات کوژرا... ژنەکەی بە ناوی زەنووبی و کوڕەکەی بە ناوی (وەهب ئەلات) یاخۆ (واهیلات) دەسەڵاتیان گرتەدەست، وەهب ئەلات دەیەویست لە بەرانبەر رۆم خۆی بە سەربەخۆ بناسێنێت، لە ساڵی (٢٧١ ز) خۆی بە (ئەگۆستۆس) ناساند، بۆیە ئۆرلینی قەیسەری رۆم لەشکرێکی بەهێزی هێنایە پالمۆر، دوای بەرگرییەکی دلێرانەی کە زەنووبی کردی، ئەو شارەی گرت و وێرانی کرد، لە ساڵی ٢٧٢ زاینی زەنووبی ویستی پەنا بباتە بەر ئێرانییەکان و سەرکەوتوو نەبوو، ئەویان گرت و بردیان بۆ رۆم. ئێستەش هەندێ لە پاشماوەکانی وێرانەی ئەو دەوڵەتە بە شکۆیە ماوەتەوە. پەرتووکی "ئێران لەسەردەمی ساسانییەکان، چاپی دووەم، لاپەرە ٢٥١. "زەبیحوڵڵا"

هەبووە، بەشێك لە تەمەنم لە جەنگەکاندا بردووەتە سەر، مرۆڤ هەرچەندە لە جەنگدا نەرم بێت، هەر پێویستی بە ئەوە دەبێت هەندێك توونديتيژی بنوێنێت.

هەندێ کات ناچار بوومە لەگەڵ خێڵە کێوییەکاندا بجەنگم، بۆ ئەو کارەش پێویستم بەوپەڕی توندی هەبووە، مرۆڤ ناتوانێت بە ئامۆژگاری و وتە، خێڵە کێوییەکان ناچار بکات دەست لە کوشتن و تاڵان و وێرانکردنی شار و گوندان هەڵبگرن. ئەوان لە کاتی گەیشتنیان بە باخی میوە، لە جیاتی لێکردنەوە و خواردنی میوە، دارەکانیان بە تەور دەبڕن.

پێستی دەستی هەندێ کەسی خێڵە کێوییەکان زۆر زبر بوو، دەیانتوانی ئاگر بە دەست بگرن و لە ئازاری سووتانی دەستیان دوور بن، من بۆ ڕێگرتن لە هێرشی ئەو خێڵانە بۆ سەر شوێنکەوتووانم، نەمدەتوانی نەرمی بنوێنم، هەندێك جار ناچاربووم توند بم تا شوێنکەوتووانم ئاسوودە بژین، بەڵام بەرانبەر نەتەوەکانی دیکە توندیم نەنواندووە و هیچ کەسم بە دەستی ئەنقەست ئازار نەداوە، خوازیارم مەزدا لەو ستەمانە ببەخشێت کە بەبێ زانین ئەنجامم داون.

من بۆ چارەسەری نەخۆشەکان، ژمارەیەك نەخۆشخانەم چێ کرد، بۆ هەریەکەشیان داهاتێکم تەرخان کرد تا بەو داهاتە خەرجی چارەسەری نەخۆشەکان بکرێت و نەخۆشە نەدارەکانیش دوای چارەسەر خەرجی گەڕانەوەشیان بۆ خەرج دەکرا.

بۆ پەرەگرتنی ئاینی مەزدا هیچ کات بەخورتی کەسم ناچار نەکردووە بێنە سەر ئەو ئاینە، بەڵام ژمارەیەکی زۆر ئاگرخانەم لە وڵاتانی ژێردەستمدا چێ کرد و هیچ دەرفەتێکم بۆ ئەو کارە لە کیس خۆم نەدا. دوای چێکردنی هەر ئاگرخانەیەك، ڕاستەوخۆ سەرپەرشتیار و خزمەتکارم بۆ دابین دەکرد و بڕێك داهاتیشم بۆ دیاری دەکرد تا بتوانن ئاگرخانەکەی پێ بەڕێوە ببەن، چوونکە نابێت ئاگری پیرۆز بخرێتە ئاگرخانە و ئەگەر خرایە ئاگرخانە، نابێت ڕێگە بە کوژانەوەی بدرێت.

پێش دەسەڵاتیی من لە هەندێ لە وڵاتەکانی ژێردەستم بە تایبەتی لە شوێنە گەرمەکاندا، جووتیاران بە دەست کەمی ئاوەوە گرفتار بوون و نەیاندەتوانی ئاوی پێویست بۆ کشتوکاڵ دابین بکەن، لە هەر شوێنێك ڕووبارێك هەبووایە، شوێن بۆ چێکردنی بەنداو هەبووایە، بەنداوم دروست دەکرد تا ئاو پاشەکەوت بکەن، لە ناوچەی شووشیان (خۆزستان) هێندەم بەنداو بیناکرد کە جووتیارەکانی ئەوێ ئاوی تەواویان دەست کەوت، ئێستە بە ڕادەیەك چاندنی قامیشی شەکر لەوێندەر زۆر بووە کە هەموو جووتیاران بە توانان، ئەوان شەکر لە قامیشی شەکر بەرهەم دێنن و بە وڵاتانی دیکەی دەفرۆشن.

به درێژایی چوار سەدە لە ئێران و وڵاتانی ژێردەستیدا یاسای دیاریکراو و دادپەروەرانە نەبوو، تا ئەوکاتەی باوکم ئەردەشێری مەزداپەرست هاتە سەر تەختی پاشایەتیی و هەوڵیدا کۆمەڵە یاسایەك دابڕێژێت کە دادپەروەرانە بن و بە ویستی دەسەڵاتداران نەگۆڕێن، بەڵام بابم هێندە پڕ ئیش بوو کە نەیتوانی ئەوکارە تەواو بکات، لە سەردەمی مندا کۆکردنەوەی تەواوی ئاڤێستا کۆتایی هات، هاوکات لە سەردەمی مندا یاسا گشتییەکان کۆکرانەوە و من ئەوکارم ئەنجامدا تا ئەوانەی لە دوای منەوە دێن، نەتوانن بە ویستی خۆیان یاساکان بگۆڕن.

یەکێك لە کارە باشەکانم ڕێگەگرتن بوو لە مایەپووچ بوونی جووتیارانمان بە هۆی هێرشی کوللە بۆ سەر کێڵگەکانیان، بۆ ئەوەش بڕیارمدا هەموو ساڵێك دوای کۆکردنەوەی بەرهەم لەلایەن جووتیارانەوە، بەشێکی کەم لە بەرهەمەکانیان وەربگیرێت، بەشێکیش لە گەنجینەی من بخرێتە سەریان تا لە کاتی هێرشی کوللەدا ئەو پاشکەوتانە بدرێتەوە بە جووتیاران.

لەو ڕۆژەوە کە من جڵەوی دەسەڵاتیی ئێران و وڵاتانی ژێردەستەیەم لە ئەستۆدایە، ڕێگەم نەداوە هیچ یەکێك لەو وڵاتانەی ڕاستەوخۆ یاخۆ ناڕاستەوخۆ لەژێر پارێزگاری مندان بکەونەبەر مەترسی، ئەگەر یەکێك لەو وڵاتانەش کەوتبێتە بەر هەڕەشە و پەلامار، ڕاستەوخۆ بۆ یارمەتییان چووم، بەردەوامیش سزای لایەنی پەلامارده‌رم داوە. چاوەڕوانیشم لە نەوەکانم کە دوای من لە ئێران و وڵاتانی ژێردەستی فەرمانڕەوا دەبن، هەمان ئەو ئەرکە بەردەوام بکەن تا لە سنووری پاشایەتییەکەمان بەردەوام ئاشتی پارێزراو بێت.

لەو ڕۆژەوە کە لە جیاتی باوکم بوومەتە پاشا، بەردەوام تەواوی چینەکانی کۆمەڵگەم بە یەك چاو سەیر کردووە و نەمویستووە هیچیان بەسەر ئەوی دیکەدا بسەپێنم.

لە سەردەمی پاشایەتیمدا شاری زۆرم بینا کردوون، لە شارەکانیشدا بۆ چێکردنی خانووەکان، بەردەوام باشترین کەرەستەکانم بەکار بردووە تا خانووەکان تەمەنیان پتر بێت.

کاتێك یەکێك لە شارەکان تەواو دەبوو، بانگهێشتی خەڵکم دەکرد بۆ ئەوەی لەو شارانە نیشتەجێ بن، هەرگیز بە زۆر کەسم لەو شارانە نیشتەجێ نەکردووە. بۆ ئەوەی هاووڵاتیان بچنە ئەو شارانەوە، بەردەوام خانووەکانم بەو نرخە دەدانێ کە تێچووی بووە، پارەکەشم بە یەکجار وەرنەدەگرت، من ئەو کارەم نەدەکرد تا سەرمایەی پێ کەڵەکە بکەم، دەمویست ئەوانەی لە بیابانەکانن بێن و لەو شارانەدا خانوو بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن، من ئەو کارە لە خورۆ واتە کوروش کە یەکێکە لە پاشا گەورەکانی ئێران لە پێش من بووە فێر بووم. دوای ئەوەی چەند

شارێکم بیناکرد، ئارەزووم بۆ چێکردنی شار پتر بوو، چوونکە دەمبینی لە لایەك خەڵك پەناگەی دەست دەکەوێت، لە لایەکی دیکەیش بیناکردنی شارەکان یارمەتی ئاوەدانی دەدا.

لە رێگەی مووغەکانەوە خەڵکم بۆ رێگەی راست بانگهێشت کرد و داوام لێ کردن تا بگەڕێنەوە بۆ نەریتی باو و باپیرانیان، درۆ نەکەن و دەستدرێژی نەکەنە سەر ماڵی خەڵکی دیکە و سووکایەتی بە یەکدیی نەکەن. ئێستە کە تەمەنم لە لاویەتیی تێپەڕاندووە، دەبینم مۆچیارییەکانم باش بوون و جێگەی خۆیان گرتوو، نها درۆ، ستەم و سووکی کەم بۆتەوە، خوازیارم بە تەواوەتی بنبڕ ببن.

بیری چاك، وتە و کرداری چاك لە ئێران خەریك بوو لەنێودەچوو، من جارێکی دیکە ئەو خەسڵەتانە کە مەزدا رایسپارد بوون بۆ خەڵکی ئێرانم گەڕاندەوە، هەندێ نەریتی ناشایستەش کە لە نەتەوەکانی دەرەوەی ئێرانەوە هاتبوون، ریشەکێشم کردن و نەمهێشتن، لە دوورگە دوورەکانی رۆژهەڵاتەوە تۆی دارەکان و ڕووەکە دەرمانییەکانم هێنا و لە وڵاتە گەرمەکانی ئێران چاندم. لە وڵاتی چینەوە داری کافۆرم هێنا، هەر لە ئەوێشەوە چەند کەسێکم هێنا و شوێنی ژیانم بۆ دابین کردن تا ئێرانییەکان فێر بکەن کە چۆن داری کافۆر لە رێگەی دلۆپاندنەوە (بە هەڵم کردن) بکەن بە (حنوت) تا بۆ مردووەکان بەکاربێت.

دەمزانی خورما لەو نعمەتانەیە کە مەزدا پێمانی بەخشیوە، زۆر کەس دەکارن خۆراکی خۆیانی لێوە بەدەست بێنن، بۆیە پەروەردەکردنی ئەو دارەم تا ئەو رادەیە پەرە پێدا کە لە ماوەی دەسەڵاتیی مندا بیست جار سەد هەزار داری خورما لە شوێنە گەرمەکانی ئێران گەورە بوون و بەرهەمیان داا.

کارێکی دیکەی سەردەمی من گەڕاندنەوەی متمانە بوو بە پارەی زێڕ و زیو تا کاری بازرگانان و سەوداکاران ئاسان بێت.

لە ماوەی چوار سەدەدا لە وڵاتانی ژێردەستی ئێران زێڕ و زیو متمانەیان پێ نەدەکرا، لەو چوار سەدەیەدا ئێران دابەش ببوو بەسەر وڵاتانی بچووك، هەر وڵاتێك پاشای خۆی هەبوو، چوونکە بەشێك لەو پاشایانە سەرمایەیان نەبوو، هەندێکیان هەڵدەستان بە بەرزکردنەوەی عەیاری زێڕ و زیو و فێڵیان دەکرد، لە ئاکامدا کەس پارەی ئێرانی نەدەویست. بازرگانان دراوی بیانیان وەردەگرت، ئەگەر دراوی دەرەوە نەبووایە، ئەوکات سەوداییان بە کاڵا گۆڕینەوە دەکرد، هەرچەندە ئەوەیان ماندووبوونی هەبوو، بەڵام لە بەرانبەردا باوەڕ پێکراوتر بوو.

لە گوندەکاندا بەپێی نەریتی کۆن کەس پارەی پێویست نەبوو، خەڵك کاڵای دەهەمبەر کاڵا دەگۆڕییەوە، بەڵام لە شار خەڵك زێڕ و خشڵی پێویست بوو، بازرگانانیش بۆ ساتوسەوداییکردن

لە دەرەوەی وڵات پێویستیان بە زێڕ و خشڵ بوو، ئەوان هەرکات پێویستی پارەیان بووایە، سەوداییان بە دراوەکانی دەرەوە دەکرد.

دوای ئەوەی باوکم ئەردەشێری مەزداپەرست هاتەسەر دەسەڵات، هەوڵیدا تا ئەو دراوە ساختانە کۆبکاتەوە و دراوی دروستیان بخاتەجێ، بەڵام تەمەنی ئەو بۆ ئەوکارە بەشی نەکرد، من درێژەپێدەری کارەکەی بووم، لە هەر وڵاتێکی ئێران و بەردەستی ئێران کە کانی زێڕ هەبووایە، بەرهەممان دەهێنا تا زێڕ زۆر ببێت، هەندێك لە کانگەکان بە هۆی سەختی و دژواری دەرهێنانی زێڕ لێیانەوە، بەجێ هێڵدرابوون، لە تەواوی کانگەکانی دیکەیش بەردەوام بووم لە بەرهەم هێنانی زێڕ، تا ئێستەش بەرهەم هێنان بەردەوامە لەو کانگەیانەدا.

بە هەمان ڕێژە کە زێڕمان دەست دەکەت، دراوی ساختەمان کۆدەکردەوە و دراوی دروستمان دەخستە نێو بازاڕ، فەرمانڕەواکانم لە تەواوی سنووری ژێردەستمدا شوێنی سککە لێدانیان هەیە، سککەی دروست لێدەدەن، ئەوان دەزانن ئەگەر دراوی ساختە لێ بدەن بە سەختی سزایان دەدەم، بۆیە بەرە بەرە دراوی ساختە لە بازاڕەکاندا نەما و دراوی دروست هاتە شوێنی. ئەی ئەو کەسەی ئەو کەتیبەیە دەخوێنیتەوە، بزانە کە لە ئێستەدا لە ئێران دراوی ساختە نەماوە، جگە لە گوندەکان کە نەریتی باوی کۆنە، کەس لە شارەکاندا سەودایی بە کاڵا ناکات و هەمووان بەو دراوە سەودایی دەکەن کە لە شوێنەکانی سککە لێدانی وڵاتەکانم بەرهەم دێت و کەس سەودایی بە دراوەکانی دەرەوەش ناکات.

کارێکی دیکەی من ڕزگارکردنی خەڵکی باشووری بەکتریا بوو لە دەست ئەژدیها[٢]، لەو کاتەوە کە وڵاتی بەکتریا هەبوو، خەڵکی ئەو شوێنە کەوتبوونە بەر مەترسی ئەژدیها، تا دەهات ژمارەی ئەژدیهاکان زۆر دەبوو، چوونکە ئەژدیهای مێیە هەر وەك مریشك هێلکە دەکات، هەرجارە و چەندان هێلکە دەکات کە لە هەر هێلکەیەك بێچووە ئەژدیهایەك دێتە دەرێ. بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ژمارەیەك لەو سەربازانەم کە بەرگی ئاسنینیان لەبەر بوو، نارد بۆ ئەوێ و پێموتن تا ئەو ڕۆژەی تاکە ئەژدیهایەك مابێت دەبێ لە ئەو شوێنە بن، دوای ئەوەی بە تەواوەتیی لەنێویان بردن، بگەڕێنەوە.

---

(٢) ئەوەی لە رابردوو بە ئەژدیها ناسرابوون، بریتی بوون لە سەرمازەڵەی گەورە کە قاچی درێژیان هەبوو، زمانیان سوور بوو، ئەوان زمانیان لە زاریان دەردەهێنا و بە خێرایی بایان دەدا و لە دوورەوە وا دەردەکەوت کە ئاگر لە زاریان دێتەدەر، ترسی خەڵك تەنیا لە گەورەیی و ناشیرینی ئەو گیانلەبەرە بوو، ئەگەرنا ئەو ئاژەڵە هیچ مەترسییەکی نەبوو بۆ سەر مرۆڤ، تەنانەت سوودەشی هەبوو کە جرجی دەخوارد. "زەبیحوڵڵا"

سەربازە ئاسن پۆشەکانم رۆیشتن بۆ جەنگی ئەو ئاژەڵە مەترسیدارە، چوونکە بەرگی ئاسنیان لەبەردا بوو، لە ئاگری ئەو نەترسان و بە شمشێری دوودەم هێرشیان دەکردە سەریان و دەیانکوشتن. ئەوان ماوەی چەندین ساڵ لە باشووری بەکتریا مانەوە، نیزیکەی پێنج سەد ئەژدیهایان کوشت، دوای ئەوەی زانیان نەوەی ئەو ئاژەڵە کۆتایی هاتووە، گەڕانەوە.

دوای گەیشتنم بە دەسەڵات بۆم دەرکەوت کە لە وڵاتەکەمدا تەنیا هۆکار بۆ دەوڵەمەندی برێتی نییە لە زێڕ و خشڵ و کێڵگە و پەروەردەی ئاژەڵی خۆماڵی، بگرە راوی ئاژەڵی کێویش یارمەتی خەڵك دەدات بۆ دەستەبەرکردنی داهات و سەرمایە. بۆیە لە هەندێ لە وڵاتەکان راوم بە یەکجارەکی یاساخ کرد، لە هەندێکیشیان بۆ ماوەی چەند ساڵێك ئەو کارەم کرد، چوونکە لە چوار سەدەی دەسەڵاتیی ئەشکانییەکاندا بە رادەیەك راوی ئاژەڵە کێوییەکان کرا بوو کە رەگەزی هەندێك لە ئەوان لەنێو چوون. چەند جۆرێکی مەڕی کێوی کە لە وڵاتەکانی ژێردەستی ساسانی هەبوون لە ماوەی ئەو چوار سەدەیە بە تەواوەتی لەنێو چووبوون، رەگەزی کەرگەدەن و زەررافە لە لەوەڕگە گەورەکانی ئەو خاکە فرەوانەدا نەمابوون، بۆیە هەوڵمدا ئەو ئاژەڵانەی مابوون بپارێزم، بۆ ئەو مەبەستەش تا ببمە سەرمەشقی خەڵك، ماوەی چەند ساڵێك نە خۆم راوی ئاژەڵە کێوییەکانم کرد، نە مۆڵەتی راوکردنم بە کوڕەکانمدا.

بەو هۆیەوە ئەو ئاژەڵە کێویانەی رەگەزیان لەنێو نەچووبوون، لەو ماوەیەدا تا ئەو رادەیە زیاد بوونەوە کە بۆ خەڵکی ناوچە جیاکان بوونە مایەی سەرئێشە، بۆ نموونە زۆربوونی گورگ و بەراز و چەقەڵ بۆ جووتیاران ببوونە مەترسی، بەرازەکان هێرشیان دەکردە سەر کێڵگەکان، گورگەکانیش پەلاماری مێگەلە مەڕەکانیان دەدا، چەقەڵەکانیش ببوونە بەلاّ بۆ کاڵەك و ترێ، بۆیە رێگەمدا تا ئەو ئاژەڵان راوبکرێن.

بە گشتیی شێوەی سەودایی من لە بەرانبەر راوکردنی ئاژەڵە کێوییەکان بووە هۆی ئەوەی رەگەزی ئەو ئاژەڵانەی لە سەردەمی دەسەڵاتیی ئەشکانییەکان لەسەر خاکی ئێران لەنێو چوو بوون، دەربکەونەوە و جارێکی دیکە زۆر بنەوە.

لە سەردەمی پاشایەتیی خۆمدا بڕیارمدا تا باجی سەر جووتیار و خاوەن ئاژەڵەکان جێگیر ببێت، هیچ کات باجی وڵاتم بەو کەسانە نەدا کە باجیان بە مەبەستی سەودایی لە پێشدا دەکڕیەوە، چوونکە دەمزانی ئەوان دوای ئەوەی لە کیسەی خۆیان باج لە جیاتی جووتیار و خاوەن ئاژەڵەکان دەدەن، دواتر چەند بەرانبەری ئەو باجە لە خەڵك دەستێنن، بۆیە نابێت چاوەڕوان بین ئەو کەسانە بەزەییان بە خەڵکی ئاساییدا بێتەوە و باجی کەمیان لێ وەربگرن،

نابێت لەو کەسانە چاوەڕوان بین کە هەروا بە ئاسانی ئەو باجە دادپەروەرانەی کە دیاری کراوە، لە ئەوان وەربگرنەوە.

لە سەردەمی دەسەڵاتمدا بڕیارمدا جووتیاران و ئاژەڵدارەکان و سەوداکاران لە کاتی دیاریکراودا باج بدەن، واتە ئەوکاتەی کە بەرهەمەکەیان دێتەبەر، ئەگەر نەیان هێنابووایە، ئەو کات فەرمانبەرانی باج بۆ وەرگرتنی باج دەچوون.

بەپێی ئەزموون ئەگەر جووتیاران و ئاژەڵدارەکان لە کاتی خۆیدا باجیان بە دراو یاخۆ بە کاڵا نەدا بووایە، دەزانرا دووچاری بەڵا بوونە یاخۆ ڕێگرێك هەبووە کە نەیانتوانیوە لە کاتی خۆیدا باج بدەن، بۆیە کەس گووشاری نەدەخستنە سەریان تا باج بدەن. تەنانەت ئەگەر کاتی باج بە سەر چووبایە دیسان باجگر گووشاری نەدەخستە سەریان، تەنیا لەوکاتانەدا نەبێت کە باجگرەکان بە ئەنقەست خەڵکیان ناڕاحەت کردبایە و من هەندێ سیخووڕم دانابوون تا ئاگەداربم لە شێوەی هەڵسووکەوتی ئەوان لەگەڵ خەڵکدا. ئەو باجگرەی زۆرتر لە ڕێژەی دیاریکراو باجی وەرگرتبایە تا زیادەکەی بۆ سوودی خۆی بێت، دەکەوتە بەر سزای تووند و سەرمایەکەی داگیر دەکرا و خۆشی دەکوژرا، تەنیا بڕێك لە سەرمایەکەی بۆ بژێوی ژن و منداڵەکانی جێدەهێڵدرا، ئەوەی دیکەش دەستی بە سەردا دەگیرا.

ناوی وڵاتەکانی ئێران و ژێردەستەی ئێران لە کەتیبەکەمدا دەکەوێتە بەر دیدەی هەندێ لەو ڕێبوارانەی کەتیبەکەم دەبینن، ئەو وڵاتانە بەشێکیان ڕاستەوخۆ لەلایەن خۆم بەڕێوە دەچن، ئەوانی دیکەیش لەلایەن دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانەوە بەڕێوە دەبرێن، من باج لە هیچ کامیان وەرناگرم. تەنیا ئەگەر وڵاتێك لەوانە نەریتی دۆستایەتیی شکاند و کەوتە بەرەی دوژمن، ئەوسا بۆ تەنبێ کردنیان باجیان لێ وەردەگرم.

لە سەردەمی دەسەڵاتمدا یارمەتی تەواوی ئەو پیشەوەرانەم دەدا کە لە دەرەوەی ئێران دەهاتن، لە وڵاتی مندا تاکە پیشەوەرێك نییە کە کێشەی ژیانی هەبێت جا چ ئێرانی بێت یاخۆ هی دەرەوەی ئێران.

هەر پیشەوەرێك کە هاتبایە یەکێك لەو وڵاتانەی ڕاستەوخۆ لەژێردەستی خۆم بوو، فەرمانڕەوای ناوچەکە دەبووایە پارەی بۆ دەستەبەر بکات تا بتوانێت ئەو پیشەیە دابمەزرێنێت کە هەیەتی، ئەگەر لە ئەوێ کارێك نەبێت کە لەگەڵ پیشەکەی ئەودا بگونجێت، فەرمانڕەوای ناوچەکە دەبووایە بینێرێت بۆ ئەو وڵاتەی ئێران کە پێویستیان بە پیشەکەیەتی و خەرجی ڕێگەشی بۆ دابین بکات. لە کاتێکدا ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم زۆر جار لەگەڵ مندا جەنگاون، بەڵام

ئێستە ژمارەیەکی زۆر لە پیشەوەرە رۆمەکان لە وڵاتەکانم کار دەکەن، هۆیەکەشی ئەوەیە کە من تەنانەت پیشەوەرەکانی دەوڵەتە دوژمنەکانیشم لە وڵاتەکەم وەردەگرم.

لە کاتی دەسەڵاتمدا تەواوی ئەو بابەتانەی دەمزانی بۆ وڵاتەکەم بەکەڵکن، لە هەر شوێنێك بمدیتبایە، دەمهێنا بۆ ئێران. لە رۆمیانەوە بینیم کە شووشەیان لە پەنجەرەکان دەخست تا نێو ژوورەکان ڕووناکتر ببێتەوە، منیش ئەو شێوازەم لە ئێران پەرە پێدا.

پێش من لە وڵاتانی ئێران، بە تایبەتی لە زستان بۆ ئەوەی سەرما و سۆڵە نەیەتە ژوورەوە، دەرگەکانیان دادەخست و ژورەکان تاریك دەبوون، ناچار دەبوون چرا داگیرسێنن تا ژوورەکە ڕووناك ببێتەوە، بەڵام ژوورەکانی خانووەکانی من بە تەواوی ڕووناك بوون، چوونکە لە خانووەکانی مندا جامی زێڕ لە پەنجەرەکان هەبوو.(٣) بەڵام خەڵکی ئاسایی ناتوانن بۆ پەنجەرەی ژوورەکانیان جامی زێڕ دابین بکەن، چوونکە گرانە و ناچارن بەرگەی تاریکی رۆژانی زستان بگرن کە هەوا ساردە. بۆیە جامی شووشەم لە تەواوی ئێران پەرە پێدا تا هەمووان لە خانووەکانیاندا جامی شووشە بەکار بێنن، ئێستە لە تەواوی ئێران شووشە بەکاردێت.

زانیاریم وەرگرت کە لە وڵاتانی رۆم خەڵك زۆر سوود لە زەیتوون وەردەگرن و ڕۆنی زەیتوون یارمەتیدەرێکی باشی خۆراکی ئەوانە، لە کاتێکدا لە وڵاتانی ئێران زەیتوون نییە. بە رادەیەك چاندنی زەیتوونم لە وڵاتەکەم پەرەپێدا کە ئێستە نەتەنیا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکەکەم ڕۆنی زەیتوون دەخۆن، بگرە زیادەی بەرهەمی ڕۆنی زەیتوون لە ڕێگەی دەریاوە بۆ هیندستان دەڕوات و پەلکی داری زەیتوونیش دوای ئەوەی وشك دەکرێتەوە بۆ هیندستان دەنێردرێت، چوونکە خەڵکی هیندستان وشك کراوەی پەلکی داری زەیتوونیان لە چارەسەری هەندێ نەخۆشی بەکاردەبرد.

لە ماوەی چوار سەدەی دەسەڵاتداری ئەشکانییەکان لە تەواوی وڵاتدا دادگە نەبوو، من بڕیارمدا دادگەکان بەپێی تایبەتمەندی دابمەزرێن، بۆ هەر دادگەیەکیش لە چینی تایبەت بە خۆیان و لەنێویاندا لەلایەن خۆیان دادوەر دیاری دەکرا. ماوە ماوەش دادوەرەکان لەلایەن چینەکانەوە دەگۆڕدران، چوونکە دەمزانی ئەگەر دادوەرەکان بۆ ماوەیەکی زۆر لە شوێنێك بمێننەوە، بەهێز دەبن و مافی لاوازەکان پێشێل دەکەن. جگە لە دادوەرەکانی چینە جیاکان، هەندێ دادوەریش کە بە دادوەری پاشایەتیی ناو دەبران لەلایەن خۆمەوە دیاری دەکران.

---

(٣) زێڕ زۆر تەنك دەکرێتەوە تا ئەو رادەیە کە تیشکی رووناکی بەنێویدا تێپەڕ ببێت، ئەوکات لە پەنجەرەی ژوورەکان دەبەسترێن. "زەبیحوڵڵا"

دادوەرەکانی پاشایەتیی بەو سکالآیانە رادەگەیشتن کە لە نێوان چینە جیاکاندا ڕوویان دەدا، ئەوانیش لەلایەن منەوە ماوە ماوە دەگۆڕدران، دەمزانی ئەگەر زۆر لەو پایەیە بمێننەوە، دەست رۆیشتوو دەبن و مافی خەڵك پێشێل دەکەن.

وەرزش خەسڵەتێکی دیکە بوو لەو بابەتانەی من لە بێگانەکانم وەرگرت، بەڵام من وەرزشم بە شێوەی ڕاستەوخۆ لە یۆنانییەکان وەرنەگرت، بگرە مانی بووە هۆکار بۆ ئەوەی وەرزش لە یۆنانییەکان وەربگرم و لە وڵاتەکانمدا پەرەی پێ بدەم، منیش بە تایبەتی لەنێو ئەفسەر و سەربازەکانم پەرەم پێدا، چوونکە بۆ ئەوان بە سوود بوو و چالاکی دەکردن.

ئێستە هەست دەکەم تەمەنم لە کۆتاییدایە و پێویستە بەرەو نێروانا (بەهەشت) بڕۆم، بەڵام لە ئێران شوێنی زۆر ئاوەدان بەجێ دەهێڵم و لەو ئاوەدانیانە بە هۆی ئەو دادپەروەرییەی من دامەزراندووە، چینە جیاوازەکانی وڵاتەکەم لە ئاسوودەییدا دەژین، لە تەواوی وڵاتەکەمدا تاکە سواڵکەرێك نییە، هۆکەشی ئەوەیە خەڵك لەسەر ئاینی زەردەشتین، بۆیە دادپەروەریشیان هەیە، هیچ یەکێك لە فەرمانبەرانی دیوان توانایان نییە یەك قرۆش زیادە باج وەربگرن.

باوکم ئەردەشێری مەزداپەرست دوای ئەوەی هاتەسەر تەختی پاشایەتیی بۆ هەریەکە لە فەرمانبەران و دەسەڵاتدارانی دیوان مووچەی دیاری کرد تا بۆ بەڕێوەبردنی ژیانیان ناچار نەبن بەرتیل وەربگرن و ستەم بکەن. ئەو دەیزانی ئەو نەریتانەی لە چوار سەد ساڵی بوریدا دروست بوونە، بە ئاسانی کۆتاییان پێ نایەت و پێویستی بە توندی هەیە و فەرمانی کرد هەر کەسێك بەرتیل وەربگرێت، دەکوژرێت و هەموو سامانەکەی داگیر دەکرێت، وێڕای ئەو توندوتیژیەش هێشتا هەندێ لە فەرمانبەرانی دیوانی حکوومەت بەرتیلیان وەردەگرت.

دوای ئەوەی من هاتمەسەر تەختی پاشایەتیی بڕیارمدا هەر شوێنکەوتوویەکی من کە سەردانی یەکێك لە فەرمانبەرانی دیوانەکانی من لە شارەکان بکات، ئەو فەرمانبەرە دەبێت هەر هەمان رۆژ کارەکەی بۆ ئەنجام بدات، بە پێچەوانەوە ئەگەر بیخاتە رۆژی دواتر، بە بەرتیلخۆر دادەنرێت و سزای ئەویش هەمان سزای بەرتیل خۆرە. دەمزانی هەرچەندە سزای بەرتیلخۆرەکان بەهێزتر بکەم، بەرتیلخۆری هەر دەمیچنێتەوە، چوونکە بەرتیلدەر نادوێت و دان بە بەرتیلدان نانێت.

دەمزانی هەندێ جار فەرمانبەرانی دیوان کاری هاووڵاتیان دەخەنە رۆژی دواتر تا بەو رێگەیە ناچار بە بەرتیل دانی بکەن، ئەگەر هەر لە هەمان رۆژ کارەکەی بکەن، ئیدی رێگەیەك بۆ بەرتیل وەرگرتن نایەتە ئاراوە. ئەو رێگەیە بە رادەیەك کاریگەر بوو کە لە ئێستەدا لە تەواوی سنووری من کەس ناتوانێت بەرتیل وەربگرێت، چوونکە رێگەیەك بۆ بەرتیل نەماوەتەوە.

# هورمزی یەکەم لە ڕێگەی تیسفۆن

شاپووری یەکەم کە بەسەرهاتی ژیانی خۆی لە کەتیبەکەیدا نووسیوە لەوە دەچوو کە بزانێت ژیانی لە کۆتایی نێزیك بۆتەوە.

ئەو لە ساڵی (٢٧٢ ز) و بە گریمانی زۆر بە هەمان نەخۆشی مرد کە لە ساڵی (٢٦٧ ز) بە ناچاری بۆ چارەسەری چووە هەمەدان، شوێنی ناشتنەکەی هەروەك شوێنی ناشتنی هەموو پاشاکانی ساسانی نازانین، بەڵام زانراوە کە تەرمەکەی لە شوێنێکی دوور لە شار و لەوانەشە لە بەرزایی دانرا بێت تا هەوای پاکی لێ بدات، دواتر ئێسکەکانی نێژراون. ئەو نەریتە بۆ هەمووان پێڕەو دەکرا، تەنیا لە کاتی جەنگ یاخۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە گوازراوەکانی وەك تاعوون و پەتا، ئەو نەریتە بۆ ناشتنی مردووەکان پێڕەوی لێ نەدەکرا.

بە گریمانی زۆر ئێسك و پرووسکی شاپوور و پاشاکانی دیکەی ساسانی لە گۆڕە گشتییەکان نەدەنێژران و لە گۆڕیچکەی تایبەت دەنێژران.

لەوانەیە هەروەك لە فرەنسا تەرمی تەواوی پاشاکانیان لە کڵێسای (سێن دێنیس) دەناشت، ئێسکی تەواوی پاشا ساسانییەکانیش لە شوێنێك یاخۆ چەند شوێنێك نێژرا بن، تا ئێستە لێکۆڵەرەکان نەیان توانیوە ئەو گۆڕیچکە تایبەتیانە بدۆزنەوە.

کاتێك شاپووری یەکەم کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەی هورمز کە دواتر بە هورمزی یەکەم ناسرا، لە خۆراسان فەرمانڕەوا بوو.

ناوەندی حکوومەتەکەی لە شارێك بوو کە باوکی بە ناوی (شاپوور) لە خۆراسان دروستی کرد، دواتر بە (نەیشاپوور) ناسرا. دەوترا لە پێدەشتی نەیشاپوور دوازدە هەزار نۆکەندی ئاو هەبووە کە پێ دەچێت زێدەڕۆیی زۆری تێدا کرا بێت، بەڵام گومانمان نییە کە ئەو پێدەشتە لە پێدەشتە هەرە بە پیت و فەڕەکان بوو.

لە نەیشاپوورەوە تا تیسفون کە لە کەناری ڕووباری **دیجلە** بوو، شارێیەکی گەورە هەبوو کە تەنانەت گالیسکەکانیش هاتوچۆیان دەکرد و ماوەماوە و لە شوێنە دیاریکراوەکان شوێنی پشوو هەبوو کە تیایاندا ئەسپی ئامادە هەبوو، گالیسکە حکومییەکان ئەسپەکانیان دەگۆڕی. هورمزی یەکەم بۆ ئەوەی زووتر بگاتە تیسفون بە گالیسکە کەوتەڕێ و باشی گالیسکە لە

بەرانبەر ئەسپ لەوەدا بوو کە ڕێبوار توانای هەبوو لەنێویدا بخەوێت، لە کاتێکدا سواری ئەسپ ناچارە بۆ پشوودان دابەزێت و بخەوێت.

هورمزی یەکەم لەگەڵ سەرباز و دەستوپێوەندەکانی کە ئەوانیش بە نێزیکەی چل گالیسکە دەهاتن، کەوتنەڕێ، ئەو بابەتە لە شوێنی گۆڕینی چوارپێیەکانی (بەریدخانە)[1] ڕێگەی تیسفوندا گرفتی نایەوە، چوونکە لەو شوێنانەی بۆ ئەم مەبەستە لەو ڕێگەیە هەبوون، تەنیا بۆ یەك یاخۆ دوو گالیسکە ئەسپ هەبوو، ئەوان نەیاندەتوانی ئەسپی چل گالیسکە دابین بکەن.

ئەو کاتانەی فەرمانڕەواکان ویستبایان لەو ڕێگەیەوە بڕۆن، هەواڵیان دەنارد تا ئەسپی پێویست ئامادە بکەن، بەڵام هورمزی یەکەم کە زۆر پەلەی بوو، بێ ناردنی هەواڵ کەوتەڕێ، تا ئەو کاتەی سوارکارەکان بۆ هەواڵ گەیاندن بە بەریدخانەیەکی دیکەی سەر ڕێگەگە ڕۆیشتن، هورمز کارمەندانی یەکێك لەو بەریدخانانەی بە تاوانی ئامادە نەکردنی ئەسپ کوشت، لە کاتێکدا ئەوان هیچ تاوانیان لەو بارەوە نەبوو، ئەسپیان پێ نەدرابوو تا ئامادەیان بکەن.

دوای ئەوەی کارمەندەکانیان کوشت، بە فەرمانی هورمز چوون تا لە گوندەکانی دەوروبەر ئەسپی پێویست بۆ گالیسکەکان بێنن، بەڵام ئەسپی گوندەکان کەرەستە و پێداویستیی بەستنەوەیان بە گالیسکەکانەوە نەبوو، هەر بۆیە نەدەتواندرا لە گالیسکە ببەسترێن.

وێڕای ئەوەش ئەو فەرمانی کرد تا بە پەت و شتی هاوشێوە کە لە سینگیان دەبەستن بە گالیسکەکانیانەوە ببەستن، بەڵام هەندێ لە ئەسپەکان دەرپەڕین و گوریس و پتەکانیان پساند. هورمز کە دەبووە پاشا نەیدەزانی ئەو ئەسپانەی لە گالیسکە دەبەسترێن، پێویستە ڕابهێندرێن تا بتوانن گالیسکەیان لێ ببەسترێتەوە.

بەم شێوەیە دەسەڵاتیی پاشایەتیی هورمزی یەکەم بە کوشتنی هەندێ کەسی بێتاوان کە کەمترین کێماسییان نەنواندبوو، دەستی پێکرد.

کاتێك هورمزی یەکەم گەیشتە ناوچەیەك کە ئێستە بە (دە نەمەك) ناسراوە و لە سەردەمی ساسانییەکاندا ئاواییەکی گەورە بوو. هورمزی یەکەم ناچار بوو سی و پێنج

---

(١) لە رابردوودا لەسەر ڕێگە سەرەکییەکان هەندێ شوێن بۆ پشوودان و ناردنی بەریدی میری و گۆڕینی ئەسپی دەسەڵاتداران هەبووە، کە تیایاندا ئەسپی حەساوە دراوە بە ئەوان و ئەسپە ماندووەکان وەرگیراون، وەك بەریدخانەی ئەمڕۆ بوونە. "وەرگێڕی کوردی"

گالیسکە لەو ئاواییە بەجێ بهێڵێت تا دواتر سەرنشینەکانیان خۆیان بەو بگەیەننەوە، خۆشی بە پێنج گالیسکەوە بەردەوام بوو تا گەیشتە قەزووین.

ئەو کاتەی لە قەزووین سەرگەرمی گۆڕینی ئەسپەکانی بوو، گوێ بیست بوو کە خەڵك سەبارەت بە بەهرامی برای دەئاخڤن. دیار بوو ئەو دوو قەزووینییەی سەبارەت بە بەهرام دەئاخڤان، هورمزیان نەناسی بوو، چوونکە لە جیاتی پۆشاکی پاشایەتی، جلوبەرگی خۆڵاوی لەبەربوو.

قسەی ئەوان لەبارەی ئەو پێنج گالیسکەبوو، ئەوان بیستبوویان کە ئەو گالیسکانە لە نەیشاپوورەوە هاتوون و دەچن بۆ تیسفون و کوڕی شاپووری یەکەمیان لەگەڵدایە.

ئەوان دەیانوت رۆیشتنی هورمز بۆ تیسفون بێ سوودە، چوونکە بەهرامی کوڕی شاپووری یەکەم لە تیسفون لەسەر تەختی پاشایەتیی دانیشتووە و تاجی لەسەر کردووە.

هورمز بێ ئەوەی لێکۆڵینەوە بکات و بزانێت هەواڵەکە راستە و ئەو هەواڵەی لە کوێ بە دەست گەیشتووە و چۆن ئەو هەواڵە بە خۆی نەگەیشتووە، فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد، دواتر سواری ئەسپەکەی بوو، بەرەو هەمەدان کەوتەڕێ.

ئەو رێگەیەی ئەوکات لە ساڵی (٢٧٢ ز) لە قەزووینەوە دەگەیشتە تیسفون، هەر ئەو رێگەیەیە کە ئێستە دوای تێپەڕ بوون لە هەمەدان، قەزووین بە قەسری شیرین دەبەستێتەوە، ئەو رێبوارەی ئێستە بەو رێگەیەدا دەڕوات هەر ئەو دیمەنانە دەبینێت کە رێبوارێك لە شازدە تا هەڤدە سەدە بەر لە نها دەیبینی، تەنیا یەك جیاوازیی هەبوو، واتە ئەوکات رێگەکە بە ناوەڕاستی ماهیدەشتدا دەڕۆیشت، ئێستە بە کەناری ئەو دەشتەدا دەڕوات، لە سەردەمی شاپووری یەکەم و پاشاکانی دیکەی زنجیرەی ساسانیدا ماهیدەشت گەورەترین ناوەندی پەروەردەی ئەسپەکانی میری بوو، دوای لەنێوچوونی ساسانییەکان، ئەو ناوەندییەتەی نەما و پەروەردەی ئەسپی لێ نەکرێت.

دەنگۆی دانیشتنی بەهرام لەسەر تەخت و بوونی بە پاشا، درۆ بوو، کاتێك شاپووری یەکەم مرد، بەهرام فەرمانڕەوای فارس بوو لە ئێستەخر دەژیا ئەو سەردەمە ئێستەخر پایتەختی فارس بوو، هەروەها یەکەم پایتەختی ساسانییەکان بوو، دواتر گواسترایەوە بۆ تیسفون.

بەهرام دوای مردنی باوکی لە پایتەختی خۆی دەرنەچوو، نەڕۆیشت بۆ تیسفون تا لەوێندەر لەسەر تەختی پاشایەتیی دابنیشێت و تاج بکاتە سەری، بەڵام پەیکێکی نارد بۆ تیسفون تا لە بارودۆخی پایتەخت ئاگەدار ببێتەوە.

ئەو دەیزانی دوای مردنی شاپووری بابی، دەبێت هورمزی جێنشینی ببێتە پاشا و دەیزانی هورمز لە خۆراسانە و خۆراسان زۆر دوورە لە تیسفون و ماوەیەکی پێویستە تا ئەو بتوانێت خۆی بگەیەنێتە پایتەخت لە کەناری دیجلە، لەوانەبوو بە هۆی مردنی شاپوورەوە ئاژاوە لە پایتەخت ڕوویدابووایە، ئەو دەیویست دۆخی پایتەخت بزانێت تا ئەگەر کێشە هەبووایە، بەرەو ئەوێ رۆیشتبایە و بارودۆخی رێکخستبایەوە، چوونکە ئەو وەك کوڕی شاپووری یەکەم خۆی بە بەرپرس دەزانی لە روانگەی رێکخستنەوەی پایتەخت..

دوای گەیشتنی پەیکی بەهرام بۆ ناو تیسفون، پروپاگەندە لەنێو خەڵکدا بڵاو کرایەوە کە بە زوویی بەهرام دێتە نێو تیسفون. دواتر پروپاگەندەچییەکان پروپاگەندەکەیان گەورەتر کرد و وتیان بەهرام هاتووەتە نێو تیسفون و بۆتە پاشا و تاجی لەسەر ناوە.

ئەو پروپاگەندەیە بە زوویی بڵاوبۆوە و کەس نەیویست پرسیار بکات کە ئەو کەی و لە چ رۆژێك تاجی لەسەر ناوە.

دانیشتنی پاشایەك لەسەر تەخت و تاج لەسەر نانی پاشایەك بە نهێنی نییە، کاتێك کەسێك دەبێتە پاشا، تەواوی گەورەکانی وڵات یاخۆ گەورەکانی نێو پایتەخت ئامادە دەبن و پیرۆزبایی لێ دەکەن، لە کاتێکدا کە کەس نەیبینی بوو بەهرام لەسەر تەخت دابنیشێت و تاج بکاتە سەری.

کاتێك هورمز بیستی کە براکەی لە تیسفون پاشایەتیی خۆی راگەیاندووە و تاجی لەسەر کردووە، هەوڵیدا تا لە کرماشان لەشکرێك ئامادە بکات و بەرەو تیسفون بڕوات، چوونکە پێی وابوو براکەی رێگەی نادات بچێتە نێو تیسفون یاخۆ بۆ کوشتنی ئەو لەشکر دەنێرێت.

سەرزەوی کرماشان لە سەردەمی مادەکانەوە ناوەندی نیشتەجێی خێڵەکان بوو، هەر خێڵێك سەربەخۆیی تایبەتی هەبوو، ئەندامانی هەر خێڵێك تەنیا فەرمانی لە سەرۆکی خۆی وەردەگرت و سەرۆکی خێڵ ئەمەکداری بەرانبەر بە پاشا دەردەبڕی و ئەو کاتانەی پاشا پێویستی بە سەرباز بووایە، ئەوان سەربازەکانیان لەنێو خێڵەکەیان دیاری دەکردن و خۆیان وەك فەرماندە دەچوون بۆ جەنگ، خێڵەکانی کرماشان هەروەك خێڵەکانی دیکەی ئێران هیچ جۆرە باجێکیان نەدەدا و هەمووشیان ورەی جەنگیان هەبوو.

دوای ئەوەی سەرۆك خێڵەکانی کرماشان لە هاتنی هورمز بۆ کرماشان ئاگەدار بوونەوە، چوونە لای و بە بۆنەی کۆچی دوایی باوکی سەرەخۆشیان لێکرد.

ئەوانیش بیستبوویان بەهرام لە تیسفون لەسەر تەخت دانیشتووە و تاجی لەسەر کردووە، بەڵام پاشایەتیان بە مافی هورمز دەزانی.

هورمز پێی وتن یارمەتیم بدەن تا بچمە تیسفون و بەهرام تەنبێ بکەم، دوای ئەوەی لەسەر تەختی پاشایەتیی دانیشتم ئێوە بە پاداشتی شاهانە خەڵات دەکەم، سەرۆك خێڵەکانیش وتیان بۆ فیداکاری لە ڕێگەی تۆدا ئامادەین.

لە مێژوودا نووسراوە کە هورمز بە لەشکرێکی پەنجا هەزار کەسییەوە چووەتە نێو شاری تیسفون، بەڵام (فێن گۆشمید) مامۆستای مێژووی ئێران لە زانکۆی (تۆبین گێن) ئەو ژمارەیە بە زێدەڕۆیی دادەنێت و دەڵێت: "ئەو ڕۆژەی هورمز چووە نێو کرماشان لەشکری نەبوو، ماوەی دە تا دوازدە ڕۆژ لەوێندەر مایەوە، ئەو نەیدەتوانی لەو ماوەیەدا پەنجا هەزار سەرباز لەو خێڵانە کۆ بکاتەوە کە پێویست بوو لە دەوروبەرەوە بێن، ژمارەی سەربازەکانی ئەو لەو کاتەدا کە لە کرماشان جووڵا تا بەرەو قەسری شیرین و لە ئەوێوە بەرەو تیسفون بڕوات، لەو ژمارەیە زۆر کەمتر بووە، لەوانەیە نەگەیشت بێت بە دە هەزار سەربازیش.

هورمزی یەکەم بە سوپاکەیەوە لە کرماشان بەرەو ئەو ناوچەیە کەوتەڕێ کە ئێستە بە قەسری شیرین ناسراوە و گەیشتە دەربەندێك کە ئەوکات بە (ڕەوەند) ناو دەبرا، لەوێندەر لەشکرەکەی ئەو بەرانبەر بەو شوورە بەردینە وێستان کە ئەو دەربەندەی داخست بوو بۆ ڕێگرتن لە ڕۆیشتنی ئەو.

هورمزی یەکەم کە بیستبووی بەهرامی برای بۆتە پاشا و لە جیاتی ئەو لەسەر تەخت دانیشتووە، بە بینینی ئەو شوورەیە دڵنیا بۆوە کە ئەو شوورەیە لەلایەن لەشکری بەهرام بۆ ڕێگرتن لە لەشکری ئەو چێ کراوە.

یەکێك لە سەرۆك خێڵەکانی کرماشان کە لەگەڵ هورمزدا بوو، وتی با چەند کەسێك بنێرینە سەر ئەو دوو شاخەی دەکەونە هەردوولای دەربەندەکە، تا چەند و چۆنایەتیی لەشکری بەهرامان بۆ دەربکەوێت.

هورمزی یەکەم چەند کەسێك لەو سەربازانەی کە لە سەرکەوتنی شاخ شارەزا بوون نارد تا لە سەرەوە لەبارەی بوون و چۆنییەتی ئەو لەشکرە بزانن و ئەوان دوای گەڕانەوە، وتیان چەند سوارێك لەو بەری شوورەکە هەنە.

هورمز پرسیاری کرد کە ئایا ئەو سوارانە بەرگی یەکگرتووی لەشکری ئێران و ئاڵای هەڵۆیان پێیە؟ ئەوانیش وتیان کە ئەوان نە بەرگیان یەکگرتووە و نە ئاڵای هەڵۆیان پێیە.

هورمز بڕیاریدا جارێکی دیکە ئەوان ڕەوان بکاتەوە بۆ سەر شاخەکان و پێی وتن تا شێوازی جلوبەرگ و ئەسپ و ئالاَکانیان (ئەگەر ئالاَیان لا بێت) لە بیر بهێنێت و ئەگەر چەکی قورسی وەك مەنجەنیق و گالیسکەیان هەبوو، سەرکێشی بکەن و بزانن ئەوان سەر بە چ گرووپێکن.

ئەوان جارێکی دیکە لە شاخەکان سەرکەوتن و هاتنەوە و وتیان ئەو سوارانەی لەوبەری شاخەکان دەبینرێن، بەرگی ڕەنگاورەنگیان لەبەردایە کە یەك شێوە نین، چەکی قورسیان نییە و کاسکێت و زرێیان نییە، هێندە لە دوورەوە دەبینرێت ئەوان تەنیا شمشێر و نێزەیان لایە و شێوەی جلکەکانیان دەرخەری ئەوەیە کە خەڵکی دانیشتووی ناوچەکەن.

هورمز پرسیاری لەو سەرۆك خێڵانە کرد کە لەگەڵیدا بوون: ئەو سوارانەی لەوبەری شوورەکەن لە کام خێڵەن؟.

ئەوان وتیان: لەوانەیە لە خێڵی ڕەوەند بن کە سەرۆکەکەیان بە (کوە زاد رەوەند) ناو دەبرێت.

هورمز وتی: مادام ئێوە دەیناسن، پرسیاری لێ بکەن و بزانن چی دەوێت و بۆ ڕێگەی بەسەر مندا داخستووە.

سەرۆك خێڵەکان وتیان: ئێمە لەگەڵ ئەودا هاوسنوور نین تا بیناسین و پرسیار بکەین کە بۆ ڕێگەی داخستووە و چی لە ئێوە دەوێت.

هورمز فەرمانی کرد تا بەردەکانی شوورەکە لابدەن و ڕێگەکە بۆ پەڕینەوەی لەشکرەکەی بکەنەوە، چوونکە ئێشکگرەکان هەواڵیان دابوو کە لەودیو دەربەندەکەوە کەسی لێ نییە و ئەو سوارانەی بە دوژمن دەردەکەون، لە دەرەوەی دەربەندەکە وەستاون. تا بەردەکانیان لادا شەو ڕاکشا، هورمز کە تا ئەوکات نەیدەزانی ژمارەی لەشکری بەرانبەری چەندە، نەیدەویست لەشکرەکەی دووچاری پەلامار ببێتەوە، بۆیە فەرمانیدا تا لە دەربەندەکە بهێننەوە و ئاگری زۆر بکەنەوە تا دووچاری پەلاماری لەپڕ نەبنەوە.

دەربەندی ڕەوەند، دەربەندێك بوو کە تا ڕادەیەك بە دار داپۆشرا بوو، کەوتبۆوە نێوان دوو شاخ و سەربازەکانی هورمز توانیان ژمارەیەك لەو دارانە ببڕنەوە و ئاگری گەورە بکەنەوە. هەرچەندە هاتنی ئەوان بۆ ئەو دەربەندە چاوەڕوان نەکراو بوو، بەڵام ئەوان دووچاری کەم ئاوی نەبوون و لەو شاخانە هێندە کانی هەبوو کە ئەوان بتوانن سەرەتا ئەسپەکانیان، دواتریش خۆیان تێر ئاو بکەن و نەکەونە کێشەی کەم ئاوییەوە.

بە گشتیی ئەو شەوە بۆ هورمز و سەربازەکانی بە ئارامی تێپەڕ دەبوو، بە هۆی ئەو هەموو ئاگرەی کرابوونەوە، کەس نەیدەتوانی بێتە نێو دەربەندەکە و بۆ هورمز و سەربازەکانی ببێتە مایەی کێشە و ئەوان بە ئاسوودەیی خەوتن.

هورمز بە ئاسوودەیی خەوت و لەپڕ لە دەنگی ترسناکتر لە دەنگی هەورە تریشقە و ناخۆشتر لە بوومەلەرزە بە ئاگا هاتەوە، وایزانی دنیا وێران دەبێت، چوونکە هاواری ترسناکی سەربازەکانی خۆشی بیست و وایزانی کەوتوونەتە ژێر بەردەکانی شاخەکە.

دەنگەکان لە هەردوو لای دەربەندەکەوە دەهاتن و بەرد لە هەردوو لای شاخەکانەوە دەهاتن و کاتی هاتنە خوارەوە دەنگی ئاوا تۆقێنەر و ترسێنەریان لێ بەرز دەبۆوە کە تا ئەو شەوە هورمز دەنگی ئاوا ترسناك و توندی نەبیست بوو، چوونکە بەردەکان لە هەردوولای شاخەکانەوە دەکەوتنە خوارەوە، هورمز بیری کردەوە کە بوومەلەرزە بێت، بەڵام ئەو فەرمانڕەوای خۆراسان بوو، بوومەلەرزەی بینی بوو، دەیزانی بوومەلەرزە زۆر ناخایەنێت و لەوانەیە دوای تەواوبوونی جارێکی دیکە بوومەلەرزە بێتەوە، بەڵام بە گشتیی بوومەلەرزە ماوەی زۆر ناخایەنێت. لە کاتێکدا کە ئەو بوومەلەرزەیە زۆری پێچوو، بەرد لە هەردوو شاخەکەوە دەباری و دەنگی هاوارهاواری سەربازەکانی لە ئاسماندا دەنگی دەدایەوە.

خەرمانەی ئاگرە زۆرەکان کە لە داوێنی شاخەکان کرابوونەوە، بە باشی نێو دەربەندەکە و بەشەکانی خوارەوەی شاخەکانی ڕووناك کردبۆوە، بەڵام کەس نەیدەتوانی بەشەکانی سەرەوەی شاخەکان ببینێت کە بەردەکانی لێوە دەبارین.

هورمز و ئەوانی دیکە سەرەتا بیریان کردەوە کە ئەوە داڕووخانی ئاسایی شاخەکانە، چوونکە دەیانزانی هەندێ لە شاخەکان بە شێوەی سرووشتی دووچاری داڕووخان دەبنەوە، بەڵام دواتر بۆیان دەرکەوت کە بەربوونەوەی بەردەکان لە شاخەکانەوە سرووشتی نییە و ئەو بردانە لەلایەن کەسانێکەوە کە لەسەر شاخەکانن، بۆ خوارەوە فڕێ دەدرێن، بەڵام تا ئەوان ئەو بابەتەیان بۆ دەرکەوت کە بەردەکان لەلایەن مرۆڤەکانەوە هەڵدەدرێن، ژمارەیەك لە سەربازەکانیان کوژران و بریندار بوون.

لەو کاتەدا هورمز و سەرباز و سەردارەکانی نەیاندەتوانی لای سەرەوەی شاخەکانیان ببینن، تاکە ڕێگە بۆ بەرگری ئەوە بوو کە خۆیان لە هاتنی بەردەکان رزگار بکەن، چوونکە پێشبینی دەکرا کە ئەگەر بەرەو پێشەوەی دەربەندەکە بڕۆن ئەوا بەردبارینەکە پتر دەبن، بۆیە بەرەو دواوەی دەربەندەکە پاشەکشەیان کرد، تا ماوەیەك دیسان بەردبارانەکە بۆ سەریان بەردەوام بوو، ئەوانەی

بەردبارانیان دەکردن لەسەر شاخەکانەوە بەدوایانەوە بوون، تا ئەوکاتەی سرووشتی تاشەبەردەکانی لووتکەی شاخەکان بۆیان بوو بە ڕێگر، لەبەرد بارانکردن بەردەوام بوون.

هورمز کردنەوەی ئاگری یاساخ کرد تا ئەو کەسانەی لەسەر شاخەکان بوون دیسان بەرد بارانیان نەکەن، ئەو ئەگەر زانی بووایە دووچاری ئەو ڕووداوە دەبێتەوە، بڕیاری دەدا کە بە ئاراستەی باکور یاخۆ باشووری دەربەندەکەدا بڕۆن تا دووچاری ئەو بەڵایە نەبن، هەرچەندە بەو شێوەیە ڕێگەکەی چەندین فەرسەنگ (فەرسەنگ ٦ کیلۆمەترە) دوور دەبۆوە. بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی لەلایەن ئێشکگرەکانەوە بۆ هورمز هات بوو، وای بیر دەکردەوە کە سوارەکانی ئەوبەری دەربەندەکە هێندە نین کە بۆی ببنە مایەی کێشە.

هورمز پیاوێکی بێ بەزەیی بوو، بەڵام بێ ئاگاش نەبوو لە هونەرەکانی سەربازی و دەیزانی کاتێك لەشکرێك بە دەربەندێکدا دەڕوات کە لە خاکی دوژمنەکانی بێت، دووچاری هێرش دەبێتەوە، بەڵام بیری نەدەکردەوە لە خاکی دۆستاندا هێرشی بکرێتە سەر. ئەگەر سوارەکانی ئەودیوی شاخەکە هی بەهرامی برای بوونایە، لەوانە بوو چاوەڕوانی هێرش بێت، بەڵام بۆ سوارەکانی خێڵێك کە وەك سەرۆکەکانی کرماشان وتبوویان هی ناوچەکە بن، ئەوە چاوەڕوان نەکراو بوو، هورمز پێشبینی نەدەکرد، چوونکە ئەو بەرانبەر بە خەڵکی ئەو ناوچەیە و کرماشان خراپەی نەکرد بوو تا ئەوان سوود لەو دەرفەتە وەربگرن و هەوڵی تۆڵەسەندنەوە بدەن.

دوای ئەوەی دنیا بە تەواوەتی ڕووناك بوو، هورمز ئەو سەربازانەی لە شاخ سەرکەوتن شارەزا بوون، نارد بۆ سەر شاخ و داوای کرد تا ئەوانەی لەسەر شاخەکەوە بەردیان باراندووە، دەستگیر بکەن، ئەگەر نەیانتوانی هەموویان بکوژن، بەڵام ئەوان کاتێك لە شاخەکان سەرکەوتن کەسیان لەوێندەر نەبینی، وەك پەری و بوونەوەرەکانی دیکە لەگەڵ بەرەبەیاندا ون دەبن، ون بوون و لە ئەوێندەر نەمان، بەڵام شوێنەواریان وەك کەڵەکە بەردی زۆر لەسەر شاخەکە مابۆوە و دەردەکەوت ئەگەر هورمز فەرمانی پاشەکشەی نەدابووایە، تەواوی ئەو بەردانەیان بەسەر لەشکرەکەیدا دەباراند و نیوەی لەشکرەکەیان دەکوشت.

ئەوانەی لە شاخەکان سەرکەوتن بۆیان دەرکەوت کە ئەو بەردانەی لە شاخەکە بوون، هەموویان لە شاخەکە هەڵنەکەندرا بوون، ئەوان نەیاندەتوانی ئەو هەموو بەردە بە پاچ لە شاخەکە هەڵبکەنن، زۆرینەی بەردەکانیان لە خوارەوە سەرخستبوو، بەڵام نەدەزاندرا کە ئەو بەردانەیان ڕۆژی پێشتر لە شاخەکە سەرخستبوو یاخۆ چۆنیان سەر خستبوون؟، بۆچی

ئێشکگرەکان ئەوانیان لەکاتی سەرخستنی بەردەکاندا نەبینی بوو؟، ئەگەر لە شەویشدا ئەو بەردانەیان سەرخستبوو، چۆن توانیان بە بارە بەردەکانیانەوە بگەنە سەر شاخەکان؟.

کاتێك هەواڵی سەرخستنی بەردەکان بۆ سەر شاخ گەیشتە هورمز، ئەو وتی بەردەکان لە رۆژدا سەرخراون و لە شەودا ئەو کارە ئەستەمە، چوونکە رێگەی شاخەکە باریك و لە شەوی تاریکدا ناتوانرێت ئەو کارە بکرێت، چوونکە پێویستە مەشخەڵیان پێ بێت و ئەوکات دەردەکەن، لە لایەکی دیکە تەنانەت ئەگەر مەشخەڵیشیان پێ بێت، ئەوانەی کۆڵە بەردیان لایە بە هۆی کورتی مەودای بینینیان، لە شاخ دەکەونە خوارێ.

دوای ئەوەی هورمز دڵنیابوو لەوەی کەس لەسەر شاخەکان نییە تا رێگریان بێت، فەرمانی جووڵەی لەشکرەکەیدا.

پێش ئەوەی بکەونەرێ، کوژراوەکانیان ناشت و بریندارەکانیان بەپێی تواناکانیان چارەسەر کرد، پێش دەرچوونیان لە دەربەندەکە، بینیان لەشکرێکی سوارە لە بەرانبەریان وێستاوە.

هورمز دوو کەس لە سەرۆك خێڵەکانی کرماشانی نارد تا بچن و لەگەڵ فەرماندەی لەشکری بەرانبەر دانووستاندن بکەن و پرسیاریان لێ بکەن کە بۆچی شەوی رابردوو ژمارەیەك سەربازی ئەوانیان کوشتووە و هۆی ئەو دوژمنایەتییە چییە؟، لە کاتێکدا کە ئەو دڵنیایە لەوەی هەرگیز خراپەی لەگەڵ ئەوان و تەنانەت یەك کەسیش لە دانیشتووانی ناوچەکەدا نەکردووە.

دانووستانی سەرۆك خێڵە کرماشانییەکان و فەرماندەی لەشکری بەرانبەر زۆری نەخایاند، ئەوان گەڕانەوە و وتیان: فەرماندەی ئەو لەشکرە (کوەزاد رەوەندە) و دەڵێت بابی ئێوە کاتی خۆی بابی ئەو و ژمارەیەك لە خزمەکانی کوشتووە، ئەویش ئێستە بە دەرفەت دەزانێت بۆ تۆڵەکردنەوە.

هورمز وتی: بڕۆن و پێی بڵێن باوکم دادپەروەر بووە و هیچ کات فەرمانی کوشتنی کەسی بێ تاوان دەرنەدەکردن، تەنیا ئەگەر بە هۆی کارە ناشیاوەکانەوە شیاوی کوشتن بووایە، ئەگەر فەرمانی کوژرانی باب و هەندێك لە کەسوکاری ئێوەش لەلایەن باوکی منەوە دەرچوو بێت، بە دڵنیاییەوە بۆ چەسپاندنی دادپەروەری بووە، چوونکە ئەوان خەڵکی دیکەیان کوشتووە، بۆیە بەپێی یاساکانی دادپەروەری بەرەو ڕووی مەرگ کراونەتەوە.

هێشتا هورمز بە دروستی ئاگەداری باروودۆخی تیسفونی پایتەخت نەبوو و نەیدەزانی ئایا کوەزاد خۆی هاتووەتە سەر رێی یاخۆ بە فەرمانی بەهرامی برای هاتووە. بەڵام سەرۆك خێڵەکانی نەناردە لایان، هەرچەندە بەپێی نەریتی هەموو سەردەمەکان لەبەرئەوەی کوە زاد

ڕەوەند هاتبووە سەر ڕێگەی لەشکرەکەی و زیانی پێ گەیاندبوون، دەبووایە سزا بدرێت، چوونکە ئەو لە بارودۆخی تیسفون دڵنیا نەبوو، بیری کردەوە کە ئەگەر کوە زاد ڕاوەند لەلایەن براکەیەوە ڕەوان کرابێت و بتوانێت کوە زاد لە بەهرامی برای دابڕێت، سوودی پێدەگات، ئەگەر سەربەخۆش دژایەتیی هورمزی کرد بێت دیسان وا باشترە بیکاتە دۆستی خۆی و سوودی لێ وەربگرێت بۆ شەڕی بەهرام.

سەرۆك خێڵەکانی کرماشان بە کوەزادیان وت ئەگەر بێت و دەست لە جەنگ هەڵ بگرێت و داوای لێ خۆش بوون لە هورمز بکات، هەرچەندە شەوی ڕابردوو کۆمەڵێك سەربازی لێ کوشتووە، ئەوا ئەو دەیبەخشێت، بەڵام کوەزاد دەیزانی شەوی ڕابردوو چ ژمارە سەربازی لە هورمز کوشتووە، بۆیە دەترسا ئەگەر دەست لە بەرگری هەڵبگرێت، دوای ئەوە بکوژرێت.

بەپێی نەریتی ڕابردوو ئەگەر پاشایەك ویستبایەی کەسێك کە پێویست بوو سزا بدرێت، دڵنیایی بکاتەوە کە سزای نادات و بەخشیویەتی، دیاری پاشایەتیی بۆ دەنارد کە برێتی بوو لە لە کەرەستە تایبەتیەکانی خۆی.

هورمز بۆ ئەوەی کوە زاد ڕاوەند دڵنیا بکاتەوە کە ئاسوودە بێت، کە دواتر سزای نادات، لە ڕێگەی ئەو دوو سەرۆك خێڵەی کرماشان کە دانووستاندنیان لەگەڵ کوە زاد ڕاوەنددا کرد بوو، دیارییەکی پاشایەتیی بۆ ئەو نارد، ئەویش دوای وەرگرتنی ئەو دیارییە، ڕێگەی کردەوە تا هورمز و لەشکرەکەی دەربچن، بەڵام خۆی بە دەستەوە نەدا و لەگەڵ سوارەکانیدا ڕۆیشت.

دۆخی جوگرافی ڕۆژئاوای ئێران لە ڕوانگەی گشتییەوە گۆڕانی بە سەردا نەهاتووە.

سەبارەت بە دۆخی جوگرافی ڕۆژئاوای ئێران بەڵگەیەکی مێژوویی سەرەنج ڕاکێشمان هەیە کە برێتییە لە باسی گەشتی (سێم پولی سیۆس)ی یۆنانییە، ئەو پیاوە زانایەکی یۆنان بووە و ئەندامی ئەو ئەکادیمیایە بەناوبانگەی یۆنان بووە کە لەلایەن ئەفلاتوون لە ساڵی (٣٨٧ ز) لە باخێکی نێزیك ئەسینا بینا کرا بوو، بە هەمان ناویش ناو دەبرا، ئەو زانکۆیە تا نێزیکەی (٩١٦) ساڵ بەردەوام بوو.

لە ساڵی (٥٢٩) زاینیدا (ژۆس تی نین) ئیمپراتۆری ڕۆمی بچووك (بیزانس) کە ئەسیناشی لە بەردەست بوو، بە هۆی ئەوەی کریستیانێکی توندڕۆ بوو، ئەو ئەکادیمیایەی داخست، ئەو زانایانەشی لە ئەسینا دوور خستەوە کە وانەیان لەو ئەکادیمیایە دەوتەوە، چوونکە (ژووس تی نین) ئەو وانانەی لەو ئەکادیمیایەدا دەوترانەوە بە پێچەوانەی ئاینی کریستیان دەزانی و دەیوت ئەو وانە فەلسەفییانە خەڵك دووچاری بێ باوەڕی دەکات.

شەش لەو زانایانەی لەو ئەکادیمیایە وانەیان دەگوتەوە، ڕێگەی ئێرانیان گرتەبەر و مێژووی ڕۆیشتنی ئەوان بۆ ئێران لەگەڵ ئەو بابەتانەی ئێستە باسیان دەکەین (٢٥٧) ساڵیان مەودا هەیە، واتە ئەوان دوای (٢٥٧) ساڵ لەو ڕووداوانەی لە بەردەستمانن و بە ڕێگەی نێوان دوو ڕووبارەوە هاتوونەتە ئێران و بە کرماشان و هەمەدان تێپەڕ بوون و چوونەتە خۆزستان، تا لە زانکۆی (گندی شاپوور) سەرگەرمی وانە وتنەوە بن.

(سێم پولی سیۆس)[٢] کە یەکێك بووە لەو شەش زانایەی بۆ ئێران هاتوون، گەشتنامەیەکی ورد و دروستی سەبارەت بە سرووشت و دۆخی ئەو دەڤەرەیلەی پیایاندا تێپەڕ بووە، نووسیوە، لە گەشتنامەکەی ئەودا تەنانەت ناوی هەندێ ناوچە و ئاوایی لە ڕۆژئاوای ئێران هاتوون کە هەر ئەو ناوانەن کە ئێستە هەن، بۆ نموونە وەك (هەرسین، کەرەند، رەوەند، بێستون و سییە ئاب)، (سیە ئاب) لە فارسیدا کورتکراوەی (ئاوی رەشە) کە ئەمڕۆ لە ئێران بە (قرەسوو) ناوی دەبەن کە هەمان (ئاوی ڕەش).

---

(٢) سەبارەت بەو پیاوە پێویستە باس لە بابەتێکی دیکەیش بکەین، ئەگەر باسی نەکەین مافێکی ئەو و زانکۆی مەزنی پزیشکی ئێرانمان پێشێل کردووە، سیم پولی سیۆس ئەوکاتەی مامۆستای زانکۆی گەندی شاپوور بوو دەیووت گەورەیی مردنی مرۆڤ لەوە دایە کە بە خواردن، ژەهراوی دەبێت.

ئەو وتەیە لە سەدەی شەشەمی زاینی لە بنمینچی زانکۆی گەندی شاپوور نووسراوە، ئێستە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا تەواوی زانایانی بواری زیندەوەرناسی و پزیشکەکان ئەو وتەیە پشتڕاست دەکەنەوە و هۆکاری مردن بە ژەهراوی بوونی خانەکان بە تایبەتی خانەکانی کۆئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ دەزانن.

ئەوکات لە ئێران ئازادی تەواو بۆ دەربڕینی بیروڕای زانستی هەبوو ئەو زانایە گەورەیە لە وڵاتی خۆی نەدەوێرا ئەو بابەتە باس بکات و لە ئێران باسی لەوە کرد کە مردنی مرۆڤ بە هۆی ژەهراوی بوونی خانەکانییەتی.

ئەو ئەگەر لە یۆنان ئەو بابەتەی ورووژاندبایە، بە فەرمانی ئیمپراتۆری ڕۆمی بچووك دەکوژرا، چونکە ئەو ئیمپراتۆرە بەپێی ئاینی کریستیان باوەڕی وابوو، نان برێتییە لە گۆشتی حەزرەتی مەسیح و شەرابیش برێتیە لە خوێنی ئەو، چۆن دەکرێت ئەو بیروڕایەی زانایەك پەسەند بکات کە نان و گۆشت بە هۆکاری ژەهراوی بوون دادەنێت.

ئەو باوەڕەی کریستیانەکان تەنیا وەك سونبولە و وەرگیراوەتەوە لە بیروڕایەکی گەورەی ئاینی کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنیمان نییە، بەو واتایە نایەت کە هەموو ئەوانەی نان و ئاو دەخۆن، گۆشت و خوێنی مەسیح دەخۆن، بەڵام ئیمپراتۆری ڕۆم نەیدەتوانی ئەو بابەتە تەنیا بە سونبول بزانێت و تەنیا ڕووکاری بابەتەکەی دەبینی. "زەبیحوڵڵا"

له گەشتنامەی ئەو زانایەدا باسێکی ورد لەبارەی ئاسیای بچووك و میزۆپۆتامیا و ئێران هەیە، ئەو نووسیویەتی لە تەواوی پێدەشتی بەرینی میزۆپۆتامیا تەنانەت یەك شاخ نییە و شاخەکان لە ناوچەی کارامسینەوە دەست پێدەکەن، لەوێندەر شاخێك هەیە کە بە راکا ناوی هاتووە.

دوای ئەوەی هورمز و لەشکرەکەی لە دەربەندی رەوەند پەڕینەوە و گەیشتنە نێو پێدەشتێك کە ئیدی شاخێك نەدەبینرا تا دەگەیشتنە شاخەکانی ئاسیای بچووك لە رۆژئاوا.

هورمز باوەڕی نەدەکرد کە بەبێ هیچ کێشەیەك بگاتە تیسفون، بۆیە کاتی رۆژئاوا بوون فەرمانی کرد تا لە کەناری ڕووبارێکی بچووك کە ئاوەکەی دەڕژایە نێو ڕووباری دیجلە لەشکرەکەی ئۆردووگە دامەزرێنن، هەندێ لە مێژوونووسان ئەو ڕووبارەیان بە ڕووباری دیالە دەست نیشان کردووە، لە کاتێکدا کە ڕێڕەوی هورمز وانیشان دەدات کە ئەو ڕووبارە دیالە نەبووە، ڕووباری دیالە کە لە باشوور بووە، هێشتا لەو ڕێڕەوەدا ماوەتەوە، بەڵام لە رابردوو زۆر ڕووباری دیکە هەبوون، کە ئێستە نەماون، ئەو وێنانەی لە ئاسمانەوە گیراون ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە لە سەردەمانی ڕابردوودا لە ئێران و وڵاتانی دەوروبەری کۆمەڵێك ڕووبار هەبوون، کە ئێستە وشك بوونە.[(٣)]

هورمز لە پازدەی ئۆکتۆبەری ساڵی (٢٧٢ ز) ئۆردووگەی خۆی لە کەناری ڕووبارەکە دامەزراند، ئەو بەرواره بەپێی ساڵنامەی کوردی دەبێتە نۆزدەمین ڕۆژی مانگی دووەمی پایز.

کەشوهەوا لەو وەرزەی ساڵ لەو شوێنە فێنك بوو، سەربازەکانی وەك تەواوی ئەو سەربازانەی لە ڕێپێوانی دوورەوە بەرەو شوێنی پشوودان دێن، کەوتنە ئامادەکردنی خواردن. بیابان لە هەموو لایەکەوە تا چاو بڕی دەکرد چۆڵ و هۆڵ بوو، هەتاویش دوای ئەوەی رەنگی ئەرخەوانی بە هەموو لایەکدا سەپاند، لە رۆژئاوای بیابانەکە رۆچوو، بە هۆی ئەوەی وەرزی پایز بوو، دوای ئاوابوونی ڕۆژ زۆر بە زوویی تاریکی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشا.

هورمز لە هەموو لایەك پاسەوانی دانا، لە لای رۆژئاواشەوە دەستەیەك سواری بۆ پاسەوانی بە دووری سێ کیلۆمەتر دانا، ئەو پێی وابوو ئەگەر بەهرامی برای هێرش بکات لە لای رۆژئاواوە دێت، بۆیە ئەو سوارانەی لەو شوێنە دامەزراند، تیسفون دەکەوتە رۆژئاوای

---

(٣) لە بیرمە لەو ناوچەیەی ئێستە ناوەندی کارەبای ئالستۆمی تارانی لێیە، ڕووبارێك هەبوو، من کە ئەو کات منداڵ بووم، نەدەوێرام لە وەرزی بەهار لەو ڕووبارە بپەڕمەوە، واتە گەورەکان پێیان دەووتم ئەگەر بچیە نێو ڕووبارەکە ئاو دەتبات، ئێستە ئەو ڕووبارە نەماوە. "زەبیحوڵڵا"

خێوەتگەکەی ئەو، دانانی پاسەوانی سوارەش لەو ئاراستەیە بۆ ئەوە بوو کە ئەگەر لە دوورەوە پێشەنگی لەشکرێك دەرکەوت، بە پەلە بێن و هەواڵ بگەیەنن.

دوای ئەوەی نانی ئێوارە خورا، بەر لە کاتی خەوتن، دەنگی گۆرانی وتنی پیاوانی کرماشان کە ئاوازی خەم بوو بەرز بۆوە. سێم پۆلی سیۆس لە گەشتنامەکەیدا باس دەکات کە پیاوانی خێڵەکانی کرماشان لە کاتی گۆرانی وتندا دەنگیان وەك دەنگی ئەو بایە وایە کە لە شاخەکان دەئاڵێت و بەرز دەبێتەوە، وەك ئەوەی ئەوان ئاوازەکەیان لە ئاوازی با وەرگرتبێت.

لەوانەیە ئەو وتەیە بۆ هەندێ لە ئاوازەکانی کرماشان راست بێت و میناکی خەمناکی بێت کە لە شاخەکانەوە بڵند دەبێت، بەڵام ئەوان ئاوازی خۆشی و هەڵپەڕکێشیان هەیە و بەو ئاوازانەیان هەڵدەپەرن، دوای نێزیکەی شازدە یاخۆ هەڤدە سەدە هێشتا ئەو نۆتەی ئەو ئاوازانە لە کڵێسا و پەرستگەی ئەرمەنییەکان ماون و دەبنە هۆی جۆشدانەوەی ڕۆحی مرۆڤ و چالاکی پێ دەبەخشن، تەنانەت بۆنی گوڵی کوێستانەکانی کرماشان لە بەهاردا بە هۆی ئەو ئاوازانەوە دەگەنە گوێی بیسەر، هەر وەك چۆن زانست هەرگیز کۆن نابێت، ئەو ئاوازانەش بە هەمان شێوە.

لە رابردوودا لە تەواوی خێوەتگە سەربازییەکاندا بەر لە کاتی خەو شەیپووری جەنگ لێ دەدرا، لەگەڵ دەنگی شەیپوور دەنگی گۆرانی تەواو دەبوو، بە هەمان شێوەش دەنگی گۆرانی کرماشانییەکان تەواو بوو، هەمووان دەنووستن.

دوای چەند دەمژمێرێك و لەپڕ ئەو پاسەوانانەی لای باکور بوون، هاواریان کرد و شەیپووری جەنگ لێ درا، سەربازەکان بە گورجی لە خەو ڕابوون، هەموو لایەك لە باکوریان دەڕوانی، لەوە دەچوو کە لە باکورەوە دەریایەك لە ئاگر لە ئۆردووگەکە نێزیك ببێتەوە و بە زوویی دەرکەوت کە ژمارەیەکی زۆر مەشخەڵ هەڵگر لە ئۆردووگەکە نێزیك بوونەتەوە.

هەرچەندە هەوڵیاندا بلەز خێوەتەکان کۆبکەنەوە، بەڵام نەیانتوانی تەواوی ریزەکانیان ڕێك بخەن، هورمز کە وایدەزانی براکەی واتە بەهرام هێرشی کردووەتە سەر، تا رادەیەك ئەوە بۆ ئەو چاوەڕوان نەکراو بوو.

دوای ئەوەی هێرشبەرەکان گەیشتنە نێو ئۆردووگەکە، بوونە مایەی سەرسووڕمانی هەمووان، هورمز وای بیردەکردەوە کە بەهرامی برای لە پایتەختەوە لەشکری ئێرانی هێناوە و هێرشی کردوووتە سەر، بەڵام یەك سەربازیش چییە لە سەربازەکانی ئێران نەدەچوو.

ئەو پیاوانە پرچیان درێژ و بۆر بوو، سمێڵیان فش بە هەردوولادا قەفی کردبوو، لە ڕووناکی مەشخەڵەکاندا چاوە رەشەکانیان دەبریسکانەوە.

دوای ئەوەی زانرا ئەوان سەربازی لەشکری ئێران نین، سەرەتا گریمان کرا کە لەوانەیە ئەوان هەپتاڵ بن، بەڵام بە زوویی هەمووان زانیان کە ئەوان هەپتاڵیش نین.

ئێرانییەکان هەپتاڵەکانیان دەناسی و دەیانزانی کە چاویان بچووك و کولمەکانیان بەرز و ڕووخساریان مەیلەو زەردە. زانستی رەگەزناسی لە ئێستەدا دەری خستووە کە هەپتاڵەکان لە رەگەزی (مەنگلۆ پۆئید) بوونە و لە رەگەزی مۆغۆلەکان جیا بوونەوە، بەڵام ئەو سەربازانەی ئەو شەوە هێرشیان بۆ خێوەتگەی هورمز کرد بوو، چاوی گەورەی ڕەش و ڕووخساریان سوور و سپی و رەنگی مووەکانیان بۆر بوو، لەبەرئەوەی لە سەردەمی شاپوور (گۆتەکان) لە ئەورووپاوە هاتن و بە ئاسیای بچووکدا خۆیان گەیاندە ئازەربایجان، وا مەزەندە کرا کە ئەو سەربازانە (گۆت) بن، بە زوویی دەرکەوت ئەو بیرۆکەیەش راست نییە و سەربازە هێرشبەرەکان لە نەتەوە ئەورووپاییەکان نین.

لە گەرمەی بەردەوامبوونی جەنگ لە ئۆردووگەکەدا، هورمز فەرمانی کرد تا بە هەر شێوەیەك بێت چەند سەربازێك لەوان دیل بکەن و بیانهێنن تا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکرێت و بزانرێت ئایا ئەوان کێن و لە کوێ هاتوون، چۆن ئەوان بە رۆژ، تەنانەت لە کاتی رۆژئاوابوونیش دیار نەبوون و لەپڕ دەرکەوتن.

هەر بۆیەش بە زوویی سەربازەکانی هورمز دوو سەربازی زامداری دوژمنیان بە دیل گرت و بۆ لای ئەویان برد، ئەویش پرسیاری لێ کردن کە ئێوە لە کام نەتەوەن و لە کوێوە هاتون؟، بەڵام ئەوان تێنەدەگەیشتن کە هورمز چ دەڵێت.

هورمز لە کەسانی دەوروبەری خۆی پرسیار کرد کە ئایا کەس لە زمانی ئەوان تێ دەگات، کەس نەبوو کە ئەو بابەتە بزانێت، سەرەنجام یەکێك لە کەسانی نێزیك هورمز لەو دوو برینداره نێزیك کەوتەوە و بە زمانی ئاماژە پرسیاری لێکردن کە لە کوێوە هاتون؟.

ئەوان پێش ئەوەی بئاخڤن، سەریان بۆ ئاسمان بەرز کردەوە تا ئاراستەکەیان لەسەر ئەستێرەکانەوە بزانن، دواتر ئاراستەی باکوریان دەست نیشان کرد، بەڵام لە باکور کۆمەڵێك وڵات هەبوون و نەدەزانرا ئەوان لە کام وڵاتەوە هاتوون.

دووبارە هەمان پیاو بە ئاماژە پرسیاری لێ کردنەوە کە لە کام وڵاتەوە هاتوون؟.

ئەوان وەڵامیان دایەوە لە (لاگزاس) هاتوون، ئەو کات هورمز و نێزیکەکانی زانیان ئەوان یەکێکن لە نەتەوە گەورەکانی ناوچەی قەوقاز. لە سەردەمی دەسەڵاتیی شاپوور و هورمزی کوڕیدا چەند وڵاتێك لە قەوقاز هەبوو، یەکێك لەوان لاگزاس بوو کە لە سەردەمانی دواتر بوو بە لاگزستان یان لەگزستان، واتە وڵاتی نەتەوەی (لەگزی یاخۆ لەزگی) کە تا ئێستەش لە قەوقاز و لە ناوچەی داغستان ماون.

بە هۆی نەبوونی مێژووی سەردەمی ئەشکانییەکان بە شێوازی پوخت و دروست، زانیاریمان نییە کە ئایا لە سەردەمی ئەواندا لەگزییەکان هێرشیان کردووە بۆ سەر ئێران یان نا؟، بەڵام دەزانین کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا ئەوە یەکەم هێرشی ئەوان بووە. سەربازە لەگزییەکان بە شمشێری سووك کە چەماوە بوون، دەجەنگان و لە راوەشاندنی ئەو شمشێرانە زۆر شارەزا بوون.

خەڵکی لاگزاس ئەو شمشێرە پۆڵاییینەیان لە وڵاتی خۆیان لە رێگەی تواندنەوەی ئاسن و وەبەرهێنانی پۆڵا چێ دەکرد. کورە کۆنەکانی ئاگر تواندنەوە کە ئێستەش هەندێکیان لە ئەرمەنستان و لاگزاس ماون، نیشاندەری ئەوەن کە نەتەوەکانی ئەوێ شارەزابوونە لە تواندنەوەی ئاسن و چێکردنی پۆڵا. ئەوان بە شێوازی تایبەتی خۆیان کە ئێستە بەردەست نییە، توانیویانە پۆڵاکانیان بە رادەیەك باریك و پوخت بکەنەوە کە بتوانرێت شمشێری سووکی لێ دروست بکەن بەبێ ئەوەی ئەو باریك کردنەوەیە، لە پتەوی شمشێرەکان کەم بکاتەوە، لە ئاکامدا ئەو شمشێرە سووکانە نەدەبوونە مایەی ماندووکردنی دەست و مەچەکی ئەو سەربازانە، ئەوان دەیانتوانی لە مەیداندا بەبێ ماندوو بوون، چەندین دەمژمێر شمشێر راوەشێنن.

خێڵە کوردەکانی کرماشان بە باشیان دەزانی بە نێزە بجەنگن، لەوانەیە ئەگەر لەو شەوەدا نێزەکانی ئەوان نەبووایە، لەشکری هورمز لێك دەپرژا، سەرەنجام ئەوان توانیان هێرشی لەگزیەکان کەم بکەنەوە کە بە لێهاتووییەوە شمشێریان دەوەشاند.

سەربازانی لەگزی لەپڕ بازی بەرزیان دەدا، ئەگەر لەوکاتەدا بینرا بووانە وابیر دەکرایەوە کە وەرزشکاری باڵندەن و دەیانەوێت لەگەڵ هەر بازێکدا دوو مەتر بفڕن، لەگەڵ بازداندا هەندێکات شمشێریان لە گەردنی بەرانبەریان دەدا، هەندێ جار کەللەیان دەپەڕاند و هەندێك جاریش زەربەکە هێندە بەهێز نەبوو کە سەری لێ بکاتەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش ئەو سەربازەی شمشێر بەر گەردنی دەکەوت، بە هۆی پچڕانی شادەماری قوڕگی و پچڕانی بڕبڕەی گەردنی یاخۆ یەکێك لەو دووانەوە دەمرد.

هەندێ کات سەربازە لەگزییەکان خۆیان هەڵدەدا بۆ بەردەم سەربازەکانی دوژمن و بە شمشێر لە قاچیان دەدا، زەربەکانیان هێندە بەهێز بوو کە ئەستەم بوو ئەو سەربازەی بەریدەکەت، زیندوو بمێنێت و لە ئاکامی خوێن بەربوونی زۆری برینەکەش دەکەوت و دەمرد.

هەندێ لە سەربازانی هورمز زرێیان لەبەر بوو، بەڵام هەموویان فریا نەکەوت بوون تا زرێکان بکەنە بەریان. لە رابردوودا نەریت بوو ئەوکاتەی سەربازەکان دڵنیا دەبوون کە دەکەونە جەنگەوە، دەیانزانی چ بکەن، زرێکانیان دەکردەبەر، لە هیچ لەشکرێکدا لە کاتی رۆیشتن و رێپێوان، سەربازەکان بە هۆی قورسییەوە، زرێیان نەدەکردە بەریان. ئەو شەوەش چوونکە هێرشی لەگزیەکان لە ناکاو بوو، سەربازە کرماشانییەکان زۆرینەیان نەیانتوانی زرێ بکەنە بەریان و بە زەربەی شمشێری دوژمن دەکوژران.

سەربازە کرماشانییەکان ئەو شەوە زۆر فیداکاریان نواند، بە نێزە درێژەکانیان و بە فیداکاریەکانیان توانیان پێش بە هێرشی لەگزییەکان بگرن.

ئەوان گورج و گۆڵی سەربازە لەگزییەکانیان نەبوو، بۆیە نەیاندەتوانی وەك ئەوان لە کاتی خۆهەڵداندا شمشێر رابوەشێنن، بەڵام لە بەرانبەردا وەك گاشەبەردێکی گەورەی بەهێز و پتەو و خۆڕاگر بوون. کاتێك لە شوێنی خۆیان دەوەستان و نێزەیان لە پێش خۆیانەوە دەجووڵاند، لەو گابەردانەی شاخەکان دەچوون کە لە سەریان پەروەردە ببوون. جگە لە مردن هیچ شتێکی دیکە نەیدەتوانی ئەوان لەو شوێنە بجوڵێنێت، دوای مەرگیش تەنیا ئەگەر تەرمەکانیان وەلانرا بووانە، ئەگەرنا هەر لەو شوێنە دەمانەوە و رێگەیان لە رۆیشتنی دوژمن دەگرت.

خێڵەکانی کرماشان هەر دوای ئەوەی کوڕەکانیان هێندە توانای دەبوو کە تیر و کەوانێك یاخۆ شمشیرێك بە دەستەوە بگرێت، پێیان دەوت کە دەبێت خۆی بەهێز بکات و لە پێش دوژمن هێندە خۆڕاگر بن تا دەکوژرێن،هەروەها دەیانوت کە شوێنی مردنی پیاوان گۆڕەپانی جەنگە نەوەك نێو جێگە.

ئەوان وەك هەندێ لە نەتەوەکانی دیکە شاعیر و سروودبێژیان نەبوو تا بە وتنی شیعر و سروود ورەیان بەرز بکەنەوە و هانیان بدەن، بۆ ئەوەی خۆڕاگری بکەن و دوژمن بکشێننەوە. ئازایەتیی و خۆراگری ئەوان لە بەرانبەر دوژمندا، تەنیا بەشێك بوو لە خەسڵەتەکانی پێکهاتەی خێڵەکانیان، لەوانەشە سەختی ئەو شاخانەی شوێنی ژیانیان بوو، ئەوانی ئاوا راهێنابێت.

لە سەرەتای ئەم پەڕتووکە باسمان کرد کە پاڵنەری سەرەکیی بۆ بە شاخنشین بوونی نەتەوە ئێرانییەکان، هێرشی بەردەوامی بێگانەکان بووە، لەوانەیە ئەوان ئەو چەکانەیان نەبووبێت کە دوژمنەکانیان هەیان بووە، بۆ پارێزگاری لە ژیانی ژن و منداڵەکانیان دەستیان داوەتە ژیانی شاخ و پێدەشتەکانیان بەجێ هێشتووە، ئەگەرنا ئەوان هەرگیز ترسیان لە مردن لە بەرانبەر دوژمن نەبووە.

ئەو نەتەوە هێرشبەرانەی بە گریمانی زۆر ئێرانییەکانیان کردە شاخ نشین، بە ڕای هەریەکە لە ماریژان مۆلە و گێرشمەن لە نەتەوەکانی زەرد بوون کە دانیشتووانیان یەکجار زۆرە، بەڵام ئەو زۆریەی دانیشتووان ئەوانی نەترساند و جۆری ئەو چەکانەی هەیانبوو وای کرد تا ئەوان پەنا ببەنە بەر شاخەکان، لە پێناو بەردەوامبوونی ژیانی ژن و منداڵەکانیان، ژیانی سەختی شاخ و ئاژەڵداری، بوونە هۆکار بۆ دروستبوونی ڕۆحی خۆڕاگری لە بەرانبەر دوژمنان لەنێو نەتەوەکانی ئێران.

ورەی خۆڕاگری لە بەرانبەر دوژمن لە هەموو نەتەوە ئێرانییەکاندا هەبووە، هەرگیز دانیشتووانی پێدەشتەکانی ئێران هەرەشە نەبوونە بۆ سەر دانیشتووانی شاخەکان. کەواتە ترس لە بێگانەکان بۆتە مایەی ئەوەی نەتەوە شاخ نشینەکان ئەو ورە پۆلایینە وەربگرن.

پیاوانی خێڵە کرماشانییەکان چووست و چالاك نەبوون و بازیان نەدەدا، لە خەسڵەتە بەرزەکانی جەستەی ئەوان ئەوەبوو کە هەموو کارێك بە لەسەرخۆیی ئەنجام بدەن، تەنانەت هێواش دەڕۆیشتن.

لە پێدەشتی تەخت ئەو کەسە پێش دەکەوێتەوە کە لە راکردن باشە، بەڵام ئەو کەسەی بەردەوام و هێواش دەڕوات لە شاخ پێش دەکەوێتەوە، پیاوانی کرماشان لە منداڵیەوە لە شاخ پەروەردە دەبوون، بۆیە رادەهاتن کە هێواش بڕۆن، کاتێك دەگەیشتنە تافی لاویەتیی ئیدی نەیاندەتوانی ڕابکەن، بەڵام ئازایەتیان وەك شێرێك وابوو.

هەڵبەز و دابەزی پیاوانی لەگزی لە بەرچاوی پیاوانی پڕ متمانەی کرماشان لە هەڵبەز و دابەزی مەڕەکانیان دەچوو کە بەسەر تاشە بەردەکانی شاخەکانەوە دەڕۆیشتن.

ئەو شەوە سەلمێندرا کە ئازایەتیی تەنیا لە پەروەردەی جەستە و چووست و چالاکیدا نییە، بە پلەی یەکەم ئازایەتیی واتە ورە.

چەرچڵی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا، سەبارەت بەو جەنگە نووسیویەتی: "ڕۆژێك لە ڕۆژنامەی تایمز خوێندمەوە کە یەکێك لە جەنراڵەکانمان هەموو

ڕۆژێك سەربازەكانی ناچار بە ڕاكردن بۆ مەودای شەش كیلۆمەتر دەكات، بۆ سەرۆكایەتیی سوپام نووسی كە ئایا ئەو جەنەراڵە كە ئەوان شەش كیلۆمەتر بە ڕاكردن دەدات، خۆشی رادەكات یاخۆ تەنیا فەرمان بەو كارە دەكات. ئایا ئەو نازانێت لە جەنگدا تەنیا توانای جەستەیی و چاپووكی بەس نییە، بگرە ورە و ئیرادە پتر كاریگەرە، ئەگەر تەنیا لێهاتوویی جەستەیی بەس بووایە، بە بەردەوام پاڵەوان و قارەمانەكانی وەرزشیان دەكرد بە فەرماندەی جەنگەكان".

دیسان چەرچڵ لە بیرەوەریەكانیدا دەڵێت: "یەكێك لە باشترین جەنەراڵەكانی ئێمە لە دووەمین جەنگی جیهانیدا، جەنەراڵ مۆنتێگەمری بوو كە گەیشتە پلەی مارشاڵ بە هۆی سەركەوتنی بەسەر سوپاكانی دەوڵەتانی ئاڵمان و ئیتاڵیا لە ناوچەی عەلەمەین لە باكوری ئەفریقا، دواتر بە نازناوی (لۆرد عەلەمەین) بانگ دەكرا. ئەو پیاوێكی باریكەڵە بوو كە هیچ كات وەرزشی نەكردبوو، كەس نەیبینی بوو كە هەنگاوێك بەپەلە بهاوێت، بەڵام ئەو لە تاكتیك و لە گۆڕەپانی جەنگدا یەكێك بوو لە دیارترین سەركردەكانی دووەمین جەنگی جیهانی".

ئەو شەوەش دەركەوت كە ئازایەتیی بە هاتوهاوار و خۆهەڵدان و چووست و چالاكی نییە، پیاوانی كرماشان بە لەسەرخۆیی خۆیان توانیان هێرشی لەگزیەكان تێك بشكێنن.

زەوی هێندە خوێنی ئەوانی بەسەردا رژابوو كە لەژێر ڕووناكی مەشخەڵەكاندا بە رەنگی ئەرخەوانی دەچوو، بەڵام هەرجارێك نێزەی یەكێك لە سەربازە كرماشانییەكان دەجووڵایەوە، سك یاخۆ سینگی یەكێك لە لەگزیەكانی دەدڕاند یاخۆ لە قاچ و دەستی یەكیان ڕۆدەچوو.

فەرماندەی لەشكری لەگزیەكان بە ناوی (تاراس دان) كاتێك سەرەنجیدا كە ناتوانێت هێزی خۆڕاگری كرماشانییەكان تێك بشكێنێت و زیانەكانی لەشكرەكەی بەرەو زیادبوونن، فەرمانی پاشەكشەی دەركرد. چوونكە ئەگەر بەم شێوەیە بەردەوام بووایە، لەوانەبوو نەتەنیا تەواوی سەربازەكانی دەكوژران یان بریندار دەبوون یاخۆ دیل دەكران، لەوانەبوو خۆشی دیل بكرێت.

(تاراس داس) پاشای لەگزستان بوو، كاتێك زانی بووی شاپووری یەكەم مردووە و بۆشایی لە حكوومەت هەیە، دەرفەتی بە پەسەندزانی و بۆ مەبەستی بردنی تاڵان و دەستكەوت هێرشی كردە سەر ئێران.

تاراس داس و شوێنکەوتووەکانی چاویان لەوە نەبوو کە بێن و خاکی خەڵکی دیکە داگیر بکەن و لەو ڕێگەیەوە وڵاتەکەیان گەورەتر بکەن، تەنیا بابەتێك کە بیریان لێ دەکردەوە تاڵان بوو، دەیانەویست لەو ڕێگەیەوە کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەیان خاوەن سەرمایە بن.

تاراس داس لە لەگزستانەوە بەڕێ کەوتبوو، دوای ئەوەی شارەکانی ئازەربایجانی تاڵان کردبوو، چوونکە دەیزانی تیسفون پایتەختی ساسانی دەوڵەمەندترین شاری ئاسیایە، بڕیاریدا خۆی بگەیەنێتە ئەوێ و بچێتە نێوان دوو ڕووبارەوە.

ئەو لە ڕێگەی خۆی بەرەو تیسفون، گەیشتە لەشکری هورمز، لە سەرەتادا نەیتوانی بزانێت ئەو لەشکرەی بە ڕێکەوت کەوتووەتە سەر ڕێگەی هی کێیە، سەرەتا بیری کردەوە لە تیسفونەوە بۆ ڕێگرتن لەو نێردراوە، لەوانەیە ئەگەر جەنگ بەردەوام بێت، هێز بۆ یارمەتیدانیان بێت، بۆیە دەستبەجێ فەرمانی پاشەکشەیدا.

هورمز بێ هیچ ڕێگریەك گەیشتە نێو شاری تیسفون، کاتێك گەیشت بەهرامی نەبینی، ئەو وای بیردەکردەوە کە بەهرام خۆی بە پاشا ناساندووە، بۆی دەرکەوت کە وانییە، تەنیا چاوەدێری بارودۆخی پایتەختی کردووە تا دووچاری شڵەژان نەبێت.

دوای سێ ڕۆژ لە گەیشتنی هورمز بە پایتەختی ساسانییەکان، بەهرامی برای هات و بە خزمەتی گەیشت. هورمز لە هەڵوێستی براکەی لە چاوەدێری پایتەخت بە ڕادەیەك ڕازی بوو کە بڕیاریدا ئەو بکاتە جێنشینی خۆی.

بە وتەی مێژوونووسەکان هورمزی یەکەم پێش ئەوەی ببێتە پاشا بە (هورمزی ئەردەشێر) ناو دەبرا، کوڕی گەورەی شاپوور نەبوو. ئەو ماوەیەك فەرمانڕەوای پارتیا و ماوەیەکیش فەرمانڕەوای ئەرمەنستان بوو، دوو برای بە ناوەکانی (وەهرام گیلانشاە و شاپوور میسانشاە) لە خۆی گەورەتر بوون، باوکی واتە شاپوور کە خۆی بە سەرکردەیەکی سەربازی هەژمار دەکرا، ئەوی بە هۆی لێهاتوویی و ئازایەتییەوە کردە جێنشینی خۆی.

یەکێك لە هەڵەکانی مێژوونووسان ئەو بابەتە کە پێیان وایە هورمز بە هۆی ئەوەی جەنگی ڕۆمی کردووە و سەرکەوتووە، نازناوی (دلێر)یان پێ بەخشیوە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو لە یەکەمین ساڵەی پاشاتیی خۆیدا، لەگەڵ ڕۆمەکان نەجەنگی تا سەربکەوێت و نازناوی پێ بدرێت. بگرە ئەو نازناوە لە سەردەمی باوکی و لەلایەن باوکییەوە بە هۆی ئازایەتیی لە جەنگەکانی ڕۆم و ئەرمەنستان پێی درا.

لەو هەڵەیەوە هەڵەیەکی دیکە هاتووەتە ئاراوە، گوایە بە هۆی ئەو سەرکەوتنەیەوە، هورمز پەیمانی لەگەڵ رۆم بەست کە کریستیانەکان لە تەواوی ئێران ئازاد بن و لە بەرانبەریشدا زەردەشتییەکان لە تەواوی رۆم ئازاد بن لە ئاینداری خۆیان.

ئەو کەسانەی ئەو بابەتەیان باس کردووە، لێکدانەوەیان نەبووە کە ئەوکات ئاینی کریستیان ئاینی فەرمی نەبووە لە رۆم تا ئەو وڵاتە پاڵپشتی بکات و پەیمان لەگەڵ پاشای ئێران بۆ ئازادی ئاینی ئەوان ببەستێت.

هەرچەندە ئەوکات واتە (٢٧٢ و ٢٧٣ ز) وەك جاران کریستیانەکان لە رۆم نەدەکەوتنە بەر کوشتن و چەوساندنەوە و ئازار، بەڵام چوونکە ئاینی فەرمی رۆم ئاینی کریستیان نەبوو، رێزی لە لای حکوومەتدا نەبوو.

لە نێوان ئێران و رۆم پەیماننامەیەك بەسترا تا کریستیانەکان لە ئێران ئازاد بن و زەردەشتییەکان لە رۆم ئازاد بن تا بە ئەرکە ئاینییەکانی خۆیان ڕابگەن، بەڵام ئەو پەیماننامەیە لە (١٦٦) ساڵ دوای مردنی هورمز و لە کاتی پاشایەتیی بەهرامی پێنجەم لە نێوان ساسانییەکان و رۆمەکان مۆر کرا، بەهرامی پێنجەم هەر هەمان ئەو کەسەیە کە لە مێژوودا بە (بەهرام گوور) ناسراوە و دەوترێت کە لە کاتی راوی کەرە کێویدا لە زەلکاوی (گاو خونی) ڕۆچووە. (فێن گۆشمید) مامۆستای مێژووی ئێران لە زانکۆی (توویبن گێن) لە ئەڵمان، ڕۆچوون و مردنی بەهرام لە زەلکاودا بە راست نازانێت و بەڵگەی بۆ ئەو وتەیەی هەیە و یەکێك لەو بەڵگانە ئەوەیە کە مێژوونووسە ئەرمەنییەکان نووسیویانە کە بەهرام گوور لە گۆڕی پاشایەتیی لە هەمەدان نێژراوە، ئەگەر لە زەلکاو ڕۆچووبایە، چۆن ئێسکەکانی لەو گۆڕە دەنێژرا، هەروەها ئەو دەڵێت کەرەکێوی ئاژەڵێکی زیرەکە و بە وردی خۆی دەپارێزێت تا نەچێتە شوێنی زەلکاو و بەو پێیەش بەهرام بەدوویدا ناچێتە زەلکاو.

بەڵگەی سێیەمیش وتەی (یەزدەگوردی دووەم) کوڕی بەهرام گوورە. لە نێوان پاشای ساسانییەکان تا سەردەمی یەزدگوردی دووەم نەریت بوو کە هەموو یەکەمین رۆژی هەموو مانگەکان رێگەدانی گشتیی بوو بۆ هەموو کەسێك لە هەر پلە و پایە و چینێك بۆ بینینی پاشا تا هەر سکاڵا و گازەندەیەکی هەبێت دژی هەر کەسێك لە بەرپرسانی حکوومەت و دیوانی پاشا، بیلێت، ئەمەش زۆر کاریگەریی هەبوو لە سنووردانان بۆ زێدەڕۆیی و خراپەکاری بەرپرسان.

یەزدگوردی سێیەم کاتێك گەیشتە دەسەڵات ئەو نەریتەی نەهێشت و کاتێك لێیان پرسی بۆ ئەو نەریتەی نەهێشتووە؟، وتی لەو کاتەی لە سەرە مەرگی باوکم لە لای بووم، پێی وتم کاتێك گەیشتییە دەسەڵات، ڕێپێدانی گشتیی هەڵوەشێنەوە.

ئەگەر بەهرامی پێنجەم لە زەلکاو ڕۆچوو بووایە، ئیدی یەزدگوردی کوڕی لەسەر جێگەی مردن نەیدەبینی تا ئەو وەسیەتەی لێ وەربگرێت؟.

بەڵێ هورمزی یەکەم لەگەڵ رۆم نەجەنگا تا لەگەڵ ئەواندا و سەبارەت بە کریستیانەکان پەیماننامەیەك مۆر بکات.

زانراوە ئێرانییەکان هەڵگری هەندێ خەسڵەتی بەرز بوون، بێگانەکانیش گەواهی ئەوەیان داوە کە یەکێك لەو خەسڵەتانە راستگۆیی ئەوان بوو، بەڵام بە داخەوە لە سەردەمی هورمزدا ئەو خەسڵەتەیان تا رادەیەك ڕووی لە کەمی کرد، کاتێك هورمز فەرمانی کوشتنی لایەنگرانی ئاینی مانی دەرکرد، بۆ خەڵکانێکی دیکەیش تا رادەیەك بووە مایەی ئازار و ناخۆشی.

هورمز بۆ لەنێوبردنی لایەنگرانی ئاینی مانی لە ئێران و وڵاتانی ژێردەستی ئێران فەرمانی کوشتنی دەرکرد، ئەو بڕیارە لە روانگەی سیاسیی و کۆمەڵایەتی هەڵەیەکی گەورە بوو. چوونکە بڕیاریدا هەر کەسێك لایەنگری ئەو ئاینە بێت پێویستە بکوژرێت، کەسیان بە هۆی ئەوەی بکوژی یەکێك یاخۆ چەند کەسێك بوو، سزا نەدەدا. بەم شێوەیە هورمز کوشتنی مانییەکانی دایە دەست خەڵکی ئاسایی و هیچ چاوەدێرییەکی بەسەرەوە نەبوون.

مۆنتسکیۆ لە پەڕتووکی (رۆحی یاساکان) دەڵێت: هەندێ لە دەوڵەتان، هەندێ بڕیار و یاسا دەردەکەن کە بە مەزەندەی خۆیان کاری باشە و لە ئەنجامیشدا وا نییە و دەبنە هۆکار بۆ گەندەڵبوونی کۆمەڵگە. ئەو بڕیارەی هورمز دژ بە مانییەکان دەریکرد یەکێك لەو بڕیارانە بوو. ئەگەر ئەو کوشتنی مانییەکانی نەدابووایە دەست خەڵکی ئاسایی و لە بەرانبەردا تەنیا وتبای هەر کەسێك لایەنگرێکی ئاینی مانی بداتە دەست کارمەندانی حکوومەت، ئەو بارودۆخەی دواتر لە وڵات هاتەکایەوە، ڕووی نەدەدا، بەڵام شێوەی بڕیارەکە بووە هۆی ئەوەی لە هەموو شوێنێك خەڵکانێك بە هۆی رق و کینەوە بە ناوی لایەنگری مانی لەلایەن کەسانێکەوە بکوژرێن.

ئەوەی کەسێکی دەکوشت و دەیوت ئەو پێڕەوی مانی بووە، کەس لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەدەکرد، زۆرینەی کات تەنانەت پرسیاری ناوی کوژراوەکەشیان لە بکوژ نەدەکرد، بەڵام

راستکاری بەشێکی دانەبڕاو بوو لە کردەوەی ئێرانییەکان، بەو هۆیەشەوە ژمارەی ئەوانەی بە هۆی رق و کینەوە کوژران لە بەرانبەر زۆرینەی ئێران کەم بوو.

موسا خۆرنی مێژوونووسی ناسراوی ئەرمەنی دەڵێت لە تەواوی ئەو شارانەی لەلایەن شاپوورەوە بینا کران و بە بێشاپوور (نەیشاپوور) ناسرابوون، وێڕای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر مانۆیی دەژیان، بەڵام کەسیان تەنانەت یەکیان نەکوژران و تەنانەت وێڕای ئەوەی خەڵکی ناوچەکە نەیانکوشتن، بگرە نەچوون تا بە شوێنی دیکەیش بیانناسێنن و بە کوشتیان بدەن.

بەپێی نووسینەکانی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان، کوشتاری مانییەکان دوای گەیشتنی هورمز بە شاری تیسفون دەستی پێکرد، لەو بارەوە بەرواری وردیان دیاری نەکردووە. لە تەواوی ئەو وڵاتانەی راستەوخۆ لە بەردەستی ئێران و هورمز بوون، مانییەکان کوژران و لەنێوبران، بەڵام لە وڵاتانی ژێردەستی ئێران تەنانەت یەك مانۆییش نەکوژرا، ئەوانەی ئێرانیش دەیانتوانی ڕابکەن و خۆیان بگەیەننە یەکێك لەو وڵاتانە و پەنایان دەگرت.

سەبارەت بە بوونی مانییەکان لە سەرەتاوە کە ئایا تەنیا لە ئێران بوون یاخۆ لە وڵاتانی دیکەیش هەبوون، دوو بیرۆکە هەیە:

بیرۆکەی یەکەم ئەوەیە کە مانییەکان تەنیا لە ئێران بوونە و توندوتیژی هورمز بووە هۆکاری ئەوەی ئەوان هەڵبێن و بچنە وڵاتانی دیکە و نیشتەجێ ببن.

باوەڕی دووەم دەڵێت مانی بەر لە هاتنی بۆ ئێران لە وڵاتانی دیکەی وەك چین و هیندستان هەبووە، ئەو مانیانەی لەو شوێنانەن لە کاتی نیشتەجێبوونی ئەودا لەو شوێنانە بوونەتە مانۆیی، بەڵام گومان نییە کە توندوتیژی هورمز بۆتە مایەی بڵاوبوونەوەیان.

توندوتیژی هورمز وایکرد کە بەشێك لە کارمەندانی دیوانی دەوڵەت بە وەرگرتنی بەرتیل لە مانییەکان، لە لایەك ببنە هۆکاری رزگاربوونیان و دەرچوونیان لە وڵات، لە لایەکی دیکەیش خۆیان بە وەرگرتنی پارە گەندەڵ ببن.

لە سەردەمی هورمزدا بەرتیل وەرگرتن لەنێو دیوانی دەوڵەت تا رادەیەك پەرەی سەند، هەندێك لە مێژوونووسانی رۆژهەڵات ئەوە بە گوناهی مانییەکان دادەنێن، لە کاتێکدا کە هورمز و بڕیارەکەی هۆکاری ئەو بابەتە بوون.

ژمارەی مانییەکان هێندە زۆربوون وێڕای ئەوەی زۆریان لێ کوژرا، بەڵام هێندە مابوونەوە کە لە دوای هورمزی یەکەم، توانیان بەهرامی یەکەم بکوژن کە پاشا و برای هورمز بوو.

دوایین هەفتەکانی دەسەڵاتیی هورمز بۆ ئێرانییەکان سەردەمێکی سەخت و ناخۆش بوو، بە هۆی بوومەلەرزەی توونددەوە، ژمارەیەکی زۆر لە شار و گوندان ڕووخان و خەڵکێکی زۆر لەژێر دار و بەردی داڕووخاوی خانووەکانیان مردن.

لە مێژووی ئێراندا نەبووە کە لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا چەند بوومەلەرزەیەك لەدوا یەك لە وڵاتانی ئازەربایجان، فارس و خۆراسان بدەن، هەردەم بوومەلەرزەکان ماوەیەکی باشیان کەوتووەتە نێوان، بەڵام ئەوکات و لە چەند هەفتەیەکدا چەند بوومەلەرزەیەکی توووند، سەرەتا لە ئازەربایجان، دواتریش لە فارس و دواجار لە خوراسانیان دا، بوومەلەرزەی یەکەم لە (٧ی سێپتامبەری ٢٧٣ زاینی) بوو لە ئازەربایجان.

ئەوکات بە هۆی سادە و ساکاری ئامێرەکانی پێوەندی، خەڵك بە درەنگەوە لەو بابەتانە ئاگەدار دەبوونەوە، بەڵام کاربەدەستانی حکوومەت خێراتر دەیانزانی، چوونکە کۆترە نامەبەرەکان هەواڵەکانیان لە لایەك بۆ لایەکەی دیکەی وڵات دەگواستەوە. هورمزی یەکەم بە زوویی هەواڵی ڕوودانی بوومەلەرزەی ئازەربایجان و فارس و خۆراسانی زانی، بەڵام هیچ کارێکی بۆ یارمەتیدانی بەرکەوتووانی ئەو بوومەلەرزانە نەکرد.

دوابەدوای ئەو بوومەلەرزانە و لە پایزی هەمان ساڵ کە هێشتا وەرزی بارانی توووند نەهاتبوو، لە ناوچەی خوزیان یاخۆ شووشیان کە دواتر بوو بە خۆزستان، باران بۆ ماوەی چەندین شەو و ڕۆژ باری و بووە مایەی لافاوی گەورە کە بەشێك لە دەشتەکانی ئەو ناوچەیەی کردە دەریا، زۆرێك لە شار و گوندەکانی کە زۆر ئاوەدان بوون، خستە ژێر ئاو، دیسان لەلایەن هورمز بۆ یارمەتیدانی ئەوان هیچ هەنگاوێك نەهاوێژرا. ئەو دەیوت ئەو بوومەلەرزانە و ئەو لافاوە بە هۆی ئەوەیە کە خەڵك مانییەکانیان پەناداوە و نەیانکوشتون، ئەگەر وایان نەکردبایە، ئەوە ڕووی نەدەدا. لەوکاتەدا کە خەڵك بە دەست ئەو کارەساتە سرووشتیانەوە لە ئازار و ناخۆشیدا بوون، هورمز بۆ راوی شێر بەرەو فارس دەڕۆیشت.

بابەتی مردنی هورمز یەکێکە لە بابەتە شاراوەکانی مێژووی ساسانییەکان، چوونکە بە دروستی نەزانراوە کە ئەو چۆن مردووە، تەنانەت نەزانراوە لە کوێ مردووە و تەرمەکەی چی لێ هاتووە و لە کوێیان داناوە و ئێسکەکانی لە کوێ لە گۆڕ نراون.

هەندێك وتوویانە ئەو بە مردنی ئاسایی مردووە، هەندێکیش بەرواری کوشتنی ئەو لە مانگی دیسامبەری ساڵی (٢٧٣ ز) یاخۆ مانگی یەکەمی ساڵی (٢٧٤ ز) دیاری دەکەن، تەنانەت وتوویانە کە یەکێك لە پێڕەوانی مانی ئەوی کوشتووە.

فێن گۆشمید کوژرانی هورمز بە دەستی کەسێکی مانی ڕەت دەکاتەوە و دەڵێت ئاینی مانی دژی کاری نامرۆیانەیە، ڕووی نەداوە مانییەك یەکێکی دیکە بکوژێت. بە وتەی ئەو زانایە تەنانەت ئەگەر ئەو بابەتەش پەسەند بکەین، پێویستە بەروار و شوێنی کوژرانی زانراو بێت.

هورمزی یەکەم لە کاتی مردنیدا لە تافی لاوی بووە، تەنیا بیست و حەوت ساڵی بووە، گەنج لەو تەمەنەدا زۆر پتەوە و بە مردنی ئاسایی و تەنانەت بە نەخۆشیش نامرێت، زۆرێك لە لاوەکان لەو سەردەمانی کۆندا، تەنانەت بە نەخۆشییەکانی وەك تاعوونیش نەدەمردن و توانای مانەوەیان هەبوو. تەنانەت ئەگەر گریمانی ئەوە بکەین کە ئەو بە نەخۆشی مردووە، دەبێت جۆری نەخۆشییەکەی بزانین.

بەرواری مردنی ئەو لە مانگی دیسامبەری ساڵی (٢٧٣ ز) یاخۆ مانگی یەکەمی ساڵی (٢٧٤ز) دیاری دەکەن، بەڵام ڕۆژەکەی دیاری نەکراوە.

ناتوانین بزانین هۆکاری مردنی هورمز چ بووە، بۆ وا بە شاراوەیی مایەوە، تەنانەت شوێنی ناشتنیشی نەزانراوە، بەڵام تەنیا یەك خاڵ زانراوە، ئەویش ئەوەیە کە بە هۆی ئەوەی گەنج بووە و لە تەمەنی لاویدا مردووە، ڕێوڕەسمی پرسەی سیاووش کە ڕێوڕەسم و پرسەیەکی باوی ئێرانە بۆ ئەو جێبەجێ کراوە.

لە مێژووی ساسانییەکان تا ئەو کات یەکەمجار بوو کە ئەو ڕێوڕەسمە بۆ پاشایەك ئەنجام بدەن، ئەوەش بە هۆی لاوەتیی ئەو بوو. ئەمەش ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو کە لە سەرەتای زنجیرە پاشایەتیی ساسانییەکاندا، خەڵك سیاوەشیان ناسیوە و زانیویانە لە تافی لاوەتیی و بە چ شێوەیەك کوژراوە.

بۆ مێژوونووس گرینگ نییە کە ئایا بە راستی سیاووەش هەبووە یاخۆ ئەفسانە بووە، چوونکە تەواوی نەتەوەکانی جیهان ئەفسانەیان هەبووە و تیایاندا پاڵەوان و ناوداری وەها ناوی هاتووە کە لە راستیدا نەبوونە، وێڕای ئەوەش خەڵك بە باشی ئەو پاڵەوانە ئەفسانەییانەیان دەناسی و وایان رەفتار دەکرد کە لەگەڵ خۆیاندا هەڵسوکەوتیان کردووە.

بوونی قارەمانە ئەفسانەییەکان لای تەواوی نەتەوەکان بابەتی دوور لە گومانن و خەڵك باوەڕیان بە خۆیان دەهێنا کە ئەوان هەبوونە، ئەمەش بۆ دوو هۆکار دەگەڕایەوە:

یەکەم: ئەوان دەیانەویست بە باسکردنی پاڵەوانەکان خۆیان لە گەنجیدا وەك ئەوان بە توانا دەربخەن. دووەم: بە تێکەڵاوکردنی ئەفسانە و پاڵەوانەکانیان، هەوڵیان دەدا مێژوو و بوونی نەتەوەییان بەهێزتر نیشان بدەن.

لە سەردەمی ئەشکانییەکان پرسەی سیاووەش نەخراوەتە کار، تەنانەت ئەگەر کرابێش هیچ شوێنەواری لە مێژوودا نییە، لە کاتێکدا بە بڕوای هەندێ لە مێژوونووسانی ئێرانناسی ئەوروپایی ئەو پاڵەوانانەی لە سەردەمی ئیسلام خراونەتە نێو شانامەی فیردەوسی و لە ئەوانیش پرسەی سیاووش، لە سەردەمی ئەشکانییەکان هاتوونەتە کایەوە.

ئەوە دەردەکەوێت کە مردنی هورمز بە شێوەیەك بووە کە کاریگەریی لەسەر هەمووان هەبووە، بۆیە ئەو ڕێوڕەسمەیان بۆ داناوە کە تا ڕادەیەك بەپێی دەستەواژەکانی ئێستە دەتوانین بە پرسەی گشتیی بناسین، ئەو پرسەیە بۆ سی ڕۆژ بەردەوام بووە، لە کاتی پرسەدا بابەتی لاواندنەوە هەبووە کە لە دوو کاتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوون. لە هەردوو کاتدا ئەو لاواندنەوانە بە موزیکەوە بووە و بە ڕواڵەت لاواندنەوەکان زۆر خەمناك بوون و هەموو کەسایان خستووەتە گریانەوە.

# بەهرامی یەکەم و سەردەمی تاریکی

هەندێك جار لە مێژوودا هەندێ بۆشایی دەردەکەون کە دەبنە مایەی سەرسووڕمان، مێژووی زنجیرەی ساسانییەکان لەو مێژووانەیە کە دەتوانین بڵێین تەکووز و ڕێکوپێکە، وەك مێژووی هەخامەنشیی یاخۆ ئەشکانییەکان نییە کە لە هەندێ لە بەشەکانی بێ ئاگا بین، وێڕای ئەوەش مێژووی ئەوانیش نەزانراوی هەیە و بۆشایی لێ دەردەکەوێت، بۆ وێنە نەزانراوە کە ئایا هورمز کوڕی هەبووە یا نا؟

ئەوکات نەریت بوو کە پیاوان و شازادەکان زوو هاوسەرگیریان دەکرد، هورمزیش ئەو کاتەی مرد، پیاوێك بوو لە تافی لاویەتی و بەپێی ئەو نەریتە دەبووایە هاوسەرگیری کرد بێت و منداڵی هەبێت، بەڵام زانیاریمان لەبارەی منداڵەکانی ئەو نییە، چوونکە دوای مردنی ئەو، براکەی کە ناوی بەهرامە، لە مێژوودا بە بەهرامی یەکەم ناوی دێت، بوو بە پاشا.

تەنیا گێڕانەوەیەکی لاواز هەیە کە گوایە بەهرامی سێیەم کە دواتر دێینە سەر باسی ئەویش، کوڕی هورمز بووە، بەڵام هەموو ئێرانناسە بەناوبانگەکان کە لە مێژووی ساسانییەکان شارەزان، ئەو بابەتە بە ناڕاست دەناسێنن.

هەریەکە لە کریستیەن سێن و نۆڵدکە ئەو بابەتە ڕەت دەکەنەوە، فۆن گۆشمید بە بێ متمانەی دەناسێت، بە گشتیی ئێمە نازانین کە بەهرام بێ منداڵ و بە وتەی مێژوونووسە ئیسلامییەکان بێ پاشەوار بووە.

دەبێت سەردەمی دەسەڵاتیی بەهرامی یەکەم بە یەکێك لە سەردەمە خراپەکانی مێژووی ساسانییەکان بناسین.

بەهرام لە سەردەمی شاپووری یەکەم واتە باوکی و سەردەمی کورتی دەسەڵاتیی هورمزی برای بە پیاوێکی ڕێك دادەنرا، ئەوە نەزانراوە کە بۆچی دوای گەیشتنی بە دەسەڵات بووە ئەو پیاوەی کە بەردەوام سەرخۆش و هەوەسباز بێت و لە هیچ شتێك سڵ نەکاتەوە یاخۆ نەگەڕێتەوە. ئەوکاتەی پاشایەك بەردەوام سەرخۆش بێت، بە تایبەت لە دەسەڵاتێکی وەك دەسەڵاتیی ئێران، ڕوونە کە دەسەڵات دەکەوێتە دەست بەرپرسانی دیوانی پاشا.

له سەردەمی کورتی دەسەڵاتیی هورمزدا بەرتیل وەرگرتن و گەندەڵی لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێران تا رادەیەکی بەرچاو بڵاو بوو، لە سەردەمی بەهرام پتر پەرەیسەند و بووە ڕەفتارێکی ئاسایی و کەس نەبوو ڕێگەی لێ بگرێت. تاکە کەس کە توانای ڕێگری لە بەرتیل وەرگرتن و گەندەڵی هەبوو، هەمان بەهرام بوو کە بە هۆی سەرخۆشی و نغرۆبوون لە هەوا و هەوەس و سەرخۆشبوونی بە درێژایی شەو، توانای هیچی نەبوو، کاتێك لە ڕۆژیشدا لە خەو هەڵدەستا، نیوەڕۆ هاتبوو، دوای ئەوکاتیش بە هۆی ئەوەی سەرخۆشی بە تەواوەتی بەری نەدابوو، نەیدەتوانی کەس ببینێت و سکاڵای کەس وەربگرێت، بۆیە ڕێگە بۆ دەسەڵاتدارانی کۆشك خۆش ببوو هەر کارێك بکەن کە پێیان خۆش بووایە، بەم شێوەیە ژیان بۆ خەڵکی هەژار و بێ پشتیوان زۆر سەخت بوو.

تا ئەوکات لە ئێران ئەگەر ویستبایان بەرانبەر کەسێك خراپە بکەن، بە پێڕەوی ئاینی مانیان ناوزەد دەکرد، ڤێجا لەنێویان دەبرد، بەڵام پێڕەوانی ئاینەکانی دیکەی وەك جوولەکە و کریستیانەکان هیچ کێشەیان نەبوو، تا ئەو کاتەی چەند کەسێك لە شوێنکەوتووانی ئاینی کریستیان و جوولەکان چوونەسەر ئاینی مانی و ئەو ئاینەیان پەسەند کرد.

ئەو گێڕانەوەیەی لەبارەی ئەو بابەتە دەکرێت راستی تێدا نییە و نەزانراوە چەند کەس لەوان چوونەتە سەر ئاینی مانی، بەڵام ئەو بابەتە بووە دەستەچیلە بە دەست پیاوانی کۆشك و بەم شێوەیە کەوتنە گووشار خستنە سەر جوولەکە و کریستیانەکان بۆ دەسکەوتی پتر.

لە کۆمەڵگەی ئێران هیچ گووشارێك لەسەر پێڕەوانی ئاینەکانی دیکە نەبوو، کریستیان و جوولەکەکان هیچ جۆرە باجێکیان نەدەدا، بەم شێوەیە زۆر دەوڵەمەند بوون، ئەمەش چاوی فەرمانبەرانی وەرگرتنی باجی بۆ لای ئەوان تیژ کردەوە، بۆ ئەوەی بتوانن زێڕیان لێ بستێنن، ئەوانیان بە باوەڕهێنان بە ئاینی مانۆی تاوانبار کرد و وتیان دەبێت بکوژرێن.

هەندێ لە جوولەکەکان لە ئێران ڕۆیشتن و کریستیانەکان سکاڵایان لای پێشەوای ئاینەکەیان کرد لە ئەنتاکیەی تورکیای ئێستە. پێویستە سەرەنج بدەین کە ئەوکات کریستیانەکان تەنیا یەك ئاینزاییان هەبوو ئەویش ئەرتۆدۆکس بوو، ناوەندی ئاینی ئەوان ئەنتاکیە بوو، هێشتا ئاینزاکانی دیکەی کریستییانەکان نەهاتبوونە کایەوە.

پێشەوای کریستیانەکان نێردراوێکی بە نامەوە نارد تا بەهرام ببینێت و داوای لێ بکات کە هەروەك جاران ڕێگە بۆ ئازادی کریستیانەکان خۆش بکاتەوە، نێردراوەکە لە تیسفونی پایتەختی بەهرام و پاشاکانی دیکەی ساسانی بۆ ماوەی سێ مانگ لە چاوەڕوانی مایەوە و

نەیتوانی بەهرام ببینێت. دواتر بە نێردراوەکەیان ڕاگەیاند کە بەهرام لەبەر گەرمبوونی کەش، بەرەو هەمەدان رۆیشتووە، ئەویش کە فەرمانی پێکرابوو تا نامەکە بگەیەنێتە بەهرام، رۆیشتە هەمەدان و بە هەر شێوەیەك بێت نامەکەی گەیاندە دەست بەهرام.

بەهرام فەرمانی کرد تا چیدی ئازاری کریستیانەکان نەدەن، دەتوانرێت بگوترێت کە تاکە کاری باشی ئەو لە دوای گەیشتنی بە دەسەلات، هەر ئەو کارە بووە و لە تەواوی سەردەمی پاشایەتیدا کارێکی دیکەی شیاوی باسی نییە، بە گریمانەی زۆریش مەیخواردنەوەی زۆر بۆتە هۆی مردنی، چوونکە بەهرام هەوەسباز و سەرخۆش بوو، بۆیە کارەکانی لە دەستی دەرچوون و کەوتنە دەست کاربەدەستەکانی کۆشك و سەرجەم ئەوانیش لە فەرمانی کارتێردا بوون، پێشتر ناوی کارتێر هاتووە، کە ئەو مانی دادگەیی کرد.

پێویستە بگوترێت کە مانی یەکێك بووە لە هەڵگری هزرە کۆمەڵایەتییەکانی رۆژهەڵات، بەڵام لێکدانەوەی بۆ کات نەبووە و نەیدەزانی خۆی بگونجێنێت. ئەوەی ئەو بانگەشەی بۆ دەکرد دژی ئاینی فەرمی وڵات واتە زەردەشتیی نەبوو، ئەگەر ئەو لەگەڵ کارتێر و مووغەکان خۆی گونجاندبایە، نەتەنیا نەدەکوژرا، بگرە بیرۆکەکانی بەرەبەرە پەرەیان دەسەند، بەڵام ئەو چوونکە خۆگونجێن نەبوو، هەڵەیەکی مەزنی کرد و هێرشی کردە سەر زانایانی زەردەشتی و ئاگرخانەکان، ئەو بابەتەی بە هەند وەرنەگرت کە ئەوان خودان دامەزراوەیەکی ناوەندین.

ئەو کەسانەی ئێستە دامەزراوەی ناوەندی کریستیانەکان واتە (ڤاتیکان) دەبینن، وا بیر دەکەنەوە کە ئەو دامەزراوەیە لە داهێنانی کریستیانەکان خۆیانە، ڤاتیکان ئێستە خاوەنی سەرمایەی زۆرە کە بە پتر لە سەد ملیار دۆلاری ئەمەریکی مەزەندە دەکرێت، هەندێك کەس سەرمایەی ڤاتیکان بە پتر دادەنێن لە سەرمایەی زیاتر لە بیست بانکی ناوەندی و پلە یەك لە جیهاندا.

هەڵبەتە ئاینی زەردەشتیش خودان دامەزراوەی مەزن بووە، سەرمایە و داهاتی تایبەت بە خۆی هەبوو، بێگومان ئەوکات خاوەن دەوڵەمەندترین دامەزراوەی ئاینی جیهان بووە.

فێن گۆشمید لە بابەت دارایی دامەزراوەی زەردەشتییەکان ژمارەیەك دەڵێت کە وێڕای متمانەمان بە وردبینی ناوبراو، بەڵام بە زێدەڕۆیی دەزانین.ئەو دەڵێت لە نیوەڕاستی سەردەمی پاشایەتیی ساسانییەکان کە چوار سەدەی خایاندووە، دامەزراوەی زەردەشتی خاوەنی شەست و پێنج هەزار گوند و باخ و ئاش و پاوەن بووە لە پانتایی سنووری ساسانییەکان و وڵاتانی ژێردەستی.

لە سەردەمی بەهرامی یەکەم کە بابەتی باسی ئێمەیە، ئەو دامەزراوەیە ئەو ڕێژەیە لە سەرمایەی نەبووە، وەك دەزانرێت بە تێپەڕبوونی کات ژمارەی ئاگرخانەکان زۆرتر دەبوو، ئەو داراییانەی خەڵکیش بۆ بەڕێوەبردنی ئاگرخانەکان دەیانبەخشین زۆرتر دەبوون، بەڵام دڵنیاین ئەوکاتیش موڵك و سەرمایەی ئەو دامەزراوە زۆر بووە، بۆیە مانی ویستوویەتی ئەو داراییە لەژێر دەستی مووغەکان دەربهێنێت، دیارە ئاگرخانەکان بۆ خۆیان ناوەندێکیان هەبوو کە لقەکانی پێڕەویان دەکرد، مانی بەبێ ئەوەی دامەزراوەیەکی هەبێت، دەیویست سەرمایە و موڵکەکانیان لە دەست دەربهێنێت، ئەمەش ئاکامەکەی تووڕەیی مووغ و پێڕەوەکانیانی بەدوای خۆیدا هێنا. بە درێژایی مێژوو، بیرۆکە نوێیەکان ئەوکاتە بوونەتە مایەی ململانێی توند و خوێن ڕشتن کە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی ئەوانی دیکەی خستبێتە مەترسییەوە.

لە (١٣٠٠ پ. ز) لە میسری کەڤنار جەنگێکی درێژخایەن لە نێوان لایەنگرانی خاچی میسری ڕوویدا (خاچی میسری جیا بووە لەو خاچەی کە کریستیانەکان بەکاری دەهێنن)، کە لە ڕووکاردا دەمارگیری گرووپەکانی نێو هەناوی تاکە هۆکاری جەنگەکە بوو، بەڵام لە ڕاستیدا دراو و دارایی هۆکاری سەرەکیی هەڵگیرسانی جەنگ بووە، چوونکە زۆرینەی هەرە زۆری پاوەن و موڵك و ماڵی میسر سەر بە پەرستگەکان و لایەنگرانی قۆچ (هێمای گرووپێکی نوێی ئاینی بوو)، کە دەیانەویست ئەو موڵك و ماڵانە لە پەرستگەکان بستێننەوە.

لە سەدەی شازدەیەمی زاینیدا، لە یەك شەودا لە فەرەنسا ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە کریستیانە پرۆتستانتەکانیان کوشت، بە هۆی ئەوەی بویەری کۆمەڵکوژییەکە لە شەوی (سێن بار تلمی) ڕوویدا، کە یەکێك بووە لە پیاوە پیرۆزەکانی ئەوان ، هەر بۆیە ئەو شەوە بەو ناوە ناو نرا.

بە رواڵەت هۆکار ئەوە بوو کە کاسۆلیکەکانی ئەو وڵاتە پرۆتستانتەکانیان بە لادەر لە ئاین دەزانی و کوشتنی ئەوانیان بە ئەرك دادەنا، بەڵام هۆکاری شاراوە ئەوە بوو کە کاسۆلیکەکان دەیانەویست بوون و نەبوونی گوندەکان داگیر بکەن.

کوشتارە ترسناکەکەی مانۆکانیش لە تەواوی وڵاتانی ژێردەستی ئێران ئەوکاتە دەستی پێکرد کە ئاگرخانەکان تێگەیشتن کە موڵکەکانیان لەدەست دەچێت. ئەوکات سەرۆکی دەزگەی ناوەندی زەردەشتی، کارتێر بوو، نیشانی مەگوپەد یاخۆ مووغی هەبوو، بەو ناوەوە فەرمانی بۆ تەواوی ئاگرخانەکان دەنارد.

هەروەك ئێستە لە دامەزراوەی ڤاتیکاندا لە هەر ناوچەیەك ئەسقۆفەكان خودان سەربەخۆییەكی ناوچەین و بۆ كازێی گشتیش لە ڤاتیكانەوە فەرمانیان بۆ دێت، لە سەردەمی ساسانییەكانیشدا ئاگرخانەكان بە گشتیی جۆرێك سەربەخۆییان هەبوو، بۆ كازێی گشتیی فەرمانیان لە نێوەندەوە بۆ دەهات.

هەر وەك چۆن لەوانەیە لە لێكدانەوەی بڕیارە ئاینییەكاندا جیاوازیی لە نێوان ئەسقۆفەكاندا هەبێت، بە هەمان شێوە جیاوازیی لە بیروڕای بەڕێوەبەرانی ئاگرخانەكانیش هەبوو، بەلآم ئەوان هەموویان لە بابەت دارایی و موڵكەكانی ئاگرخانەكان هاوڕا بوون و ڕێگەیان نەدەدا كەس ئەو موڵك و سامانەیان لێ داگیر بكات.

هەر بۆیە كاتێك كارتێر فەرمانی لەنێوبردنی مانییەكانی دەركرد، هەموو مووغەكان و بەڕێوەبەرانی ئاگرخانەكان بەرفەرمانی بوون و هەر مانۆییەكیان دەدۆزییەوە لە ڕێگەی شوێنكەوتووانی خۆیانەوە لەنێویان دەبردن.

یەكێك لە خاڵە نادیارەكانی مێژووی ئێران كە لەلایەن ئێراناسە ئەڵمانییەكان و لە سەروویانەوە (ڤێن گۆشمید) دۆزرایەوە، كاریگەریی مانی بوو لە پیشەسازی ئێران.

مێژوونووسانی ڕۆژهەلآت مانیان تەنیا بە نیگاركێش دەناساند و نیگاریان بە پەرجۆی ئەو دەناساند، بەلآم كاری مانی نیگاركێشی نەبوو، ئەو چاكسازێكی كۆمەلآیەتی و داهێنەرێكی پیشەسازی بوو، یەكێك لە دروشمەكانی ئەوە بوو كە پێویستە هەموو كەسێك پیشەیەك بزانێت، ئەوەی هیچ پیشەی نەبێت، ناتوانێت بانگەشەی پێڕەوایەتیی مانی بكات.

بە وتەی (ڤێن گۆشمید) لە سەردەمی ئەودا نیگاركێشی، پەیكەرتاشی، تواندنەوەی كانزاكان، دروستكردنی پۆلآ و كشتوكاڵی دێمی لە میزۆپۆتامیا و سەرووی ئێران پەرەی سەند.

ئێمە لەو بارەوە كە كشتووكاڵی دێمی لە داهێنانەكانی مانی بێت، لەگەڵ ڤێن گۆشمید هاوڕا نین، چوونكە زۆر پێش ئەو لە ئازەربایجان و خۆراسان ئەو كشتووكاڵە هەبووە، بەلآم سەبارەت بە ئەوانی دیكە پشتڕاستین و پێویستە بگوترێت سەرچاوەی گۆشمید لەبارەی پیشەسازییەكانی مانی لە ئێران بە گشتیی برێتین لە سەرچاوە ئەرمەنییەكان.

تواندنەوەی كانزاكان لە ئێران زۆر بەر لە هاتنی مانی هەبووە، تەنانەت ئاسنیش دەتوێنرایەوە، لە هەموو كانزاكانیش جگە لە زێڕ و زیو گرانتر بوو، چوونكە تێچووی تواندنەوەی ئاسن لە ئەوانی دیكە زۆر پتر بوو، بە وتەی نۆلدكەی ئەڵمانی كورەی تواندنەوەی ئاسن لە حەوت تا دە شەو و ڕۆژ بەردەوام دەبوو لە گەرمبوون، بە درێژایی ئەوكاتە كۆمەڵێك

کەس دەبووایە دار بخەنە نێو ئاگرەکە، چوونکە سووتەمەنی دیکەیان نەبوو، دوای ئەو ماوە درێژە گەرمی ئاگرەکە دەگەیشتە ئاستی پێویست و ئاسنەکە دەستی بە توانەوە دەکرد.

بە ڕای گۆشمید ئەوەی بووە هۆکار تا بە هۆی مانۆییەکان توانەوەی کانزاکان لە وڵاتانی بەردەستی ساسانی بەربڵاو و فرەوانتر ببێت، دروستکردنی کورەی تازە بوو لەلایەن مانییەوە، کە توانای تواندنەوەی زۆرتر و زووتری ئاسنی هەبێت، هەروەسا ئەوان توانیان پۆڵای ئاودراو بەرهەم بێنن، ئەو بابەتە یەکێك لە داهێنانەکانی ئەوان بوو کە ئەمڕۆ ئەو بابەتە ئاساییە و پۆڵایەك نییە کە ئاودراو نەبێت، بەڵام لە رابردوودا نەیاندەتوانی پۆڵای ئاودراو بەرهەم بێنن کە پتەوترە لە پۆڵای ئاسایی و مانییەکان ئەو بابەتەیان داهێنا و ئێرانییەکان لەوانەوە ئەو بابەتە فێربوون.

ئۆمستیدی ئەمەریکایی دەڵێت: "دوور نییە مێژوونووسە ئەرمەنییەکان سەبارەت بە مانییەکان زیادەڕۆییان کرد بێت، چوونکە لە سەردەمی ساسانییەکان لە نێوان ئێران و ئەرمەنستان کێشە هەبوو، مانییەکان کە لەلایەن زەردەشتییەکانەوە کەوتبوونە ژێر گووشارەوە، ناڕاستەوخۆ لە لای ئەرمەنییەکان خۆشەویست بوون، مێژوونووسە ئەرمەنییەکان ئەوانیان لەوە گەورەتر پێشان دەدا کە هەبوون.

دوای ئەو بیرۆکەیە ئەو دەڵێت لەگەڵ ئەوەشدا گومانمان نییە لەوەی مانییەکان پیشەسازکار بوونە، هەر بۆیە کوشتاری ئەوان زیانی بە ئێران گەیاند، دەتوانرێت بگوترێت کە کوشتاری ئەوان وەك دەرکردنی پرۆتستانتەکانە لە فەرەنسا لە سەردەمی لویسی چواردەیەمدا، کە ئەویش زیانی مەزنی بە پیشەسازی فەرەنساگەیاند، چوونکە بەر لەو کارەساتە فەرەنسا بە یەکەم وڵاتی پیشەسازی دەناسرا، بۆیە دواتر گەڕایەوە بۆ وڵاتانی پلە دووی پیشەسازی.

هەموو مێژوونووسانی ئەوروپایی و ئەمەریکی کە سوودیان لە سەرچاوە مێژووییە ئەرمەنییەکان وەرگرتووە، باس لە پاشەکشەی پیشەسازی ئێران دەکەن لە دوای کوشتاری مانۆیەکان. شاپووری دووەم کە دواتر باسی سەردەمی پاشایەتیی ئەو دەکەین، بووە تاکە هۆکار بۆ پەرە پێدانەوە و بووژانەوەی پیشەسازی ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان لە دوای ئەو کوشتارە.

دوای ئەوەی کارتێر و مووغەکانی دیکە مانی و تەواوی مانۆییەکانیان لەنێوبرد، لە نێوان خۆشیاندا لەسەر دەسەڵات و داهات، کێشە و ئاریشە و جیاوازیی لە پلەبەندییەکانەوە هاتە کایەوە.

دامەزراوە زەردەشتییەکان بریێتی بوون لە دامەزراوەگەلێك کە کۆمەڵێك پلە و پایەی تێدا هەبوو، کە پلەبەندی بۆ کرابوو، هەر وەك چۆن لە دامەزراوە کاسۆلیکییەکاندا قەشەکان دوای تەواوکردنی خوێندن بە پلەی تایبەت بە خۆیان دێنە نێو دامەزراوە ئایینییەکەیان و بەرە بەرە پلەیان بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە پلەی کاردینالّ. زاناکانی ئاینی زەردەشتیش پلەکانیان دەبڕی تا دەگەیشتنە پلەی (مووغ)، دوای ئەو پلەیە سەرۆکایەتیی دامەزراوەکە لەلایەن ئەوانەوە دەکرا.

لە ناوچەی خۆراساندا مووغێك بە ناوی (سەراباد یاخۆ سەرابۆد) پلەی سەرۆکایەتیی ئاگرخانەی نەیشاپووری لە ئەستۆ بوو، ئەو خۆی بە ستەم لیّ کراو دەزانی و پێی وابوو بە هۆی پێوەندیی نەرێنی لەگەڵ کارتێر، ئەو مافەی لیّ زەوت کراوە و پلەی بەرز ناکرێتەوە.

سەرابۆد دوای ئەوەی مانی کوژرا، رایگەیاند ئاگرخانەی تیسفون بە فەرمی ناناسێت و کارتێریش بە سەرۆك دانانێت، ئەو وتی ئاگرخانەی نەیشاپوور ناوەندی زەردەشتییە و هەر خۆیشی سەرۆکی دامەزراوەکەیەتی، لەسەر تەواوی ژن و پیاوانی ئاینی زەردەشتیش پێویستە، ئەو ئاگرخانەیە بە ناوەندیی ئاینەکەیان بناسن.

سەرچاوەکانی داهاتی هەر ئاگرخانەیەك لە سنووری خۆی دیار بوو، لەو سامان و موڵکانەوە بوو کە لەلایەن ئاگرخانەکەوە پێیان بەخشرا بوو، زیادەکەشی بۆ ئاگرخانەی ناوەندیی لە تیسفون دەنێردرا.

سەرابۆد دوای ئەوەی سەربەخۆبوون و ڕەوایەتی خۆی ناساند، چیدی زیادەی داهاتی بۆ تیسفون نەنارد. سەرابۆد بە باشی کارتێری دەناسی، هەر بۆیە هەوڵیدا تا فەرمانڕوای پارتیا (خۆراسان) بکاتە هاوپەیمانی خۆی و پێی وت: بەهرام بەردەوام سەرخۆش و مەستە و لەبەر مەی نۆشی ئاگەداری کاروباری وڵات نییە و کارگێڕی وڵات کەوتووەتە بەردەستی کارتێر کە کەسێکی گەندەڵ و چاوچنۆك و خوێنمژە. ئەگەر تۆ ببی بە هاوپەیمانی من، ئەوا دەتکەم بە پاشای تەواوی ئێران و وڵاتانی ژێردەستی، خۆشم دەبمە سەرۆکی دامەزراوەی ئاینی زەردەشتی لە تەواوی ئەو وڵاتانەدا.

فەرمانڕەوای پارتیا کە ناوی (تەلاووس) بوو، وتەکانی سەرۆکی ئاگرخانەی پشتڕاست کردەوە، چوونکە دەیزانی بەهرام بەردەوام مەست و خومارە و کازێی دەوڵەت لە دەست کارتێرە.

ئەگەر دۆخی ئەوکاتی ئێران بخەینە بەرچاوان، تێدەگەین کە بۆچی وتەکانی مووغەکە کاریگەریی کردە سەر فەرمانڕەوای پارتیا.

سەردەمی پاشایەتیی هورمزی یەکەم ساڵێکی نەخایاند، دوای ئەو بەهرام بوو بە پاشا کە تەواوی کاتەکانی بە خواردنەوە و رابواردن دەبردەسەر، هەندێ لە کارمەند و بەرپرسانی دیوانەکەشی بەرتیل خۆر و گەندڵ ببوون، نەدەزانرا کە کێ ئەوان سزا دەدات. جگە لەوە لە سیستەمی دیکتاتۆریی ئەوکات، دەبووایە بەردەوام کەسێکی بەهێز لە دەسەڵاتدا بێت تا کەسانی ستەمکار و سەرکێش توانایان نەبێت سەر راست بکەنەوە و ببنە مایەی کێشە بۆ گەل و حکوومەت. هەر کاتێك پیاوێکی بێ دەسەڵات دەگەیشتە دەسەڵات، کەسانی پاوانخواز و سەرکێش دەردەکەتن، چجای ئەوەی کەسێك لەسەر دەسەڵات بێت کە لەبەر مەیخۆری ئاگەداری کازێی حکوومەت نەبێت.

بەپێی ئەو رێسایە دەبووایە زۆر زووتر لەوکاتە سەرکێشی و یاخیبوون دەستی پێکردبایە، بەڵام شتێك رێگر، ئەویش کوشتاری مانییەکان بوو، لە هەموو شوێنەکان بیری سەرکێشەکان بە دۆزینەوەی مانییەکانەوە سەرگەرم ببوو، کەس بیری بەلای شتێکی دیکەدا نەدەچوو، سەرئەنجام دوای کوڕانی مانی، ئەو سەرگەرمییە کۆتایی هات.

سەرابۆد توانی کاریگەریی بکاتە سەر تەلاووس و پێی وت کە کارتێر هەروا ناوەستێت و چاوەڕوان نابێت، ئەو ئەگەر نەتوانێت بەهرامیش بنێرێت بۆ جەنگی ئێمە، بە دڵنیاییەوە خۆی دێت، بۆیە پێویستە ئێمە بەر لە هاتنی ئەو خۆمان ئامادە بکەین بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و بەربەرەکانی، هەر بۆیە پێویستە لەشکرێك ئامادە بکەین، ئەوکاتەی کارتێر هات، تێکی بشکێنین و خۆمان بەرەو تیسفون بڕۆین. ئەو وتی ئامادەکردنی سەرباز و تێچووی جەنگ لەلایەن منەوە دەبێت، مەشق و راهێنان و ئامادەکردنی جلوبەرگ و پێداویستیی سەربازیش لەلایەن تۆوە دەبێت.

تەلاووس پێشنیازەکەی سەرابۆدی پەسەند کرد، سەرابۆدیش کۆمەڵێك نێردراوی بەناو پارتیادا بلاوکردەوە، ئەوان دەیانوت رۆژی دواین (قیامەت) هاتووە، سەرابۆد ئەو کەسەیە کە ئاینی زەردەشتی لە مەترسی رزگار دەکات و دەیگەێنێتە پلەی یەکەم و پاکی، ئەرکی هەموو

پیاوانی زەردەشتییە کە بە بۆنەی ڕۆژی هاتنی رزگارکەری ئاینی زەردەشتەوە، خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن و ببنە تاکێك لە لەشکری رزگاری بەخش.(١)

خەڵك کە گوێیان بۆ زانایانی ئاینی دەگرت، وتەی نێردراوەکانیان پەسەند کرد و خۆیان ئامادە کرد بۆ چوونە ڕیزی لەشکرەکەوە، نێردراوەکان بە هەموو ئەو کەسانەی دەهاتنە نێو لەشکرەکەیانەوە پێیان رادەگەیاند کە ئەوان مووچە دەدەنە خێزان و منداڵەکانیان تا دوای رۆیشتنیان ژن و منداڵەکانیان بۆ بەردەوامبوونی ژیانیان بێ مووچە نەبن.

فەرمانڕەوای پارتیاش بەو زێڕ و خشڵانەی لە ئاگرخانەکەی وەرگرتبوو، پیشەوەرەکانی هاندا تا هەموو جۆرە چەکێك دەستەبەر بکەن. ئەو دەیزانی لەشکری بەهرام گالیسکەی جەنگیان هەیە، بۆیە دروستکردنی گالیسکەی جەنگی بە خەڵکی (گۆناباد) سپارد.

ناوچەی پارتیا دوو ناوەندیی پیشەسازی گرینگی هەبوو کە برێتی بوون لە (گۆناباد و تەبەس)، پیشەوەرەکانی ئەو دوو ناوچەیە لە بەرهەمهێنانی جۆرەکانی کانزا کارامەبوون.

ئەوان شمشێر و زووبین و نێزە و زرێیان بەرهەم دەهێنا، لە شاری کاشمەریش کە لە شارەکانی خۆراسان بوو، زرێیان دەچنی و هێندە لەو کارەیاندا وردبوون کە ئەوکاتەی بۆ خانەدانەکان ئەو زرێیانەیان لە بەرانبەر پارەیەکی باشدا دەچنی، ئەو زرێیەی بەرهەم دەهات وێڕای ئەوەی سووك و خۆش بوو، بە رادەیەکیش پتەو و بەهێز بوو کە رێگری دەکرد لە تێپەڕبوونی تیر و شمشێر و نێزە.

مێژوونووسە رۆژهەڵاتییەکان لەبارەی لەشکری خۆراسان زێدەڕۆییان کردووە و بە پێنج سەد هەزار کەسیان هەژمار کردووە. مێژوونووسە ئەرمەنییەکانیش ئەو ژمارەیەیان بە سەد هەزار سەرباز دیار کردووە، بە بڕوای ئێمە ئەو رێژەیەش هەر زۆرە، چوونکە لە لایەك دانیشتووانی ناوچە جیاکانی ئەوکاتی ئێران وەك سەردەمانی دواتری زۆر نەبووە، لە لایەکی دیکەیش بە دووری دەزانین کە لە توانای ئاگرخانەی نەیشاپوور و ئاگرخانەکانی سنووری ئەودا بووبێت کە

---

(١) لێرەدا ناتوانین سەبارەت بە ئۆلی زەردەشتییەکان لە سەردەمی ساسانییەکان بئاخڤین، چونکە زۆری پێویستە، بەو پێیەی لە ماوەی چوار سەدەی دەسەڵاتی ساسانییەکاندا گۆڕان بەسەر بنەما سەرەکییەکانی زەردەشتیدا نەهات، بەڵام دووجار بنەماکانی دیکەی ئەو ئاینە گۆڕان. تەنها ئەوە باس دەکەین کە یەکێك لە بیر و باوەڕەکانی زەردەشتییەکان ئەوە بوو کە ئەو ئاینە فریادڕەسێکی هەیە کە رۆژێك لە ڕۆژان دەردەکەوێت ئەو ئاینە لە لادانەکان و ئەو خراپەکاری و کێماسییانەی هاتوونەتە نێوی رزگار دەکات و دەیگەێنێتەوە بە پلەی پاکی و سەرەتای خۆی، کەواتە ئەو رۆژەی فریادڕەس دێت هەمان رۆژی کۆتاییە. "زەبیحوڵڵا"

وێڕای خەرجی خۆیان و خزمەتکار و بەڕێوەبەرەکانیان، بتوانن تێچووی ئامادەکردن و بەڕێوەبردنی لەشکرێکی سەد هەزار کەسی بگرنە ئەستۆی خۆیان، بە بڕوای ئێمە و بە لێکدانەوەکانمان دەتوانین ژمارەی پەنجا هەزار سەرباز بۆ ئەو لەشکرە بە دروست بناسین کە بەشێکیان پیادە و بەشێك سوارە و گالیسکەی جەنگیشیان هەبووە.

دوای ئەوەی کارتێر بە یاخیبوونی سەرابۆدی زانی، راستەوخۆ فەرمانی دەستگیرکردنی ناوبراوی بۆ فەرمانڕەوای خۆراسان نارد، فەرمانڕەوا هاوپەیمانی سەرابۆد بوو، فەرمانەکەی فەرامۆش کرد.

بەپێی فەرمانەکە دەبووایە تەلاووس، سەرابۆد بە زنجیرکراوی بۆ کارتێر رەوان بکات، ئەگەریش سەرابۆد بەرگری کرد، پێویستە تێکی بشکێنێت و سەری لە لاشەی جیا بکاتەوە، چوونکە تەلاووس هاوپەیمانی سەرابۆد بوو، ئەو فەرمانەی جێبەجێ نەکرد.

تا ئەو دەمە لەلایەن دامەزراوەی ناوەندیی زەردەشتییەوە فەرمانی بەو رادەیە توند بەرانبەر بە زانایەکی ئاینی زەردەشتی دەرنەکرابوو، تا ئەوکاتیش کە هێشتا سەدەی سێیەم بە کۆتا نەهاتبوو، لەو دامەزراوەیەدا هەندێ رێسا و نەریت بۆ رێزگرتن لە زانایانی ئەو ئاینە هەر مابوو، لەوانەیە ئەو رێسایانە لە سەردەمی ئەشکانییەکانیش هەبووبن.

یەکێك لەو رێسایانە کە لە دامەزراوەی زەردەشتی هەبوو، هاوشێوەشی لە دامەزراوەی کریستیان هەیە، برێتی بوو لەوەی ئەگەر کەسێك بیەوێت زانایەکی ئاینی بخاتەبەر لێدان، بە دەرچوو لە ئاین دەناسرێت، لە هەمان شوێن کوشتنی بە ئەرك دادەنرێت، ئەو رێسایە بۆ هەموو زانایانی زەردەشتی لە پلەکانی خواروو و سەروو بەهەند وەردەگیرا.

کارتێر دەیزانی کە هیچ سەربازێکی ئێرانی ئامادە نابێت زنجیر بکاتە ئەستۆی سەرابۆد یاخۆ سەری لە لاشەی جیا بکاتەوە، بۆیە لەو فەرمانەی بۆ تەلاووسی نارد بوو، فەرمانی کرد بوو کە ئەو ئەرکە بەو سەربازانە بسپێرێت کە لە ولاّتانی ژێردەستی ئێرانەوە هاتوون و بوونەتە سەربازی پاشای ئێران و لە خۆراسانن، هەندێك لەو سەربازانەی دەرەوەی ئێران کە لە خزمەتی پاشای ساسانیدا بوون، لە شوێنە جیاکانی ئێران لە سەربازگەکان .

لەوانەیە ئەو پرسیارە بێتە ئاراوە کە ئایا لە دامەزراوەی ناوەندیی زەردەشتیدا هیچ سزایەك بۆ ئەو زانایانەی ئاینەکە هەیە کە تاوان دەکەن؟، وەلاّمی ئەو پرسیارە نەخێرە، چوونکە بە بڕوای ئەوان زانای زەردەشتی دووچاری تاوان نابێت تا سزا بدرێت. بابەتی

سەرابۆدیش کە تا ئەو کات تەنیا لایەنی کارگێڕی ئاینی هەبوو واتە لایەنی بەڕێوەبردن و ئاینی هەبوو، لەو کات بە دواوە بووە مژارێکی سیاسیی هەموو ولأتەکە.

کارتێر نەیدەتوانی لە لای بەهرام، سەرابۆد بە یاخی بوو لە فەرمانەکان دەست نیشان بکات، چوونکە تا ئەو رۆژە هیچ نافەرمانییەك و هەڵەیەکی نەبوو کە نیشاندەری یاخی بوونی ئەو بێت، بەڵام دوای ئەوەی تەلاووس فەرمانەکەی جێبەجێ نەکرد، لە لای بەهرام ئەوی بە یاخی لە فەرمانەکان ناساند و وتی پێویستە لەشکر ببات و تەلاووس و هاوپەیمانەکەی واتە سەرابۆد دەستگیر بکات، چوونکە لەشکر بۆ جەنگی سەرابۆد دەچوو، بۆ ئەوەی هەستە ئاینییەکان نەبنە مایەی کێشە و بەرهەڵستی، کارتێر بە باشی زانی کە لەشکرەکە لەو سەربازانە پێکبێت کە خەڵکی دەرەوەی ئێران و خەڵکی ولأتانی ژێردەستی ساسانییەکانن.

لە ولأتانی ژێردەستی ساسانییەکان کە پاڵپشتی پاشای ساسانیان هەبوو، بەڵام بە جۆرێك لە جۆرەکان سەربەخۆ بوون، خەڵکی دلێر هەبوون کە خۆبەخشانە دەهاتنە نێو لەشکری پاشای ساسانی و مووچەیان وەردەگرت و بە سەربازانی لەشکری ناوزەد دەکران، پێدەچێت ئەو کات بەکاربردنی وشەی سەرباز نەبووە، هەرچەندە ئەو وشەیە لە زمانی فارسیدا هەبوو، بەڵام بەو واتایەی ئێستە هەیەتیی بەکار نەدەهات.

وەك ئەوە وابوو کە تاکە وشەی گونجاو لەنێو تەواوی زمانەکانی جیهاندا بۆ ئەو کار و پیشەیە وشەی سەرباز لە هەمووان گونجاوتر بوویێت.[2]،[3]

لەشکری تیسفون بۆ جەنگی تەلاووس و سەرابۆد لە بیست هەزار سەربازی دەرەوەی ئێران پێکهات، کە ناوی ئەو ولأتانە لە کەتیبەی رۆستەمدا هاتووە.

دوای ئەوەی لەشکر لە تیسفون کەوتەڕێ، فەرمان کرا لە تەواوی ناوچەکانی ئێرانەوە سەربازی دیکەی ولأتانی ژێردەستەی بخرێتەسەر.

---

(٢) لە زمانە ئەوروپاییەکان وشەی سەرباز بەپێی شێوە زارەکان بە سالّدات، ولّدا، سۆلّداتی و سۆلجەر دێت، هەموویان بە واتای وەرگری خوێ دێن، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە لە رۆمی کۆن و دواتر لە فەرەنسا و ئەڵمان مووچەی سەربازەکان بە خوێ دەدرایەوە. "زەبیحوڵلا"

(٣) هەڵبەت ئەو بابەتە تەنیا ڕای زەبیحوڵلایە و ناکرێت وشەی سەرباز کە بە واتای ئەوکەسە دێت کە سەری خۆی بۆ خاکەکەی دەبەخشێت بەرانبەر بکرێت بەو کەسەی کە مووچەی بە خوێ وەردەگرێت، دوا وتەش بۆ زمان ناسەکانە نەك بۆ مێژوونووسان. "وەرگێڕی کوردی"

کاتێك ئەو لەشکرە گەیشتە شاری (ڕەی) دووسەد هەزار سەربازی هەبوو، دیسان لەبارەی ئەو ژمارەیە پێویستە بە وریاییەوە هەڵسوکەوت بکەین، چوونکە نەزانراوە کە ئایا ژمارەی ئەو سەربازانەی دەرەوەی ئێران کە ئەوکات لەو وڵاتە دەژیان دەگەیشتە ئەو ژمارەیە یان نا؟.

مێژوونووسە ئەرمەنییەکان نووسیویانە مانۆیەکان باوەڕیان وایە کە خوێنی مانی بەردەوام دەکولێت و ئەوانەی ئەویان کوشتووە، یەك لە دوای یەك دەکوژێنەوە و هەموویان بە سزای خۆیان دەگەیێنێتەوە. نازانین کە ئایا بە ڕاستی نەفرەتی مانی و مانۆکان کاریگەر بوون یاخۆ نا؟، بەڵام کارەساتی سەرابۆد و کارتێر نێزیکەی مانگێك لە دوای کوژرانی مانی ڕوویدا و مێژووی وردی ئەو کارەساتە دیار نییە.[٤]

لەشکرە دوو سەد هەزار کەسییەکە بە نێو جەنگەڵ و لەوەڕگەکاندا لە شاری ڕەی بەرەو خوراسان کەوتنەڕێ، بە هۆی وەرزەی بەهارەوە گەرمایان نەدەبوو، چوونکە بوونی لەوەڕگە و جەنگەڵ و بێشەڵانەکان گەرمی هەواکەی دادەبەزاند.

ئێستە لە هەموو ئەو ڕێگەیە نە یەك بێشەڵان و نە جەنگەڵێك و نە لەوەڕگەیەك نییە، گۆڕانی ژینگە و ڕێژەی باران بارین، هەموو ئەو جەنگەڵ و لەوەڕگەنەی لەنێو بردووە، تەنیا دەشتی وشك و برینگ لە جیاتی ئەوان لەو ناوچەیە دەبینرێن. لە سەدەی سێیەم دەشتەکانی ناو بیابانی ناوەندی ئێران سەوز نەبوونن لەوانەیە تا زیاتر لە دە سەدە دواتریش پاشماوەی درەختەکانی مابن، ئەو دارانە هێندە پتەو بوون کە با و باران نەبوونە مایەی رزینیان، تا سەدەیەك بەر لە ئێستەش خەڵکی دەوروبەری بیابانی ناوەندی ئێران، ئەو دارانەیان بۆ سووتاندن دەبردەوە، یاخۆ دەیانکردن بە خەلووز، خەڵووزەکانیان بۆ سووتاندن دەبردەماڵەوە.

ڕۆژێك لەوکاتەی ئەو لەشکرە لە جەنگەڵێکدا دەحەسانەوە، نێزیکەی دوو هەزار سەرباز بە هۆی خواردنی میوەی جەنگەڵییەوە مردن. ئەو وتەیەی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان لە روانگەی مێژووییەوە، پێویستە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و بەو شێوەیە پەسەند کردنی باش نییە، چوونکە جەنگەڵەکانی ناو بیابانی ناوەندیی ئێران هەر وەك هاوشێوەیان لە ئێستەدا لە (

---

(٤) گومانمان نییە دادگەیی کردنی مانی لە سەردەمی بەهرامی یەکەم و بە فەرمانی کارتێر بووە، بەڵام مێژووی ئەو ڕووداوە بە وردی نەزانراوە و دەکەوێتە نێوان ساڵانی ٢٧٣ تا ٢٧٧ زاینی و ئارتۆر کریستیەن سێن لە پەڕتووکی (ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان) ساڵی ٢٧٦ ز دیاری کردووە. "زەبیحوڵڵا"

گیلان، مازەندەران و گۆرگان) هەیە، داری بەریان نەبووە، تەنیا هەنار و کانۆس (ئەزگیل) بە میوەی ئەو بێشەلانانە دەناسرێن.

لە لایەکی دیکە بەپێی وەرزەکە کە بەهار بووە ئەو میوانە پێ نەگەیشتوون، هەردووکیان لە وەرزی پایزدا دەگەن و لە وەرزی بەهاردا لەو جەنگەڵانە تەنیا (توو) پێ دەگات کە خواردنی توو نابێتە هۆکاری مردنی کەس، ئەویش بەو مەرجەی لە ئەوێ هەبێت.

بە تێگەیشتنی ئێمە لە سەرچاوە ئەرمەنییەکان، لەو وەرزەدا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازەکان بە خواردنی کوارگ (قارچك) ژەهراوی بوون.

لە وەرزی بەهاردا رێژەیەکی زۆر کوارگ لەو جەنگەڵانە دەڕوێت، سەربازەکانی ئەو لەشکرە بە هۆی ئەوەی هەموویان هی ولاتانی ژێردەستەی ئێران بوون و لەوانەیە کوارگ لە ولاتەکانیان نەبووبێت یاخۆ بەردەستی هەمووان نەبووبێت، بۆیە جیاوازیی نێوان کوارگی ژەهراوی و ناژەهراویان نەزانیوە. کاتێك چاویان بە کوارگی گەورە و رەنگاورەنگ کەوتووە، کەوتوونەتە کوڵاندن و خواردنیان. هەر وەك دەزانرێت لە رێگەی تامەوە ئەو جیاوازییە دەرناکەوێت، بۆیە تا نەکەوتوون، نەیانزانیوە کە ژەهراوییە. کوارگی ژەهراوی وەك ژەهری (ئێستەر کنین) وایە، هەر کەسێك بیخوات، بێگومان دەمرێت، بەڵام دانیشتووانی ناوچەکە شارەزاییان لە ناسینی جۆرەکانی کوارگ هەبووە و دەیانزانی کام جۆرە لە کوارگ دەبێت بخۆن تا ژەهراوی نەبن.

بە وتەی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان دوای مردنی دووهەزار سەرباز بە هۆی میوەی جەنگەڵی، بە رادەیەك ترس لە دڵیان نیشت کە تا ئەوکاتەی لە جەنگەڵ دەرچوون، تەنیا خواردنەکانی لایان بوو دەیان خوارد و دەستیان بۆ میوە نەدەبرد.

تەلاووس و سەرابۆد بڕیاریاندا لە دەشتی بیهەقی ناوچەی سەبزەوار بەر بە لەشکری تیسفون بگرن. لەشکرەکە لەژێر فەرماندەیی ئەفسەرێك بوو کە لە میرەکانی ولاتی (کلیکی) بوو، ژمارەیەك سەربازی ولاتی خۆشی لەگەڵدا بوون.

تەواوی ئەو پیاوانەی هاتنە نێو لەشکری سەرابۆد، دەیانزانی بۆ جەنگێکی ئاینی دەچن، بۆیە گومان لە دڵسۆزیان نەبوو...جگە لە سەربازانی سەربازگەی خۆراسان کە کارامە بوون، تەواوی سەربازانی دیکە کە بانگەشەی سەرابۆدیان پەسەند کردبوو بێ ئەزموون بوون، وێڕای ئەوەی لە ڕووی جەستەییەوە لاواز بوون، شارەزاییشیان لە هونەرەکانی جەنگ نەبوو، نەیان دەتوانی بەرگەی ماندووبوونی رێپێوانی درێژی رۆژانە و بێخەوی شەوان و ماندووبوونی رۆژانی

جەنگ بگرن. گرینگی بەردەوامی ڕاهێنان و مەشقی سەربازی لە رابردوودا زۆر پتر بوو لە ئێستە و ڕاهێنانەکانی ئێستە پتر تاکتیکین، بەڵام لە ڕابردوودا جەستەیی بوون.(٥)

سەربازانی لەشکری (جاتان) هەموویان کارامە بوون، بەڵام ژمارەیەکی کەم لە سەربازانی خۆراسان کارامە بوون، تەنانەت ئەگەر ورە و فیداکاری و ویستی زۆر بەهێزیش هەبن، ناتوانرێت لاوازی جەستەیی و کەم شارەزایی لە هونەرەکانی جەنگی پێ هاوسەنگ بکرێتەوە.

دوو لەشکری جاتان و خۆراسان لە وێنەی دوو زۆرانباز بوون کە یەکەمیان زۆر کارامە و شارەزا بوون بە هونەرەکانی وەرزشەکەی و ساڵانێك ڕاهێنانی کردبوو، ئەوەی دیکەیش شارەزای هونەرەکانی جەنگ نەبوو، تەنیا بڕیاری فیداکاری دابوو، لە مردن نەدەترسا. هەڵبەت فیداکاری ڕێگە لە شکست ناگرێت و لە بەرانبەر زۆرانبازە کارامەکەدا شکست دەخوات.

لەشکری خۆراسان لە پێدەشتی بیهەق توانای خۆڕاگرتنی بەرانبەر بە لەشکری جاتانی نەبوو، تەلاووس کە زانی توانای جەنگی نییە، بە پەلە فەرمانی پاشەکشەی دەرکرد و کشایەوە و لە لەشکری دوژمن دوورکەوتەوە، هێندە خێرا کشایەوە کە توانای دەربازکردنی هەموو کەرەستە و کەلوپەلە جەنگییەکانی نەبوو، بەشێکیان بەجێمان و کەوتنە بەردەستی لەشکری جاناتان.

دوای ئەو شکستە تەلاووس و سەرابۆد زانیان ناتوانن لە خۆراسان بەرگری بکەن و ئەو شارەیان جێ هێشت، لە جیاتی بەرەو ڕۆژهەڵات بڕۆن، بەرەو باشوور واتە سەگستان (زابلستان، سیستان) ڕۆیشتن. ئەوان دەیانزانی ئەگەر داوای یارمەتی لە پیاوانی ئازا و بەجەرگی ئەو ناوچەیە بکەن کە هەموویان لە ئاینی زەردەشتین، بێگومان یارمەتی دەدرێن و لە ڕووی خۆراکەوەش دووچاری دەست تەنگی نابن، چوونکە ئەوێ لە ناوچە ئاوەدان و بە بەرهەمەکانی ئێران بوو، مەڕ و ماڵاتی زۆر بە تایبەتی مانگای لێ هەبوو، ژنان و پیاوان لە جیاتی ئەسپ سواری گا دەبوون، ژنانی سەگستانی وەك پیاوانیان لە جەنگ بەشدار دەبوون.

لە ناوچەی سەگستان چەند ڕووبارێك هەبوون کە ئێستە جگە لە یەکێکیان کە هیرمەندە هەموویان وشك بوون، زۆری ئاوی ئەو ڕووبارانە لەوێندەر دانەوێڵەکانی یەکجار زۆر کرد بوو. ئاو لەو ناوچەیە هێندە زۆر بوو، کە ئەو کاتانەی قاتوقڕی لە هیندستان ڕووی دەدا، گەنم لەو وڵاتەوە بۆ ئەوێ هەناردە دەکرا، لە سەردەمی ساسانی و ئەشکانییەکان چەندین جار بەرهەمی

(٥) تەنیا بۆ زانینی گرینگی ڕاهێنانی جەنگی باسی ئەوە دەکەین کە لە هەندێ لە وڵاتانی کۆن ڕاهێنان لە پازدە ساڵی دەستی پێدەکرد و تا سی ساڵی بەردەوام دەبوو. "زەبیحوڵڵا"

دانەوێڵەی ئەو ناوچەیە، ناوچەی سێندی لە قاتوقڕی رزگار دەکرد، لەو ناوچەیە ساڵی دووجار گەنم هەڵدەگیرایەوە، زەوی هێندە زۆر بوو کە دەیانتوانی دوو ساڵ زەوی بە بەیاری بهێڵنەوە و لە ساڵی سێیەم زەوییەکە بچێنن.

جاتان دوای داگیرکردنی نەیشاپوور، تەواوی شارەکانی دیکەی خۆراسانی داگیرکرد، ئەوکات هەوڵیدا بەرەو سەگستان بڕوات و تەلاووس و سەرابۆد دەستگیر بکات، بەڵام پایز هات و وەرزی لەشکرکێشیی کۆتایی هات، جاناتان ناچار بوو کە پایز و زستان لە خۆراسان بمێنێتەوە و لە بەهاردا بەرەو سەگستان بڕوات.

جاتان لە بەهاری ساڵی (٢٧٦ ز) لە باکوری خۆراسان کە بە پارتیا ناسرا بوو، بەڕێ کەوت، ئەوکات لە سەرەتای بەهار لە هەندێ شوێنی خۆراسان بەفر دەباری و جاتان ئەو خۆپارێزییەی نەکرد، لە ئاکامدا لە چوارەمین ڕۆژی بەڕێ کەوتنەکەی لە ناوچەیەکی شاخاوی دووچاری بەفرێك بوو کە ناچار بە وەستانی کرد، جاتان بە ئومێدی ئەوەی بەفر بە زوویی بتوێتەوە و بە یەکەمین رۆژی هەتاوکەوتن بەفر نەمێنێت، بەڵام ئەو دۆخە دژوارە چەند رۆژێکی خایاند، هەوا تا دەهات ساردتر دەبوو، سەرمای توندی ئەو ناوچە شاخاوییە سەربازەکانی جاتانی خستە بارێکی سەخت.

نازانین کە جاتان ئەو بەهارە بە کوێدا رۆیشتووە کە دووچاری بەفری قورس بووە، تەنیا بە گومانی خۆمان ئەو بە شاخەکانی قوچان یاخۆ ناوچەی (توربەت حەیدەریە)دا بەرەو باشوور واتە سەگستان رۆیشتووە، جگە لەو دوو ناوچە شاخاوییە، لە رێگەی ئەودا هیچ شاخێك نەبووە تا ئەو رابگرێت، بۆیە ئەو شاخانەی توانیان لەشکری بەهرامی یەکەم بە سەرکردایەتیی جاتان رابگرن قوچان یاخۆ ئەو ناوچەیە بووە کە ئێستە بە توربەت حەیدەریە ناو دەبرێت.

لەوێندەر دەست و قاچی هەندێ لە سەربازان بە هۆی سەرماوە چوو، وێڕای ئەوەی جاتان پیاوێکی ئازا بوو، بەڵام ڕووداوی ژەهراوی بوونی سەربازەکانی و بابەتی چوونی دەست و قاچی سەربازەکانی بە هۆی بەفرەکە، نیشاندەری ئەوەن کە سەرکردەی ئازا پێویستی بە زۆر شتی دیکەیش هەیە کە بیزانێت تا بتوانێت لەشکرەکەی بەڕێوە ببات و بیگەێنێتە شوێنی جەنگ. بۆیە لە کۆنەوە تا ئێستە فەرماندە دەبێت کەسێك بێت وێڕای ئازایەتی، خودان ئەزموونیش بێت و بکارێت ئەو بویەرانە پێشبینی بکات کە لەوانەیە بۆی ڕووبدەن.

دوای ئەو زیانانەی بەر لەشکری جاتان کەوت، هەتاوی گەرمی بەهار بووە هۆی توانەوەی بەفر و رێگەی کوێستان بە ڕووی لەشکردا کرایەوە، ئەوان کەوتنەڕێ و لە ناوچەی شاخاوی

دەرچوون و گەیشتنە پێ دەشتێك، لە ڕێگەبڕین بەردەوامبوون تا گەیشتنە ناوچەی (نیك نان یاخۆ نیكنام)، كە بە جەنگەڵ و لەوەڕگە داپۆشرا بوو، چەندین زێ كە لە شاخەكانەوە دەهاتن، ئاویان دەدا و ڕێگەیەكی گەورە لە نێوەڕاستی ئەو ناوچەیە كە ئەمڕۆ بە بیابانی ناوەندیی ئێران ناسراوە، تێپەڕ دەبوو، لەو شوێنانەی كەوتبوونە ڕۆژئاوا وەك شیراز و كاشان كۆتایی دەهات.

ئەو ڕێگەیەش بەنێو جەنگەڵ و لەوەڕگەكاندا دەڕۆیشت، لە كاتێكدا ئێستە بە درێژایی ئەو ڕێگەیە كە بە بیابانی ناوەندیی ئێراندا دەڕوات، هیچ سەوزاییەك نابینرێت، تەنیا دەشتێك نەبێت كە بە (خۆرۆ جۆندەق) ناو دەبرێت.

جاتان ماوەی چەند ڕۆژێك لەو ناوچەیە مایەوە بۆ پشوودانی سەربازەكانی كە سەرما شەكەتی كرد بوون، دواتر لەو ناوچە بە پیتەوە كەوتەڕێ، بێ ئەوەی بەو ناوچە كوێستانییەدا بڕوات كە دەكەوتە نێوان هەردوو شاری ئێستەی (فێردۆس و گوڵشەن)، ئەو لە ڕێگەی دەشتە تەختەكانەوە ڕۆیشت.

دوای چەند ڕۆژێك لە ڕێگە بڕین و ڕۆیشتن، لە نیوەڕۆی ڕۆژێكدا كە بۆ پشوودان لەشكرەكەی وەستاندبوو، لە دواوە پەیكێك هات هەواڵی مردنی بەهرامی لا بوو، فەرمانێكی لە جێنشینی بەهرام هێنابوو كە فەرمانی بە گەڕانەوەی بە پەلەی دەكرد بۆ پایتەخت، چوونكە لەشكرەكەی لە پایتەخت پێویست بوو.

پێش ئەوەی بكەوینە باسی تەلاووس و سەرابۆد و بزانین كە چییان بەسەر هات، پێویستە بڵێین دوای مردنی بەهرامی یەكەم و هاتنەسەر كاری كوڕەكەی واتە بەهرامی دووەم، لە ئێران لە ساڵی (٢٧٧ ز) گۆڕانێكی ئاینی هاتەكایەوە و میتراپەرستی سەریهەڵدا.

لە هەر ناوچەیەكی جیهان كە میتراپەرستی هاتبێتە كایەوە، لەوانەش لە ڕۆم، بێ دوودڵی لە ئێرانەوە چووە و سەرچاوەی میترا یاخۆ مهرپەرستی ئێران بووە.

میترا یەكێك لەو سێ خوداوەندانە بوو كە لە سەردەمانی كۆندا نەتەوەكانی ئێران دەیانپەرست، دواتر بوونە چوار خوداوەند، بەڵام لە تەواوی ئەو سەردەمانەی ئێرانییەكان ئەو سێ خوداوەندەیان دەپەرست، میترا خوداوەندی گەورەیان بووە، دواتریش كە بوون بە چوار خوداوەند، دیسان هەر میترا گەورەی خوداوەندكان بوو، تا ئەو كاتەی زەردەشت هات و ئێرانییەكان هاتنە سەر ئاینی زەردەشت و (ئاهورامەزدا)یان پەرست كە خودای تاقانەی ئەوان بوو، بەڵام دوای ئەوەی ئێرانییەكان بوونە یەكتاپەرست، میترا لە باوەڕی ئاینی ئەواندا

گرینگی و شکۆی خۆی لە دەست نەدا، هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە لە ئاڤێستادا زۆر بە گەورەیی باس لە میترا یاخۆ مهر کرا بوو، بە تایبەتی لە یەشتەکاندا کە بەشێکە لە ئاڤێستا.

میترا یاخۆ مهر بەپێی ئەوەی لە ئاڤێستادا هاتووە، هێمای هەتاو و ڕووناکییە و جیهان ڕۆشن دەکاتەوە و دێوی تاریکی لەنێو دەبات، بەڵام کاریگەریی مهر یاخۆ میترا لە جیهانی مرۆیدا تەنیا درەوشانەوە بۆ مرۆڤ و لەنێوبردنی تاریکی نییە، بگرە ئەو لەگەڵ نەزانی و نەخۆشی و نەبوونیدا دەجەنگێت و ناهێڵێت نەبوونی و نەزانی و نەخۆشی بەسەر مرۆڤاندا سەربکەون و چاوەدێری بارینی باران دەکات تا ڕووبارەکان پڕ بن و مرۆڤ بکارێت کێڵگەکان ئاو بدات.میترا پشتیوانی ئاژەڵە بە سوودەکانی وەك (گا، مەڕ، ئەسپ و پەلەوەر)ـە زیانی گیانلەبەر و ئاژەڵە خراپەکان لە مرۆڤ دوور دەخاتەوە، بە دروستی کاتی دەرکەوتن و سەرهەڵدانی زەردەشت نازانرێت، دەوترێت کە پێنج سەد ساڵ بەر لە هاتنی مەسیح هاتووە، بەڵام میترا لە ئێران زۆر کۆنترە لە زەردەشت و وشەیەکی فارسی پەتییە و پلۆتارك پشتڕاستی دەکاتەوە کە ئەو وشەیە، نەریتی میتراپەرستی لە ئێرانەوە چۆتە رۆم.

زانیاریمان نییە کە لەسەر سەردەمی ئەشکانییەکان بیروڕای خەڵك لەبارەی میترا چ بووە و چۆن بووە، ئاخۆ میتراپەرستی لە چ ئاستێك بووە؟، چوونکە لەو سەردەمە مێژوویەکی نووسراوی تەندروستمان لە بەردەست نییە تا بزانین رای ئەوان لەبارەی میترا چ بووە؟، بەڵام دوای هاتنی ساسانییەکان، ئەو ئاینە سست بۆوە، چوونکە ناوەندێکی ئاینی زانا ئاینییەکان دامەزرا، ئەو ناوەندە ئاینییەی هەبوو میترای دوورتر خستەوە و هەموو بابەتە ئاینییەکانی کۆکردەوە و لە بابەتی پەرستینی میتراگەرا تا وەك خۆی بێت و بۆ پەرەسەندنی هیچ هەنگاوی نەنا.

لە دامەزراوەی زەردەشتیدا، میترا ئاهورامەزدا نەبوو تا ئافرێنەری کات و شوێن بێت و (ئێم شاسپەند) نەبوو کە لە لای زاناکانی ئەو ئاینە فریشتە نێزیك و پلە یەکەکان بوون.

میترا لە باوەڕی زاناکانی زەردەشتی بوونەوەرێك بوو، مەزنتر لە فریشتەکان و لە پلەی یەکەمدا بوو، بەڵام ئەو ناوەندە ئامادە نەبوون تا میترا وەك ئاهورامەزدا ببینن. دوای هاتنی بەهرامی دووەم بۆ شوێنی باوکی و بوونی بە پاشا، بە هۆی هۆگربوونی زۆری بەهرامی دووەم بۆ میترا، پەرستنی میترا برەوی سەند و ئەو هاندەر بوو بۆ ئەو ئاینە.

بەڵام ئەوە نەزانراوە ئاخۆ کارتێری سەرۆکی دامەزراوەی زەردەشتی رای لەو بارەوە چ بووە و لە کەتیبەکەیدا هیچ باس نەکراوە، چوونکە بەهرامی دووەم میتراپەرست بوو، بۆیە کارتێر بێ دەنگی نواندووە و ڕەنگە لەبەر بەرژەوەندییەکان خۆی گونجاند بێت؟!.

هەندێ بابەت دەریدەخەن کارتێر بە بیروڕای بەهرامی دووەم رازی بووە، ئەوانیش برێتین لە نارەزایەتی توندی سەرابۆد لە سەگستان، دواتر لە خۆراسانەوە لە دژی کارتێر لە بەرانبەر میتراپەرستی، هەڵبەت دژایەتیی ئەو پتر سیاسیی بووە تا ئاینی بێت و بابەتی ئاینی تەنیا کردووەتە دەستەچیلە بۆ بەربەرەکانی کارتێر تا بتوانێت لەو شوێنانە خەڵك لە دژی ئەو هان بدات و هانیان بدات تا بۆ جەنگ ئامادە بن، بەڵام بابەتی پەرستنی میترا لەلایەن کارتێرەوە لە دیدی خەڵکی خۆراسان و سەگستان (سیستان)، نەدەبۆوە هۆی ئەوەی ئەوان بۆ لەنێوبردنی کارتێر بەو هۆیەوە بێنە نێو جەنگ.

میترا بە رادەیەك لە باوەڕی ئێرانییەکاندا جێگەی هەبوو کە نەیاندەتوانی لە ئاهورامەزدای جیابکەنەوە، لەوانەشە ئەو کاتەی کارتێر و دامەزراوەی زەردەشتی کەوتنە بانگەشە بۆ میترا، تا رادەیەك دووچاری سەرسووڕمانیش هات بووبن، چوونکە لە سەرەتای هاتنی ساسانییەکانەوە تا ئەوکات ئەو شێوە بانگەشەکردنە بۆ میترا نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کەس کارتێر و زانا ئاینییەکانی بە هۆی نەبوونی بانگەشە بۆ میترا بە لادەر نەزانی، تا لەسەر کردەوە تازەکەیان بکوژرێن.

دامەزراوەی ناوەندی زەردەشتی پێشنیازی کرد تا ئاگرخانەی تازە بۆ میترا بکەنەوە و ئەو پێشنیازە لەلایەن خەڵکی سەرمایەدار و خاوەن توانا نەتەنیا پێشوازی لێکرا، بگرە هەوڵی باشیشی بۆ درا. چوونکە میترا خوداوەندی هەتاو و ڕووناکی و جەنگ لەگەڵ تاریکی بوو، بەو هۆیەوە لە نێوان ئەو و ئاگردا پێوەندیی هەبوو. لە ئێران لەلایەن چینی خاوەن توانا و سەرمایە ئاگرخانەکان چێ دەکران، بۆ خەڵکی دیکەیش دیاری کرا کە هەر یەکەیان بەپێی توانا هەندێ موڵك و ماڵ و سامان و....هتد ببەخشنە ئەو ئاگرخانە نوێیانەوە بۆ ئەوەی بەڕێوەبەر و خزمەتکاریان بۆ دەستەبەر بکرێت تا هەرگیز ئاگر لەو ئاگرخانانەدا نەکوژێتەوە.

لێتۆژ و نووسەری فەرەنسی (رەنان) یەکێك لەو کەسانەیە کە لەبارەی میتراپەرستی لێکۆڵینەوەی هەیە و دەڵێت: ئەگەر ئاینە یەکتاپەرستەکان نەهاتبانە، بێگومان میتراپەرەستی دەبووە ئاینێکی جیهانی و هەموو شوێنێکی دەگرتەوە، چوونکە لەو ئاینەدا شێواز و ڤانی دیار و بەهێزی وا هەبوو کە هەموو نەتەوەکان لەسەری رەزامەند دەبوون.

میترا بە باوەڕی ئێرانییەکانی کۆن، تەنیا بۆ سەرکەوتنی مرۆڤ نەدەجەنگا و بەردەوام لە جەنگ بۆ زاڵبوون بەسەر خراپەدا بوو، ئەو لە پێناو نەمانی نەبوونی و نەخۆشی و نەزانی دەجەنگا و دەیویست درۆ و دووڕوویی لەنێو مرۆڤەکان نەمێنێت.

بە سەرەنجدان لەو بابەتە بۆچی دوای راگەیاندنی ئەو ئاینە لەلایەن بەهرامی دووەمەوە، سەرابۆد کەوتە بەربەرەکانی؟ لە وەڵامدا دەگوترێت چوونکە کارتێر میتراپەرستی برەو پێ دەدا و دوژمنی سەرابۆد بوو، ئەو نەیدەتوانی بەو ئاینە رازی بێت و پەسەندی بکات.

تەلاووس واتە فەرمانڕەوای خۆراسان دژی میتراپەرستی بوو، ئەو دژایەتییەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەو نەیدەتوانی لە سەرابۆد جیا ببێتەوە و لەگەڵ بۆچوونی کارتێر ڕەزامەند بێت. چوونکە ئەو یاخی ببوو، بەپێی ئەو ڕێسایانەی ئەوکات و پێش ئەوکات هەبوو، سزای توند بۆ یاخیبووان هەبوو، تەلاووس نەیدەتوانی بە ئارامی بژێت، چوونکە یان دەبووایە بەسەر ساسانییەکاندا سەربکەوێت یان لە جەنگدا بشکێت و سەری لە لاشەی جیا بکرێتەوە و بۆ پایتەختی ساسانی رەوانە بکرێت. بە پێچەوانەوە تا ئەو رۆژەی لە وڵاتانی ژێردەستی ساسانی بوو، نەیدەتوانی ئاسوودەیی و تەناهی بۆ خۆی دەستەبەر بکات و لەشکری ساسانی لەدوای نەدەبۆوە تا ئەو دەستگیر بکەن، بۆیە بەردەوام دەبوو تا ئەوکاتەی سەریان لە لاشەی جیا دەکردەوە و بۆ پایتەختیان دەنارد.

بەهرامی دووەم کە تازە بە دەسەڵات گەیشت بوو، هێندە نەرمی نواندنی نەبوو تا لێبووردن بۆ تەلاووس دەربکات و هاندەر بێت بۆ وازهێنانی لە یاخیبوون، جیابوونەوەی تەلاووس بۆ پاراستنی خۆی و بوونی خۆی بوو.

پاشا گەورەکانی وەك داریوشی یەکەم و خەشایارشا زۆر جار یاخیبووانیان دەبەخشی تا پەشیمان ببنەوە و جەنگ ڕوونەدات و بارودۆخەکان سەختتر نەبن و جەنگەکان درێژتر نەبن، لە کاتێکدا کە توانایان زۆر لە بەهرامی دووەم پتر بوو، بەڵام ئەوان دەیانزانی کە جەنگی درێژخایەن زیانی زۆری بۆ گەنجینەکانی ئەوان دەبێت و پیشەسازی و کشتووکاڵ لە هەندێ ناوچەی وڵات رادەگرێت.

مۆنتسکیۆ نووسەری بەناوبانگ و خاوەنی پەڕتووکی (ڕۆحی یاساکان)، کە شێوازی نووسینی خۆی لە ڕاستییەکانی ژیانی نەتەوەکان و دەسەڵاتدارانەوە وەرگرتووە، بەشێکی پەڕتووکەکەی تایبەت کردووە بە لێبووردنی دەسەڵاتدارن، لە پەڕتووکەکەیدا بەخشینی هەندێ لە تاوانباران لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە وەك سزادانی تاوانباران بە ئەرك دەزانێت و دەڵێت: هەندێ کات

لێخۆشبوون لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە دەتوانێت ڕێگر بێت لە ئاژاوەی دوورودرێژ، تەنانەت تەلاووس پێشدەستی کرد بۆ داوای لێخۆش بوون و بێ ئاگەداری سەرابۆد هەوڵیدا تا داوای لێخۆش بوون لە بەهرامی دووەم بکات و کەسێکی نارد تا لە ڕێگەی ئەوەوە داوای لێبۆردن بکات، بەڵام بەهرامی دووەم تکای ئەو کەسەی نەگرتەوە و وتی ئەو پیاوە بۆتە هۆکاری جەنگ و نافەرمانی کردووە و پێویستە سزای ئەو کارەی خۆی وەربگرێت.

# ڕۆمەكان لە نێزیك شاری تیسفون

لە یاساكانی حەمورابی پاشای بابل كە لە یەكەمین دەورەی هەڵكەندنەكان لە شووش بەردەست كەوتوون، ئامۆژگاری بۆ لێخۆشبوون كراوە، ئەو یاسادانەرە رای سپاردووە كاتێك تاوانبارێك لە گوناهەكەی پەشیمان دەبێتەوە، پێویستە دەسەڵاتدار لێی خۆش بێت، شتێكی سرووشتییە لێبووردن ئەو كاتە دەبێت كاتێك تاوانبار هێشتا توانای بەرگری هەیە. بەپێی یاسای حەمورابی، دەسەڵاتدار دوای ئەوەی دڵنیابوو تاوانبار بە تەواوەتی پەشیمان بۆتەوە، بۆ ئەوەی ڕێگە بگرێت لە درێژبوونەوەی جەنگ و زۆرتر بوونی خوێن رشتن، دەبێت بیخاتە بەر لێخۆش بوون، بەڵام بەهرامی دووەم دوای ئەوەی داوای لێخۆشبوونی لەلایەن تەلاووسەوە بە نهێنی پێگەیشت، رەزامەندی نەنواند و بووە هۆكاری ئەوەی تەلاووس لەسەر یاخیبوونەكەی بەردەوام بێت.

تەلاووس لە پاشماوەی شازادەكانی ئەشكانی بوو، دوای ئەوەی داوای لێخۆشبوونەكەی پەسەند نەكرا، ئەو باوەڕەی لەلا دروست بوو كە ئەو رەتكردنەوەیە بە هۆی ئەوەیە كە ئەو پاشماوەی ئەشكانییەكانە و لێخۆشبوون بە مەرجی خۆ بە دەستەوەدان نایگرێتەوە. هەردوو پاشای یەكەم و دووەمی زنجیرەی ساسانییەكان، رقیان لە ئەشكانییەكان هەبوو، بەو گریمانەیەی كە پێشتر باسمان كرد نەیان ویستووە مێژووی ئەشكانییەكان لەنێو مێژووی ئێران بنووسرێتەوە.

لە گەرمەی ئەو ڕووداوانەی ئێران، لە رۆم ئیمپراتۆرێك بە ناوی (كارۆس) هاتە سەر تەختی دەسەڵات و ماوەیەكی زۆر بوو كە رۆم ئیمپراتۆری ئاوا زیرەك و دوور لە هەوەسبازی بە خۆوە نەبینی بوو.

پێش ئەوەی ئەو بگاتە تەختی دەسەڵات لە رۆم كەس بە كەس نەبوو، تەواوی ئەو ڕێگەیانەی بەرەو رۆم دەچوون لەلایەن چەتەكانەوە كۆنترۆل كرا بوون، هیچ كاروانێك بە بێ دانی باج بە چەتەكان، نەیدەتوانی لەو ڕێگە سەرەكییانە تێپەڕ ببێت.

چەتەكان نەتەنیا دەسەڵاتیان لەسەر ڕێگەكان هەبوو، بگرە ماوە ماوە هێرشیان دەكردە سەر شارەكان و سامانی خەڵكیان بە تاڵان دەبرد، تەنانەت كچە گەنجەكانیشیان بە دیل دەبرد. ئەو پشێویە تا ئەو رادەیە پەرەی سەند بوو، گەیشتبۆوە نێو لژیۆنەكانی رۆمیش كە ڕێكو

پوختترین دەزگەکانی سەردەمی جیهانی کۆنن، وەك وتمان شاپووری یەکەم پاشای ساسانی، بەشێك لە دامەزراوەی سەربازی خۆی بە لاسایی کردنەوە لە رۆمەکان دامەزراند بوو.

یەکێك لەو هۆکارانەی زۆر کاریگەر بوو لە دروستبوونی ئەو نالەباری و کێبەرکێیەی لە رۆم هاتە کایەوە، لێدانی دراوی ساختە بوو لەلایەن دامەزراوەکانی دراو دروستکردنی رۆمەوە، بەر لە هاتنی کارۆس بۆ سەر تەختی دەسەڵات.

دەسەڵاتدارانی رۆم وایانزانی ئەگەر مس و سۆرب بکەنە نێو دراوی زێڕ و زیوەوە، کەس نازانێت و لە بەرانبەریشدا پارەیەکی زۆریان لە ماوەیەکی کەمدا دەست دەکەوێت، بەڵام هەر بە زوویی خەڵك ئەو بابەتەی بۆ دەرکەوت و وایلێهات کەس پارەی رۆمی تەنانەت لەنێو رۆمیش وەرنەدەگرت و بازرگانی و ساتوسەودایی بە دراوی بیانی یاخۆ دەرەوە دەکرا.

وەك زانراوە لە تەواوی سەردەمەکان دراوی دەرەکیی لای دراو گۆڕەرەوەکان و بازەڕەکان (ئێستە لە بانکەکانیش) دەست دەکەوێت، بەڵام لای خەڵکی ئاسایی کە موڵکیان نەبوو، ئەستەمە دەست بکەوێت، بۆیە ژیانی ئەوانەی دەبووایە پێداویستییەکانیان دابین بکەن، لەو کاتانەدا زۆر سەخت دەبێت و بە سەختی پێداویستییەکانیان پیێ دابین دەکرێت.

سەختییەکانی خەڵکی رۆم گەیشتە ئاستێك کە تاکە دەزگەی کاتبەسەربردن یاخۆ پشوودان و رابواردنی گشتیی ئەوان واتە سێرك داخرا، تەنیا گەرماوەکان مانەوە کە بە (تەرم) ناو دەبران، سەرمایەدار و خانەدانەکان بۆ ئەوەی کاتەکانی خۆیان بەسەر ببەن رێگەیان نەدەدا تەواوی ئەو گەرماوانە دابخرێن، وەك زانراوە گەرماوەکانی رۆم، جگە لە شوێنی خۆشووشتن، خواردنگە و پەرتووکخانە و حەوزی مەلەوانی تێدا بوو، خانەدانەکان بەیانیان دەرۆیشتنە ئەوێ و بەر لە رۆژئاوابوون دەگەڕانەوە.

یەکەمین هەنگاوی کارۆس دوای هاتنی بۆ سەر تەختی ئیمپراتۆری بریتی بوو لە چەسپاندنی دراوی رۆمەکان، ئەو کارەی ئەو بە شێوازێکی هێندە پتەو و پوخت ئەنجامدرا، تەنانەت دوای (١٦٨٠) ساڵ لە کارەکەی ئەو، جەنەراڵ (شارڵ دیگۆڵ) لە فەرەنسا بە هەمان رێگە و لە ساڵی (١٩٦٠ ز) فرەنکی فەرەنسی چەسپاند.

کاری کارۆس ئەوە بوو کە لە لای راستەوە دوو سفری سەر دراوی رۆمی لابرد، کە بە (پۆڵس) ناو دەبرا، سەد پۆڵسی کردە یەك پۆڵس، بەڵام پۆڵسی نوێ بریتی بوو لە زێڕی تەواوی عەیار (نەوەد).

ئەو بانگەشەی کرد کە ئەو کەسەی تا ئێستە ڕۆژانەی کارکردنی بەرانبەر بە نەوەد پۆڵس بووە، لەمەودوا تەنیا یەك پۆڵس وەردەگرێت، بەڵام پۆڵسی نوێ بەرانبەر سەد پۆڵسە.

ئەو کەسەی سەد پۆڵس قەرزداری کەسێکی دیکەیە، لەمەو بەدواوە تەنیا یەك پۆڵسی لێ وەردەگرێتەوە کە زێڕی تەواوە.

جەنەراڵ دیگۆڵێش لە ساڵی (١٩٦٠ ز) لە فەرەنسا هەر ئەو کارەی کرد و دوو سفری لەسەر دراوی فرەنك هەڵگرت، دراوی نوێی فرەنکی فەرەنسی لە سەدەوە کردە یەك و بە بنەمای زێڕ دیاری کرد.

کارۆس بۆ ئەوەی بکارێت لە کارەکەی سەرکەوتوو بێت، هەموو ئەو زێڕ و زیوەی لە کۆشکەکان و لە گەنجینەدا هەیبوو بۆ شوێنەکانی پارە لێدانی نارد، ئەو فەرمانی کرد تەواوی قاپ و پەیکەر و...هتد کە لە زێڕ و زیو بوون بدرێنە ئەو شوێنانە تا پارەی تەواو بکەوێتە بەردەستی خەڵکی ئاسایی، تەنانەت فەرمانی کرد هەڵۆکانی لژیۆنە ڕۆمەکانیش کە لە زێڕ بوون، وەك نیشان و ئاڵای ئەوان بوون، بتوێنرێتەوە و لەو بوارە سوودی لێ وەربگیرێت، هەروەها دراوە کۆنەکەشی کۆکردەوە تا سوود لەو زێڕە کەمەی ناوی وەربگیرێت.

هاوکات لەگەڵ چەسپاندنی دراوی ڕۆم، کارۆس دەستی کرد بە ڕێکخستنەوەی لژیۆنەکانی ڕۆم و بەهێزی کردنەوە، چوونکە ئەو بۆ ئەو کارانەی دەیویست بە ئەنجامیان بگەیەنێت، پێویستی بە لەشکرێکی بەهێز هەبوو. ئەو دوای ڕێکخستنەوەی لژیۆنەکان، زۆر بێ بەزەییانە کەوتە لەنێوبردنی چەتەکان، هەر یەکێکی لەوان دەستگیر دەکرد لە کەناری ئەو شاڕێیە لە خاچ دەدا، کە پێشتر چەتەیی لێ کرد بوو، لە هەندێ لەو شاڕێیانە ژمارەی ئەو چەتانەی لە خاچ درا بوون هێندە زۆر بوون کە سەردەمی یاخیبوونی کۆیلە ڕۆمەکان بە سەرکردایەتیی سپارتاکۆس دەهاتەوە بەر دیدەی مرۆڤ کە تیایدا چوار هەزار کۆیلە دوای دەستگیرکردنیان لە دوو لای شاڕێیەك بە ناوی (وییا ئاپیا) و بە درێژایی دە میل (١٦ کم) لە خاچ دران.

نەوەی چەتەکان لە ڕێگەکانی ڕۆم بە تەواوەتی لەنێوبران، کاروانەکانی گەشتیاری و بازرگانیی کەوتنەوە جووڵە.

دوای ئەوەی دراوی ڕۆم چەسپا، تەناهی و ئاسایش بۆ ڕێگە و شارەکان گەڕایەوە، سێرکی ڕۆم و ویلایەتەکانی ڕۆم کەوتنەوە گەڕ، خەڵك زۆر دڵخۆش و خۆشحاڵ بوون لەوەی جارێکی دیکە بە وتەی خۆیان بە (پان أ سێرسەن) واتە (نان و سێرك) گەیشتنەوە، پان بە واتای نان دێت، کە لە زمانی فارسییەوە ڕۆیشتووە بۆ (کاتی نیۆم) و لە زمانی لاتین بۆتە (پان).

پێش هاتنی کارۆس لەبەر هەژاری و پەشێوی وڵات، هەزاران ژن کەوتبوونە دەرگیری لەشفرۆشی و بەدڕەوشتی ببوون لە پێناو پەیداکردنی بژێویان لەو ڕێگەیەوە، کارۆس هەموو ئەو ژنانەی لە کارگەکانی (ڕستن و چنین، دەفر و ئامان چێکردن و کارگەکانی بۆن) خستنە سەر کار.

پێش هاتنی کارۆس یەکێك لە دروشمەکانی ئیمپراتۆرەکان ڕابواردن و خۆشگوزەرانی بوو، ئەو بە پێچەوانەی پێشینانی خۆی شەرابی نەدەخواردەوە، تەنیا نیو دەمژمێری بۆ ژەمەکانی خواردنی دادەنا، خۆی لە خواردنی قورس و چەور دەپاراست، لە کاتێکدا کە پێشینانی ئەو کۆڕی شەوانەیان بۆ خواردن و خواردنەوە تا بەرەبەیانی دەخایاند، بەرەبەیانیش ئەوانیان بە سەرخۆشی دەبردە ژورەکانیان و بۆ ناو جێگەکانیان تا بنوون.

کارۆس تەنیا چاکسازی ئەنجام نەدا، بگرە تەواوی ویلایەتەکانی ڕۆمیشی خستە بەر چاکسازی و ئەو ویلایەتانەشی بۆ ڕۆم گەڕاندەوە کە لێی جیا ببوونەوە، لە هەموو ئەو ویلایەتانە خەڵکێکی خۆی دیاری کرد تا بە نهێنی وەك سیخوڕ و لە ڕێگەی ئەو نامانەی بە شێوەی هێما دەنووسران، بەردەوام هەواڵی ئەو شوێنانەی پێ بدەن. وەك زانراوە ڕۆمەکان لە نووسینی نامەی بە هێما لە پێشەنگی تەواوی نەتەوەکان بوونە لەو بوارەدا، هێماکانی (ژۆل سێزار) یاخۆ (سێزار) هێشتا لە تەواوی جیهان بەناوبانگە.

ئەو نامانەی سیخووڕەکانی لە ڕێگەی کاروانەکانەوە دەیان ناردن، تەنیا لەلایەن کەسانی تایبەت کە نهێنییەکانی ئەو هێمایانەیان دەزانی و لە دەزگەکانی حکوومەت کاریان دەکرد، دەخوێندرانەوە، دانەر و داهێنەری زانستی ئەو نامانە بوون، کە ئێستە ئەو نامانە لە ئەورووپا بە (کریپ تۆگرافی) دەناسرێت و بریتی بوون لە تێلەگرامی نهێنی کە هێمایان پێویست بوو.

سیخووڕەکانی کارۆس هەواڵیان پێ گەیاند کە تەلاووسی فەرمانڕەوای خۆراسان یاخی بووە، چوونکە یەکێکە لە شازادەکانی ئەشکانی، ئەگەر بەردەستی بەهرامی دووەم بکەوێت، دەیکوژێت، بۆیە ئەگەر پاڵپشتی بکرێت، دەکارێت ببێتە هاوپەیمانێکی باش بۆ ڕۆمەکان.

ئەو ڕاپۆرتەی سیخووڕەکانی ڕۆم ئەو کاتە گەیشتە کارۆس، کە ئەو سەرگەرمی دەستنیشانکردنەوەی سنووری ڕۆم و گەڕاندنەوەی وڵاتانی ژێردەستی ئێران لە سوریا و ئاسیای بچووك بوو بۆ ژێر دەسەڵاتیی ئیمپراتۆرییەتەکەی، هەواڵی سیخووڕەکان لەسەر ئیمپراتۆر کاریگەر بوو، بڕیاریدا تەلاووس بکاتە هاوپەیمانی خۆی لە دژی بەهرامی دووەم.

بە گرینگی دەزانین باس لە بڕیاری ئیمپراتۆری رۆم بکەین بۆ بە هاوپەیمانێتی بوونی خۆراسان لەگەڵ خۆیدا، چوونکە لە تەواوی سەردەمی ساسانییەکاندا بابەتێکی تایبەتی بوو، بەو پێیەی خۆراسان نە سنووری هاوبەشی لەگەڵ رۆم و نەوڵاتانی ژێردەستی رۆم نەبوو.

ئیمپراتۆرەکانی رۆم هەر کاتێك لە سەردەمی ساسانییەکاندا ویستی هاوپەیمانیان لە دژی ساسانییەکان هەبوو بێت، تەنیا لەگەڵ ئەو پاشا و دەسەڵاتدارانە بوونەتە هاوپەیمان کە سنووری هاوبەشیان لەگەڵ هەبوویێت یاخۆ لەژێر پاڵپشتی ئەواندا بووبن، تا ئەو رۆژە ڕووی نەدابوو کە ئیمپراتۆرەکانی رۆم لەگەڵ یەکێك لە فەرمانڕەواکانی رۆژهەڵاتی ئێران هاوپەیمانی بکەن، دواتریش ڕووداوی لەم چەشنە ڕووی نەدایەوە.

ئاشکرایە کە هاندەر و پاڵنەری سەرەکیی بۆ ئیمپراتۆری رۆم کە هەوڵی ئەو جۆرە هاوپەیمانێتییەیدا، زانیاریی هەبوو کە تەلاووس پاشماوەی شازادە ئەشکانییەکان بوو.

ئایا کارۆسی ئیمپراتۆری رۆم ئاگەدار بووە ئەوە، بووە تەلاووس بە نهێنی داوای لێخۆشبوونی لە بەهرامی دووەم کردووە و پەسەند نەکراوە؟ لەو بابەتە زانیاریمان نییە، تەنیا بە لێکدانەوەی بابەتەکان، گریمانی ئاگەدار نەبوونی ئەو لەمەڕ ئەو بابەتە دەکەین، چوونکە داوای لێبووردنەکە زۆر بە نهێنی کراوە.

کارۆس نوێنەرێکی هەڵبژارد تا بۆ لای تەلاووسی بنێرێت و نامەیەکی بە نهێنی بە نێردراوێکی تایبەتدا بۆ تەلاووس نارد، نێردراوەکە چووە لای تەلاووس و لە خۆراسان ئەوی بینی و پێی وت کە ئیمپراتۆر دەخوازێت لە ئاشوورستانەوە (دەکەوتە باکوری میزۆپۆتامیا) هێرش بکاتە سەر شاری تیسفون و بۆ سەرکەوتنی ئەو هێرشەی ئیمپراتۆری رۆم بۆ سەر ئەو شارە، پێویستە ئەویش هاوکات لە رۆژهەڵاتەوە هێرش بکات، دوای ئەوەی بەهرامی دووەم شکست دەخوات و کارۆس تیسفونی داگیرکرد، تۆ دەکرێی بە پاشای ئێران و جارێکی دیکە پاشایەتیی ئەشکانییەکان کە ماوەی چوار سەدە بەردەوام بووە، دەست پێ دەکاتەوە.

نێرداوی ئیمپراتۆر پێی رادەگەیەنێت کە ئیمپراتۆری رۆم پێشەکی تێچووی ئەو جەنگە کە دوو سەد تالآن زێڕ دەکات، بۆی دابین دەکات، بەم پێیە تۆ دەکاریت لەشکرێکی باش ئامادە بکەیت.

گواستنەوەی دوو سەد تالآن زێڕ لە رۆم بۆ خۆراسان کارێکی ئاسان نەبوو، هەرچەندە ئەوانەی کاری پارە گۆڕینەوەیان دەکرد، دەیان توانی پارەکە بگەیەننە ئەو شوێنانەی پێویست بوو، لە شوێنی دیکەش پارەکەیان وەردەگرتەوە، بەڵام ئەو رێژەیە لە پارە زۆر ئەستەم بوو کە

بەوان دابین بکرێت و هیچ یەکێك لەوان ئەو پارەیەی راستەوخۆ پێ دابین نەدەکرا، بەڵام نێردراوەکە دڵنیایی دەداتە تەلاووس و پێی دەڵێت ئەو پارەیە لە ڕێگەی چەند کاروانێکی یەك لەدوای یەك، دەگاتە دەستت، دوای ئەوەی ئیمپراتۆریش سەرکەوت، تۆ دەبیتە پاشای ئێران.

پێدەچێت تەلاووس پێشنیازی رۆمی پەسەند کرد بێت، بەڵام سەرابۆد وێڕای دوژمنایەتیی و ڕقی زۆری بەرانبەر بە کارتێر و بوونی خواست بۆ لەنێوبردنی ئەو، دەیزانی لەکاتێکدا کە بەهرام لەنێو دەچێت بە دڵنیاییەوە کارتێریش دەکوژرێت، بەڵام بەو کارە رازی نەبوو و هەوڵیدا تا تەلاووس پەشیمان بکاتەوە، گومانمان نییە ئەو هەستەی سەرابۆد لە ئاینەکەی و نیشتمانپەروەری ئەوەوە هاتووە.

بۆیە بە تەلاووسی وت: با وتەکانی ئیمپراتۆری رۆم نەبنە مایەی فریودانت، گریمان ئەو بتوانێت دووسەد تالان زێڕت بۆ رەوانە بکات، بەڵام ئەو تۆ ناکاتە پاشای ئێران، من لەو رۆژەوەی هەم، لە باوکمم بیستووە کە رۆم هەردەم هەوڵیداوە تا پایتەختی ئێران داگیر بکات و وڵاتانی ئێران بکاتە بەشێك لە رۆم. ئەگەر کارۆس بتوانێت تیسفون داگیر بکات و بەهرامی دووەم لەنێو ببات، ئەستەمە تۆ بکاتە پاشا، لە لایەکی دیکەوە من و تۆ هەردووکمان لەسەر ئاینی زەردەشتین، ئەگەر ئیمپراتۆری رۆم سەربکەوێت، ناهێڵێت ئاگرخانەکان بمێنن و ئاگرەکانیان دەکوژێنێتەوە.

هەروەها من و تۆ کێشەمان لەگەڵ بەهرامی دووەم نییە، ئەوە کارتێرە ئاینی میترای هێناوە و میترای پێ باشترە لە ئاهورامەزدا و بانگەشە بۆ پەرستنی دەکات، ئەو لەشکرەش کە بەهرامی دووەم بۆ سەر ئێمەی ناردووە بە هاندانی کارتێرە و باپیرانی بەهرام مافیان لەسەر ئێمەی زەردەشتییان هەیە و باش نییە کە تەنها ئێمە بۆ لەنێوبردنی بەهرام لەگەڵ دوژمنەکانی ئەو ڕێك بکەوین.

تەلاووس وتی: ئەی سەرابۆد، لەوانەیە بەهرام دوژمنی تۆ نەبێت، بەڵام ئەگەر دەستی بگاتە من بە دڵنیاییەوە دەمکوژێت، هەروەسا تۆ شازادەی ئەشکانی نیت تا بەهرام ببێتە دوژمنی تۆ و بتکوژێت، بەڵام من شازادەی ئەشکانیم، بێگومان لە روانگەی بەهرامەوە کوشتنی من وەك ئەرك وایە.

هەروەها تۆ مووغێکی زەردەشتی، ئەگەر بەهرام تۆ بگرێت، تاکە سزای کە بەسەر تۆدا دەسەپێنرێت کەمکردنەوەی پلەکەتە و دەکرێیی بە لێپرسراوی ئاگرخانەیەکی پلە دوو و ناکوژرێیی، بەڵام من دەکوژرێم و کەس نازانێت ژن و منداڵەکانم چییان بەسەر دێت.

له گفتوگۆی نێوان ئەو دوو کەسە دەردەکەوێت کە سەرابۆد ئاگەدار نەبووە لە داوای لێبووردنی تەلاووس لە بەهرامی دووەم و ڕەتکردنەوەی داواکەی لەلایەن ئەو، تەلاووس نەیدەتوانی بۆ سەرابۆدی ڕوون بکاتەوە کە بە چ هۆیەك ئەو دەخوازێت لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆم لە دژی بەهرام ببێتە هاوپەیمان، چوونکە دەبووایە بۆی ڕوون بکاتەوە کە بە نهێنی هەنگاوی بۆ داوای لێبووردن ناوە و داواکەی ڕەتکراوەتەوە.

ئاشکرایە ئەگەر تەلاووس ئەو بابەتەی بۆ باس کردبایە، سەرابۆد ئەمەی بە ناپاکی هەژمار دەکرد و یەکگرتوویی ئەو دوو کەسە هەڵدەوەشایەوە. هەرچەندە تەلاووس فەرمانڕەوای خۆراسان بوو، بەڵام بۆ خۆڕاگرتن لە بەرانبەر بەهرامی دووەم پێویستی بە هاوکاری خەڵکی سەگستان هەبوو، ئەگەر پێوەندیی لەگەڵ سەرابۆد تێکچوو بووایە، خەڵکی سیستان هاریکاری نەدەبوون، چوونکە ئەوان سەرابۆدیان بە مووغی خۆیان دەناسی.

تەلاووس یاخۆ دەبووایە خۆی رادەستی بەهرامی دووەم بکات، ئەو دەمەش بە بێگومان دەکوژرا یاخۆ دەبووایە بەردەوام بێت لە جەنگ، بۆ ئەمەش پێویستی بە یارمەتی خەڵکی سیستان و بەردەوامبوونی لە هاوپەیمانی سەرابۆد هەبوو. ئەو ناچار بوو ئەو هاوپەیمانێتییە هەڵبژێرێت، بۆیە کاتێك بینی سەرابۆد ڕێگرە لە هاوپەیمانی ئەو و ڕۆمەکان، وتەکانی ئەوی پەسەند کرد و هاوپەیمانی لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆم نەکرد.

* * *

بەهرام لە سەرەتادا ئاگەداری باروودۆخی ناوخۆی ڕۆم نەبوو، هەوڵی نەدەدا بزانێت لەو ئیمپراتۆرییەتەدا چ ڕوودەدات، بەڵام دوای ئەوەی زانی کارۆس بۆ جەنگی ئەو دێت، دوژمنی بە کەم زانی. ئەو دەیزانی لە سەرەتای زنجیرە پاشایەتیی ساسانییەکانەوە تا ئەوکات هەر ئیمپراتۆرێکی ڕۆم بۆ جەنگی ئەوان هاتبێت یان کوژراوە یاخۆ بە شکاوی گەڕاوەتەوە.

خەڵك هاتبوونە سەر ئەو باوەڕەی جەنگی ڕۆم لەگەڵ ئێران بۆ ڕۆمەکان شوومە، تا ئەوکات ڕووی نەدابوو ئیمپراتۆرێکی ڕۆم (هەڵبەت لە سەردەمی ساسانییەکاندا) بێت و شکست نەخوات هەندێکیان وەك باسمان کرد لە گۆڕەپانی جەنگدا دەکوژران یان دیلیش دەبوون. بۆیە بەهرام کاتێك بیستی کارۆس بۆ جەنگی ئەو هاتووە، بە هەندی هەڵ نەگرت و دوژمنی بە کەم زانی، لای هەمووان ئاشکرایە هەڵەی مەزنی هەر سەردارێکی جەنگی ئەوەیە بێ لێکۆڵینەوە لەبارەی بەهێزی و توانای دوژمن، دوژمنەکەی بە کەم بزانێت.

جگە لەوە بەهرام لە ماوەیەکی کورتدا دوو هەڵەی کرد، هەڵەی یەکەمیان داوای لێخۆشبوونی تەلاووسی فەرمانڕەوای خۆراسانی ڕەت کردەوە، هەڵەی دووەمیش ئەوە بوو کە دوای ئەوەی زانی ئیمپراتۆری ڕۆم دێت بۆ جەنگی ئەو، داوای یارمەتی لە تەلاووس و سەرابۆد نەکرد.

ئەگەر بەهرامی دووەم لەوان خۆش ببووایە و داوای یارمەتی لێکردبان، بێگومان ئەوان دەچوون بۆ یارمەتیدانی و بە تایبەتی سەرابۆد کە باوەڕدارێکی زەردەشتی بوو، نیشتمانەکەی خۆش دەویست و بەرژەوەندیی نیشتمانەکەی لە پێش هەموو شێکی دیکەوە بوو، بەڵام بەهرام سوودی لەو دەرفەتە نایابە وەرنەگرت و هەوڵی بۆ ئەوکارە نەدا و دوژمنی بە کەم زانی، تەنانەت داوای خۆئامادەکردن بۆ جەنگیشی ڕانەگەیاند، بۆ ئەوەی پیاوانی ئازای خێڵ و نەتەوەکانی وڵات بێن، یارمەتی لەشکرەکەی بدەن، ئەمانە هەموویان بە هۆی بەکەم سەیرکردنی دوژمن بوو.

لەشکری کارۆس برێتی بوو لە پازدە لژیۆن کە هەموویان ڕێك و پوخت بوون، بەشێك لە سەربازەکانیشی کارامە بوون، بە لێکدانی ئەوەی هەر لژیۆنەك شەش هەزار سەربازە، ژمارەی سەربازانی کارۆس دەگەیشتە نەوەد هەزار سەرباز.

پازدە لژیۆنەکەی کارۆس کە لەگەڵیدا بۆ جەنگی بەهرامی دووەم هاتبوون هەموو پێداویستییە جەنگییەکانیان هەبوو، جگە لە گالیسکەی جەنگی کە لە لەشکرەکانی ڕۆمدا نەبوو، ئەوان بە چەکی کاریگەریی مەیدانی جەنگیان دانەدەنا، هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە پێیان وابوو دوای کوژرانی ئەسپی گالیسکە، گالیسکەکە ڕاستەوخۆ لەکار دەکەوێت و سەربازەکانی نێو گالیسکەکە ناچار دەبن دابەزن و پیادە جەنگ بکەن، کەواتە ئەوان بۆ لە سەرەتاوە پیادە نەبن و لەنێو لژیۆنێکدا نەجەنگن و پێویست نییە بە گالیسکەوە بچنە نێو جەنگ. بە پێچەوانەی ئەوانیش پاشاکانی ئێران، گالیسکەیان بە چەکێکی زۆر کاریگەر لە گۆڕەپانی جەنگدا دەناسی، بەو مەرجەی بە ژمارەیەکی زۆر و بەرفرەوان بهێندرێنە نێو مەیدانی جەنگ و بە کار بخرێن.

لە کۆنەوە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی لەشکرەکانی ئێران و ڕۆم ئەوەبوو کە کۆمەڵێك پسپۆر کە هەریەکەیان لە بوارێك شارەزا بوون لەگەڵ لەشکردا دەڕۆیشتن تا لە کاتی پێویست و لە مەیدانی جەنگدا ئەو کەرەستانەی پێویستن دروستیان بکەن، بۆ نموونە دروستکردنی مەنجەنیقە گەورەکان کە لەبەر گەورەیی و گواستنەوەیان نەدەکرا و دەبووایە پارچە بکرێن، ئەو کاتیش ژمارەیەکی زۆر ئەسپ دەبووایە بیانگوازنەوە بۆیە واباشتر بوو لە شوێنی جەنگ

ئامادە بکرێن. یاخۆ ئەو وەستایانەی پردیان دروست دەکرد لە کاتی پێویست بۆ پەڕینەوە لە زێیەکان، هەروەها ئەوانەی بورجی گەڕۆکیان بۆ جەنگ ئامادە دەکرد و ...هتد.

لەشکری کارۆس هەموو ئەو پسپۆرانەی هەبوو، دوای ئەوەی لە ساڵی (٢٨٣ ز) هاتە ئاسیا، هەندێکی دیکە پێیان وایە ساڵی (٢٨٤ ز) گەیشتە نێو سنووری راستەقینەی ساسانییەکان.

ئەوکاتەی ئەو لە سوریا تێپەڕ دەبوو، هیچ یەکێك لە فەرمانڕەوا ناوچەییەکانی ژێردەستی ساسانییەکان نەیانتوانی رێگەی پێ بگرن تا گەیشتە زێی فورات.

شێوەی هاتنی لەشکری کارۆس پێشبینی کراو بوو، ئەو بۆ ئەوەی بگاتە تیسفون، دەبووایە بە درێژایی زێیەکەدا بڕوات و بچێتە نێو میزۆپۆتامیا، لەوێشەوە دەبووایە لە زێیەکە بپەڕێتەوە و بچێتە کەنارەکانی رۆژهەڵاتی ئەو زێیە.

ئەو دەشتەی لەوێ لە نێوان زێی فورات و زێی دیجلە بوو، لە کۆنەوە بە (می سی شە) ناسراوە برێتییە لەو شوێنەی مەودای نێوانی هەردوو زێی دیجلە و فورات لە میزۆپۆتامیای باکور دەگاتە کەمترین پانتایی خۆی، ئێستەش تا رادەیەك هەروا ماوەتەوە. دەشتی (می سی شە) بە هۆی ئەوەی دەشتێکی تەخت بوو بۆ بەگەڕختنی گالیسکە جەنگییەکانی لەشکری ساسانی بە ناوچەیەکی زۆر باش هەژمار دەکرا.

باشترین رێکار بۆ بەهرامی دووەم برێتی بوو لە چاوەڕوانی بۆ هاتنی لەشکری دوژمن تا بێت و لەو زێیە بپەڕێتەوە، ئەوکات راستەوخۆ هێرشیان بکاتەسەر. ئەوە هەر هەمان ئەوکارە بوو کە شاپووری یەکەم دژی لەشکری رۆم بە ئەنجامی گەیاند، کە بووە هۆی شکستی رۆمەکان، بەڵام نازانرێت چ هۆیەك بووە پاڵنەر بۆ پەڕینەوەی بەهرام لە رۆژهەڵاتی زێیەکە بۆ کەناری رۆژئاوای تا لە ئەوێ جەنگی رۆم بکات.

بێگومان بەهرام بۆ ئەو کارەی پاساوی هەبووە، بۆیە سەختی پەڕینەوە لەو زێیە لە وەرزی هەڵکشانی ئاودایە بەر خۆی و لەشکرەکەی و فەرمانی کرد تا بە بەلەمەکان، پردێك چێ بکەن و بە سەر پردەکەدا تەواوی لەشکرەکەی پەڕییەوە بۆ کەناری رۆژئاوای فورات.

"کێڵمان هۆ ئارت"ی ئێرانناسی ناسراو گریمانی ئەوە دەکات کە دەشتی (می سی شە) زۆر نێزیك بووە لە پایتەختی بەهرام واتە تیسفون و بە دەوروبەری شار زانراوە، بۆیە بەهرام بە خراپی زانیوە دوژمن بەو رادەیە لە پایتەختەکەی نێزیك ببێتەوە و بڕیاری داوە تا لە فورات بپەڕێتەوە و پێش ئەوەی ئیمپراتۆری رۆم لەو شوێنە بپەڕێتەوە، دوژمنەکەی تێك بشکێنێت.

ماریژان مۆڵە بۆ پەڕینەوەی بەهرامی دووەم لە زێی فورات و گەیاندنی لەشکرەکەی بە کەناری ڕاستی ئەو زێیە هۆکارێك دێنێتەوە کە تا ڕادەیەك هەمان هۆکاری کێڵمانە، بەڵام لایەنی ئاینی تێدا هەیە.

واتە ئەو هۆکارەی کێڵمان باسی دەکات بابەتێکی پێوەستە بە ئابڕۆ، ئەوەی ماریژان مۆڵە برێتییە لەوەی لە دەشتی (می سی شە) زۆرێك لە ڕەز و باخەکان و موڵکەکان هی ئاگرخانەی گەورەی تیسفون بوون کە بە (تەدام) ناسرا بوو، مووغی تەدام لەوە دەترسا کە لە کاتی بوونی جەنگ لەو دەشتەدا، ڕەز و باخەکانیان لەنێو بچن، بۆیە ئامۆژگاری بەهرامی کرد لە شوێنێك لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆم جەنگ بکات کە نەبێتە هۆی وێرانبوونی موڵك و ڕەزەکانی ئاگرخانەکان.

لەم گریمانەشدا هەر ئەوە دەردەکەوێت کە ئەو دەشتە برێتی بووە لە دەوروبەری پایتەختی ساسانی، بۆ ئەوەی گوند و ڕەز و باخەکانی ئەو شوێنە لەنێو نەچن، جەنگ لەو شوێنە دوور خراوەتەوە، بەڵام بە گشتیی بابەتی پەڕینەوەی ئەو لەشکرە لە فورات و چێکردنی پرد لەسەر ڕووبارەکە، لە ڕووی جەنگییەوە هەڵەیەکی گەورە بووە، بە تایبەت کە بەهرام لە ڕووی جەنگییەوە ئەو ڕێکییەی لەنێو لەشکرەکەی نەبووە کە لە لەشکری شاپوور هەبوو، ئەگەر بەپێی تەمەنەکەی نەیتوانی بێت بەشداری جەنگ ببێت لەگەڵ ئەودا، ئەوا بە خوێندنەوە و گێڕانەوە ئەو جەنگانەی بیستووە.

لێکدانەوەی بابەتەکە دەری دەخات کاریگەریی خەڵکی نەشارەزا بە بواری لەشکری، لەسەر بڕیاری بەهرام هەبووە، بە پێچەوانەوە سەرکردەکانی لەشکری بەهرام نەیان دەتوانی ڕێگە بدەن بەهرام ئەو هەنگاوە هەڵەیە هەڵ بنێت و لە جیاتی جەنگ لە ناوچەیەکی دەشتایی تەخت و باش کە بۆ بەگەڕخستنی گالیسکە جەنگییەکان زۆر شیاوە، بڕوات لە ناوچەیەکی نیمچە شاخاوی و بەردەڵاندا جەنگ لەگەڵ لەشکری کارۆسی ئیمپراتۆری ڕۆم بکات و نەتوانێت کاریگەرترین چەکی خۆی کە گالیسکەکانن لە دژی لژیۆنەکانی ڕۆم بخاتەگەڕ.

بەم شێوەیە دەتوانین بیرۆکەی ماریژان مۆڵە بە دروست بزانین کە دەڵێت بڕیاری بەهرام بۆ نەجەنگان لە دەشتی (می سی شە) لەگەڵ ڕۆم، لەژێر کاریگەریی ڕای مووغی ئاگرخانەی گەورەی تیسفون بووە و سەرۆکی ئاگرخانەی تەدامیش کارتێر نەبووە، هەروەك چۆن ئێستە پاپا لە ڕۆم نیشتەجێیە و ئەو شارە ناوەندی دەسەڵاتیی ئەوە، بەڵام ئەسقۆفی کڵێسای ڕۆم نییە. کارتێر سەرۆکی دامەزراوەی ناوەندی زەردەشتی بووە و پلەی گەورەتر بووە لەو مووغە.

ماریژان مۆڵە باسی کارتێر ناکات و ناڵێت ئەو داوایە لەلایەن ئەو ئاراستەی بەهرام کراوە، بگرە دەڵێت مووغی ئاگرخانەی تەدام ئەو داوایەی کردووە. ئاشکرایە ئەو مووغە هەر هەمان مووغی سەردەمی شاپووری یەکەم نەبووە، چوونکە ئەو بە تۆمەتی پاڵپشتی لە ئاینی مانۆیی لە سەرۆکایەتیی ئاگرخانەی تەدام لادرا.

هەرچەندە ناوی کارتێر لەو بابەتەدا نەهاتووە، بەڵام بە هۆی ئەوەی ئەو سەرۆکی دامەزراوەی ناوەندی زەردەشتی بووە و پلەی لە مووغی تەدام گەورەتر بووە، دوور نییە بەو پێشنیازە رازی نەبوو بێت.

ناوچەی (مرِە) لە کەناری راستی ڕووباری فورات بە دەڤەری گەرمەسێر دەژمێردرێت، چوونکە ئەو دەمەش وەرزی بەهار بوو، ئەو شەوەی بەهرامی دووەم و کارۆسی ئیمپراتۆری رۆم لە ئەویٚ مانەوە باران باریوە.

لژیۆنەکانی رۆم لە ئەورووپاوە دەهاتن و خێوەتەکانیان بە جۆرێك چیٚ کرابوون کە ئاویان تیٚ نەدەچوو، بەڵام خێوەتەکانی لەشکری بەهرام بە شێوەیەك نەبوو کە ئاوی تیٚ نەچێت، بە هۆی درێژبوونەوەی کاتی باران بارینەکە، باران چووەتە نێو خێوەتەکانیان و ئەوانی زۆر بێزار و بیٚ توانا کرد و تا بەرەبەیان نەیانتوانی بخەون.

دوای ئەوکاتیش ئیتر دەرفەت بۆ خەوتن نەما و ناچار بوون ریزەکانیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن، بۆیە ئەو کاتەی هەمووان بۆ جەنگ ئامادە دەبوون، سەربازەکانی بەهرام تەواو ماندوو و شەکەت بوون.

ئەسپەکانی لەشکری بەهرامیش هەر وەك سەربازەکان ئەو شەوە لەژێر باران مابوونەوە، لە کاتی زینکردنیان هەست بە ماندووبوونیان دەکرا، ئامۆژگاری سوارکارە بە ئەزموونەکان بۆ سوارە لاوەکان ئەوە بوو کە ئەگەر بتانەوێت ئەسپەکانتان لە سواریدا باش بن، پێویستە لە شەوی پێش سواربوونیان، پێداویستیی تەواو بۆ پشوودانیان هەبێت. هەڵبەت یەکێك لە پێداویستییەکانی ئەسپ بۆ پشوودان، جگە لە ئالیك، بوونی ئاسوودەیی و نەمانەوەی لەبەر رێژنەی باران و بەفرە، چوونکە ئەسپ لەژێر باران و بەفر و لە کاتی شەو و بە تایبەت لە سەرمادا، سەختە بتوانێت بە بیٚ بوونی سەر پەنایەك و لە شوێنێکی ئاوەڵەدا بحەوێتەوە.

هەرچەندە ئەسپەکان ماندووبوون و لێخوڕی گالیسکەکان و سەربازە ئازاکانی ناو گالیسکەکانیش بە گشتیی ماندوو بوون، بەڵام فەرماندەی گالیسکەکان کە ناوی (فرە رام) بوو ئەفسەرێکی ئازا و کارامە بوو، بۆیە گالیسکەکانی بۆ جەنگ ئامادە کردن.

فره رام شازادەیەکی ساسانی بوو، بە هۆی قورسی خوێندنەوەی ناوەکەی، ناویان بە فرام دەوت و لەنێو لەشکری بەهرام لەو بالآبەرزتر نەبوو، ئەو بەیانییە لە گالیسکەی فەرماندەیی سوار ببوو، لە لایەك بۆ لایەکە دیکەی مەیدانی جەنگ دەڕۆیشت و ئەرکی هەر دەستەیەك لە گالیسکەکانی دیاری دەکرد. وێڕای ئەوەی شەوی رابردوو نەخەوتبوو، بەلاّم هیچ بێ تاقەتی لە هەڵسووکەوت و جموجۆڵێدا بەدی نەدەکرا، ئەوەی دەیبینی وا بیردەکردەوە کە شەوی پێشتر بە تەواوەتی خەوتووە.

لەشکری کارۆس ئیمپراتۆری رۆم لە باکور و لەشکری بەهرام لە باشوور بوون، ریزەکانی لەشکرەکانیش لە رۆژهەلاّتەوە بۆ رۆژئاوا رێکخرابوون، هێرش لەلایەن رۆمەکانەوە دەستی پێکرد و لژیۆنەکان لە هەردوو لا و لە نێوەڕاستی لەشکری بەهرام بەرەو پێشڤە چوون.

فرام ماوەیەك وێستا تا رۆمەکان نێزیك ببنەوە، دواجار فەرمانی جووڵەی گالیسکەکانی دەرکرد، گالیسکەکان لە هەردوو لای راست و چەپی لەشکری بەهرامەوە کەوتنەڕێ.

بەهرامی دووەم لە نێوەڕاستی لەشکرەکەی لەسەر ئەسپ بوو، تەنیشتەکان و پشتی بە پاسەوانەکانی گیرابوون، لە دوورەوە کاسکێت و زرێ جوانەکەی بەهرام لە ڕووناکی خۆردا دەبریسکایەوە و دەزانرا ئەوە بەهرامە، لە کۆندا نەریتی داپۆشین نەبوو، پیاوە ئازاکان خۆیان لە دوژمن نەدەشاردەوە، چوونکە ئەوکات چەکی ئاگرین نەبوو، مەودای رۆیشتنی تیریش دیار بوو، لە پەنجا مەتر پتر کاریگەریی نەبوو. لە پێشبڕکێکاندا تیر تا نێزیکەی سێ سەد و پەنجا یاخۆ چوار سەد مەتریش دەڕۆیشت، بەلاّم ئەو جۆرە تیرە بایەخی جەنگی نەبوو، لە پەنجا مەتر پتر توانای نەدەما و کەس لە دوای ئەو مەودایە خۆی لە تیر نەدەشاردەوە.

سەربازانی رۆم قەڵغانی گەورەیان بە دەستی چەپ و پێلاّیان (نێزە) بە دەستی راستەوە بوو، ئەوان شمشێریشیان هەبوو، بەلاّم زۆرتر سوودیان لە نێزەکانیان دەبینی. چوونکە بە نێزە لە توانایاندا بوو سکی دوژمن کون بکەن و ئەو کونەی بە نێزە لە سکی کەسێکدا دەکەوتەوە، دەبووە هۆی کەوتنی دەست بەجێی و هەرچەندە سەربازی زامدار ئازا بووایە نەیدەتوانی بە هۆی برینەکەیەوە خۆی رابگرێت.

لەوانەبوو سەربازێك لە بەرانبەر دە برینی شمشێر کە بەر شوێنە جیاکانی جەستەی دەکەوت خۆی رابگرێت، بەلاّم لە بەرانبەر کون بوونی سینگ یاخۆ سکی بە هۆی نێزەوە ئەستەم بوو کە پێکراو نەکەوێتە سەر زەوی، هەر ئەمەش یەکێك لە هۆکارەکانی بەکارهێنانی نێزە بوو لەلایەن سەربازانی رۆم کە دەیانزانی کونکردنی سینگ و سکی دوژمن بۆ خستنی بەسە.

لەو کاتەدا کە سەربازە رۆمەکان بەرەو رووی بەهرام دەهاتن، هەندێ گالیسکەی بچووکیان پێبوو کە بەهرام وایزانی ئەوانە مەنجەنیقن، بەڵام دواتر دەرکەوت مەنجەنیق نین، لە پێشی هەر گالیسکەیەك شتێك وەك سەری کەڵەشێر، بەڵام درێژتر هەبوو.

بەهرام لە کەسانی دەوروبەری خۆی پرسیار کرد کە ئەو شتە چییە؟ کەس لە ئەوان نەیانزانی ئەوە چییە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان لە ریزی پێشەوە لەگەڵ خۆیاندا دەیان گواستەوە، دەردەکەوت کە کەرەستە و ئامێری جەنگی بێت.

گالیسکە جەنگییەکانی بەهرام لە هەر دوو لاوە دەهاتن، بە هۆی نارێکی زەوی ناوچەکەوە توانایان نەبوو بە باشی و خێرایی بڕۆن، یەکێك لە هۆکارەکانی کاریگەریی گالیسکە بریتی بوو لە خێرایی زۆری ئەوان کە سەری لە سەربازی بەرانبەر دەشێواند و دەرفەتی نەدەدا تا بتوانێت سوود لە دەرفەت ببینێت بۆ بەرگری، بەڵام ئەو رۆژە نارێکی زەوی بووە رێگر لە توانای گالیسکەکانی بەهرام و نەیهێشت ئەوان زۆرترین سوود لە خێراییان وەربگرن.

گالیسکەکان لە هەردوولاوە بە جووڵەی هێواش لە لەشکری رۆم نێزیك بوونەوە، بە نێزیك کەوتنەوەیان لە گالیسکە بچووکەکانی رۆمەکان واتە سەری کەڵەشێرەکانەوە شتێك بەرەو گالیسکەکانی بەهرام هەڵدرا، دەرکەوت کە ئاگرە، هەر کە ئاگرەکە دەگەیشتە گالیسکەکان، یەکسەر ئەسپەکان دەوەستان و هەستی سووتانەوەی توند لە ئەسپەکان و سەرباز و لێخوورەکانی سەر گالیسکەکاندا دەهاتەدی و دەردەکەوت کە ئەگەر گالیسکەکان ئەو شەوە لەبەر باران نەبوونایە و تەڕ نەبووبانە، بێگومان ئاگریان دەگرت و دەسووتان.

ئەو ئاگرەی لەسەری کەڵەشێرەکانەوە دەهاتنەدەر، بەرەو گالیسکەکان دەچوون، نە داری بە ئاگر و نە پەڕۆ کۆنەی بە رۆن نەبوو، تەنیا شلەیەکی سووتێنەری وەك خوێن بوو، لەگەڵ پڕژانی بە سەر گالیسکە و ئەسپ و کەسەکاندا، جلوبەرگ و جەستەیانی دەسووتاند و ناچاری دەکردن لە گالیسکەکان دابەزن و بە پەلە خۆیان لەو ئاوانە وەردەن کە لە بارانی دوێنێ شەوەوە لەسەر زەوی گرد ببوونەوە تا ئاگری جەستەیان بکوژێننەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئاگرەکە بکوژێتەوە، هەندێ لە جەستەیان دەسووتا، ئەگەر بەر رووخساریان کەوتبایە بە رادەیەك دەیسووتاند کە گۆشتی رووخساریان نەدەما، دوای ماوەیەکیش گالیسکەکان کە بە بارانی شەوی رابردوو تەڕ ببوون، ئاگریان تێبەر دەبوو و دەسووتان. ئەو رووداوە چاوەڕوان نەکراو بوو، بۆیە لە گالیسکەکاندا هیچ کەرەستەیەك بۆ کوژاندنەوەی ئاگر نەبوو.

زێی فورات دوور بوو لە شوێنی ئاگرگرتنی گالیسکەکان و لە گالیسکەکانیشدا بێلْ نەبوو تا خۆلْ بکەنە سەر ئاگری گالیسکەکان و بیکوژێننەوە. لە لایەکی دیکە ئاگرەکەش کە نە دار و نە پەڕۆ کۆنە نەبوو، نەدەزانرا چۆن دەکەوێتەوە، بۆ سەربازەکانی نێو گالیسکەکان بابەتێکی شاراوە بوو.

کاتێك لەنێوەندی لەشکری بەهرام، پێکدادان لە نێوان هەردوو لەشکر دەستی پێکرد، دیسان لە زاری کەلّەشێرەکانی سەر گالیسکەکانەوە ئاگر هاتنە دەرێ و بەر جلوبەرگ و جەستەی سەربازەکانی بەهرام کەوتن و سووتاندنی، ئەوانیش بۆ خۆڕزگارکردن لە سووتانەکە، خۆیان لە زەوی تەڕ وەردەدا.

دەرکەوتنی چەکی نوێ لە مەیدانی جەنگ دەبێتە هۆی دابەزاندنی ورەی لەشکری بەرانبەر و سەربازانی بەهرامیش ئەو رۆژە ڕووبەڕووی چەکی تازە ببوونەوە و بۆیان دەرنەدەکەوت کە ئەو چەکە تازەیە چییە، لەگەلْ ئەوەشدا بەهرام فەرمانی کرد تا هێرش بکەنە سەر ئەو گالیسکانە و لەنێویان ببەن.

بەهرام دەیبینی ئاگر لە گالیسکەکانەوە دێتە دەرێ، بۆیە بیری کردەوە کە ئەگەر ئەو گالیسکانە بشکێندرێن، چیدیکە ئاگرەکە نایەتەوە.

هەندێ لە سەربازانی بەهرام کوژران و سووتان، بەلاّم لە دلّی لەشکرەکەیدا سەربازەکان گالیسکە ئاگرهاوێژەکانیان تێك شکاندن، هەرچەندە شەوی رابردوو نەخەوت بوون، بەلاّم بە لەنێوبردنی گالیسکەکان ورەیان بە رادەیەك بەرز بۆوە کە بە هێرشێکی لە ناکاو و توند، توانیان سەربازە رۆمەکان هەراسان بکەن، هەلّبەت نابێت ئەو ڕووداوە بە بێ بایەخ بزانین و لە هەر جەنگێکدا کە چەکی نوێ دێتەکایەوە، سەرکەوتن بۆ ئەو کەسەیە کە چەکە تازەکەی لایە.

لە سالّی (١٩٤٠ ز) ولاّتی فەرەنسا نێزیکەی سێ ملیۆن سەربازی لە جەنگدا بوو، جگە لەو سەربازە بەریتانیانەی هاتبوون بۆ یارمەتدانی ئەوان، لە نیشتمانپەروەری سەربازانی فەرەنسا گومان ناکرێت، بە هەمان شێوە لە یەکەمین جەنگی جیهانی دوو ملیۆن سەربازی فەرەنسی خۆیاندا بە کوشت، ئەو سێ ملیۆن سەربازەش ئامادە بوون بۆ مردن، بەلاّم تاکتیکی نوێی جەنگی ماتۆڕ واتە جەنگی تانك و زرێپۆشەکان، بووە هۆی دابەزینی ورەی فەرەنسییەکان و لێکترازانی لەشکرەکەیان و بە زوویی پاریسی پایتەخت کەوتە بەر دەستی ئەلّمانەکان.

له نیشتمانپەروەری خەڵکی ژاپۆن هیچ گومان نییه و هەزاران فڕۆکەوانی خۆبەخشی ناسراو بە (کامیکاز) بە فڕۆکەی پڕ لە بۆمب هێرشیان کردە سەر کەشتییە ئەمەریکاییەکان و خۆیان پێدا دەدان و لەنێویان دەبردن، (هاری ترۆمەن) سەرۆك کۆماری ئەمەریکا لە بیرەوەریەکانی خۆیدا دەڵێت: ئێمە دڵنیا بووین ئەگەر هێز لەنێو ژاپۆن پیادە بکەین، ژاپۆنییەکان تا دوایین کەس بەرگری دەکەن و دەکوژرێن، لە ئاکامدا رەگەزی نێر لەو وڵاتە نامێنێت، بەڵام ئەو نەتەوە ئازا و نیشتمانپەروەرە لە بەرانبەر بۆمبی ناوەکی، ورەی خۆیان لەدەستدا و خۆبەدەستەوەدانیان هەڵبژارد، لە کاتێکدا کە هێشتا تاکە سەربازێکی ئەمەریکی نەگەیشتبووە نێو ژاپۆن.

ئەو دوو ڕووداوە مێژووییەمان بۆیە باس کرد تا نیشانی بدەین سەربازانی بەهرام هەرچەندە کەوتبوونە بەرانبەر چەکێکی نوێباو کە ناویان نەبیست بوو، لە بوونی ئاگرێکی بەو شێوەیە کە بێ دار و بێ پەڕۆ کۆنە و بێ رۆن دەسووتا بێ ئاگا بوون، بەڵام ورەیان لەدەست نەدا و لە نێوەندیی لەشکرەکەیان هێرشیان بۆکردن و گالیسکە ئاگرهاوێژەکانیان تێك شکاند و ئاگر هاویشتنیان لەو بەشەی گۆڕەپانی جەنگدا راگرت، بەڵام لە لای راست و لای چەپ سەربازەکانی بەهرام ئەو کارە نەکرا، چوونکە هەردوو لای لەشکری بەهرام هێرشیان نەکرد، تەنیا گالیسکەکان هێرشیان کردە سەر گالیسکە ئاگرهاوێژەکان، ئەوانیش بە هۆی پرژانی ئاگر بەسەر ئەسپەکان و سەرنشینەکانی گالیسکەکان و هەندێك جار سووتانی گالیسکەکان تێك شکابوون.

فرام فەرماندەی گالیسکە جەنگییەکان فەرمانی بەو گالیسکانە کرد کە تا ئەو کات چاوەڕوان بوون تا هێرش بکەن ئەوان تێك بشکێنن، بەڵام ئەو کارە لە هەردوو لا سەرکەوتوو نەبوو، چوونکە گالیسکە ئاگرهاوێژەکان دەرفەتیان نەدەدا تا گالیسکە هێرشبەرەکان بتوانن هێرشەکەیان بەردەوام بکەن. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە نێوەندی لەشکردا، سەربازە پیادەکان بێ ترس لە نێوەڕاستی ئاگر تێپەڕ دەبوون و گالیسکە ئاگرهاوێژەکانیان تێك دەشکاند.

تاکە رێگە بۆ شکاندنی گالیسکە ئاگرهاوێژەکان ئەوە بوو کە سەربازەکانی نێو گالیسکەکانی بەهرام دابەزن و ئەوان بشکێنن، بەڵام ئەوان تیر و کەوان و شمشێر و نێزەیان لابوو، تەوریان لا نەبوو کە بۆ ئەو کارە پێویست بوو، تەنانەت ئەفسەرێکی وەك فرامیش بیری لەوە نەکرد بۆوە کە تەور چەکێکی پێویستە بۆ سەربازەکانی نێو گالیسکەکانی.

دەوترێت بۆ یەکەمجار ئەو جۆرە ئاگرە لەلایەن هێزی بیزەن تیۆم (ئیستانبۆلی ئێستە) لە دژی کەشتییەکانی موعاویە بەکارهات. دوای ئەویش خەلیفەکانی ئەمەوی هەوڵیاندا ئەو شارە کە دواتر بە قوستەنتینە ناسرا، داگیر بکەن، دیسان ڕووبەڕووی ئەو ئاگرە بوونەوە.

هەرچەندە لە نێوان بەهرام و موعاویەدا چوار سەدە هەبووە، بەڵام گومانمان نییە کە ئاگری نەکوژاوە لە داهێنانەکانی خەڵکی بیزانسە کە پایتەختەکەی بیزەن تیۆم بووە.

نهێنی ئەو ئاگرە لە بیزانس بە توندی دەپارێزرا، ئەو نهێنییەیان بە هیچ کەس نەدەوت، گومان نییە کە چەندین جار شاری بیزەن تیۆم بە هۆی ئەو ئاگرەوە لە داگیرکردن پارێزراوە.

ئێستە پسپۆڕەکان دەتوانن ئەو ئاگرە بەرهەم بهێنن کە بە ئاو ناکوژێتەوە و تەنیا بە خۆڵ یاخۆ بەو گازانەی دژە کوژانەوەن، دەکوژێتەوە، بەڵام لە رابردوودا ئاگەدار نەبوون لە هەبوونی گازی ئاگرکوژێنەوە و لە دەریای بەرانبەر بیزەنتیۆمیش، خۆڵ دەست نەدەکەوت.

ئێستە دەزانرێت کە ئەو ئاگرەی بە شێوەی بۆمب لە دووەمین جەنگی جیهانی و لە جەنگەکانی کۆریا و ڤێتنام بە ەر شارەکاندا رژێنران، لە فسفۆر دروست کرابوون، بەڵام ئایا ئەو رۆژەی کارۆس بە ئاگر لە گالیسکە جەنگییەکانی ئێرانیدا، لە هەمان کەرەستە ئاگرەکەی چیێ کردبوو؟.

کاتێك بەناو مێژوودا دەگەڕێین بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤ لە ساڵی (١٦٦٩ ز) مادەی فسفۆری دۆزیوەتەوە، بەو پێیە تا سەدەی هەڤدەهەمی زاینی زانیاریی لەمەڕ ئەو مادەیە نەبووە، هاوکات ئاگری نەکوژاوە لە سەدەی سێیەم لە دژی لەشکری بەهرام بەکارهاتووە، لە سەدەی حەوتەم هەمان ئاگر لە دژی لەشکری موعاویە و لە سەدەی هەشتەم لە دژی جێنشینەکانی بەکارهاتووە، ئەو ئاگرە بە ئاو نەدەکوژایەوە، کاتێك بۆ کەشتییەکانی خەلیفە ئەمەوییەکان هەڵدەدرا، کەشتییەکانی دەسووتاند، تەنانەت ئەگەر کەوتبایە نێو ئاویش نەدەکوژایەوە.

کەواتە دەبێت بگوترێت یاخۆ مێژووی دۆزینەوەی فسفۆر راست نییە و ئەوکات هەبووە، یاخۆ ئەوکات ئەوان ئەو ئاگرەیان لە مادەیەکی دیکە چێچ کردووە و تا ئێستەش مرۆڤەیل ئەو مادەیە ناناسێت یاخۆ لە تێکەڵەیەك لەگەڵ مادەیەکی دیکە چێیان کردووە، تەنانەت تا ئێستە زانایانی ئەم سەردەمش ئەو زانیارییەیان بۆ نەدۆزراوەتەوە.

سەرەنجام فەرام واتە فەرماندەی گالیسکە جەنگییەکانی ساسانییەکان، کاتێك بینی گالیسکەکانی ئەو ناتوانن ئەو گالیسکانە لەنێو ببەن کە ئاگریان لێوە دەردەچێت، بە گالیسکەکەی خۆی کە گالیسکەی فەرماندەیی بوو هێرشی کردە سەر یەکێك لەو گالیسکانە و پێش ئەوەی بیگاتیێ، لەلایەن گالیسکە ئاگرهاوێژەکانەوە ئاگری پێدا پرژێندرا و گالیسکەکەی کە بە هۆی تیشکی خۆر وشك ببۆوە و چیدیکە شێدار نەبوو، گڕی گرت و سووتا، لە ئەنجامدا

خۆی و لێخوورەکان و دوو لە سەربازانی نێو گالیسکەکە گڕیان گرت. لەوکاتەی کە گڕ لە جەستەی بەرببوو، فەرام خۆی هەڵدا بۆ یەکێك لە گالیسکەکانی دوژمن تا تێکی بشکێنێت، بەڵام لە ئەنجامی بەرگری بەرگریکاران و ئەو ئاگرەی لە جەستەی بەربببوو، کوژرا، دوای مردنیشی تەرمەکەی کە کەوتبۆوە سەر زەوی، بەردەوام بوو لە سووتان.

دوای مردنی فەرام چیدیکە کەس نەما بوو کە لەو لایەی گۆڕەپانی جەنگدا بجەنگێت و زۆرینەی گالیسکەکان تێك شکابوون و گەورەترین چەکی جەنگی بەهرام کە گالیسکەکانی بوون، بە تەواوەتی لەنێو چوون.

کارۆس کە نەزانراوە چۆن توانیویەتیی رەزامەندی پاشای بیزانس بۆ وەرگرتنی ئەو ئاگرە بە دەست بهێنێت، کاتێك بۆی دەرکەوت گالیسکەکانی بەهرام بە تەواوەتیی تێکشکاون، فەرمانی بە لای راست و لای چەپی سوپاکەیدا تا دەست بە پێشڕەوی بەرەو ناوەندیی لەشکری بەهرام بکەن.

هەڵەی مەزنی بەهرام ئەوە بوو بیٚ کۆکردنەوەی هێز و بە لەشکرێکی کەمەوە بەرەو جەنگی کارۆس رۆیشت، هەرچەندە مێژوونووسان باسیان لە ژمارەی شەست هەزار سەرباز بۆ لەشکری ئەو کردووە.

ئاشکرایە کە بەهرام پاڵپشت بە گالیسکە جەنگییەکانی بەو هێزە کەمەوە بۆ جەنگی کارۆس رۆیشت، وێڕای ئەوەی لە شوێنی نەگونجاودا گالیسکەکانی لە دژی کارۆس خستە جەنگەوە، بەڵام ئەگەر ئاگرەکە نەبووایە بە گریمانی زۆر دەیتوانی هێزی کارۆس لە دوولای شەڕگە تێك بشکێنێت، بەڵام ئاگرەکە نەخشە جەنگییەکەی بەهرامی تێکشکاند.

ژمارەی سەربازەکانی کارۆس نەوەد هەزار بوو، واتە سی هەزار لە سەربازەکانی بەهرامی دووەم پتر بوون، ئەو لژیۆنانەی لە لای راست و چەپ دەجەنگان لە سەربازە هەڵبژاردەکانی رۆم بوون، بۆیە کاتێك جوولەی لژیۆنەکانی رۆم دەستی پێکرد، بەهرامی دووەم خۆی لە بەرانبەر گەمارۆداندا بینییەوە، دەستی بە پاشەکشە کرد.

مێژوونووسە رۆمەکان ئەو پاشەکشەیەیان بە هەڵاتنێکی گەورەی مێژوو ناو بردووە، لە کاتێکدا بەهرامی دووەم ڕای نەکرد و پاشەکشەی کرد، ئێمە کە لە سەدەی بیستەمین گەواهی دوو جەنگی گەورەی یەکەم و دووەمی جیهانین و دەزانین کە پاشەکشە و هەڵاتن دوو بابەتی جیاوازن.

لە دووەمین جەنگی جیهانی رۆمێلی فەرماندەی بەناوبانگی ئەڵمانیا لە کیشوەری ئەفریقا دووجار لە بەرانبەر هێزی بەریتانیا پاشەکشەی کرد و کەس بۆی بە شکست نەنووسی.

پاشەکشە لە جەنگەکاندا چ لە سەردەمی بەهرام واتە لە سەدەی سێیەم و چ ئێستە واتە لە سەدەی بیستەم بۆ خۆپارێزی لە گەمارۆدران بەکار دەهات.

بەهرام لە کاتی پاشەکشەدا بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت لە ناوچەی (مرە) بەرگری بکات، بۆیە بڕیاریدا لە فورات بپەڕێتەوە و ئەو پردەی پێشتر دروستی کرد بوو، هێشتا مابوو و توانی تەواوی سەربازەکانی لە پردەکە بپەڕێنێتەوە، بە پەڕینەوەی دوا سەربازی لە پردەکە، فەرمانیدا تا ئەو پردە تێك بشکێنن، دوای ئەو کارە مەودای باش لە نێوان ئەو و سوپای کارۆس دروست بوو، بە هۆی وەرزی بەهار و زۆری ئاوی فورات کارۆس نەیدەتوانی لە ئاوەکە بپەڕێتەوە.

کارۆس بە هەموو کەلوپەلێکی جەنگی سەردەمی خۆی هاتبوو بۆ جەنگی بەهرام و لە لەشکرەکەیدا ئەندازیاران و ئەو کەسانەی پردیان دروست دەکرد هەبوو.

دوای ئەوەی بەهرامی دووەم پردەکەی خۆی تێکشکاند، گریمانی دەکرد کە کارۆس پرد دروست بکات و دەیزانی بۆ ئەوەش پێویستی بە تەواوی ئەو بەلەم و بەلەمانە هەیە کە لەو سنوورەن تا بە تەنیشت یەکدیدا ریزیان بکەن و داریان بخەنەسەر و پێیاندا بپەڕنەوە. بۆیە بەهرام فەرمانی کرد تا تەواوی ئەو بەلەم و بەلەمانەی لەو ناوچەیە هەبوون بۆ سەرەوە و خوارەوەی ڕووبارەکە دوور بکەونەوە تا نەکەونە دەست کارۆس و لەشکرەکەی بۆ دروستکردنی پرد.

کارۆس دوای ئەوەی لەو سنوورە هیچ بەلەم و بەلەمێکی نەبینی، فەرمانی بە ئەندازیارەکانی کرد تا دارەکانی کەناری زێیەکە ببڕن، بۆ دروستکردنی پرد، هێندەی پێویستە بەلەم دروست بکەن. سەربازانی لژیۆنەکان مشاریان گرتەدەست و دارەکانیان بڕییەوە و دوابەدوای بڕینەوەی هەر دارێك و لە ماوەی کەمتر لە کاتژمێرێك، دارەکە دەکرا بە تەختەی ئەستوور و دەگوازرایەوە بۆ کەناری ڕووبارەکە و لەوێندەر بەلەمی لێ دروست دەکرا. ئەوان لە کارگەکانی بەلەمسازی خۆیان نەتەنیا بە رۆژ، تەنانەت شەوانەش و لەبەر ڕووناکی مەشخەڵەکانیش کاریان دەکرد.

ئەو رۆژەی کارۆس کەوتە دوای بەهرام لە کەنارەکانی زێیەکە تاکە بەلەمێك بەرچاو نەدەکەوت، بەڵام بە هەوڵ و ماندوو بوونی لەشکرەکەی لە ماوەی پێنج رۆژدا توانیان پردەێك لەسەر زێی فورات دروست بکەن. سەربازە رۆمەکان کاتێك ئیمپراتۆرێکی باشیان دەبوو، بەم شێوەیە کاریان دەکرد، کە تەنانەت لە ئێستەشدا ئەو شێوە کارکردنە سەختە دەبینین کە دروستکردنی پرد لە شێوەی کەڵەك بەو چووپانەی پڕ با دەکرێن لە ماوەیەکی ئاوا کەمدا ئەستەمە.

سەرەنجام پردەکە ئامادە بوو، پەڕینەوەی سەربازە ڕۆمەکان لەسەر پردەکە دەستی پێکرد.

پەڕینەوەی سەربازەکان لەبەرەبەیانی شەشەمین ڕۆژ دەستی پێکرد و تا بەرەبەیانی ڕۆژی حەوتەمین ڕۆژی خایاند، چوونکە لە لایەك لەشکرێکی نەوەد هەزار کەسی بە لەشکری بچووك دانانرێت، لە لایەکی دیکە ئەوان مەنجەنیق و گالیسکە ئاگرهاوێژەکانیشیان لابوو و دەیانپەڕاندنەوە بۆ ئەوبەری فورات.

لە کاتی پەڕینەوەی لەشکری ڕۆم لە پردەکە واتە کاتی شەو، کارۆس پشووی دا و تا بەرەبەیان خەوت، بەرەبەیان هەواڵیان پێدا نۆرەی ئەوە و پێویستە خۆی و ئەوانەی دەورەی و خزمەتکار و گاردی پاسەوانەکانی بپەڕنەوە، بەڵام بەر لەوەی بپەڕێتەوە کاهینی گەورەی پەرستگەی ژوپیتێرن لێی نێزیك کەوتەوە و پێی وت تا پەڕینەوەکەی خۆی رابگرێت.

پێویستە ئەو بابەتە باس بکەین کە لە لەشکری ڕۆمدا کاهینی پەرستگەی ژووپی تێرن وەك فەرماندەی ڕۆحی لەشکرەکە وابوون، نەتەنیا سەرباز و ئەفسەرەکان، بگرە فەرماندەی باڵای لەشکریش دەبووایە گوێ بۆ فەرمانەکانی بگرێت. وێڕای ئەوەی کاهینەکە پیاوێکی بەڕێز بوو، بەڵام ئیمپراتۆر بە سەرسووڕمانەوە پرسیاری کرد کە بۆچی چەند ڕۆژێك پەڕینەوەکەم ڕابگرم؟.

کاهینەکە وتی من فالێکم گرتووەتەوە و ئاکامەکەی باش نییە، بەڵام ئەگەر چەند ڕۆژێك ئیمپراتۆر خۆی بگرێت و نەپەڕێتەوە، بارودۆخە شوومەکە تەواو دەبێت و هیچ ڕووداوی خراپ بۆ ئیمپراتۆر ڕوونادات.

کارۆس وتی تەواوی لەشکرەکەم پەڕیوەتەوە و هیچ سەربازێکم لێرە نەماوەتەوە، دوژمنیش لەوبەری ڕووبارەکەیە و من ناتوانم لەشکرەکەم لە بەرانبەر دوژمن بە بێ فەرماندەی بەجێ بهێڵم، بۆیە بێ گوێدان بە وتەی کاهینەکە، لە پردەکە پەڕییەوە.

نۆڵدکەی ئەڵمانی  کە مێژووی ساسانییەکانی لە فەرهەنگی بەریتانیکادا نووسیوەتەوە، دەڵێت: بەهرامی دووەم شاری تیسفونی بە شارێکی بێ بەرگریکار ناساند و بە لەشکرەکەیەوە بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشت، کارۆسیش گەیشتە نێو شاری تیسفون، بەڵام بە رای ئۆمیستید کە تا ساڵی (١٩٣٥ ز) مامۆستای مێژووی ئێران بووە لە زانکۆی شیکاگۆی ئەمەریکا، دەبێژێت ئەگەر کارۆس و لەشکرەکەی گەیشتبانە نێو شاری تیسفون، ئەو شارەیان تاڵان دەکرد، لە کاتێکدا تەنانەت یەك دەنکە گەنم لەو شارە نەبردراوە.

ئەو دەڵێت چەند ئیمپراتۆرێکی رۆمی بە دەست ساسانییەکان کوژران و بە دیل گیران یاخۆ شکستیان خوارد، بۆیە رك و کینەی رۆمەکان بەرانبەر بەوان بە رادەیەك بوو کە نەیاندەتوانی خۆیان لە تاڵانکردنی شارەکە بپارێزن.

هەرچەندە بە وتەی نۆڵدکە، بەهرامی دووەم شاری تیسفونی بە شاری بێ بەرگریکار ناساند، بەپێی نەریتی ئەوکات، دانیشتووانی شارە بێ بەرگریکارەکان نەدەبووایە هیچیان لێ بکرێت، بەڵام بێگومان ئەگەر کارۆس گەیشتبایە نێو شاری تیسفون لە تۆڵەی جەنگەکانی رابردوو، هەروەسا خوێنی سێ ئیمپراتۆری رۆم کە بە دەست ساسانییەکانەوە کوژرابوون، ئەو شارەی تاڵان دەکرد، بەڵام تیسفون نەکەوتە بەر تاڵان، ئەوە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە لەوەی کە کارۆس نەگەیشتووەتە نێو ئەو شارە و پێویستە بیروڕای نۆڵدکە لەم بارەوە راست بکرێتەوە، بەڵام نۆڵدکە کەسێك نەبووە کە بابەتی ئاوا بە بێ بەڵگە بنووسێتەوە و سەرچاوەی نووسینی ئەو بۆ ئەو بابەتە (پلیناسی بچووکە) کە جیایە لە (پلینی گەورە) کە مامێتی.

پلینی گەورە کەسێکە ناچرالیست واتە سرووشتناس بووە، مێژووی سرووشتی ئەو لەبارەی جیهانی کۆن بە یەکێك لە پەڕتووکە بە بایەخەکانی جیهان دەناسرێت و لە سی و حەوت بەرگدا کۆکراوەتەوە، هەرچەندە زانیاریی و بابەتەکانی هەموویان داهێنان و نووسینی ئەو نین، هەندێکیان وەرگیراون، بەڵام چوونکە گشتگیرە پاش دوو هەزار ساڵ، هێشتا پەڕتووکێکی بە کەڵکە و پێشکەوتنەکانی مرۆڤ نەیتوانیوە بایەخی ئەو پەڕتووکە کەم بکاتەوە.

پلینی بچووك کەسێکی خودان بەهرەی سیاسیی بوو، زۆر ئارەزووی لە مێژوو کردووە، لە ساڵی سەدی زاینیدا بۆتە کونسوڵی رۆم، ئەو پایەیە ئەو سەردەمە لە رۆم نێزیك پایەی سەرۆك کۆماری ئێستە بووە.

ئەو پەڕتووکێکی نووسیوە کە لەوانەیە لە جۆری خۆی دەگمەن بێت و بە شێوەی بەدوای یەکدا نووسراوەتەوە، واتە پلین کە لە ساڵی (١١٣ ز) کۆچی دوایی کردووە، وەسیەتی کردووە کە پەڕتووکەکەی بەکۆتا نەیێت و دوای خۆی کوڕ و نەوەکانی درێژە بدەن بە نووسین لەبارەی مێژووی رۆم. نەوەکانی پلین وەسیەتی باوکیان بەجێ گەیاند و نەوە لە دوای نەوە تا نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی زاینی نووسینەوەی مێژووی رۆمیان لەو پەڕتووکە درێژە پێدا.

دوای ئەو بەرواره بە هۆی ئەوەی لەو بنەماڵەیە کەس نەبوو کە دەستی نووسینەوەی مێژووی هەبێت، ئەو پرۆسەیە بەکۆتا هات، چوونکە ئەو مێژووە تا نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەم بەردەوام بوو، بە شێوەیەکی ئاسایی ڕووداوەکانی نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی تێدا

بوو، یەکێك لەو ڕووداوانەش کە ئەوکات ڕوویداوە، هەمان لەشکرکێشیی کارۆسی ئیمپراتۆری ڕۆم بۆ سەر دەسەڵاتیی ساسانییەکان بووە.

ئەو بابەتەمان بۆ ئەوە باس کرد تا نەبێتە مایەی سەرسووڕمانی ئەو خوێنەرانە کە زانیاریان لەبارەی ساڵی مەرگی پلین واتە (١١٣ ز) هەیە، تا نەگوترێت ئەو مێژووە چۆن لە دوای مەرگی ئەو نووسراوەتەوە، چوونکە ڕووداوەکانی پەڕتووکی پلین نەوە دوای نەوە نووسراوەتەوە، هەر نەوەیەك بە گەواهیدەری ڕووداوەکان هەژمار دەکرێت، بۆیە بەشێك لە مێژوونووسەکان متمانەی زۆریان پێیە، هاوکات هەندێ کەس دەڵێن ناکرێت متمانە بەو پەڕتووکە بکرێت، بۆ ئەمەش دوو هۆکاریان هەیە:

یەکەم: مێژووی هیچ سەردەمێك ناکرێت لە کاتی خۆیدا بنووسرێتەوە، ئەوەش بە هۆی کاریگەریی رك و کینە و خۆشەویستی و لاگیری و ترسی نووسەر کە رێگرن لە نووسینەوەی ڕووداوەکان وەك چۆن هەن، نووسەر لەبەر ئەو هۆکارانە ڕووداوەکان بە شێوەیەك دەنووسێتەوە کە بۆ خۆی و کەسوکاری نەبێتە مایەی مەترسی. بۆیە بە وتە و ڕای ئەو گرووپە، ئەو جۆرە مێژوونووسینە بە رۆژنامەنووسی یاخۆ ڕووداو نووسینەوە دەژمێردرێت و ناتواندرێت بە مێژوو نووسینەوە بزانرێت.

دووەم: چوونکە ئەو مێژووە پشت لە دوای پشت لە رێگەی نەوەکانی پلینەوە دەنووسرایەوە، بۆیە ناسراو بوو، لە رۆم هەموو ئەوانەی دەهاتنە سەر تەختی پاشایەتی دەیانزانی ئەو مێژوو نووسینەوەیە هەیە و ئەوان حەزیان نەدەکرد تا بابەتگەلێك لەو مێژووانەدا بنووسرێتەوە کە دژی حکوومەتەکانیان بێت، ئەمەش پاڵنەر بوو بۆ نەوەکانی پلین تا خۆیان بەدوور بگرن لە نووسینەوەی ئەو بابەتانەی پێچەوانەی ویستی حکوومەتەکانە و رەچاوی باوەڕی ئەوان بکەن.

نۆڵدکە بەپشت بەستن بەو مێژووە نووسیویەتی کارۆس دوای پاشەکشەی بەهرامی دووەم لە تیسفون ئەو شارەی داگیرکرد، بەڵام ئۆمیستید بڕوای بەو بەشەی ئەو پەڕتووکە نییە کە لە دوای مردنی پلین و لەلایەن نەوەکانییەوە نووسراوەتەوە و دەڵێت ئەو بەشانە بۆ دەستخۆشی کردنیان لەلایەن دەسەڵاتدارەکانی رۆمەوە نووسراوە. بەڵگەی ئەو بەهێزە و لە خوێندنەوەی ئەو دێرانەی دواتر باسیان دەکەین.

باسمان لە ئامۆژگاری کاهینی پەرستگەی ژووپی تێرن بۆ ئیمپراتۆر کرد بە وێستانی بۆ ماوەی چەند رۆژێك لەمبەری پردەکە بە هۆی ئەوەی ڕووداوی ناخۆش چاوەڕوانی بوو، هەڵبەتە

کارۆس ئەو ئامۆژگارییەی پەسەند نەکرد و کەوتەڕێ، ئەو هێشتا نەگەیشتبووە شاری تیسفون کە بە هۆی وەرزی بەهار هەورەکان ئاسمانیان داپۆشی و بروسکە چەخماخەی دەدا و بووە هەورە تریشقە، سێیەم هەورە تریشقەی هەور بەر کارۆس کەوت و دەست بەجێ کوشتی. ئیمپراتۆر و ئەسپەکەی کەوتن و قاچی ئەو لەژێر جەستەی ئەسپەکەی بوو، سەربازەکان قاچیان دەرکێشا و بینیان کە مردووە.

ئەوەی باسکرا برێتییە لە بیرۆکەی ئۆمستید، بەڵام لە پەڕتووکی پلیندا نووسراوە کە کارۆسی ئیمپراتۆری رۆم بە هۆی گەرمی هەوا لە کۆشکی پاشایەتیی لە تیسفون لە هەیوانەکە بوو، هەورە تریشقە لێی دا، دواتر لە شاری رۆم مرد.

ئۆمستید پێی وایە ئەو گێڕانەوەیە بۆ پەسەندکردن نابێت، چوونکە وەك زانراوە هەورە تریشقە بەردەوام لە بەرزترین شوێن دەدات و لە بیاباندا ئاساییە کە ئەو کارە ڕووبدات، چوونکە باڵای مرۆڤ خۆی دەبێتە ئەو بەرزییە، بەڵام کارۆس ئەگەر لە هەیوانی کۆشك بوو بێت، نەکەوتووتە شوێنێکی وا بەرز کە بەر هەورە تریشقە بکەوێت و لەسەر هەیوانەکە گومەزێك هەبووە کە دەبووایە هەورە تریشقە بەر ئەو گومەزە بکەوێت و وێرانی بکات.

ئۆمیستید بەردەوام دەبێت و دەڵێت ئەگەر ئەو گریمانە راستیش بێت کە لە کۆشك دووچاری ئەو دۆخە هاتبێت، دوای مردنی ئیمپراتۆر ئیدی سەربازەکان ترسی ئیمپراتۆریان نامێنێت و دەکەونە تاڵانی ئەو شارە، بەڵام دەبێت بۆچی دوای مردنی ئیمپراتۆر شارەکە تاڵان نەکرابێت و کەوت بێتەوە دەست خەڵکی شارەکە.

ئایا لەگاتەکانی رۆم هێندە ترسنووك و بێ ئەزموون بوون کە دوای مەرگی ئیمپراتۆر بە هەورە تریشقە، راستەوخۆ دوای ئەو هەموو رەنج و ماندووبوونەی رێگە بڕین و گرتنی پایتەختی ئێران، ئەو شارە بەجێ بهێڵن و بڕۆن؟.

بەم شێوەی باسکرا رای ئۆمستید بە راستتر دەزانرێت و لەوانەیە چوونکە ئیمپراتۆر کاسکێتی ئاسنینی لە سەر و زرێی لەبەربوو بێت، بەر هەورە تریشقە کەوت بێت و مرد بێت، دواتریش ساسانییەکان هێرشیان کرد بێت و دووبارە جەنگ ڕوویدا بێتەوە و لە جەنگەکەدا ڕەنگە رۆمەکان بە هۆی تەواوبوونی پێداویستییەکان، نەیان توانی بێت ئاگری نەکوژاوە بە لەشکری ساسانیدا بکەنەوە و سوودی تەواوی لێ وەربگرن، مردنی ئیمپراتۆریش لە لایەك و هێرشی ساسانییەکان لە لایەکی دیکە، ریزەکانی لێك ترازاندبن و ناچار بە پاشەکشە بووبن و

له پردەکە پەڕیبنەوە، سەرەنجام لە دوای خۆیانەوە پردەکەیان ڕووخاند بێتەوە تا ساسانییەکان نەتوانن بە دوویان بکەون.

بە گشتیی ئەوەی لەلایەن هەموو مێژوونووسانەوە وتراوە، مردنی کارۆس بە هەورە تریشقە پشتڕاست دەکاتەوە و پێشبینی کاهینی پەرستگەی ژووپیتێرن راست دەرچوو کە هەوڵیدا ئیمپراتۆر خۆی لە رۆیشتن بپارێزێت.

مردنی کارۆس بەو هۆکارە، پێش گەیشتنی بۆ تیسفون بە ڕووداوێکی سەرەنج راکێشی جیهان دەناسرێت و ئەو پیاوە لێهاتووە ئەگەر گەیشتبایە تیسفون، مێژووی رۆم و ئێران دوای ئەم ڕووداوە بە تەواوەتی دەگۆڕا و بە شێوەیەکی دیکە دەنووسرایەوە.

ئەو مردنە لە ناکاوەی ئیمپراتۆری رۆم، ئێران لە مەترسی رزگاری بوو، بەهرامی دووەمیش توانی پایتەختەکەی بپارێزێت. ئەو ڕووداوە دیارترین ڕووداوی سەردەمی پاشایەتیی بەهرامی دووەم بوو، دوای ئەو ڕووداوەش بەهرام دووچاری نەخۆشی هات و پزیشکەکان وتیان بۆ چارەسەر پێویستە بچێتە (دەماوەند) و ماوەیەك لەوێندەر بمێنێتەوە و ئاوی ئەو کانییە بخواتەوە کە چارەسەر بەخشە.[1]

---

(١) نەزانراوە ئەو کانییەی ئەوکات پزیشکەکان ئامۆژگاری بەهرامیان کردووە، هەمان کانی (ئاب عەلی)یە یاخۆ نا، چونکە ئەو کانییە یەکێکە لە سەرچاوە کۆنەکانی ئاوی کانزایی ئێران و لەسەردەمی کۆندا لەو باوەڕەدا بوونە کە ئەو ئاوە چارەسەری نەخۆشییەکان دەکات. "زەبیحوڵڵا"

# دەوڵەتی ناسەقامگیر

لەبارەی نەخۆشییەکەی بەهرامی دووەم پاشای ساسانی زانیاریمان نییە، جگە لەوە کە درێژەی کێشاوە و چەند ساڵێکی خایاندووە، چوونکە لە مێژوودا هیچ باسێك لە نەخۆشییەکەی نییە، ناتوانین بزانین چ نەخۆشییەکی هەبووە. تەنیا بە لە بەرچاوگرتنی درێژی ماوەی نەخۆشییەکە و ئامۆژگاریی پزیشکەکان بۆ خواردنەوەی ئاوی کانزایی، دەکرێت لێکدانەوە بکەین کە نەخۆشییەکەی لەوانەیە لە گورچیلەکانی بوو بێت، چوونکە ئەو نەخۆشیانە ئەگەر نەگەیشتبنە قۆناخی مەترسیدار، ماوەیەك دەخایەنن، سرووشتیشە ئەو لێکدانەوەی ئێمە هیچ بایەخی مێژوویی نییە.

بەهرامی دووەم لە ساڵانی دوایی تەمەنیدا بە هۆی پاڵپشتی بێ سنووری لە کارتێر، متمانەی خۆی لای لایەنگرەکانی لە دەستدا، وەك زانراوە کارتێر دوای دادگەییکردنی مانی و کوشتنی، باڵادەستی زۆری لە لای بەهرامی دووەم پەیداکرد، هەروەها وەرگرتنی نازناوی (فریادڕەسی گیانی بەهرام) ئەو دەسەڵاتەی بۆ پتر کرد، ئەویش بە سوودوەرگرتن لەو بابەتە بۆ ئازاردان و لەنێوبردنی مانییەکان و لایەنگرانی ئاینەکانی دیکە، پێگەی دامەزراوەی زەردەشتی زۆر بەهێزتر کرد، هەر لەو ڕێگەیەوە دەستی دەخستە نێو تەواوی کاروبارەکانی دەوڵەتەوە.

ئەو ڕەفتارەش لە تەواوی ساڵانی پاشایەتیی بەهرامدا لەلایەن ئەوەوە پێڕەوی دەکرا، لە ساڵانی کۆتایی تەمەنی بەهرامدا بووە هۆی ناڕەزایی و بێزاری شازادە و دەسەڵاتدارانی وڵات، لە ئاکامدا ڕاپەرینی (نەرسیس) یاخۆ (نرسی) ئامۆزای بەهرامی لێکەوتەوە کە فەرمانڕەوای ئەرمەنستان بوو. نرسی لەو سەردەمەی بەهرام نەخۆش کەوتبوو، بە ناوی خۆیەوە سککەی لێدا و بانگەشەی پاشایەتیی کرد، بەڵام لەو سەربەندەدا بەهرام مرد و لەلایەن کارتێرەوە (بەهرام سکانشاه) کرایە جێنشین و وەك بەهرامی سێیەم بە پاشا دیاری کرا.

مێژووی ساسانییەکان لەنێو ئەو ئیمپراتۆرییەتانەدا کە بەر لە هاتنی ئیسلام لە ئێران هەبوون، یەکێکە لە تەواوترین مێژووەکانی ئێران، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەندێ شوێنی ڕوون

و دیار نییە، یەکێك لە بابەتە شاراوەکانیشی برێتییە لە کەسایەتیی بەهرامی سێیەم کە ماوەیەکی کورت پاشایەتیی کردووە و نەزانراوە کێیە.

ئەوەی لەبارەی بەهرامی سێیەم بە دڵنیایی دەیزانین ئەوەیە کە ناوبراو لە ساڵانی کۆتایی تەمەنی بەهرامی دووەمدا فەرمانڕەوای ناوچەی سگستان یاخۆ زابولستان بووە و لەوێندەر (خەسرەو) ناو دەبرا.

بەهرامی سێیەم کاتێك فەرمانڕەوای ئەو سنوورە بوو، سەرابۆدی سەرۆکی ئاگرخانەی نەیشاپوور و تەلاووسی کۆنە فەرمانڕەوای خۆراسانی پاراست، ئەگەر پاڵپشتی بەهرامی سێیەم نەبووایە، بەهرامی دووەم ئەوانی لەنێودەبرد، تەنانەت ئەگەر سەرابۆد کە مووغ بوو لەنێو نەبردرایە، بە دڵنیاییەوە تەلاووس لەنێو دەبرا.

ئەوانەی سککەی سەردەمی ساسانییەکانیان هەیە، دەبینن لە سککەی بەهرامی دووەمدا وێنەی کوڕێك لەپشت سککەکە هەیە. ئەو کوڕە کوڕی بەهرام و بە گریمانی دروست، شازادەی جێنشین بووە، بەڵام دوای مردنی بەهرامی دووەم و لە ساڵانی (٢٩٣ یاخۆ ٢٩٤ ز) بەپێی ڕووداوەکان ئەو کوڕە نەگەیشتە دەسەڵات و بەهرامی سێیەم فەرمانڕەوای سەگستان بووە پاشا.

مێژوونووس و سککەناسەکان تا ئێستە نەیان زانیوە کە بەهرامی سێیەم کوڕی کێ بووە، زانراوە کە سککە لە بەڵگە بێگومانەکانی مێژووی پاشا و دەسەڵاتدارانە.

هەندێ مێژوونووس وتوویانە بەهرامی سێیەم کوڕی هورموزی یەکەم کوڕی شاپووری یەکەم بووە، هەندێکی دیکە ئەو بیرۆکەیە پەسەند ناکەن. ئەو دابڕانە مێژووییە لە دوو هۆکارەوە هاتووە کە برێتین لەوەی:

یەکەم: نازانین بەهرامی سێیەم کوڕی کێیە!.

دووەم: زانیاریمان نییە دوای مردنی بەهرامی دووەم چی ڕوویداوە، بۆچی کوڕەکەی نەهاتە سەر تەختی پاشایەتیی؟!.

دەبێ بزانین کە کەمی تەمەنی کوڕی بەهرام هیچ ڕێگری نەدەکرد لە گەیشتنی بە تەختی پاشایەتی، لە سەردەمی ساسانییەکاندا زۆر لەو منداڵتر کە شاپووری دووەم بوو، گەیشتوونەتە دەسەڵات، تەنانەت بە گێڕانەوەیەك شاپووری دووەم ئەوکاتەی لە سکی دایکیدا بووە، کە بووەتە پاشا، هەرچەندە ئەو گێڕانەوەیە لاوازە و ئەوان نەیان زانیوە ئەو کۆرپەیە لە سکی

دایکیدا کوڕە یاخۆ کچە، لە زنجیرەی پاشایەتیی ساسانییەکان، تا ئەوکات نەریت نەبوو کە کچان ببنە پاشا، تەنیا لە کۆتاییەکانی ساسانییەکان، هەندێك لە خانمان گەیشتنە دەسەڵات.

ئایا کوڕی بەهرامی دووەم مرد، پێش ئەوەی باوکی بمرێت؟!، چوونکە ئەو هیچ میراتگری بۆ تاج و تەختی پاشایەتیی نەما تا بەهرامی سێیەم ببێتە پاشا؟، بێگومان بەهرامی سێیەم لە شازادە ساسانییەکان بووە، بۆیە گەیشتۆتە پلەی پاشایەتیی، ئەگەر وابێت بۆ ناوی باوکی بە شاراوەیی ماوەتەوە یاخۆ کەوتووەتە بەر گومان؟، هەرچەندە ئەو بەشە لە مێژووی ساسانییەکان بە شاراوەیی ماوەتەوە و ئەو بابەتە تا ئێستە ڕون نییە، بەڵام نابێت نائۆمێد ببین لە دۆزینەوەی ڕاستییەکە، چوونکە لە ماوەی نیو سەدەی رابردوودا کۆڵێنکارییەکان لە ئێران زۆر بابەتی شاراوەیان بۆ بە دیار خستینەوە و یارمەتیدەری بەهێز بوون بۆ ڕوونکردنەوەی زۆر لایەنی شاراوە و نادیار.

بەهرامی سێیەم دوای بوونی بە پاشا، ناردی تا سەرابۆد بێتە تیسفون و کردی بە سەرۆکی ئاگرخانەی گەورەی تیسفون کە ناوی تەدام بوو.

سەرابۆد چاوەڕوان بوو تا پلەی بەرزتری پێ بدرێت و بکرێتە سەرۆکی دامەزراوەی زەردەشتی، تەنانەت چاوەڕوان بوو کە بەهرامی سێیەم، کارتێر بکوژێت دوای ئەوەی لە سەرۆکایەتیی ئەو دامەزراوەیە لای دەدات. ئەو تا رادەیەك دژی کارتێر بوو کە ئەو بابەتەی لەگەڵ بەهرامی سێیەم خستەبەر باس و وتی: کارتێر فەرمانی کرد بوو تا سەرم ببڕن و بیبەن بۆ شاری تیسفون، بۆیە ئێستە پێویستە سەری ئەو ببڕدرێت.

بەهرامی سێیەم وتی: ئەو مووغە و من ناتوانم مووغێك بکوژم.

سەرابۆد وتی: سەرۆکی پێشووی ئاگرخانەی تەدامیش مووغ بوو و کوشتیان.

بەهرامی سێیەم وتی: ئەو لایەنگری مانی بوو، کارتێر لایەنگری مانی نییە.

سەرابۆد وتی: کەواتە کە نیازی کوشتنی ئەوت نییە، پێویستە لە سەرۆکایەتیی دامەزراوەی زەردەشتی لای بدەی و من لە جیاتی ئەو دیاری بکەی.

بەهرامی سێیەم وتی: من ناتوانم ئەو کارەش بکەم، چوونکە کارتێر لە رابردوودا خۆی بە دۆستی من ناساندووە و دۆستایەتیی ئەو بۆ من یارمەتیدەر و کاریگەر بووە، شیاوی ئەوە نییە کە چاکەی ئەو لەبەر چاو نەگرم و ئەو لە پۆستەکەی لابدەم. لە لایەکی دیکە ئەو بە تەمەندا چووە، لەوانەیە ئەگەر لەو تەمەنەدا لە پۆستەکەی لابدرێت، هێندە خەمگین ببێت کە لە ماوەی چەند رۆژێکدا بمرێت. ئەگەر تۆ پشوودرێژ بی، ماوەیەکی کەم ناخایەنێت کە ئەو بە

هۆی تەمەنییەوە دەمرێت و ئەوکات من لە جیاتی ئەو، تۆ دیاری دەکەم بە سەرۆکی دامەزراوەی زەردەشتی.

سەرابۆد وتی: من وەك دەبینم ئەو پیاوە مەرگی دەیان گەنجی دیکە دەبینێت، ڤێجا دەمرێت.

بەهرامی سێیەم وتی: کاتێك تەمەن کۆتایی هات، ئەویش وەك هەموو ئەوانی دیکە دەمرێت.

کاتێك بۆ سەرابۆد ڕوون بۆوە بەهرامی سێیەم نەتەنیا نایەوێت کارتێر بکوژێت، بگرە ویستی لادانی ئەویشی نییە.

سەرابۆد وتی: کەواتە نەریتی پەرستنی میترا کە لەلایەن ئەو پیاوەوە لە هەموو شوێنێکی ئێران پەرەی پێدراوە، لەنێو ببە.

* * *

مەبەستی سەرابۆد لەو پێشنیازە بۆ ئەوەبوو کە گورزێکی کاریگەر لە دەروونی کارتێر بدات و سەرۆکی ئاگرخانەی تەدام لە لێکدانەوەکەیدا بە زۆر بەهەڵەدا چووبوو، چوونکە لابردنی نەریتی میتراپەرستی هیچ گورزی ڕۆحی لە کارتێر نەدەدا، کارتێر لە پەرستنی میترا و فەرمانی بۆ مووغەکان، تەنیا دەیویست خواستی دەسەڵاتدار بەدی بهێنێت و خۆی هیچ جۆرە ئارەزوویەکی لە پەرستنی میترادا نەبوو.

بەهرامی سێیەم ئەو داوایەی سەرابۆدی بەجێ گەیاند و فەرمانی بە کارتێر کرد تا بە مووغەکان رابگەیەنێت کە واز میتراپەرستی بهێنن و تەواوی ئاگرخانەکانی بە ناوی ئەو بینا کراون، بخرێنەوە سەر ناوی ئاهورامەزدا و هەموو خزمەتکار و سەرپەرشتیارانی ئاگرخانەکان لە شوێنەکانی خۆیان خزمەت بکەن، تەنیا پێویستە هەموویان بزانن کە خزمەتکار و سەرپەرشتیاری ئاگرخانەکانی ئاهورامەزدان.

سەرابۆد زۆر پشوو درێژی نواند تا بە رێگەی کاریگەرییە ڕۆحییەکان یاخۆ بە هۆی تەمەنی پیرییەوە کارتێر بمرێت و ئەو نەدەمرد، ئەو لە پزیشکەکانی پرسی بوو کە نیشانەکانی مردن بە هۆی پیری چییە؟.

پزیشکەکان وتبوویان: هەر کاتێك کەسێکی بە تەمەن سکاڵای لە قاچەکانی هەبێت کە توانای هەڵگرتنی جەستەی ئەویان نەمابێت و بڵێت وا هەست دەکەم کە قاچەکانم لە لۆکە دروست کراون، ئەو کات مردنی نێزیك بۆتەوە.

هەموو بەرەبەیانێك سەرابۆد کەسێکی دەنارد بۆ پرسین لە هەواڵی تەندروستی کارتێر، کەسەکەش بێ ئەوەی دیاری بخات کە لەلایەن سەرابۆدەوە هاتووە تا لە تەندروستی سەرۆکی دامەزراوەی زانایانی زەردەشتی بپرسێت، دواتر پرسیاری دەکرد کە ئایا قاچەکانی توانا و هێزیان هەیە یان نا؟، ئایا ئەو بە باشی دەتوانێت رێ بکات یاخۆ نا؟، ئەویش وەڵامی دەدایەوە کە قاچەکانی هێندە بە توانا و بەهێزن کە لە قاچی کەسێکی گەنج و بە توانا دەچن، زۆر بە کەمی بە دەست قاچەکانییەوە لە ئازاردایە.

کاتێك نێردراوەکە وەڵامی تەندروستی کارتێری بۆ سەرابۆد دەگەڕاندەوە، ئەو دەیوت من دەزانم ئەو پیاوە دەیان گەنجی دیکە دەنێرێتە بەر مردن،ئینجا خۆی دەمرێت.

یەکێك لە رەشترین سەردەمەکانی مێژووی ئێران ئەو سەردەمەیە لە مێژووی ساسانییەکان کە بە مردنی بەهرامی دووەم دەست پێ دەکات و بە پاشایەتیی شاپووری دووەم کۆتایی دێت. سەبارەت بە بەهرامی سێیەم نووسیویانە کە ماوەی پاشایەتییەکەی تەنیا چوار مانگ بووە، دوای یاخیبوونی نەرسی کوڕی شاپووری یەکەم و لەلایەن ئەوەوە کۆتایی بە دەسەڵاتیی هاتووە.

(ئۆزۆپ دۆ سێزارە) کە ناوەکەی بە دروستی بە (ئۆزۆبۆس) دەخوێندرێتەوە، لە ساڵی (٣٣٩) زایینیدا کۆچی دوایی کردووە، نووسیویەتی کە ئەویان ژەهرخوارد کردووە، بەڵام ئەو بابەتە راست نییە و بەهرامی سێیەم لە پاشایەتیی لابردرا، هەندێ لە لێتۆژان پێیان وایە کە ئەو لە پاش ساڵی (٢٩٣) زایینی بە دواوەش لە هەندێ لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئێران فەرمانڕەوا بووە.

سەرەنجام یاخیبوونی نرسی یاخۆ نرسێس ڕوویدا، بە پێشوازی گەرمی کاربەدەستانی وڵات هات و لە شاری تیسفون تاجی کردە سەر و کۆتایی بە سەردەمی هێز و توانای کارتێر هێنا. بۆیە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو بە سەردەمی کۆتایی توندوتیژی دژ بە ئاینەکانی دیکە و سەردەمی لێبووردەیی ئاینی ناسراوە، شێوە و جۆری ڕێوڕەسمی تاجکردنە سەری ئەو لە کەتیبەیەکدا نووسراوەتەوە کە بە فەرمانی ئەو لە (پایکۆڵی) نێزیك شاری سلێمانی لە کوردستانی عێراق هەڵ کەندراوە.

نرسی دەیەویست بیرەوەری و سەروەرییەکانی سەردەمی باوکی واتە شاپووری یەکەم زیندوو ڕابگرێت، بۆیە دوای لادانی کارتێر و ڕێکخستنەوەی هەندێ لە کارەکانی ناوەخۆی وڵات، بۆ کەم کردنەوەی دەسەڵاتیی ڕۆمەکان، لەشکرکێشیی کردە سەر ئەرمەنستان و لە ماوەیەکی کورتدا توانی هێزەکانی (تیردادی سێیەم) کە شازادەی ئەشکانی بوو، کە بە پاڵپشتی ڕۆم فەرمانڕەوایی دەکرد، تێك بشکێنێت و لە دەسەڵات دووری بخاتەوە.

نرسی دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیە، تەنانەت توانی لەشکری ڕۆم بە فەرماندەیی (گالێریۆس) تێك بشکێنێت کە بە فەرمانی (دیوو کلیسیان) ئیمپراتۆری ڕۆم بۆ یارمەتی تیرداد هات بوو، بەڵام دوای ساڵێك لەو بەرەوارە، بە کاروانی پاشایەتییەوە بەرەو ئەرمەنستان دەڕۆیشت و کەوتە بەر هێرشی گالێیۆس و لەو جەنگەدا شکستی خوارد و (ئەرسانی خێزانی) و منداڵەکانی و خزمەکانی و گەنجینەی پاشایەتیی کەوتە دەست ڕۆمەکان، بۆیە ناچار بوو تا مەرجە قورسەکانی ڕۆم پەسەند بکات.

سەرەنجام دیوو کلیسیان ڕەزامەندی بۆ ناردنەوەی دیلەکان نواند و لە بەرانبەردا ڕێککەوتننامەیەك لە نێوان هەردوولا مۆر کرا، بەپێی ڕێککەوتننامەکە نرسی هەموو وڵاتانی ئاسیای بچووك و هەموو میزۆپۆتامیا جگە لە تیسفونی پایتەخت و بەشێك لە ئازەربایجان و بەشێك لە باشووری کوردستان کە لەژێر دەستیدا بوون، بۆ ڕۆم جێهێشت و ڕۆمەکان بوونە فەرمانڕەوای ڕۆژهەڵاتی نێزیك.

ئەو ڕێککەوتننامەیە ماوەی چوار ساڵ درێژەی کێشا، بۆ ئیمپراتۆری ڕۆم مایەی سەرکەوتن و سەربەرزی بوو، بۆ پاشای ساسانی جگە لە زەبوونی و بێ توانایی هیچی دیکە نەبوو، دوای ئەو ماوەیە نرسی نەیتوانی درێژە بە دەسەڵاتیی خۆی بدات.

نرسی لە (٣٠٣) زایینی مرد و هورمزی دووەم کە کوڕی بوو هاتە شوێنی ئەو، لە ماوەی حەوت ساڵی دەسەڵاتداری ئەودا دەسەڵات کەوتە دەست فەرمانڕەوا خۆجێیەکان. هورمز لە (٣١٠ ز) مرد و کوڕەکەی واتە (ئازەر نێرسی) هاتە شوێنی، بەڵام دوو براکەی دیکەی پێکەوە ڕێکەوتن و ئازەر نێرسییان کوشت.

چەند فەرمانڕەوایەك لە فەرمانڕەوا ساسانییەکان لە تۆڵەی ئازەر نێرسیدا، یەکیان گرت و ئەو دوو برایەیان گرت و یەکیان کوێر و ئەوی دیکەشیان کوشت کە بە هورمز ناسرابوو. چوونکە دەبووایە پاشا لە شازادەکان بێت، بۆیە کوڕە تازە لە دایك بووەکەی هورمز بە ناوی شاپوور کە بە شاپووری دووەم ناسرا بوو، لە جیاتی ئەوان کرایە پاشا.

شاپووری دووەم کە هاتە سەر دنیا، دەرکەوت کە سرووشت ئەوی بۆ ئەوە هێناوە کە چارەنووسی جیا لە چارەنووسی خەڵکی ئاسایی هەبێت، چوونکە هەرکە هاتە دنیاوە دەستی بە گریان کرد و لەگەڵ یەکەم گریانیدا، ئەو مامانەی بۆ یارمەتی شاژنە ئیڤرای دایکی هات بوو سەرەنجی ئەوەیدا کە ئەو منداڵە ئاسایی نییە و ددانی هاتووە، بەڵام تەنیا یەك یاخۆ دوو ددانی نەهاتووە، بگرە هەر دوو شەویلاگی پڕن لە ددان و بەئەندازەی منداڵێکی شەش ساڵان ددانی هەیە.

نەریتی ژنە خاوەن پایەکانی ساسانی وابوو کە دوای لە دایکبوونی منداڵ، منداڵەکەیان دەسپاردە دەست مامان تا شیری بداتێ و بە خێوی بکات، بەڵام هیچ ئافرەتێك توانای شیردان بەو منداڵەی نەبوو، ئەو بە ددانەکانی ئازاری توندی مەمکی ژنەکانی دەدا.

تەنانەت ئیڤرای دایکیشی نەیدەتوانی شیر بەو کۆرپەیە بدات. چوونکە مەترسی مردنی ئەو منداڵە بە هۆی برسییەتی دەکرا، خەڵکانی زانا بیریان کردەوە تا ئەو ببەنە بەر وڵاخەکان و لە مەمکی ماین شیری پێ بدەن.

سەیر لەوەدا بوو کە شاپووری دووەم کە مەمکی دایکی و تەواوی ژنەکانی دیکەی بە ددانەکانی دەگەست، مەمکی ماینی نەدەگەست، دوای ئەوەی ڕوون بۆوە ئەو شیری ماین دەخوات، ئیتر بەردەوام هەندێ ماینیان لە تەویلەی پاشایەتیدا دەهێشتەوە تا شاپووری دووەم شیرەکانیان بخوات.

شاپووری دووەم لە تەمەنی دە مانگیدا دەستی بە قسەکردن کرد و لە یەك ساڵیدا وەك منداڵێکی چوار ساڵان توانای قسەی هەبوو، هەر وەك دەزانرێت کە زۆرێك لە منداڵان تەنانەت لە دوای دوو ساڵ و نیو لە تەمەنیان ناتوانن بە ئاسانی قسان بکەن.

دوای ئەوەی کەوتە قسەکردن واتە لە دە مانگی تەمەنیدا، شاپووری دووەم چیدی شیری نەخوارد و خواردنی دیکەی دەخوارد، چوونکە ددانی تەواوی هەبوو بۆ خواردنی هەموو خۆراکێك. لە شازدە مانگیدا شاپووری دووەم توانی لەسەر قاچەکانی بوەستێت و ماوەیەکی کەم دوای وەستان لەسەر قاچەکانی، توانی بڕوات، هەرچەندە لە سەرەتادا لە کاتی ڕۆیشتن دەکەوت، بە پێچەوانەی منداڵەکانی دیکەوە کە لە کاتی کەوتن دەگریان، شاپووری دووەم نەدەگریا.

کاتێك تەمەنی شاپووری دووەم بوو بە دوو ساڵ و نیو، ئەویان خستە بەر خوێندن لە لای مامۆستای تایبەتی تا فێری نووسین و خوێندنەوە ببێت، ئەو بە خێرایی خوێندن و نووسین

فێربوو، تەنانەت فێری زمانی ڕۆمیش بوو کە ئەو کات تاکە زمانی بێگانە بوو کە لە ئێران بخوێندرێت.

نابێت توانای شاپووری یەکەم بۆ فێربوون بە ناسرووشتی لێك بدەینەوە و بە بابەتێکی پێچەوانەی سرووشتی دابنێین، لە تەواوی سەردەمەکاندا کەسانێك هەبوون، کە توانای فێربوونیان لەچاو کەسانی دیکە بەهێزتر بووە، هەرچەندە ژمارەی ئەو کەسانەی بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی دیکە کەمترە، بەڵام بوونی ئەوان پێچەوانەی سرووشت نییە.

دەوترێت شاپووری دووەم لە تەمەنی حەوت ساڵیدا وێڕای فێربوونی نووسین و خوێندنەوە بە زمانی ڕۆمی، تەواوی زانستەکانی سەردەمی خۆشی دەزانی.

هەرچەندە ئەو وتەیە زێدەڕۆیی پێوە دیارە، بەڵام نابێت ئەو بابەتەش لە بیر بکەین کە ئەوکات زانست هێندە فرەوان نەبووە کە بە تەنیا زانستی پزیشکی دەیان لق لە خۆی بگرێت کە شارەزایی لە هەریەکەیان نیوەی تەمەنی مرۆڤی پێویستە. بۆیە دەتوانین ئەوە پەسەند بکەین کە شاپووری دووەم بە هۆی توانای زۆری بۆ خوێندن و نووسین، توانیویەتیی تەواوی زانستەکانی سەردەمی خۆی بزانێت.

یەکێك لە ڕووداوە سەرەنج ڕاکێشەکانی سەردەمی منداڵی شاپوور ئەوەیە کە لە وەرزی زستانی ساڵی (٣١١) زاینیدا واتە ئەو کاتەی کە تەمەنی شاپوور تەنیا (١٤) مانگ بووە، گۆڕانی لەپڕ بە سەر کەشوهەوای میزۆپۆتامیادا هاتووە و بەفرێکی یەکجار زۆر هەموو دەشتەکانی داپۆشی و گورگەکان لەبەر برسییەتی هێرشیان کردە سەر شاری تیسفون.

خەڵکی ئەو شارە هەرگیز گورگیان نەبینی بوو، وایانزانی ئەوانە سەگن، بەپێی ئاینی زەردەشت، چوونکە سەگ گیانلەبەرێکی بە سوودە، دەبووایە خەڵك بیان پارێزن، بەڵام دوای ئەوەی چەند کەسێکیان کوشت، سەرۆکی ئاگرخانەی گەورەی پایتەخت هۆشداریدایە دانیشتووانی پایتەخت لە مەترسی ئەو ئاژەڵە و وتی ئەو ئاژەڵە لە خەرقستەرەکانە (لە ئاینی زەردەشتیدا ئەو وشەیە بۆ ئاژەڵی زیانبەخش بەکار دێت) و پێویستە بکوژرێن.

لەو ساڵەدا سەرەڕای بەفری زۆر و سەرمای سەخت کە لە میزۆپۆتامیادا وێنەی نەبێت، ڕووداوێکی دیکەش ڕوویدا ئەویش بێ هاوتا بوو، نەتەنیا کەس نەی بینی بوو، بگرە کەس نەی بیستبوو. ئەو ڕووداوە برێتی بوو لەوەی هەردوو زێیی دیجلە و فورات بە هۆی ئەو سەرما سەخت و توندەوە شەختەیان کرد و هاتوچۆی بەلەم و کەشتییەکان لە هەردوو زێیەکەدا وەستا، لەو کاتەشەوە تا بە ئێستە دەگات سەرمای هاوشێوە لە میزۆپۆتامیا نەبینراوەتەوە.

کاتێك تەمەنی شاپووری دووەم گەیشتە هەشت ساڵی، دوژمنێکی تازە بۆ ساسانییەکان دەرکەوت و بریتی بوو لە عارەبان، هەرچەندە ئەوان پێش ئەو کاتە خۆیان بە دوژمن دەردەخست، بەڵام گرینگی و هێزی ئەوەیان نەبوو کە بە دوژمێکی ترسناك بناسرێن. لە ساڵی (٣١٨ ز) لەشکرێکی بەهێزی عارەبان بە سەرکردایەتیی (قوورەی کوڕی موخلەب) کە پیاوێکی باڵابەرز و دەمووچاو پان بوو، هێرشیان کرد، ئەگەرچی هەندێك کەس وا بیردەکەنەوە کە یەکەم هێرشی عارەبان بۆ سەر ئێران لە ساڵی (٦٣٧ ز) بووە، بەڵام لە ڕاستیدا یەکەمین هێرشی گەورەی عارەبان بۆ سەر ئێران بە فەرماندەیی (قوورەی کوڕی موخلەب) لە ساڵی (٣١٨ ز) بووە، قوورەی کوڕی موخلەب هێرشی کردە سەر شووش، دوای داگیرکردنی، کەوتنە تاڵانکردنی شارەکە و ئەوەی توانای گواستنەوەیان هەبوو لەلایەن شەڕڤانانەوە بردران، هەموو ژن و پیاوەکانیان بە دیل گرتن، ئەو دەمەی ئەو شوێنەیان بەجێ هێشت، شووش تەنیا وێرانەیەك بوو.

لەشکری عارەبان دوای شووش بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتنەڕێ، لەسەر ڕێگەیان چەندین شاریان داگیرکرد، ژن و منداڵ و پیاوانیان بە دیل گرتن، دەوترێت قوورەی کوڕی موخلەب و سوپاکەی تا شاری کرمان ڕۆیشتن، کاتێك بیستیان کە لەشکرێکی ساسانییەکان بۆ جەنگی ئەوان کەوتووەتەڕێ، بە پەلە گەڕانەوە تا پێوەندیان لەگەڵ پشتەوە و پاشکۆی خۆیان نەپچڕێت.

گەیشتنی لەشکری عارەبان بە شاری کرمان جێگەی گومانە، بەڵام گەڕانەوەی بە پەلەی لەشکرەکە بۆ دواوە ڕاستە. شەڕڤانانی عارەبان کاتێك بۆیان دەرکەوت ژمارەی دیلەکانیان زۆرن و کەس لە ئێران ئەوانیان لێ ناکڕێت و ئەو دیلانەی هێناویانن ناکارن لە بازارەکانی دیکەدا بیان فرۆشن، بۆیە دەستیان بە کوشتنی ئەو دیلانە کرد کە پێیان وابوو زیادەن.

کاتێك شاپووری دووەم قوورەی کوڕی موخلەبی دەستگیر کرد (هەڵبەت دوای ماوەیەك، کە دواتر باسی دەکەین) لێی پرسی: کابرا بۆچی تۆ و شەڕڤانانت دیلەکانتان دەکوشتن؟.

قوورەی کوڕی موخلەب وتی: چوونکە نەماندەتوانی ئەوان لەگەڵ خۆماندا ببەین.

شاپووری دووەم وتی: کەواتە بۆ ئازادتان نەدەکردن تا بەرەو ماڵەکانیان بچنەوە.

قوورەی کوڕی موخلەب بە بیستنی ئەو وتەیە دووچاری سەرسووڕمان هات و وتی: ئەوکات نە خۆم و نە شەڕڤانانم نەماندەزانی کە دەکارین دیلەکان ئازاد بکەین، تا بۆ ماڵەکانیان بچنەوە، باوەڕمان وابوو تاکە ڕێگە بۆ ڕزگاربوونمان لە دەست ئەوان، کوشتنیانە.

شاپووری دووەم پرسیاری کرد: ئایا ئێوە کاتێك ژن و پیاوەکانی گوند و شارەکانتان بە دیل دەگرتن، بۆ ئەوەتان نەبوو کە بیانفرۆشن؟، قوروەی کوڕی موخلەب بە ئەرێ وەڵامی دایەوە.

شاپوور پرسیاری کردەوە: ئەی بۆچی خواردنتان پێیان نەدەدا تا ئەوان بەرگە بگرن و نەبنە ئێسك و پێست و دواجار بمرن؟.

قوروەی کوڕی موخلەب وتی: چوونکە توانای کڕینی خواردەمەنیمان بۆ تێرکردنی ئەوان نەبوو، ئێمە تەنانەت بۆ تێربوونی خۆشمان خواردەمەنیمان نەدەکڕی، تەنیا کاتێك ناچار بین ئەو کارە دەکەین.

لە شیکاری ئەو وەڵامانە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو دەمە عارەبان چۆن بیریان کردۆتەوە، دوای گەیشتنیان بە شارێك یاخۆ گوندێك چییان بەسەر دانیشتووانەکەیدا هێناوە. گومانمان نییە لەوەی ئاکنجیبوونی عارەبان لە بیابان و دەشتەکان کاریگەریی لەسەر تووڕەیی و ڕق ئەستووری ئەوان هەبووە، عارەبان تەنیا چەند دەڤەرەیلێك بترازێت، ئیدی کشتووکاڵیان نەکردووە، لە شوێنەکانی دیکەش تاکە کشتووکاڵی ئەوان برێتی بووە لە چاندنی خورما، ئەویش بەو مەرجەی ئاو لە شوێنی نیشتەجێ بوونیان هەبوو بێت. لەو شوێنانەی خورما نەبووایە، عارەبان تەنیا شیری وشتریان خواردووە و جار بە جاریش ئەگەر توانیبیان دەستیان بکەوێت، ئەوا گوشتیان دەخوارد.

کۆلۆنێل لۆرانسی بەریتانی کە لە سەروبەندی یەکەمین جەنگی جیهانی بە جلوبەرگی عارەبانەوە لە بیابانەکانی عەرەبستان بۆ بەریتانیای مەزن کاری دەکرد، لە پەڕتووکی (حەوت کۆڵەگەی ئەقڵ) کە لە ساڵی (١٩٣٠ ز) چاپ کراوە، دەڵێت: (تەنانەت ئێستەش لە عارەبستانی سعوودی خەڵکانێك هەن جگە لە شیری وشتر، هیچ شێکی دیکەیان نەخواردووە)، مەبەستی کۆلۆنێلیش نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمە.

بە کورتی بڵێین عارەبان لە بیابانە گەرمەکان هێندە بە سەختی دەژیان کە نەیاندەزانی نەرم و نیانی چییە!، ئەوان هەرگیز بەزەییان بە هاوزمانەکانی خۆیاندا نەدەهاتەوە، چجای ئەوەی بەزەییان بە نەتەوەکانی دیکەدا بێتەوە. ئەوان لە عەرەبستاندا بەردەوام لە شەڕوشۆڕ و جەنگدا بوون، کاتێك خێڵێك بەسەر خێڵێکی دیکەدا سەردەکەوتن، پیرەکانیان دەکوشتن و ئەوانی دیکەیان بە دیل دەگرت و دەبرد، ئەو مرۆڤانە کە لەگەڵ خۆیان بەم شێوەیە هەڵسوکەوت بکەن، ئیدی دەبێت لە کاتی سەرکەوتن بەسەر نەتەوەیەکی دیکەدا چ هەڵسوکەوتێك بنوێنن!.

قوورەی کوڕی موخلەب لە ساڵی (٣٢١ ز) بۆ دووەمین جار هێرشی کردەوە ئەو جارە تا دەڤەرەیلی ناوەندیی ئێران ڕۆیشت و کەوتە تالآن و کوشتاری خەڵکەکە، وەك دانیشتووانی ئەو دەڤەرەیلە دەبێژن گەیشتووەتە شاری (رەی)، لێ دواتر گەڕایەوە.

لەو دوو هێرشە مەزنەی ئەو دوو ساڵەدا ساسانییەکان نەیانتوانی پێش بە لەشکری عارەبان بگرن، چوونکە سیستەمی ساسانییەکان بە شێوەیەك بوو کە ئەگەر کەسی بە توانا لە دەسەڵاتدا نەبووایە، هیچ کارێك جێبەجێ نەدەبوو. ئەوکات شاژنە (ئیڤرا) یاخۆ (ئای ڤرا) پاشایەتیی ساسانییەکانی دەکرد، هەر فەرمانڕەوایەك لە سنووری ناوچەکەی خۆیدا وەك سەربەخۆ ساتوسەودایی دەکرد و دۆخی گشتیی هەر وەك دۆخی سەردەمی پێش پاشایەتیی شاپووری دووەم بوو، واتە دەسەڵاتدارێکی ناوەندیی بەهێز بوونی نەبوو، کە فەرمانڕەواکان بەرفەرمانی بن و کارێك بۆ ڕێگرتن لە هێرشی عارەبان ئەنجام بدەن.

ڕەچەڵەکناسان پێیان وابوو تەواوی عارەبان لە یەك ڕەچەڵەکن، دواتر لێکۆڵینەوەکانی زانایان دەریخست کە عارەبان یەك ڕەچەڵەك نین و لە دوو ڕەچەڵەکی لە یەکدی جودان، یەکەمیان باڵابەرزن و ژن و پیاونیان چاو و برۆ و مووەکانیان ڕەشن، لووت و دەم و شەویلاگی ڕێکیان هەیە، واتە بە شێوەیەکن جگە لە ڕووخساریان بە گشتیی بە ئارییاییەکان دەچن، بەڵام ئەوانی دیکە بێگومان لە ڕەچەڵەکی سامین.

نەتەوە باڵابەرزەکە لە سەرەتادا، لە کۆتایی باشووری ڕۆژئاوای نیمچە دورگەی عارەبان دەژیان و دەڤەرەیلی نیشتەجێی ئەوان ناوچەیەکی بە پیت و پڕ ئاو بوو، بەڵام دواتر بە هۆی وشکەساڵی لەپڕ و درێژخایەن، ناچار بوون شوێنی خۆیان بەجێ بهێڵن و بەرەو باکور بڕۆن. ئەو نەتەوەیە زۆرتر بە درێژایی کەنارەکانی ڕۆژئاوای دوورگەی عارەبی، واتە کەنارەکانی دەریای سوور نیشتەجێ بوون.

نەتەوەکەی دیکە بێگومان لە دەشتەکانی باشووری میزۆپۆتامیا و دەشتەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی دوورگەی عارەبی بەرەو نێو عارەبستان کۆچیان کردووە، پێدەچێت ماوەی ئەو کۆچە زۆری خایاند بێت و لەوانەیە تا چەند سەدەیەکی پێچوو بێت.

لە نەجدی عارەبستان واتە پێدەشتەکانی ناوەند و ناوەڕاستی عارەبستان، بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی هەندێ کەس، تەنیا زەوی و زاری بێ سوودی کشتووکاڵی نەبووە و نییە. لەوێندەر زەوی بەرز هەنە کە بارانیان بەسەردا دەبارێت، لە بەرزاییەکانەوە هەندێ جۆگە دەڕژێنە خوارێ و خەڵك بە سوودوەرگرتن لەو جۆگانە کشتووکاڵیان کردووە و دەکەن، بەڵام لە دەرەوەی ئەو سنوورە

کە بە (نەجد) ناسراوە، بیابانەکانی ناوەندیی سعوودیە هەن کە سوودی کشتووکاڵیان نییە و ئەو خێڵە عارەبانەی لەوێندەر دەژیان ناچار بوون تەنیا بە شیری وشتر بژین.

ئەوەی ئەوانی ناچار بەو ژیانە لە بیابانەکاندا دەکرد، بوونی جەنگ بوو، ئەوان لەو ترسە دوور لە یەکدیی دەژیان.

لە هیچ سەردەمێکدا هیچ نەتەوەیەك نادۆزرێتەوە کە بە ئەندازەی عارەبان بەردەوام لە جەنگدا بوو بن، ئەوان بەردەوام دەجەنگان، کەم هەبوو عارەبەیلێکی بیابانشین بە مردنی خۆی بمرێت، لەوە دەچوو یاسای گشتیی بێت کە عارەبی بیابانشین پێویستە لە جەنگدا بکوژرێت.

ئاینی عارەبان برێتی بوو لە بت پەرستی، جگە لە بتەکان، ئەستێرە، مانگ و خۆریشیان دەپەرست. هەر خێڵێکی عارەبان لە (کەعبە) بتێکی تایبەت بە خۆی هەبوو، بۆیە هەموو تاکێکی عارەبان بە ئەرکی خۆی دەزانی کە هیچ نەبێت یەکجار لە تەمەنی بۆ زیارەت بچێتە کەعبە، ئەگەر توانیبای ساڵی جارێك دەچوو.

زانای ئیسلام (جاروڵڵا زەمەخشەری) کە لە سەدەی چوارەمی کۆچی ژیاوە، پێی وایە وشەی (مەککە) لە دوو وشەی (مە) واتە (مانگ)، (کەدە) واتە (شوێن) پێك هاتووە، واتە (ماڵی مانگ)، ئەو بۆ خۆی ماوەیەکی زۆر لە مەککە و لە دراوسێی ماڵی خودا ژیاوە، بۆیە بە (جاروڵڵا) واتە بە دراوسێی خودا ناوبراوە.

عارەبی بیابانشین بۆ ئەوەی بە زیندوویی بمێنێتەوە پێویستی بە دوو شت هەبووە یەکەمیان شیری وشتر، کە پاشای پێشووی سعوودیە واتە (شا سعوود) شیری وشتری بە باشترین و تەواوترین خۆراك دەزانی و دەیوت هەموو چەورییەکانی تێدایە، بۆیە بۆ هەر شوێنێك دەچوو، وشترە مێیەکانیان بە فڕۆکە بۆ دەگواستەوە، ئەو ڕۆژەی لە یۆنان کۆچی دوایی کرد، شازدە وشتری مێیەی لەلا بوو.

دووەمیان برێتی بوو لە شیعر، شیعریش خۆراکی ڕۆحی عارەبان بوو، بە رادەیەك کە بەبێ شیعر نەیاندەتوانی بژین. شیعر لە ژیانی هیچ نەتەوەیەکی کۆن بە رادەی عارەبان گرینگی نەبووە و بە ئەرکەکانی ژیان نەزانراوە، عارەبی بیابانشین تەنیا دوو جۆرە شیعریان هەبوو کە برێتی بوون لە (رەجز) کە لە جەنگدا دەخوێنرا، غەزەلیش بۆ کاتەکانی دیکە بوو.

ئەوان خوێندەوار نەبوون، بەڵام شیعریان دەوت، بۆ لەبەرکردنی شیعری خەڵکانی دیکەیش بێ هاوتابوون، تەنانەت هەندێ لە شاعیرە بەناوبانگەکانی عارەبان نەخوێندەوار بوون.

لەنێو حەوت شاعیری دیاری عارەبان کە شیعرەکانیان لە کەعبە هەڵواسرابوو، ژمارەیەکیان نەخوێندەوار بوون، خۆشنووسەکان شیعرەکانیان بۆ نووسیبوونەوە. دەستکەوتنی نووسەر لە سعوودیە کارێکی دژوار بوو، کاتێك ئیسلام هات لە هەموو مەککە تەنیا نۆ کەس خوێندەوار بوون کە یەکیان حەزرەتی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) سلاوی خوای لێبێت.

عارەبی بیابانشین کە بتپەرست بوون، بڕوای پتەویان بە بتەکانیان هەبوو، بڕوایان وابوو کە هیچ شتێك بە بێ ویستی ئەو بتانە نایەتەدی، لەگەڵ هەموو وشەیەك کە لە زاریان دەهاتەدەر، ناوی بتەکەی خۆیان دەوت و سوێندیان پێ دەخوارد. نەریتی سوێندخواردن لەلای عارەبی بیابانشین کە نەریتی پێش هاتنی ئیسلام بوو، دوای هاتنی ئیسلامیش مایەوە، دوای ئەوەی ئەوان بڕوایان بە خودای تاقانە هێنا، هێشتا بەردەوامن لە سوێند خواردن، بەڵام ئەوجارە لە کۆتایی یاخۆ سەرەتای هەر ڕستەیەکدا سوێند دەخۆن، تەنانەت ئەگەر بابەتی باسەکەیان بێ بایەخیش بێت.

عارەبان بەر لە چوونیان بۆ جەنگ دەبووایە رەجز۱ بخوێنێت، نەخوێندنی رەجز بە نەنگی هەژمار دەکرا.

ئەوانەی توانای شیعر وتنیان هەبوو، لە سەرەتای جەنگدا شیعریان دەوت، لە شیعرەکاندا خۆیان و باپیرانیان دەناساند و ناساندنی باپیرانیان بەردەوام لەسەر بنەمای ئازایەتیی ئەوان بوو.

کەڵك وەرگرتن لە رەجزی ئەوانی دیکە مایەی شەرم بوو، بەڵام دەیانتوانی سوود لە رەجزی شاعیرە بەناوبانگەکان وەربگرن، بە تایبەت سوودوەرگرتن لە شیعری حەوت شاعیرە دیارەکان ئاسایی بوو کە شیعرەکانیان بە حەوت هەڵواسراو واتە(معلقات سبعه) دەناسرێت.

ئەوانەی توانای وتنی رەجزیان نەبوو، خودان سەرمایە بوون، پێش رۆیشتنیان بۆ جەنگ پارەیان دەبەخشی بە یەکێك لە شاعیرەکان تا رەجزیان بۆ بڵێت، بەڵام بۆ خۆیان دەبووایە ئەو ئاوازە دیاری بکەن کە رەجزەکەی پێ دەخوێندرا، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا شاعیر بەپێی ئەو ئاوازە بەیتەکانی رەجزەکە بنووسێتەوە، (بەحر) لە شیعری عارەبی لەمەوە دەرکەوت، واتە

ئاوازە جەنگییەکان بوونە مایەی دروستبوونی (بەحر) لە شیعری عارەبی و لە رەجز[١]، دواتر رەجز گۆڕا بە غەزەل، بەحرەکان لەلایەن شاعیرەکانەوە بۆ غەزەلەکان بەکارهاتن.

دانیشتووانی حیجاز واتە ئەو بەشەی عارەبستان کە دەکەوێتە کەناری دەریای سوور، زۆر کەم بوو، هۆیەکەی بۆ بوونی نەخۆشییەکانی تەمەنی منداڵان دەگەڕایەوە کە دەبوونە هۆی لەنێوچوونی بە کۆمەڵی دانیشتووان، پێش ئەوەی منداڵان بگەنە تەمەنی هەرزەکاری، بە نەخۆشییەکان دەمردن.

لەوانەیە چەندین سەدە تێپەڕبوو، تا خەڵکی حیجاز زانیان کە ئەو منداڵانەی لە نەجدی عارەبستان دەژیان، بە نەخۆشی سەردەمی منداڵی نامرن، ئەوان دواجار زانیان لە نێوان بوونە سرووشتییەکانی نەجد و حیجاز جیاوازیی هەیە، لە حیجاز زۆرینەی منداڵەکان لە منداڵی دەمرن، بەڵام لە نەجد زیندوو دەمێنن.

لە ئاکامدا نەریتێکی نوێ هاتەکایەوە، دایکان لە حیجاز دوای ئەوەی منداڵیان دەبوو، دەڕۆیشتن بۆ نەجد و منداڵەکانیان لەوێندەر گەورە دەکرد یاخۆ ئەگەر هەبوو بووانە، منداڵەکانیان دەسپاردە دەست دایەنێك تا لە بیابان بۆیان گەورە بکات.

ژنەکانی خێڵەکانی بیاباننشین بە رەزامەندییەوە منداڵی یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی خێڵەکانی حیجازیان بەخێو دەکرد، چوونکە لە لایەك برێك لە پارەیان دەست دەکەوت، لە لایەکی دیکەیش منداڵەکانیان دەبوون بە برا و خوشکی شیری ئەو منداڵەی لە حیجازەوە هێنابوویان.

لەنێو عارەبی بیاباننشین ئەو ژنانەی شیریان بە منداڵی دیکە دەدا شیردەر ناودەبران، ئەو ژنانە واتە شیردەرەکان رێزی زۆریان لە لای خاوەن منداڵەکان هەبوو، چوونکە بە یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵە گەورەکان هەژمار دەکران، کوڕ و کچەکانیان دەبوونە برا و خوشکی ئەو منداڵەی شیری ئەو دایەنەی خواردبوو.

پەیامبەری مەزنی ئیسلامیش (د.خ) هەروەك گەورەکانی دیکەی حیجاز دوای ئەوەی هاتە دنیاوە، درایە دەست دایەن و لە بیابان شیری خوارد، دایەنی پەیامبەری مەزنیش تا ئەو رۆژەی زیندوو بوو، لەلایەن پەیامبەرەوە زۆر رێزی لێ دەگیرا، ساڵانە چەندین جار پەیامبەری

(١) رەجز جۆرێك لە بەحرەکانی شیعری عارەبییە، کە تەنیا بۆ بەسەردا هەڵدان و پێدا هەڵگوتن بەکار دەبرا. "وەرگێڕی کوردی"

ئیسلام دیاری بۆ دەنارد، بەڵام ئەو مێژووەی ئێمە باسی دەکەین، سێ سەدە بەر لە هاتنی ئیسلامە.

پەروەردکردنی منداڵانی حیجاز لە بیابان بووە ڕێگر لە مردنی منداڵەکان لە تەمەنی منداڵی، لە ئاکامدا دانیشتووانی حیجاز بەرەو زۆربوون ڕۆیشت، بەڵام تا سەردەمی هاتنی قوورەی کوڕی موخلەب کە لە سەردەمی منداڵی شاپووردا دوو جار لەشکری بۆ سەر ساسانییەکان هێنا، کەس نەبینرا لەنێو خێڵانی عارەبان دەست ببات بۆ هێرشێکی گەورە، یەکێك لە هۆکارەکانیش جەنگی بەردەوامی خێڵە عەرەبەکان بوو، بۆیە هیچ کەس نەیدەتوانی لەشکری گەورە ئامادە بکات، ئەوان بەردەوام لەگەڵ یەکدی دەجەنگان، هیچ کات لە دوورگەی عارەبی وازیان لە جەنگ نەدەهێنا، زۆر جار خێڵێك هەموو پیاوەکانی دەکوژران و خێڵی سەرکەوتوو خۆی بە خاوەن ماف دەزانی لە بە دیل گرتنی ژن و هەرزەکاران و دواجار فرۆشتنیان لە بازاڕی کۆیلەکان.

(ئیمرەئولقەیس) یەکێکە لە حەوت شاعیرانی مەزنی عارەبان کە بە خودان حەوت هەڵواسراو (معلقات سبعه) ناسراون، لە چامەکەیدا باسی ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت: (لەو کاتەوە کە خۆم ناسیوە، لەگەڵ پیاوانی خێڵەکەم بەشدار بووم لە جەنگ و کاری سەرەکیی من لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بریتی بوو لە شمشێر وەشاندن لە دژی ئەو کەسانەی زرێیان لەبەر بوو، ناچاربووم هەموو شەوێك لە دوای جەنگ شمشێرەکەم تیژ بکەمەوە تا بۆ سپێدەی بەیانی ئامادە بێت بۆ جەنگێکی دیکە. ئێمە هێندە جەنگاین تا لە خێڵەکەماندا تاکە پیاوێك نەما، من تەواوی خزم و دۆستەکانم لە جەنگەکاندا بە دەستی خۆم ناشت و ئێستە لە جیهاندا من هەروەك چۆن شمشێرەکەم بە تەنیا لە کالاندا ماوە، بە هەمان شێوەش بە تەنیا ماوم.)

ژیاننامەیەی ئەو شاعیرە بەڵگەی حاشاهەڵنەگرە کە لەوانەبووە لە جەنگە بەردەوامەکانی دوورگەی عارەبیدا تەواوی پیاوانی خێڵێك بکوژرێن و ژن و منداڵەکانیان بە دیل بگرن، لە خێڵی ئیمرەئولقەیسیش دوای ساڵانێکی زۆری جەنگ، هەموو پیاوان کوژراون، تەنیا ئەو ماوەتەوە، ئەگەر ئەویش کوژرابووایە کەس لە خێڵەکەی نەدەمایەوە.

لە ساڵی (٤٠٠ ز) لە نیمچە دوورگەی عارەبیدا گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیی مەزن ڕوویدا، هۆکارەکەشی پێوەندیی بازرگانی نێوان عارەبی حیجاز و نەجەد و ڕۆم بوو. لێرە مەبەستمان لە ڕۆم، ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمی گەورە نییە، کە پایتەختەکەی هەمان ڕۆمی پایتەختی ئێستەی

ئیتاڵیایە، مەبەستمان رۆمی بچووکە، عارەبان هەرگیز و لە هیچ قۆناخێکی مێژوودا پێوەندییان لەگەڵ رۆمی گەورە نەبووە.

دوای ئەوەی رۆمی بچووك دامەزرا و قوستەنتینەی کردە پایتەختی خۆی و سوریاشی کەوتە دەست، لە نێوان رۆمی بچووك و عارەبان پێوەندیی بازرگانی هاتەکایەوە. هاتنە کایەوەی ئەو پێوەندییە بۆ یەکەمجار بۆ عارەبی سەلماند کە مرۆڤ دەتوانێت یاخۆ پێویستە کارێکی دیکە، جگە لە جەنگ ئەنجام بدات، لە کۆبوونەوەی گەورەی خێڵەیلی عارەبان لە مەککە، هەموو لایەك رێککەوتن کە ساڵانە چوار مانگ جەنگ نەکەن و ئاشتی بێت.

ئەو رێککەوتنە لە ساڵی (٤٠٠ ز) و بە گێڕانەوەیەکی دیکە لە ساڵی (٩٠ ز)ی بە ئەنجام گەیشت و بە شۆڕشێکی مەزن لە ژیانی عارەبی بیابانشین دەهاتە هەژمار کرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جەنگ بە شێوەیەك ببوو بە بەشێك لە ژیانیان کە نەیانتوانی رەزامەند بن لە وەستاندنی جەنگ بۆ نیوەی ساڵ و سەرگەرم بوون بە کاری دیکەی وەك بازرگانی. وێڕای ئەوەی ماوەی وەستانی جەنگ لە ساڵێکدا چوار مانگ بوو، بەڵام هێشتا دوو چوار مانگی دیکە لە ژیانی ئەوان بۆ جەنگ تەرخان کرا بوو، بەڵام لەو مێژووەی ئێستە باسی دەکەین واتە سەردەمی منداڵی شاپووری دووەم، ئەو رێککەوتنە هێشتا نەهاتبووە کایەوە و حەرامکردنی جەنگ لە سێیەکێکی ساڵدا لەنێو عارەب مۆر نەکرابوو.

دوای ئەوەی قوروەی کوڕی موخلەب لە خێڵی کندی کە لە خێڵەکانی نەجد بوون، زاڵبوون بەسەر خێڵەکانی دیکە دەوروبەری خۆیان، پێشنیازی بۆ ئەوان کرد تا یەکگرتنێك بێننە کایەوە، ئەو یەکەم کەس بوو کە توانی لە نێوان بەشێك لە خێڵەیلی عارەبان یەکگرتن چێ بکات، ئەو یەکگرتنە بووە هۆی ئەوەی بکارن لەشکرێکی تا رادەیەك مەزن بۆ هێرشکردنە سەر ساسانییەکان رێ بنێن.

# شاپووری دووەم و قاتوقڕی و نەبوونی

ئێستە ئەو پرسیارە دێتە پێشێ کە شاپووری دووەم لە چ بەروارێکدا نازناوی (زوولئەکتاف)ی پێدرا؟، وورووژاندنی ئەو پرسیارە لێرەدا لە بەردوو هۆکارە، چوونکە هەندێك کەس دەبێژن نازناوی (زوولئەکتاف) لە حەوت ساڵی بە شاپووری دووەم بەخشراوە، کە بە دروست نایەتە بەرچاو، لە لایەکی دیکە ئێمە لە ڕووی واتاوە رەخنەمان لە واتا باوەکەی هەیە.

لەنێو لێتۆژانی رۆژئاوایی، یەکەمین کەس کە رەخنەی لە واتا باوەکەی گرتبێت (ماریژان مۆڵە) بوو، ئێمەش لەو نووسینەماندا زۆر سوودمان لە رەخنەی ئەو بینیوە.

ماریژان مۆڵە دەبێژێت بە دوور دەزانرێت کە واتای زوولئەکتاف ئەوە بێت کە هەندێ لە مێژوونووسانی رۆژهەڵات وتوویانە کە شاپووری دووەم هەردوو شانی عارەبانی کون دەکرد، دواتر پەتی تێ دەهاویشت و هەڵی دەواسین. چوونکە ئەو جۆرە سزایە لە مێژووی ئێراندا برەوی نەبووە.(١) ریچارد فرای ئێراناسی ئەمەریکاییش سەبارەت بەو لێکدانەوەیەی هێندێك لە مێژوونووسە رۆژهەڵاتییەکان لەو بارەیەوە نووسیویانە، گومانی خۆی نیشان داوە.

ئێمە بوونی سزا توندەکان لە سەردەمی ساسانییەکان لە بەرانبەر هەندێ لە تاوانباران پشتڕاست دەکەینەوە، بەڵام ئەو سزایانە لەو سەردەمەدا بوونە کە لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا سزا سەختەکان بۆ وانەدان بە تاوانباران دەخرایە کارەوە، وایان بیر دەکردەوە تا سزای تاوانباران توند و سەختتر بێت، خەڵك کەمتر دەوێرن خراپەکاری بکەن، بەڵام لە هیچ کات و سەردەمێکدا نەبینرا کە کونکردنی شانی خەڵك و هەڵواسینیان بە پەت بکرێتە نەریت.

بڕوابوون بە هەبوونی سزا سەختەکان بۆ وانەپێدان و ترساندنی خەڵك، تا سەدەی هەژدەی زاینی لە ئەورووپا بەردەوام بوو، لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەدا لە وڵاتێکی وەك فەرەنسا

---

(١) هەروەك زەبیحوڵڵا باس دەکات بوونی سزای توند لە زۆر شوێن باو بووە، یەکێك لەو شوێنانەش دەسەڵاتدارە ئێرانییەکان بوون، وەك لەو پەڕتووکەشدا خودی زەبیحوڵڵا باسی دەکات دەبینین کە پاشا هەخامەنشییەکان یەکێك لە سزاکانیان داماڵینی پێستی مرۆڤ بووە بە زیندوویی، دواتر پڕکردنی پێستەکە لە (کا) و دەیان سزای هاوشێوە و توندیش هەبووە، بەڵام وەك لە سەرەتا ئاماژەمان پێکرد، زەبیحوڵڵا تەنیا دەیەوێت پاکانە بکات. "وەرگێڕ"

یەکەم فەرهەنگنامە لەو وڵاتە بڵاوکراوەتەوە، کە تێیدا هاتووە کەسێك بە ناوی (دامین) بە تاوانی ئەوەی بە قەڵەم تراشێك هێرشی کردە سەر (لویسی پازدەیەم) لە فەرەنسا، جەستەیان کردووەتە چوار پارچەوە، واتە چوارپەلی دامینیان بە چوار ئەسپی بەهێز بەستەوە و ئەسپەکانیان بە جووڵە خست تا جەستەی ئەو کەسە بووەتە چوار پارچە.

بۆیە جێگەی سەرسووڕمان نییە، ئەگەر لە سەرەتای سەدەی چوارەمی زایینی و ئەوکاتەی شاپووری دووەم هاتووەتە سەر تەختی دەسەڵات، لەنێو ئێران هەندێ لە تاوانباران بگەنە سزا سەختەکان، لەگەڵ ئەوەشدا سزایەك لە شێوەی کونکردنی شانەکانی و هەڵواسینی بە پەت بە هۆی ئەو کونانەوە نەبووە، بەڵام لەوانەیە بە مانی ئەوە کرا بێت، کە پەت لەژێر هەردوو شانەکانییەوە تێپەڕ کرابێت، بە بێ ئەوەی هیچ شوێنێکی کون کرابێت، دواتریش بە شوێنێکەوە وەك دار و... هتد هەڵواسرا بێت.

تۆژینەوەکانی دەرەوە سەبارەت بە هەڵە لێکدانەوەی واتای زوولئەکتاف لەلایەن هەندێك لە مێژوونووسە رۆژهەڵاتییەکان لە بەردەستی ئێمە هەبوو، تا ئەو کاتەی نووسینی زانای هاوچەرخی ئێمە (حەبیبوڵڵا نۆبەخت) کەوتە بەردەستمان سەبارەت بەو واتایە. حەبیبوڵڵا نووسیویەتی لە گێڕانەوەکانی (هەمزە ئەسفەهانی، راغیب ئەسفەهانی و جەزایەری) کە ئەو سێ مێژوونووسە باسیان لە هەڵەی مێژوونووسان لەبارەی لێکدانەوەی ئەو واتایە کردووە، بە باوەڕی ئەوان ئەو وشەیە بە واتای ئەو کەسە دێت کە پەت لە شانەکان دادەماڵێت و بە واتایەکی دیکە هەردوو شانی کەسەکان ئازاد دەکات، یاخۆ بە واتایەکی دیکە ئەو کەسەی کۆیلەکان ئازاد دەکات.

لە هەمان کاتدا پەسەندکردنی ئەو رایە تا رادەیەك سەختە، چوونکە ئەگەر ئەوە واتای ئەو وشەیە بووبێت، بۆ عارەبان بەو ناوە ناویان بردووە، ئەگەر شاپووری دووەم دیلەکانی ئازاد کردبێت، دەبووایە نازناوێکی دیکەی بۆ دیاری بکرایە کە بەزەیی و سۆزی ئەوی دەربخستایە. ئەو وشەیە واتە زوولئەکتاف کاتێك بەرچاو دەکەوێت بەوە خۆ دەردەخات کە دوو شانەکان دەبەستێت، نەك دەیان کاتەوە. تا ئەم دواییانەش دەستەواژەی (کتف او را بستند) واتە شانی ئەویان بەست) کە بە (کت او را بستند) کورت دەکرایەوە، کە لە ئێران باو بوو.

بە گشتیی بەشێك لە لێكدانەوەی زانایانی پێشووی موسڵمانان سەبارەت بەو وشەیە بێگومان پەسەند دەكرێت، واتای زوولئەكتاف برێتی نییە لە كونكردنی شانەكان، بەڵام ئەو بەشەی گوایە بە واتای (فریادڕەسی دیلەكان) دێت لە راست ناچێت و وردبوونەوەی پێویستە.(٢)

دەبێژن شاپووری دووەم لە هەشت ساڵیدا فەرماندەیی جەنگێكی لە دژی قوروەی كوڕی موخلەبی سەرداری عارەبانی گرتووەتە دەست.

وێڕای ئەوەی تەواوی مێژوونووسانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا پشتڕاستیان كردووەتەوە كە ئەو توانایەكی لە رادە بەدەری هەبووە، بەڵام ئەستەمە لە هەشت ساڵیدا فەرماندەیی مەیدانی جەنگی كرد بێت. لەنێو ناودارانی كۆندا كەسانێك هەبوون كە لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بوونەتە فەرماندەی گۆڕەپانی جەنگ.

فەرماندەی كارتاژەكان (ئانی باڵ) یەكەمجار لە تەمەنی چواردە ساڵی بوو بە فەرماندەی مەیدانی جەنگ. سەرداری ئێرانی (رۆستەمی فەرۆخ زاد) كە لە جەنگی عارەبان لە نیوەی یەكەمی سەدەی حەوتم كوژرا، لە چواردە ساڵی فەرماندەی گۆڕەپانی جەنگ بوو.

شا ئیسماعیل سەفەوی دامەزرێنەری زنجیرەی پاشایەتیی سەفەوییەكان یەكەمجار كە بوو بە فەرماندەی مەیدانی جەنگ چواردە ساڵان بووە، هاوكات پاشای ئێرانیش بوو، بەڵام ناتوانین

---

(٢) كریستیەن سێن دەڵێت: "نووسەرانی عارەب كە سەرچاوەی نووسینەكانیان بە گشتیی نووسینی ساسانییەكانە، زوولئەكتاف ـیان بە (خاوەنی شانەكان) لێكداوەتەوە، بە باوەڕی نۆڵدكە ئەو وشەیە بە واتای چوارشانە دێت، بە واتایەكی دیكە واتە ئەو كەسەی زۆر جار دەوڵەت رادەكێشێت." وێڕای ئەوە هەمزە و مێژوونووسانی دیكەی پێڕەوی ئەو، وشەكەیان لە فارسی بە (هوبە سنباكە) نووسیوە واتە ئەو كەسەی شانەكان كون دەكات. نۆڵدكە گومانی وایە (تەبەری ل. ٥٢) ئەو واتایە شاراوەیە و لە واتا عارەبییەكەی وەرگیراوەتەوە، بەڵام سەبارەت بە وشە فارسییەكە كە (هوبە) نووسراوە بە رای من، رای هەمزە راستە، ئەو وشەیە راستەوخۆ لە پەهلەوی گواستراوەتەوە، ئەو واتایەش كە بۆی دانراوە دروستە"(ئێران لە سەردەمی ساسانییەكان، ل ٢٦١، پەراوێزی ٢)

هەرچەندە لە بەردەوامی ئەو نووسینەیدا كریستیەن سێن گەواهی دێنێتەوە كە لە مێژووی ساسانییەكاندا ئەو سزایە هەبووە، كاتێك خەسرەوی دووەم لە ئەستێرەگرەوەكانی خۆی تووڕە دەبێت، هەڕەشەیان لێ دەكات كە ئێسكی شانەكانیان دەردەهێنێت. بڕوای نۆڵدكە كە دەڵێت زوولئەكتاف واتە ئەوكەسەی كە دەوڵەت بە دووی خۆیدا رادەكێشێت، پتر لە راست دەچێت. "زەبیحوڵڵا"

باوەڕ بکەین منداڵێکی هەشت ساڵان بکارێت فەرماندەی راستەوخۆی جەنگ بێت، تەنیا ئەوکاتە ئەو بابەتە راستە کە ئەو تەنیا لە مەیدانی جەنگ ئامادە بوو بێت و راوێژکارەکانی ئەرکەکانیان بەڕێوە برد بێت.

لەو جەنگەدا ژمارەیەك لە پیاوە ئازاکانی عارەبان و ئێرانی جەنگی تاك بە تاکیان لە بەرانبەر یەك کرد.

بە داخەوە مێژوو ناوی هیچ یەکێك لەو قارەواتانەی ئێرانی نەنووسیوە کە لەو جەنگەدا بەرانبەر بە عارەبان جەنگاون، لە جەنگاوەرەی عارەبانیش تەنیا ناوی یەکیان لە رەجزێکی (شنفەرە) شاعیری گەورەی عارەباندا هاتووە کە ئەو پاڵەوانە بە (راقە بن دهدەم) ناو براوە.

ئێمە پێشتر لە مێژووی پێش هەخامەنشییەکان وتمان هەندێ لەو پاڵەوانانەی لە شانامەدا ناویان هاتووە بێگومان هەبوون، چوونکە لە ئاڤێستا و هەندێ دەقی دیکەی پەهلەوی ساسانیدا باس کراون.

بەشێك لە جەنگی نێوان راقەی کوڕی دهدەم لەگەڵ جەنگاوەرانی ئێرانیان لەلایەن شەنفەرە کراوەتە رەجز و لە رەجزەکەدا لە باسی ئازایەتیی راقەدا زێدەڕۆیی دەکات و دەڵێت دوای ئەوەی چەند کەسێك لە ئازایانی ئێرانییەکانی کوشت، هێرشی بۆ سەر لەشکرەکەیان کرد و شیرازەی لەشکرەکەی لەبەر یەك ترازاند.

وێڕای زێدەڕۆیی لەو باسەدا، پێ ناچێت راستیش بێت، چوونکە ئەگەر شیرازەی سوپای ساسانی تێکچوو بووایە ئەوا ئەوان شکستیان دەخوارد، لە کاتێکدا عارەبان شکستیان خواردووە و قوورەی کوڕی موخلەب و پاشماوەی لەشکرەکەی هەڵاتوون.

ئەوەش بە نەگوتراوی نەمێنێتەوە کە هێرشی پیاوێکی دلێری عارەبان بۆ سەر لەشکری ئێران بە گەواهیدانی شانامەی فیردەوسی و بە گریمانی بەهێز لە ئێرانییەکان وەرگیراوەتەوە.

نەریت وابوو کاتێك پیاوێکی ئازا دەچووە پێش و بەرانبەرکەی شکست دەدا و دەیکوشت، داوای یەکێکی دیکەی دەکرد، ئەگەر سەرکەوتوو بووایە بەردەوام دەبوو دەگمەن بوو کە رکابەر یاخۆ جەنگاوەری چوارەم و پێنجەم بۆی نەیەنە نێو جەنگ یاخۆ وەك فیردەوسی دەڵێت نەیەنە نێو (ئاوردگا).

چوونکە لە مەیدانی جەنگدا کەس نەیدەویست بەرانبەر بە پیاوێکی ئازا بە ترسنووك ببیندرێت، تەنانەت ئەگەر سوور دەیزانی کە دەکوژرێت.

دەسەڵات بە دەست فەرماندەی جەنگەوە بوو، تا جەنگی تاك بە تاك رابگرێت، ئەو بەپێی بەرژەوەندیی خۆی نەیدەهێشت جەنگی تاك بە تاك درێژ ببێتەوە، ئەگەر یەکێك ویست و داخوازی چوونی بۆ جەنگی پیاوە ئازاکەی بووبایە، رێگەی نەدەدا.

ئەو کات جەنگاوەرەکە چەند جارێك داوای دەکرد کەسێك بێتە جەنگی ئەو، ئەگەر وەڵام نەدرابووایەوە، خۆی بە تەنیا هێرشی دەکردە سەر لەشکری بەرانبەر.

ئێستە ئێمە ئەو جۆرە هێرشانە بە دوور لە ئەقڵ دەزانین، چوونکە تاکە کەسێك هەرچەندە ئازا و بەهێز بێت، ئەگەر بە تەنیا بۆ سەر لەشکری بەرانبەر هێرش بکات لەنێو دەچێت، بەڵام باسی ئەو کەسەی لە جەنگی تاك بە تاك سەردەکەوێت، کەس نایەت بۆ جەنگی، بەو واتایە دێت کە کەس لە لەشکری بەرانبەردا پیاو نییە تا بێتە جەنگی ئەو، بۆیە پێویستە هێرشیان بکاتە سەر و بە تەنیا دەتوانێت لەگەڵ هەمووان بجەنگێت.

ئاشکرایە کە دوای چەند خولەك و هەندێ کات تەنیا دوای چەند ساتێك لەو کاتەی جەنگاوەر هێرش دەکات، بە دەست سەربازەکانی ئەو سوپایەی لەگەڵیدا دەجەنگێت، دەکوژرێت هەرچەندە ئازا بێت، تەنیا لەوکاتەدا دەتوانێت سەرکەوتوو بێت کە ئەو لەشکرەی کە لەگەڵ ئەودایە، هاوکات لەگەڵ ئەودا هێرش بکات و ئەوکات لەوانەیە ئەو زیندوو بمێنێت.

ئێمە نامانەوێت ئازایەتیی راقەی کوڕی دهدەم رەت بکەینەوە، چوونکە لە نێوان عارەبانی بیابانشینەکان زۆر پیاوی ئازا هەبوون، کە ترسیان لە مردن نەبووە، بەڵام وتەی شەنفەرە بە واتای لێکترازندنی ریزەکانی لەشکری ئێران لەلایەن ڕاقەوە دێت، ئەوەش راست نییە، چوونکە لەو جەنگەدا ڕاقە دەکوژرێت و قوروەی کوڕی موخلەبیش لەگەڵ پاشماوەی لەشکرەکەی هەڵدێن، تەنانەت نەیتوانی سەربازە بریندارەکانی لە گۆڕەپانی جەنگ دەربکات و بریندارەکان لەلایەن ساسانییەکان بە دیل گیران.

شوێنی ئەو جەنگە لە میزۆپۆتامیای باشوور و لە رۆژئاوای زێی فورات بوو، جەنگەکە دوو رۆژ و هەندێکی دیکەش دەڵێن سێ رۆژی خایاندووە.

لە ساڵی (٣١٩) زاینی کە شاپووری دووەم دە ساڵان بوو، لە ئێران هەر سەرکێك لە گەنم تەنیا بە (١٠) پۆڵس دەفرۆشرا، لە هەموو وڵاتانی ژێردەستی ئێران گەنم و جۆ زۆر بوو، لە پایزی ساڵی (٣١٩ ز) بارانی پایزی نەباری، لە زستانیش بەفر نەکەت، لە بەهاریش هەر وشك و باران نەباری. ساڵی دواتریش واتە (٣٢٠ ز) بە هەمان شێوە وشکە ساڵی بوو، لە ساڵی

(٣٢١ ز) گەنم بە رادەیەك كەم بوو، كە هەر سێركێك لە گەنم بە (٣٥٠) پۆڵس[٣] واتە سی و پێنج هێندەی جاران دەفرۆشرا.

بە هۆی دوو ساڵ وشكە ساڵییەوە لەسەر یەك و نەبوونی باران، ئاوی كارێزەكان كە یەكێك لە بابەتە ژیارییە گرینگەكانی كشتووكاڵی ئێران بوون، بەرەو كەمی چوون یاخۆ وشكیان كرد، ئەگەر گریمانی بارینی بارانیش ببوایە لە ساڵی (٣٢١ ز) ئەوا هەر بێ سوود دەبوو، چوونكە جووتیاران ئەو بنە تۆوەی دایان نابوو، هەموویان خواردبوو، تۆمەیان نەبوو بۆ چاندن.

باری جووتیارانی ئێران بە رادەیەك لە سەختیدا بوو، كە ئەوان دواپین كەرەستەی ماڵەكانیان كە بە كەڵكی فرۆشتن دەهات فرۆشتیان و بە خۆراكیاندا بووە، بە ناچاری بۆ تێركردنی سكی منداڵەكانیان بەرەو شارەكان دەرۆیشتن، بێ ئەوەی لە شارەكان هیچ خۆراكیان دەست بكەوێت.

وێڕای ئەوەی لەو سەردەمەدا لە ئێران زۆر جۆر لە كەرەستە بەرهەم دەهێنرا و بۆ دەرەوە هەنارده دەكرا، بەڵام ئابووری ئێران بە پلەی یەكەم پشتی بە كشتووكاڵ و ئاژەڵداری بەست بوو، وشكە ساڵی بۆ ماوەی دوو ساڵ بە دوای یەكدا زیانی زۆری لەو دوو كەرتەی ئابووریدا و زیانی مەزنیشی بە ژیان و بژێوی جووتیاران گەیاند.

لەوەڕگەكانی وڵاتانی باكور و رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی ئێران كە لە سەرەتای سەدەی چوارەمدا پانتایی زۆریان پێكدەهێنا، بە هۆی نەبارینی باران و بەفر وشكیان كرد و گاگەل و مێگەلە مەڕەكان لە برسییەتی و تینویەتیدا دەمردن.

لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا وشكە ساڵی لە ئێران قاتوقڕی چێ كرد بوو، ناوچەی سیستان كە كەوتبووە رۆژهەڵاتی ئێران بە هۆی زێی گەورە و پڕ ئاوی هیرمەند هیچ كێشەیەك نەهات بووە سەر رێگەی كشتووكاڵ و ئاژەڵداری.

---

(٣) پۆڵس ئەو پارەیە بوو كە لە كانزای مس چێ دەكرا، هەندێ لە زانایانی زمانەوانی لەو باوەڕەدان وشەی پۆڵس سەرەتا لە فینقییەوە هاتووەتە كایەوە، لەوێوەش بەرەو وڵاتانی دیكە پەرەی سەندووە، وشەی (فلوس) كە تا ئێستە لە هەندێ لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی دوور بەكاردێت هەر لەو وشەیەوە هاتووە. تەنانەت وشەی پوولْ كە لە زمانی فارسی هەیە و بە واتای پارە دێت، بە پێچەوانەی بڕوای هەندێ كەس لە پۆلاوە نەهاتووە، لە هەمان وشە وەرگیراوە. "زەبیحوڵڵا"

لەو کاتەدا کە وشکە ساڵی هەموو شوێنێکی ئێرانی تەنیبووە، ڕووباری **دیجلە** کە بەکەناری تیسفوندا دەڕۆیشت، لە شارێك دەچوو. هیرمەند لە دۆخی نیوە سەرکێشیدا بوو، زەوییەکانی سگستانی ئاو دەدا و کێڵگە و پاوەنەکانی تێر ئاو دەکردن.

دەبێت ئەوە بزانین کە ئەو دەریاچەیەی ئێستە لە سیستانە و بە هاموون ناو دەبرێت، تەنیا دەریاچەیەکی ناوەخۆییە.

لە سەدەی چوارەم کە هاوکات بووە لەگەڵ دەسەڵاتیی شاپووری دووەم، دەریاچەی هاموون نێزیکەی (٣٠٠ کم) درێژ و (١٥٠ کم) پان بوو، ئاشکرایە دەریاچەیەکی ئاوی شیرین بەو ڕووبەرە زۆرەوە دەتوانێت بە هۆی  سامانی ماسییەوە ببێتە سەرچاوەیەکی چاك بۆ خۆراك، لە لایەکی دیکە دەبێتە ناوەندیی کۆبوونەوەی پەلەوەرە و باڵندە کێوییەکانی وەك قاز و قورینگ مراوی و ...هتد.

سەرەڕای ئاوی زۆر کە لەو ناوچەیە هەبوو، زەوییەکانیشی بە شێوەیەك بوون کە بەرهەمی باشیان دەدا، وەك مێژوونووسان دەڵێن هەر دەنکە گەنمێك هەزار دەنکی لێ دەکەوتەوە.

تا ئێستەش لە دەڤەرەیلی باشووری ئێران لە هەندێ شوێنی وەك بوشەهر، هەندێ لە زەوییەکان هێندە بەهێزن کە لە کاتی بوونی بارانی باشدا جووتیاران لە یەك دەنکە گەنم، پێنج سەد دەنك هەڵدەگرنەوە، واتە ئەگەر سەد کیلۆ گەنم بچێنن، نێزیکەی پەنجا تەن گەنم هەڵدەگرنەوە، لە هەر ساڵێك کە باران بە باشی ببارێت، جووتیارانی هەندێ لە شارەکانی باشووری ئێران بە ئاسانی دەتوانن لە بەرهەمی کشتووکاڵی یەکساڵ، خۆراکی دە ساڵ پاشکەوت بکەن، ئەوەی هەردەم جووتیارانی ئەو ناوچەیە دووچاری دواکەوتن دەکات، نەبوونی بارانە.

زەوی و زاری ناوچەی سگستانیش ئەو توانا و هێزەی هەبوو بۆ بەرهەمی گەنم و جۆ، بە رادەیەك کە جووتیارانی ئەو دەڤەرەیلە لە هەندێ لە ساڵەکان هێندە گەنم و جۆیان دەست دەکەوت کە جێیان نەدەما لەوە پتر ئەمبار بکەن، بە ناچاری لە بیابان دایان دەپۆشی تا باران و شەونم تێکی نەدات، بەڵام بە هۆی شێی زەوی بەشێك لە بەرهەمەکەیان دەڕزی و لەنێودەچوو و ناچار فڕێیان دەدا.

ساڵی (٣٢١ ز) شاپووری دووەم بڕیاریدا لەگەڵ قاتوقڕی بجەنگێت، هەر چۆنێك بێت ڕێگە لە مردنی خەڵك بە هۆی نەبوونییەوە بگرێت. بۆیە هەموو کاروانە وشترەکانی ئێرانی نارد بۆ سگستان تا گەنم و جۆ و هەر جۆرە دانەوێڵەیەکی خۆراکی هەبێت بیهێنن بۆ خۆراسان و وڵاتەکانی باشوور، تا لەوێوە بۆ هەموو وڵاتانی سنووری بگوازرێتەوە. هاندەری سەرەکیش کە

وایکرد شاپوور خۆی لەگەڵ قاتوقڕیدا ڕووبەڕوو ببێتەوە، گەندەڵی دامودەزگەکانی ئێران بوو کە لە جیاتی ئەوەی خۆراك بۆ دانیشتووان دابین بکەن، سەرگەرمی سوودی نابەجێ بوون.

لە تەواوی سەردەمی ساسانییەکان کاتێك پاشایەك دەمرد و کوڕێکی منداڵ یاخۆ هەرزەکار لە جێی دەبوو بە پاشا، دەسەڵات دەکەوتە دەست کەسانی نابەرپرس و چاوچنۆك و بێ ویژدان بوو، لەو سەروبەندەدا لاوازی دامەزراوەی حکوومەت بەدەردەکەوت و کارمەندانی دیوانی حکوومەت دەکەتنە سوود وەرگرتنی نابەجێ لە دەسەڵات و داهاتی حکوومەت. لە سەردەمی منداڵی شاپووری دووەمیش کە وەك وتمان دایکی دەسەڵاتدار بوو، هەمان دۆخ هاتبووە ئاراوە.

پێویستە بگوترێت بە درێژایی دەسەڵاتیی ساسانییەکان لە وڵاتانی ئێران حکوومەت لە شێوەی دیکتاتۆری بووە، لە سەردەمی ئەوان و لە سەردەمانی دواتریش، هیچ کات دیموکراسییەت بوونی نەبووە.

لەو جۆرە حکوومەتەدا فەرمانبەرانی دیوان و ئەوانی دیکە دەبووایە لە دەسەڵاتدار بترسێن تا ئەرکی خۆیان راپەڕێنن و تێکەڵاوی ناکۆکی نەبن. کاتێك دەسەڵاتدار بەهێز نەبوو، هیچ کەسێك لە هیچ نادادپەروەرییەك سڵی نەدەکردەوە و نەدەترسا، کارمەندانی دیوانیش هەردەم هەڵپەی سوودی نابەجێ بوون و هەوڵیان دەدا ناکۆکییەکانیش بۆ بەرژەوەندی و قازانجی کەسیی و تایبەتی بقۆزنەوە.

دانیشتووانی ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا بەسەر چەند چینێکدا دابەش ببوون، هەر چینێك لەنێو خۆیدا هەندێ رێسا و نەریتی باوی هەبوو، کە تیایدا بە هۆی ریزەوە برا گەورە و کوێخا و...هتد هەبوو، کەس ئەو نەریتانەی نەدەشکاند، لە هەر وڵاتێك کە لە چینەکان پێکهاتبێت، هیچ چینێك هەوڵ نادات رێسا و نەریتەکان پێشێل بکات، ئەگەر بزانێت لە کاتی ئەنجامدانی پێشێلکاری دووچاری سزا دەبێتەوە، فەرمانبەرانی دیوانی حکوومەت لە چینەکانی جیای گەلانی ئێران نەبوون، بەڵام لە سەردەمی ساسانییەکاندا ئەوان لە چینی جیا و تایبەت بوون، تەنیا لە یەك کەس دەترسان کە ئەویش پاشا بوو، بەڵام بە هۆی کەمی تەمەنی شاپووری دووەمەوە، کەسێك نەبوو کە ئەوان ترسیان لێی هەبێت. بەشێك لە ئەوان خاوەن زەوی بوون و هاتنی قاتوقڕی بۆ ئەوان دەرفەتی زۆر باش بوو تا بە نرخی کەم زەوی جووتیارەکان بکڕنەوە.

ئاشکرایە کە بەردەوامبوونی قاتوقڕی بۆ ئەوان زۆر بە سوود بوو، ئەوان لە لایەك دانەوێڵەکانی خۆیان بە گرانتر دەفرۆشت، لە لایەکی دیکە زەوی جووتیارانیان بە هەرزانتر دەکڕی و دەیان خستە سەر موڵکە زۆرەکانیان. ئەگەر هەندێ کاتیش دانەوێڵە دەست کەوتبایە، لەکاتێکدا دەبووایە بەسەر نەداران و هەژاران دابەش بکرێت، ئەوان خۆیان بە خودان ماف دەزانی و بەشێك لەو دانەوێڵەیان بۆ خۆیان دەبرد.

شاپووری دووەم بە تەنیا هاتە نێو ئەو کێشانەی بە هۆی قاتوقڕییەوە سەریان هەڵدابوو، هەرچی وشتری دەستکەوت ناردی بۆ سەگستان تا هەر جۆرە دانەوێڵەیەك کە بە گواستنەوە تێك ناچێت و دەستیان دەکەوێت بیکڕن و بۆ وڵاتانی دیکەی ئێرانی بگوازنەوە. هاوکات فەرمانی کرد تا هەرچی دانەوێڵە لە ئەمبار و کۆگەکانی خەڵکانێکدا شاردراونەتەوە، دەستیان بەسەردا بگیرێت، ئەو کارەی بووە مایەی نارەزایی چەند کەسێك لە دیوانی حکوومەت، هەر بۆیە شاپووری دووەم فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد.

ئەگەر ئەو فەرمانە بۆ کوشتنی ئەوان لە کاتێکی دیکە دەرچووبووایە، بێگومان نارەزایی کاربەدەستان و خەڵکی لێ پەیدا دەبوو، بەڵام کاتەکە وابوو، جگە لەوەی خەڵك لەو کارە خۆشحاڵ بوون، کاربەدەستانی دیوانیش کێشەیان نەنایەوە و رەزامەندیان نواند.

شاپووری دووەم لەو شوێنانەی قاتوقڕی تیایاندا توندتر بوو، فەرمانی کرد تا بەشە خۆراك لە گەنم و جۆ بەخۆڕایی بۆ هەر تاکێك دیاری بکرێت و پێیان بدرێت، هەروەها فەرمانی کرد کاتێك کەسێك سکاڵا بکات لە پێنەدانی بەشە خۆراکەکەی یاخۆ کەم پێدانی لەلایەن کاربەدەستانەوە، دەبێ دەستبەجێ کاربەدەستەکە بکوژرێت، هەر بۆیە شاپووری دووەم بۆ ئەوەی بە تەواوەتی ئاگەدار و دڵنیابێت لە جێبەجێکردنی فەرمانەکەی لە هەموو شوێنێکدا چەندین پشکنەری نهێنی دیاری کرد.

جگە لە جووتیارە خاوەن بەرهەمەکان کە ژمارەیان بە بەراورد لەگەڵ جووتیارە کەم بەرهەمەکان زۆر کەم بوو، جووتیارانی دیکە نە توانای تێرکردنی خۆیان و منداڵەکانیان هەبوو، نە تۆویان هەبوو تا لە زەوییەکانیاندا بیچێنن، بۆیە شاپووری دووەم فەرمانی کرد تا جگە لە پێدانی بەشە خۆراك بە جووتیاران، تۆوی تەواویشیان بۆ چاندن بە خۆڕایی پێ بدرێت. بۆ ئەو کارەی پێویستی بە دانەوێڵەی پتر هەبوو، ئەو رێگەیەکی گرتەبەر کە گەورەکان بیریان بۆی نەچوو بوو، ئەویش هێنانی دانەوێڵە بوو لە هیندستان.

شاپووری دووەم بێ ئەوەی دەست بگرێتەوە، پارە و زێڕەکانی گەنجینەی حکوومەتی دایە ئەو کەسانەی بە کەشتییەکان دەچوون بۆ هیندستان تا دانەوێڵە بکڕن و بۆ ئێران بیهێنن. ئەو دەیزانی چوونکە کەشتییەکان بە ڕۆژ و شەو ناوەستن، دانەوێڵەی هیندستان زووتر دەگاتە ئێران، هەر وا دەرچوو، پێش ئەوەی وەرزی چاندنی گەنمی پایزی بە درەنگ بکەوێت، توانی دانەوێڵەی هیندستان بگەیەنێتە جووتیاران.

وێڕای ئەوەی بەرهەمی ساڵی دواتر لە گەنم و جۆ بە هۆی بوونی بارانەوە باش بوو، بەڵام قاتوقڕی ساڵی (٣٢١ ز) شاپووری ترساند بوو، بۆیە لەبەر مەترسی دووبارەبوونەوەی قاتوقڕی کەوتە هەوڵدان بۆ هەڵگرتنی گەنم.

(تۆماس مەن) نووسەر و لێتۆژی ئەڵمانی  کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بە یەکێك لە نووسەر و لێتۆژە دیار و بەرچاوەکانی مێژوو دەناسرا، نووسیویەتی: یەکەم کەس کە هەوڵی هەڵگرتنی گەنمیدا، یوسفی کوڕی یەعقووب بوو، کە لە دوای بوونی بە وەزیر لە دەرباری فیرعەون، (وەك لە گێڕانەوەکاندا هاتووە و هەمووان لێی ئاگەدارن) گەنمی زیادەی وڵاتی میسری لە ئەمباری ستوونی لوولەییدا هەڵگرت، سایلۆکان لە بەردی داتاشراو چێ کرابوون تا مشك و زیندەوەر نەتوانن بچنە نێو ئەمبار و سایلۆکان و دەنکە گەنمەکان نەبەن و بۆگەنی نەکەن.

پێشتر لە نووسینەکانماندا باسمان کرد کە سەرەتای دەسەڵاتیی هەخامەنشییەکاندا، سایلۆی گەنم لە شێوەی لوولەیی و ستوونی چێ دەکران و دانەوێڵەیان لێ ئەمبار دەکردن، دوای کۆتایی دەسەڵاتیی هەخامەنشییەکان چیدی چێکردنی ئەو ئەمباران و سایلۆیانە بەردەوام نەبوو، هۆکارەکەشی بۆ ئێمە ڕوون نییە و تێچووی چێکردنی ئەو جۆرە سایلۆیانە کە بە بەردی داتاشراو دروست دەکران، زۆر بوو، جووتیارەکان نەیان دەتوانی ئەو جۆرە ئەمبارانە چێ بکەن کە توانایان هەیە گەنم بۆ ماوەی چەند ساڵ لەنێو خۆیاندا بپارێزن.

مرۆڤ لە کۆنترین سەردەمەکاندا کە هیچ شوێنەواریان لە مێژوودا نییە، سایلۆی گەنمی لە شێوەی لوولەیی بینا کرد، ئەگەر حەزرەتی یوسف بە یەکەم کەس بناسین کە سایلۆی لوولەیی دروست کردبێت، ئەوا لانی کەم سێ هەزار و پێنج سەد ساڵ بەسەر دروستکردنی یەکەمین سایلۆی لەو شێوەیەدا تێپەڕ دەبێت، تا ئێستەش لە تەواوی جیهاندا سایلۆکان بە شێوەی لوولەیی بینا دەکرێن، ئەو بابەتەش نیشانەی خاوەن ئەقڵ و هۆشبوونی مرۆڤە کە لە سی و

پێنج سەدە پێش ئێستە ئەو کارەی ئەنجام داوە. لە مێژووی میسردا ناوی دوو وەستا تۆمار کراوە کە سایلۆکانیان بە شێوەی لوولەیی و لە بەردی تاشراو بینا کردووە.

وەك وتمان دوای هەخامەنشییەکان چیدیکە سایلۆی لوولەیی دروست نەکرا تا ئەوکاتەی ساسانییەکان هاتنە سەر تەختی دەسەڵات.

ئەوەی لای ئێمە ڕوونە ئەوەیە کە لە ساڵی (٣٢٣) زاینی لە ئێران سایلۆی گەورەی لوولەیی بەردین هەبوو، دەتوانین بڵێین ئەگەر پێش قاتوقڕی سایلۆ هەبووایە و دانەوێڵەیان تێدا هەڵگیرابووایە، خەڵك بە دەست قاتوقڕییەوە هێندە نەدەکەوتنە بەر هەڕەشە و مەترسی مردن و ژیانەوە.

بە درێژایی سەردەمی دەسەڵاتیی شاپووری دووەم، هەرکاتێك پێویستیان بە گەنمی سایلۆکان دەبوو، سوودیان لەو گەنمە وەردەگرت کە کۆنتر بوو، چوونکە بەردەوام گەنمی تازە لە سەرەوە دەخرایە نێو سایلۆکان ئەمباردەکران و لە دەرگەکانی خوارەوەی سایلۆکانیش گەنمی کۆن دەهاتەدەرێ. بەو پێیەش بەردەوام گەنمی کۆن دەهاتەدەرێ، هەرگیز گەنمی کۆن و نوێ تێکەڵاو نەدەبوون.

دووبارە هەڵگێرسانەوەی جەنگ لە نێوان ساسانی و ڕۆمەکان ئەمجارە بۆ زانیاریی پتر پێویستمان بە ناسینی (قوستەنتین) ئیمپراتۆری ڕۆم هەیە.

لە ساڵی (٣١٢ ز) قوستەنتین ناسراو بە (گەورە) کە پیاوێکی تەمەن (٣٨) ساڵان بوو، شەوێك کە بە هۆی گەرمای هاوینەوە لە باخەکەی خۆی دانیشتبوو، تەماشای ئاسمانی دەکرد، ڕووناکییەکی نائاسایی بینی و لەنێو ڕووناکییەکەدا کەسێکی بینی کە لە خاچ درا بوو.

ئەو پیاوەی لە خاچ درابوو گەنجێکی تەمەن سی ساڵان بوو، کە هەردوو دەستی لە هەردوو لاوە لە خاچ درابوون، هەردوو قاچیشی بە بزمارێکی درێژ لە بنکەی خاچەکە درابوو.

قوستەنتین هەستی کرد ئەو پیاوە ئازاری زۆرە و لەبەر ئەو ئازارە توندەی هەیبوو، توانای بەرزکردنەوەی سەری نەبوو.

نێزیکەی نیو دەمژمێر قوستەنتین نەیتوانی چاوی لەسەر ئەو پیاوە لە خاچدراوە هەڵبگرێت، هەر چاوی لەسەر بوو، ئەو دەمەی پیاوەکە سەری بڵند کرد و چاوەکانی کە شوێنەواری ئازاری سەختیان پێوە دیار بوو خستەسەر قوستەنتین و دەستی بە قسەکردن کرد، هەرچەندە ئەو لە ئاسمانەوە دەدوا و قوستەنتین لە باخی پاشایەتیدا بوو، بە باشی وتەکانی پیاوەکەی دەبیست کە دەیوت: (ئەی قوستەنتین من عیسای خەڵکی ناسیرەم و هەر هەمان

کەسم کە بە فەرمانی فەرمانڕەوای رۆم (پۆنتۆس پلۆتۆس) لە ئۆرشەلیم لە خاچ درام، پرسیارت لیٚ دەکەم کە بۆچی دۆست و شوێنکەوتووانم ئازار دەدەی؟، دەست لە ئازاردانیان هەڵبگرە و لیٚ بگەڕیٚ تا بەردەوام بن لە برەودان بە بیروباوەڕی خۆیان).

دوای ئەو وتانە کەسە لە خاچدراوەکە لە سەرەتادا وەك کەسێك کە بکەوێتە پشت پەردەوە، کەوتە پشت تارمایی یاخۆ لە شێوەی کەسێك کە بەرەبەرە داپۆشرێت، دواتر دیار نەما.

بینینی حەزرەتی عیسا لە ئاسماندا کاریگەریی زۆری خستە سەر قوستەنتین و بە شێوەیەك بوو کە قوستەنتین گومانی نەما، کە عیسای لە ئاسمانەوە بینیوە و لە خەوندا نەبووە، هەروەها دەنگی عیسای لە بێداریدا بیستووە و لە خەودا نەبووە.

هیچ یەکێك لەو کەسانەی ئەو شەوە لەو باخەدا بوون، عیسای مەسیحیان نەبینی و گوێیان لە دەنگی نەبوو، بەڵام قوستەنتین گومانی لە بینینی عیسا و بیستنی دەنگی نەبوو، بڕیاریدا هەر ئەو شەوە ئاینی عیسا پەسەند بکات و ئازادیش بدات بە کریستیانەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە ئاینییەکانیان کە تا ئەوکات ئازاد نەبوون و لەژێر گووشاری ئیمپراتۆردا بوون. بۆ ئازادکردنی ئەوان لە کارە ئاینییەکانیاندا پێویستی بە وەرگرتنی رەزامەندیی ئەو کەسانە بوو کە سەرۆکی پەرستگەکانی رۆم بوون.

رۆمەکان تا ئەوکات کۆمەڵێك خوداوەندیان هەبوو، خوداکانیان لەو پەرستگەیانە دەپەرست کە بۆ ئەوان چیٚ کرابوون، هەندێك لە خوداوەندیانی رۆم لە هەر شارێك پەرستگەیان هەبوو، هەر پەرستگەیەك سەرۆك و خزمەتگوزاری هەبوون کە بە چینی زانا ئاینییەکانیان دەناسران، ئەوان دژی بوونی ئاینی کریستیان بوون.

ماوەی ساڵێك قوستەنتین لە گفتوگۆدا بوو لەگەڵ ئەو سەرۆك پەرستگەیانەدا، دواجار توانی رەزامەندیی ئەوان بە هەندیٚ مەرج بەدەست بێنێت، یەکێك لەو مەرجانە ئەوەبوو کە هەرگیز ژمارەی ئەوان لە یەك لەسەر پازدەی ژمارەی دانیشتووانی ئەو وڵاتە تێپەڕ نەکات.

هەندیٚ لە مێژوونووسان دووچاری سەرسووڕمان بوون لەوەی قوستەنتین پایتەختی لە شاری رۆم لە ئیتاڵیای ئێستە گواستەوە بۆ (بیزەن تیۆم)، کە دواتر بە قوستەنتینە ناسرا، ئەوان سەرەنجی تەواویان نەداوە کە قوستەنتین و هاوئاینەکانی لە رۆم بە تەواوەتی لە جێبەجێکردنی ئاین و ئەرکە ئاینییەکانیان ئازاد نەبوون و پایتەختیان گۆڕی تا بتوانن تەواو ئازاد بن لە بەڕێوەبردنی کاروباری ئاینی خۆیان. بە هۆی گواستنەوەی پایتەختەوە، قوستەنتین توانی لەو

مەرجە رزگاری ببێت کە وەك ڕێژە بۆ زیادبوونی ئاینەکەی دانرا بوو، بۆیە بە خێرایی ژمارەی کریستیانەکان زیادی کرد، چوونکە دوای گواستنەوەی پایتەخت بۆ بیزەن تیۆم، رۆم بوو بە دوو ئیمپراتۆرییەت کە لەلایەن مێژوونووسەکان ئیمپراتۆرییەتە رۆژهەڵاتییەکەی بە (رۆمی بچووك) ناو بردرا کە بیزەن تیۆم پایتەختی بوو، ئیمپراتۆرییەتە رۆژئاواییەکەش کە تا ئێستەش رۆم پایتەختییەتی، بە رۆمی گەورە ناسرا.

جیابوونەوەی رۆمی رۆژهەڵات لە رۆمی رۆژئاوا، دەست رۆیشتوویی زانایانی ئاینە رۆمەکانی لە رۆمی رۆژهەڵات کەم کردەوە و ئاینی مەسیح بە خێرایی لە رۆم گەشەی کرد، دوای مردنی قوستەنتین و هاتنە سەرکاری کوڕەکەی، ئاینی کریستیان لە رۆمی رۆژئاواش پەرەی سەند، هۆکارەکەشی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی وێڕای ئەوەی کوڕی قوستەنتین کە گەورەی رۆم بوو کریستیان بوو، هەموو سەرکردە و ئەفسەرەکانی لەشکرەکەشی هاوئاینی ئەو بوون.

دوای ئەوەی لە ساڵی (٣١٣ ز) قوستەنتین دوای ئەوەی توانی رەزامەندیی گەورەکانی ئاینە رۆمەکان وەربگرێت لە ئازادبوونی ئاینی کریستیان، لە شاری (میلان) لە ئیتاڵیادا بڕیارنامەیەکی ڕاگەیاند کە لە مێژووی کریستیانەکان بە بڕیارنامەی میلان ناسرا.

بەپێی ئەو فەرمانە تەواوی کریستیانەکان لە هەر شوێنێکی ئیمپراتۆرییەتی رۆمدا ئازادبوون لە بەڕێوەبردنی کار و ئەرکە ئاینییەکانیان و فەرمان بە تەواوی کاربەدەستان و فەرمانبەرانی حکوومەت کرا کە بە هیچ شێوەیەك کێشەیان بۆ نەنێنەوە. یەکێك لە بڕگەکانی بڕیارنامەی میلان بریتی بوو لە ئەوەی کە کریستیانەکان لە هەر وڵاتێکی دەرەوەی ئیمپراتۆری رۆم بن، دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ رۆم.

پێشتر باسمان کرد کریستیانەکان لە دەرەوەی ئیمپراتۆرییەتی رۆم لە هیچ وڵاتێك بە ئەندازەی ئێران ئاسایشیان دەستەبەر نەبوو، بۆیە لە سەدەی یەکەمی زاینی بە دواوە، ئەو دەستەیە لە کریستیانەکان کە لە رۆم خۆیان لە مەترسیدا دەبینی ڕوویان دەکردە ئێران و ئەو وڵاتانەی ژێردەستی بوون.

بۆیە تا ساڵی (٣١٣ ز) کە فەرمانی ئازادبوونی ئاینی کریستیان لە رۆم دەرچوو، ئەو کریستیانانەی لە ئێران و وڵاتانی ژێردەستی دەژیان، ویستی گەڕانەوەیان بۆ رۆم نەبوو.

یەکەم: ئەوان نەیاندەویست بگەڕێنەوە بۆ رۆم.

دووەم: ئەوان دۆستی ئێران و دوژمنی رۆم بوون، بەڵام دوای بڕیارنامەکە دۆخەکە گۆڕا.

یەکەم: چوونکە ئەوان هەوڵی گەڕانەوەیان بۆ رۆم دەدا.

دووەم: چوونکە بە ڕۆم دەبەسترانەوە، هەندێ لەوان نەتەنیا ڕۆمیان بە دوژمن نەدەزانی، بە پێچەوانەوە ئێرانیان بە دوژمن دیاری کرد.

یەکێك لە هۆکارەکانی بەد ڕەفتاری شاپووری دووەم بەرانبەر بە کریستیانەکان دوای گەیشتنی بە دەسەڵات، ئەو بابەتە بوو، ئەو لەگەڵ تەواوی کریستیانەکان خراپ نەبوو، لە کاتێکدا ئەو دژی هەندێ لە کریستیانەکان بوو، بوڵام هەندێ کریستیانی دیکەش لە بەرەی ئەودا سەرباز و ئەفسەر بوون، تەنانەت کەسێکی کریستیان لەلایەن شاپوورەوە وەك حوکمڕانی ویلایەتێك دیار کرا بوو.

بە پێچەوانەی ئەوەی لەلایەن هەندێ لە مێژوونووسانەوە وتراوە، شاپووری دووەم لەگەڵ تەواوی کریستیانەکان خراپ نەبوو، تەنیا دژی ئەوانە بوو کە خۆیان پێوەست بە ڕۆم دەزانی، هەر کات ناکۆکیی لە نێوان ساسانی و ڕۆم هەبووایە، خوازیاری سەرکەوتنی ڕۆم دەبوون و بە دەستەواژەی ئێستە (ڕەتڵی پێنجەم) بوون.

ڕەفتاری شاپووری دووەم لە بەرانبەر کریستیانەکان، لایەنی ئاینی نەبوو، لە سەدەی یەکەمەوە تا ئەوکات کەس دژی کریستیانەکان نەبوو لە ئێراندا، ئەوانیش هاوشێوەی جوولەکەکان کە کەمینە بوون و ناوەندی نیشتەجێبوونیان بریّتی بوو لە ئەسفەهان، بەردەوام بە ئازادی ژیاون.

ڕاستە کە مووغە زەردەشتییەکان دەیانەویست سوود لەو دەرفەتە وەربگرن و بە سیاسەتی ئازار و چاوەدێریکردنی کریستیانەکان، بگەنەوە ئەو دەسەڵات و توانایەی لە سەردەمی پێش پاشایەتیی نرسی هەیانبوو، بەڵام توندوتیژی شاپووری دووەم بەرانبەر بە کریستیانەکان، هیچ پێوەندیی بە ڕوانینی ئاینییەوە نەبوو، دەبێت ئەو هەڵەیە وەلا بنێن، چوونکە ئەو لەگەڵ تەواوی کریستیانەکان خراپ نەبوو، بگرە ئەو تەنیا لەگەڵ ئەو کریستیانانەدا کە ڕەتڵی پێنجەم بوون، ساتوسەودایی نەرێنی بوو.

❊ ❊ ❊

لە ساڵی (٣٢٥ ز) واتە کاتێك شاپووری دووەم لە شازدە ساڵی تەمەنیدا بوو، ڕووداوێکی ڕاچڵەکێن و تۆقێنەر لە وڵاتانی باشووری ئێران ڕوویدا، بەڵام بەر لەوەی باس لە بویەرەکە بکەین بە باشی دەزانین باس لە تەمەنی شازدە ساڵی شاپووری دووەم بکەین. هەڵبەت کاتێك

باسی تەمەنی شازدە ساڵان دەکرێت، بیرمان بۆ کوڕە لاوێك دەچێت کە ئەمڕۆ لە تەمەنی شازدە ساڵیدایە و سەردەمی منداڵی تێپەڕاندووە و لەقۆناخی گەنجیدایە، نها بە وتەی ئەمەریکاییەکان لە سەردەمی تەمەنی (تین ئیج) واتە ئەو تەمەنانە دایە کە بە پاشگری (تین) کۆتاییان دێت و دەکەونە نێوان سێزدە تا نۆزدە ساڵان. بە بۆچوونی ئێستە کوڕە گەنجێکی شازدە ساڵان نەبووەتە پیاوێکی تەواو، هەڵبەت ئەمە تەنیا تێگەیشتنی ئێستەمانە.

لە رابردوودا کوڕێکی شازدە ساڵان کە لەنێو کۆمەڵگەدا گەورە دەبوو، وەك کەسێکی کارامە دەبینرا، بە تایبەتی کەسێکی وەك شاپووری دووەم کە وەك وتمان توانای تایبەتی هەبوو، ئێستەش دەبینین ئەوانەی لەنێو دۆخی تایبەت یاخۆ کەشی کارکردن گەورە دەکرێن، جیاوازییان هەیە لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆیان کە بە ئاسوودەیی پەروەردە دەبن.

شاپووری دووەم وێڕای فێربوونی زانستەکانی سەردەمی خۆی، لە ماوەیەی تەمەنیدا لەنێو کەشی کاروباری بەڕێوەبردنی دەوڵەت و بە داهێنانی بەرچاو پەروەردە ببوو، بۆیە کە گەیشتە تەمەنی شازدە ساڵان بە پیاوێکی تەواو هەژمار دەکرا.

زانیاریمان لەبارەی هەڵکەوتە و ڕووخساری ئەو لە تەمەنی شازدە ساڵیدا نییە، بەڵام مێژوونووسە ئەرمەنییەکان ڕووخسار و دیمەنی ئەویان بە جەستەی کەسێکی بیست ساڵان باس کردووە. بەرزی باڵای ئەویان بە نێزیکەی (١٨٠ سم) بە پێوەری ئێستە دیاری کردووە، وتوویانە کە دەمووچاوی بازنەیی تەواو نەبووە، ریش و سمێڵی رەش و چاوی گەورە و شەویلاگی پان بووە، هەر بە وتەی ئەوان شاپووری دووەم  ئەو کات کۆمەڵێك ژنی هەبووە، ئەمەش هەر نیشانەی ئەوەیە کە لە تەمەنی پێ گەیشتوویيدا بووە.

ساڵی (٣٢٥ ز) بە هۆی بارانی زۆر و باش لە وەرزەکانی زستان و بەهاردا، بەروبوومی کشتوکاڵیش وەك میوە باش بوو، جووتیاران لە بەرهەمی خۆیان رازی بوون. لە کاتی دروێنەی قامیشی شەکر لە باشووری ئێران و کاتی لێکردنەوەی خورما لە دار خورمایەکانی هەندێ شوێنی دیکەی هەمان دەڤەر، بوومەلەرزە هات و لە کەنارەکانی ڕووباری کارۆن تا سنووری وڵاتی کرمانی خستە جووڵەوە، لە هەندێ شوێن زەوی قەڵەشتی برد، بە درێژایی ئەو شوێنانەی بوومەلەرزەکە گرتبوویەوە، گوند و شارەکانی وێران کرد، کاتی بوومەلەرزەکەش هاوکات بوو لەگەڵ دوا دەمژمێری بەر لە ڕۆژهەڵات، واتە ئەو دەمەی زۆرینەی خەڵکان لە خەوی قورسدان.

ئەوە نەزانراوە بوومەلەرزەکە چەند کەسی خستە ژێر دار و بەرد و پەردووی داڕووخاوی خانووەکانی شار و گوندانەوە، تەنیا ئەوە دەزانرێت کە هێندە ترسناك و تۆقێنەر بوو کە تا کۆتایی پاشایەتیی ساسانییەکانیش لەنێو خەڵکدا کرا بووە وتەی نەستەق، خەڵك هەر کاتێك ویستبایان بابەتێك بە ترسناك بناسێنن، دەیانوت: (وەك بوومەلەرزەکەی سەردەمی شاپووری دووەم وایە).

لە رابردوودا ئەگەر بوومەلەرزە لە شوێنێکی دابووایە، لە ئاوایی و گوندەکانی نێزیکییەوە خەڵك دەڕۆیشتن و تەرمی مردووەکانیان لە بن دار و پەردووەکان دەردەهێنایەوە و دەیانناشتن و بڕوایان وابوو کوژراوانی بوومەلەرزە وەك کوژراوانی گۆڕەپانی جەنگ وان، دەبێت لە گۆڕ بنرێن، بەڵام ئەوانەی بە مردنی خۆیان دەمردن نەدەخرانە گۆڕەوە، لە بەرزاییەك دادەنران تا لاشەکەیان دەڕزی و تەنیا ئێسك دەمایەوە، ئەو دەمە ئێسکەکانیان لەنێو چاڵەکاندا دەناشت.

لەو سەردەمەدا فریاکەوتنی ئەوانەی بەر کارەساتی بوومەلەرزەکە کەوتبوون، واتای نەبوو، ئەگەر توانیبایان هاوکاریان لە خزم و دۆستان وەردەگرت، ئەگەر نەیانتوانی بووایە، دەبووایە پشت بە خۆیان ببەستن بۆ ئەوەی بە نەبوونی و گرفتەوە نەمرن و زیندوو بمێننەوە.

ئەوەش پێویستە بگوترێت کە بە باوەڕی خەڵکی ئەوکات واتە سەردەمی ساسانییەکان، بوومەلەرزە تاکە کارەساتی سرووشتی بوو کە بە هۆی تاوان و گوناهباربوونی دانیشتووانی ناوچەکەوە دەهات. ئەگەر لافاو لە گوندێکی دابووایە و بردبای، کەس نەیدەوت ئەوان تاوانبار بوون، ئەگەر زریانیش لە ناوچەیەکی دابووایە و لەنێوی بردبایە، کەس ناوی تاوانباربوونی بۆ دانیشتووانەکەی نەدەهێنا، بەڵام بۆ بوومەلەرزە کە لە شوێنێکی دەدا، کۆمەڵێك کوژراو و بریندار لیچ دەکەوتەوە، دەوترا ئەوانە بە سزای تاوانی خۆیان گەیشتن.

پێویستە بگوترێت کە ئەو شێوە بیرکردنەوەیە تەنیا هی سەردەمی ساسانییەکان بوو.

لەوانەشە پرسیار بکرێت لەوەی بۆچ لە سەردەمی ساسانییەکاندا تەنیا بیرۆکەی تاوانبار و گوناهباربوونی ئەو کەسانە هاتە کایەوە؟، بۆچ لە سەردەمانی پێشوتر و دواتر ئەو بیرۆکەیە نەبوو؟، وەڵامی ئەو پرسیارەش ئەوەیە کە ئەو باوەڕە لە یەکێك لە وتەکانی زەردەشتەوە هاتووە، کە دەڵێت: (شەت زەردەشت وتوویەتی کە زەوی لە لایەن ئاهورامەزداوە بە سەقامگیر و جێگیر ئافرانێدراوە و بێ جووڵەیە، زەوی ناجوڵاێتەوە تەنیا بە هۆی تاوانی کەسانێکەوە نەبێت.)

دوای ئەوەی بوومەلەرزە ڕوویدا، شاپووری دووەم کە لە ئەسفەهان بوو هەواڵی ڕێژەی زیانەکانی پێگەیشت، بەرەو فارس ڕۆیشت، جارێکی دیکە داهێنانی کرد و فەرمانیدا تا تەواوی سەربازان و

هاوولاتییان بکەونە  هاوکاریکردنی ئەوانەی بوومەلەرزە لێی داون، هەروەسا فەرمانی کرد هەر کەسێك لە خەڵکی گوندان یارمەتی ئەوان بدات، وێڕای خۆراکی رۆژانە کە وەری دەگرێت، بە ئەندازەی کرێکارێکی بواری خانووبەرە کە لە شار کار دەکات، کرێی رۆژانە وەردەگرێت. بەشێکی زۆر لە خەڵکی گوندان بێکار بوون، کاتێك ئەو هەواڵیان بیست کە وێڕای خۆراکی رۆژانە، کرێی کارەکەشیان بۆ هەر رۆژێك وەردەگرن، بە خۆشحاڵیەوە رۆیشتن بۆ کارکردن.

ئەو دەڤەرەیلەی بوومەلەرزەی لێی دابوون بەربلاو بوون، بۆیە بە فەرمانی شاپووری دووەم کۆمەڵێك ناوەند بۆ کۆمەك و یارمەتی دانران، لەو ناوەندانەوە هاوکاری دەگەیشتە ئەو کەسانەی بە هۆی بوومەلەرزەکەوە زیانیان بەرکەوتبوو.

ئەو یەکانەی دیار کرابوون بۆ هارکاریکردنی ئەو شوێنانەی بوومەلەرزەی لێ دابوون، جگە لە ناشتنی مردووەکان و چارەسەرکردنی بریندار و گەیاندنی خۆراك بە زیندووەکان، هەروەسا ئەرکی دروستکردنەوەی خانوویانیش لە ئەستۆ بوو، بۆ ئەوانەی زیندوو ماون. ئەوان دەبووایە جۆرێك لە خانوو دروست بکەن کە لەنێو دیواری خانووەکان، داری وەك کۆڵەگە بە شێوەی ستوونی دابنێن تا لە بەرانبەر بوومەلەرزە خۆڕاگر و بەهێز بێت. لەو خانووانەدا داری ئەستوور بە نێو دیواردا دەڕۆیشت، سەرێکی دەخرایە نێو زەوی و سەرەکەی دیکەیشی دەکەوتە ژێر بنمیچەکە، بەلام لە باشووری ئێران، یەکەمین کەس کە هەوڵیدا ئەو جۆرە خانووانە چێ بکات کە لە بەرانبەر بوومەلەرزەدا خۆڕاگر بن، شاپووری دووەم بوو، ئەویش شێوەی کاری خەڵکی خۆراسانی گرتەبەر و رایسپارد تا لە نێوەڕاستی خانووەکان کۆڵەگە دابنێن. لەوانەیە هەموو خەڵکی ئێران ئەو شوێنانەیان نەناسی بێت کە بوومەلەرزە دەیانگرێتەوە و نەیان زانی بێت کە کەوتوونەتە کوێ، بەلام خەڵکی خۆراسان و بەشێك لە ئازەربایجان ئەوەیان دەزانی کە ناوچەکانیان بوومەلەرزەی زۆرە. گزنفۆنی مێژوونووسی کۆنی یۆنانی نووسیویەتی: "بەشێك لە خەڵکی ئازەربایجان خانووەکانیان بە شێوەیەك بینا دەکەن تا بە بوومەلەرزە وێران نەبن، بۆ پێش گرتن لە وێرانبوونیان دار لە نێوەڕاستی دیوارەکاندا دادەنێن، ئەو دارانەش کە بە کاریان دەهێنن ڕایەڵ دەکرێن بە شێوەیەك کە رێگر بن لە کەوتنی داڕووخاوەکان بەسەر دانیشتووانی نیچو خانووەکە لە کاتی بوومەلەرزەدا، لە بنمیچەوەش دارەڕێی دەکەن و لەسەر دارەڕێکان پووش و لەسەر ئەویش خۆڵی نەرم دەڕێژن تا لە کاتی بوومەلەرزە نەکەون. لە کاتی بوومەلەرزە هەرچەندە کەمێك گەچ دەکەوێت کە بە دیوار و بنمیچەکەوە کراوە، بەلام میچ بە هۆی ئەو دارەڕێیەی بۆی کراوە ناکەوێتە سەر دانیشتووانی ماڵەکەوە".

ئەو نووسینە نیشان دەدات کە بیناکردنی خانووەکان بە دارەڕێ و پووش لە هەندێ شوێنی ئێران بۆ کەمکردنەوەی بە کاربردنی کەرەستەی خانوو نەبووە، بگرە میچیان بەم شێوەیە چێ دەکرد تا بە بوومەلەرزە نەڕووخێت. بە سەرنجدان لە کەرەستەکانی بیناسازی ئەو کات (ئاسن و تۆڕی ئاسنی نەبوو تا لەسەر خانووی دابنێن)، وەك دەردەکەوێ ئەوان باشترین کەرەستەکانیان بەکارهێناوە کە هەم بەهێز بوون، هەمیش ڕێگربوون لە ڕووخانی بنمیچ بە بوومەلەرزە.

یەکێك لەو شارانەی بە بوومەلەرزەی ساڵی (٣٢٥ ز) وێران بوو، شاری شووش بوو، کە دواتر شاپووری دووەم ئەو شارەی بە شێوەیەکی نموونەیی بینا کردەوە، لە سەردەمێکدا کە ئامرازەکانی گواستنەوە جگە لە ئەسپ و چوارپێکان و گالیسکە شتێکی دیکە نەبوو، پانی ڕێگەکانی کردە چل گەز.

ئەو شارەی لە ساڵی (١٣٥٣ هەتاوی) بەرانبەر (١٩٧٤ ز) کۆڵینکاری بۆ کراوە لە شوێنی ئەو شارە، هەمان شاری شووشە کە بە فەرمانی شاپووری دووەم ئاوەدانکراوەتەوە، شاری شووشی هەخامەنشیی کەوتووەتە ژێر ئەو شارە. کۆڵینکاری لەو شارە کۆنەدا لە سەرەتا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم لەلایەن (دیۆلافوای فەرەنسی) و خێزانەکەی دەستی پێکرد، دواتر لەلایەن (ژاك دۆ مۆرگان) کە ئەویش فەرەنسی بوو بە شێوەی بنەڕەتی و بۆ ماوەیەکی درێژ کۆڵینکاری بۆ کرا. لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم (رۆمێن گێرشمەنی) فەرەنسی کۆڵینکاری بۆ شووش کرد، لە ساڵانی (١٩٧٣ – ١٩٧٤ ز) قوتابیەکانی ئەو کارەیان ئەنجامدا، ئاشکراشە کە بە هۆی گەرمای زۆری ئەو ناوچەیە، کاتی کۆڵینکاری دەکەوێتە وەرزی پایز تا سەرەتای مانگی دووەمی بەهار، دواتر رادەگیرێت.

هەموو ئەو پێشکەوتنانەی ئەوکات لە دروستکردنی شاردا هەبوون، بۆ دروستکردنی شاری نوێی شووش سوودی لێ وەرگیرا، ئاوی خواردنەوە دەچووە هەموو خانووەکان، کەناڵەکانی زێرابیش هەبوون، لە هەر گەڕەکێك شوێنێك بۆ جل شۆرین دیاری کرا. هەروەها لە هەر گەڕەکێك شوێنی دانانی ئاگر چێ کرا، بۆ شارەکەش ئاگرخانەیەکی مەزن لە نێوەندی شار بیناکرا.

(ئافراتس) مێژوونووسی ئەرمەنی دەڵێت: چوونکە خەڵکی شووش یاخیبوون، بە فەرمانی شاپووری دووەم هەموو خەڵکەکەی کوژران و خانووەکانی ڕووخێندران، لە ڕووخاندنیان سوودیان لە فیل وەرگرت. دوای ئەوەی ئەو شارە کەڤنارە بە تەواوەتی وێران کرا، بە فەرمانی شاپووری دووەم سەر لە نوێ ئاوەدان کرایەوە.

* * *

له ساڵی (٣٢٨ ز) واته ئەوکاتەی شاپووری دووەم هەژدە ساڵان بوو، جارێکی دیکە (قورەوەی کوڕی موخلەب) بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر شاری تیسفونی پایتەختی شاپووری دووەم، وەك یەکێکیش لە مێژوونووسەکان دەبێژێت: "ژمارەی لەشکرەکەی لە ژمارەی لمی بیابان زۆرتر بوو"، ئەو بڕیاری دابوو شاپوور لەنێو ببات و زەوییە بە پیتەکانی رۆژهەڵاتی میزۆپۆتامیا بخاتە ژێردەستی خۆی.

بە داخەوە زێدەڕۆیی هەندێك لە مێژوونووسە کۆنەکان رێگر بووە لە زانینی ژمارەی سەربازانی قورەوەی کوڕی موخلەب کە ویستوویەتی پایتەختی ساسانییەکان داگیر بکات.

قورەوەی کوڕی موخلەب سەرکردەیەکی لێهاتوو و شارەزا بە نهێنییەکانی جەنگ بوو، لە باشووری فوراتەوە لەشکرەکەی لە بوارێك پەڕاندەوە و هاتە نێو میزۆپۆتامیا واتە زەوییەکانی نێوان دیجلە و فورات.

سەرداری عارەبان نەیدەتوانی بە ناوەڕاستی وشکانی نێوان دوو ڕووبارەکەدا بڕوات، چوونکە لەوێندەر ئاوی پێویست بۆ لەشکرەکەی دەست نەدەکەوت، بۆیە ناچار بوو بە درێژایی زێی فورات یاخۆ زێی دیجلەدا جووڵە بکات، تا بەردەوام ئاوی پێویست بۆ لەشکرەکەی بەردەست بێت. چوونکە دەیویست هێرش بکاتە سەر پایتەختی شاپوور کە لە کەناری دیجلە بوو، بە درێژایی کەناری رۆژئاوای دیجلە، واتە لای راستی ڕووبارەکە رێگەی بەرەو باکور گرتەبەر. لە رابردوودا، تەنانەت هەندێکات لە ئێستەشدا، کاتی جەنگەکان لەسەر وەرزەکان دیاری دەکرێت، تەنانەت لە دووەمین جەنگی جیهان هیتلەری سەرۆکی ئەڵمان بە هۆی سەرماوە کە سەربازەکانی توانای جەنگیان لە سەرمای رۆسیا نەبوو، جەنگی خستە وەرزی گەرماوە.

لە میزۆپۆتامیاش هاوین زۆر گەرم بوو، لەشکر لە گەرمادا توانای رێ بڕینی نەبوو، بۆیە قورەوەی کوڕی موخلەب لە سەرەتای پایز کە هەوای بیابان فێنکە کەوتەڕێ تا بتوانێت لە سەرەتای دووەمین مانگی پایزدا بجەنگێت. سەربازەکانی ئەو بەرگی گەرمیان هێنابوو، بە رۆژ لە کۆڵە پشتیان دادەنا، بە شەویش لەبەریان دەکرد، چوونکە سەربازەکان و سەرداری عارەبان دەیانزانی لە وەرزی پایز، شەوەکان ساردن، ئەگەر بەرگی گەرمیان نەبێت، بەهۆی سەرماوە هەراسان دەبن و بەرگە ناگرن.

هەر یەکە لە سەربازەکانی قوروەی کوڕی موخلەب، جگە لە پێداویستییەکانی جەنگ، پەیکەرێکی بچووکی خوداوەندی خۆیان لە لابوو، ئەوان بە بێ ئەو پەیکەرانە سەفەریان نەدەکرد، عارەبی بیاباننشین بەر لە هاتنی ئیسلام بەبێ پەیکەری خوداوەندکانی خۆیان سەفەریان نەدەکرد.

پێش هاتنی ئیسلام هەموو عارەبان بت پەرست بوون و بتە گەورەکانیان لە کەعبە دانابوو، ئەگەر توانیبایان ساڵانە جارێك بۆ زیارەتی ئەو بتانە دەچوونە مەککە، بەڵام بە هۆکاری جۆراوجۆر ئەو کارە بۆ ئەوان سەخت بوو، هەموو عارەبان لە ماڵ یاخۆ خێوەتەکەی خۆیدا پەیکەرێکی بچووککراوەی خوداوەندی خۆی هەبوو، کە لە مەککە بوو، ئەو پەیکەرەی دەپاراست.

ناوی بتەکان برێتی بوون لە: (لات، مەنات، عزی، مەلوود، ئەربیل و تەداف، سێ سەد و پەنجا و چوار ناوی دیکەش. چوونکە لەنێو کەعبەدا بە ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ بتیان هەبوو (لە رابردوودا عارەبان بۆ ئاسان بوونی کارەکانیان، بەم شێوەیەیان دەبژارد)، لە ئێستەدا دیارترین مێژوونووسەکانیش ناوی هەموو بتەکان نازانن، لە کاتێکدا ناوەکانیان لە هەندێ پەڕتووکدا هاتووە کە لە سەدەکانی دووەم و سێیەمی پاش ئیسلام نووسراون.

بەداخەوە بە هۆی جۆراوجۆری وەك بوومەلەرزە، لافاو و ئاگرکەوتنەوە و گوێ پێ نەدان بە بایەخیان، بەشی زۆری پەڕتووکەکانی زانایانی ئیسلام کە لە سەدەکانی دووەم و سێیەم و چوارەمی کۆچی نووسرا بوون لەنێوچوون و ناوی ئەوان لەنێو پەڕتووکی (ئەلفەهرەست) لە نووسینی (توفەیل بن نەدیم) ماون، بۆیە ئەو زانیارییانەمان هەیە. لە سەدەی دواتریش هەر بە هەمان شێوە هەندێ پەڕتووکی زانا ئیسلامییەکان لەنێوچوون.

وێڕای ئەوانەش ئاشکرایە کە هەر دەستەیەك لە کەسانی ئەو سەردەمە یەکێك لە بتەکانیان دەپەرست و لایان بەرزتر بوو لە ئەوانی دیکە، بە خودای خوداکانیان دەناسی، (هەر وەك یۆنانی و ڕۆمەکان) لەگەڵ خۆیاندا بۆ گەشتەکانیان دەبردن و پەیکەری خوداوەندانی دیکەیان لەگەڵ خۆیان نەدەبرد، بە تایبەت کە هەڵگرتنی کۆمەڵێك لە خوداوەندان بە تایبەتی بۆ سەربازەکان سەخت بوو.

خۆراکی سەرەکیی عارەبانی بیاباننشین شیری وشتر بوو، هەندێ جاریش گۆشتیان دەخوارد، لە هەر شوێنێك خورماش هەبووایە، ئەوا ئەو میوە بەهێز و شیرنە دەبووە بەشێك لە خۆراکیان، بەڵام سەربازەکان لە لەشکرەکاندا خۆراکی باشیان دەخوارد، یەکێك لە هۆکارەکانی

بە سەربازبوونی خۆبەخشانەی عارەبان لەنێو لەشکری قوورەی کوڕی موخلەب و سەردارەکانی دیکەی عارەبان هەبوونی خۆراکی باش و پارەی رۆژانەی باش بوو.

ئەو بابەتەمان بۆیە باسکرد تا خوێنەری بەڕێز دۆخی نێو لەشکری قوورەی کوڕی موخلەب و سەردارانی عارەبانی بەر لە هاتنی ئیسلام و دوای هاتنی ئیسلامی لێ تێك نەچێت.

دوای هاتنی ئیسلام، جەنگی کافران بووە ئەرکی ئاینی هەر مسوڵمانێك، هەر کاتێك پەیامبەر (د.خ) و خەلیفە گەورەکانی ئیسلام دەیانەویست جەنگی نەتەوەیەکی ناموسوڵمان بکەن، بە پیاوە مسوڵمانەکانیان دەوت تا بۆ جەنگ ئامادە بن. رۆیشتن بۆ مەیدانی جەنگ بە فەرمانی پەیامبەر یاخۆ خەلیفەکان وەك نوێژ و رۆژوو ئەرك بوو، جا خواردنی باشیان پێدرا بووایە یاخۆ نەدرابووایە.

پیاوی مسوڵمان بۆ خواردنی باش و مووچە نەدەهاتە نێو لەشکر، تەنانەت لە سەرەتای ئیسلام پارە نەدەدرا بە ژن و منداڵی ئەو کەسانەی لە مەیدانی جەنگ دەکوژران، چوونکە گەنجینە ئیسلام ڤاڵا بوو، هیچ زێڕ و دراوی تێدا نەبوو تا بکارن مووچە بدەنە کەسوکاری کوژراوەکان، بەڵام دواتر کە گەنجینەی ئیسلام پڕ بوو، مووچەی مانگانە دەدرایە تەواوی کەسوکاری کوژراوەکان، تەنانەت ئەو سەربازانەش بە هۆی جەنگەوە کەمئەندام دەبوون، تا مردن مووچەیان وەردەگرت.

لە سەردەمی نەزانی یاخۆ جاهیلی عارەبانی بەر لە ئیسلام، لە عارەبستان و ئەو شوێنانەی دیکە کە عارەبانی لێ نیشتەجێ بوون وەك رۆژئاوای میزۆپۆتامیا، سەربازی خۆبەخشانە بوو، بۆ راکێشانی خەڵك بۆ سەربازی خواردن و پۆشاکی باشیان پێ دەدرا، بە رەچاوکردنی داهاتی تاکەکانی عارەبان لە بیاباندا، مووچەیەکیشیان پێ دەدرا.

ئەو ڕوونکردنەوانەمان باس کرد تا خوێنەر بزانێت سەربازەکانی قوورەی کوڕی موخلەب ئەوە نەبوون کە تەنیا شمشێر یاخۆ نێزەیەکیان پێ بێت و بە کراسێکەوە هاتبن بۆ جەنگ، ئەوان وەك هەر لەشکرێکی دیکە رێك و تەکووز بوون، هەموو پێداویستیی جەنگیان هەبوو، تەنانەت ریزی سوارە و پیادە و مەنجەنیقیشیان هەبوو، بەڵام گالیسکەی جەنگیان نەبوو، چوونکە ئەوان ئەو پیشەیان نەدەزانی کە بۆ چێکردنی گالیسکەی جەنگی پێویستە، بەڵام دەیانتوانی لە داری ئاسایی مەنجەنیق چێ بکەن.

یەکێك لە هەڵەکانی هەندێك لە مێژوونووسان ئەوەیە کە وایانزانیوە عارەبان توانای دروستکردنی لەشکرێکی رێك و مانەوە لە مەیدانی جەنگ بۆ چەند رۆژ یاخۆ هەفتەیان نییە.

بە مەزندەی ئەوان عارەبانی بیابان تەنیا توانیویانە یەك دوو رۆژ بجەنگن، دواتر بگەڕێنەوە، چوونکە بە هۆی بوونی ئەوان بە شێوەی بەردەوام لە بیابان و جوولەی بەردەوامیان، قاچی وەستانیان نییە، لە راستیدا ئەو بیرکردنەوەیە هەڵەیە، عارەبان چ پێش هاتنی ئیسلام و چ لە دوای هاتنی ئیسلام زۆر جار جەنگی دوورودرێژیان کردووە، کە نەتەنیا چەند رۆژ، بگرە چەندین مانگی خایاندووە. جەنگی سەفین کە لە نێوان (عەلی کوڕی ئەبی تالێب) و (معاویە) ڕوویدا، ساڵێك و بە وتەی هەندێ کەس هەژدە مانگی خایاند.

چوونکە رێگەی تێپەڕینی سەرداری عارەبان دەکەوتە درێژایی کەنارەکانی رۆژئاوای دیجلە، شاپووری دووەم هێزەکانی خۆی لە دیجلە پەڕاندەوە و لە رۆژئاوای دیجلەی جێگیریکردن، بەڵام کەناری رۆژهەڵاتیشی چۆڵ نەکرد، چوونکە لەوانەبوو قوروەی کوڕی موخلەب لەشکرەکەی لە دیجلە بپەڕێنێتەوە و لە کەناری راستی ڕووبار دامەزرێت، ئەگەر هێزی تەواو لە پێش نەبێت بۆ رێگە لێگرتنی، بێ هیچ رێگریەك دەگاتە تیسفون.

ئافرانسی مێژوونووسی ئەرمەنی دەڵێت: ئەوکات لە تیسفون هەشت پرد هەبوو کە رۆژهەڵات و رۆژئاوای شارەکەیان پێکەوە دەبەستەوە، شاپووری دووەم بەشێك لە هێزەکەی لە پردەکان پەڕاندەوە، بەشەکەی دیکەیشی نەپەڕاندەوە، چوونکە هەر بە وتەی ئافرانس لە شاری تیسفون دوو سەربازگە هەبوون کە دەکەوتنە نێو شار یەکیان لە رۆژهەڵات و ئەویکەشین لە رۆژئاوای شارەکە بوون، هەردووکیان دەکەوتنە نێو شارەکەوە.

پێش ئەوەی شاپووری دووەم و سوپاکەی بکەونەڕێ، بە ئەفسەرەکانی وت تا بە سەربازەکان بڵێن، لەشکری قوروەی کوڕی موخلەب پێش ئەوەی بگاتە تیسفون پێویستە لەنێو بچێت، ئەگەر لەنێو نەچوو و گەیشتە نێو شار، پێویستە پردەکانی شارەکە تێك بشکێنن تا دوژمن نەتوانێت بە ئاسانی لە لایەك بۆ لاکەی دیکەی شارەکە بڕوات.

ئەو پردانە ئمبەر و ئەوبەری شارەکەیان پێکەوە دەبەستەوە، پردی ئەندازەیی بوون و بە بەرد و ساڕووج و خشت چێ کرابوون، ئەو ساڕووجەی لە پردەکەدا بەکارهاتبوو برێتی بوو لە ساڕووجی سوورکراوە، وەك چیمەنتۆی ئێستە بەهێز بوو، لە دروستکردنی پرد و زێراب و ئەمبار و کۆگەی ئاو و ئەو شوێنانەی نەدەبوو ئاویان تێ بچێت، سوودیان لێ وەردەگیرا، بۆیە پردەکانیش کە بەو کەرەستانە چێ کرابوون، بەهێز بوون و بەرگەی باران و هەڵکشان و لافاوی زێیەکەیان لە بەهاردا دەگرت کە زۆر سەخت بوون، بۆیە ڕووخاندنی پردەکان قورس بوو.

پردە بەهێزەکانی ئەوکاتیان بە شێوەی تایبەتی لەنێودەبرد، ئەویش بریتی بوو لەوەی لەژێر پرد و سەر پردەکان مەقلّی گەورەیان دادەنا و ئاگری بەهێزیان تێدا دەکردنەوە تا ساڕووج و خشتەکان بە تەواوەتی لە گەرمادا سووربېنەوە و بتەقن و ئەوکات لە رێگەی دوورەوە بە مەنجەنیق ئەو ئاوەیان هەڵدەدایە سەر پردەکە کە لە دەفری تایبەتیدا بوون و لەنێو هەندێ بەلەمیشەوە ئاویان بە هەمان شێوە بە مەنجەنیق هەڵدەدا بۆ بەشی ژێرەوەی پردەکە و بە هۆی ڕژانی ئاو و زوو بە هەڵم بوونی، بەرد و ساڕووجە گەرمەکان دەستیان بە تەقین و پرژانی خێرا دەکرد و پردەکەش دەڕووخا بەبێ ئەوەی زیان بە کەس بگات.

دەکرێت بگوترێت ئێرانییەکان لە یەکەمین نەتەوەکان بوون کە سوودیان لە هێزی هەڵم بوونی ئاو وەرگرتووە. ئەوان تەنیا بۆ وێرانکردنی پردەکان سوودیان لە هەڵم وەرنەدەگرت، بگرە لە ناوچە ساردەکانیش بۆ گەرمکردنی ژوورەکانیش سوودیان لە هەڵم وەردەگرت، لە هەر ماڵێکدا بۆ وەرزی زستان شوێنێك هەبوو کە تیایدا ئاو لەنێو کۆگەیەکی گەورەدا دەکولێندرا و بە هەڵم دەبوو و بەناو بۆڕی تایبەتیدا بەنێو ژوورەکاندا دەڕۆیشت و گەرمی دەکردن.

شاپووری دووەم لە رۆژی (ئاسمانی رۆژ)[٤] لە رۆژەکانی مانگی پایز بۆ سەرکردایەتیی کردنی سوپاکەی لە تیسفون دەرچوو.

شاپووری دووەم نەیدەویست سوپاکەی سەرداری عارەبان لە پایتەختەکەی نێزیك ببنەوە، ئەمە بچێتە پێشوازی قوروەی کوڕی موخلەب، چوونکە رۆژەکانی پایز کورتبوون، بۆیە سوپاکەی ئەو لەگەڵ یەکەم تیشکی سپێدەی بەرەبەیاندا دەکەوتنە جووڵە و تا شەو بەردەوام دەبوون لە رۆیشتن، ئەوان لە نێوەڕاستی رۆژدا پشوویان نەدەدا، چوونکە رۆژەکان کورت بوون، لە بەرانبەردا سەربازەکان لە شەودا کاتی پێویستیان هەبوو بۆ پشوودان.

دووەمین رۆژ و دوای ئەوەی خێوەتگەی سەربازەکان دامەزرا، شاپووری دووەم لە بابەتی فەرماندەیی سوپا ئاسوودە بوو، فەرمانی کرد تا خۆراکی بۆ بێنن. ئەو لە کاروانی جەنگدا

---

(٤) بە دروستی نازانین کە ئەو رۆژە چ رۆژێك بووە ئایا رۆژی بیست و شەشەم یاخۆ بیست و حەوتەمی مانگ بووە، بەڵام زانراوە لە ئێرانی کۆندا هەموو رۆژەکان ناوی تایبەت بە خۆیان هەبووە، هەندێ لە ناوەکان لە شانامەی فیردەوسیدا هاتوون و یەکیان ئەم ناوەی سەرەوەیە:

مە بهمن و ئاسمان رۆز بود          کە حاکم بە این نامە پیرۆز بود          (زەبیحوڵڵا)

بوو، بۆیە بێ ڕێوڕەسم و بە سادەیی نانی دەخوارد، مێزێکی بچووك و نزم لە خێوەتی شاپوور و لە بەرانبەری بوو، خۆراك و خواردنەوەیان بۆ لەسەر دانا.

چەند خێوەتێك کە هی کەسانی نێزیکی شاپوور بوون، یەکێك لە ئەوان خێوەتی (پشوتەن) پزیشکی تایبەتی ئەو بوو.

کاتێك شاپوور نانی دەخوارد، خزمەتکارەکانی دەکەوتنە پشتیەوە، بۆیە ئەو خزمەتگوزارەی کاتی ئەرکی بوو، چووە پشت شاپوور وێستا، وەك ئەمڕۆ دەگوترێت بوو بە پاسەوانی، شاپووری یەکەمین پارووی خوارد، کاتێك ویستی دووەمین پارووی بخوات، خزمەتکارەکە بینی کە شاپوور بێ ئەوەی تەنیا وشەیەك بڵێت بە ئارامی کەوتە سەر زەوی.

خزمەتکارەکە بە ترسێکی زۆرەوە خۆی گەیاندە سەر شاپوور و بینی کە ئەو چاوی لێ دەکات، بەڵام لە چاوەکانی ترس بەدی دەکرێت و ڕووخساری ڕەش بووە.

خزمەتکارەکە بە شەپرزەیی لە خێوەتەکە هاتەدەر و خۆی گەیاندە خێوەتی (پشوتەن) کە لەوکاتەدا سەرگەرمی نان خواردن بوو و هاواری کرد پاشا دووچاری نۆبەی دڵ بووە.

پشوتەن دەستی لە نان خواردن هەڵگرت و بە راکردن خۆی گەیاندە خێوەتی شاپووری دووەم و بینی کە هێشتا لەسەر زەوی کەوتووە، سەری شاپووری بەرز کرد و وتی چیتان بە سەر هاتووە؟، بەڵام شاپووری دووەم نەیتوانی بئاخڤێت و رەنگی ڕووخساریشی ڕەش ببوو.

بە هۆی دەنگە دەنگی خزمەتگوزارەکە و راکردنی پزیشکەکە، ئەفسەر و سەربازەکانی گاردی تایبەتی شاپووریش زانیان کە بویەرێك ڕوویداوە، ئەوانیش هاتنە نێو خێوەتەکە، لە بینینی نەخۆشەکە کەوتنە ترسەوە، دڵنیابوون کە ئەو دووچاری نۆبەی دڵ (جەڵتە) بووە. پشوتەن بە ئاوازێك کە وەك فەرمان دەچوو، وتی دووربکەونەوە و بەردەستم مەگرن.

ئەفسەر و خزمەتکارەکان دوورکەوتنەوە، پزیشك دەمی شاپووری کردەوە و تا توانی پەنجەکانی خستە نێو دەمی، شتێکی لە گەرووی دەرهێنا و خستیە سەر مێزەکە، هاوکات دەنگی شاپووری دووەم هات کە وتی ماوەیەکی کورتیتر دەخنکام. لە دەمی شاپوورەوە کەمێك خوێن هاتەدەر، پشوتەن بە خزمەتکارەکانی وت تا بچن و دەفرێك بێنن تا خوێنەکەی بکرێتە نێو.

شاپووری دووەم وتی: بیستم کە هاواریان کرد گوایە من دووچاری نۆبەی دڵ بووم، ئایا ئەو خوێنە هی ئەو نەخۆشییەیە.

پزیشك وتی: نەخێر ئەی خاوەن شکۆ، ئەو خوێنە بە هۆی دەستی منەوە بوو کە گەرووی بریندار کردووی، بەڵام برینی سووك و هەندێ خوێن بەربوون باشتر بوو، لەوەی پاشا مەترسی لەسەر بێت.

شاپووری دووەم وتی: کەواتە نۆبەی دڵ ئەوەیە؟، من بیستبووم کە هەندێ کەس بەو نەخۆشییە دەمرن، بەڵام نەمدەزانی کە خۆم ئەو نەخۆشییە دەگرم.

پزیشك وتی: تەمەنی پاشا درێژ بێت، ئێوە دووچاری نۆبەی دڵ نەبوون، من هەرکە هاتمە نێو خێوەتەکە تێگەیشتم کە ئەو کێشەیەی بۆ ئێوە هاتووەتە پێشێ لە خواردنەکەیە.

شاپوور وتی: چۆن ئەمەت بۆ دەرکەوت، کە ئەمە بە هۆی گیربوونی خواردن لە گەروومدایە؟.

پزیشك وتی: کاتێك هاتمە ژوورەوە، مێزی نان خواردنەکەم بینی و زانیم ئێوە سەرگەرمی خواردن بوون، دواتر بینیم رەنگی ڕووخسارتان رەش بووە، لە کاتێکدا لە ڕوودانی نۆبەی دڵ رەنگی ڕووخسار ڕەش نابێت. دوای ئەوەی پرسیارم لە خەسرەو کرد کە چیتانە؟ وەڵامتان نەدامەوە، بووم دەرکەوت کە ناتوانن وەڵامم بدەنەوە، بەڵام لە نۆبەی دڵدا نەخۆش دەتوانێت بدوێت، هەرچەند ئازاری زۆرە، لە نۆبەی مێشکیشدا نەخۆش تەنانەت ئازاریشی نابێت و بەپێی ئەو نیشانانە من زانیم کە ئێوە دووچاری نۆبەی دڵ نەبوونە، بگرە خواردن لە گەرووتان گیر ببوو، بۆیە بە باشم نەزانی بوەستم و بڕیارمدا بە پەنجەی خۆم خۆراکەکە لە گەرووتان دەربهێنم.

من دەمتوانی بچم و مەقاش بێنم و ئەو کارە بە مەقاش ئەنجام بدەم تا گەرووتان بریندار نەبێت، بەڵام بۆم دەرکەوت تا بڕۆم و مەقاشی پزیشکی بێنم، درەنگ دەبێت، درەنگ بوونیش باش نییە، نەگەیشتنی هەناسە بە سینگتان مەترسیدارە، بۆیە بە خۆمم وت تۆزێك برین و هاتنی کەمێك خوێن باشترە لە مەترسی گەورە. سوپاسی خوداوەند دەکەم کە خواردنەکە لە گەرووتان هاتەدەرێ و ئێوە باشن، ئێستەش وا باشە کە ئەمشەو خواردن نەخۆن، هەرچەندە خواردن زیانی بۆتان نییە، بەڵام چوونکە ئەو بابەتە بۆ ئێوە ڕوویداوە و گەرووتان بریندارە و هەستیارە، باشترە خواردن نەخۆن تا دووبارە نەبێتەوە.

شاپووری دووەم لە شێوەی چارەسەری پزیشك زۆر رەزامەند بوو، فەرمانی کرد تا سەد سککەی زێڕی پێ بدەن.

**رۆژی دواتر بە هۆی ئەوەی سوپای شاپووری دووەم بە درێژایی دیجلەدا بەرەو پێش دەڕۆیشت، گوند و ئاوایی زۆر دەکەوتنە سەر رێگەیان، پشوتەن فەرمانی کرد تا (شیرپا)[٥] بۆ شاپوور ئامادە بکەن.**

**پشوتەن تا ئەو رۆژەی لە ژیاندا بوو، لە کۆشکی شاپووری دووەمدا بوو، زۆر جار نەخۆشییەکانی چارەسەر دەکرد، کوڕەکەشی بە ناوی ئیزەد گۆرد (یەزد گۆرد) بوو بە سەرۆکی نەخۆشخانەی بەناوبانگی (گوندی شاپوور) کە وەك زانکۆیەکی گەورەی پزیشکی وابوو.[٦]**

---

(٥) شیرپا برێتی بوو لە شۆربایەکی سادە کە بە هۆی شل بوونییەوە بۆ ئەو کەسانە باش بوو کە گەروویان بریندار بوو، بۆیە کێشەی بۆ نەدەنانەوە. "زەبیحوڵڵا"

(٦) ئیزەد گۆرد نامەیەکی لەپاش ماوەتەوە کە لە سەرچاوە ئێرانییەکاندا باسی نەکراوە، بەڵام لە سەرچاوە ئەرمەنییەکاندا کورتەیەکی ماوە، ئەو نووسینە تا رادەیەك بیۆگرافیایە و باسی رۆژانی سەرەتای ئەزموون وەرگرتنی ئەوە لە نەخۆشخانەی گوندی شاپوور. ئەو ژیاننامەیە بە دوو هۆ گرینگە، یەکەم لە روانگەی مێژوو کە لە سەردەمی ساسانییەکان پزیشکی تەنیا هەر بە هۆی ئەزموونی کەسەکانەوە نەبووە، بگرە پزیشکەکان لەسەر پەڕتووك و بە شێوازی خوێندن شارەزاییان لە پزیشکی وەرگرتووە.

بایەخی دووەمی ئەوەیە کە دەردەکەوێت قوتابیانی ئەو کاتیش وەك ئێستە لەگەڵ مامۆستاکەیان چوونەتە نێو نەخۆشخانە و نەخۆشیان بینیوە، گوێیان لە مامۆستاکانیان گرتووە، مامۆستا لەلای ئەوان وەك بوونەوەرێکی سەرووی سروشت بووە.

ئێستە وێڕای هەبوونی هەزاران پەڕتووك و سەرچاوە سەبارەت بە بەشە جۆراوجۆرەکانی پزیشکی، هێشتا باسێکی ئاوا بەسوود لەسەر یەکەم ئەزموونەکانی قوتابییەکان لە کاتی چوونە ژوورەوەیان بۆ لای نەخۆشەکان نییە، ئیزەد گۆرد وەك نووسەرێکی ڕاستەقینە بارودۆخی دەروونی خۆی لەو کاتانەدا باس کردووە کە بە هاوڕێیەتی قوتابییەکانی دیکە لەگەڵ مامۆستا چوونەتە نێو ژووری نەخۆشەکان. باس دەکات کە تا چ رادەیەك لە شارەزایی و زانستی مامۆستاکەیان سەرسام بووە، کاتێك کە تەنیا بە سەرەنج دان لە چاوەکان و زمان و گرتنی لێدانی دڵ، نەخۆشییەکانی دەست نیشان کردووە.

ئەو باس دەکات کاتێك مامۆستا بەرانبەر نەخۆشێك دەوێستا، داوای لە قوتابییەکانی دەکرد تا بۆی روون بکەنەوە کە نەخۆشییەکە چییە و چی پێویستە و چەند دەخایەنێت بۆ ئەوەی چارەسەر ببێت. ئەگەر یەکێك لە قوتابییەکان توانی باسکردنی وەڵامەکانی ببوایە، مامۆستا گوێی دەگرت، ئەگەرنا خۆی بە تەواوەتیی بۆی باس دەکردن.

ئیزەد گۆرد لە رۆژانی سەرەتاوە بۆی دەردەکەوێت کە مامۆستاکەیان بۆ پشکنینی چاوی هەر نەخۆشێك، شووشەیەك لە پێش چاوی رادەگرێت کە چاوی کەسی بەرانبەر چەندین جار گەورەتر دەکات، ئەو برینانەی لەنێو چاودا هەیە بە باشی گەورە دەکات و دەبینرێن. ئەو لە رۆژانی سەرەتا لە قوتابییەکانی بیست کە سپێنەی چاو لە هەر نەخۆشێکدا برینەکانی بە جۆرێك دەبن، ئەوەش نیشانەیە لە نەخۆشییەك بۆ یەکێکی دی، هەر بەو رێگەیە نەخۆشییەکان لەیەك جیا دەکرێنەوە.

پێویستە باسی ئەوەش بکەین کە لە پەرتووکی (چاوگێرانێك بەنێو هونەری ئێران) لە نووسینی (پرۆفیسۆر پۆپە) و پەرتووکێکی بە وێنەیە، وێنەی دەسکی عەینەك هەیە کە دەگەرێتەوە بۆ سالانی پێش زاین، کە لە ئێران دۆزراوەتەوە. ناوی راستینەی عەینەك (ئاینەك) بووە. "زەبیحوڵڵا"

# نەبەردی گەورە لە کەنارەکانی دیجلەدا

لە دەیەمین ڕۆژی مانگی دووەمی پایزی ساڵی (٣٢٨ ز) هەردوو سوپا کە یەکیان لە باکور بەرەو باشوور و ئەوی دیکەیان بە پێچەوانەوە دەهات، لە کەناری ڕووباری دیجلە و لەو کاتەی ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت، لە یەکدیی نێزیك بوونەوە.

شاپووری دووەم و قوورەی کوڕی موخلەب تێگەیشتن کە لەو ڕۆژەدا کاتی جەنگ نەماوە، ڕۆژی پایز کورتە و بە زوویی شەو رادەکشێت، بۆیە هەردووکیان فەرمانی دامەزراندنی خێوەتگەیان بۆ پشوودانی سەربازەکانیان دەرکرد.

کاتێك ئۆردووگە دامەزرا، شاپوور یەکێك لە ئەفسەرە باڵاکانی کردە فەرماندەی خێوەتگە، دەسەڵاتیی تەواوی پێدا و پێی وت: ئامادە بێت بۆ پەلاماری لە ناکاوی عارەبان و بە ئەفسەرەکان بڵێت تا سەربازەکان ئاگەدار بکەنەوە لەوەی ئەگەر دەنگی ئاژەڵیان بیست، بزانن ئەوە عارەبانن کە پێکەوە دەئاخڤن، چوونکە لەو ناوچەیە و لەو وەرزەی ساڵدا، جگە لە دەنگی کەمتیار دەنگی هیچ ئاژەڵێکی دیکە لە شەودا نایەت، پێویستە سەربازەکان هۆشیار بن و بە دەنگی کەمتیاریش نەخەڵەتێن، چوونکە لەوانەیە سەربازەکانی دوژمن لاسایی دەنگی کەمتیاریش بکەنەوە.

کەمتیارەکان لەو ناوچەیە بەردەوام مایەی ڕەنجی دانیشتووانی سنوورەکە بوون، چوونکە ئەوان وەك نەریتی ساسانییەکان، مردووەکانیان نەدەناشت و لە دەشتیان دادەنان تا گۆشتەکەیان لەنێو دەچوو، تەنیا ئێسکەکانیان دەمایەوە، ئەوجار ئێسکەکانیان لە چاڵێك دەنا. کەمتیارەکان بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر تەرمی مردووەکان، ئەوانیش هەر هەوڵێکیان دەدا بۆ ڕێگرتنیان، نەیاندەتوانی ڕێگریان بکەن و بێ سوود بوو، تا ئەوکاتەی لە چینەوە باروتیان بۆ ئێران هێنا، دوای ئەوەی ئەوان باروتیان بە مەودای چەند مەترێك دوور لە نێزیك مردووەکە بە بازنەیی دەڕشت و گڕیان تێ بەردەدا، بوونی باروت لای کەمتیار هێندە ناخۆش بوو کە کەمتیار دەڕۆیشت و بە هیچ شێوەیەك نەدەهاتەوە بۆ لای تەرمەکە.[1]

---

(١) لە چین و ئێران بەکارهێنانی باروت (بەڵام نەك بۆ کارەکانی جەنگی) زۆر کۆنە و چەندین سەدە پێش ئەوەی باروت بۆ جەنگ بەکار ببرێت و لە تۆپ و تفەنگ بکرێت، لە لایەن ئەوانەوە بۆ دەرکردنی کەمتیار

شاپووری دووەم فەرمانی بە فەرماندەی خێوەتگەکەی کرد تا ئەویش هەندێ سەرباز وەك گەشتی بنێرێت بۆ نێزیك خێوەتگەی عارەبان تا لە ژمارەی سەرباز و چۆنییەتی سوپاکەیان زانیاریی تەواو وەربگرێت، ئەگەر توانیان هەندێ لە سەربازە عارەبەکان کە پاسەوانن دیل بکەن، باشتر دەبێت و دەتوانرێت زانیاریی تەواو لەوان وەربگیرێت.

شاپووری دووەم نەیدەویست تا لەو شەوە پەلاماری لە ناکاوی دوژمن بدات، چوونکە ئەو زۆر پشت ئەستوور بوو بە گالیسکە جەنگییەکانی و دەیزانی کە ئەوان دەتوانن لە ڕۆژی دواتر زەربەی کاریگەر لە دوژمن بدەن، ئەگەر ڕۆژی دواتر جەنگ یەکلا نەبێتەوە لە دووەمین ڕۆژان یاخۆ سێیەمین یەکلا دەبێتەوە، مخابنە کە سەربازەکانی لە پەلامارێکی شەوانە بە کوشتن بدات، کە ئاکامەکەشی لەوانەیە سەرکەوتوو نەبێت، چوونکە بێگومان قوورەی کوڕی موخلەب کە سەردارێکی تازە نەبوو، بە دڵنیاییەوە ئەو شەوە بە تەواوەتی خۆی ئامادە دەکرد بۆ ڕێگرتن لە پەلاماری لەناکاوی ئەوان تا لە تاریکیدا نەکەوێتە کێشە.

هەر کە مەودایەك لە شەو ڕۆیشت، شاپوور بینی دەورەی لەشکری عارەبان ڕووناك بووە، زانی ئەوان مەشخەڵیان هەڵکردووە. پێکردنی مەشخەڵەکان و ڕووناککردنەوەی دەورەی ئۆردووگەکە، نیشاندەری ئەوە بوو کە سەرداری عارەبان چاوەڕوانی پەلاماری لەناکاوی ساسانییەکانی دەکرد و ئەو کارەی کردووە تا ئەوان سوود لە تاریکی شەو وەرنەگرن بۆ هێرشکردنە سەر لەشکرەکەی.

سەربازەکانی شاپوور بە توندی هەوڵیاندا تا هەندێ سەربازی عارەبان بە دیل بگرن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، چوونکە ئەوان زۆر بە توندی ئاگەداری خۆیان بوون، بە شێوەیەك دەجووڵان کە ساسانییەکان نەیاندەتوانی گەمارۆیان بدەن و دەستگیریان بکەن، بەرەبەیان هات و دەنگی کەڵەشێری ئاواییەکانی کەناری دیجلە بەرز بۆوە.

ئێرانییەکان دەنگی قووقەی کەڵەشێریان بە هێمای شادمانی پەروەردگار دەناسی، بۆیە کەڵەشێر لەنێو پەلەوەرەکاندا یەکێك بوو لە باڵندە بەڕێزەکان، بۆیە دەڵێین یەکێك لە باڵندە بەڕێزەکان بوو، چوونکە باڵندەی دیکەیش هەبوون کە خودان ڕێز بوون لە لای ئێرانییەکان، لەنێو ئەوانیشدا باڵندەی وەك شاهینیش خاوەن ڕێز بوو.

---

بەکار دەهات، لە بواری جەنگیش بۆ یەکەمجار بارووت لە لایەن جەنگیزخانی مەغول بەکار بردرا و بە شێوەی تۆپ نەبوو، بگرە بۆ تەقاندنەوەی دیواری قەڵاکان بەکار دەهێنرا. "زەبیحوڵڵا"

به بیستنی دەنگی کەڵەشێرەکانی ئاواییەکانی کەناری دیجلە، موزیکی جەنگ لە لەشکری ساسانی بەرز بۆوە و سەربازەکان لەخەو ڕابوون.

پێش ئەوەی خێوەتەکان کۆ بکرێنەوە، خواردنی ئەو ڕۆژە دەدرا بە سەربازەکان (جگە لەو ڕۆژانەی یەکسەر جەنگ ڕووی دەدا). لە سەرچاوە ئێرانییەکاندا هیچ باسێك لەبارەی ئەوە نەهاتووە کە جۆری خواردنی لەشکری ساسانییەکان چ بووە، بەڵام لە سەرچاوە ئەرمەنییەکاندا هاتووە کە بۆ هەر سەربازێك یەك باقە نان و هەندێك (کرۆت)[٢] و پەنیر دراوە، کە توانیویەتیی سەربازێك بە تەواوەتیی تێر بکات، تا ژەمێکی دیکە کە خۆراکیان پێدراوە، پێویستیان بە خۆراك نەبۆتەوە.

ئەو خۆراکەی لە بەیانی دەدرا بە سەربازەکان بۆ هەر سێ ژەمی بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارەی سەربازەکان بوو، ئەگەر سەربازەکانیش دەرفەتیان ببووایە لە سێ ژەمدا دەیان خوارد، ئەگەر بە ڕۆژیش بە هۆی جەنگەوە دەرفەتیان نەبووایە، ئەوا دوای ئەوەی نانی بەیانیان دەخوارد، نانیان نەدەخواردەوە، ئەوی دەمایەوە لە شەو، دوای کۆتایی جەنگدا دەیان خوارد.

لە ڕۆژانی پایزدا هەتاو درەنگ دێتەدەر، دوای ئەوەی خواردن دەخورا، ئۆردووگە هەڵگیرایەوە و ریزەکانی جەنگ ئامادە کران، هێشتا دنیا ڕووناك نەببوو، هەڵبەتە پێش ڕووناك بوونی دنیا ئەوان ناتوانن بجەنگن. لە لەشکری عارەبانیشدا بەشە خواردنی سەربازانی درا، ئێمە بە هۆی سەرچاوە ئەرمەنییەکانەوە دەزانین کە خواردنی سەربازانی قوروەی کوڕی موخلەب برێتی بووە لە نان و گۆشت و ئاردی کەشك (کەشکی کوتراو) و خورما، پێچەوانەی ئەوەی لەوانەیە لێك بدرێتەوە کە خورما لەوانە بووە خواردنی بەردەوامی سەربازی عارەبان بوو بێت، چوونکە لەو وەرزە خورما تازە پێگەیشتبوو، بۆ سەر خۆراکی ئەوان زیاد کرا بوو.

دوای ڕۆژهەڵاتن، شاپووری دووەم هێرشی دەست پێکرد، سوپاکەی بەسەر هەردوولا و ناوەند دابەش کردبوو، بەشێکیشی وەك یەدەگ لە پشت سوپاوە دانابوو.

---

(٢) (کرۆت برێتی بوو لە خواردنێکی خۆش و بە تام کە تا رادەیەك لە خۆراکی (کۆتلێت) دەچوو، تامیشی هەر لە کۆتلێت دەچوو، بەو شێوەیە دروست دەکرا کە گۆشتیان دەدا بە چێشتلێنەران و دەیانکوتا لەنێو دەسك و ئاوەنگ، دواتر پیازیش بە هەمان شێوە دەکوترا و ئاردی تێکەڵاو دەکرا، دواجار گۆشتی کوتراو دروست دەکرا و لە رۆندا سوور دەکرایەوە، لە شفتەی خۆمان دەچوو، ئەوان دوای تەواوبوونی کوتانی خاوەکەی، لە پارچەی خڕی گەورە دەیان بڕین و سووریان دەکردنەوە، هەر سەربازێك دانەیەکی پێ دەدرا بۆ رۆژێك، پەنیریش لەگەڵ نان دەدرا بە سەرباز، "زەبیحوڵڵا"

سەرداری عارەبانیش بە هەمان شێوە لەشکرەکەی دابەش کرد بوو، قوروە تەواوی مەنجەنیقەکانی لە بەرانبەر هەردوو لای خۆیدا دانا بوو، ئەو شێوازە لە ئارایشی جەنگی، بەگەڕخستنی گالیسکەکانی شاپووری لە یەك یاخۆ هەردوولا دەخستە کێشەوە، چوونکە مەنجەنیقەکان بەردبارانی گالیسکەکانیان دەکرد و ئەسپەکانیان دەکوشت، بەو شێوەیە رێگر دەبوون لەبەردەم جووڵەی گالیسکەکان.

ئەگەر شاپوور گالیسکەکانی بەرەو ناوەندی سوپای عارەبان ناردبایە، ئەو گریمانە هەبوو کە سوپای عارەبان پشت گالیسکەکان بگرن، لە ئاکامدا لە پشتەوە هێرشیان بکەنەسەر. بۆیە باش وابوو کە گالیسکەکان هێرش بکەنە سەر یەك لا یاخۆ هەردوولا، ئەگەر نەتوانن هێرش بکەنە سەریان، بەسەر یەك یاخۆ هەردوولای لەشکری دوژمندا بسووڕێنەوە و خۆیان بگەیەننە پشت دوژمن تا لە پشتەوە هێرش بکەن، بەڵام شاپووری دووەم نەیدەتوانی بگاتە پشت لەشکری عارەبان، چوونکە قوروە بە شێوەیەك لەشکرەکەی دامەزراند بوو کە لایەکی گەیشتبۆوە زێی دیجلە، لایەکەی دیکەیش گەیشتبۆوە ئاودڕێکی گەورە کە بە باران و لافاوە بەهارییەکانی دیجلە چێ ببوو، زۆر گەورە بوو، شاپووری دووەم نەیدەتوانی گالیسکەکانی لەو ئاودڕە بپەڕێنێتەوە و بگاتە پشت لەشکری دوژمن.

بەو شێوەیە شاپووری دووەم یاخۆ دەبووایە گالیسکە جەنگییەکانی نەخاتەکار و سوود لەو ئامێرە جەنگییە وەرنەگرێت، کە ئەگەر بە جوانی بکەوێتە کارەوە، دەبێتە چەکێکی زۆر کاریگەر یاخۆ هێرش بکاتە سەر ناوەندی سوپای دوژمن. ئەو نەیدەتوانی دەست لە بەکارخستنی گالیسکەکان هەڵبگرێت، ئەگەر بەکاریشی خستبووانە دەبووایە خۆی ئامادە بکات بۆ زیانی گەورە لە ریزەکانی پیادە و سوارەی لەشکرەکەی.

شاپووری دووەم دەیزانی (قوروەی کوڕی موخلەب) سەردارێکی لێهاتووە و ناکرێت بە ئاسانی شکست بخوات، بۆ ئەمە پێویستە شیرازەی لەشکرەکەی تێك بدرێت و باشترین چەك بۆ ئەوەی شیرازەی سوپاکەی لە ماوەیەکی کەمدا تێك بچێت هەمان گالیسکە جەنگییەکانن، شاپوور تەنیا چەند خولەکێك لە گومان و دوو دڵیدا بوو، دواجار بڕیاری خۆیدا و فەرمانی کرد تا گالیسکەکان هێرش بکەنەسەر ناوەندی لەشکری قوروە.

هاوکات لەگەڵ هێرشی گالیسکەکان بۆ ناوەندی لەشکری قوروەی کوڕی موخلەب، لە لای راستی شاپوورەوە پیادەکان و لە لای چەپی ئەویش سوارەکان هێرشیان بردە سەر هەردوولای لەشکری عارەبان.

هەر سوارێك لە سوارەکانی شاپووری دووەم زرێیان هەبوو کە سینگ و ملی داپۆشی بوون لە مەترسی شمشێر و تیر و تەور دەیپاراستن، سوارەکانیش زرێیان لەبەر بوو، بۆیان هەبوو بە ئارەزووی خۆیان چەکی جەنگی دیاری بکەن.

پیادەکانی شاپووری دووەم کە لە لای راستی ئەوەوە کەوتنەڕێ و بەرەو دوژمن رۆیشتن، لەگەڵ پیادەکانی عارەبان کە لە لای چەپی قوورەی کوڕی موخلەب بوون، کەوتنە جەنگ و عارەبە پیادەکان زۆر سەرسەختانە لە بەرانبەر پیادە ساسانییەکان جەنگان و بە باشی بەرگرییان دەکرد.

سوارەکانی شاپوور کە لە لای راستی شاپوورەوە کەوتنە جووڵە، ئەو پیادانەیان خستە بەر هێرش کە لە لای راستی قوورەی کوڕی موخلەب بوون، پیادەکانی عارەبان هەوڵیاندا تا بە نێزە درێژەکانیان رێ لە سوارەکان بگرن و هێرشەکەیان تێکبشکێنن.

قوورەی کوڕی موخلەب کاتێك بینی گالیسکەکان بەرەو ناوەڕاستی لەشکرەکەی دێن، بە ئەفسەرەکانی خۆی وت کە لە هەر بەشێك هەندێ خۆبەخشی پێویستە و دەبێت ئەسپی گالیسکەکان بکوژن، بەو رێگەیە کاتی پێویست بۆ گواستنەوەی مەنجەنیقەکان لە هەردوولای گۆڕەپانی جەنگ بەرەو ناوەڕاستی لەشکرەکەی دەستەبەر بکەن.

خۆبەخشە عارەبەکان بێ ترس لەو تیرانەی لە گالیسکەکانەوە بەرەو ڕوویان دەهاتن، بەرەو گالیسکەکان کەوتنە غاردان و خۆیان هەڵدەدایە سەر ئەسپەکانی (یان)[٣] و سکیان دەدڕین، پاش کەمێك گالیسکەکە دەوێستا، دەبینرا کە هەندێ لە عارەبان چەندین تیریان بەردەکەوت، وەك ژووژك تیریان لە جەستەدا دەبوو، وێڕای ئەوەش تا توانایان دەما هەوڵیان دەدا لە گالیسکەکان نێزیك ببنەوە تا ئەسپێکی گالیسکەکان لەنێو ببەن.

فیداکاری خۆبەخشەکان بووە مایەی تێکشکانی هەندێ لە گالیسکەکانی شاپووری دووەم، کاتیشی بۆ قوورەی کوڕی موخلەب دەستەبەر کرد تا هەندێ لە مەنجەنیقەکانی خۆی بەرەو ناوەڕاستی لەشکرەکەی بێنێت و گالیسکە جەنگییەکان بەردباران بکات.

مەنجەنیقەکان بۆ گالیسکەکان تا رادەیەك بە مەترسی گەورە دادەنران، چوونکە هەر جارێك مەنجەنیق کۆمەڵە بەردێکیان هەڵدەدا، هەر بەردێك لە کاتی بەرکەوتنی بە ئەسپ یاخۆ سەرنشینی گالیسکەکان، ئەگەر ئەوانی نەکوشتبایە ئەوا پەکی دەخستن، ئەوەش بە هۆی

(٣) هەر چوار ئەسپی گالیسکەکان ناویان هەیە، ئەو دوو ئەسپەی بە ماڵبەندەکەوە دەبەسترێنەوە بە ئەسپی (دیشلی) ناو دەبرێن، ئەو دوو ئەسپەش کە دەکەونە هەردوو لای ئەوان بە (یان) ناسراون. "زەبیحوڵڵا"

خێرایی زۆری گالیسکەکانەوە بوو کە لێخوڕی گالیسکەکان نەیاندەتوانی بە خێرایی گالیسکەکانیان بەرەو لای راست یاخۆ چەپ ببن یاخۆ بسوورێنەوە تا بەر بەردی مەنجەنیق نەکەون.

ئەسپەکانی گالیسکەکان کە کاریگەریی تووندی گۆڕەپانی جەنگیان دەکەوتە سەر، بە خێرایی بەرفەرمانی لێخوورەکانیان نەدەبوون، ئەوەش ماوەیەك کە چەند خولەکێکی دەخایاند تا لێخوورەکان بتوانن جموجۆڵی توند و سەرکێشی ئەسپەکانیان کەم بکەنەوە، ئەوان ناچار بکەن گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان بن و بۆ لای راست یاخۆ بۆ لای چەپیان ببەن، هەر لەو ماوەیەشدا بەردی مەنجەنیقەکان بەریان دەکەوت و ئەسپەکانی دەکوشت یاخۆ پەکی دەخستن.

شاپووری دووەم پێشبینیی کردبوو کە هێرشی گالیسکەکان بۆسەر ناوەندی لەشکری دوژمن، زیانی زۆر بەدواوە دەبێت، بەڵام ناچار بوو تا فەرمانی هێرشی گالیسکەکان بۆ دڵی سوپای عارەبان دەربکات.

قوروەی کوڕی موخلەب دەرفەتی تەواوی دەست نەکەوت تا هەموو گالیسکەکان لە هەردوو لای لەشکرەکەیەوە بۆ ناوەندی مەیدانی جەنگ بگوازێتەوە، ریزی دووەمی گالیسکە جەنگییەکان کەوتنە هێرشکردن، ئەمجارە زیانی کەمتر بەر گالیسکەکان کەوت و ئەوان گەیشتنە ناوەندیی لەشکری قوروەی کوڕی موخلەب، بە رادەیەك گووشاریان خستەسەر کە ناچاریان کردن تا پاشەکشە بکات، بەڵام ئەو هەوڵی دەدا تا پێوەندیی خۆی لەگەڵ هەردوو لای لەشکرەکەی نەپچڕێنێت و دەیزانی ئەگەر ناوەندی لەشکر چۆڵ بکات، ساسانییەکان دێنە شوێنەکانیان، دوای ئەوە هەردوولای راست و چەپی لەشکری عارەبان دەکەونە گەمارۆی ئەوان.

لە لای چەپی قوروەی کوڕی موخلەب سەربازە پیادەکانی بە باشی دەجەنگان و بەرگری باشیان دەکرد، بەڵام ئەوانەی لای راست توانای بەرگریان لە بەرانبەر سوارەکاندا نەبوو، نەیان دەتوانی رێ لە پێشڕەوی سوارەکانی شاپووری دووەم بگرن، سوارەکان توانیان هێزی بەرگری ئەوان تێك بشکێنن و بگەنە پشت دڵی لەشکری عارەبان، بەم شێوەیە تەواوی ناوەندیی لەشکری عارەبان گەمارۆ درا. قوروەی کوڕی موخلەب کە دەیزانی ئەگەر دیل ببێت دووچاری سزای توند دەبێت، چوونکە لە جەنگەکانی پێشتر دیلە ئێرانییەکانی کوشت بوو، بۆیە هەوڵیدا هەڵ بێت، بەڵام رێگەی هەڵاتن گیرا بوو، شاپووری دووەم هەر کە زانی بووی سوارەکانی گەیشتوونەتە پشت ناوەندیی لەشکری عارەبان، فەرمانیدا تا ئەو سوارانەی لە یەدەگبوون بۆ

یارمەتی پیادەکانیان لە لای چەپ بچن و توانای بەرگری ئەوان بشکێنن، ئەوان لە ماوەیەکی کەمدا توانیان ئەو کارە بکەن و بگەنە پشت ناوەندیی لەشکری عارەبان و تێکەڵ ببنەوە بە سوارەکانی دیکە، بەم شێوەیە تەواوی لەشکری عارەبان کەتنە گەمارۆوە.

رۆژی پایز کورت بوون و بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت، شاپوور دەیزانی سەرداری عارەبان پیاوێکی سەرسەختە، بۆیە فەرمانیدا تا مەشخەڵەکان دابگیرسێنن، بۆ ئەوەی کاتی تاریك بوونی دنیا، تەواوی هێڵی گەمارۆکە ڕووناك ببێت.

پاشای ساسانی گریمانی ئەوەی کرد کە لەوانەیە ئەو شەوە سەرداری عارەبان بیەوێت رابکات و خۆی لە ناوچەی گەمارۆدراو رزگار بکات، بۆیە فەرمانی بە فەرماندەکانی سوپاکەی کرد تا لە بەرەبەیاندا ئاگەدار بن و نەهێڵن سەرداری عارەبان کە ژمارەیەکی زۆر ئێرانی کوشت بوون، هەڵبێت و خۆی لە دەست سزاکانی دەرباز بکات.

ئەو شەوە شاپوور دەیتوانی پەیام بۆ قوورەی کوڕی موخلەب بنێرێت تا خۆی بەدەستەوە بدات، بەڵام ناردنی وەڵام بەو شێوەیە واتای بەڵێنی لێ خۆش بوون و دەرباز بوونی قوورەی کوڕی موخلەب بوو لە سزادان، شاپووری دووەمیش حەزی نەدەکرد بەڵێنی پارێزراوبوون بە قوورە بدات.

بەر لەوەی شەو بە تەواوەتی بگات، هەور ئاسمانی داپۆشی، لەوانە بوو باران ببارێت، بۆیە شاپوور دووبارە سەردارەکانی راسپارد تا وریاتر بن و نەهێڵن سەرداری عارەبان سوود لە تاریکی و باران و کورتی مەودای بینین وەربگرێت و ڕابکات. لە نیوەی شەو بە دواوە باران دەستی بە بارین کرد و تا کاتی دنیاڕووناك بوون بەردەوام بوو، ئەو شەوە بۆ سەربازانی عارەبان و ساسانی زۆر سەخت بوو، ئەوان هیچ دەرفەتیان بۆ پشوودان نەبوو، لە ئامادەباشی تەواودا بوون. عارەبان مەترسی پەلاماری شەوانەیان هەبوو، ساسانییەکانیش دەترسان لەو شەوەدا قوورەی کوڕی موخلەب رابکات.

لەوانەیە ئەو شەوە بۆ هەندێك لە سەربازەکانی ساسانی لەژێر بارین باراندا هێندە سەخت و درێژ بوو، بەساڵێك هەبوو لەلایاندا، بەڵام بە هەر حاڵ دنیا ڕووناك بۆوە و باران وێستا، ئەوان لە مۆکەیەکی سەخت و درێژ رزگاریان بوو.

شاپوور دەیزانی ئەگەر فەرمانی هێرش دەربکات، سەربازەکانی کە تا بەرەبەیان و لەژێر باراندا نەخەوت بوون، ناکارن بە باشی بجەنگن، چوونکە گەمارۆی دوژمنی دابوو، بۆیە

فەرمانیدا تا سەربازەکانی پشوو بدەن، تەنیا ئەو ژمارە لە سەربازی سوار و پیادە و لە گالیسکە جەنگییەکانی هێشتەوە کە بۆ هێڵەکانی گەمارۆ پێویست بوون.

ئەگەر ئەو شەوە باران نەباری بووایە، لەو رۆژەدا شەڕڤانانی عارەبان دووچاری تینویەتیی دەبوون، ئەگەر خۆشیان دووچاری تینویەتیی نەبووبانە، ئەسپەکانیان لە تینوویەتیی بە بێ توانا دەکەوتن، چوونکە ئەسپ ئاژەڵێکە کە بەرانبەر بە تینویەتیی بە هەستە و بە پێچەوانەی وشتر بەرگەگرتنی بۆ تینوویەتیی زۆر کەمە، بەڵام بارانی ئەو شەوە تەواوی ئەو قۆڵت و چاڵانەی لە ناوچەی لەشکری عارەبان هەبوون پڕ ئاو کرد بوون، ئەوان توانیان ئەسپەکانیان بە ئاوی نێو ئەو چاڵانە تێر ئاو بکەن و خۆشیان ئاو بخۆنەوە.

لەشکری عارەبان لایەکی خۆیان بە ڕووباری دیجلەوە تووند کردبوو، بەڵام دوای ئەوەی گەمارۆدران، چیدی پێوەندییان بە ڕووباری دیجلەوە نەما، شاپووری دووەم کە دەیزانی ئاو بۆ لەشکر چەندە پێویستە، فەرمانی کرد تا بە توندی ئاگەدار بن بۆ ئەوەی قوروەی کوڕی موخلەب نەتوانێت جارێکی دیکە دەستی بگاتە ئەو ئاوە.

ئەو رۆژە ڕووداوێکی بەرچاو ڕووی نەدا، بەڵام لەگەڵ تاریك بوونی دنیا، دووبارە باران دەستی بە بارین کرد، هێندە باری کە تەواوی کەند و لەند و ئاودڕەکانی سنووری لەشکری عارەبانی پڕ ئاوکرد، بەڵام باران تا بەیانی بەردەوام نەبوو.

لە بەرە بەیانی دووەمین رۆژی گەمارۆ خۆرتاوێکی گەرم کە لە تاوی بەهار دەچوو دەستی بە درەوشانەوە کرد، هەرچەندە شاپوور توانی هەبوو فەرمانی هێرش بدات، بەڵام بۆ ئەوەی زیان بەر لەشکرەکەی نەکەوێت، بە هۆی ئەوەی دوژمن لە گەمارۆ دابوو، ئەو کارەی نەکرد، تەنیا دووبارە ئاگەداری سەردارەکانی کردەوە تا وریا بن، چوونکە لەوانە بوو سەرداری عارەبان بۆ شکاندنی گەمارۆکەی سەر لەشکرەکەی، هێرش بکات.

شاپووری دووەم بە سەردارەکانی لەشکرەکەی وت: لە لای رۆژهەڵاتی سەرداری عارەبان ڕووباری دیجلەیە، لای رۆژئاواشی ئاودڕێکی گەورەیە، بە دووری دەزانم کە سەرداری عارەبان بۆ دەربازبوونی لە یەکێك لەو دوو لایەوە هێرشمان بکاتە سەر، چوونکە لە هەردوولا بەربەستی لە پێشە و لەوانەیە تەواوی قورسایی خۆی لە لای باشوور یاخۆ باکور تاقی بکاتەوە و گەمارۆکە بشکێنێت و خۆی دەرباز بکات. ئەگەر لە هەر یەکە لەو دوو ئاراستەیەدا بازنەی گەمارۆکە بشکێنێت، رێگەی هەڵاتن بە ڕووی ئەودا دەکرێتەوە، لە کاتێکدا کە لە هەردوو ئاراستەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەر یەکێك لە بەربەستەکان دەکەوێت.

پێشبینیی شاپووری دووەم ڕاست دەرچوو، دوای ئەوەی کەمێك لە ڕۆژ ڕۆیشت و هەوا بەرەو گەرمی چوو زەوی ئەو دەڤەرە کە بە باران تەڕ ببوو، بە هۆی هەتاوی گەرمی ئەو ڕۆژەوە وشك بۆوە، قوورەی کوڕی موخلەب بە تەواوی هێزییەوە بەرەو باکور هێرشی کردە سەر لەشکرەکەی شاپوور.

ئەو ڕۆژە سەرباز و ئەسپەکانی ساسانییەکان پشووی تەواویان دابوو، دەستبەجێ و دوا بە دوای هێرشی عارەبان، ئەوانیش هێرشی بەرانبەریان دەست پێ کرد و هێرشی گالیسکە جەنگییەکان هێندە بەهێز بوو کە سەرداری عارەبان ترسی لە دەست دانی هەموو سەربازەکانی خۆی لێ نیشت، بۆیە دەستبەجێ فەرمانی پاشەکشەی دەرکرد، تا نیوەڕۆ هیچ جموجۆڵێکی نەکرد، بەڵام هەر کە هەتاوی پایزی گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان، بوو بە نیوەڕۆ (قوورەی کوڕی موخلەب) هێرشێکی سەختی بەرەو باشوور دەست پێکرد، بەڵام نەیتوانی گەمارۆکە بشکێنێت، دوای کەمێك ئیدی شەو ڕاشکا.

دنیا فێنك و ساماڵ بوو، شاپووری دووەم بە سەردارەکانی خۆی وت: چیدی قوورە توانای هێرشی نییە، ئەوە ئێمەین کە ئەمجارە هێرش دەکەین، لەگەڵ بەرە بەیاندا لە هەر چوار لاوە هێرش دەکەینە سەر ئەوان، هەر کەسێك خۆی بەدەستەوە نەدا بیکوژن، ئەوەی خۆی ڕادەست کرد، چەکی بکەن و بە دیل بیگرن، دڵنیا بن لە ئەوەی قوورە نەتوانێت ڕابکات.

ڕۆژی دواتر لە هەر چوار لاوە لەشکری شاپووری دووەم هێرشی کردە سەر لەشکری عارەبان و بە شێوەیەکی هەست پێکراو دەردەکەوت، کە ئەوان ورەی خۆیان بەر داوە، ئەوان وەك یەکەمین ڕۆژ و ڕۆژی دواتر شەڕیان نەدەکرد، دەستە دەستە خۆیان ڕادەستی لەشکری ساسانی دەکرد، دوای چەککردن دەگوازرانەوە پشت مەیدانی جەنگ.

تەنیا دەستەیەك لە سەربازانی عارەبان لەو ڕۆژەدا بە باشی دەجەنگان، ئەوانیش پاسەوانەکانی قوورەی کوڕی موخلەب بوون، کە تا دوا کەس جەنگان، کاتێك قوورەی سەرداری عارەبان دیل بوو، تەنانەت یەکێك لە سەربازە پاسەوانەکانی بە پێوە نەمابوو، دوا پاسەوانەکانی یان کوژرابوون یاخۆ بریندار ببوون و توانای جەنگیان نەما بوو.

ڕۆژی دواتر قوورەی کوڕی موخلەبیان بردە لای شاپووری دووەم، ئەو پیاوێکی باڵابەرزی چوار شانە، چاو زەرد و پرچ سوور بوو. شاپووری دووەمیش لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو، ریشێکی تەنك بە ڕووخسارییەوە بوو.

شاپوور گەنجێکی جوان بوو کاتێك قوورەیان بۆ لای ئەو هێنا، هەردوولا دووچاری سەرسووڕمان هاتن، سەرسووڕمانی قوورە لە جوانی شاپوور بوو، سەرسووڕمانی شاپووری دووەمیش لە ناشیرینی قوورە بوو.

قوورەی کوڕی موخلەب زمانی فارسی یاخۆ زمانی ساسانی پەهلەوی دەزانی، بۆیە شاپوور پێویستی بە وەرگێڕ نەبوو بۆ قسە کردن لەگەڵ ئەودا. کاتێك موخلەبیان هێنا بۆ لای شاپوور، ماندوو دیار بوو، بۆیە شاپووری دووەم مۆڵەتیدا تا دابنیشێت و پێی وت: هیچ کات جەنگم لەگەڵدا نەکردی، بگرە ئەوە تۆ بووی کە هەردەم دەستپێشخەریت لە جەنگدا دەکرد و هێرشت دەکردە سەر شارەکانی وڵاتانی ژێردەستی من و ژن و پیاوە گەنجەکانت دیل دەکرد و ئەوانت لە بازاڕەکانی فرۆشتنی کۆیلەکاندا دەفرۆشت. ئەو دیلانەشت دەکوشت کە نەدەفرۆشران، بە راست ئەی کوڕی موخلەب بۆچی ئەو دیلانەت دەکوشت کە نەدەفرۆشران؟.

قوورەی کوڕی موخلەب وتی: چوونکە نەمدەتوانی خواردنیان پیێ بدەم، تێرکردنی ئەوان لە توانای من بەدەر بوو.

شاپووری دووەم وتی: هەرچەندە ئەستەمە پیاوێکی وەك تۆ نەتوانێت ژمارەیەك لە دیلەکان نان بدات، بەڵام گریمان کە توانای تێرکردنی ئەوانت نەبوو، بۆچی ئازادت نەدەکردن تا بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان و ئەوانت دەکوشتن؟.

قوورە بە رادەیەك لەو پرسیارە دووچاری سەرسووڕمان هات کە بە شاپووری وت، تۆ چاوەڕوان بووی من دیلەکان ئازاد بکەم؟.

شاپووری دووەم وتی: بەڵێ، چوونکە تۆ ژن و پیاوە گەنجەکانت بە دیل دەگرت تا لە بازاڕەکاندا بیانفرۆشی، کاتێك کەس نەیدەکڕین، ئیدی ئەوان لە لای تۆ بێ بایەخ بوون، نەدەبوو زەحمەتی کوشتنی ئەوان بە ئەستۆ بگری. ئایا وا باشتر نەبوو تا ئازادییان بکەی و رێگە بدەی بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان؟.

قوورە وەڵامی دایەوە: من نەمدەتوانی ئەوان ئازاد بکەم.

شاپووری دووەم وتی: چ بابەتێك رێگر بوو لەوەی تۆ نەتوانی ئەوان ئازاد بکەی؟.

ئەو وتی: ئەوان ئێرانی بوون، ئەمە رێگر بوو بۆ ئازادکردنیان.

شاپووری دووەم وتی: بۆ ئێرانییەکان چیان بەرانبەر بە تۆ کردووە، کە هێندە دوژمندارانە سەیریان دەکەی؟.

قوورە وتی: نازانم بۆچی دوژمنایەتیم لەگەڵ ئەواندا هەبوو.

شاپوور وتی: هۆکاری هێرشی تۆ بۆ سەر شار و گوندەکانی من چ بوو، هۆکاری کوشتن و تالانکردن و بە دیلگرتنی شوێنکەوتووانی من لەلایەن تۆوە چ بوو؟.

قوروە وتی: چوونکە تۆ منداڵی و من وامزانی داگیرکردنی شارەکانت ئاسانە.

شاپوور وتی: تۆ هێرشت کردووە و ژن و منداڵی بێ تاوانت کوشتووە، ئایا تۆ خۆت ژن و منداڵت نییە؟.

قوروە وتی: لە رابردوودا کە گەنج بووم، حەفتا و پێنج ژنم هەبوو، ئێستە ژمارەی ژنەکانم کەمترە.

شاپوور وتی: ئەو کەسەی خودان هحفتا و پێنج ژن بێت، دەبێت ژمارەیەکی زۆر منداڵی هەبێت، ئەوەی منداڵیشی هەبێت، بەزەیی بە منداڵانی خەڵکانی دیکە دێتەوە. ئایا لە دڵی تۆدا بەرانبەر بە منداڵانی شوێنکەوتووانی من، هیچ دڵۆڤانی و بەزەییەك نەبوو؟.

قوروە زۆر بە سانایی و بێباکی بەرسڤی دایەوە: نەخێر.

کاتێك گوێ لە وتووێژی نێوان قوروە و شاپووری دووەم دەگرین، بۆمان دەردەکەوێت کە عارەبان ئەو دەمە هێندە سادە و ئاسایی بوون کە نەیان توانیوە درۆ بکەن یاخۆ بە دووڕوویی دەرکەون، ئەو سادەییە تا ناوەڕاستی سەدەی یەکەمی کۆچیش بەردەوام بوو. بەڵام دواتر عارەبان ئەو سادەییەیان لە دەستدا هۆکارەکەشی هاتنی ئیسلام بوو، کە بە هۆی برەوگرتنی ئیسلام و فرەوانبوونی سنوورەکانی ئیسلام کە لە لای رۆژهەڵات تا ئەندۆنیزیای ئێستە و لە لای رۆژئاوا تا ئیسپانیا بڕۆن، عارەبان لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە تێکەڵاوبوون، ئەو تێکەڵاوبوونەش بووە هۆی وەرگرتنی خووخدەی نەتەوەکانی دیکە و ئەوان فێری درۆ و دووڕوویی بوون، چوونکە وایاندەزانی دەتوانن ڕاستی بشارنەوە و فێری دووڕوویی بوون، تا خۆیان پێچەوانەی ئەوە دەربخەن کە هەبوون، بەڵام تا ئەوکات کە سەدەی چوارەمی زاینی بوو، ئەوان هەروا سادە و بێ درۆ و ریا بوون و نەیاندەتوانی درۆ بکەن و ریاکاربن، هەموو ئەوەیان دەوت کە لە دڵیاندا بوو و هیچ بابەتێکیان نەدەشاردەوە.

قوروەی کوڕی موخلەب کاتێك چووە لای شاپوور، دەیزانی کە راستگۆییەکەی دەبێتە هۆی مردنی، بەڵام نەیتوانی درۆ بکات، ئەوەی لە دڵیدا هەیبوو، بە زمانیدا دەهات دەریدەبڕی.

شاپووری دووەم وتی: تۆ لە چەند هێرشێکدا نێزیکەی سەد هەزار کەس لە خەڵکی منت کوشت و نێزیکەی سەد هەزار کەسیشت بە دیل گرت، کە ئەوانیش بە کوژرا و هەژمار

دەکرێن، چوونکە هیچ یەکێك لەوانەی تۆ دیلت کردن، نەگەڕاونەتەوە، وەك خۆشت دانت پێدا ناوە، هەندێك لە ئەو کەسانەت کوشتووە.

قوروە وتی: شتێکیان بە تۆ وتووە کە ڕاست نییە.

شاپووری دووەم وتی: ئایا تۆ خەڵکی منت نەکوشتووە؟.

قوروە وتی: خەڵکی تۆم کوشتووە، بەڵام پتر لە چل و پێنج هەزار کەس نەبووە.

شاپوور وتی: وا دیارە چل و پێنج هەزار کەس بۆ تۆ ژمارەیەکی زۆر بێ بایەخ بێت.

قوروە وتی: جیاوازیی زۆری لەگەڵ سەد هەزار هەیە.

شاپوور وتی: چەند کەست بە دیل گرت؟.

قوروە وتی: بە دروستی بیرم نەماوە، بەڵام پێموایە نێزیکەی حەفتا هەزار کەس دەبوون.

شاپووری دووەم وتی: ئایا ئەو حەفتا هەزار کەسەش وەك کوژراوەکان هەژمار دەکرێن، من ژمارەی هەر یەکە لە کوژرا و دیلەکانم بە سەد هەزار کەس دیارکردووە. گریمان ئەوەی من نادروستە و ئەوەی تۆ دروستە، بە دان پیانانی خۆت، سەد و پازدە هەزار کەست لە شوێنکەوتوو و خەڵکی من لەنێو بردووە.

قوروە وتی: مەبەستت لەو وتەیە چییە؟.

شاپوور وتی: نەریتی عارەبان بەرانبەر بکوژەکان برێتییە لە تۆڵەکردنەوە، بۆ هەر کەسێك کە دەکوژرێت، کەسێك دەکوژنەوە تۆ سەد و پازدە هەزار کەست کوشتووە. هیچ کات دانیشتووانی ئەو شارانەی خۆیان بەدەستەوە دەدەن ناکوژرێن و تالاَن ناکرێن، بەڵام تۆ ئەو شار و گوندانەی بێ جەنگ خۆیان بەدەستەوە دەدا، تالاَنت دەکرد و دانیشتووانەکەت بە دیل دەبردن.

قوروە وتی: بەڵام پشتڕاستی بکەوە، کە من ئەوانم نەکوشتووە.

شاپووری دووەم وتی: بۆ دیل گرتنی ژن و پیاوە گەنجەکان و بردنیان بۆ بازاڕی کۆیلە فرۆشان، هیچ جیاوازیی هەیە لەگەڵ کوشتنی ئەوان؟ تۆ تالاَنی ئەو خەڵکەت دەکرد، کە لە شارەکاندا خۆیان بەدەستەوە دابوو، بۆ هەندێ لەو خەڵکانە مردن و لە دەست دانی ماڵ و بوونیان وەك یەك وایە، چوونکە خەڵك تەمەنێك هەوڵیان داوە ڤێجا ئەو سامان و ماڵەیان کۆکردووەتەوە، کە ئەوەش ئامرازی ژیانی منداڵەکانیانە، کاتێك ئامرازەکانی ژیانیان لێ زەوت بکرێت، وەك ئەوەیە ژیانیان زەوت بکرێت، ئیدی لەوانەیە هیچ ئامرازێکی دیکە بۆ ژیان نەدۆزنەوە، ئەو دەمەش هەژاری و نەداری و نەبوونی لەنێویان دەبات. کەواتە تۆ ئەی

کوڕی موخلەب ڕەتی مەکەوە کە لە شارە داگیرکراوەکاندا خەڵکت نەکوشتووە، چوونکە تالانکردنی شار و بە دیل گرتنی ژن و پیاوانی گەنج، هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ مردن نییە، هەندێ کەس لە کیس چوونی ماڵ و سامانیان لە مردن خراپتر دەزانن.

قوورە وتی: ئەو بویەرانە لە جەنگدا ڕوودەدات، ئەی تۆ لە جەنگی مندا، سەربازەکانی منت نەکوشتووە.

شاپووری دووەم وتی: جەنگی من و هێرشەکانی تۆ جیاوازن، تۆ بۆ تالان و دیل بردن دەهاتی، منیش بۆ بەرگری هاتووم، من بۆ دەستدرێژی نەهاتووم، بە پێچەوانەوەی تۆ، ئەگەر ئەمجارەش تۆ نەهاتبای و هێرشت نەکردبایە، من جەنگم لەگەڵتدا نەدەکرد، کەواتە تۆ جەنگەکانی خۆت و من وەك یەك مەزانە، تۆ تاوانباری و جەنگەکانت ناڕەوا بوون، من بەرگریکارم و جەنگەکەم ڕەوا بووە، خۆت دەزانی من نەمویستووە لەگەڵ تۆدا بجەنگم، تۆ هاتوویت بۆ جەنگی من.

قوورە وتی: ئەو قسانە بۆ دەکەی و مەبەستت چییە؟.

شاپووری دووەم وتی: مەبەستمە کە پەسەندت بێت، کە پیاوێکی بێ بەزەیی و تاوانباری.

قوورە وتی: لەوانەیە من بە مەزەندەی تۆ بێ بەزەیی بم، بەڵام تاوانبار نیم، ئەو وتەیەی تۆ وەك جوێن بەرانبەر خۆم دادەنێم، بەڵام بۆ ئەوەی مەبەستی کۆتایی تۆ بزانم، پەسەندی دەکەم کە تاوانبارم، ئێستە تۆ پێم بڵێ کە چیت دەوێت؟.

شاپوور وتی: دەمەوێت پێت بڵێم کە پێویستە سزات بدەم.

قوورە وتی: چوونکە لە جەنگدا شکستم خواردووە، سزاواری سزادانم؟.

شاپووری دووەم وتی: نەخێر، ئەگەر تۆ پێش ئەوەی تالان و کوشتنی شوێنکەوتووانی من بکەی، بۆ جەنگی من هاتبای و لە جەنگی مندا شکستت بخواردایە، من تەنیا سزایەکی مادیم لێ وەردەگرتی و سزام نەدەدای، چوونکە لە کۆنەوە سزای سەرکردەیەك کە جەنگ هەڵدەگیرسێنێت و شکست بخوات، سزای مادی بووە، بەڵام تۆ زۆر جار هێرشت کردووەتە سەر وڵاتەکانم و بە دان پێدانانی خۆت سەد و پازدە هەزار کەست لە خەڵکی من کوشتوە، من ناتوانم لە تاوانەکانت خۆش ببم.

قوورە وتی: دەتەوێت چیم لەگەڵدا بکەی؟.

شاپووری دووەم وتی: هەمان ئەو کارەی لە وڵاتی تۆدا لەگەڵ بکوژی کەسێکدا دەکرێت، تۆ سەد و پازدە هەزار کەست کوشتووە، بەپێی نەریتی وڵاتی خۆت دەبێت سەد و پازدە هەزار جار بکوژرێیتەوە، من تەنیا یەکجار دەتکوژم.

قوورەی کوڕی موخلەب وتی: منەتم لەسەر مەکە کە تەنیا یەکجار من دەکوژی، هیچ کەس لە جارێك پتر ناتوانێت بەرانبەرەکەی بکوژێت، منیش بۆ کوژران ئامادەم.

شاپووری دووەم وتی: پشتڕاستی دەکەمەوە کە پیاوێکی ئازا و دلێری.

قوورە وتی: مادام ئازایەتیی من پەسەند دەکەی، من بپارێزە.

شاپووری دووەم وتی: مەبەستت چییە؟

قوورە وتی: لە وڵاتی تۆ سەردارێکی وەك منت دەست ناکەوێت، تۆ دەتوانی لە جەنگەکاندا سوودی زۆر لە من وەربگریت، کەواتە چاوپۆشی لە کوشتنی من بکە، تا من بە پۆستێکی بەرزەوە بێمە نێو سوپای تۆ.

شاپووری دووەم وتی: ئەگەر ئەو داوایەی تۆ پەسەند بکەم، وەڵامی ئەو سەد و پازدە هەزار کەسە چۆن بدەمەوە کە لەلایەن تۆوە لەنێو براون؟.

قوورە وتی: ئەوان لەنێو چوون و لە تۆ ناپرسن بۆ ئەوت بەخشیوە.

شاپووری دووەم وتی: ئەوان لەم جیهانە نەماون، بەڵام لەنێونەچوون و زیندون، ئەوان لە نیروانان (بەهەشت) لەوێندەر ژیانی هەمیشەییان هەیە، بێگومان ڕۆژێك من دەخەنە ژێر پرسیار کە بۆچی دەستم لە سزادانت هەڵگرت. هەروەها کەسوکاریان لە وڵاتی مندا نیشتەجێن و لێرە دەژین، چۆن دەتوانم بەوان بڵێم دەستم لە سزای تۆ کێشایەوە؟.

قوورەی کوڕی موخلەب دوای ئەوەی زانی شاپوور هەر دەیکوژێت، وتی: ئایا تۆ من دەکوژی؟.

شاپوور وتی: نەخێر، بگرە پیاوکوژەکان دەتکوژن.

قوورە وتی: بانگیان بکە تا سەرم لە لاشەم جیا بکەنەوە.

لەبارەی شێوەی کوشتنی قوورەی کوڕی موخلەب دوو گێڕانەوە هەیە.

یەکەمیان ئەوەیە کە لە بەردەم شاپووردا سەری ئەویان لە لاشەکەی جیاکردۆتەوە، بەپێی گێڕانەوەکەی دیکەیش گوایە دوای کونکردنی هەردوو شانی، پەتیان بەناو کونەکاندا تێپەڕاندووە و بە دارێکەوە هەڵیان واسیوە تا ئەو کاتەی مردووە. بەڵام بە وتەی هەندێ لە مێژوونووسانی وەك ماریژان مۆڵەی فەرەنسایی کە وتوویانە کونکردنی هەردوو شانەکان و

تێپەڕکردنی پەت بە ناویاندا ڕاست نەبووە، تەنیا پەتیان بە شانیاندا سووڕاندۆتەوە، بەم شێوەیە هەڵیانواسیون.

ئەگەر قوروەی کوڕی موخلەب بە شانەکانی هەڵواسرا بێت، بەو شێوە بووە کە لە جیاتی کونکردنی شانەکانی، هەردوو دەستەکانیان بەستووەتەوە و پەتەکەیان لەژێر هەردوو شانییەوە تێپەڕاندراوە، دواتر بە شوێنێك هەڵواسراوە، ڤێجا تا مردووە بە هەڵواسراوی ماوەتەوە. هەڵبەت لە سەرەتادا ئەو هەڵواسینە زۆر ئازاربەخش نییە، بەڵام بەرەبەرە تا دێت بە هۆی کێشی لاشەی مرۆڤەوە ئازارەکە پتر دەبێت و دەگاتە ئەو رادەیەی لە ئازاری لە خاچ درانی کەسێك کەمتر نابێت.

بە گشتیی بە هۆی گێڕانەوە جیاوازەکانەوە، نەزانراوە قوروە سەری بڕدراوە یاخۆ بەو شێوەیەی وترا هەڵواسراوە، تا ئەوکاتەی بە ئازارەوە مردووە یاخۆ سەری لە لاشەی جیاکراوەتەوە.

دوای کوژرانی قوروە ئیدی عارەبان تا ماوەیەك هێرشیان نەکردە سەر ئێران، تا ئەو کاتەی کوڕی قوروە کە ناوی سەعد بوو، هێرشی کردە سەر ئێران، لە کاتی خۆیدا باسی لێ دەکەین.

بۆ هاوینی ساڵی داهاتوو شاپوور وەك نەریتی ئەو سەردەمە بۆ هەمەدان ڕۆیشت، ئەو شارە نەتەنیا لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا، بگرە لە سەردەمی ساسانییەکانیش هەر پایتەختی هاوینە بووە و پاشاکانی ئەو دوو زنجیرەیە لەو شارە و لە بناری شاخی ئەڵوەند کۆشکی زۆریان چێ کردبوو، وەرزی هاوینیان تێیدا بەسەر دەبرد، بە وتەی ئەرمەنییەکان شەوان هێندە سارد دەبوو، تەنانەت لە شەوانی هاویناندا نەدەتوانرا لە دەرەوە بخەون، بۆیە دەبووایە لە ژوورەوە بن و دەرگەکانیش داخەن، بۆ ئەوەی سەرمایان نەبێت.

ئەوکاتەی شاپووری دووەم لە هەمەدان بوو، هەواڵی هێرش کردنە سەر ئازەربایجانیان پێدا، وتیان پیاوێکی موو زەردی لەسەر سپی و باڵا بەرز کە چاوەکانی شینن، سەرکردەی ئەو هێرشەیە و بەم زووانە دەگاتە دەریای ورمێ.

ئەوانەی هێرشیان بۆ ئازەربایجان کرد بوو لە پاشماوەکانی ئۆرارتووەکان هەژمار دەکرێن، ئەو نەتەوەیە ئێستە لە چوارچێوەی کۆمەڵگەیەکی تایبەتدا نەماون، بەڵام پاشماوەکانیان لەنێو نەتەوەی چەرکەس لە قەوقازیادا دەردەکەون، لە تایبەتمەندییەکانی نەتەوەکان لە ڕووی رەچەڵەکەوە ئەوەیە کە هیچ نەتەوەیەك بە تەواوەتی لەنێو ناچێت، هەندێ لە نموونەکانی دەمێنن، ئەو بابەتە هێندە وردە، تەنانەت ئێستە و دوای یەك ملیۆن ساڵ دەتوانرێت هەندێك

له مرۆڤەکانی رەچەڵەکە کۆنەکان ببینرێن، تەنانەت ئەگە لەو ماوە دوورودرێژەدا زۆریش گۆڕا بن.

رەچەڵەکی ئۆرارتوو تا ئێستەش ناوەکەیان بە شێوەی ئارارات (هەمان شاخی ناسراوی ئارارات) ماوە، خەڵکانێك بوون باڵابەرز و چوارشانە، مووەکانیان بۆر و چاویان شین بووە، پێش مادەکان لە باکوری ئێرانی ئێستە، بە تایبەت لە ئازەربایجان ژیاون، پاشماوەی شارستانییەتی ئەوان لە هەزار و پێنج سەد ساڵ پێش زاین دەست کەوتووە.

ئەو لێکۆڵینەوانەی کەوتوونەتە بەردەست لە ساڵی (١٩٥٠ ز) وا دەردەخەن کە لە بەشێك لە قەوقازیا و بۆ نموونە لە ئەرمەنستان، نەتەوەی ئۆرارتوو توانیویانە ئاسن بتوێننەوە، هەروەها نەتەوەی ئۆرارتوو توانیویانە ئاسن خەست بکەن، واتە هەر ئەو کارەی کە ئەمڕۆ دەکرێت. بە هۆی ئەو لێکۆڵینەوانەوە لێکۆڵەرە مێژووییەکان گەیشتنە ئەو باوەڕەی نەتەوەی ئۆرارتوو یەکەمین نەتەوەبوونە کە ئاسنیان تواندووەتەوە، کورەیەکی ئاسن تواندنەوە و خەستکردنەوە لە ئەرمەنستان دۆزراوەتەوە کە بۆ (٥٠٠٠ پ . ز) دەگەڕێتەوە، ئەمەش وای لە گێرشمەنی کردووە کە پێی وا بێت نەتەوەی (هاتی) ئاسن تواندنەوە لە ئۆرارتووەکان فێر بوون.

ئەگەر سەرەنج بدەین لە ئەوەی نەتەوەی ئۆرارتوو باڵای بەرز و مووی بۆر و چاوی شینیان بووە، ئەوکات دەبێت بە مێژووی کۆچکردنی نەتەوە ئارياييەکان بۆ ئاسیادا بچینەوە. چوونکە بەپێی ئەو مێژووانەی کۆچی ئارياييەکان دەست نیشان دەکەن ئەو نەتەوانە لە (١٥٠٠ پ. ز) هاتوون، ئەگەر ئەو مێژووە تەنانەت بە (٢٠٠٠ پ. ز) دیار بکەین، ئەوا دیسان شارستانییەتی ئۆرارتووەکان کۆنتر دەبن. ئەو تاقیکردنەوانەی بە (کاربۆنی ١٤) بۆ کورەی تواندنەوەی ئاسن لە ئەرمەنستان کراوە، ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کە ئەو کورەیە لە (٣٠٠٠ پ. ز) کارا بووە، ئەگەر رەچاوی رەنگی چاو و باڵا و مووی ئۆرارتووەکان بکەین، گومانمان نامێنێت کە ئەوان لە نەتەوە ئارياييەکانن ئاشکرا دەبێت کە ئارياييەکان زۆر زووتر لە (١٥٠٠ پ . ز) کۆچیان بۆ ئاسیا کردووە.

یەکێك لە بابەتە سەیرەکانی مێژوو ئەوەیە کە شارستانییەتی ئۆرارتووەکان لەپڕ لەنێوچوو، بەڵام ئێستە پاشماوەی شارستانییەتی ئەو نەتەوەیە نەتەنیا لە قەوقازیا، بگرە لە نێزیك شاخی (قافلان) لە ئازەربایجان و بۆ نموونە لە نێزیك دەریاچەی ورمێ دەبینرێت.

بە بڕوای ژاك دۆمۆرگان شارستانییەتی ئۆرارتوو بە دەست ئارياييەكان لەنێوچووە، بە بۆچوونی ئەو ئۆرارتووەكان ئاريايی نەبوونە، بگرە ئەوان لە ڕەچەڵەكێكی دیكە بوون، كە ئێستە نەماوە، ئەو ڕەچەڵەكە تیرەیەك بووە لە ئارياييەكان.

ژاك دۆگمان دەڵێت ئۆرارتووەكان شاری ئاوەدان و لەوەڕگەی سەوز و جوان و خودان پیشەسازی بوون و كشتووكاڵیان كردووە و دەيان هەزار سەر مەڕ و ماڵات لە لەوەڕگەكانیان بەخێو كراون. كاتێك ئارياييەكان لە قەوقازياوە هاتن بۆ ئاسيا بۆ ئەوەی بكارن دەست بگرن بەسەر شار و زەوی و لەوەڕگە و ئاژەڵەكانی ئەو نەتەوەیە، ئەوانیان بە گشتیی كوشت و لەنێو برد.

ئەو بۆچوونە بۆ هەندێ لە مێژوونووسان ناخۆش دێتە بەرچاو، ئەوان لە بنەڕەتدا ئارياييەكانیان بە تالانچی و بكوژ نەناسیوە، وێڕای ئەوەش ناتوانرێت ئەو بابەتە ڕەت بكرێتەوە كە ئارياييەكان لە كاتی هاتنیان لەگەڵ دانیشتووانی ناوچەكە جەنگان و ئەوانیان لەنێوبرد، ئەگەر هەستی ڕەگەزپەرەستی و دەمارگیری بێتە نێو مێژوو، ئیدی ناتوانرێت متمانەی پێ بكرێت، تەنانەت هەتا سەر ڕەگەزپەرەستی و خوێنیش ناكارێت چەواشەكاری و گۆڕانگاریی لە بويەر و ڕاستییەكاندا بكات.

شارستانییەتی ئۆرارتووەكان لەنێوچوو، بەڵام خودی ئەو نەتەوەیە لەنێو نەچوون و لەو دەشتانە دەژيان كە كەوتبوونە باكوری كێوی قاف (قەوقازيا) و ناوە ناوە هێرشيان دەكردە سەر ئێران، بەڵام چیدی بە ئۆرارتوو ناو نەدەبران، بگرە بە (هەپتاڵ) ناسرا بوون. ئەو وشەیە لە مێژووی ڕۆژهەڵات گۆڕدراوە و پیتی (پ) بووە بە (ی) و وشەكە شێوەی كۆی وەرگرتووە و بووە بە (هەياتلە)، ئەوان ئەو كەسانەبوون كە لە كاتی مانەوەی شاپوور لە هەمەدان هێرشيان كرد بۆ ئازەربايجان.

هەندێ لە مێژوونووسەكان هەپتاڵەكانیان لەگەڵ مەغۆلەكان بە هەڵە بە يەك زانیوە، بەڵام ئەوان لە ڕەچەڵەكی مەغۆلەكان نین، هێرتسفێڵد كە ماوەيەك لە ئێران ژياوە دەڵێت: بێگومان هەپتاڵەكان تیرەیەك بوون لە ئارياييەكان، بە مەغۆل ناسینی ئەوان هەڵەيەكی گەورەيە، ئەو ڕێڕەوەی ئەوان پیایدا هێرشیان كردووەتە سەر ئێران، ئەوە نیشان دەدات كە ئەوان مەغۆل نین. چوونكە مەغۆل و هاوڕەگەزەكانیان هەر جارێك كە هێرشیان كرد بێت بۆ سەر ئێران، لە ڕێگەی خۆراسانەوە هاتوون.

بە بیستنی هەواڵی هێرشی هەپتاڵەکان، شاپوور بەو هێزەوە کە هەیبوو بەرەو (ڕێی) کەوتەڕێ، دوای ئەوەی گەیشتە شاری ڕێی، سەربازەکانی سەربازگەی ڕێی بەرەو ئازەربایجان خستە جووڵە. ئەو دەیزانی لە تۆرۆس (تەبرێز) و ورمێ (ئۆر ـ میە) دوو سەربازگەی هەیە، بەڵام پێشبینیی کرد کە بە هۆی هێرشی هەپتاڵەکانەوە نەتوانێت سوودی تەواو لە سەربازانی هەردوو سەربازگەی ئازەربایجان وەربگرێت لە دژی هەپتاڵەکان.

هەپتاڵەکان ئەو هێرشەیان بۆ سەر ئازەربایجان، لە دەربەندی بەناوبانگی (داریاڵ) لە گورجستانەوە پەڕیبوونەوە و هاتبوون بۆ کەنارەکانی ڕووباری ئاراس.

ئاراس یەکێکە لە ڕووبارە پڕ ئاو و تیژڕەوەکانی ئێران بوو، چوونکە ڕێڕەوی ڕووبارەکە لە ڕۆژئاوا بەرەو ڕۆژهەڵات نشێوی هەبوو، لە وەرزی بەهاردا ڕووباری ئاراز سەرکێشی دەکرد و ئاوەکەی هێندە زۆر دەبوو، تەنانەت لە بوارەکانیش توانای پەڕینەوە نەدەبوو، بەڵام لە وەرزی هاویندا بە هۆی کەم بوونەوەی ئاوەکەی، لە بوارەکانەوە توانای پەڕینەوە دەبوو، یەکێك لە بوارەکانی ئەو ڕووبارە لە نێزیك (جولفای) ئێستە بوو.

پێویستە بگوترێت ئاترۆپاتێنی کۆن و ئازەربایجانی ئێستە بەو شوێنە دەوترا کە لە شاخی قافلان لە باشوور دەست پێ دەکات و دەگاتە قەوقازیا لە باکور، کەواتە ڕووباری ئاراس لە نێوەڕاستی ئاترۆپاتێنەوە لە باکور بۆ باشوور دەڕۆیشت، لە کاتێکدا ئێستە ئەو ڕووبارە بۆتە سنووری باکوری ئازەربایجان و ئەو سنوورە لە دوو سەدەی رابردوودا چێ کراوە.

شاپووری دووەم مەترسی هەبوو کە پێش گەیشتنی خۆی بۆ ڕووباری ئاراس، هەپتاڵەکان لەو ڕووبارە بپەڕنەوە، بەڵام کاتێك گەیشتە ئەو شوێنەی ئێستە بە مەرەند ناسراوە، بۆی دەرکەوت کە ئەوان لە ڕووبارەکە نەپەڕیونەتەوە.

دوای ئەوەی هەپتاڵەکان لە دەربەندی داریاڵ پەڕینەوە، هەر ئاوایی و گوند و شارێك لەسەر ڕێگەیان بوو، تاڵانیان کرد و هەر پیاوێکیان بینی، کوشتیان و پیاوانی گەنجیان بە دیل گرت تا لە ناوچە بە پانتاییەکانی دەشتەکانی باکور لە سەرووی قەوقازیا ناچار بە کشتووکاڵیان بکەن.

هەندێ لەو مێژوونووسانەی هەپتاڵەکانیان لە ڕەچەڵەکی مەغۆلەکان داناوە، بۆیە وایان بیرکردووەتەوە کە ئەوان نەتەوەیەکی سوارەن. پێویستە بزانرێت کە بێگومان ئەوان لە کاتی هێرشەکاندا سوودیان لە ئەسپ بینیووە، بابەتێکی ئاسایی بووە، کە نەتەوەکانی ئەو دەمە بە

بێ ئەسپ ڕێگەکانیان بۆ نەبڕدراوە، بەڵام ئەوان وەك مەغۆڵەکان نەتەوەیەك نەبوون کە بەردەوام سوار بن.

مەغۆڵەکان لەو ڕۆژەوە کە توانای گرتنی ڕێشمەی ئەسپیان دەبوو، سواری ئەسپ دەبوون و دانەدەبەزین، ڕەوە ئەسپەکانیان بە بەردەوام لەنێو لەوەڕگەکانی مەغۆلستاندا دەلەوەڕان، ئەوان لە منداڵییەوە لەسەر ئەسپ دەبوون، بۆیە قاچەکانیان وەك سك و پشتی ئەسپەکانیان نێزیکە چەماوە دەبوو، ئەو خەسڵەتانە لە هەپتاڵەکاندا نەبوو، بەڵام هەپتاڵەکانیش لە کاتی هێرشکردندا بە سوپایەکی پیادە هەژمار دەکران، خەسڵەتەکانی سوپایەکی پیادەیان هەبوو.

زانیاریمان لەبارەی پێداویستی و ئامرازە سەربازییەکانی سوپای هەپتاڵەکانەوە نییە، تەنیا بەپێی وتەی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان، دوای هاتنی ڕۆمەکان و جێگیربوونی لژیۆنەکانی ڕۆم لە ئەرمەنستان، هەپتاڵەکان هەندێ بابەت لە ڕۆمەکان فێربوون و هەندێ لە شێواز و کەرەستە جەنگییەکانی پیادە لژیۆنەکان فێربوون، تەنانەت ئەفسەرەکانیشیان زرێی ئەفسەرانی ڕۆمیان دەکردە بەریان کە لە چەرم و بە پارچە ئاسنەکان داپۆشرا بوون.

شاپووری دووەم هێندەی لە توانایدا هەبوو، بە خێرایی ڕێگەی بڕی و خۆی گەیاندە ڕووباری ئاراس، ئەوکاتەی گەیشتە ئەوی شوێنە هێشتا هەپتاڵەکان لە ڕووبارەکە نەپەڕیبوونەوە و نەهات بوونە بەشەکانی باشووری ڕووباری ئاراس و ئازەربایجانی ئێستە.

هەزاران کۆچبەری هەڵاتوو کە لە ترسی هەپتاڵەکان هەڵات بوون، لە باشووری ئەو ڕووبارە سەرگەردان بوون، بە گەیشتنی شاپوور وەك ئەوە بوو کە سەر لە نوێ گیانیان بە بەردا کرابێتەوە.

شاپووری دووەم بە لێکدانەوەی وەرزی ساڵ بۆی دەرکەوت کە پەنابەرەکان ناتوانن پێش هاتنی وەرزی سەرمای توونو بۆ ماڵەکانیان بگەڕێنەوە، چوونکە تا ئەو جەنگی هەپتاڵەکان دەکات و بە سەریاندا زاڵ دەبێت، وەرزی سەرما دەگات و بە هۆی سەرمای توونوی ئەو دەڤەرەیلەشە لەوانەیە ئەوان دەرگیری سەختی و مردن ببنەوە، بۆیە جارێکی دیکە بە هەمان شێوازی ئەو ناوچانەی بوومەلەرزە لێی دابوون، فەرمانی چێکردنی خانووی بۆ ئەوان دەرکرد، بۆ ئەم مەبەستەش سوودی لە دانیشتووانی دەڤەرەکە وەرگرت. پەنابەرەکانیش بە گشتیی کاتێك زانیان شاپوور خانوویان بۆ چێ دەکات، نەتەنیا پیاوەکانیان، بگرە ژنەکانیش کەوتنە کارکردن.

شاپووری دووەم هەروەك شێوازی جاری پێشووی خۆی، كرێی ڕۆژانەی بۆ تەواوی ئەو خەڵكە دیاری كرد كە لە دانیشتووانی ناوچەكە بوون و كاریان لە خانووەكاندا دەكرد، ئەو فەرمانی كرد تا بە ڕەچاوكردنی وەرزە ساردەكانی ئازەربایجان و باران و بەفری زۆری ئەو ناوچەیە، خانووەكان بە پتەوی چێ بكەن تا بەرگەی سەرمای سەخت بگرن.

پاشا لاوەكەی ساسانییەكان لە زانستی بەڕێوەبردن هێندە سەركەوتوو بوو، كە لە ماوەی سێ ڕۆژدا هەموو ئەو كارانەی تەواوكرد، كە پێوەستبوون بە ئاوارەكان، هەر لەو سێ ڕۆژەشدا بەشێك لە سوپاكەی خۆی كە بە هێزەكانی هەردوو سەربازگەی تەورێز و ورمێ بەهێز كرابوون لە ئاوی ئاراس پەڕاندەوە و لە مەیدانێكی پانتایی كەم ئەوانی جێگیر كرد و هەندێ سیخووڕی نارد تا زانیاریی لەبارەی لەشكری هەپتاڵەكان كۆ بكەنەوە.

شاپووری دووەم دەیویست ژمارەی لەشكری هەپتاڵ و مەبەستی ئەوان بزانێت، چوونكە ئەو دەیزانی ڕێڕەوی هەپتاڵەكان لە گورجستان ئاشكرایە، ئەوان جگە لە تێپەڕین بە گەلییە شاخاوییەكەی داریاڵ كە لە گورجستان بوو، ڕێگەی دیكەیان نەبوو بۆ ڕۆیشتن بەرەو باشوور، بەڵام دوای پەڕینەوە لەو گەلییە دەرفەتیان بۆ زۆر دەبوو، بەرانبەریان بەرین بوو، دەیانتوانی لە سەرانسەری ئەو ناوچەیەی كەوتووەتە باشووری شاخەكانی قەوقازیا لە ڕۆژئاوا تا ڕۆژهەڵات دەست بە تاڵان و كوشت و بڕین بكەن، هەروەك چۆن لە ڕۆژئاوا كردبوویان.

شاپوور مەبەستی بوو بزانێت كە نەتەوەی هێرشبەر ئایا بەرەو باشوور دەچن یاخۆ ڕێگەی ڕۆژهەڵات دەگرنەبەر و بەرەو كەراباخ و شێروان و داغستان ڕێگە دەبڕن. سیخووڕەكانی ئەركیان دۆزینەوەی ڕێڕەوی ڕۆیشتنی ئەوان بوو.

ئێستە دانیشتووانی ناوچەكانی (كەراباخ، شێروان و داغستان) و وڵاتەكانی دیكەی باشووری زنجیرە شاخەكانی قەوقازیا و هەر وەك (ئێرەوان و نەخچەوان) بە زمانی توركی دەدوێن، ئەو زمانەش ئەو كاتە برەوی سەند كە سەلجووقییەكان بوونە دەسەڵاتداری ئەو وڵاتانەی لە باشووری شاخەكانی قەوقازن، ئەو كاتەی كە لەبەر باسی ئێمەیە، ئەو دەڤەرەیلەش بە زمانی ئازەری دەئاخڤان، كە یەكێكە لە لقەكانی زمانە ئێرانییەكان، لقە

گەورەکانی زمانی ئێرانی برێتی بوون لە (باختەری، پەهلەوی هەخامەنشیی، پەهلەوی ئەشکانی، پەهلەوی ساسانی، ئازەری و دەری).[٤]

پێویستە ئەو بابەتە باس بکەین کە هەردوو زمانی (پەهلەوی هەخامەنشیی و ساسانی) فارسین و بێشکەی چێبوونی هەردوو زمانی باشووری ئێران و ناوچەی فارسە. دانیشتووانی ناوچەکانی باشووری قەوقازیا بە زمانی (دەری) دەدوان، ئەوکات دانیشتووانی ئازەربایجانی ئێستەش هەر بە زمانی ئازەری دەئاخڤین.

زمانی ئازەری هێشتا وەك زمانی باختەری بە تەواوەتی لەنێو نەچووە، لە هەندێ شوێن هەندێ لە وشەکانی برەویان هەیە و کاریان پێ دەکرێت.[٥]،[٦]

فەرماندەی ئەو بەشە لە سوپای شاپوور کە لە کەناری باکوری ئاراس جێگیر ببوو، دەستەیەك لە پێشەنگی لەشکری خۆی راسپارد تا بچن و بە دەورەی شاخی ئاراراتی گەورەدا

---

(٤) بەپێی دابەشکارییەکان خێزانە زمانەکانی جیهان دیارکراون کە یەکێك لەوان زمانە هیند و ئەوروپاییەکانن، زمانە ئێرانییەکانیش لقێکن لەو کۆمەڵەیە کە پێکهاتووە لە هەر یەکە لە زمانەکانی فارسی کۆن، فارسی نوێ، کوردی، ئەفغانی، بلووچی و ئۆزەتی). لاپەرە (٧٠) لە پەڕتووکی کوردۆلۆجی لە نووسینی نەریمان خۆشناو، سەلام ناوخۆش و ئیدریس عەبدوڵلا. فارسی کۆن هەمان پەهلەوی دەگرێتەوە جا ساسانی بێت یاخۆ هەخامەنشیی، دەریش هەمان ئەفغانییە، کوردی کە زەبیحوڵلا بە ئەنقەست ناوی بە باختەری بردووە هەمان زمانە کە ئاڤێستای پێ نووسراوە. "وەرگێڕی کوردی"

(٥) دەزانرێت پێشکەوتنی ئامێرەکانی راگەیاندنی بیستراو و بینراو دەبنە هۆی بەرە بەرە لەناوچوونی زاراوە ناوچەییەکان، لەوانەش وشەکانی زمانی ئازەری کە هێشتا لە گوندکانی ئازەربایجان ماون، وەك زاراوەکانی دیکە لەناو دەچن. لە کاتێکدا زمانی ئازەری یەکێکە لە لقە گەورەکانی زمانە ئێرانییەکان و ئەوانەی بۆ پارێزگاری لە میراتی کولتووری ئێران هەوڵ دەدەن، دەچن چیرۆکێکی ئاسایی دێنن و دەیکەنە پەڕتووك تا لەنێو نەچێت، پێویستە بۆ پێشگرتن لە لەنێوچوونی ئەو زمانە هەنگاو بنێن، ئەوە کاری تاکێك و دووان نییە، پێویستە گرووپێك لە ئەدیب و مێژوونووسان ئەو کارە بکەن و وشە ئازەرییەکان کۆبکەنەوە و بیان نووسنەوە، "زەبیحوڵلا"

(٦) (زمانی ئازەری یاخۆ تورکی ئازەری نەتەنیا لە هەندێ لە گوندەکانی ئێران، بگرە لە هەندێ لە شارە گەورەکانی ئێران وەك تەورێز، زەنجان، قەزوین، ورمێ، ئەردەبیل و ...تەنانەت لەنێو تاران و هەمەدانیش خەڵکێك بەو زمانە دەدوێن. "وەرگێڕی کوردی"

بسووڕێنەوە و لەو شاخە سەربکەون تا لەوێوە هێندەی لە توانایاندایە چاوەدێری زەوییەکانی ئەودیو بکەن.

وەك زانراوە کە دوو شاخی ئارارات هەیە، یەکیان کورتترە لە ئەوی دیکە، بەڵام دەرکەوتەی گشتیی ئەو دوو شاخە لە یەکدیی دەچن، تا مرۆڤ لەو پێدەشتەوە کە ڕووباری ئاراسی پێدا دێت، نەڕوانێتە ئەو دوو شاخە و نەیانبینێت، ناتوانێت لە کاریگەریی ئەو دوو شاخە لەسەر بینەر بگات لەو پێدەشتەدا کە هیچ شاخێکێکی دیکەی لێ نییە.

ئەو پێشەنگەی لە دامێنی باکوری شاخی ئاراراتی گەورە سەرکەوت بوون، کاتی شەو ژمارەیەکی زۆر لە ئاگریان لە دوورەوە بینی، چوونکە ئاگرەکان زۆر بوون، زانیان ئەوانە هی شوان و ئاژەڵدارەکان نین، هی لەشکری هەپتاڵەکانە و بە بێ وێستان، هەواڵی بە فەرماندەی خۆی گەیاند کە ئاگری خێوەتگەی هەپتاڵەکانی بینیوە، ئەویش زۆر بە خێرایی هەواڵی بۆ شاپوور نارد کە لە باشووری ڕووباری ئاراس بوو.

لە رابردوودا ئامرازە پێشکەوتووەکان بۆ زانینی زانیارییەکان نەبوو، بەڵام هەردەم کەسانی بە ئەزموون هەبوون کە لە ڕێگەی هەندێ دەرکەوتە و پاشکەوتە توانیویانە ئەو راستییانە بزانن، کە لە ئێستەدا بە ڕێگەی تیشکی سەرووی سوور دەبینرێنەوە. یەکێك لە ئەرکەکانی فەرماندەی پێشەنگی لەشکر بریتی بوو لە زانینی مەودای نێوان خێوەتگەی دوژمن و خێوەتگەی لەشکری خۆی.

وەك دەزانرێت کە لە شەودا دیارکردنی مەوداکان بەپێی ڕووناکی ئاگر سەختە، بەڵام پیاوانی بە ئەزموون دەیان زانی کە ئەگەر خێوەتگەی دوژمن لە مەودای یەك فەرسەنگ (٦ کم) دووریدا بێت، ڕووناکی ئاگر راستەوخۆ و بێ تروسکانەوە دەگاتە چاو و تا ئاگرەکە دوورتر بێت پتر دەبریسکێتەوە و تیشکی ڕووناکی ئاگر لە چاوی مرۆڤدا دەلەرێتەوە، تا ئەو مەودایە زۆرتر بێت کە لە نێوان مرۆڤ و ئاگرەکە هەیە، ڕووناکییەکە پتر دەبریسکێتەوە.

فەرماندەی پێشەنگی لەشکری شاپوور بە لێکدانەوەی شێوەی گەیشتنی تیشکی ڕووناکی ئاگری هەپتاڵەکان، بۆی دەرکەوت کە ئەوان چوار تا پێنج فەرسەنگ (٢٤ تا ٣٠ کم) لە دامێنی ئەو شاخەوە دوورن کە ئەوانی لێیە، لە ئەوێشەوە تا دەگاتە ڕووباری ئاراس مەودایەکی دیکە هەیە، ئەوان لانی کەم رۆژێکیان پێویستە بۆ گەیشتن بە راستی شاخی ئارارات، بۆیە لە راپۆرتەکەیدا بۆ شاپوور، نووسی کە ئەوان ناتوانن بەر لە سبەی بگەنە کەناری ڕووباری ئاراس.

شاپووری دووەم فەرمانی کرد تا ئەو بەشەی سوپاکەی کە لە باشووری ڕووبارەکە بوون لە زێ بپەڕنەوە و لە باکوری زێیەکە جێگیر بن، تەنیا بەشێکی کەم لە هێزەکەی وەك یەدەگ و خۆپارێزی لە باشووری زێیەکە هێشتەوە تا ئەگەر هەپتالّەکان توانیان لە سەرەوە یاخۆ لە خوارەوە هێزەکانیان لە زێ بپەڕێننەوە و بگەنە ئەوێ، ئەو شوێنە بێ پاسەوان نەبێت.

لەشکری هەپتالّەکان لەگەڵ بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر بەڕێ کەوتن و فەرماندەی پێشەنگیش بە رەچاوکردنی ئەو تۆزەی لە رێگەی ئەوان دەیبینی، ماوە ماوە شوێنی ئەوان و رادەی نێزیکبوونەوەی ئەوانی بە شاپوور دەگەیاند.

لەو پەیامانەی فەرماندەی سەربازە پێشەنگەکان دەیناردن، شاپووری دووەم بۆی دەرکەوت لەشکری هەپتالّ بە خێرایی دەجولاێن، هۆی ئەو پەلەکردنەش ئەوە بوو کە پێش ئەوەی شەو بێت، بگەنە کەناری ڕووباری ئاراس و خێوەتگەکەی لە ئەوێ دامەزرێنێت. چوونکە بە پێچەوانەوە دەبووایە خێوەتگەکەی لە دەشت هەڵبدات، ئەوکات دەست گەیشتنی بە ئاو بۆ لەشکرەکەی ئەستەم دەبوو، پێویست ناکات باسی گرینگی ئاو بۆ لەشکرێك بکەین.

کاتێك هەتاو سێبەری لە شاخەکان بڕی، سوپای هەپتالّەکان گەیشتە راستی شاخەکان و فەرماندەی هەپتالّ دەستەیەك لە پێشەنگەکانی خۆی نارد بۆ شاخەکان.

کاتێك فەرماندەی پێشەنگی شاپوور سەرکەوتنی پێشەنگی هەپتالّەکانی لە شاخ بینی، فەرمانی بە سەربازەکانی کرد خۆیان حەشار بدەن و پێی وتن: ئەوانە لەو لایەوە لە شاخەکەوە سەردەکەون، چوونکە ئەگەر لەو لایەی شاخەکە سەر بکەون، ئەوا لەشکری ئێمە نابینن، مەبەستی ئەوانیش بینینی لەشکری ئێمەیە، بۆیە پێویستە لە داوێنی باشووری شاخەکە سەر بکەون.

گریمانی فەرماندەی پێشەنگی شاپوور راست بوو، سەربازە هەپتالّەکان بە دامێنی ئاراراتی گەورەدا ڕۆیشتن تا بچنە دیوەکەی دیکەی شاخەکە، واتە دامێنە باشوورییەکانی. دوای ئەوە چیدی پێشەنگی ساسانی نەیاندەتوانی هەواڵ بۆ شاپوور بنێرن، چوونکە ئەوکات سوپای هەپتالّ سەربازەکانی ئەویان دەبینی و دەیانزانی دەستەیەکی پێشەنگ لە سەربازانی شاپوور لەوێندەرن.

هەرچەندە ئەرکی ئەو بەکۆتا هات، بەڵام چاوی لەسەر سوپای هەپتالّ هەڵ نەگرت تا ئەو کاتەی کە بینی جووڵەی لەشکرەکە هێواش بۆوە، دواتر لەشکرەکە وەستا.

ئەو ڕووداوە دەرخەری ئەوە بوو کە پێشەنگی هەپتاڵەکان هەواڵی بینینی لەشکرێکیان لە کەناری باشووری ئاراسەوە بە فەرماندەی لەشکرەکەیان گەیاندووە، ئەویش فەرمانی وێستانی لەشکرەکەی داوە.

کاتێك لەشکری هێرشبەر لە جووڵە وێستا، مەودای نێوانیان لەگەڵ شاخەکانی ئارارات زۆر نەبوو، فەرماندەی هەپتاڵ فەرمانیدا تا لەوێندەر خێوەتگەکەیان دابمەزرێنن، دواتر دەستەیەك سەربازی نارد تا لە شوێنێکی دوورتر لە سەربازەکانی شاپوور ئاو بێنن، دەستەیەکی دیکە لە سەربازەکانیشی راسپارد تا بچن و لە بناری شاخ دار بێنن بۆ ئاگر کردنەوە. بناری شاخی ئاراراتی گەورە بە دار داپۆشرابوو، هەرچەندی دار پێویست بووایە لەوێندەر دەست دەکەوت.

شاپوور دەیتوانی هەر لەو شەوەدا هێرش بکاتە سەر هەپتاڵەکان، بەڵام خۆی لە هێرشکردن پاراست، چوونکە دەیزانی پێش یەکلابوونەوەی جەنگ، شەو دەگات و دنیا تاریك دەبێت.

لەو رۆژانەی بەشی یەکەمی لەشکری شاپوور لە ئاراس دەپەڕییەوە، شاپوور توانی بووی بەشێك لە گالیسکە جەنگییەکانی بپەڕێنێتەوە و پێشبینیی دەکرد لە رۆژی داهاتوو بتوانێت بە هۆی گالیسکەکانەوە زیانی گەورە لە دوژمن بدات، بۆیە نەدەبووایە هێزەکەی لەو دۆڵە تەنگە دووچاری زیان بکات.

شاپووری دووەم دەیزانی پێش ئەوەی شەو بگات، سەربازەکانی دوژمن هەوڵ دەدەن لە سەرەوە یاخۆ خوارەوەی ڕووبارەکە خۆیان لە ئاوەکە نێزیك بکەنەوە تا لەو شوێنەوە ئاو دەستەبەر بکەن، تەواوکردنی شەو بە بێ ئاو بۆ ئەوان کارێکی سەختە.

ئەو دەیتوانی فەرمان بکات تا دەستەیەك لە سەربازەکانی ڕاسپێرێت بۆ رێگریکردن لە ئەوەی سەربازەکانی هەپتاڵ دەستیان بگاتە ئاوی ڕووبارەکە، بەڵام ئەوەش دەبووە هۆی دروستبوونی پێکدادان و کوژرانی سەربازەکانی، بۆیە هیچ فەرمانێکی بۆ رێگریکردنی ئەوان نەکرد، ئەوانیش لە سەرەتای شەودا بە ترسەوە بۆ ئاوبردن دەهاتن، دواتر بێ سڵکردنەوە کەوتنە ئاو بردن لە ڕووبارەکەوە بۆ خێوەتگەکەیان.

شاپووری دووەم دەیتوانی ئەو شەوە پەلاماری لەناکاوی دوژمن بدات، بەڵام بە بەرژەوەندیی نەزانی، چوونکە زانیاریی لەبارەی ژمارە و چۆنایەتیی لەشکری دوژمن نەبوو، هەروەها دەیزانی هەپتاڵەکان کەسانی ئاسایی و بێ ئەزموون نین، بێگومان ئەو کەسەی

فەرماندەیی لەشکرەکەی لە ئەستۆیە، گریمانی کردووە کە ئەو شەوە هێرشی بکرێتە سەر، بۆیە خۆی ئامادە کردووە، باشتر وایە کە جەنگ بخرێتە رۆژی دواتر، لە ڕووناکیدا بجەنگێت تا هەمووان و هەموو شوێنێك ببینێت لەکاتی جەنگدا.

لە سوپای شاپووردا تەواوی سەرباز و ئەفسەرەکان دەیانزانی بەیانی رۆژی نەبەردە، بەڵام وێڕای ئەوەش هەموویان، جگە لە پاسەوانەکان و ئەو دەستانەی لە نێوان هەردوو لەشکردا وەك پاسەوان دەگەڕانن هەمووان تا بەیانی خەوتن.

ئەو ئەفسەر و سەربازانەی ئەو شەوە لەو خێوەتگەیەدا بوون، بە گشتیی لە خاوەن ئەزموونەکان بوون، زۆر جاری دیکە لە جەنگدا بەشدار ببوون، بۆ ئەوانەی لە جەنگی جۆراوجۆردا جەنگاون، شەوی پێش جەنگ و شەوەکانی دیکە وەك یەکن و بە ئاسایی و بێ ترس لە جەنگ دەتوانن بخەون. بۆیە سەربازی کۆن باشتر بوو، لە سەربازی نوێ، چوونکە کۆنەکان لە مردن نەدەترسان و نوێیەکانیش هەرچەندە ئازا و بە توانا بووان لە مردن دەترسان.

قەیسەری رۆم (ژۆلیۆس سیزار) کە لە سەدەی یەکەمی پێش زاین لەنێو ئەنجومەنی سیناتی رۆم کوژرا، وتەیەکی بەناوبانگی لەبارەی سەربازانی کۆن هەیە، کە لە تەواوی مێژووە سەربازییەکانی جیهان نووسراوەتەوە و برێتییە لە: (سەربازەکانی من کە سێ ساڵە لەگەڵ مندا بەشداری جەنگەکان دەبن، مرۆڤ نین و لە کانزای قەڵایین.) ئەوکات لە رۆم ئاسن نەبوو، ئەو کانزایە نیشانەی پتەوی و بەهێزی بوو، بۆیە ئەوانی بەو کانزایە شوبهاندووە.

لە راستیدا ئەو سەربازانەی ماوەی سێ ساڵ بەشداری جەنگ دەبن و ناکوژرێن، هێندە پتەو دەبن کە ورەیەکی بەهێزیان دەبێت و لە مرۆڤی سەرووی سرووشت دەچن، سیزار ئەو ڕاستی دەکرد، کە ئەوانی بەو شێوەیە باس کردووە.

ئەو شەوە تا نێزیکەی بەرەبەیان پاشای ساسانی نەخەوت، بەڵام نەخەوتنی ئەو لە ترسان نەبوو، دەگەڕایەوە بۆ هەستکردنی بە بەرپرسیارەتی، بە تایبەت کە ئەو گریمانی ئەوەی دەکرد لەو شەوەدا هەپتاڵەکان پەلاماری لەناکاوی لەشکرەکەی بدەن.

نێزیك بەرەبەیان خەوی لێکەوت، بەڵام موزیکی لەشکرەکەی کە لەگەڵ بەرەبەیاندا لێدرا لە خەوی هەستاند، ئەویش دوای ئەوەی بە نەریتی زەردەشتی نزا و پاڕانەوەی بەرانبەر بە یەزدان کرد، داوای ئەسپی کرد و سوار بوو.

ئەو ئەفسەرە پایەبەرزانەی فەرماندەیی بەشەکانی لەشکری شاپووریان لە ئەستۆ بوو، دەیانزانی پێویستە ریزەکانی لەشکرەکەیان لەو دەشتە بچووکەی باکوری ڕووباری ئاراسدا ڕێك بخەن، ئەوەش کارێکی ئاسان بوو.

دوای ئەوەی بەشە خۆراکی رۆژانە درایە سەربازەکان، ریزەکان ڕێکخران، بەپێی فەرمانی شاپووری دووەم گالیسکە جەنگییەکان لە لای راست و سوارەکان لە لای چەپ جێگیر بوون، ناوەندیی سوپاش لە پیادەکان پێکهات، شاپووری دووەم بە سواری ئەسپەوە لە نێوەندیی سوپاکەی جێگیر بوو.

بەپێی فەرمانی شاپوور دەبووایە دوای ئەوەی ریزەکانیان ڕێك دەخەن، لەشکرەکەی بە ئارایشی جەنگی بەرەو لەشکری دوژمن بڕۆن.

هەر کە ئارایشی جەنگی لەشکرەکە کۆتایی هات، تەواوی بەشەکانی لەشکرەکە کەوتنەڕێ، بە هێواشی بەرەو ڕووی دوژمن رۆیشتن، بەڵام گالیسکەکان و سوارەکان بە هەنگاوی هێواشی ئەسپەکان دەڕۆیشتن تا هاوهەنگاو لەگەڵ پێی سەربازە پیادەکانی ناوەندیی لەشکرەکەیان بڕۆن و پێش ئەوان نەکەونەوە.

شاپوور چاوەڕوان بوو کاتێك لە لەشکری هەپتاڵەکان نێزیك دەبێتەوە، ئەوانیش وەك لەشکری ئەو ئامادە بووبن. ئەوانیش وەك سوپای ئێران لەخەو هەستا بوون و ئامادە ببوون، ئەوکاتەی لەشکری ساسانی بە ئارایشی جەنگییەوە بەرەو ڕوویان دەهات، کەوتەڕێ و لە جیاتی بەرەو ڕووی لەشکری ساسانی بچن، بەرەو باکور رۆیشتن، واتە پاشەکشەیان کرد.

شاپووری دووەم سەرەتا کە تۆز و خۆڵی دوورکەوتنەوەی ئەوانی بینی، بیری کردەوە کە ئەوە ڕەنگە یەکێك بێت لە هونەر و تەڵەکە سەربازییەکانیان بۆ سووڕانەوە، ئەوکات نێزیك کەوتنەوە لە ئەوان، بەڵام دواتر تێ گەیشت کە دوژمن پاشەکشە دەکات و دەیەوێت خۆی ڕزگار بکات، بۆیە فەرمانی بە سوارکار و گالیسکە جەنگییەکانی کرد تا بە خێرایی خۆیان بگەیەننە لەشکری دوژمن و نەهێڵن هەڵبێن و هەر لەوێندەر لەنێویان ببەن.

# تاعوون لە تیسفون

لەشکری هەپتاڵ پیادە بوون، بەڵام وەك هەر لەشکرێکی پیادە ئەسپیان هەبوو بۆ گواستنەوەی پێداویستییە جەنگی و خواردەمەنییەکانیان. ئەوان هەر کە زانیان لەشکری شاپوور بەدوویان کەوتووە، تەواوی ئەسپەکانیان رەوانی پێشەوە کرد تا بە خێرایی بڕۆن و پێداویستییەکانیان نەکەونە بەردەستی دوژمن.

فەرماندەی لەشکری هەپتاڵ کە پێشبینیی نەدەکرد لەشکری بەرانبەر بەدوویان بکەون، کاتێك ئەسپ سوار و گالیسکەکانی بینی، زانی هەڵاتن بێ سوودە، چوونکە چەندە سەربازەکانی بە خێرایی بڕۆن و بێ پشوودان ڕابکەن، ناتوانن لە گالیسکە جەنگی و ئەسپەکان رزگاریان ببێت، ئەوان خۆیان دەگەیەننە هەڵاتووەکان و تا دوایین کەس دەیان کوژن یاخۆ دیلیان دەکەن.

ئەگەر زەوییەکەی ئەو ناوچەیە بە شێوەیەك بووایە کە رێگر بووایە لەبەردەم خێرایی رۆیشتن یاخۆ لێخووڕینی ئەسپ و گالیسکەکان و ئەوانی ناچار دەکرد بە ناوچەیەکی بەرەلاّن یاخۆ شاخاوی بەرتەسکدا بڕۆن، فەرماندەی لەشکری هەپتاڵ ئۆمێدی دەبوو کە سەربازەکانی خۆی رزگار بکات، بەڵام ئەو شوێنەی گالیسکەکانی ساسانی پێدا دەڕۆیشتن، تەنیا کەمێك بەرز و نزمی هەبوو کە نەیدەتوانی ببێتە رێگرێکی گرینگ بۆ رۆیشتنی ئەوان.

فەرماندەی لەشکری هەپتاڵ دەیزانی لەو ناوچە تەختە سەربازەکانی بۆ هەرلایەك هەڵبێن، دەکەونە داوی گالیسکە و ئەسپ سوارەکان، بۆیە تاکە رێگە بۆ رزگارکردنیانی لە بەرەنگاربوونەوەدا بینییەوە و فەرمانی پاشەکشەی ڕاگرت، لە بەرانبەردا فەرمانی کرد تا لەشکر خۆی رێك بخاتەوە و دابەش ببێت بەسەر دڵ (ناوەند) و هەردوو لای مەیدانی جەنگ.

فەرمانی فەرماندەی هەپتاڵەکان بۆ رێکخستنەوەی ریزەکان و دابەشبوونی جەنگی دەرچوو، هەپتاڵەکان تا ئەوکات لە ئارایشی رێڕۆیشتندا بوون و نەیان دەتوانی لە ماوەی چەند خولەکێکدا ریزەکانیان بگۆڕن و (دڵ و دوو لای لەشکر) ساز بکەن تا بتوانن بەرانبەر گالیسکە و سوارەکانی ساسانی بوەستنەوە. لە جەنگەی کاتی سەرگەرمبوونی ئەوان بە ئارایشی سەربازییەوە، سوارەکان و گالیسکە جەنگییەکانی ساسانییەکان گەیشتن.

شاپووری دووەم فەرمانی کرد بوو، ئەگەر هەپتاڵەکان خۆیان بە دەستەوە نەدا تا دوایین کەسیان بکوژن، چوونکە یەکەمجاریان نەبوو هێرش بکەنە سەر دانیشتووانی سنوورەکەی و پیاوان بکوژن و هەرچییەکی دەستیان بکەوێت بە تالآنی ببەن.

چەکی هەپتاڵەکان جگە لە تیر و کەوان برێتی بوو لە تەور و گورز، لەنێو ئەو چەکانەشدا تەنیا تیر و کەوان توانای بەرگرتن بە گالیسکە و سوارەکانی هەبوو، لەوانەیە ئەوان بە تەور و گورز توانای ڕاگرتنی سوارەکانیان هەبووایە، بەڵام نەیاندەتوانی ڕێگە لە گالیسکەکان بگرن.

بۆ ڕاگرتنی گالیسکەکان بە تیر و کەوان، پێویست بوو هەموو تیرهاوێژەکان پێکەوە لە یەك شوێن کۆ ببنەوە و پێکەوەش تیرەکانیان بهاوێژن و وردبینی بکەن، چوونکە ئەگەر ئەوان بە تیر هاویشتنی نارێك و تاکەکەسی توانای شکاندنی چەند گالیسکەیەکیان ببووایە، بەڵام نەیان دەتوانی ڕێگەی هەموو گالیسکەکان بگرن. ئەوان هیچ ڕێگەیەکیان نەبوو بۆ بەرگرتن بە گالیسکەکان، جگە لە تیر هاویشتنی بە کۆمەڵ نەبێت، لەو کاتەشدا ئەوان توانی خۆ کۆکردنەوە بۆ ئەو کارەیان نەبوو.

لە سەردەمی کۆندا کە جەنگ بە چەکی سارد ئەنجام دەدرا، بارودۆخی جەنگ بە شێوەیەك بوو کە ئەگەر ریزی سەربازەکان بۆ جەنگ ڕێك نەخرابووایە، نەتەنیا سەربازێك بگرە دە هەزار سەربازی نارێك و بڵاویش نەیاندەتوانی هیچ بکەن و بایەخ و گرینگی ئەوتۆیان لە جەنگدا نەبوو. تەنانەت دوای دەرکەوتنی چەکی ئاگرینیش، دیسان ڕێکخستنی ریزەکان و دانەمەزرانی سەربازەکان بەهای تایبەتی خۆی هەبوو، ئەو بەهایە تا یەکەمین جەنگی جیهانیش بەها و بایەخی خۆی لەدەست نەدا، چوونکە هەر لەو جەنگە ئەگەر دوو لەشکر بەریەك دەکەوتن ئەو لەشکرەی ئارایشی جەنگی نەدەما، توانای جەنگیشی نەدەما و شکستی دەخوارد. شکستی لەشکری رووسیا لە جەنگی (نانن برگ) لە ساڵی (١٩١٤ ز) نموونەیەکی دیارە بۆ ئەو بابەتە.

لەو جەنگەدا کە لە نێوان ئەڵمان و رووسیا ڕوویدا سوپای ئەڵمان بە فەرماندەیی (هێندنبۆرگ) و سوپای رووسیا لە دوو لەشکری جیا کە هەریەکەیان فەرماندەی خۆی هەبوو، بە ناوەکانی (سامسۆنۆف و رنەکامف) بوون، ژمارەی هەر یەکەیان (٧٥٠) هەزار سەرباز پێك هات بوو. هەردوو سوپای رووسیا دەبووایە هێرش بکەنە سەر سوپای ئەڵمان و شکستی بدەن، بەڵام هێندنبۆرگ بە تەنیا (٧٠٠) هەزار سەرباز و بە هاوکاری سەرۆکی دەستەی سوپا کە ناوی (لۆدندرۆف) بوو، توانی ملیۆنێك و نیو سەربازی رووسیا تێك بشکێنێت، دوای ئەوەی ریزەکانی هەردوو سوپای تێکدا.

بۆ ساتێك بیر بكەینەوە كە ملیۆنێك و نیو سەرباز، چەندە ژمارەیەكی گەورەیە، بەڵام ئەو ژمارە یەك ملیۆن و نیو سەربازە بە هۆی لە دەستدانی ئارایش و ڕێككاریە جەنگییەكەیان دووچاری شكست و دواتر دیلی هاتن، هەردوو فەرماندەكەیان دووچاری چارەنووسی خراپ بوون، سامسۆنۆف لە مەیدانی جەنگدا خۆی كوشت، ڕنەكامف دیار نەما، هەندێ وتیان خۆی كوشتووە، هەندێكی دیكەش وتیان بۆتە دیلی ئەڵمانەكان.

ئەو نموونەیەمان تەنیا بۆ ناساندنی بایەخی ڕیزبوونی لەشكر بە شێوەی دروست لە مەیدانی جەنگدا هێنایەوە كە تا یەكەمین جەنگی جیهانیش هەر بایەخی مابوو.

هەرچەندە هەپتاڵەكان پیاوی ئازا بوون، بەڵام دەرفەتی ڕێكخستنی ڕیزەكانیان نەبوو، بۆیە نەیانتوانی لە بەرانبەر هێرشی ساسانییەكان بەرگە بگرن و شكستیان خوارد.

ئەوان پیاوانی ئازا و دلێر بوون، بە شمشێر و تەور و گورز هەندێ لە سوارەكانی شاپووریان دەكوشت و هەندێكیشیان بێ ئەوەی لە مردن ترسیان هەبێت، لە لای ڕاست یاخۆ چەپەوە خۆیان دەگەیاندە ئەسپی گالیسكەكان و بە شمشێر ورگیان دەدڕین و خۆشیان بە تیری سەرنشینەكانی گالیسكەكان دەكوژران یاخۆ دەكەوتنە ژێر تایەی گالیسكەكان و دەمردن. هەرچەندە گالیسكەكان بەو شێوەیە بۆ ماوەیەك لەكار دەكەوتن، بەڵام دوای ئەوەی ئەسپە كوژراوەكەیان لە گالیسكەكە دادەبڕی، جارێكی دیكە گالیسكەكە دەكەوتەوە كار.

تا جەنگەكە زۆرتر بەردەوام دەبوو، لاوازی هەپتاڵەكان پتر دەردەكەوت و ئازایەتیی تاكەكانی هەپتاڵ، نەیدەتوانی بۆشایی نەبوونی ئارایشی جەنگی پڕ بكاتەوە. هەرچەندە پیاوانی هەپتاڵ دەیان بینی بێ هێزترن، ژمارەیەكی زۆریان لەلایەن گالیسكە جەنگییەكان و سوارەكانەوە كوژراون، بەڵام دەستیان لە بەرگری هەڵ نەدەگرت و خۆیان بەدەستەوە نەدەدا، چوونكە مردایەتی و دلێری ئەوان ڕێگەی ئەو كارەی پێ نەدەدان خۆیان بە دەستەوە بدەن.

هەندێك لە هەپتاڵەكان كەوتبوونە نێو سستی جەنگ، دەوترێت ئەو سستیە وەك ئەوەیە كە سەربازەكە مەست بێت و ئاگەداری خۆی نەمابێت، لەوكاتەدا ئەو تەنیا دەجەنگێت و ئاگای لە سەربازەكانی هاوڕێی نامێنێت، تەنانەت ئەگەر ئەوان دەست لە جەنگیش هەڵبگرن، ئەو بەردەوام دەبیت تا دەكوژرێت، لەوكاتەدا گوێ لە فەرمانی فەرماندەكەشیان ناگرن بۆ واز هێنان لە جەنگ. هەندێك لە سەربازە هەپتاڵەكان كەوتبوونە ئەو دۆخە و بێ گوێدان بە مردن دەجەنگان و نەیاندەزانی ئازایەتیی تاكە كەسی ئەوان ناتوانێت دۆخی جەنگ بگۆڕێت و هێندە جەنگان تا بە شمشێری سوارەكان یاخۆ بە داسی گالیسكەكان دەكوژران.

ئەو نەتەوە بیابانن‌شینە ئەو ڕۆژە دەریان خست کە نەتەوەیەکی ئازان و توانایان هەیە بەرگری لە بەرانبەر دوژمنێکی بەهێز بکەن و لە مردن ناترسن.

جەنگ تا نێزیکەی کاتی ڕۆژئاوا بەردەوام بوو، تەنانەت گالیسکەکان و ئەسپ سوارەکان بە تەواوەتیی ماندوو ببوون.

لە دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەوە، شاپووری دووەم خۆشی بە گالیسکەیەکەوە هات بوو بۆ مەیدانی جەنگ و دەیبینی کە زەوی بە تەرمی کوژراوانی هەپتالْ داپۆشراوە و چاوەڕوان بوو ئەوان داوای وێستانی جەنگ بکەن، بەڵام ئەوەیان نەدەکرد.

هەرچەند ئەوان سەرسەختانەتر بجەنگان، شاپوور پتر لەسەر بڕیاری لەنێوبردنی ئەوان سوورتر دەبوو، دەیوت نەتەوەیەکی ئاوا دلێر ئەگەر بە زیندوویی بڕۆن، دواتر هێزی تازە دێننەوە و دووبارە بۆ خەڵکی سنوورەکەی دەبنەوە مایەی ئازار و نەهامەتی، بۆیە پێویستە ئەوان لەنێو ببردرێن.

کاتێك هەتاو کە لە ڕۆژئاوا و لە پشت شاخەکانی لای چەپی مەیدانی جەنگ بوو، ئاوابوو و دیار نەما، ئیتر جەنگ خۆی وێستا و دەست لە جەنگ هەڵگیرا، شاپووری دووەم فەرمانی کرد تا کەڕەنای گەڕانەوە لیٚ بدرێت.

ئەگەر مەیدانی جەنگ هێندە گەورە نەبووایە کە ڕووناك کردنەوەی کارێکی ئاسان بووایە، شاپووری دووەم فەرمانی گەڕانەوەی سەربازەکانی نەدەکرد، دوای ڕووناك کردنەوەی مەیدانی جەنگ، هێندە بەردەوام دەبوو تا تەواوی سەربازە هەپتاڵەکانی لەنێو دەبرد، بەڵام مەیدانی جەنگ زۆر فرەوان بوو، بە مەشخەڵەکانیش ڕووناك نەدەکرایەوە، لە لایەکی دیکەیش شاپوور دەترسا لەوەی هەپتاڵەکان کە پیاوانی ئازا و سەرسەخت بوون، سوود لە تاریکی شەو ببینن و خۆیان بگەیەننە ئەسپەکانی گالیسکە و سوارەکان و یەك لەدوای یەك، بیانکوژن و گالیسکەکان لەنێو ببەن، بۆیە گەڕانەوەی پیٚ باشتر بوو لە بەردەوام بوونی جەنگ.

گالیسکە و سوارەکانی شاپوور دوای بیستنی کەڕەنای گەڕانەوە، لە کاتێکدا کە چاویان بڕیبووە لووتکە سپیەکەی ئارارات، ئەو دەشتە فرەوانەیان بەجیٚ هێشت و گەڕانەوە.

گەڕانەوەی گالیسکە و سوارەکان تا بەرەبەیانی ئەو شەوەی خایاند، چوونکە هەندیٚ جار لە ڕێگەی گەڕانەوە دەکەوتنە نێو ئەو قۆڵت و ئادڕانەی دەهاتە پێشیان، بۆیە ناچاربوون مەودایەك بسووڕێنەوە یاخۆ بگەڕێنەوە تا تێپەڕ ببن.

به فەرمانی شاپووری دووەم لە بناری شاخی ئاراراتدا خێوەتگەیەکیان دامەزراند و خۆراك و خواردنەوەیان دایە سەربازەکان و ئالیکیشیان بۆ ئەسپەکانیان دابین کرد.

پاشای ساسانی دەیزانی تەواوی ئەوانەی دەگەڕێنەوە، برسی و تینوون و پێویستیان بە ئاو و خواردن و پشوودان هەیە و ئەسپەکانیان لە خۆیان ماندووتر و برسی و تینووترن، چوونکە ئەسپ زووتر برسی و تینوو دەبێت، بەڵام وێڕای ئەوەش هەندێك لە سوار و گالیسکەکان تا دوای ڕۆژهەڵات نەیانتوانی خۆیان بگەیەننەوە خێوەتگەکە.

هەپتالّەکانیش چیتر توانای بەردەوامبوونی جەنگیان نەبوو، ئەوانەی مابوونەوە ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر.

شاپووری دووەم دەیزانی کە زیانی گەورەی لە هەپتالّەکان داوە، لە لایەکی دیکە گالیسکە و سوارەکانی نەیانتوانی تا دوای ڕۆژهەڵات کۆببنەوە، بۆیە بە باشی نەزانی چیدی دوای ئەوان بکەوێت، ئەوانیش زەربەی باشیان بەرکەوتبوو، بۆیە تا ماوەیەکی دوور نەیانتوانی سەر لە نوێ هێرش بکەنەوە سەر سنووری ساسانییەکان.

ساڵی دواتر (٣٣٠ ز) بەڵایەکی گەورە بۆ پایتەختی شاپوور هات کە ئەوکات بە (نەخۆشی ڕەش) و ئێستە بە (تاعوون) ناسراوە. ئەو نەخۆشییە بۆیە بەو ناوە دەناسرا، چوونکە بە هۆیەوە برینێك لە ڕانی نەخۆش دەهات و ڕەش دەبوو، هێندەی ئازار هەبوو کە نەخۆشەکەی دەکوشت.

ئەو نەخۆشییە لە رابردوو بە شێوەی بەردەوام لە وڵاتانی باشووری ئاسیا هەبوو، هیچ کات کۆتایی نەدەهات، هەندێك جار دەبووە نەخۆشی گوێزەرەوە، نەتەنیا دەگەیشتە ئێران، بگرە کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەورووپاشی دەگرتەوە و سەدان هەزار کەسی دەکوشت. مایەی سەرسووڕمانی ئێمەیە ئەگەر ببیستین کە دوای هاتنی تاعوون بۆ وڵاتێك، ژمارەی دانیشتووانی ئەو وڵاتە بۆ نیوەی ژمارەی پێشتووتری دابەزیوە.

ئێستە زانراوە هۆکاری ئەو نەخۆشییە برێتییە لە میکرۆبێك، ئەو میکرۆبە لە کێچێکدا دەژێت کە لە مشکدا هەیە، لە مشکێکەوە بۆ ئەوی دی دەگواسترێتەوە، هەندێ کات هەندێ لە ئاژەڵەکاننش بۆ نموونە گاکان لە مەترسی تاعووندان، بەڵام لە رابردوو بەو بابەتی گواستنەوەیان نەدەزانی و نەخۆشییەکەیان بە بەڵایەکی ئاسمانی دەناسی.

لە رابردوودا دوورکەوتنەوە لە ناوچەی تاعوونیان بە باشترین ڕێگەی لە بەرانبەر ئەو نەخۆشییە دەناسی، بەڵام تاعوون لە مرۆڤ خێراتر دەڕۆیشت و بڵاو دەبۆوە، بۆیە هەردەم هەڵاتن چارەسەر نەبوو.

لە نێوان (ئێران شەهر) یاخۆ (دڵی ئێران شەهر) واتە میزۆپۆتامیای کۆن و وڵاتانی باشووری ئاسیای ئەوکات بە شێوەی بەردەوام پێوەندیی بازرگانی و هاتوچۆ هەبوو، بە تایبەتی کەشتییە بازرگانییەکان بەردەوام لە تیسفونەوە دەچوون بۆ بەندەرەکانی ئەو وڵاتانە، لەو وڵاتانەشەوە بۆ بەندەرەکانی ئێران دەهاتن.

لە سەردەمی شاپووری دووەمدا هەر دوو ڕووباری دیجلە و فورات کە ئێستە پێش تێکەڵ بوونیان بە کەنداوی فارسی دەبنەوە بە یەك ڕووبار بە ناوی (شەتولعەرەب)، هەری ەکەیان بەجیا تێکەڵ بەو کەنداوە دەبوونەوە و بە درێژایی هەردووکیاندا کەشتییەکان بەنێو کەنداوی فارس و دەریای عومان و زەریای هینددا دەڕۆیشتن، لە درێژایی کەنارەکانی باشووری ئاسیا، خۆیان دەگەیاندە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی چین، هەر لەو ڕێگەیەشەوە دەگەڕانەوە.

لەمڕۆدا کەشتییە زەریاپێوەکان توانای ڕۆیشتن بە ڕووبارەکانیان نییە، چوونکە لە لایەك کەشتییەکان یەکجار گەورە، هەندێکیشیان توانی هەڵگرتنی نیو ملیۆن تەنیان هەیە، لە لایەکی دیکە ئاوی زەریا سوێرە و هی زێ شیرینە، ڕۆچوونی کەشتیی لە ئاوی سوێر زۆر کەمترە تا لە ئاوی شیرین، بەڵام کەشتییە دارینەکانی ئەوکات توانی گواستنەوەیان زۆر کەمتر بوو لەوانەی ئێستە، هەروەها زۆر بچووکتر بوون و بە ئاسانی دەیانتوانی بچنە نێو زێییەکان، ئەو کەشتییانەی لە کەنداوی فارسەوە دەهاتن بە ئاسانی دەچوونە ناو زێیەکانی دیجلە یاخۆ فورات و تا تیسفون دەڕۆیشتن، چوونکە ئەو کەشتییانە لە بەندەرەکانی باشووری ئاسیاوە دەهاتن، هەندێك جار نەخۆشی تاعوونیشیان دەگواستەوە بۆ ئێران.

خێرایی گواستنەوەی نەخۆشی تاعوون پێش ئەوەی بگاتە مرۆڤ، زۆر نەبوو.

ئێستە زانراوە هەتا ئەو کێچەی لەسەر مشك دەژییێت، نەپەڕێتەوە سەر مرۆڤ و مرۆڤ نەگەزێت، مرۆڤ دووچاری نەخۆشی تاعوون نایەت، ئەگەر هەزاران مشکی تووشبوو بە تاعوون لە مرۆڤەکان نێزیك بن، بەڵام کێچەکانیان نەپەڕنەوە سەر مرۆڤ و نەیگەزن، مرۆڤ تووشی تاعوون نابێت، بەڵام هەر کە مرۆڤێك گرفتاری ئەو نەخۆشییە بوو، ئیدی خێرایی گواستنەوەکە زۆر دەبێت و بچووکترین بەریەککەوتنی مرۆڤی تەندروست بە مرۆڤی تووشبوو، تەنانەت قسەکردن لەگەڵ مرۆڤی تووشبوو، دەبێتە هۆی گواستنەوەی نەخۆشییەکە.

لە ساڵی (٣٣٠ ز) بە هۆی ئەو کەشتییانەی دەهاتنە شاری تیسفون، تاعوون گەیشتە ئەو شارە و ڕۆژێك دەنگۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ڕەش لەو شارە پەیدا بوو، ئەو دەنگۆیە بە خێرایی لە تەواوی گەڕەکەکانی شارەکە لەمبەر و ئەوبەری دیجلە بڵاو بۆوە. لەگەڵ دەنگۆکەدا

خەڵك بە خێرایی کەوتنە هەڵاتن لە شاری تیسفون، بەڵام هەموو کەس ئامرازی پێویستی بۆ هەڵاتن نەبوو، هەندێك کەس هەبوون کە توانایان نەبوو تیسفون بەجێ بهێڵن، هەرچەندە پێشبینیان دەکرد کە بە هۆی ئەو نەخۆشییەوە دەمرن.

بە بیستنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعوون لە تیسفوندا، دەرگەی ئاگرخانەی گەورەی تیسفونیان داخست، چوونکە خەڵك لەوکاتانەدا پەنایان دەبردە بەر ئاگرخانەکان، دەوترا کە نەخۆشی گوێزەرەوە ناچێتە نێو ئاگرخانەکان، بەڵام ئاگرخانەی تیسفون، وێڕای ئەوەی مەزن بوو لە توانایدا نەبوو تەواوی خەڵکی تیسفون وەربگرێت، ئەو مووغەی سەرۆکی ئاگرخانەکە بوو، فەرمانیدا تا تەواوی دەرگەکانی ئاگرخانەکە دابخرێت.

لەو جۆرە کاتانەدا بە فەرمانی مووغی ئاگرخانەکە، هەموو خزمانی خۆی و کارمەندەکانی ئاگرخانە و هەندێ لە گەورەکانی شار بە نهێنی دەهێنران بۆ ئاگرخانە و رێگە لە هاتنی خەڵکی ئاسایی دەگیرا. پێدەچێت پچڕاندنی پێوەندیی ئاگرخانە لەگەڵ دەرەوە و داخستنی دەرگەکانی بووبێتە رێگر لە گەیشتنی تاعوون بۆ نێو ئاگرخانەکان.

لە شارەکانیتری ئێرانیش بە هەمان شێواز و لە کاتی هاتنی نەخۆشییە گوێزەرەوەکاندا دەرگاکانی ئاگرخانەکان دادەخران.

ئێستە دەزاندرێت داخستنی دەرگەکانی ئاگرخانە و پچراندنی پێوەندی ئاگرخانە بە دەرەوە، بۆتە هۆی رێگری کردن بە گەیشتنی نەخۆشی بۆ ناو ئاگرخانە.

خەڵکی ئێستە پێداویستییەکانی رێگریکردن لە نەخۆشییە گوێزەرەوەکانیان بەردەستە و دەتوانرێت رێگە لە نەخۆشی وەك تاعوون و پەتا بگیرێت و بە بەڵای ئاسمانی نازانرێن، بۆیە ئاسان نییە ئێستە لە دۆخی ئەوسا واتە سەدەی چوارەمی زاینی شارێك تێ بگەین.

هەرکە ئەو دەنگۆیە بڵاوبۆوە، کە نەخۆشی تاعوون لە شاری تیسفون برەوی گرتووە، خەڵك بە بێ پسانەوە دەستیان کرد بە دەرچوون لەو شارە، ئاراستەی جووڵەی ئەوان بێ پسانەوە بەرەو باکور یاخۆ رۆژهەڵات بوو، هەموو ئەوانەی توانای دەرچوونیان لە شار هەبوو، بەو ئامێرانەی گواستنەوە کە هەیان بوو کەوتنەڕێ.

دوو کاروانی گەورە و تا رادەیەك بێ کۆتایی لە دوو رێگەی جیا بەرەو باکور و رۆژهەڵات ڕۆیشتن. ئەو کەسانەی توانای دەرچوون لە شارەکەشیان نەبوو، بە پەلە و بەپێی داهاتی خۆیان یان بەپێی بوونی جێگە بۆ هەڵگرتنیان کەوتنە کڕینی ئەو خۆراکانەی تێك نەدەچوون.

تیسفون شارێکی گەرمەسێر بوو، دانیشتووانەکەی وەك دانیشتووانی شارە کوێستانییەکان بۆ دابینکردنی خۆراك و پاشکەوتکردنی ورد‌بین نەبوون، وێڕای ئەوەش لەو شارەدا ئەوانەی داهاتیان ناوەندی بوو، بە شێوەی بەردەوام کەمێك خواردەمەنیان لە ماڵەکانیان هەبوو، بەڵام چوونکە نەیاندەزانی ماوەی درێژەکێشانی نەخۆشی تاعوون لە شاری تیسفون چەند دەبێت، بۆیە بەپێی توانای خۆیان کەوتنە کڕینی خۆراك و سووتەمەنی و بردنەوەیان بۆ ماڵەکانیان.

ئەوان پەلەیان بوو، چوونکە دەیانزانی بە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە، کاروبار و بازاڕی شار و ژیان لەو شارە دادەخرێت.

ڕۆژی دوای هاتنی تاعوون لە کۆڵان و بازاڕی شاری تیسفون، جگە لە ئەوانەی هیچ شوێنیان نەبوو، کەسی دیکە لە دەرێ نەدەبینرا، ئەوکاتیش لە شارە گەورەکان کەسانێك هەبوون کە هیچیان نەبوو، هەر شەوێك لە شوێنێك ڕۆژیان دەکردەوە، ئەگەر شارێکی گەورەکەی وەك شاری تیسفون شارێکی گەرمەسێر بووایە، هەوای ئازاد و فێنکی شەوانەی ئەو شارە دەبووە هاندەر بۆ ئەوەی ئەو کەسانە تا دواساتی ژیانیان لەو جۆرە ژیانەیان بەردەوام بن.

ئەو کەشتییانەی لەنگریان لە کەناری ئەو شارە گرتبوو، لەنگەرەکانیان ڕاکێشایەوە و دەستیان کرد بە دوورکەوتنەوە لە شاری تاعووناوی و نەیاندەزانی کە هەر بەشێك لە خۆیان هۆکاری هێنانی ئەو نەخۆشییە کوشندەیەن.

شاری تیسفون ببوو بە یەکێك لە بەندەرە گەورەکانی بازرگانی ئاسیا و لە نیوەی یەکەمی دەسەڵاتی ساسانییەکاندا ئەو شارە بە ڕادەیەك گەورە ببوو، کە ئەو کاروانەی دەهاتە ئەو شارە چەندین ڕۆژی پێویست بوو تا لەو شارە دەربچێت، ئەو بابەتە تەنیا لەلایەن مێژوونووسە خۆماڵییەکان باس نەکراوە، مێژوونووسەکانی دیکەی وەك ئەرمەنییەکانیش ئەوەیان پشتڕاست کردووەتەوە. چوونکە ئەو شارە ناوەندی دەسەڵاتیی ساسانی بوو، جگە لەئەوەی بەندەرێکی گەورە و بە بایەخ بوو، ناوەندی دەسەڵاتی سیاسی و بەڕێوەبردنی ئەو ئیمپراتۆرییەتە بوو، هەموو شازادە و فەرماندە و دەسەڵاتدارانی وڵات بە هۆی پۆستەکانیانەوە ناچار بوون بچنە پایتەخت و لە تیسفون و لە یەکێك لە دوو کەنارەکانی **دیجلە** نیشتەجێ بن.

کۆشکەکان و ئەو خانووانەش کە بە لاسایی ئەوان چێ کرا بوون، شاریان لە هەردوو کەناری ڕووباری **دیجلە** زۆر گەورە کردبوو، لەو شارە گەورەیەدا هەموو کار و ئاڵوگۆڕێك و هەموو جۆرە بازرگانییەك داخرا.

بازرگان و سەوداکار و پیشەوەران شوێنەکانی خۆیان داخست و بۆ ماڵەکانیان ڕۆیشتنەوە، هەموو شوێنەکانی دەستەبەرکردنی ئازووقە و هەموو شوێنەکانی ئامادەکردنی خۆراك وەك نان و خواردنگەکان داخران ئەوەی پێویستی بە خواردن ببووایە، دەبوو لە ماڵی خۆی و لەو خۆراکانەی هەیەتیی بخوات یان بۆ خۆی لە ماڵەکەیدا نان بکات. ئەگەر نەخۆشێك دەرمانی پێویست ببووایە، نەیدەتوانی بەردەستی بخات، چوونکە دەرمان فرۆشەکانیش وەك خەڵکی دیکە شوێنەکانیان داخست بوو، بۆ ماڵەکانیان ڕۆیشتبوونەوە و لەنێو ماڵەکانیان خۆیان قایم کردبوو، بۆ ئەوەی دووچاری نەخۆشی تاعوون نەبن.

لە کاتی ڕوودانی تاعوون، شاپووری دووەم لە پایتەخت نەبوو، لە ئازەربایجان دەگەڕایەوە، هەواڵی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ڕەش یاخۆ تاعوون لە کارامسین یاخۆ کرماشانی ئێستە بە شاپوور گەیشت.

پێش ئەوەی شاپووری دووەم بگاتە کارامسین و گوێبیستی هەواڵی نەخۆشییەکە ببێت، دەرفەتی هێنا و بۆ زیارەت ڕۆیشت بۆ (شیز).

بە هەمان شێواز کە موسوڵواتان ئارەزوو دەکەن لانی کەم جارێك لە تەمەنیان بچن بۆ زیارەتی کەعبە، هەر مەسیحیەکیش ئارەزوو دەکات لە تەمەنیدا یەکجار بۆ (بەیتولمەقدەس) بچێت، ئەو کات زەردەشتییەکانیش ئارەزوویان دەکرد لانی کەم یەکجار لە تەمەنیان، بچنە سەردانی شیز کە ئێستە بە تەختی سلێمان ناسراوە.

شیز یاخۆ شیت هێندە پیرۆز بوو کە هەندێ لە پاشاکانی ساسانی هەر وەك چۆن پاشای گەورەی سەفەوی (شا عەباس) بە پێ لە ئەسفەهانەوە بۆ مەشهەد ڕۆیشت، بە هەمان شێوە بە پێ لە تیسفونی پایتەختەوە بۆ ئەو شوێنە دەڕۆیشتن.

شیز برێتی بوو لە ئاگرخانەیەك کە لەسەر شاخێك بوو، بە هەمان ناو ئاگرخانەیەکی گەورە و جوان بوو کە بە جوانترین و ناسکترین جوانکارییەکانی ئەو کاتی ئێران ڕازاندرا بۆوە.

تەواوی ئاگرخانەکان لە سەردەمی ساسانییەکاندا خودان کۆمەڵێك موڵك و ماڵ بوون تا بە سوود وەرگرتن لە داهاتەکانیان، ئاگرخانەکە بەڕێوە بچێت و موڵکەکانی ئەو ئاگرخانەیە لە تەواوی موڵکەکانی ئاگرخانەکانی دیکە پتر بوو.

جگە لەوە شیز وەك مۆزەخانەیەکی نیشتمانی گەورە وابوو کە کەرەستەکانی ئەوێ لەلایەن خاوەن توانا و دەوڵەمەندەکانەوە دەدرا، هەندێ لە ئەوان پێش ئەوەی بمرن، گرنبەهاترین و دەگمەنترین دیارییەکانی خۆیان بەو ئاگرخانەیە دەسپارد، چوونکە ئەوان وایان مەزەندە دەکرد

كه هەر كەرەستەيەك بدرێتە شيز لەنێو ناچێت و دەمێنێتەوە، بەڵام لەوانەيە ميراتگرەكانيان هەرزان فرۆشی بكەن.

ژمارەيەكی زۆر شمشێر ڕازێندراوە، گۆچانی زێڕين و ئاوسارە زێڕينەكان و خشڵە پڕ بەها و دەگمەنەكان لە شيز هەبوون كە مرۆڤ لە بيستنی ژمارەكەيان دووچاری سەرسووڕمان دەبوو. پاشاكانی ساسانی بۆ زيارەت دەچوونە ئەو شوێنە، بۆيە لە تەختی سلێمان كۆشكێك بۆ ئەوان چێ كرا بوو، ئەو كۆشكەش وەك پرۆفيسۆر (پۆپ) ئێرانناسی ناسراو باسی دەكات، لە تەلارە مەزنوكانی سەردەمی ساسانييەكان بوو.

ئەمڕۆ ئەگەر گەشتيارێك بچێتە تەختی سلێمان، وێڕای ئەوەی لە تەلاری مەزنی ئاگرخانەی شيز و كۆشكی ساسانييەكان، جگە لە وێرانە هيچی ديكە نەماوەتەوە، بكێش دەبێت بۆ نێو شكۆی سرووشتی ئەو دەڤەرە و هەر كەسێك خۆی جوانی ئەو سرووشتەی ئەوێندەر نەبينێت، تێ ناگات كە بۆچی ئێرانييەكان ئەو شوێنەيان بە پيرۆز دەزانی و گەورەترين و بەشكۆترين ئاگرخانەيان لەو شوێنە دامەزراندبوو، هەروەسا چۆن باوەڕيان كرد كە زەردەشت لە شيز لە دايك بووە.

ئەمڕۆكەش كە نێزيكەی چواردە سەدە بەسەر لەنێوچوونی زەنجيرەی پاشايەتيی ساسانييەكاندا تێپەڕ بووە تا ئێستەش نهێنی گەورەی دەرياچەی تەختی سلێمان ئاشكرا نەبووە و زەويناسەكان نەيان توانيوە هۆكاری چۆنييەتيی چێبوونی ئەو دەرياچەيە، هەروەها هۆكاری لەنێونەچوونی بدۆزنەوە. ئەو دەرياچەيە هێندە قووڵە كە هەزار مەتر لە گوريسی تايبەتی پێوانەكردنی قووڵی ئاويان خستە نێوی و ئەو تەنە قورسەی لەسەری گوريسەكە بەسترابوو، نەگەيشتە بنی دەرياچەكە.

ئاوی دەرياچەی تەختی سلێمان هێندە زۆرە كە بۆتە سەرچاوە و دەستپێكی دوو ڕووبار، ئەو دوو ڕووبارەش بەردەوام لەو دەرياچەيە دێنەدەر و بە دامێنی شاخدا شۆڕ دەبنەوە.

بە ڕای زەويناسان دەرياچەی قووڵی تەختی سلێمان نهێنييەكی ئاڵۆزە، چوونكە زەوناسان تا بە ئێستە دەگات نازانن سەرچاوەی ئەو ئاوەی دەرياچەكە لێوڕێژ دەكات لە كوێيە. شاخی تەختی سلێمان بە بەراورد بە پێ دەشتەكانی دەوروبەری، شاخەكە بەرزترە و بەيرزيەكەی لە ئاستی دەرياش دەگاتە (٢٢٠٠) مەتر.

لای کەس شاراوە نییە ئاو لە سەرەوە بۆ خوارەوە دێت و ناتوانێت لە خوارەوە بۆ سەرەوە بڕوات و ئاوی تەختی سلێمان لە شاخێکە بە بەرزایی (٢٢٠٠ م) نەزانراوە کە لە کوێوە دێت و دەگاتە لووتکەی ئەو شاخە.

بە باوەڕی زەردەشتییە کۆنەکان زەردەشت بە ئاماژەی پەنجەکانی و بۆ ئەوەی دانیشتووانی ئاگرخانەکە هەرگیز بێ ئاو نەبن، ئەو شوێنەی درز پێدا و شکاندی و ئاوی لێ هێنا، بەڵام پەسەندکردنی ئەو بابەتە لە روانگەی زانستییەوە ئەستەمە. تا ئێستە زەویناس و زانایانی ئەو سەردەمە نەیانتوانیوە سەرچاوەی ئەو ئاوە بدۆزنەوە، بۆیە لۆمەکردنی خەڵکی ئەوکات بۆ باوەڕەکانیان لەبارەی ئەو دەریاچە و ئەوەی کە بە ئاماژەی دەستی زەردەشت ئاوەهای لێهاتووە، کارێکی شیاو نییە.

یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئێرانییە کۆنەکان، بە تایبەت دوای دروستبوونی ئاگرخانەکان، چاندنی گوڵ بووە و لە کەناری هەر ئاگرخانەیەك لە ئێراندا، گوڵخانەیەك هەبووە، ئەگەر ئاگرخانەکە لە ناوچەی سەرسەوزی وەك بەڵخ و شیزیش بووایە، ئەوا لە کەنار ئەودا گەرمخانەیەك بۆ گوڵەکان چێ دەکرا تا لە زستاندا جۆرەکانی گوڵی تێدا بفرۆشرێت و بێبەش نەبن لە هەبوونی گوڵ. بەر لە ئێستە و لەو پەڕتووکەدا باسکرا کە نەریتی پێشکێشکردنی گوڵ بە دۆست و خۆشەویستەکان، نەریتێکی ئێرانی بوو و ئەورووپاییەکان ئەو نەریتە لە ئێرانییەکان فێر بوون.

پرۆفیسۆر (پۆپ) نووسەری پەڕتووکی گرانبەهای (چاوخشاندنێك بە مێژووی ئێراندا) دەڵێت: (ئەو سەردەمەی لە شیز گەرمخانە بۆ پەروەردەی گوڵ هەبوو، لە هیچ شوێنێکی جیهاندا گەرمخانەی ئاوا جوان و گەورە بۆ ئەو مەبەستە نەبوو).

دەگێڕنەوە کە لەژێر تەختی سلێماندا واتە لەژێر وێرانەکانی ئەو شوێنە کە ئێستە دەبینرێن، هەندێك ژێرزەمین هەبوون کە لە کاتی هەڕەشە و مەترسیدا، موبیدەکانی زەردەشتی ئاگری پیرۆز و خشڵ و کەرەستە گرانبەهاکانیان دەگواستەوە بۆ ئەو ژێرزەمینانە.

لە مێژووی کۆنی ئێران دووجار هەموو مۆزەخانەی گەورەی ئێران بە تاڵان براوە، یەکەمیان لە سەردەمی هێرشی ئەسکەندەر بۆ ئێران و بە تاڵانبردنی پێرسپۆلیس بوو، ئەویدی لە سەردەمی هێرشی (هەرقل) ئیمپراتۆری رۆمی بچووك بوو کە مۆزەخانەی تەختی سلێمانی بە تاڵان برد.

لە هەردووجاردا ئەوەی لەو مۆزەخانانە براوە و لە پەڕتووکە مێژووییەکاندا نووسراوە، هێندە زۆرە کە لە کاتی بیستنی ئەو بابەتانە، دووچاری سەرسووڕمان دەبین.

پێرسپۆلیس بۆ ماوەی دوو سەدە و نیو واتە لە تەواوی سەردەمی هەخامەنشییەکاندا مۆزەخانەی تەواوی وڵاتانی ژێردەستی هەخامەنشییەکان بوو، هەر کەرەستەیەکی دەگمەن و دیار هەبووایە، دەهێندرا و لەو کۆشکە دادەنرا.

شیزیش لە ماوەی چوار سەدە دەسەڵاتی ساسانییەکان ناوەندێکی ئاینی گەورە و مۆزەخانە بووە، پاشا و دەسەڵاتدار و خاوەن سەرمایەکان کەرەستە دەگمەنەکانیان بە شیز دەبەخشی.

کەواتە دەتوانرێت پەسەند بکرێت کە هەر وەك مێژوونووسان نووسیویانە، بە لێکدانەوەی ئەوەی هەرقل (دە کرۆر) زێڕ و زیو و خشڵ و کوتاڵە زێڕینەکان و کاڵا گرانبەهاکانی لەگەڵ خۆیدا بردووە، چوونکە ئەو سەرمایە مەزنە لەو ئاگرخانە و مەزارگەیە برداوە، گێڕانەوەش سەبارەت بە بوونی ئەو ژێرزەمینانە لە تەختی سلێمان ناڕاست بووە، ئەگەر ئەو ژێرزەمینانە بوونیان هەبووایە لانی کەم خزمەتکار و کاربەدەستەکانی ئەو ئاگرخانانە کەرەستە سووکەکانی وەك خشڵ و زێڕ و زیوەکانیان دەگواستەوە بۆ ئەو سەردابانە بۆ ئەوەی پارێزراو بن و بەر تاڵان نەکەون.

کەواتە بوونی ئەو سەردابانە ڕاست نەبووە، ئەگەر ڕاست بوو بێت کارمەندانی ئاگرخانەکە توانایان نەبووە کە کەرەستە گرانبەهاکانی بۆ بگوازنەوە، ئەگەر ئەو کارەشیان کرد بێت، دیارە ڕۆمەکان و هەرقل ئەوانیان دۆزیوەتەوە و بردوویانن. پێویستە بگوترێت کە هەرقل و سەربازەکانی لەسەر ئاینی مەسیح واتە کریستیان بوون.

هەڵبەتە ئێران پەناگەیەکی بەهێز بووە بۆ حەشاردانی کریستیانەکان و بەڵگەش بۆ ئەو بابەتە ئەوەیە کە کۆنترین کڵێسای مەسیحی لە جیهان لە ئێران چێ کراوە، پێش ئەوکات کەس لە مەسیحییەکان نەیوێراوە لە هیچ شوێنێکی جیهان کڵێسا چێ بکان، تەنانەت لە (ئەنتاکیە) کە مێژوونووسانی ئەورووپایی کاتێك باس لە مێژووی کریستیانەکان دەکەن، بە یەکەم نێوەند لە نێوەندەکانی ئاینی کریستیان لە جیهانی دەناسێنن.

پاداشتی چاکەی پاشاکانی ئێران و ئێرانییەکان بۆ پارێزگاری لە کریستیانەکان، ئەوە بوو کە ئیمپراتۆرێکی کریستیانی بە ناوی هەرقل لەگەڵ سەربازەکانی هێرش بکاتە سەر گەورەترین نێوەندی ئاینی ئێران و ئەوەی توانی بیبات، بە تاڵانی برد.

شاپووری دووەم پێش ئەوەی بگاتە کرماشان، چوو بۆ پەرستگەی شیز بۆ زیارەتکردن، کاتێك گەیشتە دامێنی ئەو شاخەی کە ئاگرخانەی شیزی لێ بوو، پێڵاو و گۆرەوییەکانی داکەند، چوونکە نەریت وابوو کە هەر کەسێك چووبایە تەختی سلێمان بۆ زیارەتکردن و توانای

ڕۆیشتنی هەبووایە، دەبووایە سەرەتا پێڵاو و گۆرەوییەکانی دابکەنێت، ڤێجا بەپێی پەتی لە شاخەکە سەربکەوێت.

ئەگەر کەسەکە نەخۆش بووایە، دەبووایە کەسوکارەکەی بە هەمان شێوە پێڵاو و گۆرەوییەکانی دابکەنن و لە شاخەکە سەری بخەن. هەندێ کەس ئەو نەخۆشانەیان دەهێنا بۆ ئەو شاخە کە دووچاری هەندێ نەخۆشی ببوون، کە چارەسەرکردنیان ئەستەم بوو، لە ئەو شوێنە دەمانەوە، باوەڕی هەمووان وابوو، چوونکە ئەو ئاگرخانەیە کەوتووەتە شوێنی لە دایکبوونی زەردەشت، لە توانایدایە نەخۆشییە بێ چارەکانیش چارەسەر بکات.

چوونی شاپووری دووەم بۆ ئەو پەرستگەیە بۆ زیارەت، دەرفەتێکی گەورە بوو بۆ چینێك لەو کەسانەی لەو ئاگرخانەیە بوون بۆ ئازادبوونیان، ئەوان ئەو تاوانبار و گوناهکارانە بوون کە پەنایان برد بووە بەر ئەو ئاگرخانەیە.

نەریتی پەنابردنە بەر پەرستگەکان نەریتێکی تایبەت بوو بە ئێرانییەکان، ئەو خووخدەیە لەنێو نەتەوەکانی دیکە نەدەبینرا، مێژووی هیچ نەتەوەیەکی دیکە باس لە هەبوونی ئەو نەریتە ناکات. هەرچەندە هەندێ لە دەسەڵاتداران و پیاوە گەورەکانی سەردەمە جیاکان لە پەرستگە و کڵێساکان پەناگیر دەبوون و هەر لەو شوێنانە دەمردن، بەڵام لە هیچ شوێنێك جگە لە ئێران ئەو نەریتە نەبووە، کە تاوانبار و گوناهکاران بۆ ئەوەی پارێزراو بن لە سزادرانیان بە هۆی تاوانەکانیانەوە، پەنا ببەنە بەر پەرستگە و کڵێساکان و لەوێ پەنا بگرن، تەنیا لە ئێران ئەو نەریتە هەبوو، ئەوانەی تاوانیان دەکرد ئەگەر لە پەرستگەدا وەرگیرا بووانە تا کۆتایی تەمەن لەو پەرستگەیانەدا دەمانەوە و دەرنەدەچوون، کەسیش ئەوانی سزا نەدەدا تا ئەو کاتەی پەناگیری ئەو پەرستگەیانە بووانە.

پێویستە ئەوەش بزانین کە موبیدەکان هەموو تاوانبارێکیان لە پەرستگەکاندا وەرنەدەگرت، بۆ نموونە ئەوەی بە ئەنقەست یەکێکی دەکوشت یاخۆ ئەو کەسەی دژی پاشای ساسانی یاخی دەبوو، نەیدەتوانی پەنا بباتە بەر پەرستگە، تەنیا ئەو کەسانە لە پەرستگە وەردەگیران کە بە مەزەندەی موغەکان تاوانەکانیان بە تاوانی شیاو بۆ لێخۆشبوون دەناسران.

شتێکی سرووشتی بوو کە تاوانباران بە گشتیی ئاگرخانەی شیزیان بۆ پەناگرتن پێ باشتر بوو بێت لە پەرستگەکانی دیکە، چوونکە دەیان زانی پاشاکانی ساسانی دێن بۆ زیارەت و ئەوان دەکارن لە حەوشە و سنووری زیارەتگەکە داوای لێبووردن لە پاشای ساسانی بکەن.

شاپووری دووەم دوای ئەوەی ڕێوڕەسمە ئاینییەکانی بەجێ گەیاند، لەو تاوانبارانە خۆشبوو کە لە بەرانبەریدا کەوتبوونە سەر خاك و داوای بەخشینیان دەکرد. دواتر وەك سوپاسگوزاری بەرانبەر بە سەرکەوتنی بەسەر هەپتاڵەکاندا، فەرمانی کرد تا پەیکەرێکی بۆ چێ بکەن، لە بەردی سماق و ناوی تەواوی ئەو وڵاتانەی لەژێردەستیدان لە بن پەیکەرەکە بنووسن و لە ئاگرخانەکەدا هەڵی بواسن.[1]

پەیکەری شاپووری دووەم لەژێر چاوەدێری وەستایەکی رۆمی بە ناوی مارکۆس چێ کرا و لە بەردی سماق بوو، تا ئێستە لە شیز نەدۆزراوەتەوە، بەڵام بە گریمانی زۆر شێوازی تاشینی لە

---

(١) باستان ناسی فەرەنسی ژان پرۆ کە سەرۆکایەتیی ئەو دەستەیەی دەکرد کە کاری هەڵکەندنیان لە شووش بۆ ماوەی سێ ساڵ، واتە تا ساڵی ١٩٥٠ زایینی کرد، توانی کۆشکی گەورەی داریوش و پەیکەرەکەی لەژێر خاك بدۆزێتەوە، پێی وایە دانانی پەیکەری پاشاکانی هەخامەنشیی و ساسانی لەناو پەرەستگەکاندا نەریتێکی میسری بووە و هاتووەتە ئێران. ئەو باوەری وایە ئەو نەریتە لە ئێران بوونی نەبووە، دوای ئەوەی داریوش سەفەری بۆ میسر کرد و ماوەیەك لەوێ مایەوە، ئەو نەریتەی هێنا.

ژان پرۆ پیاوێکی زیرەك بووە و قوتابی گێرشمەن بوو، ئەو توانی پەیکەری داریوش کە نیوە پەیکەر بوو، لە رووی مێژووییەوە زۆر بە نرخە لە خاك دەربهێنێتەوە و ئەو پەیکەرە بە تەواوەتی نێزیکەی پێنج تا شەش تەن قورسایی بووە، بێگومان بەردەکەی لە جۆری بەردی بلورینی میسر بووە و لە لایەن پەیکەرتاشە میسرییەکان داتاشراوە، دوای ئەوەی داریوش بڕیاری چێکردنی کۆشکی پێرس پۆلیسی داوە، هەر لە میسر ئەو پەیکەرەیان تاشیوە و قەڵەمکاری سەر پەیکەرەکە و کۆشکەکە بە تەواوەتی لێك چوون. پەیکەرەکە لە میسر بە کەشتی لە رێگەی ئەو کەناڵەی داریوش لە نێوان ڕووباری نیل و دەریای قەلزەم دروستی کردبوو بەرەو کەنداوی فارس و دواتر بۆ شووش گواسترایەوە.

ئەو پەیکەرە بەشی سەرەوەی پێوە نییە، لە رووی داتاشین و نووسینەکانی سەری زۆر بەرچاوە و بە وتەی دەستە فەرەنسییەکەی دەریان هێناوە، ئەوەندە لە داریوش دەچێت کە ئەگەر سەری پێوە بووایە، ئێمە رووخساری ئەومان بە تەواوەتیی بۆ دەردەکەوت و ئەوە لە رووی مێژووییەوە زۆر بە نرخە.

لە لایەکی دیکە نێزیکەی سەدەیەکە هەڵکەندن لە شووش بەردەوامە و رێژەیەکی یەکجار زۆر لە شوێنەوارەکانی کۆشکی شووشیان دۆزیوەتەوە، کە ئەگەر تەنیا ناوەکانی دۆزراوەکان بنووسینەوە دەبێتە پەرتووکێکی زۆر ئەستوور. وێڕای ئەوەش تازە کۆشکەکە کە شەست و چوار دینگەی هەبووە دەردەکەوێت، بۆیە ئەو بیرۆکەیەی ژاك دۆ مۆرگانی فەرەنسی دەبێتە ڕاستی کە دەڵێت لە دڵی شووش ئەوەندە شوێنەواری باستانی لێیە کە ئەگەر گەنجی قارۆن بۆ دۆزینەوەیان خەرج بکرێت، هێشتا بایەخی هەیە. "زەبیحوڵڵا"

شێوازی (تاقی بوستان) دەچێت کە بە دەست سەنگ تاشە رۆمەکانەوە چێ کرابێت و پەیکەرەکەیان لەسەر شێوەی شاپوور دروست کرد و هێنانی بەردەکە و داتاشینی و کارەکانی دیکەی نێزیکەی دوو ساڵی ویست.

ئەو مێژووە باس نەکراوە، تەنیا بە بەراورد لە کاتی فەرمانکردنی شاپوور تا کاتی سەفەری دووەمی کە لە ساڵی (٣٣٢ ز) بۆ شیز واتە دوو ساڵ دواتر بووە، ئەو ماوەیەمان دیاری کردووە. لەوانەیە ئەو لە کاتی سەردانی دووەمی بۆ شیز، پەیکەرەکەی بینی بێت، گومان ناکەین کە دیارکردنی ماوەکە لەلایەن ئێمەوە بێ بنەما نییە.

مارکۆس سەرەتا و پێش ئەوەی دەست بە تاشینی پەیکەری شاپوور لە بەرد بکات، بە مۆم یاخۆ شانەی هەنگوین مۆدێلێکی بۆ پەیکەری شاپوور چێ کرد و مۆم لەو سنوورە زۆر دەست دەکەوت، هێشتاش هەر ئازەربایجان لەو ناوچانەیە کە هەنگوینی زۆرە، بە گریمانی زۆر سەر و ڕووخساری پەیکەرەکە لە تیسفون و لە بەرانبەر شاپوور لەلایەن سەنگ تاشەکەوە چێ کراوە و گواستراوەتەوە بۆ ئەوێ، بێگومان بۆ ئەو کارش تەنیا یەك بەرد بەکار نەهاتووە، دەبێت چەند پارچە بەردێك هێنرابێتە شیز یاخۆ تەختی سلێمان.

هەرچەندە کەم وایە بەردی سماق ناوەکەی پتەو نەبێت و ناوی کون بێت، بەڵام بۆ ئەوەی دووچاری ئەو جۆرە کێشەیە نەبنەوە لە جیاتی تەنیا بەردێك، چەندین جۆر بەردیان بۆ ئەو کارەیان گواستووەتەوە، ئاشکراشە کە گواستنەوەی بەرد لە دامێنی شاخەکە بۆ تەختی سلێمان چەند سەختە و چ کارێکی پێویست بووە، بەڵام ئێرانییەکانی ئەو سەردەمە توانیویانە بۆ گواستنەوەی شتی قورس سوود لە بارییە و ئامێری گواستنەوەی بەردی قورس وەربگرن، بۆ ئەو کارەش ئامێری تایبەتیان هەبووە، ئەو کەسانەی بڕوا ناکەن دەتوانن سەردانی وێرانەکانی پێرسپۆلیس لە فارس بکەن و ئەوکات بۆی دەردەکەوێت کە گواستنەوەی ئەو هەموو بەردانە بۆ ئەو شوێنە، دواتر بۆ سەر کارەکە هەروا ئاسان نییە و بەبێ ئامێرەی تایبەت نەکراوە.

پەیکەرتاش و هاوکارەکانی ناوی وڵاتە ژێردەستەکانی ساسانیان لە بنکەی پەیکەرەکە نووسی، لە سەردەمی شاپووری یەکەم و لە کەتیبەی نەقشی رۆستەمدا ناوی سی و حەوت وڵات هاتووە، لە کاتی شاپووری دووەم ئەو ژمارە زۆر کەمتر بووە و لە کاتی دەسەڵاتیی پاشا بێ دەسەڵاتەکانی ساسانی کە کەوتبوونە نێوان ئەو دووانە، زۆرینەیان لە ساسانییەکان جیا

ببوونەوە. نەریتی نووسینەوەی ناوی وڵاتەکان لەژێر پەیکەرەکان یاخۆ لە کەتیبە و شتی دیکەدا، نەریتێك بوو کە لە هەخامەنشییەکانەوە گواستراوەتەوە و بەردەوام کراوە.(٢)

لە ساڵی (٣٣٢ ز) شاپوور بۆ بینینی پەیکەری خۆی رۆیشت بۆ شیز، گوایە لە پەیکەرەکە زۆر رازی بووە، بە وتەی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان هەزار سککەی زێڕ دیار داوەتە پەیکەرتاشەکە و ئەوی بە ماڵی دنیا دەوڵەمەند کرد، چوونکە ئەو زێڕە هێندە زۆر بوو کە تا کۆتایی تەمەنی دەیتوانی بە باشی بژیت، دوای مردنیش میراتی باش بۆ منداڵەکانی بەجێ بهێڵێت.

دوای ئەوەی شاپوور کۆتایی بە زیارەتەکەی بۆ شیز هێنا، بەرەو تیسفون کەوتەڕێ، هێشتا تاعوون لە شارەکە مابوو، خەڵك بە هۆیەوە دەمردن، شار تەنیا ئەو کەسانەی لێ مابوو کە توانای رۆیشتنیان نەبوو، ئەوانیش ناچاربوون لە شارێك بژین کە کەسی تێدا نەماوە و لە ماڵەکانیان دەرنەدەچوون، شار بە تەواوەتی چۆڵ و ڤاڵادیار بوو، بازاڕیش خڕ داخرا بوو.

لە سەردەمی کۆندا هیچ نەخۆشییەك وەك تاعوون خەڵکی نەدەترساند، تەنانەت کولێرەش هێندە مەترسی نەدەخستەوە، وەك زانراوە کە لە کاتی هاتنی میکرۆبی تاعوون بۆ نێو جەستەی مرۆڤ تا ئەو کاتەی یەکەم نیشانەکانی دەردەکەوێت، سێ رۆژ دەخایەنێت کە بە سووڕی ژیانی ئەو میکرۆبە ناسراوە.

لە رابردوودا خەڵك ئەو بابەتەیان نەدەزانی و وایان بیردەکردەوە کە ئەگەر بە پەنا کەسێکی دووچار بە تاعووندا بڕۆن، راستەوخۆ دووچاری ئەو نەخۆشییە دەبن و نەخۆشییەکەیان بە بەڵای ئاسمانی دەزانی، بۆیە ترسێکی تایبەتیان لەو نەخۆشییە هەبوو. ئەوان جیاوازیان نەدەکرد لە نێوان ئەهریمەن و تاعوون و لە هەردووکیان بە یەك رادە دەترسان.

سەبارەت بە بەروار و مێژووی دامەزراندنی (قەرەنتینە) زانیاریمان نییە و نازانین لە کەیەوە فێر بوون کە نەخۆشەکانی دووچاربوو بە نەخۆشییە گوێزەرەوەکان بۆ ماوەی چل رۆژ لە

(٢) لە پەیکەری داریوش کە لە شووش دۆزرایەوە، لەژێر ناوی هەر وڵاتێکی ژێردەستی ئێران، هێمایەك هەبوو کە تا ئەمرۆ زانیاریمان لە بارەی نییە، لەوانەیە ئاڵا یاخۆ نیشانەی تایبەتی ئەوان بوو بێت، تەنانەت لە کەتیبەی بێستوونیشدا کە لە راستیدا پەڕتووکێکی مێژووییە، ئەو هێمایانە نەبوون، تەنیا ناوی وڵاتەکان هەبوون، ئەمەش زانیارییەکی بە بایەخی مێژووییە. لەوانەشە ئەگەر پەیکەری پاشای ساسانی دەست بکەوێت، بابەتی هاوشێوە هەبێت، بەڵام چونکە هیچ هێمایەکی ئەو وڵاتانەمان دەست نەکەوتووە کە هی ساسانییەکان بێت، ناتوانین دڵنیا بین کە شتی ئاوا هەیە. "زەبیحوڵڵا"

نەخۆشخانەی تایبەت دابنێن و ڕێگەی هاتنە ناو شاریان پێ نەدەن، بەڵام گومانمان نییە ڕێگرتن لە هاتنی خەڵکی شارە تووشبووەکان بە نەخۆشی تاعوون بۆ شارێکی تووش نەبوو زۆر کۆنە، تەنانەت لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا ڕێگریان دەکرد لە چوونی خەڵکی دانیشتووی شارە تووشبووەکان بە تاعوون بۆ ئەو شارانەی تاعوونیان لێ نەبوو.

زانیاریمان لەبارەی یاساکانی تایبەت بە قەرەنتینە لە کۆندا نییە و نازانین کە نەخۆشەکانیان بۆ ماوەی چەند ڕۆژ لە قەرەنتینەدا هێشتووەتەوە، تەنیا دەزانین کە ئەوانەی دووچار دەبوون، دووکەڵیان پێ هەڵدەمژین و باوەڕیان وابوو کە دووکەڵ بوونی نەخۆشی لەنێو دەبات، بەڵام بوونی قەرەنتینە پێویستی بە دیارکردنی ڕێگەکانی هاتوچۆ هەبوو، جگە لەو ڕێگەیانەش کەس بۆی نەبوو لە ڕێگەیەکی دیکەوە هاتووچۆ بکات، ئەگەر ویستبایان ئەو کارە لەگەڵ تیسفوندا بکەن دەبووایە بە درێژایی دیجلە لە باکور و باشوور و ناوەڕاستی شارەکەوە بگەنە قەرەنتینە.

بەپێی زانیارییەکان کاتێك تاعوون گەیشتە تیسفون، ئەو ساڵە بوو کە قەرەنتینە لەو شارە نەبوو، چوونکە شارەکە خۆی سەرچاوەی تاعوون بوو، هەر کەس لەو شارە دەڕۆیشت بوونی ئەو نەخۆشییەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد.

یەکێك لە گرفتەکانی شارێك کە دووچاری تاعوون دەبوو لە کۆندا ئەوە بوو کە تەرمی مردووەکان لەسەر زەوی دەمایەوە.

باسکردنی ئەو بابەتە کە دوای هاتنی ئیسلام بۆ ئێران، ناشتنی مردووەکان بوو بە ئەرك بۆ مسوڵمان، هەر کاتێك کە تاعوون بۆ ئێران دەهات و خەڵکی دەکوشت، ئێرانییە مسوڵمانەکان تەرمی مردووەکانیان دەناشت. چوونکە لە ئیسلام ناشتنی مردوو بە ئەرکی کیفایە ناسراوە، کاتێك کەسێك لە شارێك دەمرێت، ئەوا ئەرکی هەمووانە تا بە ئەرکی ناشتنی ئەو مردووە هەڵبستن، ئەگەر کەسێکیش ئەو ئەرکەی بە ئەستۆ گرتبووایە، ئەوا هەمووانی لەو ئەرکە ڕزگار دەکرد، بۆیە دوای هاتنی ئیسلام بۆ ئێران، تەرمی ئەو کەسانەی بە تاعوون دەمردن لە گۆڕێ نەدەمایەوە، بەڵام کاتێ باسی ئێمە ساڵی (٣٣٠ ز) و سێ سەدە پێش هاتنی ئیسلامە.

وەك زانراوە زەردەشتییەکان تەرمی مردووەکانیان تەنیا لە دوو کاتدا دەناشت، یەکەمیان لە کاتی جەنگ، دووەمیان لە کاتی هاتنی نەخۆشییە گوێزەرەوەکان بوو، لە هەردوو دۆخدا ژمارەی قوربانیان هێندە زۆر دەبوو کە نەیاندەتوانی بە نەریتی خۆیان بیان نێژن، واتە لە

شوێنێك تەرمەكە دابنێن تا دەڕزێت، دواتر ئێسكەكان لەو چاڵانە بكەن كە پێشتر بۆیان ئامادە كردوون.

لە تیسفون هەموو ئەوانەی دەبووایە تەرمەكان بنێژن لە ترسی دووچار بوون بە نەخۆشییەكە ڕایان كردبوو، تەرمی مردووەكان لە هەموو شوێنەكانی شارەكە هەبوون، تەرمەكان لەو هەوا گەرمەی ئەوكاتدا بۆگەن ببوون، ئەمەش وادەكرد لە ئاسمانەوە داڵە كەرخۆرەكان و لە زەویشەوە كەمتیارەكان بەرەو شار بكێش بن.

لەگەڵ هاتنی شەو كەمتیارەكان هێرشیان دەكردە نێو شار و سەگە گەورە گەڕۆكەكان كە بە هۆی بوونی تەرمی مردووەكان و چۆڵبوونی شارەكە، ببوون بە سەگی كێوی و دڕندە، لە كۆڵان و شەقامەكانی شارەكە بڵاو دەبوونەوە.

خواردنی لاشەی مردووەكان سەگەكانی كردبووە دڕندە، ئەگەر لە شەودا كەسێك بە هۆی كارێكی پێویست لە ماڵ دەرچوو بووایە لەلایەن سەگەكانەوە پەلامار دەدرا و پارچە پارچە دەكرا و دەخورا، شەو تا بەرەبەیان دەنگی سەگوەڕ دەهات، بەڵام كەمتیارەكان بێ دەنگ بوون و كەس دەنگی نەدەبیستن، چوونكە كەمتیار ئەو ئاژەڵەیە كە نالوورنێت تەنیا ئەو كاتە دەلوورێنێ كە بیەوێت جووتەكەی خۆی بانگ بكات.

لەگەڵ هاتنەوەی رۆژیش سەگ و كەمتیارەكان ون دەبوون، كەس نەیدەدۆزینەوە، ڤێجا نۆرەی هاتنی داڵەكان دەهات تا سكیان بە خواردنی گۆشتی مردووەكان تێر بكەن.

تا ئەوكات كەس نەی بینی بوو كە داڵەكان بێنە نێو شارەكان، چوونكە ئەوان لە شار و گوندان دەترسان، بەڵام ئەوكات شاری تیسفون بە رادەیەك چۆڵ و بێ دەنگ ببوو، كە لەوانەیە ئەوانیش ئەو شارەیان بە بیابان هەژمار كردبێت و بێ ترس لەوێندەر خۆیان تێر كردبێت.

تەرمی مردووەكان هێندە زۆر بوو كە هەندێك لە داڵەكان توانای داخستنی دەندووكەكانیان نەبوو، چوونكە هێندە زۆریان دەخوارد كە چیكڵدانەیان ئەستوور دەبوو و نەیدەهێشت دەندووكیان دابخرێت.

راپۆرتی ئەو دیمەنانە دەگەیشتە شاپووری دووەم و ئەوی بە سەختی ناڕاحەت دەكرد و لە بیری ئەوەدا بوو كە بۆچی گەورەكانی شار هیچ ناكەن بۆ كۆكردنەوەی تەرمەكان.

هەرچەندە لە راپۆرتەكاندا دەوترا كە گەورەكانی شار رۆیشتوون، بەڵام شاپوور دەیوت لەنێو ئەوانەی لە شار ماونەتەوە بە دڵنیاییەوە كەسانێك هەن، كە زانا و دیارترن لە ئەوانی

دیکە و دەبێت ئەوان لاشەی مردووەکان بنێژن و ڕێگە نەدەن تەرمەکان بە ڕۆژ لە بەردەم پەلاماری داڵەکان بن، شەویش لە بەردەم هێرشی کەمتیار و سەگە دڕندەکاندا بن.

شاپوور زۆر پەلەی بوو تا بگاتەوە تیسفون و بڕواتە نێوشار، بەڵام ئەوانەی لێی نێزیك بوون ئامۆژگاریان دەکرد کە شار مەترسی زۆرە و لاشەی مردووەکان کە لە هەموو شوێنێك هەیە، بۆتە مایەی بڵاوبوونەوەی تاعوون لە تەواوی شاردا و ئەو کەسەی بگاتە نێو شار دووچاری ئەو نەخۆشییە دەبێت.

شاپوور دەیوت ئەگەر ئێوە ناتانەوێت بێنە نێو شار، من بە تەنیا دەڕۆم و ئەوان دەستیان لە گووشار و ئامۆژگاری ئەو هەڵ نەدەگرت و دەیان وت کە شاپوور پاشای وڵاتە و کەسێکی ئاسایی نییە کە تووشبوونی نەبێتە مایەی کێشە بۆ بارودۆخی وڵات.

ئەوان دەیانوت کە ئەگەر هەریەکە لە ئێمە دووچاری ئەو نەخۆشییە ببین و بمرین، تەنیا کەسوکارمان ماتەم دەیانگرێت، بەڵام ئەگەر پاشا دووچاری ئەو نەخۆشییە ببێت و چارەسەری نەبێت، تەواوی سنووری ساسانییەکان دەکەونە ماتەم.

دوو ڕۆژ پێش ئەوەی شاپوور بگاتە نێزیك شاری تیسفون، باران دەستی بە بارین کرد و شاپوور لەژێر باران بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تا گەیشتە دەوروبەری شارەکە و لە ئەوێ چەند کەسێك لە ئەوانەی هاوڕێی بوون کەوتنە پاڕانەوە تا ڕێگری بکەن لە ڕۆیشتنی ئەو بۆ نێو شار، بەڵام شاپوور گوێی پێ نەدان و ڕۆیشتە نێوشار.

هەوای شار بە هۆی بۆنی گەنیووی مردووەکان بۆ هەڵمژین نەدەشیا، لە هەموو کۆڵانێك پاشماوەی لاشەی مردووەکان کە کەوتبوونە بەر پەلاماری گیانلەبەر و ئاژەڵان بەرچاو دەکەوتن. دەرگەی زۆرینەی ماڵەکان کراوە بوو، دەردەکەوت کەس لە ماڵەکاندا نییە، لە ماڵەکانیشەوە بۆنی گەنیووی مردووەکان دەهات.

شاپوور زانی گەورەترین و گرینگترین ئەرکی برێتییە لە ناشتنی مردووەکان، سەربازەکانی لەشکرەکەی ڕاسپارد ئەو کارە ئەنجام بدەن.

هەندێك کەس پێشنیازیان کرد تا تەرمەکان بخرێنە ناو ڕووباری دیجلەوە، ئەو پێشنیازە لەلایەن شاپوورەوە ڕەت کرایەوە و وتی لەوانەیە بە هۆی زۆریانەوە تەرمەکان لە بوارەکانی ڕووبارەکەوە وەك بەربەستیان لێ بێت و ڕێگری بکەن لە ڕۆیشتنی ئاو، لە لایەکی دیکە هەر شوێنێك ئاوی دیجلەی دەگاتێ بە هۆی ئەو تەرمانەوە تاعوونی بۆ دەگوازرێتەوە، بۆیە ئەوەی

پەسەند نەکرد. بە هۆی زۆری تەرمەکانەوە شاپوور فەرمانی کرد تا لەبەر ڕووناکی مەشخەڵەکان بە شەویش گۆڕ هەڵبکەنن تا بە زوویی تەرمەکان بنێژرێن، بۆیە شەو و ڕۆژ ناشتن بەردەوام بوو.

بەشێکی دیکە لە سەربازەکان ئەرکی کوشتنی سەگەکانیان پێ بەخشرا و بەردەوام بوون لە کوشتنیان، بەڵام کەمتیارەکان نەکەوتنە بەر کوشتن، هەر کە زانیان شارەکە قەرەباڵغ بۆتەوە، هەموویان ڕۆیشتن، بەرەو گۆڕ تازەکان دەڕۆیشتن تا خۆیان تێر بکەن.

ڕۆژی دواتر داڵە کەرخۆرەکانیش لەنێو شارەکەدا نەدەبینران، لە ڕۆژی دواتر لەلایەن جارچییەکانەوە جاڕدرا کە تەواوی ئەو کەسانەی زیندوون و لەنێو شار ماون، پێویستە بێنە دەرێ و بگەڕێنەوە بۆ سەر کارەکانیان چوونکە بەرفەرمان بوونی فەرمانی پاشا ئەرك بوو، بۆیە هەمووان گەڕانەوە سەر کار و بۆ یەکەمجار دوای هاتنی تاعوون بۆ شاری تیسفون و داخرانی بازاڕەکانی، نانخانەکانی ئەو شارە کرانەوە.

لە سێیەمین ڕۆژی هاتنەوەی شاپوور بۆ نێو شار دوایین تەرمی مردووەکان نێژران و هیچ تەرمێك لەنێو کۆڵان و ماڵەکاندا نەمایەوە، لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا تەنیا چەند کەسێك بە هۆی تاعوون مردن، چیدی کەس بەو نەخۆشییە نەمرد، خەڵك سوپاسگوزاریان بۆ ئاهورامەزدا دەربڕی و پێیان وابوو ئەوە پێ و قەدەمی پاشا بووە کە بەخێر بووە، بۆتە مایەی نەمانی نەخۆشییەکە.

پێویستە بگوترێت لە سەردەمی کۆن هیچ ڕێگەچارەیەك بۆ ڕێگرتن لە نەخۆشییەکانی وەك تاعوون نەبوو، تەنیا دەبووایە خۆڕاگر بن و دانبەخۆیاندا بگرن تا نەخۆشییەکە تەواو ببێت، هەندێ جار نەخۆشییەکە دەبووە جیهانی و هەرسێ کیشوەری ئەوکات واتە (ئاسیا، ئەورووپا و ئەفریقیای) دەگرتەوە، لە هەر شوێنێك کە کۆتایی دەهات لە شوێنێکی دیکە دەستی پێ دەکردەوە.

پێچەوانەی بیرکردنەوەی هەندێك کەس، تاعوون نەدەبوو بە هۆی مردنی تەواوی تووشبووان بە نەخۆشییەکە، بەشێك لە تووشبووان دوای ماوەیەك چاك دەبوونەوە و تا ماوەیەك بەرگریان بۆ ئەو نەخۆشییە لە لا دروست دەبوو.

ماوەی بەرگری جەستەی کەسەکان دوای ڕزگار بوونیان لە تاعوون نەزانراوە، هەندێك کەس ئەو ماوەیەیان بە پێنجساڵ و هەندێکی دیکە بە دە ساڵیان زانیوە و وتوویانە کەسی ڕزگار بوو ئەگەر لەنێو نەخۆشەکانیشدا بێت، دووبارە دووچاری نەخۆشییەکە نابێتەوە تا ئەو ماوەیەی وترا.

چینییەکان پێش هاتنی حەزرەتی مەسیح و پێش زاین ڕێگەی بەرگری لە نەخۆشی ئاوڵەیان بە ڕێگەی کوتان دۆزیبۆوە، بۆیە لە چین کەس دووچاری ئەو نەخۆشییە نەدەبوو، کاتێك ئەورووپاییەکان چوونە چین، کەسیان نەبینی کە ڕووخساری شوێنەواری ئاوڵەی لەسەر بێت، چوونکە کەس دووچاری نەدەبوو تا شوێنەوارەکانی لەسەر ڕووخساری هەبێت، بۆیە هەوڵیاندا تا ڕێگە چارە بۆ پێشگیری لە تاعوون بە هەمان شێواز بدۆزنەوە. ئەوان هەوڵیاندا ئەو پلۆقەی لە ڕانی مرۆڤەکان بە هۆی تاعوونەوە دەهات وشك بکەنەوە و بیکوتن تا ببێتە پۆدرە، دواتر لە ئاویان دەکرد، بەو ئاوە کوتان دژی تاعوونیان دەکرد، بەڵام ئەو کوتانە سەرکەوتوو نەبوو، ئەوانەی بەو شێوەیە دەکوتران، هەموویان دەمردن، بۆیە چینییەکان ئەو ڕێگەیەیان نەگرتەبەر. چین لە وڵاتانی باشووری ئاسیا بوو، هەرجارێك تاعوون ڕووی لەو وڵاتە دەکرد بە سەدان هەزار کەسی دەکوشت ئەوان لە چاوەڕوانی زیاتر هیچ چارەسەرێکیان نەبوو، دەوەستان تا نەخۆشییەکە بۆ خۆی کۆتایی بێت.

لە دوو کاتدا تاعوون کۆتایی دەهات، یەکەمیان بە گۆڕانی وەرزی هاوین بۆ پایز و هاتنی باران و بەفر و سەرما کە لەوانەیە هۆی مردنی میکرۆبی تاعوون سەرما بووبێت، ئەو میکرۆبە لە گەرمادا چالاك دەبێت. دووەم بابەتیش باران بوو، تەنانەت ئەگەر لە وەرزی سەرما یاخۆ بە گۆڕانی وەرزیش نەبووایە، بە گریمانی زۆر لە شاری تیسفون هەردوو بابەتی بارینی باران بۆ ماوەی یەك دوو ڕۆژ و ناشتنی تەرمی مردووەکان، بوونە هۆی نەمانی تاعوون. لە ناوچەی پایتەخت ئەو نەخۆشییە بە تەواوەتی لەنێو چوو، بەڵام لەو شوێنانەی تاعوونی پایتەختیان بۆ گواسترایەوە، ئەو نەخۆشییە لەنێو نەچوو تا ئەوکاتەی وەرز گۆڕا و باران بارین دەستی پێکرد.

# ساسانییەکان لە ئاوەکانی زەریای هیند

سەردەمی پاشایەتیی شاپوور لە ئێران دیسان سەردەمی گەشانەوەی زانست و چوونی بیرۆکە زانستییەکان بوو لە ئێرانەوە بەرەو ئەورووپا.

مێژوونووسە ئەورووپاییەکان لە کاتە نووسینەوەی مێژوودا، بە شێوەی گشتیی زانستیان پێوەست کردووە بە یۆنان و لە مێژووەکانی ئەواندا بەشی ئێران لە روانگەی پەرەپێدان بە زانست ناگاتە یەك لەسەر بیستی پێگەی یۆنان.

ئاسایییە کە مێژوونووسە ئەورووپاییەکان زانست و پەرەگرتنی بە هی یۆنان بزانن، بەڵام مێژوونووسەکانی خۆمان کە گومانمان نییە لە ئەوەی بەشێکیان کەسانی راستگۆ و دروستکار و پاکن، ئاسایی نییە کە بێ هیچ لێکدانەوەیەك هاوڕا بن لەگەڵ ئەواندا. خودا لێخۆش بوو محەمەد عەلی فەروغی (زەکائولەمەلیك) زانای ناسراو کە هیچ کەس گومانی لە راستگۆیی ئەودا نییە، لەو سەرەتایەی بۆ پەڕتووکی (ڕوتیی حیکمەت لە ئەورووپا) نووسیویەتی و زۆر ستایشی زانست لە یۆنانی کردووە و دەڵێت: (وەك ئەوە وایە کە زەوی و ئاو و خاکی یۆنان بۆ پەروەردەکردنی فەیلەسووف و زانایان لەبارە).

راستییەکەی ئەوەیە کە بەشێك لەو گریمان و بیرۆکە زانستیانەی بە هی یۆنانییەکان دادەنرێن، هی ئێرانییەکان بوونە و لە ئێرانەوە بۆ یۆنان رۆیشتوون، مێژوونووسە ئەورووپاییەکان ئەو بابەتەیان لە پەڕتووکەکانیان نەنووسیوەتەوە، بەڵام هەندێك لە مێژوونووسە ئەمەریکاییەکان باسیان لەو بابەتە کردووە، چوونکە ئەوان ئەورووپایی نین و خۆشەویستیان بەلای یۆناندا نییە.

ئەگەر سەیری هەر مێژوویەك بکەین کە لە نووسینی مێژوونووسە ئەورووپاییەکان بێت، لەو بابەتەی باسی زانا (دیمۆکریت) دەکات کە لە رۆژهەڵات بە (زیموقراتیس) ناسراوە، نووسراوە کە ئەو بڕوای وابووە کە تەواوی جیهان لە وردیلەی زۆر بچووك پێك هاتووە، ئەو وردیلانە دابەش ناکرێن و بەردەوام لە جووڵەدان، ئەو وردیلانەی بە (ئەتۆم) ناو بردووە کە پێکهێنەرە بنەڕەتییەکانی گەردوون.

بەڵام هیچ مێژوونووسێکی ئەورووپایی باس ناکات کە زیمۆقراتیس ئەو بیرۆکەیەی لە کوێ وەرگرتووە.

دوای نووسینەوەی پەڕتووکی (مێژووی پاشایەتیی ئێران) لەلایەن ئۆمستید، بۆمان دەرکەوت زیمۆقراتیس باسی ئەو بیرۆکەیەی نەکردووە تا ئەو کاتەی بچێتە ئێران.

ئەگەر ئەو هەڵێنجانە بە تاکە کەسیی هەژمار نەکرابایە، دەبووایە بگوترێت بیرۆکەکە لەلایەن زیمۆقراتیسەوە پێش رۆیشتنی بۆ ئێران پێویسیت بوو باس بکرێت. دواتر ئۆمستید باس لەوە دەکات کە دوای گەڕانەوەی زیمۆقراتیس بۆ یۆنان، هەندێ بابەت لە ئێرانەوە رۆیشتن بۆ یۆنان، لە ئەوانیشەوە کاتژمێر کە دوازدە بوو، بۆ پێوانەی کات دیار کرا بوو، هەروەها ساڵنامە کە بە وردی بە سێ سەد و شەست و پێنج رۆژ و چەند کاتژمێرێك دیاری کرا بوون نیشاندەری بیرۆکەی زانایانی ئێرانیان بووە سەبارەت بەوەی مانگ ڕووناکی خۆی نییە و ئەو ڕووناکییە لە خۆر وەردەگرێت، هەروەها گریمانی دیکەی زانایانی ئێران کە دەڵێت لەسەر مانگ، دۆڵ و شاخ هەیە.

ئەو بابەتانە لەلایەن هیچ مێژوونووسێکی ئەورووپایی باس نەکراوە، تا ئەو رادەیە کە نووسەری ئەم پەڕتووکە (زەبیحولڵا) زانیاریی پێگەیشتووە، یەکەمین کەس کە باسی ئەو بابەتەی کردووە ئۆمستیدی ئەمەریکی بووە.

کاتێك مێژووی ئێران لە نووسینی ئۆمستید دەخوێنینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە بەشێك لە زانا یۆنانییەکان زانستەکانیان لە ئێران فێربوون یاخۆ دوای ئەوەی نەیانتوانیوە لە یۆنان بمێننەوە، نیشتمانی خۆیان بەرەو ئێران بەجێ هێشتووە و ئیدی بە درێژایی تەمەنیان لە ئێران ماونەتەوە. چوونکە لە لایەك توانیویانە سوود لە کەشی زانستی وەربگرن، لە لایەکی دیکەوە لە ڕووی مادییەوە سوودیان پێگەیشتووە، ئەگەر بە راستی زانا بووبن ئەوا پاشکەوتیشیان هەبووە.

لە مێژووی ئێران سەردەمێکی شاراوە هەیە کە سەردەمی ئەشکانییەکانە و هیچ زانیاریمان لەبارەی دۆخی زانستی لەو سەردەمەدا نییە، لە بەرانبەردا زانراوە کە سەردەمی هەخامەنشییەکان و ساسانییەکان سەردەمێك بووە کە لە ڕووی زانستییەوە لە پایەی بەرزدایە.

ناتوانرێت بگوترێت ئەو زانستەی لە سەردەمی ساسانییەکان هەبووە بە تەواوەتی بەرهەمی ئێرانیان بووە و لە شوێنانی دیکە وەرنەگیراوە. لە رابردووشدا هەروەك ئێستە زانست

لە ولاَتێك بۆ ئەویدی دەڕۆیشت، بە گریمانی زۆر ئێرانییان سوودیان لە زانیاری و زانستەکانی میسری، بابلی و هیندی وەردەگرت بێت، بەلاّم یۆنان لەو سەردەمەدا هێشتا خودان ئەو زانستە نەبوو تا ئێران لێی وەربگرێت، ئەوکات (سەردەمی هەخامەنشییەکان) تەنیا پێشوازی لە زانا یۆنانییەکان دەکرد.

لە سەردەمی هەخامەنشیی و ساسانییەکاندا ئێران وەك ناوەندێکی زانست بوو، زانستخوازانی هەموو جیهان ڕوویان لەو ولاّتە دەکرد، هەروەك چۆن لە ئێستەدا خەلّك بۆ زانستی ناوەکی دەچێتە ئەمەریکا تا زانست و زانیاریی پێویست لەو ولاّتە وەربگرێت، بەو پێیەی ئەو ولاّتە بە ناوەندی ئەو زانستە ناسراوە، لە سەردەمی کۆنیشدا ئەوانەی ویستبایان لە زانستەکانی (پزیشکی، ئەستێرەناسی، فەلسەفە و زانستەکانی دیکە شارەزا ببێت و پتر بزانێت، سەردانی ئێرانی دەکرد، وەك ئەورووپاییەکان دەلّێن ئێرانی ئەوکات ئاستەنگە ئاینییەکانی بۆ زانست نەبوو، لە کاتێکدا کە لە یۆنان ئەو ڕێگرییە هەبوو.

ئۆمستید لە پەڕتووکەکەی خۆیدا ئاماژە بە ناوی دوو لە زانا ناسراوە یۆنانییەکان دەکات کە یەکەمیان (ئانا گزیمەن) و ئەوی دیکەشیان قوتابییەکەیەتی بە ناوی (ئانا گزاگۆراس).

ئاناگزیمەن لە ئێران بووە، وێڕای فێربوونی زۆرێك لە زانستەکان، ئەو کاتەی لە ئێران بووە بۆی دەردەکەوێت کە هەسارەکان بە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، دوای گەڕانەوەی بۆ یۆنان، ئەوەی بۆی دەرکەوتووە بۆ قوتابییەکەی باس دەکات و پێکەوە هەولّی بلاّوکردنەوەی ئەو زانیاریانەیاندا کە پێچەوانەی باوەڕە زانستییەکانی یۆنان بوون.

یۆنانییەکان هەریەك لە هەسارەکانیان بە خوداوەندێك دادەنا و نەیان دەویست سووڕانەوەی هەسارەکان بە دەورەی خۆردا پەسەند بکەن، بۆیە هەولّیاندا ئانا گزیمەن و قوتابیەکەی ئانا گزاگۆرۆس بە تاوانی بێ ڕێزی بەرانبەر بە ئاین و دژایەتی کردنی ئاین سزا بدەن، ئەوانیش بە ناچاری یۆنانیان جێ هێشت و بەرەو ئێران رۆیشتن.

بەلاّم لە سەردەمی ساسانی و هەخامەنشییەکاندا زانست لە ئاین جیا کرابۆوە، هیچ زانایەك بە هۆی باوەڕە زانستییەکانی نەدەخرایە بەر بەدواداچوون و لێپێچینەوە، ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کە زانا و زانستخوازانی بۆ ئێران بکێش دەکرد، ئەوان لە ولاّتانی خۆیان بواری ئازادی ڕادەربڕینیان نەبوو، بەرەو ئێران کۆچیان دەکرد، لەوێ ئازادییەکانیان سنووردار نەدەکرا و هیچ کات ڕووی نەداوە کە زانایەك لە سەردەمی هەخامەنشیی یاخۆ ساسانییەکاندا بە هۆی گریمانە زانستییەکانی راوەدوو بنرێت.

ئەگەر لە مێژوودا دەبینین خەڵکانێکی وەك (گۆماتە یاخۆ گئۆمات) لە سەردەمی هەخامەنشییەکان و (مانی و مەزدەك) لە سەردەمی ساسانییەکاندا کەوتوونەتە بەر ئازار و پەلاماردان و لەنێوبردن، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت، کە ئازادی ئاینی نەبووە، بگرە بە هۆی لاوازی ئەو سیستەمەوە بووە کە حکوومەتەکانی ئەوکات بۆ پارێزگاریان تێکۆشاون، ئێمە نامانەوێت باس لە باشی یاخۆ خراپی ئەو ئاینانە بکەین و بابەتی گۆماتەش لایەنی دیکەی هەبووە و هیچ پێوەندیی بە ئاینەوە نەبوو.

بەداخەوە تەواوی پەڕتووکەکانی سەردەمی ساسانی و هەخامەنشییەکان لەنێوچوون، ئێمە تەنیا لە چوارچێوەی پەڕتووکی خەڵکی دیکەدا دەزانین سوود و قازانجی خەڵك لە زانستی ئێرانی ئەوکات چۆن بووە، لە هەمان کات زۆر لە پەڕتووکەکانی خەڵکانی دیکەیش لەنێو چوون.

بۆ نموونە زیمۆقراتیس کە ناومان هێنا، بە هۆی مانەوەی بۆ ماوەیەك لە ئێران، پەڕتووکێکی لەبارەی زانستەکانی ئێران نووسی، ئەگەر ئێستە بەردەست بووایە، دەبوو بە سەرچاوەیەکی باش بۆ ئێمە. سەرجەمی پەڕتووکەکانی ئەو زانایە لەنێوچوون ئەگەر مابووانە ئەوا کۆمەڵگەی مرۆیی سوودی زۆری لێ دەبینین.

ئێستەش هەر پەڕتووکێکی کۆنی یۆنان و رۆمەکان ماوەتەوە بە هۆی کلێسای کریستیانەکانەوەیە، ئەوان هەندێ لە پەڕتووکەکانیان لە دەست تالانچی و نەتەوە هێرشبەرەکان پاراست، ئەگەر بەم شێوەیە نەبووایە، لەوانە بوو تەنانەت یەك پەڕتووکی یۆنان و رۆمی کۆن نەمابووایە. بۆ ماوەی (١٥٠٠) ساڵ و تا سەردەمی رێنێسانسی ئەورووپا تاکە پارێزەری زانست و پەڕتووکەکانی رۆم و یۆنان و شارستانییەتی ئەوان، کلێساکان بوون، هەرچەندە ئەوان ئەو کارەیان ئەنجامدا. واتە ئەوەی کلێسا توانی پارێزگاری لێ بکات لەچاو ئەوەی هەبوو زۆر کەم بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش ئەو بەشەی ماوەتەوە توانی ژیار و شارستانییەتی مرۆیی بە رۆم و یۆنانەکان ئاشنا بکات، لەو رێژە کەمەی ئەو پەڕتووکانەی کە ماون، نێزیکەی چوار هەزار پەڕتووك هەیە کە باسی کوروش و سەردەمی هەخامەنشییەکانی تێدا هاتووە.

ئەوکات لە ئێران دامەزراوەیەك نەبوو کە پەڕتووکەکانی وڵات لە کاتی هێرشی دوژمنان و هێرشبەران بپارێزێت، هەڵبەتە بارودۆخی چاپی پەڕتووکیش، جیاوازیی لەگەڵ ئێستە هەبوو،

له رابردوودا هەر پەڕتووکێك لە سەرەتادا تەنیا یەك دانەی لێ دەنووسرایەوە، دواتر لەوانە بوو کە چەند دانەیەکی دیکەی لێ بنووسرێتەوە تا بۆ ناوەندە زانستییەکان ڕەوان بکرێنەوە.

هەروەها هەموو کەسێك توانای نووسینەوەی نووسخەی نوێی نەبوو لە پەڕتووکەکەی، وێڕای ئەوەی کاغەز گران بوو، دەبووایە کرێ بدەن بەو کەسەش کە پەڕتووکەکەی بۆ دەنووسینەوە، ئەمەش دەبوو هۆی ئەوەی تەنانەت ئەو پەڕتووکانەی کە خەڵك هۆگریشیان بوون، تەنیا چەند نووسخەیەکیان لێ بنووسرێتەوە، لە ئەنجامیشدا ئەگەر بە هۆی لافاو و بوومەلەرزە و هێرشی دوژمنان و...هتد ئەو پەڕتووکە لەنێو چووبووایە، ئیدی ئەو پەڕتووکە بە یەکجاری نەدەما، هەروەك چۆن لە کۆتایی دەسەڵاتیی ساسانییەکاندا هەموو پەڕتووکەکانیان لەنێو چوون.

ئێرانییەکان هۆگری پەڕتووك بوون و پارێزگاریان لێ دەکردن، بەڵام ئەوانەی هۆگری پەڕتووك بوون، دواجار هەر دەمردن، دوای مردنیشیان پەڕتووکەکانیان دەکەوتنە بەردەست میراتگرەکانیان، زۆر جار میراتگریش هۆگری پەڕتووك نەبوو، ڕەنگە ئەمەش وایدەکرد زۆرجار ئەو کەسانە ئەو پەڕتووکانە بفرۆشن، کریار و بازرگانانی پەڕتووکیش لە سەردەمی سەفەوییەکانەوە تاکو سەرەتای سەدەی پێشوو، کاتێك پەڕتووکێکیان لای ژنێك یاخۆ پیاوێکی ناهۆگر بە پەڕتووك دەبینییەوە، بە هەر جۆرێك بووایە لێیان دەکڕی و دەیانبرد بۆ ئەورووپا، تەنانەت یەك دانەش چییە لە هیچ پەڕتووکێك کە لەبارەی زانست بێت لە سەردەمی ساسانییەکان و بە تایبەتی سەردەمی شاپووری دووەم نەماوە، بۆیە ناتوانین هیچ شتێك لە بارەیانەوە بڵێین، بۆ ئەم مەبەستەش تەنیا دەتوانین پشت بە خەڵکانی دیکە ببەستین.

لە سەردەمی شاپووری دووەمدا لە ئێران چوار ناوەندی گەورەی زانستی هەبووە، لە وڵاتێك کە چوار ناوەندی زانستی هەبوو بێت، بێگومان ناوەندی دیکەی زانستی بچووکتر هەبوون، بەڵام هیچ ناوێك لەو ناوەندانە لە مێژوودا نییە.

چوار ناوەندە زانستییەکە بریتی بوون لە (ناوەندی زانستی تیسفون، ناوەندی ڕەی، ناوەندی تووس و ناوەندی زانستی پارس) کە ئەمەی دوایی لەوانەیە لە (ئێستەخر) بوو بێت، پێویستە بگوترێت شاری شیراز کە پایتەختی وڵاتی فارس بووە بە پێچەوانەی ئەوەی گوایە دوای هاتنی عارەبان لە ئێران چێ کراوە، پێش ئەوکات هەبووە. بەپێی کەتیبەکانی تەختی جەمشید ئەو شارە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان هەبووە، لە پەڕاوە ژمێریارییەکانی سەردەمی هەخامەنشیی زۆر جار باس لە کرێی ڕۆژانەی کرێکارەکانی (شیراز)یش کراوە کە گومانمان

نییە کە شیرازیش هەمان شیرازی ئێستەیە، لە لایەکی دیکە ناوی شیراز کە ناوێکی فارسییە خۆی دەبێتە گەواهیدەر کە پێش هاتنی عارەبان ئەو شارە هەبووە، بە پێچەوانەوەش ناوەکەی فارسی نەدەبوو.

ئەو زانستانەی ئەو سەردەمە لە نێوەندە زانستییەکان لە ئێران سوودیان لێ دەبینرا، هێندە فرەوان بوون کە لە رێگەی رۆمی بچووك بۆ ئەورووپا دەڕۆیشت و جارێکی دیکەیش بیرۆکە و گریمانی تایبەت بە بەردی بناخەی دامەزراوەی ناوەکییە کە لە ئێران و لە رێگەی رۆمی بچووك بۆ ئەورووپا رۆیشت.

ئەوکات ئێران لە رێگەی دەریاوە پێوەندیی لەگەڵ تەواوی وڵاتانی جیهان هەبوو، کەشتییەکانی وڵاتە ئاسیایی و ئەفریقیاییەکان لە رێگەی بەندەرەکانەوە دەهاتن بۆ ئێران و بە پێچەوانەوە، ئەو هاتوچۆکردنە بازرگانی و ئەو ئاڵۆگۆڕەش ژمارەیەکی زۆر چەتەی دەریایی بۆ نێو ئاوەکانی کەنداوی فارس و دەریای عومان پەلکێش کردبوو.

چەتە دەریاییەکان بە باشی دەیان زانی کەشتییە بازرگانییەکان کە بەرەو بەندەرەکانی ئێران دەچن و ئەو بازرگانانەش کە لەو شوێنانە دێنەوە، هەم کاڵایان پێیە کە یاخۆ بۆ فرۆش بۆ ئەوێ دێت یاخۆ لەوێندەرەوە کڕدراوە و هاوردەکراوە ، هەم زێڕ و دراو لای ئەو بازرگانانە هەیە، کە لە کەشتییەکاندان، چوونکە ئەو بازرگانانەی دەچن ئەوا دراویان پێیە و کاڵا دەکڕن، ئەوانەی دێنەوەش کاڵایان فرۆشتووە و دراو و زێڕیان لایە، بە گشتیی هیچ بازرگان و سەوداکارێك نییە کە لە کەشتییەکاندا بێت، دراو و زێڕ و کاڵای نەبێت.

رێگەکانی هاتوچۆی ئەو کەشتییانەش لە کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەفریقا بەرەو بەندەرەکانی ئێران دەهاتن یاخۆ لە ئێرانەوە بەرەو بەندەرەکانی ئەو کیشوەرانە دەچوون، بە گشتیی ناسراوبوون، چەتە و دزە دەریاییەکانیش دەیان زانی ڕێڕەوی رۆیشتنی کەشتییەکان لە کوێیە و چۆن تەریب بە کەنارەکان لە ئاسیاوە بەرەو ئەفریقا دەڕۆن تا رێگەکە ون نەکەن.

هێرتسفێڵد سەبارەت بە هۆکاری دوورکەوتنەوەی ڕێڕەوی کەشتییەکان بەرەو ناوەندی دەریاکان گریمانەیەکی هەیە کە بە کورتی دەڵێت: دۆزینەوەی ئەستێرەی جەمسەری گەورە لەلایەن کەشتیوانان بۆ دۆزینەوەی ڕێڕەوی کەشتییەکان، بە هۆی ئەو مەترسییەوە بوو، کە ئەوان لە چەتە دەریاییەکان هەیان بوو.

بەپێی وتەی کەشتیوانان بۆ ئەوەی لە دەست چەتەکانی دەریا رزگاریان ببێت، رێگەیان بەرەو ناوەندی دەریا دەگرتە بەر، دوای ئەوە ئیدی نە تەنیا بە شەو، بگرە لە رۆژیشدا رێگەیان

ون دەکرد و نەیان دەزانی چی بکەن؟، تا دواجار لەو جۆرە گەشتانەدا بۆ هۆکارێك گەڕان کە بکارن بە هۆیەوە ئاراستەکان بدۆزنەوە، سەرئەنجام بۆیان دەرکەوت کە ئەستێرەیەك لە باکور هەیە کە لە هەموو وەرزەکانی ساڵ و بەردەوام لە کاتەکانی شەو لەو شوێنەیە، دەتوانرێت بەهۆی ئەو ئەستێرە کە بەردەوام لە باکورە، ئاراستەکان بدۆزنەوە ئەو ئەستێرەیەش، بە ئەستێرەی جەمسەری باکور یاخۆ (جوودی) ناسرا، دوای ئەو ڕووداوانە بوو بە هێما بۆ دۆزینەوەی ڕێگەکان.

ئەو بابەتە تەنیا گریمانە و هیچ بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی نییە، بەڵام هەر کەسێك ئەو ئەستێرەی دۆزیبێتەوە لە کەسانێکی زیرەك و لێهاتوو بووە، چوونکە ئەو ئەستێرە هێندە ڕووناکییەکەی کەمە، تەنانەت لە ئەستێرە پلە چوارەکانیش کەمتر درەوشاوەیە، زۆر کەس توانای بینینیشی لە ئاسماندا نییە، هەر بۆیە بینینیی ئەو ئەستێرەیە چاوی بەهێزی دەوێت و تەنیا لە باکور دەدۆزرێتەوە. دۆزینەوەی ئەو ئەستێرەیە نەیتوانی بە تەواوەتی کێشەی کەشتیوانان چارەسەر بکات، تا ئەو ڕۆژەی قیبلەنما لەلایەن چینییەکانەوە دۆزرایەوە، ئەو کێشەیە هەر مایەوە، بەڵام کاتێك قیبلەنما هاتەکایەوە، ئیدی بە ڕۆژ و بە شەو دۆزینەوەی ئاراستەی ڕۆیشتنی کەشتییەکان ئاسان بوو.

چەتەکان لە ڕێگە دەریاییەکانی کەنداوی فارس و دەریای عومان کێشە و ئاریشەی زۆریان بۆ کەشتییەکان دەنایەوە و ببوونە گەورەترین مەترسی بۆیان، بۆیە شاپووری دووەم بڕیاریدا ئەو مەترسییە ریشەکێش بکات. پێش ئەوکات چەند جارێك پاشاکانی ساسانی هەوڵیان دابوو بۆ ئەوەی چەتەکان سەرکوت بکەن و چەند کەشتییەکیان دەنارد و چەتەکانیش بە بینینیی کەشتییەکانی پاشایەتیی، خۆیان حەشار دەدا، بەڵام دوای گەڕانەوەی کەشتییەکان، یەکسەر دەگەڕانەوە بۆ سەر کاری خۆیان.

شاپووری دووەم بە مەبەستی بەربەرەکانی و لەنێوبردنی چەتە دەریاییەکان، بڕیاریدا تا لەشکرێکی دەریایی بەهێز بۆ پارێزگاری لەو دەڤەرەیلە چێ بکات و فەرمانی کرد تا کارخانەکانی کەشتی سازی کەنارەکانی کەنداو و دەریای عومان بەهێز بکەنەوە.

پێویستە بزانرێت کە لە رابردوودا کارخانەکانی کەشتی سازی ئێران گەورەترین کارخانەکانی کەشتی سازی بوون لە ئاسیا و ئەفریقیادا، ئەو بابەتە بۆ زۆرێك لە مێژوونووسان شاراوەیە. ئەو کەسانەی لە وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقایی دەیانویست کەشتیی پتەو و بەهێز بکڕن، ئەو کەشتییانەیان لە ئێران دەکڕی، بۆ چێکردنی کەشتیی لە ئێران، دار لە

جەنگەڵەکانی ناوەند و باشووری ئێران دەهێنرا کە ئێستە ئەو جەنگەلانە نەماون، بەلاّم بە هۆی بەهێزی ئەو دارانەوە لە کاتێکدا با و باران بە درێژایی دە سەدەی بەردەوام لەو دارانەی داوە، نەبۆتە هۆی لەنێوچوونی پاشماوەکانیان و لە هەندێ شوێن ئەو دارانە بە وشکی ماون. لە رابردوو ئەو کەشتییانەی لە کارخانە کەنار ئاوییەکانی ئێران دروست دەکران، بەو دارانە دروست دەکران، بەلاّم ئێستە ئەو دارستانانە نەماون و لە کارگەکانی کەشتیی سازی باشووری ئێران، بەو دارانەی لە جەنگەڵەکانی ئەفریقیاوە دەهێنرێن، ساز دەکرێن، لە رابردوودا پێویست بە هێنانی دار لە ئەفریقیاوە نەبوو.

بە فەرمانی شاپووری دووەم لە کارخانەکانی کەشتی سازی باشووری ئێران دەست بە دروستکردنی کەشتیی جەنگی کرا.

وەك بیستراوە هەندێك جار دەگوترێت جیاوازیی لە نێوان کەشتی بازرگانی و جەنگیدا نەبووە، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، جیاوازیی زۆر لە نێوان ئەو دوو جۆرە کەشتییە بە تایبەتی لە سەردەمی رۆمی کۆن و ئێرانی کۆندا هەبووە، ئەو جیاوازییە بە تایبەتی لە سەردەمی شاپووری دووەم زۆرتر بوو.

کەشتییە بازرگانییەکان لە سەردەمی ساسانییەکاندا چارۆگەیان هەبوو، کەشتییە جەنگییەکانیش دوو هۆکاریان بۆ جووڵە هەبوو، وێڕای چارۆگە، بە سەوڵیش دەڕۆیشتن، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا کەشتییە جەنگییەکان لە کاتی نەبوونی بادا بەردەوام بن لە رۆیشتن بەهۆی سەوڵەوە. لە لایەکی دیکەوە کەشتییە جەنگییەکان باریك و درێژتربوون لە کەشتییە بازرگانییەکان، بۆیە کەشتییە جەنگییەکانیان باریك و درێژتر دەکرد تا خێراییان پتر بکرێت.

لە سەردەمی شاپووری دووەم ئەو کەشتییە جەنگیانەی لە بەندەرەکانی باشوور چێ دەکران، سێ جۆر بوون و برێتی بوون لە: جۆرێك لەوان کەشتیی خاوەن یەك ریز سەوڵ بوون، جۆرێکی دیکەیش کەشتیی خاوەن دوو ریز و جۆری سێیەمیش کەشتیی خاوەن سێ ریز سەوڵ بوون.

لەو کەشتییانەی کە دوو ریز سەوڵ یاخۆ سێ ریز سەوڵیان هەبوو، یەك ریز لە سەرووی ریزەکەی دیکەوە جێگیر دەبوو.

ئەگەر نموونەیەك بۆ ئاسان بوونی زانینی ئەو بابەتە بێنینەوە، لێك چواندن لە نێوان کەشتیی دوو ریز بە خانووی دوو نهۆمی و کەشتیی سێ ریز بە خانووی سێ نهۆمی دەچوو.

واتە ریزی دووەمی سەوڵ لێدەرەکان بە سەوڵی درێژتر لە نهۆمی سەرووتر و بە هەمان شێوەش ریزی سێیەم لە نهۆمی سێیەم بوون بە سەوڵی درێژتر.

ئێستە بۆ ئێمە کە لە سەردەمی پێشکەوتنداین بیرکردنەوە لە کەشتییەك کە سێ نهۆم بێت بۆ سەوڵلێدان، تا رادەیەك ئاسان نییە، بەڵام ئەو کەشتییانە بۆ بینەر زۆر بە شکۆ بوون، ئەگەر بینەرێك لە کاتی رۆیشتن چاوی لێکردبان دەیبینی بە شێوەیەکی رێك لە هەردوولای کەشتییەکە و لە هەر سێ نهۆمەوە، سەوڵەکان هاتوونەتەدەر و پێکەوە دەجوولێن.

هەڵبەت ئەو بینەرە سەوڵچییەکانی نەدەبینی، تەنیا سەوڵەکانی دەبینی، چوونکە سەوڵچییەکان بۆ پارێزگاری لە هەتاوی هاوین و بەفر و بارانی زستان و پایز، دیار نەبوون و لەنێو کەشتیی بوون.

یەکێك لەو بابەتانەی جووڵەی کەشتییەکانی بە شکۆتر پێشان دەدا، ئەو رەنگانە بوون کە لە رەنگکردنی نهۆمەکان و دەرگەکانی سەوڵەکاندا بەکار دەهات هەر نهۆمێك رەنگی تایبەت بە خۆی هەبوو، رەنگی دەرگەی سەوڵەکان جیا بوو لەو رەنگە و ناوە ناوەش رەنگەکان تازە دەکرانەوە.

لە بەرزترین شوێنەکانی کەشتیی، واتە لە نهۆمە باڵاکاندا کۆمەڵە ئاڵایەکی رەنگاورەنگ بەرچاو دەکەوتن و ئامرازی پێوەندیی بوون، ئەمە بە یەکێك لە داهێنانە بەرزەکانی ئێرانییەکان لە بواری دەریاوانی هەژمار دەکران، ئەم داهێنانە بە رادەیەك بەرچاو بوو، کە ئێستەش کە بێتەل لە کەشتییەکاندا هەیە، هێشتا ئەو ئاڵایانە سوودی تەواویان ماوە، بەڵام سەبارەت بەوەی سەوڵەکان لە کەشتییەکاندا چۆن دەجووڵان، ئەوە بابەتێکی بێزارکەر و ناخۆشە و دەبێت بگوترێت لە کەشتییە سێ نهۆمییەکاندا هەندێك لە سەوڵەکان تا بیست و حەوت مەتر درێژ بوون.

پێش سەردەمی شاپووری دووەم، کاتێك کەشتییەکی چەتە دەریاییەکان دەکەوتە بەردەستی کەشتییەکی پاشایەتیی، هەموو چەتەکان دەکوژران، بەڵام شاپووری دووەم ئەو کارەی نەکرد، ئەو چەتە دەریاییانەی دەگیران، لە کەشتییە جەنگییەکاندا کاری سەوڵلێدانیان پێ ئەنجام دەدان، چوونکە چەتەکان پیاوانێکی ئازا و سەرسەخت بوون و بە ئاسانی لەنێو نەدەچوون و توانایان هەبوو سەوڵ لێ بدەن.

سەوڵلێدان لە کەشتییە جەنگییەکان کارێکی سەخت بوو، خەڵکی بێ هێز زوو دەکەوتن، بۆیە بەرپرسان لەو بوارە بەردەوام بە دوای ئەو کەسانەدا دەگەڕان کە بەهێز و بەتوانا بوانایە.

هەرچەندە مووچەی سەوڵچییەکان زۆر باش بوو، بەڵام ئەوانەی خۆبەخشانە ئەو کارەیان دەکرد زۆر کەم بوون، بۆیە چەتە و تاوانباران و ئەو کەسانەی بڕیاری سزادانیان بۆ دەدرا، دەکران بە سەوڵچی. ئەوکاتانەی پێویست بە سەوڵلێدان نەبووایە، واتە ئەو کاتەی شەپۆلەکانی با هاتبان و کەشتیی بەو شەپۆلانە ڕۆیشتبایە، سەوڵەکان لە ئاو دەهاتنەدەر و سەوڵچییەکان لەو ماوەیەدا کە هەندێجار چەندین شەو و ڕۆژی دەخایاند، تەنیا سەرگەرمی پشوودان و خواردن دەبوون.

ئەوانەی بە ویستی خۆیان و بە کرێ دەبوونە سەوڵچی، مافی مۆڵەت وەرگرتن و خانەنشین بوونیان لە دوای تەمەنی خانەنشینییەوە هەبوو.

هێندە مێشکمان لەو بابەتانە پڕ بووە کە لەلایەن مێژوونووسە ئەورووپاییەکانەوە نووسراوە کە کاتێك دەبیستین لە ئێرانی کۆندا جگە لە سەوڵچییەکانی نێو کەشتییە جەنگییەکان، هەموو سەرباز و ئەفسەر و کارمەندانی دەوڵەت مافی خانەنشینیان هەبوو لە دوای تەواوبوونی ساڵانی خزمەت و پەك کەوتنیان، بەڵام ئێستە کاتێك بابەتی ئاوا دەبیستین بە تەواوەتی دووچاری سەرسووڕمان دەبین، چوونکە هێندە وتراوە ئەو بابەتانە تازەن و لە ئەورووپاوە هاتوون، کە هەموومان باوەڕمان کردووە، لە ڕاستیدا ئەو نەریتە زۆر کۆنە و لە سەردەمی ساسانییەکانیش هەبووە، دوای لەنێوچوونی دەسەڵاتیی ئێران، ئەو نەریتانە لەنێوچوون.

هەر ژمارەیەك لە کەشتیی جەنگی تەواو دەبوو، ڕادەستی هێزی دەریایی دەکرا و دەخرایە نێو لەشکری دەریایی و بە فەرمانی شاپووری دووەم بە درێژایی کەنارەکانی کەنداوی فارس و دەریای عومان کۆمەڵێك بنکەی سەربازی دەریایی بۆ کەشتییەکان دامەزرێندرا. چوونکە پەلاماری چەتەکان هەردەم لەناکاو بوو، بۆیە فەرمان کرا تا بە شێوەی بەردەوام دەستە کەشتییە جەنگییەکان بە درێژایی کەنارەکان لە جووڵەدا بن و ڕێگە لە چەتەکان بگرن.

کەشتییەکان لە دەریادا بە شەو و بە ڕۆژ لە جووڵەدا بوون، بەو شێوەیە نییە کە بە ڕۆژ لە جووڵە بن و بە شەو پشوو بدەن، ئەمە یەکێك لە خاڵە باشەکانی کەشتییەکانە بەرانبەر بە جووڵەی وشکانی.

لە ڕابردوودا کاروانەکانی وشکانی بە ڕۆژ چەندین کیلۆمەتر ڕێگەیان دەبڕی و بە هاتنی ئێوارە و نێزیك بوونەوەی شەو، دەوەستان، بۆ ئەوەی بارەکان لە وڵاخەکانیان دابگرن، تا ئەوانیش پشوو بدەن، دوای پشوودان لە بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر بکەونەڕێ، بەڵام کەشتییەکان وا نەبوون، لە کاتی بەڕێ

کەوتن لە بەندەر تا کاتی گەیشتن بۆ شوێنی مەبەست، لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبوون، بە رادەیەکی بەرچاو ڕێگەی زۆرتریان لە کاروانە وشکانییەکان دەبڕی و زووتر دەگەیشتن. بازرگانان بە گشتیی ڕێگەی دەریاییان پێ باشتر بوو، چوونکە لە لایەك بۆ گەیشتن بە شوێنی مەبەست کاتێکی کەمتری پێ دەچوو، لە لایەکی دیکەوەش تێچووی گواستنەوە کەمتر بوو، چوونکە کەشتییە بازرگانییەکان بە گشتیی شەو و ڕۆژ ڕێگەیان دەبڕی و دەهاتن بۆ بەندەرەکانی ساسانی یاخۆ دەڕۆیشتن، هەر یەکەشیان هێمای تایبەت بە خۆی هەبوو، هێزی دەریایی ساسانی کە لەنێو کەنداو و دەریای عومان بەردەوام لە پاسەوانیدا بوون، ئەوانیان دەناسی، هەرگیز تەنانەت لە شەویشدا هێرشیان نەدەکردە سەر کەشتییەکی بازرگانی لە جیاتی کەشتییەکی چەتەکان.

چەتە دەرياييەکان بە هۆی ئەو پاسەوانییە بەردەوامەوە، ژمارەی هێرشەکانی خۆیان کەم کردەوە، بەڵام کۆتاییان پێ نەهێنا، هەندێ جار بە ڕۆژ و هەندێ جاریش بە شەو هێرشیان دەکرد، هۆکارەکەشی ئەو دەستکەوتە زۆرە بوو کە لە کەشتییەکدا دەست ئەوان دەکەوت، هەر چەتەیەك لە کاتی سەرکەوتنی هێرشدا ئەوەی لە کەشتییەك دەستی دەکەوت، پتر بوو لەو مووچەیەی لە تەمەنیدا دەیتوانی وەریبگرێت.

کەشتییە جەنگییەکانیش بەردەوام بوون لە ڕاوەدوونانیان، کاتێك یەکێك لە کەشتی چەتەکانیان دەگرت، هەموو چەتەکانیان دەکردە سەوڵچی. ئەو پاسەوانییەی کەشتییە جەنگییەکانی شاپوور زۆر کاریگەر بوو، بووە هۆی ئەوەی سێ کەس لە پاشاکانی هیندستان کە یەکیان پاشای سەرئەندیب (سری لانکای ئێستە) بوو، داوایان لە شاپوور کرد تا فەرمان بە کەشتییە جەنگییەکانی بکات کە لە ئاوەکانی ژێردەستی ئەوان، واتە لە زەریای هیندیش پاسەوانی بکەن لە دژی چەتەکانی دەریا.

لەوانەیە لە سەردەمی ئێستە ئەو داوایە بە ناتەندروست بێتە بەرچاو، بەڵام بۆ ئەوکات بە ڕێز بەرانبەر بە پاشای ساسانی هەژمار دەکرا، لە لایەکی دیکەوە وەك لە کەتیبەی نەخشی ڕۆستەمدا هاتووە، لە سەردەمی دەسەڵاتیی شاپووری یەکەمدا بەشێك لە هیندستان لەژێردەستی ساسانییەکان بووە، پاشاکانی سەربەخۆیی ناوەخۆییان هەبووە، بەڵام ئەو پاشایانەی ئەو داوایەیان دایە شاپوور جیابوون لەو ناوچانە و سەربەخۆ بوون.

یەکێك لە مەترسیدارترین ڕێگە دەرياييەکانی ئەوکاتی ئاسیا، هەمان کەنارەکانی دوورگەی گەورەی سەرئەندیب و بە تایبەتی کەنارەکانی باکور و باشووری بوون. چوونکە تەواوی ئەو کەشتییانەی لە ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەڵات و بە پێچەوانەوە دەڕۆیشتن ناچار بوون بە دوو شوێنەدا تێپەڕ

بین. تەواوی ئەو کەشتیيانەی لە (چين، دوورگەکانی ملووك و ئەندۆنیزیای ئێستە) و وڵاتانی دیکەی باشووری ئاسیا وەك (مالیزیا، هیندستان، بیرمانی و هیندستانی رۆژهەڵات) بەرەو رۆژئاوای ئاسیا دەڕۆیشتن، ناچار بوون بە کەنارەکانی باکور یاخۆ باشووری ئەو دوورگە گەورەیەدا بڕۆن.

هەروەها هەموو ئەو کەشتیيانەی لە (میسر، عەربستان و سەبا یاخۆ یەمەنی ئێستە) و وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا و ئێران و هیندستانی رۆژئاوا، ویستبایان بەرەو رۆژهەڵاتی ئاسیا بڕۆن، ناچار بوون بە باکور یاخۆ باشووری ئەو دوورگەیەدا بڕۆن. ئەو دوورگەیە لە سەردەمانی کۆن بە هۆی ئەو ئەڵماسە زۆرەی لێی دەست دەکەوت بە دوورگەی ئەڵماس دەناسرا. چەتە دەریاییەکانیش بە باشی ئاگەداری ئەو بابەتە بوون، بۆیەش بەردەوام لەو شوێنە هەوڵی پەلاماری کەشتییەکانیان دەدا.

جووڵەی کەشتییە بازرگانییەکان بە درێژایی کەنارەکانی باشووری ئاسیا بەپێی بەرنامەیەکی تایبەتی بوو، پێوەندیی بە ئاراستەی با هەبوو، چوونکە کەشتییە بازرگانییەکان تەنیا چارۆگەیان هەبوو، بە هێزی با دەجووڵان، وەك کەشتییە جەنگییەکان سەوڵیان نەبوو. ئەم بابەتەش پێوەندیی بە داهات و تێچوو هەبوو، کەشتیی بازرگانی توانای بەخشینی خۆراك و کرێی بەردەوامی نەبوو بە سەد تا دوو سەد کرێکار بۆ سەوڵلێدان، ئەم بابەتە تەنیا لەلایەن حکوومەت و لە کەشتییە جەنگییەکان دا ئەنجام دەدرا.

لە کەنارەکانی باشووری ئاسیا بای رۆژهەڵات و بای رۆژئاوا هەبوو، هەریەکەیان بۆ ماوەی شەش مانگ بەردەوام دەبوو. واتە شەش مانگ با لە رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا، شەش مانگیش بە پێچەوانەوە بوو، بۆیە کەشتییەکانی بازرگانی بە شێوەیەك دەڕۆیشتن تا لەگەڵ ئەو بایانە بگونجێن.

شاپووری دووەم ئەزموونی تەواوی لە جەنگی چەتە دەریاییەکان وەرگرت، بۆیە دەیزانی کاردانەوە کاتییەکان هیچ چارەسەری گونجاو نین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان، لە کاتی هاتنی کەشتیی جەنگیدا، چەتەکان خۆیان حەشار دەدەن و بە رۆیشتنی کەشتییە جەنگییەکان دێنەوە و بەردەوام دەبن لە پیشەکەیان. بۆیە شاپوور سەرەتا فەرمانی کرد تا ناوەندێك بۆ فەرماندەیی لەشکری دەریایی لە کەنارەکانی سەرئەندیب دابنرێت کە ژمارەیەکی زۆر کەشتیی لێ دابنرێت، ئەو کەشتییانە هێندە زۆر بوون کە لە تەواوی وەرزەکانی ساڵ و بە شێوەی بەردەوام و لە هەموو کەنارەکانی ئەو دوورگەیە، کەشتییە جەنگییەکان لە پاسەوانی و جووڵەی بەردەوام دەبوون.

کاتێك ژمارەی پێویست لە کەشتیی و سەرباز و سەوڵچی و خۆراك دابین کرا بۆ ئەوانەی بەشداری ئەو کارە دەبوون، فەرمانێك لەلایەن شاپوورەوە دەرچوو بۆ جەنگ لە دژی چەتە دەریاییەکان. شاپووری دووەم لە بەرانبەر ئەو پاسەوانییە هیچ داوایەکی لە پاشای سەرئەندیب نەبوو، تەنیا داوای کرد تەواوی کەشتییە بازرگانییەکانی ئێران کە دەچنە بەندەرەکانی ئەو وڵاتە لەو بڕە پارەیە ببەخشرێن کە هەر کەشتییەك دەبێت بیداتە بەندەرەکە.

بە لێکدانەوی ئەو بابەتە بۆمان دەردەکەوێت کە شاپوور بە دوو هۆکار هیچ پاداشتی لە پاشای سەرئەندیب نەویست کە برێتی بوون لە: یەکەم ئەو بابەتی پاسەوانییە کە کەوتە دەست هێزەکانی ئەو، بۆ ئەو کارێکی گەورە بوو، هێما بوو بۆ ئەوەی پاشای سەرئەندیب ئەوی بە گەورەی خۆی ناسیوە، بۆیە شاپوور ئەو بابەتەی پەسەند کرد. لە لایەکی دیکە بە ئەو ڕێگەیەوە شاپوور دەیتوانی پارێزگاری لە ئاسایشی وڵاتانی خۆی بکات. ئەو دوورگەیە مەترسیدارترین ڕێگەکان بوو، کە چەتەی زۆری لێ ببێت، بۆیە جیامان کردەوە لە دوو وڵاتەکەی دیکە.

ئەوکات پروپاگەندە دەکرا کە چەتە دەریاییەکان لەلایەن هەندێ لە پاشاکانی ڕۆژهەڵاتی هیندستانەوە دەنێردرێن بۆ سەرئەندیب تا هێرش بکەنە سەر کەشتییە بازرگانییەکان، هەندێ کەسیش ئەو پروپاگەندەیان ڕەت دەکردەوە، بۆ شاپووریش سەخت بوو تا لە ڕێگەی نەخشەکانی ئەوکات کە ورد نەبوون ئەو بابەتە یەکلا بکاتەوە. ئێستە بە بوونی ئەو نەخشە وردانەی هەن، بۆ ئێمە ئاسانە ئەم بابەتە یەکلا بکەینەوە.

کاتێك لە نەخشەی باشووری ئاسیا دەڕوانین، دەبینین لە دوای هیندستانەوە، کۆمەڵە دوورگەکانی (ماڵدیۆ و لاکاویۆ) لە هەمووان نێزیکترن بۆ ئەو دوورگەیە، بۆیە بیردەکەینەوە کە ئەوان لەو دوورگانە خۆیان حەشار دەدەن، دواتر هێرش دەکەنە سەر کەشتییە بازرگانییەکان، بەڵام ئەوە بۆ چەتە دەریاییەکان ئەستەم بوو، چوونکە پانتایی دەریا دەکەوتە نێوانی ئەو دوورگانە و دوورگەی سەرئەندیب، تا ئەوکاتیش پەڕینەوە لە پانتایی دەریا بۆ هەموو کەشتییەکان سەخت بوو، ئەوان تەنیا تەریب بە کەنارەکانی دەریا دەڕۆیشتن تا ڕێگەکانیان بدۆزنەوە.

چەتەکان دەبووایە هی ئەو ناوچەیە بن تا شارەزاییان هەبێت، هەروەها نەدەبوو ئەوان هی سەرئەندیب بن، دەگەیشتنە ئەو ئاکامە کە ئەوان لەو نێزیکانەوە دێن و دەگەڕێنەوە. هەروەها دەکرا بگوترێت ئەوان ئەگەر بە هاندانی پاشاکانی ڕۆژهەڵاتی هیندستانیش نەهاتبن، لەوانەیە

خاكی ئەوان بۆیان پەناگا بوویێت و لەوێوە كارەكانیان ئەنجام بدەن. بۆیە كاتێك چاو لە نەخشەی ناوچەكە دەكەین، دەبینین ئەو دەنگۆیە زۆریش بێ بنەما نەبووە، چوونكە چەتەكان لە سەرئەندیب هیچ پەناگەیان نەبوو، لە كەنارەكانی باشوور و رۆژئاوای هیندستانیش، دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایانی ناوچەكە بە توندی لەگەڵ ئەوان دەجەنگان، بۆیە ئەوێ بۆ ئەوان هیچ پەناگەیەك نەبوو، ئەوان لە كەنارەكانی رۆژهەڵاتی هیندستان دەژیان، لەو شوێنەوەش بە كەنارەكاندا خۆیان دەگەیاندە سەرئەندیب، دوای تاڵانكردنی كەشتیی یاخۆ كەشتییەكان، دەگەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

لەگەڵ دەستپێكی گەشتەكانی كەشتییە جەنگییەكانی شاپوور بە درێژایی كەنارەكانی سەرئەندیب، هاتوچۆ و هێرشی چەتەكان كەم بۆوە، چەتەكان كە هەندێكات ژمارەیان لە ژمارەی قرشەكانی دەریا زۆرتر بوو، وایانزانی ئەو گەشتانە تەنیا بۆ ماوەیەكی كاتییە، دواتر بۆیان دەركەوت كە ئەو گەشتانە وەك هاتنی شەو و ڕۆژ بەدوای یەكدایە و هیچ كات كۆتاییان پێ نایەت.

سێ پاشای هیندستان داوای هاوشێوەیان پێشكێشی شاپوور كرد، كە یەكیان پاشای سەرئەندیب و ئەوانی دیكە هی (كوجارات و كەلكوت) بوون. ئەورووپاییەكان كەلكوتیان بە كەلكەتە دەخوێندەوە، شاری بەناوبانگی رۆژهەڵاتی هیندستانیش هەر كەلكەتە بوو، بۆیەش زۆرجار بۆ هەندێ لە ئەورووپاییەكان ئەو هەڵەیە دێتەپێشێ، كە كەلكەتەی رۆژهەڵاتی هیندستان لەگەڵ كەلكەتەی ئێستە بە هەڵە بەیەك دەزانن.

كەلكوت كەوتبووە رۆژئاوای هیندستان، كوجاراتیش لە باكوری ئەو وڵاتە بوو. كوجارات بە هۆی ئەوەی ناوەندیی پەرستگەی بەناوبانگی (سۆمنات) بوو، زۆر ناوبانگی هەبوو، مێژوونووسانی رۆژهەڵات ناوی سۆمناتیان بە بتخانە ناسیوە و هیندییەكان خۆیان ئەوێیان بە بتخانە نەدەزانی، بە هۆی بوونی پەیكەری بودا لەوێندەر، ئەو شوێنە لە لایان زۆر بەرێز و پیرۆز بوو، ئەو شوێنە هەر ئەو شوێنە بوو، كە دوای حەوت سەدە لەلایەن سوڵتان مەحموودی غەزنی داگیر كرا.

لە سەردەمی كۆندا بەردەوام پێوەندیی لە نێوان هیندستان و ئێران هەبووە، هەردەم ژمارەیەك هیندی لە ئێران ژیاون. ئەو پێوەندییە تا كاتی هاتنی بەریتانییەكان بۆ هیندستانیش بە بەهێزی مایەوە، دوای هاتنی ئەوان سنووردار كرا، پێش ئەو سەردەمە پێوەندییەكی بەهێز لە نێوان ئێران و هیندستاندا هەبوو، كە هەندێ لە كاڵاكانی ئێران تەنیا لە هیندستان دەفرۆشران.

زۆرێك لە پاشاكانی هیندستان كە لە زنجیرەی مەغۆلی هیند بوون، بە زمانی فارسی شیعریان وتووە، هەندێكیان ژنەكانیان شاعیری فارسی زمان بوون و شیعرەكانیان بەناوبانگ بوون.

لە سەردەمی شاپووری دووەم و بە درێژایی زنجیرەی پاشایەتیی ساسانییەكان بەردەوام ڕێژەیەكی زۆر (شەكر، ئاوریشم، پەشم، فەرش و بەردە بە نرخەكانی وەك فەیرۆزە و یەسر، هەروەها زێڕ لە ئێرانەوە ڕۆیشتووە بۆ هیندستان.

ڕێژەیەكی زۆر كاڵای ئێران دەگەیشتە بەندەر و شارە كەنارییەكانی كوجارات و كەلكوت. ئەوساش وەك ئێستە باشترین و خێراترین ئامرازی گەیاندن هەر كەشتیی بوو لە نێوان دوو وڵاتدا كە ڕێگەی ئاویان لە نێواندا هەبووایە، بۆیە كەشتییەكان مەودای نێوان ئێران و كوجاراتیان بە خێرایی دەبڕی و دەگەیشتنە بەندەرەكانی یەكدی. ئێران لە سەردەمی شاپووردا خاوەنی دەریاوانی زۆر مەزن و ئازا بوو، ئەوان تا ژاپۆن لە ڕێگەی دەریاوە دەڕۆیشتن، ئەمە لە كاتێكدا بوو ڕۆیشتن بۆ ژاپۆن دەبووایە لە دوا كەنارەكانی ئاسیاوە، كەنارەكان بەرەو ناوەندیی دەریا بەجێ بهێڵن تا بتوانن بپەڕنەوە و بگەنە ئەو وڵاتە. دەریاوانە ئێرانییەكان یەكەمین دەستە لە دەریاوانان بوون، كە كەشتییەكانیان هاوسەنگ و تەرازوو دەكرد، ئەویش بە بەكارهێنانی تەرازوو كە لە شێوەی شووشەیەكی سەرداخراو بوو، كە ئاوی ڕەنگ كراوی تێدەكرا و لە دارێك دەبەسترا، ئەوكات لەسەر تەختانی ناو كەشتییەكە دادەنرا، بەم شێوەیە تەرازووبوونی دەزانرا.

لە رابردوودا زۆرێك لەو كەشتییانەی بە شەپۆلەكانی ئاو نغرۆ دەبوون بە هۆی تەرازوو نەبوون یان لاسەنگبوونیانەوە بوو، بە شێوەیەك كە لایەكی كەشتییەكە لەكاتی باركردنیدا سووكتر و لایەكەی دیكەیشی قورستر بووایە، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی بە یەكەمین شەپۆلی بەهێزی ئاو، نغرۆ ببێت، ئێرانییەكان بە دۆزینەوەی تەراز و تەرازووكردنی كەشتییەكانیان لەو مەترسییە رزگاریان بوو. ئەوان لە نێوەندی كەشتییەكە كۆگەیان بۆ تەرازكردنی كەشتییەكە دروست دەكرد، بەم شێوەیە رزگاریان دەبوو لە نغرۆبوونی كەشتیی، هەرچەندە زریانەكانی زەریای هیند بەهێزتر بووانە، بەردەوام لەگەڵ شەپۆلەكان بەرز و نزم دەبوونەوە و وەرنەدەگەڕان.

بە هەمان شێوە كە ئەوكات دەریاوانی بازرگانی كارامە لە ئێران هەبوو، هەروەسا دەریاوانی جەنگی كارامەش هەبوون، ئەوان زۆر شارەزای تەواوی دەریاكان بوون و لێهاتووتر

بوون لەو دەریاوانانەی لە دەریاکانی مەدیتەرانە یاخۆ رۆژئاوا و باکوری ئەورووپا دەریاوانیان دەکرد.

لە سەردەمی ئەشکانییەکان دەریاوانە ئێرانییەکان یەکەمین دەستەبوون لە دەریاوانەکان کە بە دەورەی کیشوەری ئەفریقیادا سووڕانەوە. بە هەمان شێوە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان باسی هەندێ کۆچبەرمان کرد، کە رۆیشتن و لە کەنارەکانی ئەورووپا نیشتەجێ بوون و بەردەوام بوون لە ژیانیان، بۆ ئەمەش بەڵگەی مێژووییمان هەبوو، بەڵام ئایا دەریاوانە ساسانییەکانیش کەنارەکانی ئەفریقیایان هەروەك دەریاوانە هەخامەنشییەکان دەناسی؟.

بەداخەوە هیچ بەڵگەیەکمان لەو بارەوە نییە، تەنیا دەزانین کە ئەوان توانیویانە تا نێزیکەی ناوەڕاستی کەنارەکانی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا بەرەو باشوور برۆن، ئەوان دوورگەی گەورەی (ماداگاسکار)یان ناسیوە کە ئێستە وڵاتێکی سەربەخۆی رۆژهەڵاتی ئەفریقیایە. زانیاریی ئێمە لەبارەی دەریاوانی ساسانییەکان لەبارەی ئەفریقیا هەر هێندەیە و هیچی دی. دەریاوانە ساسانییەکان نەخشەی تەواوی کەنارەکانی ئاسیایان هەبوو، هێندە بەو کەنارانەدا رۆیشتبوون کە نەخشەی وردی ئەو کەنارانەیان بە دروستی وێنە کردبوو، بەڵام لە ئێستەدا تاکە یەك دانە لەو نەخشانە نەماون، ئەورووپاییەکان خۆیان بە داهێنەری نەخشە ئاوییەکان دەزانن، بەڵام ئەگەر نەخشەی دەریاوانە ساسانییەکانیش نەمابن، ئەوا نەخشەی دەریاوانە چینییەکان ماون و نیشاندەری ئەو ڕاستییەن کە ئەورووپاییەکان داهێنەری ئەو نەخشانە نەبوون.

سوڵتانەکانی کوجارات و کەلکوت داوایان کرد تا شاپوور تەناهی و ئاسایشی کەنارە ئاوییەکانیان بۆ دابین بکات، ئەویش بە هەمان هۆی بۆ پاشای سەرئەندیب وەك باسمان کرد، بە داوای ئەوان رازی بوو، ئەمەش بۆ کەشتییە بازرگانییەکانی ئێران زۆر باش بوو، دەبووە مایەی هاتوچۆی بازرگانی باش لە نێوان ساسانییەکان و ئەو وڵاتانەدا، عارەبانیش ناچار دەبوون کە بە کەنارەکانی ئەواندا سەفەر بکەن.

ئەوکات لە نێوان ئەو وڵاتانەدا هەندێ شوێنی بیابان هەبوو کە ڤاڵابوون لە دانیشتووان، چەتە دەریاییەکان ئەو شوێنانەیان بۆ حەشاردانی خۆیان و پەلامارەکانیان بۆ سەر کەشتییە بازرگانییەکان بەکار دەهێنا. ئەوان لەپڕ هێرشیان دەکرد، هەر کەسێك بەرگری بکردایە

دەیانکوشت و کالاّ و سامانەکانی کەشتیی و بازرگانەکانیان بە تالاّن دەبرد، ئەگەر بۆیان کرابایە، کەشتییەکەشیان دەبرد تا بۆ گواستنەوەی کالاّکانی نێو کەشتییەکە نەکەونە کێشەوە.

شاپووری یەکەم کاتێك ویستی چەتە دەریاییەکانی کوجارات و کەلکوت ریشەکێش بکات، هەمان رێگەی گرتەبەر کە لە سەرئەندیب کرد بووی. ئەو سەرەتا کەشتیگەلی زۆری لە کەنارەکانی ئەو دوو وڵاتە کۆکردەوە و ناوەندی فەرماندەیی بۆ دیارکردن، دواتر تەواوی پێداویستییەکانی بۆ ناردن و دواجار فەرمانی دەست پێکردنی گەشتەکانی لە کاتێکدا دەرکرد کە دەیزانی کەشتییەکانی ئامادەن بۆ ئەوەی بەردەوام گەشت بکەن.

دوای ئەو بەرواره کەشتییە ساسانییەکان لە تەواوی کەنار و کەنداوەکانی ئەو وڵاتانە دەگەڕان، سەرئەنجام تەواوی چەتە دەریاییەکانیان لە ماوەی شەش مانگدا گرت و کردیانن بە سەوڵچیی کەشتییەکانیان یاخۆ لەنێویان بردن، ئەو چەتانەش کە توانیان ڕابکەن ئیدی نەگەڕانەوە.

# بارودۆخی ئابووری و بازرگانی و کۆمەڵایەتیی ئێران

ئەوانەی لە رابردوودا مێژووی ساسانییەکانیان نووسیوەتەوە، زۆر بە کەمی بەلای بابەتی بازرگانی و ئابووریدا رۆیشتوون، تەنانەت کریستیەن سێن نووسەری دانیمارکی کە پەڕتووکی (ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان) لە نووسینی ئەوە، کەمتر سەرەنجی ئەو بابەتەی داوە، بەڵام لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم مێژوونووسان توانیان زانیاریی بە سوود لەبارەی بازرگانی و ئابووری لە سەردەمی ساسانییەکان، بە تایبەتی لە سەردەمی شاپووری دووەم بەردەست بخەن.

ئەو زانیارییانەی لەبارەی بازرگانی و ئابووری ساسانییەکانەوە بۆ نموونە لە سەردەمی شاپووری دووەم هەمانە، زۆرینەیان لە سەرچاوە رۆمەکان وەرگیراون.

لەوانەیە پرسیار بێتە پێشێ کە بۆچی سەرچاوە مێژووەییە رۆمەکان لە بابەتەکانی دیکەی ساسانییەکان بێ دەنگەیان نواندووە و تەنیا باسی ئابووری و بازرگانی ئەوانیان کردووە؟.

هۆکارەکەی برێتی بوو لەوەی رۆمەکان نەیان ویستووە بزانن باوەڕە ئاینییەکانی ئێرانییەکان چییە و دامەزراوەی بەڕێوەبردنیان چۆنە، ئەوان ویستوویانە بزانن ئێرانییەکان چ بەرهەم دەهێنن و چ دەفرۆشن، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئێرانییەکان و رۆمەکان لە سەردەمی ساسانییەکان لە هەندێ بواردا لە بازاڕەکانی جیهانی رکابەری یەکدیی بوون.

ئایا لە جیهانی نوێدا هیچ بازرگانێکی پیشەسازی ئۆتۆمبێل هەیە کە لە جیاتی لە شێوە و جۆری بەرهەمی ڕکابەرەکەی بکۆڵێتەوە، لە بارەی کۆمەڵایەتی و ژمارەی منداڵ و هەڵسوکەوتی بکۆڵێتەوە. رۆمەکان ساسانییەکانیان بە رکابەری بازرگانی خۆیان دەناسی و دەیانەویست بازانن ئەوان چ کاڵایەك هەنارده دەکەن و باری ئابوورییان چۆنە.

زۆرینەی زانیارییەکانی پێوەست بە بازرگانی و ئابووری ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا کەوتووەتە بەر سوودوەرگرتن لەلایەن مێژوونووسانەوە.

لە سەردەمی ساسانییەکان، بە تایبەتی لە سەردەمی شاپووری دووەم، کۆمەڵگەی ئێران دابەش ببوون بەسەر چینە جیاجیاکان، هەر چینێك پیشەی تایبەت بە خۆی هەبوو.

ئێستە هیچ کۆمەڵگەیەك تەنیا بە یەك شێوەی چینایەتی نابێت و بنەمای کۆمەڵگە ئەوەیە کە تواناکان ئازاد بن تا هەمووان لە رێگەی تەندروست و یاسایی بەرەو پێشڤە بچن.

لە سەردەمی ساسانییەکان و بە تایبەتی شاپووری دووەمدا ئەو بابەتە لە ئێران نەبوو، هەر تاکێك دەبووایە لەسەر ئەو پیشەیە بێت کە باب و باپیرانی هەیان بووە و دەرفەتی پێ نەدەدرا تا پیشەیەکی دیکە وەربگرێت، بەلاّم ئەم بە چینایەتی کردنە لە یەك روانگەوە بە سوود بوو، ئەویش بریتییە لە ئەوەیە کە کەسەکان پیشەی خۆیان بە باشترین شێوە بە ئەنجام دەگەیاند، چوونکە زانین و توانایان لەو پیشەیەدا بە شێوەی میراتی بوو، بەشێکیش دەگەڕایەوە بۆ توانای خۆیان.

ئاشکرایە کە هەندێ لە پیشەکان بە میرات وەردەگیرێن، لەوانەیە کەسێك کە خەتی نووسینی جوان بێت، ببێتە خاوەن کوڕێك کە جوان بنووسێت، کەسێك کە میناتۆر بێت، کوڕەکەشی وەك خۆی میناتۆر بێت.

لە سەردەمی ساسانییەکان تا شاپووری دووەم چەند نەوەیەك بەو شێوەیە و لە چوارچێوەی چینایەتیدا ژیانیان بەسەر برد.

پێویستە ئاماژە بەو ڕاستییە بکەین کە وێڕای بوونی ئەو شێوەیە لە کۆمەڵگەی ئێران، بەلاّم دیسان پێشکەوتنی پیشەسازی هەبوو، بە مەرجێك پێشکەوتن لەو بوارەدا بە پێوەرەکانی ئێستە نەپێوین، هەر هێندەش بۆ نموونە بەسە کە ئەوکات لە ئێرانەوە ئاسن و مس هەناردە دەکرا بۆ ولاّتە دراوسێکانی ساسانییەکان.

لە سەردەمی ساسانییەکاندا ئێران گەورەترین هەناردەکاری مس بووە، نەتەنیا بۆ ولاّتانی رۆژهەلاّت بگرە بۆ ولاّتە ئەورووپاییەکانیش مسی ناردووە.

دۆست و هاوپەیمانەکانی ئێران بەشێك لە چەك و پێداویستیی جەنگی خۆیان لە ئێران کڕیوە، بۆ نموونە گالیسکە جەنگییەکانی ئێران لەو چەکانە بوون کە ولاّتانی دیکە بەو شێوەیە و بە ئاسن نەیاندەتوانی دروستیان بکەن، بۆیە لە ساسانییەکانیان دەکڕی.

ئەو کالاّیانەی بە چنین بەرهەم دێن، بەشێکی گرینگ بوون لە هەناردەی ساسانییەکان لە سەردەمی شاپووری دووەم، چوونکە شاپووری دووەم زۆر هانی بەرهەمهێنانی ئەو کالاّیانەی دەدا.

هەموو ساڵێك ڕێژەیەکی بەرچاو لە کوتاڵ و چنراوی ئاوریشم و پەشمی و بەنییەکان بۆ دەرەوە هەناردە دەکران. لە بازاڕەکانی رۆژهەلاّتی نێزیك و باشووری ئاسیا ئەو کالاّیانەی ئێران بە بایەخ بوون، لە بازاڕەکانی ئەورووپاش رۆمەکان توانای ڕکابەریان لەگەڵ ئەو کالاّیانە نەبوو، تەنیا ڕکابەربوون لەگەڵ چنراوە پەشمینەکانی ئێران.

له بواری کوتاڵی بەن و ئاوریشم ئێران له پێشەوەی رۆمەکانەوە دەهات، تەنیا لەو بەشە لە کوتاڵە پشمینەکان کە بە ئەرخەوان ناسرا بوون، بە تایبەت بۆ ئیمپراتۆر و پیاوانی پلە یەکی وڵاتی رۆم دروست دەکران، رۆمەکان لە پێش ئێران بوون، ئەرخەوانی رۆم زۆر بە کەمی رەنگی دەبوو بە سووری درەوشاوە، ئەو پیشەسازیەش لە کۆنەوە لێهاتوویی رۆمەکانی پێوە دیار بوو.

فەرش کاڵایەکی دیکە بوو کە لە ئێرانەوە بۆ بازاڕەکانی جیهان دەڕۆیشت، دوای ئەوەی ئیمپراتۆرییەتی رۆمی بچووك دامەزرا، کۆشکی ئەو ئیمپراتۆرییەتە بە فەرشە ئێرانییەکان رازێندرایەوە.

فەرشە گەورەکان بە هۆی گالیسکەکانەوە بۆ تەواوی خاکی ئێران و ئاسیای بچووك دەڕۆیشت، تا دەگەیشتە قوستەنتینە (ئیستانبول)، ئەو رێگەیەش کە بۆ ئەم مەبەستە سوودی لێ وەردەگیرا، هەمان ئەو رێگەیە بوو کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان دروست کرا بوو، رێگەکە زۆر بە پتەوی و باشی دروست کرابوو، ناوە ناوە نۆژەن دەکرایەوە، بۆیە تا سەردەمی ساسانییەکان ئەو رێگەیە خۆی گرتبوو. مێژوونووسە ئەرمەنییەکان دەڵێن: خەسرەو پاشای ساسانی ناسراو بە (ئەنوشیروان) دوای ئەوەی لەگەڵ رۆمی بچووك رێککەوتننامەی ئاشتی مۆر کرد، فەرمانی بە کارگەیەکی فەرش کرد بۆ ئەوەی فەرشێك بۆ کۆشکی ئیمپراتۆری قوستەنتینە چێ بکەن کە (١٢) گەز درێژ و (١٠) گەز پان بوو، ئەو فەرشە ماوەی دە سەدە لەو کۆشکە مابۆوە و لەنێونەچوو.

لە ساڵی (١٤٥٣ ز) (سوڵتان محەمەدی فاتیح) توانی قوستەنتینە بگرێت و ئیمپراتۆری رۆمی بچووك کە ئەوکات تەنیا قوستەنتینەی لە بەردەست مابوو لەنێو ببات و ئەو فەرشەش وەك هەموو شتە بە نرخەکانی دیکەی ئەو کۆشکە بوونە هی ئەو. لە دەورەی ئەو فەرشە بە زمانەکانی فارسی و یۆنانی نووسرابوو (دیاری پاشای ئێران بۆ ئیمپراتۆری رۆم)، زمانی فەرمی ئیمپراتۆری رۆمی بچووك یۆنانی بوو، خەڵکی قوستەنتین بەو زمانە دەئاخڤین، بۆیە بە زمانی یۆنانی لەسەر ئەو فەرشە نووسرا بوو.

کاڵایەکی دیکەش کە لە ئێرانەوە هەناردە دەکرا برێتی بوو لە جۆرەکانی دەرمان و لەنێویشیاندا (تریاك) بوو. لە ئێران کەس تریاکی بەکار نەدەبرد وەك مادەی بێ هۆشبەر و لەلایەن ئەوانەی هۆگری تریاك بووبن و زانیاریمان نییە کە لە وڵاتانی دیکەیش بۆ ئەو مەبەستە بەکار هاتبێت.

بەکاربردنی تریاك بۆ کەمکردنەوەی سەرخۆشی و بێ هەستبوونی خۆیان یەکێکە لە نەریتەکانی سەدەی رابردوو، لە سەردەمی شاپووری دووەم کە سەدەی چوارەم بوو کەس وەك

مادەی بێ هۆشبەر بەکاری نەدەهێنا، بەڵکو بۆ بواری دەرمانسازی کاری پێ دەکرا. تریاك وشەیەکی یۆنانییە و بە واتای دەرمان دێت، ئێرانییەکان تریاکیان بە (ئەپیۆن) ناودەبرد، دوای هاتنی عارەبان بۆ ئێران، ئەوان چوونکە پیتی (پ) لە زمانیان نەبوو کردیان بە (ئەفیۆن) و لە جیهانی کۆندا تریاك بۆ کەمکردنەوەی ئازاری نەخۆشییەکان بەکار دەبرا.[1]

بەپێی نووسینی مێژوونووسە ئەرمەنییەکان لە ئێران جۆرێك کوتاڵ هەناردە کراوە کە لە ئاوریشم نەرمتر بووە و لە وەرزی سەرمادا جەستەی مرۆڤی گەرم کردووەتەوە و خانەدانەکانی رۆم لە وەرزی زستان ئەو کوتاڵەیان کردووەتە بەریان.

مێژوونووسە رۆمەکان وتوویانە بە دڵنیاییەوە ئەو کوتاڵە لە ئاوریشم نییە و نابێت لە پشمیش بێت، چوونکە کوتاڵە پشمییەکان زبرن، بە وتەی مێژوونووسە رۆمەکان، ئاشکرا نییە کوتاڵچییە ئێرانییەکان سوودیان لە چ وەرگرتووە تا ئەو کاڵایەیان بەو شێوە نەرم و جوانە بەرهەم هێناوە؟، ئەو کوتاڵە (پەرەك) بوو، کە ئێستەش هەر ماوە، رۆمەکان کەرەکیان نەبوو، بۆیەش نەیاندەتوانی بزانن کە چۆن کەرەك دەست دەکەوێت، بۆیە نەیاندەتوانی تێبگەن چۆن ئەو کوتاڵە نەرمانە بەرهەم دێن.

بە دڵنیاییەوە بازرگانە ئێرانییەکان کە پەرەکیان بە رۆم دەفرۆشت، باسیان لە نهێنی دروست کردنی نەدەکرد، تا ئەوان نەتوانن پەرەك وەبەر بێنن و بازاڕ لە دەست بازرگانە ئێرانییەکان دەربهێنن.

لە سەردەمی ساسانییەکان ئەسپی زۆر بە دەرەوە دەفرۆشرا، ئەوکات ژمارەیەکی زۆر کێڵگە و شوێنی بەخێوکردنی ئەسپ هەبوون، کە هەندێکیان هی پاشایەتیی بوون و ئەسپیان بۆ لەشکر واتە بۆ سوارکارەکان و بۆ گالیسکەکانی جەنگی پەروەردە دەکرد. هەندێك لەو شوێنانەی پەروەردەی ئەسپیش هی خەڵك بوون و لەوێندەر ئەسپ بۆ فرۆشتن پەروەردە دەکرا،

---

(١) ئێران لە سەردەمانی کۆنەوە وڵاتێك بووە کە زۆرترین رێژەی رووەکی دەرمانی هەبووە، ئێستە نێزیکەی سێ هەزار جۆر رووەکی دەرمانی هەیە کە وێنەیان لە وڵاتانی دیکە نییە. بەڵگەش بۆ ئەو بابەتە پەڕتووکی (رووەکە ئێرانییەکانە) کە زانایەکی ئەورووپایی نووسیویەتی و نێزیکەی سەد بەرگ دەبێت. ئەوانەی دەڵێن سەردەمی گیادەرمانی تەواو بووە، زۆر هەڵەن، زۆرینەی ئەو دەرمانانەی ئێستە بە ناوی دیکە بەرهەم دەهێنرێن، لە رووەکەکانەوە سەرچاوە دەگرن ."زەبیحوڵڵا"

لەو شوێنانە وردبینی دەکرا بۆ بەهێزکردنی ڕەگەزە خراپ و لاوازەکانی ئەسپ، هەوڵ دەدرا ئەوان لەگەڵ ڕەگەزی بەهێز و باش جووت بکەن تا بەرەو باشتر بچن.

هەندێك سەوداکار هەبوون کە ئەسپیان هەناردە دەکرد بۆ دەرەوە، ئەسپیان لە بازاڕەکانی نێوەخۆ دەکڕی، بە گشتیی سەد ئەسپ پێکەوە دەکرانە ڕەوە ئەسپ و دەیانبردن، ئەسپە ئێرانییەکان لەبەر ئەوەی ڕەسەن بوون لە دەرەوە داواکاری زۆریان لەسەر بوو..ئەسپەکان بە نرخی چاك دەفرۆشران و قازانجی باش دەست بازرگان و سەوداکاران دەکەوت. ئەسپی عارەبی کە لە ڕەگەزە باشەکانی ئەسپە و هەناسەی باشی هەیە، لە ڕەگەزە ئێرانییەکانە و لە ئێرانەوە براوەتە سعوودیە، لە ئەوێ کەوتنە ژێر کاریگەریی ژینگەی ئەو شوێنە. بە گشتیی ئەسپە ئێرانییەکان دەرکەوتەکانی ئەندامیان بەم شێوەیە بووە: (بەلەکی باریك، سمی تەکووز، سینگی پان، کەللەی سەری جوان، ملی ڕێك و زراڤ). فیردەوسی لە شیعرەکانی لە شانامەدا باسی لە دەرکەوتەی ئەسپی ئێرانی کردووە و بەم نیوە دێڕە دەست پێ دەکات: (سیە چشم و بور ابرش و گاو دم) کە لە کوردی دەکاتە: (چاو ڕەش و یاڵی بۆر و کلکی وەك مانگا).

هێستر ئاژەڵێکی دیکە بوو کە هەناردەکردنی لە پلەی دوای ئەسپ دەهات.

مێژوونووسەکان گومانیان هەیە کە یەکەم بێشکەی ئەسپ ئێران بوو بێت، بەڵام سەبارەت بە زۆرکردنی هێستر و کردنی بە ڕەگەزێکی سەربەخۆ، گومانیان نییە کە لە ئێران بووە. لە زۆر وڵاتی دیکە هێستر چێ کرا، بەڵام پەرەیان بە زۆرکردنی نەدا، چوونکە نەیان دەزانی لە ئەسپ پتر سوودی هەیە بۆ بارهەڵگرتن. ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی پێویستیان بە بارهەڵگر کەمتر بوو، زۆرینەی دەڤەرەیلی ئێران شاخاوییە و توانای ئەسپیش لە شاخ کەمترە و زووش دەکەوت، بەڵام هێستر بە سانایی لە پێچ و هەوراز و بەرزاییەکان سەردەکەوت، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لە ئێران بە ڕێژەی زۆر پەرە بە چێکردنی هێستر بدرێت.

چەند کەسێك لە مێژوونووسانی ئەورووپایی نووسیویانە ئابووری سەردەمی ساسانییەکان ئابووری شوانکاری بووە، ئەوەش بەو واتایەیە ئەوکات لە ئەورووپا ئابووری پیشەسازی هەبووە، هاوکات لەو سەردەمەدا لە ئەورووپاش ئابووری شوانکاری هەبووە، بەڵام ئابووری پیشەسازی تا ئەو قۆناخەی ماشینەکان نەدۆزرانەوە نەهاتووەتە بەرهەم.

تەنانەت لە سەدەی هەژدەیەمی زاینی کە شۆڕشی فەرەنسا هاتەکایەوە، هێشتا لە ئەورووپا ئابووری پیشەسازی نەهاتبووە کایەوە و سەرمایە دانان لە پیشەسازیدا لە ئاستی

سەرمایەدانان لە ئابووری شوانکارە بوو، بەڵام لە سەردەمی شاپووری دووەم، هەندێ بوار هەبوو کە بە بچووك کراوەیی لە سنووری پیشەسازیدا بوون.

یەکێك لە بەڵگەکانمان بۆ پێشکەوتنی ئابووری ساسانییەکان، بوونی دامەزراوەیەك بووە بە ناوی (بنکە)، وشەی بانك کە ئێستە لە جیهاندا برەوی هەیە لەو واژە فارسییەوە وەرگیراوە.

وەك لە کاتی نووسینەکانی تایبەت بە سەردەمی هەخامەنشییەکان باسمان کرد ئەو وشەیە لەو سەردەمەدا هەبووە، بە گریمانی زۆر لە سەردەمی ئەشکانییەکانیش ماوە، بە گشتیی لە سەردەمی ساسانییەکانیش دەبینرێتەوە.

بنکە دامەزراوەیەك بوو وەك بنکەکانی ئاڵوگۆڕی دراو لە ئێستەدا، پێویستە بگوترێت کە سەرمایەی هەر بنکەیەك لە دوورەوە لە رێگەی ئاڵای تایبەتی کە لەسەر بنکەکان هەڵواسراون، زانراوە، ئەو کەسەی بە نێزیك ئەوێدا تێپەڕ دەبوو لە ژمارەی ئەو ئاڵایانەی لەسەر بنکە هەڵدەواسرا دەیزانی سەرمایەکەی چەندە.

دەتوانین بە راشکاوی بڵێین زانیاریی نامەی سوود و زیان کە لەلایەن کۆمپانیا وەبەرهێنەکان و بانکەکانەوە هەڵدەواسرێن بۆ ئەوەی رێگر بن لە سوودی نابەجێ، لە سەردەمی ساسانییەکان وەرگیراوە.

سەرمایەی بنکەکان وەك وترا بەپێی ئاڵاکان دیار بوون، هەر ئاڵایەك لە هەر بنکەیەك هێما بوو بۆ سەد هەزار لیرەی زێڕ، ئەگەر لە بنکەیەك دوو ئاڵا هەبووایە بە واتای بوونی دووسەد هەزار لیرەی زێڕ لە سەرمایە بوو، بۆیە هەر بنکەیەك ئاڵای پتری لەسەر هەبووایە نیشانەی سەرمایەی زۆرتری بنکەکە بوو.

ئەمڕۆ لەوانەیە سەد یاخۆ دوو سەد هەزار لیرە بە کەم بێتە بەرچاو، بەڵام بە رەچاوکردنی توانای کڕینی ئەو دەمە لە سەدەی چوارەمی زاینیدا، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو دراوە چەندە زۆر بووە. لە سەردەمی ساسانییەکان ناوی سککەی زێڕ چەسپاو نەبوو، بەپێی ناوی پاشاکان بوو، بۆ نموونە سککەی شاپووری، سککەی خەسرەوی و...هتد.

دیارکردنی رێژەی سەرمایەی بانکەکان تا ئەم دواییەش لەسەر دەمی سەفەوییەکان مابوو، گەشتیارانی دەرەوە لە کاتی هاتنیان بۆ ئێران ئەو شتەیان بینیوە و باسیان کردووە.

بنکەکانی سەردەمی ساسانی دراویان لە خەڵك وەردەگرت و براتیان پێ دەدان بۆ ئەوەی لە شارێکی دیکە بیدەن بە دراوگۆڕ و دراوەکەیان وەربگرنەوە. ئەو کەسانەش کە دراوێکی باشیان

هەبووایە، دەیاندایە دەست بنکەکان تا لە ماوەیەکی دیارکراودا سوودێکی بەرچاوی لێ وەربگرن.

ئەو رۆژەی عارەبان هاتنە ئێران، لە ئێران ژمارەیەکی زۆر بنکە هەبوون کە بەلانی کەم ئێمە ناوی یەکیان دەزانین کە بریتی بووە لە (ئالاك) و لە شاری نەیشاپوور بووە کە یەکێك لەو شارانە بووە لەلایەن شاپوورەوە چێ کراوە.

خەڵك وا دەزانن لە سەردەمی ساسانییەکان تەنیا لە خۆزستان بەنداوێك چێ کراوە، لە کاتێکدا لەو سەردەمەدا نەتەنیا لەسەر تەواوی ڕووبارە گەورەکان، بگرە لەسەر زێیە بچووکەکانیش کە ئاویان کەم بووە، بەنداو کراوە.

مێژوونووسێکی فەرەنسی نووسیویەتی: هەر یەکێك لە پاشاکانی ساسانی کە ویستبای بەنداوێك چێ بکات، سەرمایەکەی لە بنکەکان قەرز دەکرد، دواتر بە قازانجەوە بۆی دەگەڕاندەوە. ئەمەش وەك ئابووری پیشەسازی هەژمار دەکرێت یاخۆ وەك سیستەمی ئێستەی بانکەکانی تەواوی دنیا کە هەندێ لە بانکەکان بە متمانەن و دراو بە قەرز دەدەن.

خەڵك وابیر دەکەنەوە کە پاشاکانی ساسانی تێچووی چێکردنی بەنداوەکانیان لە گەنجینەکانی خۆیان نەداوە، بە پێچەوانەی ئەوەی لە ئەفسانەکان دەوترا کە گەنجینەی پاشاکانی ساسانی بەردەوام پڕ بوو بێت، بگرە بەردەوام پارە و زێڕی ئەو گەنجینانە بۆ خەرجی لەشکرەکانیان تێچووی جەنگ لەگەڵ رۆمی گەورە و رۆمی بچووك بەکاردەهات، ئەمە وایدەکرد زۆرینەی گاڤان گەنجینەی وڵات بەرەو ڤاڵابوون بڕوات، بۆیە دراوێکی ئەوها لە گەنجینەی ئەوان نەدەمایەوە بۆ بوارە گشتییەکانی وەك چێکردنی ڕێگەوبان، بەنداو، بیناکردنی شارەکان و کەناڵەکانی ئاودێری و ...هتد.

هەندێکات بۆ هەڵکەندنی کەناڵ یاخۆ کارێزێك پێویستیان بە کاری هەزار کرێکار دەبوو کە پارەکەیان دەبووایە بە شێوەی مووچەی رۆژانە بدرێت، هەروەسا دەبووایە خواردنیشیان بۆ دابین بکرێت، چوونکە لە شارەکان دووربوون و نەیان دەتوانی بۆ خۆیان بچن بۆ کڕینی خواردن، بەڵام نەزانراوە کە خواردنەکەیان لەسەر خاوەن کار بووە یاخۆ نا؟

بێگومان لە رابردوودا تێچووی بەنداوەکان کەمتر نەبووە لە ئێستە، هەموو کارەکان لەلایەن کرێکار و بە بێڵ و بازووی کرێکار ئەنجام دەدرا، هەندێ جار مێژوونووسان ژمارەی کرێکارانی بەنداوێکیان بە چل هەزار کەس دیاری کردووە کە لەوانەیە زێدەڕۆیی تێدا بێت،

بەڵام ئێستە هەر ئامێرێکی هەڵکەندنی وەك شۆفڵ و بلدۆزەر کاری سەدان کرێکار ئەنجام دەدات.

لە مێژوودا دەوترێت دیلەکانی جەنگ و بە تایبەتی دیلەکانی رۆمەکانیان وەك کرێکار لە بەندوەکان بەکار خستووە، بەڵام تەنیا لە سەردەمی شاپووری یەکەم ئەو بابەتە هەبووە، لە سەردەمانی دیکەدا دیلەکان کاریان پێ نەدەکرا.

لە سەردەمی ئاشتیدا رۆمەکان لە ئێران کاریان دەکرد و ئێرانییەکان شێوازی کاری بیناسازی لە رۆمەکان فێردەبوون و سوودیان لێ وەردەگرت. بە تایبەتی شێوەی بیناکردنی تاقەکانی نێو بیناسازی رۆمەکان بە زوویی فێربوون و لە بیناسازیدا پێڕەویان کردووە، هەروەها لە بیناسازی ئەشکانییەکانیشدا هەبووە، دوای ئەوەی عارەبان هاتنە ئێرانیش ئەو بابەتە هەر مابوو.

بە پێچەوانەی ئەوەی هەندێ لە مێژوونووسە ئەورووپاییەکان باسیان کردووە، ئابووری سەردەمی ساسانییەکان بە تەنیا ئابووری شوانکاری نەبووە و بە شێوەیەکی زۆر سادەتر لەوەی ئێستە هەیە، ئابووری پیشەسازی بووە، تەنانەت بۆ ئاسانبوونی ئاڵوگۆڕی دراو، پارەی کاغەزیشیان برەو پێداوە کە بە (ئێران پەت) ناوبراوە، واتاکەشی راستەوخۆ دەبێتە (کاغەزی ئێران). ئەو دراوە، دواتر لە دوای هاتنی عارەبان هەندێ لە پاشا و دەسەڵاتدارانی وڵاتانی دیکە ویستیان وەك سەردەمی ساسانییەکان لاسایی بکەنەوە، چوونکە وەك سککەی زێڕ و زیو بایەخی هەبوو.

ئەو دراوەیەی لە سەردەمی ساسانییەکاندا هەبوو، لەسەر کاغەز هەڵنەدەکەندرا، بەڵکو لەسەر چەرم دەدرا، ئەوان مۆرێکی دارینیان هەبوو کە نەخشی تایبەتی لەسەر هەڵکەندرابوو، پێش ئەوەی چەرمەکەی پێ مۆر بکەن، لە تیزابیان وەردەدا، دواتر لە مۆرەکەیان دەدا و تیزاب بە شێوەی بەرچاو چەرمەکەی دەخوارد و جێی نەخشەکەی بەجێ دەهێشت. ئێرانییەکان بۆ خۆیان داهێنەری ئەو جۆرە لە دراو نەبوون، ئەو بابەتە لە چینییەکانەوە فێر بوون.

ئەو چەرمەی بۆ ئەوکارە بەکار دەبرا، برێتی بوو لە چەرمی ئەسپ و لە پێستەخانەی تایبەتی خۆش دەکران، چوونکە لە بازاڕەکان دەست نەدەکەتن، چەرمی دراو تەنانەت دوای سوانیشی هەر لەلایەن خەڵکەوە دەناسرایەوە و لە ناسینیشی هەرگیز هەڵە نەدەکرا، چوونکە بە شێوەی تایبەتی ئامادە دەکرا، بە شێوەیەك بوو کە لوول نەدەرا و نەدەنووشتایە و لە

قەبارەی دیارکراو و تەختی وەك مەقەبا چێ دەکران. بەپێی نرخی دراوەکەش قەبارە و شێوەیان جیا بوو، بە شێوەیەك بوون، تەنانەت لە تاریکیشدا خەڵك دەیتوانی بزانێت دراوەکە چەندە.

لە هەموو شارە گەورەکانی ئێران ناوەندێکی پارە گۆڕینەوە هەبوو، کە تیایدا هاووڵاتییەکان دراوی چەرمیان دەگۆڕییەوە و دراوی زێڕ یاخۆ زیویان وەردەگرت. لە شارە بچووکەکانیش کە ناوەندیی پارە گۆڕینەوەیان نەبوو، بنکەکان ئەو کارەیان ئەنجام دەدا، لە بەرانبەردا هەندێ سوودیان لە کەسەکە وەردەگرت. ئەو دراوە تەنانەت ئەگەر کۆنیش ببووایە وەك دراوی کاغەز لەنێو نەدەچوو، چوونکە چەرمەکەی تایبەتی بوو و دەست نەدەکەوت، ساختەش نەدەکرا.

هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن لە سەردەمی ساسانییەکان لە ئێران هەندێ ڕێگە بە شێوازی ڕۆم و لەلایەن ئەندازیاری ڕۆمی چێ کراوە. ڕێگەکان بە بەردی شکاو بەردڕێژ کراوە و بە لم داپۆشراوە، دواتر بە توندی کوتاویانە بۆ ئەوەی قایم و پتەو ببێت.

بێگومان ژمارەیەکی ڕۆمی لە سەردەمی ساسانییەکان لە ئێران کاریان کردووە، بەڵام ئەگەر ئێستە کۆڵینکاری و پشکنین بۆ شارێگەکانی سەردەمی هەخامەنشیی بکەن، لەژێر ڕێگەکان بەردە شکاوەکان دەدۆزنەوە، هەموو مێژوونووسە یۆنانییە کۆنەکان، تەنانەت هیرۆدۆت، ئەو شێوە لە چێکردنی ڕێگەیان بە هی ئێرانیان زانیوە، بەڵام لەوانەیە ئەو شێوە ڕێگەیە تا سەردەمی ساسانییەکان بەردەوام نەبوو بێت و فەرامۆش کرابێت، دواتر بۆ جارێکی دیکە ئەو شێوەیە لە ڕۆمەکانەوە وەرگیرابێتەوە. چوونکە لە مێژووی ئێران زۆر جۆر لە پیشە و هونەر هەبووە کە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لەنێو چوون، دواتر جارێکی دیکە گەڕاونەتەوە یاخۆ بۆ هەتا هەتا لەنێو چوون.

لە سەردەمی ساسانییەکان ئێران گەورەترین ناوەندیی هەناردەکردنی ئاسن و پۆڵا بووە، بۆ ئەمەش دەبووایە ئەوان شێوازی تواندنەوەی ئاسنیان زانی بێت، بەڵام ئەو بابەتە دواتر بە شێوەیەك لە ئێران فەرامۆشکراوە، کە لە سەدەی هەڤدەیەمی زایینی ئەوان نەیاندەزانی ئاسن بتوێننەوە و نەشیان دەتوانی پۆڵا چێ بکەن.

ئێرانییەکان چێکردنی تۆپی جەنگی لە خەڵکی وێنیز لە سەردەمی پاشاکانی (ئاق قۆینلو) فێر بوون، دواتر هەندێ شتان لە عوسمانییەکانەوە لەو بارەوە فێربوون، پاشان بە بەردەوام بۆ خۆیان تۆپیان چێ دەکرد، نادر شای ئەفشار ئەو تۆپانەی لە جەنگەکاندا بەکار دەبرد کە لە ئێران چێ دەکران، کەچی لە سەدەی نۆزدەیەم توانای چێکردنی تۆپیان نەما.

دروستکردنی شووشەش هەمان گرفتی هاتەپێشیّ، ئێرانییە کۆنەکان شووشە و تەنانەت شووشەی پەنجەرەشیان چێ دەکرد، بەڵام دواتر بە هۆی ڕووداوەکانی ڕۆژگار و مردنی پیشەوەرانی ئەو بوارە، ئەو پیشەیە دووچاری داکشان بۆوە.

یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئابووری ساسانییەکان بوونی گومرگ بۆ هەموو ئەو کاڵایانە بوو کە هاوردەی ئێران دەکرا، ئەو بابەتە لە داهێنانەکانی ئەم سەردەمە نییە، بە هەمان شێواز کە ئێستە وڵاتان بۆ پارێزگاری لە پیشەسازی و کشتووکاڵی خۆیان و بەپێی بەرژەوەندی خۆیان زیادە دەخەنە سەر کاڵاکان، بە هەمان شێواز لە سەردەمی ساسانییەکان بۆ پاڵپشتی لە بەرهەمی پیشەسازی ناوەخۆ نرخی گومرگی هەندێ کاڵا دەبرایە سەرەوە.

لە مێژوودا دەبینرێت کە شاپووری دووەم گومرگی سەر جۆرە کوتاڵێکی زیاد کرد کە لە سوریاوە بۆ ئێران دەهات و ببووە ڕکابەری کوتاڵە ئێرانییەکان، کەواتە بۆ ئەوەی بەرهەمی ناوەخۆ فرۆشتنی لەنێو بازاڕ ناوەخۆییەکان دانەبەزێت، گومرگێکی زۆرتر لەسەر کوتاڵە هاوردەکان دادەنرا.

مێژوونووسە ئەورووپاییەکان نووسیویانە کە ئێرانییەکان دروستکردنی پرد لە ڕۆمەکانەوە فێربوون، بەڵام خۆشبەختانە بەنداو و کارێزیان بە داهێنانی ئێرانییەکان ناسیوە، لە تەواوی ئاسیادا لە هەر شوێنێك کارێز هەڵکەندرا بێت، ئەوا لە ئێرانییەکانەوە فێربوون، زۆرینەی کاتەکان کارێز هەڵکەنە ئێرانییەکان سەرپەرشتی ئەو کارەیان لە دەڤەرەیلی دیکە کردووە، ئەوان لە دۆزینەوەی سەرچاوەی تایبەت بۆ کارێز و ئەو سەرچاوانەی بە دایك هەژمار دەکران زۆر کارامە بوونە.

دەوترێت ئاوە ژێرزەمینییەکان سەرچاوەیان لە دامێنی شاخەکانە، بەڵام بیرهەڵکەنە ئێرانییەکان لە نێوەندیی دەشتەکان و لە مەودای زۆر دوور لە شاخەکاندا کارێزیان لێداوە، ئەمە لە کاتێکدا بووە کە بەردەوام ئەو شوێنەی بۆ سەرچاوەی ئاوەکە هەڵیان دەکەند جیاوازیی لە ڕووکاردا نەبووە لەگەڵ شوێنەکانی دیکە دەشتەکە.

متمانەی زۆر بە کارێز هەڵکەنە ئێرانییەکان هەبوو، زۆر جار تەنیا پشت بە وتەکانی ئەوان دەبەسترا بۆ بوونی ئاو لە شوێنێك و پارەیەکی زۆر خەرج دەکرا بۆ دۆزینەوەی ئاو و باوەڕ نەدەکرا کە ئەوان هەڵە بکەن.

ئەوانەی پارەیان بۆ هەڵکەندنی کارێز دابین دەکرد، لە دەستپێکی دەرگەی کارێز تا ئەوکاتەی دەگەیشتنە چاڵی سەرەکی واتە ئەو شوێنەی بە لێکدانەوەی کارێز هەڵکەن ئاوی تێدایە، تەنانەت دوای هەڵکەندنیش، ئەگەر چاڵەکە ئاویشی تێدا نەبووایە، بیریان بۆ لای ئەوە

نەدەچوو کە کارێزهەڵکەنەکە هەڵەی کردبێت. ئەوان وێڕای ئەو زیانە زۆرەی بەریان دەکەوت، دەیانوت لەوانەیە ئاوەکە هێندە لە قووڵایی بێت کە هەڵکەندنەکەی پیێ نەگەیشتبێت.

کارێزهەڵکەنە ئێرانییەکان دەیانزانی هەر شوێنێك هەڵکەنن، سەرەنجام دەگەنە ئاو، بەڵام هەندێ کات ئاو دەکەوتە قووڵایی سێ تا چوار هەزار گەز، ئەوەش لە توانای هەڵکەندنی ئەوان نەبوو، تەنانەت ئەگەر توانای هەڵکەندنیشیان هەبووایە، ئاو لە دوو هەزار مەتر پتر سەرناکەوێت و ناتوانێت بێتە ناو کارێزەکە و ڕێڕەوەکەی ببڕێت و بێتەدەر.

لە کارێزدا شتێك بە ناوی پەمپ نییە، دوای ئەوەی چاڵی سەرچاوە هەڵدەکەندرا، ئیتر ئاو بە توانا و هێزی خۆی دەبووایە بێتە نێو کارێزەکە و بەرەو سەر بڕوات.

هەمووان دەڵێن و دەیانوت ئاو بەرەو سەر نایەت، بەڵام کارێزلێدەرە ئێرانییەکان دەیانوت دێت و هەورازی کارێز بە رادەیەك نەرم بوو کە ئاو بە هێواشی بەرەو ناو گەرووی کارێزەکە دەڕۆیشت و سەردەکەوت تا دەگەیشتە دەرەوە.

لە هەڵکەندنی بیرەکان لە دەروازەی کارێز تا دەگەیشتە چاڵی سەرچاوەی ئاو، دەبووایە نشێوی زۆر نەرمی پێ بدرێت و هێندە بێت کە ئاو بە ئاسانی بتوانێت پێیدا بڕوات، لە سەردەمی ئێستەدا ئەندازیاران بۆ دیارکردنی ئەو جۆرە ڕێڕەوەی ئاو پێویستیان بە سوود وەرگرتن لە ئامێر و لێکدانەوەی ئەندازەیی و...هتد هەیە، کارێزلێدەرە ئێرانییەکان بێ ئەوەی ئەو زانستانەیان هەبێت، یەك بەرە دەست هەڵەیان نەدەکرد.

ئێرانییەکان زۆر بابەتیان بە جیهانیان ناساند کە دەتوانین باس لە: (گەنم، نیسك، ماش، گاورەس، جۆرەکانی دانەوێڵە و گوڵ و ڕووەکی دەرمانی، چێکردنی بەنداو، شەکر لە قامیشی شەکر و ڕێگەسازی و...هتد)، بەڵام لەنێو هەموو ئەو بابەتانەدا هەڵکەندنی کارێز بابەتێکی هەستیار و تایبەتمەندە.

دوای هەزاران ساڵ هێشتا جێگەی رامانە کە ئەوان چۆن توانیان پەی بە ئەوە ببەن کە دەتوانن بە هەڵکەندنی کارێز کە هەورازێکی نەرمی هەیە، ئاو لەژێر زەوییەوە بگەیەننە سەر ڕووی زەوی و چۆن توانیان ئاوی ژێر زەوی بدۆزنەوە و بە گەیاندنی بۆ سەر زەوی سوودی لێ ببینن.

کەس نازانێت یەکەم کارێز هەڵکەن چ کەسێکی ئێرانی بوو، بێگومان ئەو لە کەسە داهێنەر و زیرەکەکانی جیهان بووە.

چێکردنی بەنداویش داهێنانی ئێرانییەکان بوو، پێش ئەوەی ئەوان ئەو کارە بکەن، کەس لە هیچ وڵاتێکدا بە بیریدا نەهات ئەو کارە ئەنجام بدات، ئێرانییەکان بەو کارەیان نەتەنیا ئاستی ئاویان بەرز کردەوە تا زەوییەکانیان ئاو بدەن، بگرە بوونە خودان پاشکەوتی ئاویش کە لە پشت بەنداوەکاندا دەمایەوە.

وەستاکانی بواری بەنداو لە ئێران جۆرێك لە ساروجیان هەبوو کە بە تەواوەتی نەزانراوە لە چی بەرهەم هاتووە، تەنیا وەك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە، ئەوان ئاهەك (قەسەڵ) و خیزیان بەکار بردووە، دواتر تێکەڵیان کردوون، ماوەیەکی باش کوتاویانن، ئەو کوتانە بۆ نەرمکردنەوەی قەسەڵەکە نەبوو، ئەو کارە پێش تێکەڵ بوونیان بە ئەنجام گەیشتووە. گوایە ئەو کوتانە بۆ پتەوتر بوونی ئەو ساروجانە بووە، بەو پێیەش ئەو ساروجەی پێش دوو هەزار ساڵ چێ کراوە، لە ڕووی پتەوییەوە جیاوازیی نەبووە لەگەڵ چیمەنتۆی ئەم سەردەمە.

ئێرانییە کۆنەکان کاری گەورەیان بۆ چێکردنی بەنداو دەکرد، ئەوان سەرەتا ڕێڕەوی ئاویان دەگۆڕی، ئەوە لە ڕووبارە گەورەکان و بە تایبەتی لە وەرزی زۆربوونی ئاو واتە لە وەرزی بەهاردائەنجامدانی ئەو کارە سەخت بوو، ئەوان دوای ئەوەی ئاویان دەخستە ڕێڕەوێکی دیکەوە، چاوەڕوان دەبوون شوێنەکە وشك ببێتەوە، دواتر سێ تا چوار گەز زەویان هەڵدەکەند بۆ بناخەی بەنداوەکە.

ئەو بەنداوانەی لە خۆزستان چێ کران، هەموویان لەو بەنداوانە بوون کە سێ گەز زەوی ژێریان بۆ بناخە هەڵکەندرابوو، پێوانەیە لە هەڵکەندنیش ئەگەر لێك بدرێتەوە، دەزانرێت کە ئەو خاك هەڵگرتنە چەندە زۆر دەکات.

یەکێك لەو بەنداوانەی لە سەردەمی ساسانییەکان چێ کرا برێتی بوو لە بەنداوێك لەسەر ڕووباری هیرمەند بە مەبەستی پاشکەوتکردنی ئاوی ڕووبارەکە لە وەرزی سەرکێشی ئاو واتە لە وەرزی بەهار، کە سەرکێشی ئاوی ئەو ڕووبارە لە ئێرانی کۆن بەناوبانگ بوو.

شاپووری دووەم زۆر ئارەزووی لە کاری تەلارسازی بوو، بۆیە لە سەردەمی ئەودا زۆر کۆشکی گەورەی پاشایەتیی چێ کران، یەکێك لەوان بە (کۆشکی تیسفون) ناسراوە و هێشتا پاشماوە و شوێنەوارەکانی ماوە کە بە (تاقی کیسرا) ناو دەبرێت، عارەبان چێکردنی ئەو کۆشکەیان بۆ ئەنۆشیروان دەگەڕێننەوە، هەرچەندە لە راستیدا ئەنوشیروان بینای نەکردووە و هی شاپووری دووەم بووە.

ئەو بابەتە تا ئەم دواییانەش نەزانراو بوو، هەر دەوترا ئەو کۆشکە لەلایەن ئەنۆشیروان چێ کراوە، بەڵام دوای ئەوەی لێکۆڵینەوە کرا و بە هۆی (کاربۆنی ١٤) تەمەنی کۆشکەکە دیارکرا، دەرکەوت کە ئەو کۆشکە کۆنترە لە سەردەمی ئەنۆشیروان و هی سەردەمی شاپووری دووەمە.

کۆشکی بە شکۆی بێشاپوور لە فارس، یەکێکی دیکەیە بوو لەو کۆشکانەی شاپووری دووەم بینای کرد و لە سەرەتای ساڵی (١٩٧١ ز) دەستەیەك لە شوێنەوارناسانی فەرەنسی توانیان ستوونەکانی ئەو کۆشکە لەژێر خاك دەربهێننەوە و بەپێی ئەو ستوونانە دەرکەوت شاپووری دووەم کۆشکەکانی بە شێوازی کۆشکەکانی سەردەمی هەخامەنشیی و بە بەرد بینا دەکرد. ئەگەر ئێستە هیچ شوێنەواری بەردەکانی کۆشکی تیسفون واتە تاقی کیسرا نەماوە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خەلیفەی عەباسی (مەنسور) کاتێك ویستی شاری بەغدا چێ بکات تەواوی بەردەکانی ئەو کۆشکەی بۆ بەکار بردن لەو شارە گواستەوە. داتاشینی بەرد لە رابردوو کە هیچ ئامێری تایبەتی وەك ئەمڕۆ نەبوو، کارێکی زۆر سەخت بوو، بۆیە کاتێك خەلیفەی عەباسی بەردە تاشراو و ئامادەکراوەکانی کۆشکی تیسفونی بینی، هەموویانی بۆ ئەو شارە گواستەوە و لە بیناکانی ئەو شارە سوودی لێ وەرگرتن.

نەتەنیا عارەبان کەوتنە گواستنەوەی بەردەکانی کۆشکەکانی شاپووری دووەم، بگرە ئەو ئێرانیانەی لە کۆشکەکانیش نێزیك بوون، خۆیان ماندوو نەدەکرد و بەردەکانی ئەو کۆشکانەیان بۆ بەکاربردنەوە لە بیناکانیان دەگواستەوە. ئەگەر دەبینرێت کە پاشماوەی تەختی جەمشید تا ئێستە لەنێو نەچوو و بە تاڵان نەبرا، بۆ شکۆی ناوی سلێمان دەگەڕێتەوە و ئێرانییەکان وتیان ئەوە بارەگەی سلێمانی پەیامبەر بووە، بە پیرۆزی ئەو کەسە وێرانەکانی بە یەکجاری لەنێو نەبرد و هەمان کاریشیان بۆ گۆڕی کوروش بەکار هێنا و وتیان ئەوە گۆڕی دایکی سلێمانە، بەم شێوەیە ئەو شوێنەوارانە مانەوە و لەنێو نەچوون.

شارسازی لە سەردەمی ساسانییەکان زۆر باشتر بووە، لە شارسازی لەدوای هێرش هێنان بۆ ئێران، پێش ئەو کات تەواوی ئەو شارانە بینا دەکران وەك نموونە شاری بیشاپوور، ئاوی خواردنەوە و کەناڵی زێرابیان هەبوو. دوای نەمانی ساسانییەکان چیدی کەناڵی زێراب لە شارەکانی ئێران، جگە لە شارەکانی وەك ئیسفەهان، گیلان، مازەندەران و ئەستەر ئاباد چێ نەکرانەوە.

دوای ئەو سەردەمە لە جیاتی زێراب، لە هەموو ماڵەکان چاڵیان بۆ ئاودەست هەڵدەکەند، زانراوە ئەو چاڵانە لە داهێنانی ئێرانییەکان بووە، تەنانەت نەتەوەکانی دیکە نەیان بووە. شاری رۆم لە گەرمەی دەسەلات و شکۆمەندیدا چاڵی ئاودەستی نەبووە، سی و حەوت تاقی نەسرەتیان هەبوو، بێ ئەوەی چاڵێکی ئاودەستیان هەبێت. پاریسی پایتەختی فەرەنساش نە چاڵ و نە کەناڵی زێرابی نەبووە، تەنانەت لە ڤێرسای پایتەختی دەسەلاتدارانی فەرەنساییدا کە لویسی چواردەیەمی لێ بوو، چاڵی ئاودەست نەبوو، لەوانەیە دووچاری سەرسوورمان بین ئەگەر بگوترێت کە چاڵی تەوالێت و وانی گەرماو لەلایەن (محەمە رەزا بەگ) نێردەی ئێران براوەتە دەرباری لویسی چواردەیەم و ئەو بابەتەی فێری فەرەنسییەکان کردووە.

لە ئێران لە سەردەمانی بەر لە مێژوو چاڵی ئاودەست هەبووە، لە هەندێ شوێن لە کاتی گەڕان لە شوێنەوارەکاندا دۆزراوەتەوە، بۆ نموونە لە گردی شاری سێلکی کاشان کە تەمەنی حەوت هەزار ساڵ بەر لە ئێستەیە، لە گردی حەساری دامەغان کە هی شەش هەزار ساڵە، ئەو چاڵانە دۆزراونەتەوە، ئەمەش نیشانەی کۆنی و بەرزی شارستانییەتی نەتەوە ئێرانییەکانە بەسەر ئەوانی دیکە و بە تایبەتی بەسەر ئەورووپاییەکاندا.

یەکێك لە کارە سەرەنج راکێشەکانی سەردەمی ساسانییەکان هەڵکەندنی کانەکان و دەرهێنانی کانزاکان بووە.

لە سەردەمی ساسانییەکاندا ئێران گەورەترین هەناردە کاری ئاسن و مس بووە لە ئاسیا، بۆ ئەمەش پێویستی بە دەرهێنانی رێژەیەکی زۆر بەردی ئاسن و مس هەبوو، بە هەمان شێوە بۆ ئەو کارە ژمارەیەکی زۆر کرێکاریش پێویست بوو. چوونکە کارکردن لە کانەکاندا قورس بوو، بۆیە مووچەی ئەوان پتر بوو لە کرێکارەکانی دیکە، دوای هەر جەنگێکیش، دیلەکان دەکرانە کرێکار لە کانەکان تا پێداویستیی کانەکان بۆ کرێکار کەم ببێتەوە.

دیلە جەنگییەکان ئەگەر بە رێکەوتن لە نێوان پاشای ئێران و پاشای دوژمن ئازاد کرا بووان، ئەوا دوای دانی بڕە پارەی دیارکراو بۆ هەریەکەیان، ئازاد دەکران، ئەوەی لە وڵاتی خۆی کەرەستە و موڵکیان هەبووایە یاخۆ لە خزمەکانیان پارەیان وەرگرتبایە، ئەوە ئازاد دەکران، ئەوەشی پارەی نەبووایە بۆ ئازادبوونی بیدات، وەك دیل دەمایەوە و بەپێی پێویستی سەردەم سوودی لێ وەردەگیرا.

لە هەندێ سەردەم ئەوانیان ناچار دەکرد تا کاری کشتووکاڵ بکەن یاخۆ بەنداویان پێ دروست دەکردن، یان پێشنیازی دوو تا سێ ساڵ کار کردن لە کانی ئاسن یاخۆ مسیان بۆ

دەکرا، ئەوانیش پەسەندیان دەکرد، دیلەکان ناچار بوون متمانە بە وتەکانی ئێرانییەکان بکەن، دوای دوو یاخۆ سێ ساڵ لە کارکردن لە کانەکان ئازاد دەکران.

کرێکارەکان بەردەکانی ئاسن و مسیان دەگواستەوە، چوونکە ئەمە کارێکی سەخت بوو، بۆیە تا لەتوانادا بووایە کارگەکانی تواندنەوەیان لە نێزیك کانەکان دادەمەزراند. سرووشتییە کە کارگەکان دەبووایە نێزیك ئاو دروست بکرێن، چوونکە تواندنەوەی ئاسن و مس و چێکردنی پۆڵا بە گشتیی ئاوی زۆری دەوێت. بە دڵنیاییەوە ئێرانییەکان بە لێهاتوویی و تەکنیکی باش توانیویانە ئاسن بتوێننەوە، بۆیەش بوونەتە گەورەترین هەناردەکاری ئاسن و لە لایەکی دیکە ئەوان بۆ تواندنەوەی مسیش دەکرێت کە هەمان لێهاتوویيان هەبوو بێت.

ئەمڕۆ دەزانین پێویستیمان بە پلەی گەرمی بەرز بۆ تواندنەوەی ئاسن و مس هەیە، کە بۆ ئاسن بە لانی کەم دەگاتە (١٥٣٥) پلەی سەدی، بۆ مسیش بە لانی کەم دەگاتە (١٠٨٣) پلە.

بە سووتەمەنی ئێستە بە دەستهێنانی ئە پلە گەرمییە کارێکی ئاسانە، بەڵام بە سووتەمەنی ئەوکات کە تەنیا برێتی بووە لە داری وشك، گەیشتن بەو پلە گەرمییە زۆر سەخت بووە. جگە لەوە ئەو پلەیە بۆ توانەوەی بەردی ئاسن کەمە و پێویستە ئەو گەرمییە بگاتە لانی کەم (١٦٠٠) پلە تا بەردەکان بە باشی بتوێنەوە. چوونکە ئاسن و مس لەو کانانەن کە زۆر بە زوویی ژەنگ دەیانگرێت، بۆیە ئاسن و مسی سەردەمی ساسانییەکان هیچ پاشەوارێکی نەماوەتەوە.

بە گریمانی زۆر هەر وەك چۆن ئێستە جیاوازیی لە نێوان بەرهەمی کۆتایی ئاسن و پۆڵای وڵاتێك بۆ ئەوی دیکە هەیە، بە هەمان شێوە لە رابردوودا جیاوازیی لە نێوان پۆڵا و ئاسنی ئێران و پۆڵا و ئاسنی وڵاتانی دیکەیش هەبووە، کە دەبوونە دوا بەرهەم و ئەو جیاوازییە زۆرتر بوو لە ئەوەی ئەمڕۆ هەیە، چوونکە پارێزگاریکردن لە نهێنییەکانی پیشەسازی لە کۆندا زۆر پتر بووە.

لە سەردەمانی کۆن هەر وڵاتێك کە جۆرە کاڵایەکی باشی هەبووایە، نەتەنیا نەیدەویست کەس ببێتە رکابەری، بگرە نەیدەویست کەسی دیکە بتوانێت لە هەمان کاڵا بەرهەم بهێنێت. هەروەها لە هەموو وڵاتێکدا وەستاکانیش نەیاندەویست هاوپیشەکانیان نهێنییەکانی پیشەکەیان بزانن، تەنیا منداڵەکانی خۆیان دەخستە سەر کار تا بە زوویی ئەو نهێنییە بزانن.

ئێستە بۆ توانەوەی بەردی ئاسن، هەندێ مادەی دیکە لەگەڵ بەردی ئاسن دەکەنە ناو کورەکان و لە رابردووشدا بێگومان بۆ دەستکەوتنی ئاسنی خاوێن هەمان کاریان کردووە،

بەڵام تواندنەوەی ئاسنی سەردەمی ساسانییەکان بە شێوەیەك کەوتە فەرامۆشی کە ئێستە ئێمە هیچ یەکێك لەو مادانە ناناسین، هەرچی سەبارەت بە تواندنەوەی مسیشە، ئەو بابەتە بەردەوام بوو لە دوای تەواوبوونی دەسەڵاتیی ساسانییەکان.

کۆمەڵگەی ئێرانی لە سەردەمی ساسانییەکاندا بەسەر چینە جیاوازەکاندا دابەش ببوون، هەر چینێك کاری خۆی دەکرد و دەستی نەدەخستە نێو کاوباری چینەکەی دیکە، یەکێك لە چینەکان برێتی بوون لە جووتیاران، هەموویان بە جووتیاری خودان مۆڵك کە مۆڵکی کەمی هەبوو، هەژمار دەکران، هەر جووتیارێك کاری بۆ خۆی دەکرد و زەوییەکی کەمی هەبوو، کەس کۆیلە نەبوو، بەڵام ئەمە تایبەت بوو بە ئێرانییەکان و دیلەکانی نەدەگرتەوە کە بۆ خاوەن زەوییەکان وەك کۆیلە کاریان دەکرد. یەکێك لە داهێنانەکانی جووتیارە ئێرانییەکان برێتی بوو لە لێکدانی گەنم و جۆ و بەرهەم هێنانی دانەوێڵەیەکی دیکە کە نە جۆ بوو، نە گەنم، بەرهەمی زۆری لێ دەکەوتەوە و نانێکی زۆر خۆشی لێ چێ دەکرا.

پەمۆ یەکێك لە بەرهەمەکانی دیکەی سەردەمی ساسانییەکان بوو، بە تایبەتی لە ناوچە گەرمەکان دەچێندرا، وەك باسکرا تەواوی ناوچەکانی ئێران لە سەردەمانی کۆندا بارانیان پتر بوو، پەمۆ پێویستی بە باران و هەتاو هەیە، لە ناوچە گەرمەکانی ئێران هەردووکیان هەبوون. بە دڵنیایی رێژەی بەرهەمی پەمۆی ئێران نازانین، بەڵام دەزانین کە رێژەیەکی باشی لێ هەناردە دەکرا.

یەکێکی دیکە لە بەرهەمە فرەوانەکانی کشتووکاڵی لە سەردەمی ساسانییەکاندا قامیشی شەکر بوو کە بەرهەمێکی زۆری ئێران بوو، کە لە شیلەکەی شەکر بەرهەم دەهات، بە هەردوو رێگەی ئاوی و وشکانی هەناردەی وڵاتانی دراوسێ دەکرا. بە ڕای زۆر کەس وشەی شەکر وشەیەکی هیندییە و بە هۆی زۆری شەکر لەو وڵاتە ئەو ناوە بۆ زمانەکانی دیکە پەڕیوەتەوە، تەنانەت بۆ ئێرانیش هاتووە، ئەگەر ئەوە راستیش بێت، قامیشی شەکر لە ئێران زۆر بووە، بۆیە ئەوکات شەکر لە ئێرانەوە رۆیشتووە بۆ هیندستان.

هەندێ لە میوەکانی دەڤەرە گەرمەکان کە ئەمڕۆ لە ئێران دەست ناکەون و لە سەردەمی ساسانییەکان بە رێژەی زۆر لە ئێران بەرهەم دەهاتن، بۆ نموونە مۆز و بانگولە کە جۆرە کاڵەکێکە کە بە دارەوە دەڕوا، ئەو دارە لە تەواوی کەنارەکانی باشووری ئێران هەبوو، بەڵام ئێستە هاوشێوەی ئەو میوەیە تەنیا لە بلوچستان هەیە.

جووتیارەکانی ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان مۆزیان بە باشی دەناسی و دەیانزانی دارێکە کە تەمەنی تەنیا ساڵێکە و یەك جار میوە دەگرێت و وشك دەبێت، ئەوان دەیانزانی میوەکەی بە شێوەی هێشوویەکی گەورەی مۆزە کە سەد تا سەد و پەنجا دانە مۆزی دەبێت، بەڵام ئەگەر پێش وشکبوونی داری مۆز، پارچەی پێستی دارەکە بە ئەندازەی لەپی دەستمان ببڕین و بیان چێنین، ئەوا لەو دارە یازدە مانگییە دەتوانرێت داری تازەمان دەست بکەوێت، کە بە هەمان شێوە مۆزمان پێ دەدات و لە ئەنجامدا پێش ئەوەی داری مۆز وشك ببێت، لانی کەم لەو دارە یەك داری تازەی مۆز دەست دەکەوێتەوە، ئەو بابەتەش لە لای جووتیارانی ئەوکاتی ئێران زانرا بوو.

داهێنانێکی جووتیارانی سەردەمی ساسانییەکان برێتی بوو لە دۆزینەوە و دەرهێنانی شیلەکەی رەگی دەوەنەکانی بیابان، نەتەوەکانی دیکە تەنیا دەوەنەکانیان دەناسی و دەریان دەهێنان، بەڵام ئەوان شیلەی ئەو دەوەنانە کە برێتی بوون لە: (دەوەنی گەز شیری، دەوەنی گەز ئەنگەبین و دڕکی خەسك و...هتد). ئەو شیراوکانەی جووتیاری ئێرانی لە بنە دەوەنەکانی دەردەهێنان، سوودی پیشەسازی یاخۆ پزیشکی یان خۆراکی هەبوو. ئێرانییەکان لە شیراوکەی کەتیرە سوودیان بۆ پیشەسازی وەردەگرت و شیراوکەی (ئەنقوزە) بۆ گیادەرمانی بەکار دەهات و پەلکەکانیشی لە بیابان بۆ نەهێشتنی تینوویەتیی دەدرایە ئاژەڵەکان ئەگەر ئاو دەست نەکەوتبایە، جوینی پەلکی ئەو ڕووەکە تینوویەتیی ڕێبوارانیشی نەدەهێشت.

ئەو شیراوکەیەی لە ئەنقوزە لەلایەن ئێرانییەکانەوە دەهێنرایەدەر بۆ کاروباری پزیشکی بەکار دەهات و چارەسەری ئازارەکانی رۆماتیزم بوو، شیراوکەی گەز شیری و گەز ئەنگبینیش وەك خۆراك بەکار دەهات.

پەروەردەکردنی هەنگیش یەکێك لە کارەکانی دیکەی جووتیارەکان بوو، جگە لە جووتیارەکان کەسی دیکە بۆی نەبوو ئەوکارە بکات، جووتیارەکان لە پەروەردەی مێش هەنگوین، زۆر سوودیان وەردەگرت. مێژوونووسە یۆنانییەکان پەروەردەی مێشی هەنگوین بۆ جووتیارانی خۆیان دەگەڕێننەوە، چینییەکانیش خۆیان بە بناخەی ئەوکارە دەزانن، بەڵام هیچ یەکێك لەو وتانە راست نییە و لە تەواوی جیهان لە هەر شوێنێك کە ئاووهەوا فێنك بووبێت ئە کارە هەبووە.

چینی ئاژەڵدارەکان لە سەردەمی ساسانییەکان بە جووتیار هەژمار دەکران، بە هۆی بوونی لەوەڕگە و ئالیکی زۆر بۆ ئاژەڵەکانیان، ئاژەڵداری لە سەردەمی ساسانییەکاندا بە یەکێك لەو

کارانە هەژمار دەکرا کە بەرووبومی باشیان هەبوو، بەرووبومی ئاژەڵی هەر ناوچەیەك خەسڵەتی تایبەت بە خۆی هەبوو.

نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی (ولاَتێر) نانەوەی پەنیری کۆنی بە داهێنانی فەرەنسییەکان داناوە و نووسیویەتی کە زۆربوونی جۆرە پەنیرەکانی فەرەنسی هێمان بۆ پێشکەوتنی ئەوان، ئەگەر ولاَتێر شانامەی فیردەوسی خوێندبایەوە، دەیزانی کە ئەو چەندین جار باسی پەنیری کۆنی لە سەردەمی ساسانییەکان کردووە، ئەگەر نەڵێین کە کۆنکردنی پەنیر پێش سەردەمی ساسانییەکان هەبووە، بە دڵنیاییەوە لە سەردەمی ساسانییەکان هەبووە، فیردەوسی لە چیرۆکی ڕێ بزرکردنی پاشای ئێران لە کاتی ڕاو و ڕۆیشتنی بۆ ماڵی کەسێك، بەم شێوە دەدوێت: (پاشا هەندێ پارە دەداتە ئەو و دەڵێت بڕۆ هەندێ پەنیری کۆن و ناوکە بادامی تازەم بۆ بێنە) فیردەوسی چەندین جار لە شانامەدا باسی پەنیری کۆن دەکات.

هەروەها زۆری جۆری پەنیر لە فەرەنسا نە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوان بە پێشەنگی نەتەوەکانی دیکە لەو بوارە بناسین، نە نیشانەی پێگەیشتوویی ئەوانیشە وەك ولاَتێر دەڵێت، چوونکە لە زۆر ولاَت و لە ئێرانیش جۆرەکانی پەنیر زۆربوون بۆ نموونە لە ئێران جۆرە پەنیرەکانی (لاری، کوردی، پەرچەك، خیکی، شیرازی، مازەندەرانی، لیقوانی و قوچانی) ناوبانگیان هەبووە، لە لایەکی دیکە ئەو نەتەوانەی ئاژەڵدار بوون لە ڕووی بەرهەمە شیرەمەنییەکان زۆر لە پێشەوەی نەتەوە راوچییەکان بوون.

فەرەنسییەکان لەو سەردەمەی بە (گەلوا) دەناسران، راوچی یاخۆ ڕاوکەر بوون و خۆراکی سەرەکیان گۆشت بوو، ئەو نەریتە تەنانەت دوای ئەوەی ئەو نەتەوەبوونی جووتیار و ئاژەڵداریشیان کرد، هەر مایەوە، ئێستەش خۆراکی سەرەکیی ئەوان گۆشتە و نان تەنیا بە بەشێك لە خۆراکیان هەژمار دەکرێت، خۆراکی سەرەکیی نییە. هەندێ لە نەتەوە ئەورووپاییەکان تەنانەت لە ئێستەشدا کە گۆشت کەم بۆتەوە، نان ناخۆن، تەنانەت هۆڵەندییەکان لە هەموو تەمەنیان نایانەوێت نان بخۆن. مەبەستمان لەو بابەتە ئەوەیە کە فەرەنسییەکان یەکەم جووتیار و ئاژەڵدار نەبوون تا پەنیر بەرهەم بێنن، بەلاَم ئێرانییەکان بەر لە ئەوان ئاژەڵداری و جووتیاریان کردووە.

ڕۆمێن گێرشمەنی فەرەنسی لە گردی سێلکی کاشان و لە گیانی نەهاوەند هەندێ شوێنەواری دۆزیوەتەوە کە نیشانی دەدەن ئێرانییەکان بەر لە حەوت هەزار ساڵ ئاژەڵداریان کردووە.

ژان دۆ مۆرگان دەڵێت: بە باوەڕی من ئاژەڵداری لەلایەن ئەو خێڵانەی لە کوێستانەکانی ئێران دەژیان، دەبێت لە هەزاران ساڵ پتر بێت.

هێرتزفێلد دەڵێت: بە هۆی هەبوونی ژمارەی زۆری مەڕی کێوی لە ئێران، دەکرێت بگوترێت کە ئەو ئاژەڵە لە ئێران کراوە بە ئاژەڵێکی خۆماڵی یاخۆ ئێران یەکێك لەو ناوەندانەیە کە هەر لە سەرەتاوە ئەو کارەیان کردووە، ئەگەر راوی لە رادە بەدەری ئەو ئاژەڵە لە ئێران تا سەرەتای سەدەی بیستەمیش بەردەوام نەبووایە، ئێستەش ئەو ئاژەڵە بە رێژەی زۆر دەست دەکەوت.

لە بەرهەمە ڕووەکییەکانی دیکەی ئێران لەو سەردەمەدا (فستق و زەعفەران) بوون کە دوو میوەی بە بەرەکەت بوونە، هەندێ لە دارەکانی فستق تا نێزیکەی سەدەیەك بەریان هەبووە، ناوەندی تەمەنی بە سوود بۆ بەخشینی میوەی ئەو درەختە شەست ساڵە. لە ڕووداوەکانی سەردەمی شاپووری دووەمدا هاتووە کە ئەو ساڵانە هەندێ لە فستق و زەعفەرانی بە دیاری بۆ هەر یەکە لە پاشاکانی (کەلکوت، کوجارات و سەرئەندیب) رەوانە کردووە.

زەعفەرانیش لە بەرهەمدا بە بەرەکەت بوو، رەگی ئەو ڕووەکە لە زەویدا تا دەساڵ دەمێنێتەوە، نە وشك دەبێت، نە دەڕزێ بۆ ماوەی ئەو دە ساڵەش بەری دەگرت، ئەو ڕووەکە لە ئێرانەوە بۆ هیندستان هەناردە دەکرا، چوونکە لە زۆرینەی خۆراك و خواردنی دەوڵەمەند و سەرمایەدار و دەسەڵاتداران بەکار دەهات، هەوەها دوای هەڵماندنی لەلایەن جووتیارە ئێرانییەکانەوە جۆرە بۆنێکی لێ بەرهەم دەهات، لەکاتێکدا لە ئێران کڕیاری نەبوو، بۆیە هەناردەی هیندستان دەکرا.

ئەو وشکە ساڵییەی لە ئێران لە سەرەتای هەرزەکاری شاپوور بەرۆکی خەڵکی گرت، بۆ ئەو بوو بە مایەی پەند وەرگرتن، بۆیە بەردەوام هەوڵی دەدا رێگری بکات لە دووبارە نەبوونەوەی. وێڕای ئەوەی ئەو سەردەمە لە تەواوی شوێنەکانی ئێران باران زۆرتر دەباری، بەڵام دیسان هەندێ کات وشکەساڵی دەبوو بە هەڕەشە، نەتەنیا لەو ساڵانەی باران بارین کەم دەبۆوە کێڵگەکان تینوو دەبوون، بگرە ئاوی کەناڵەکانیش ئاویان کەم دەبۆوە هەندێ جار وشك دەبوون.

شاپووری دووەم بۆ ئەوەی رێگری بکات لە هاتنی قاتوقڕی بە هۆی کەمی باران بارین و جووتیارانیش لە ئاکامی گرانی دانەوێڵە نەکەونە کێشەوە، هەوڵیدا بۆ ئەوەی جووتیاران لە

تەواوی ئێران بتوانن پتر لە پێویستی ساڵانەی خۆیان و منداڵەکانیان دانەوێڵە و خۆراك دەستەبەر بکەن.

شێوازی کاری جووتیارانی ئێرانی پێش هاتنی شاپوور بەو شێوەیە بوو کە هەر جووتیارێك ڕێژەیەکی دیارکراو لە دانەوێڵەی دەچاند، ئەو ڕێژەیە بە پێوەری خۆیان بەشی پێداویستیی خۆیان و منداڵەکانیانی دەکرد و کەمێکیشی دەمایەوە، بۆ ئەوەی لە بازاڕ ناوەخۆییەکان بفرۆشرێت.

ئەوان هیچ کات لەو ڕێژەیەی دیاریان دەکرد پتریان نەدەچاند، چوونکە زۆر چاندن پێویستی بە بنەتۆی زۆرتر و کێڵانی ڕووبەری زۆرتری زەوی و ئاودانی زیاتر و ماندووبوونی زۆرتر هەبوو، جووتیارەکان نەیاندەویست خۆیان ماندووتر بکەن، بۆیە دانەوێڵەکان هێندە زۆر نەدەبوون کە ئەگەر وشکەساڵی هاتبایە، توانای ڕێگری لە قاتوقڕیان ببوایە.

لە لایەکی دیکە جووتیاران دەترسان کە ئەگەر زیاد لە پێویست دانەوێڵە بچێنن، لەو ساڵانەی کە بەروبووم فرەوان دەبێت، لەسەریان دەمێنێتەوە و بۆیان نافرۆشرێت یاخۆ ناچار دەبن هەرزان فرۆشی بکەن.

شاپووری دووەم نرخێکی جێگیری بۆ دانەوێڵە دیارکرد و فەرمانیدا هەرچەندە جووتیاران زیاتر بەرهەم بهێنن، بەرهەمەکەیان لەلایەن حکوومەتەوە هەر بەو نرخە بکڕدرێت.

شاپووری دووەم لە ڕێگەی دەسەڵاتدار و فەرمانڕەواکانییەوە جووتیارانی تێگەیاند کە هەرچەندە زۆرتر بەرهەمیان هەبێت، ئاساییە و نابێت بترسن کە بەرهەمەکەیان لەسەریان دەمێنێتەوە، چوونکە بە هەمان نرخی جێگیری دیارکراو لێیان دەکڕدرێت، بۆ ئەوەی ئەوان ناچار نەبن هەرزان فرۆشی بکەن. ئەم بابەتە و بانگەشەیە بووە هاندەری باش بۆ جووتیاران، بۆیە ئەوان گومانیان نەبوو لە ئەوەی شاپوور بەڵێنەکانی لەو بارەیەوە جێبەجێ دەکات.

بابەتی ئەمبارکردنی دانەوێڵەکان لە کۆنەوە بابەتێکی وردبووە، نەتەوەکانی پێشین نەیانتوانیوە بۆ ماوەی درێژ دانەوێڵەکانیان لە کۆگەکاندا بهێڵنەوە.

ئێستە بە چێکردنی سایلۆی پێشکەوتوو و نوێ، توانراوە تەنانەت بۆ ماوەی پەنجا ساڵیش دانەوێڵەکان لە ڕزین و لەنێوچوون بپارێزرێن، ئەوکات وانەبوو، دانەوێڵە دەکەوتە بەر هێرشی زیندەوەر و مشکەکان و لەنێو دەبرا.

هەندێ لە دانەوێڵەكان تەنیا بۆ یەك یاخۆ دوو ساڵ توانای هەڵگرتنیان هەبوو، نیسك و گاورەس لەو دانەوێلانە بوون كە لە ڕووی خۆراكییەوە بەهێز و بەرچاون، ئەگەر لە سەرەتای ساڵی دووەمدا بەكارنەهێندرا بووان، ئەوا لەنێودەچوون و بێ كەڵك دەبوون.

هۆی تێكچوونی ئەو دوو دانەوێڵەیە بۆ جۆرە مێشوولەیەك دەگەڕایەوە كە لە سەرەتای ساڵی دووەم دەچووە نێوی و خراپی دەكردن، خەڵكی كۆن زانیارییان نەبوو لەبارەی ئەوەی چۆن بكارن ڕێگە لە هاتنی ئەو مێشوولە و زیندەوەرانە بگرن.

برنج دانەوێڵەیەك بوو هەڵگرتنی بۆ ماوەی پتر لە دوو ساڵ ئیدی نەدەشیا، چوونكە لە ساڵی سێیەمدا جۆرە مێشوولەیەك دەچووە نێوی و خراپی دەكرد. هەندێ لە جۆرەكانی برنج بۆ ماوەی سێ ساڵ دەمانەوە، لە چوارەمین ساڵ خراپ دەبوون، تا ئەو كاتەی بەرەبەرە مرۆڤ توانی نهێنیی پارێزگاریكردنی دانەوێڵەكان لە دەست مشك و زیندەوەر و مێشوولەكان بدۆزێتەوە.

دواتر مرۆڤ زانی بۆ پێشگرتن لە هێرشی مشك بۆ سەر ئەمبار و سایلۆی دانەوێڵەكان، چارەیەك نییە جگە لەوەی لە جیاتی ئەوەی بە وردە بەرد و خۆڵ سایلۆ چێ بكرێت بە بەردی داتاشراو چێ بكرێت. چوونكە ئەگەر سایلۆ بە وردە بەرد دروست بكرێت، مشك بەنێو بەردەكاندا دەڕوات و ڕێگەی خۆی بۆ ئەمبارەكە دەكاتەوە، بەڵام بەردی داتاشراو و گەورە، ڕێگر دەبێت لە چوونی مشك بۆ نێو ئەمبارەكان، ددانەكانی مشك لە بەرانبەر ئەو بەردانە بێ توان بوو، لەو ڕووەوە دانەوێڵەكان پارێزراو دەبوون، بەڵام ئەمە دواچارەسەر نەبوو بۆ پارێزگاری لە بەرهەمی گەنم و جۆ و دانەوێڵە بەگشتی.

ڤێجا مرۆڤ بە هۆی ئەزموونەوەكانی خۆیەوە بۆی دەركەوت كە لەنێو خودی دانەوێڵەكاندا هەندێ شت هەیە كە دەبێتە هۆی لەنێوچوونی، پاش ماوەیەك بۆی دەركەوت ئەوەیە كە لە كاتی هەڵگرتنەوەی گەنم و دانەوێڵە لە كێڵگەكانەوە بۆ سایلۆكان، خۆڵ و هەندێ زیندەوەر لەگەڵ گەنمەكە دەچنە نێو ئەمبار و سایلۆكان و دەبنە مایەی خراپبوونی دانەوێڵەكان، بۆیە لەوكات بە دواوە پێش بردنی دانەوێڵەكان بۆ سایلۆ و ئەمبارەكان هەر لە كێڵگەكاندا گەنمەكانیان بژار و پاك دەكردەوە، بەم شێوەیە تەمەنی بەرگەگرتنی دانەوێڵە لە سایلۆكاندا زیادی كرد.

خاوێنكردنەوەی دانەوێڵە كارێكی زۆر قورس بوو، چوونكە ماوەی زۆری دەویست، بەڵام مرۆڤ بە سەر ئەو مژارەشدا سەركەوت، كاتێك سەد خەروار لە گەنم و جۆیان لە كێڵگەوە بۆ سایلۆكان

دەگواستەوە، نەتەنیا یەك مێروو لەنێویدا نەبوو، بگرە یەك دانە وردە بەردیشی تێدا نەبوو، ئەوەی ئێستە لە سەدەی بیستەم لە ڕێگەی ماشێنەکانەوە دەکرێت، ئەوکات بە ڕێگەی هێڵەك و سەرەند و بێژینگەوە دادەبێژرا، بەم ڕێگەیە تەمەنی مانەوەی گەنم و جۆ و دانەوێڵەکان لەو شوێنانەی بارانیان زۆر بوو دەگەیشتە دە ساڵ، لە شوێنە وشکەکانیش دەگەیشتە نێزیکەی بیست ساڵ، بەڵام دواتر دەرکەوت دانەوێڵە و گەنم و جۆ لە شوێنە شێدارەکان لەنێو ئەمبارەکان چەکەرە دەکەن، مرۆڤ نەیدەتوانی زاڵ بێت بەسەر ئەو بابەتە و سایلۆیەك چێ بکات کە تیایدا ئاڵوگۆڕی هەوا بکرێت، بەو شێوەیە لە شوێنە شێدار و بە بارانەکان، ڕێگە لە چەکەرەی دانەوێڵە بگرن، چێکردنی ئەو ئەمبار و سایلۆیانەی کە ئاڵوگۆڕی هەوایان تێدا دەکرا، دوا کەوت بۆ سەدەی بیستەم، ئەویش بۆ نیوەی دووەمی هەمان سەدە، لە نیوەی یەکەم هەندێ سایلۆ هەبوون کە سیستەمی ئاڵوگۆڕی هەوایان تێدا نەبوو.

لە سەردەمی شاپووردا سایلۆکانیان لە بەردی تاشراو چێ دەکرد و دانەوێڵەکانیشیان خاوێن دەکردەوە بە ڕێگەی سەرەند و بێژینگ و لە سایلۆکاندا هەڵیان دەگرتن.

شاپووری دووەم هەر وەك بەڵێنی دابوو زیادە بەرهەمی جووتیارانی بە نرخی جێگیر دەکڕدرایەوە و لە سایلۆکاندا ئەمباری دەکردن و لەو ساڵانەی وشکە ساڵی دەبوو یاخۆ دانەوێڵە کەم دەبوو، دەرگەی ئەمبارە و سایلۆکان دەکرانەوە و دانەوێڵە بە خەڵك دەدرا.

نرخی جێگیری دانەوێڵەکان لە سەردەمی شاپوور بووە مایەی دەرکەوتنی دراوێکی دیکە کە دراوی کاڵا بوو، کاڵاکە بریتی بوو لە گەنم و خەڵك هێندەیان متمانە بەو نرخە هەبوو کە لە سەوداکاری و کڕین و فرۆشتن و نووسینەکانیان لە جیاتی پێوانە بە پارە، ڕێژەی گەنمیان دیار دەکرد بۆ کڕینی کاڵا و زەوی و...هتد.

شێوازی ئەمبارکردنی دانەوێڵەکان لە سایلۆکاندا بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ کەمی بەرهەم یاخۆ وشکەساڵی لە ئێران بۆ ماوەی زۆر لە سەردەمی ساسانییەکان بەردەوام بوو، تا سەردەمی خەسرەوی پێنجەم ناسراو بە ئەنۆشیروان بەردەوام بوو. دەگێڕنەوە لە سەردەمی ئەنوشیرواندا لە دوای ڕێوڕەسمی نەورۆز و لە سەرەتای بەهاردا، ئەنۆشیروان دەچوو بۆ بەسەرکردنەوەی سایلۆکانی دانەوێڵەی تیسفون (مەدائن)، چوونکە دەیزانی لەو وەرزە ڕێژەی دانەوێڵە جێگیر دەبوو، زەویش هیچی دیکەی پێ نەدەکرا، بەڵام ئەو گێڕانەوەیە لەنگی تێدایە، ئەویش ئەوەیە کە وتوویانە دوای ڕێوڕەسمی نەورۆز و بە بۆنەی وەرزی بەهار،

ئەنۆشیروان بۆ پێڕاگەیشتن بە دۆخی دانەوێڵە دەچوو، بە گریمانی زۆر لە سەردەمی پاشاکانی ساسانی یاخۆ پاشاکانی سەرەتای ئەو زنجیرەیە نەورۆز لە سەرەتای زستاندا بوو.

داهات و بەرهەمی سەرەکیی ئێران کشتووکاڵ بوو، جگە لە چەند کانزایەکی وەك ئاسن و مس هیچی دیکە وەك داهات نەبوو، خەڵکیش لە سەرەتای بەهار ئەوەی هەیانبوو بە زەویاندا دەکرد، دیارە بۆ نەتەوەیەك کە داهاتی سەرەکیی لە کشتووکاڵەوە بێت، ئەو وەرزە بە وەرزی خەرجی هەژمار دەکرا.

هێرتسفێڵد دەڵێت: دەستکەوتنی ئاو لە سەردەمانی کۆنەوە بابەتی بەرچاو و گرینگ بووە بۆ جووتیارانی ئێران، جگە لە ناوچەکانی باکور، ئەوان بۆ ئاودانی زەوییەکانیان کە بارانی پێویستیان نەبوو، ناچار بوون بە دوای ئاودا بگەڕێن، بەو شێوەیە کارێزیان دۆزییەوە. کەواتە ئەگەر پێویستی نەبووایە ئەو داهێنانە گەورەیە کە کارێز بوو، نەدەهاتە کایەوە، بە هەمان شێوە کە هیچ کات جووتیاری فەرەنسی یاخۆ هۆڵەندی بیر لە دۆزینەوەی ئاو ناکاتەوە، چوونکە دەزانێت ساڵانە (١٣٨) رۆژ باران و بەفر لە ئاسمانەوە بۆ زەوییەکانی دەبارێت و زەوییەکانی تینوو نابن و ناچار نابێت بۆ ئاو بگەڕێت، بەڵام جووتیاری ئێرانی بەردەوام بیری لە ئاو دەکردەوە، تەنانەت دوای دۆزینەوەی کارێزیش هەر لەو بابەتە دوور نەبوو، چوونکە ئەگەر تەنیا ساڵێك باران نەباری بووایە، ئاوی کارێزەکەی کەم دەبوو، ئەگەر ببووایە بە دوو ساڵ، لەوانە بوو ئاوی کارێزەکە وشك بکات.

بیرۆکەی نەمانی ئاو کە هێرتسفێڵد باسی دەکات، لە سەردەمی ساسانییەکانیش بەردەوام لەگەڵ جووتیاری ئێرانی مایەوە، بەڵام بە هۆی چێکردنی بەنداوی زۆر و کەناڵەکانی ئاودێری وەك جاران مەترسیدار نەما.

یەکێك لە هۆکارەکانی زۆربوونی بەرهەمی کشتووکاڵی لە سەردەمی ساسانییەکان بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە جووتیاران خۆیان وردە موڵکدار بوون و زەوییە بچووکەکانی خۆیان دەکێڵا.

هەندێ مێژوونووسان لەو بارەوە بە هەڵەداچوونە و وایانزانیوە ئەو کات لە ئێران جووتیاران ژێردەستە و کۆیلە بوونە، بۆ خاوەن زەوییەکان کاریان کردووە، بەڵام ئەوە هەڵەیە، وەك گوترا بەو شێوەیە جووتیاران لەسەر موڵکەکانیان کاریان کردووە، ئەوان خودان رەز و باخ و کێڵگەی خۆیان بوونە.

دوای لەنێو چوونی دەسەڵاتیی ساسانییەکان، گرینگی زۆر بە کشتووکاڵ نەدرا، بە هۆی ئەو گرینگی نەدانەش، بەنداوەکان وێران بوون و کەناڵەکان تێکچوون و جووتیاران زەوییەکانیان

له دەستچوو، واتە گەورە موڵکدارەکان بۆ ئەوەی بتوانن ئاودێری زەوییەکان بکەن، لە دەستیان دەردەهێنا و دەبوونە خودان زەوی جووتیارەکان، جووتیارەکانیش کە بێ زەوی مابوونەوە، ناچار بوون لە کێڵگەی موڵکدارەکاندا کاربکەن و ببنە کۆیلە.

هۆکارەکی دیکە برێتی بوو لە میرات، دوای ئەوەی جووتیارێك دەمرد، زەوییەکەی بەسەر منداڵەکانیدا دابەش دەبوو، واتە دەبووە کۆمەڵە پارچە زەوییەکی بچووك کە نەیاندەتوانی بەرهەمی پێویست بۆ خاوەنەکانیان دابین بکەن، ئەوانیش بە ناچاری زەوییەکەیان دەفرۆشت تا سەرمایەکیان هەبێت. موڵکدارە گەورەکانیش لە بۆسەدا بوون بۆ کڕینی زەوییەکانی ئەوان، بەڵام لە سەردەمی ساسانییەکان جووتیاران ڕێگەیان پێ نەدەدرا، جگە لە کاری چینەکەی خۆیان، بۆیان نەبوو کارێکی دیکە ئەنجام بدەن، بەم شێوەیە کوڕەکان دوای مردنی باوکیان بە ناچاری کاریان لەسەر زەوییە میراتییەکە بە هاوبەشی دەکرد و زەوییەکەیان لە دەست خۆیاندا دەهێشتەوە.

پێویستە بزانرێت کە ئێمە نامانەوێت بڵێین سیستەمی کۆمەڵایەتیی سەردەمی ساسانییەکان سیستەمبێکی ئەقڵانییە و کێماسیی نەبوو، چوونکە وەك باسمان کرد ئەوکات بە هۆی ئەو سیستەمە چینایەتییەوە سنوور بۆ هەمووان دانرابوو، کەس توانای سنوور بەزێنی نەبوو، تەنیا چینە تایبەتەکان بۆیان هەبوو خوێندەوار بن، بۆ ماوەی چوار سەدە هیچ کەسێك بۆی نەبوو فێری خوێدەواری ببێت، هەر بۆیە لە زانست و هونەر و ئەدەب بێبەش بوون. بە هۆی نەخوێندەوارییەوە هزرە پڕوپووچ و ناڕاستییەکان ببوونە باو، تەنانەت بیرۆکە چەوت و ناڕاستەکان وەك ئاینێکی لێ هات بوو، دەتوانرێت بگوترێت کە هیچ سەردەمێك وەك ئەوکات ئەفسانە و هزری پڕوپووچ باو نەبوو.

ناتوانین ئەوە ڕەت بکەینەوە کە چینە باڵادەستەکانی کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە سوودیان لە نەزانی و نەخوێندەواری خەڵکی وەردەگرت، بەڵام وێڕای ئەوەش کشتوکاڵ بە شێوەیەك بوو کە دوای مردنی خاوەن موڵك، مۆڵکەکەی دابەش دەبوو، لە ئاکامدا بە موڵکدارە گەورەکان دەفرۆشرا.

لە سەردەمی شاپووردا خودان زەوی لە ڕێگەی قەرزەوە لە ئاوی بەنداو و کەناڵەکانی ئاودێری سوودمەند دەبوو، لە قازانجی بەروبۆمەکەی پارەی قەرزی حکوومەتی دەدایەوە، بەڵام دوای ئەو سەردەمە ئەو سیستەمە نەما و جووتیار توانای دابینکردنی ئاوی بۆ زەویەکەی نەبوو، لە ئاکامدا زەوییەکەی دەفرۆشت، دوای سەدەی چوارەمی کۆچی بەپێی ئەو

بەڵگەنامانەی دەست کەوتوون، ژمارەی وردە موڵکدارەکان بەرەو سفر رۆیشتن، ئەمە وایکرد تەواوی زەوییەکان ببنە هی موڵکدارە گەورەکان.

لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا وەزیری ناسراو (ساحیب بن عیباد) ژمارەی موڵکەکانی گەیشتە حەوت هەزار گوند، تەنانەت لەنێوی گوندەکانیشی بێ ئاگا بوو.

ساحیب بن عیباد بۆ دەستخستنی ئەو حەوت هەزار گوندە خۆی هیچ زەوییەکی نەکێڵا، هەروەها خواجە نیزام ئەلمولکیش جووتیاری نەکرد بۆ دەستخستنی شەش هەزار گوند کە هەیبوو. نە ئەوان و نە ئەوانی دیکەیش کە بوونە خودان موڵك نەیانزانی ماندوو بوون چییە!، تەنیا چاوەڕوان بوون، هەر کەسێك دەمرد، زەوییەکانیان لە منداڵەکانیان دەکڕیەوە، هەندێ کەسیش تەنانەت پارەشیان بۆ زەوی نەدەدا، بگرە بە هێز و دەسەڵات داگیریان دەکرد، خاوەنە کۆنەکانیشیان بۆ ئەوەی لە برسان نەمرن، ناچار دەبوون وەك کۆیلە کار بکەن.

دوای هێرشی عارەبان بۆ سەر ئێران نەریتێك هاتەکایەوە کە شاعیر و وتاربێژانێکی زۆر باسیان لێوە کردووە و بە نەریتێکی مەردانە دەناسرا، بە شێوەیەك کە ئەگەر خودان سەرمایە یاخۆ خاوەن دەسەڵاتێك زەوی لە جووتیارێکی نەدار دەکڕیەوە، رێگەی بە ئەو نەدەدا کە بێکار بێت و لە زەوییەکەی خۆیدا دەی خستەوە بەر کارکردن، ئەو کارە بە پەروەردەکردنێکی جۆری هەژمار دەکرا و لەلایەن خەڵکەوە بە گەورەیی دەزانرا کە کەسێك کە زەوییەکەی لێ کڕیوەتەوە، ئەویش بە سوودی خودی جووتیارەکە بەکاری دەخاتەوە.

فرۆشتنی بەرهەمی جووتیاران لە سەردەمی ساسانییەکان بەو شێوەیە بوو کە لە وەرزی پێگەیشتنی سەوزە و میوەدا، هەموو رۆژێك بازاڕ هەبوو بۆ ساخکردنەوەی سەوزە و میوەکان، هەر رۆژێك بازاڕەکان لە شوێنێك دەبوون، بەڵام لە وەرزی نەبوونی میوە و سەوزە و ئەو بەرهەمانەی زوو لەنێودەچوون، بازاڕ بە شێوەی جیابوو، هەر دە رۆژ جارێك و لە شوێنێك دادەمەزرا، جووتیاران بەروبوومی خۆیان تێدا دەفرۆشت. لە سەرەدەمی ساسانییەکان هەفتە نەبوو، لەبری دەیە هەبوو، واتە دە رۆژ باو بوو.

لە شارەکان کەسانێك هەبوون کە بە (بووندار) کە (کورتکراوەی بنکەدار) ناسرا بوون، ئەوان ئەو کەسانە بوون کە دانەوێڵە و ئاژەڵی جووتیارانیان دەکڕی، ئەوان لە هەموو شارە گەورەکانی ئێران هەبوون.

لە پاپیرۆسەکانی میسری دێرین باس لە بوونی ئەو کەسانە لە شارەکانی مەمفیس و تبس کراوە کە بەرهەمەکانیان کڕیوەتەوە، دواتر بە گرانتر فرۆشتوویانە. لە بابلی کۆنیشدا ئەو

کەسانە هەبوون، بەرهەمی جووتیارانیان دەکڕیەوە کە لە ڕێگەی ڕووباری فورات یاخۆ وشکانییەوە دەهاتن بۆ شار، دواتر بە دانیشتووانی شارەکەیان دەفرۆشتەوە.

بوونی بوونداراەکان لە شارە کۆنەکان، بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە کە جووتیاران دەبووایە بەرهەمەکانیان بفرۆشن، لە لایەکی دیکەیش ئامرازەکانی هاتوچۆ زۆر هێواش بوونە.

مەڕدارەکانی قۆچان بۆ ئەوەی ڕۆنەکەیان بتوانن لە بازاڕی تووس بفرۆشن، ناچار بوون دە ڕۆژ ڕێگە ببڕن بۆ ئەوەی بگەنە شوێنی مەبەست، دە ڕۆژیش بۆ گەڕانەوەیان پێویست بوو، بۆیە بە ناچاری هەموو بەرهەمی ڕۆنی خۆیان کە لە (هیزە) واتە پێستەی بزن دەکران، بە یەك جێ بفرۆشن.

ئەوان نەیاندەتوانی هەموو جارێك تەنیا بۆ فرۆشتنی چەند مەنێك (مەن سێ کیلۆیە بە پێوەری ئێستە) بچن بۆ شار و تواناشیان نەبوو تەواوی ڕۆنەکەیان کە لە چەندین پێستە بوو، لە چەند ولاخێك بار دەکران بە دانیشتووانی شارەکان و بە خاوەن ماڵەکان بفرۆشێت، چوونکە بۆ ئەو کارەی پێویستی بە ماوەیەکی زۆر هەبوو، کە لەوانە بوو تا نێزیکەی کۆتایی ساڵی ویستبایە، بۆیە بە ناچاری لە جیاتی چاوی لە پارەی زۆرتر بێت کە مافی خۆی بوو، بەرهەمەکەی بە هەرزانتر و بە کۆمەڵ و بەیەك جێ دەفرۆشت بە بوونداراەکان، ئەوانیش دوای ئەوەی نرخەکەیان بەرزتر دەکردەوە بە دانیشتووانی شاریان دەفرۆشت و سوودیان لێ دەدیت.

ئەو پێویستییە لە تەواوی بەرهەمەکانی وەك دانەوێڵە و بەرهەمە ئاژەڵییەکانی وەك (کەرە، پەنیر، ڕۆن، کەشك، قەرە برووت، پێستە و خوری و..هتد) هەبوو.

کەوتە پێویستیی و پێداویستی وای دەکرد تا بوونداراەکان دروست بن، ئەوە چاو بڕین بۆ سەرمایە نەبوو کە ئەوانی دەهێنایە کایەوە، ئەوانیش ڕێ خۆشکەر بوون بۆ کڕینی بەرهەمی جووتیاران بە بەهای هەرزان و فرۆشتنیان بە بەهای گرانتر بە خەڵکی دانیشتووی شارەکان. بوونداراەکان لە سەردەمی ساسانییەکانیش هەبوون، ئەو دەمەش جووتیاران بەرهەمەکانیان هەر بە ئەوان دەفرۆشت.

# خولی دووەمی جەنگەکانی ئێران و ڕۆم

سەردەمێکی نویٚ لە ژیانی شاپووری دووەم کە بە خولی دووەمی جەنگەکانی ئێران و ڕۆم ناسراوە.

خولی یەکەمی جەنگەکانی ئێران و ڕۆم لە سەردەمی شاپووری یەکەم دەستی پێکرد، ئەو توانی سیٚ ئیمپراتۆری ڕۆم تێك بشکێنێت لەنێو مەیدانی جەنگدا، یەکیان لە جەنگی تاك بە تاك بکوژێت، یەکێکی دیکەشیان لە جەنگدا بە دەستەکانی خۆی دیل بکات.

جیاوازییەك هەیە لە نێوان ئەو دوو خولەی جەنگەکانی ڕۆم و ئێران، جەنگەکانی خولی یەکەم لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەتی ساسانی و ڕۆمی گەورە بوو کە پایتەختەکەی ڕۆم بوو، جەنگەکانی خولی دووەم لە سەردەمی شاپووری دووەمدا، لە نێوان ساسانییەکان و ڕۆمی بچووك بوو کە پایتەختەکەی قوستەنتینە یاخۆ ئیستەنبوڵی ئێستە بوو.

لە سەردەمی شاپووری دووەم بە دواوە پێوەندی و جەنگەکانی ئێران و ڕۆمی گەورە بە تەواوەتیی پچڕا، ساسانییەکان بوونە دراوسێی ڕۆمی بچووك، ئیدی جەنگەکانیش لە نێوان ئەو دووانە ڕووی دەدا، بەو پێیەی ڕۆمی بچووك خۆی بە میراتگری ڕۆمی گەورە دەناسی.

ئێستە (٥٢١) ساڵ بە سەر داگیرکردنی قوستەنتینە لەلایەن سوڵتان محەمەدی فاتیح تێپەڕ دەبێت، ئەو حکوومەتی ڕۆمی بچووکی ڕووخاند، (مەبەستی نووسەر لەکاتی نووسینی ئەم پەڕتووکەیە)، بەڵام تا ئێستە بەساڵاچووەکانی ڕۆژئاوای ئێران، دانیشتووانی ئاسیای بچووك کە دەکاتە تورکیای ئێستە بە ڕۆمی ناو دەبەن، چوونکە پێش شکست و کەوتنی قوستەنتینە بەردەوام ئیمپراتۆری ڕۆمیان بە دراوسێی خۆیان دەبینی.

ئەگەر بمانەوێت باسی چۆنییەتی هاتنی قوستەنتین بۆ ئاسیای بچووك و هۆکارەکانی دانانی ڕۆمی بچووك و هەڵبژاردنی قوستەنتینە بە پایتەخت بکەین، لە ئاکامدا ڕۆمی بچووك دامەزرا، چوونکە بۆ ئەو کارە ناچارین باس لە سەرلەبەری مێژووی کلێسای ئەرتۆدۆکسی (یەکەمین کلێسای کریستیانەکان) بکەین، ئەمەش بەدەرە لە مێژووی ئێران و نابێت ئێمە لە بابەتەکەمان دەربچین، تەنیا ئاماژە بۆ ئەو بابەتە دەکەین کە مێژوونووسان سەرەنجیان لیٚ

نەداوە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئێران نەبووایە بە پەناگەی کریستیانەکان، رۆمی بچووك چیٚ نەدەبوو.

برەوگرتنی کریستیانی بوون لە ئێران و وڵاتە بەردەستەکانی بە رێگەی هاتنی رێژەی زۆری کریستیانەکان بوون، نەوەك پەسەندکردنی ئەو ئاینە لەلایەن ئێرانیانەوە.

ئێرانییەکان کریستیانیان وەردەگرت، کریستیانەکان لە هەر شوێنێکی ئیمپراتۆری رۆمەوە کە بۆیان کرابایە، دەهاتن بۆ ئێران و وڵاتانی ژێردەستی ئێران، چوونکە تەنیا لەوێندەر هەستیان بە تەناهی و ئارامی و پارێزراوی دەکرد، هەر بۆیە ئاینی کریستیانی لە ئێران و وڵاتانی ژێردەستەی برەوی گرت. ئەوان بە تایبەتی دەهاتن بۆ ئەنتاکیە و شارەکانی دیکەی ئاسیای بچووك کە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان دانیشتووانەکانیان یۆنانی بوون.

ئەو رۆژەی قوستەنتین پایتەختی خۆی گواستەوە بۆ ئەو شارە، زۆرێك لە دانیشتووانی ئەویٚ کریستیان بوون و راستەوخۆ بوونە شوێنکەوتووی ئەو.

جیاوازییەکی دیکە هەبوو لە نێوان یەکەمین کۆمەڵە جەنگەکانی نێوان رۆم و ساسانییەکان، لەگەڵ دووەمین کۆمەڵە جەنگەکانی نێوانیاندا، لە یەکەمین جەنگەکانی ساسانییەکاندا ئەوان لەگەڵ خەڵکانێك دەجەنگان کە بیٚ باوەڕ بوون و هاوبەشیان بۆ خودا دادەنا، بەڵام لە دووەمین جەنگەکاندا ئەوان لەگەڵ خەڵکێك دەجەنگان کە باوەڕیان بە ئاینی کریستیانی هەبوو.

سەربازە لژیۆنەکانی رۆمی گەورە بە گشتیی خوداوەندە جۆراوجۆرەکانی رۆمیان دەپەرست، هەرچی سەربازەکانی رۆمی بچووك خوداوەندی مەزن و حەزرەتی عیسایان دەپەرست، بەڵام لژیۆنەکانی رۆمی بچووك کە چوون لەگەڵ شاپووری دووەمی پاشای ساسانی دەجەنگان، پێڕەوی هەمان سیستەمی لژیۆنەکانی رۆمی گەورە بوون، ژمارەی سەربازەکانیان هەر شەش هەزار کەس بوو کە بە سەر سیٚ یەکە بە ناوی (کۆهۆرت) یاخۆ پەل دابەش بوو، کە هەریەکەیان دوو هەزار کەس دەبوون، هەر (کۆهۆرتێك) دابەش دەبوو بە سەر دە (مانی پۆرت) کە هەر یەکەیان دەبوو بە دوو (سێنتۆری) کە لە سەد کەس پێك دەهات و سەرکردەی سێنتۆری ئەفسەرێك بوو بە ناوی (سێنتۆریەن) کە تورکەکان بە (یوز باشی) واتە گەورەی سەد کەس ناویان بردووە. ئەفسەری سێنتۆریەن بە ئەفسەری بنەڕەتی لژیۆن دەناسرا، هەموو سەربازەکان ئەویان باشتر لە لەگات دەناسی کە فەرماندەی تەواوی لژیۆنەکە بوو، بە هەمان

شێوە کە لە لەشکری ئەڵمان لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەت و دوای ئەویش سەربازە ئەڵمانییەکان، فەرماندەی دەستەکان (عریف)یان باشتر دەناسی لە فەرماندەی بەتالیۆنەکان.

فەرمانەکان لە ڕێگەی سێنتۆریەن دەگەیشتە سەربازانەوە، هەر ئەوانیش ڕاهێنانیان بە سەربازەکان دەکرد، لە یادداشتەکانی شاپووری یەکەمدا باس کرا کە ئەو سوودی لە سیستەمی ڕێکوپێکی لژیۆن لەنێو لەشکرەکەی وەرگرت و توانی بیکاتە لەشکرێکی تەکووزگەری.

لە نێوان لەگاتەکان واتە فەرماندەی لژیۆنەکان لە لەشکری ڕۆمی گەورە و لەگاتەکانی ڕۆمی بچووک جیاوازیی هەبوو.

لە ڕۆمی گەورە لەگاتەکان لە سیناتۆرەکانی ڕۆم (ئەندامانی ئەنجومەنی سینا) هەڵدەبژێردران، دوای ئەوەی ئیدارەی حکوومەت و لەشکر لە یەك جیابۆوە، لەگات لەنێو باشترین ئەفسەرەکان کە لە جەنگدا دەردەکەوتن هەڵدەبژێردران، ڕۆمیش هیچ ساڵێك نەبوو کە لە جەنگدا نەبێت.

بۆیە کاتێك ناوی لەگات دەهات، هەمووان باڵای پیاوێکی بەهێز و بە شکۆ و لێهاتوویان دەهاتە بەرچاو، ماوەیەکی زۆر ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم لە نێوان لەگاتەکان دیاری دەکران، یاخۆ ئەوان بۆ خۆیان کودەتایان بەسەر یەکدیدا دەکرد و دەگەیشتنە سەر تەختی ئیمپراتۆرییەت، بەڵام لە ڕۆمی بچووک لەگاتەکان خودان ئەو ناوبانگ و شکۆیەی ڕابردوو نەمانەوە و ڕابردووی بەهێزیان نەبوو، زۆرتر لەنێو ئەو کەسانە دیار دەکران کە لە ئیمپراتۆر نێزیك بوون و شارەزاییان لە وتاربێژی و میوانداری زۆرتر هەبوو تا لە هونەرەکانی جەنگ، وێڕای ئەوەش هەندێك لە ئەوان بوونە پیاوی ئازا و هەڵکەوتە و لە جەنگەکاندا بوونە مایەی سەختی زۆر بۆ شاپووری دووەم.

لە بەرانبەردا سێنتۆریەنەکان لە لژیۆنەکانی ڕۆمی بچووك خودان هەمان کاریگەریی بوون، لە پیاوانی بەهێزی جەنگی هەژمار دەکران، نەریتی ئەوان وا باوبوو کە لەگەڵ سەربازەکانیان بە شێوەی بەردەوام لە ڕێپێوانەکانا بە پیادە ڕێ بکەن و شەوانیش نەخەون تا لە مەترسی پەلاماری دوژمن بۆ سەر خێوەتگەکانیان پارێزراو بن، بە گشتی بایەخی لژیۆن زۆرتر بوو لە کاریگەریی سێنتۆریەنەکان کە وەك لژیۆنەکانی ڕۆم، بنەمای سەرەکیی ئەفسەرەکان بوون.

ڕۆمی بچووك لە سەرەتاوە خۆی بە میراتگری ڕۆمی گەورە دەزانی، بۆیە تەواوی ئەو خاکانەی بە هی خۆی زانی کە پێشتر لەبەر دەستی ڕۆمی گەورە بوون، دواتر لە سەردەمی

شاپووری دووەم کەوتنە بەردەستی ساسانییەکان و دەیانگوت دەبێت بگەڕێتەوە بۆ بەردەستی ڕۆمی بچووك. یەکێك لەو وڵاتانەی بە هۆی ڕووداوەکانەوە و پێش سەردەمی پاشایەتیی شاپووری دووەم کەوتە بەردەستی ڕۆم، وڵاتی (ئادیابێن) بوو لە میزۆپۆتامیا و ڕۆمی بچووك دوای ڕۆمی گەورە ئەو وڵاتەی داگیرکرد. ئادیابێن وڵاتێك بوو کە خاکێکی بە پیتی هەبوو، لە تیسفون نێزیك بوو، بۆیە لەوانە بوو لە کاتی هێرشی ڕۆمەکان بۆ تیسفون ئەگەر نەبێتە هۆی داگیرکردنی پایتەختیش بە دەستی ڕۆمەکان، ببێتە مایەی ئازار و سەختی زۆر.

شاپووری دووەم بڕیاریدا لە یەکەمین دەرفەتدا کە بۆی هەڵ بکەوێت، ئەو وڵاتە لە ڕۆمەکان وەربگرێتەوە، بەڵام تا ئەو کاتەی قوستەنتینی دامەزرێنەری شاری قوستەنتینە زیندوو بوو، نەیتوانی ئەو هەلەی دەست بکەوێت. قوستەنتین هەر ئەو کەسە بوو کە پایتەختی گواستەوە بۆ کەناری گەرووی بسفۆر و شاری ئیستەنبوڵای ئێستە، یەکێك لە کارەکانی ئەو دامەزراندنی بازاڕێکی سەرداخراو بوو، لە شێوەی بازاڕەکانی ڕۆژهەڵات، لەو شارە و شاری ئیستەنبوڵا تا ئەوکات بازاڕی لەو شێوەیەی نەبوو.

قوستەنتین پاشایەکی لێهاتوو بوو، شاپووری دووەم دەیزانی جەنگ لەگەڵ ئەودا کارێکی سەختە و بەهای گرانی دەوێت، بەڵام چوونکە ئەو نەخۆش بوو، شاپووری دووەم پێشبینیی مردنی قوستەنتینی دەکرد.

قوستەنتین نەخۆشییەکی بەهێزی لەگەڵدا بوو کە لە سەردەمانی کۆنەوە ناسرا بوو، بۆقراتی پزیشك ناوی بردووە و ناوی ئەو دەرمانانەشی نووسیوە کە چارەسەرن بۆ ئەو نەخۆشییە. ناوی نەخۆشییەکە (نەقرس) بوو، پزیشکەکان توانای چارەسەری ئەویان نەبوو تا ئەوکاتەی پزیشکێکی ئێرانی بە ناوی فوراهات پارسی (فەرهاد پارسی) چوو بۆ قوستەنتینە و نەخۆشیی ئەوی بیست و بە نێزیکەکانی ئەوی ڕاگەیاند کە دەتوانێت چارەسەری ئیمپراتۆر بکات.

پزیشکەکانی کۆشك وتیان چۆن دەتوانیت چارەسەری بکەیت و ناوی دەرمانەکەت چیی؟، بەڵام ئەو ناوی دەرمانەکەی پێ نەگوتن.

بە قوستەنتینیان گوت پزیشکێکی ئێرانی هاتووە کە توانای چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی تۆی هەیە، هەرچەندە پزیشکەکانی کۆشك حەزیان نەدەکرد فوراهاتی پارسی ئیمپراتۆر چارەسەر بکات، بەڵام چوونکە ئەو فەرمانی بە هێنانی پزیشکەکە کرد بوو،

هێنایان بۆ لای ئیمپراتۆر، ئەویش وتی بیستوومە کە بانگەشەت کردووە کە گوایە تۆ دەتوانی من چارەسەر بکەی؟.

پزیشکە ئێرانییەکە وتی: بەڵێ ئەی ئیمپراتۆر.

قوستەنتین وتی: کەواتە زانستی تۆ پترە لە هی ئەو پزیشکانەی نەیانتوانیوە تا ئەمڕۆ من چارەسەر بکەن.

فوراهات وتی: ئەی ئیمپراتۆر، زانستی من پتر نییە لە زانستی پزیشکەکانی ئێرە، بەڵام بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەت دەرمانێکم هەیە کە پزیشکەکانت بە بوونی نازانن و خواردنێکت بۆ پێشنیاز دەکەم کە ئەوان نەیانکردووە.

ئیمپراتۆر وتی: دەرمانەکەت چییە؟.

پزیشکەکە وتی: ناوی دەرمانەکەی من شەنبەلیدە.(١)

ئیمپراتۆر وتی: من تا ئێستە ئەو ناوەم نەبیستووە.

پزیشکەکە وتی: ئەی ئیمپراتۆر من ئەو دەرمانەتان بۆ دیار دەکەم و فەرمان بکەن تا ڕۆژانە سێ جاران بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە بۆتان بکوڵێنن و بیخۆنەوە، بۆ ئەوەی ئازارتان کە بە هۆی نقرسەوەیە لەنێو بچێت، بۆ ئەوەی هەوکردنەکەش نەگەڕێتەوە ئامۆژگاریتان دەکەم تا ژەمێك لە خواردنتان بکەن بە کاهوو، جگە لەوە هیچی دیکە نەخۆن.

ئیمپراتۆر بە سەرسووڕمانەوە وتی: ئایا ئەو کاهووە هیچە چارەسەری منە؟.

پزیشك وتی: دەرمانی ئیمپراتۆر لە شەنبەلیدە و کاهووش دەبێتە ڕێگر لە گەڕانەوەی سەرلەنوێی ئازار و هەوکردنی نەقرس، تۆ ئەگەر تەنیا یەك ژەم لە خواردنەکەت بکەی بە کاهوو، لە ئازار و دەردی ئەو نەخۆشییە بە دوور دەبی.

خزمەتکارەکانی کۆشك ئەو دەرمانەیان بۆ ئامادە کرد و دایان بە ئیمپراتۆر، ئەویش لە یەکەمین ڕۆژی خواردنیدا هەستی بە باشتربوون کرد و ئازارەکەی هاتە خوارێ، فوراهاتی پارسیش بە وەرگرتنی پاداشتەوە بەرەو ئێران گەڕایەوە، بەڵام نەخۆشی نەقرەس لە جەستەی ئیمپراتۆردا کۆن بوو، ئەو ماوەی سێ ساڵ بوو ئەو نەخۆشییەی هەبوو، زانراوە هۆکاری ئەو نەخۆشییە بریتییە لە ترشەلۆکی یۆرئیك، هەردوو گورچیلەکانی ئەوی نەخۆش کردبوو،

---

(١) ئێستە ناوی ئەو دەرمانە لە گیا دەرمانییەکان لە تاران و شارەکانی ئێران، ناوی قۆڵنجانە. "زەبیحوڵڵا"

کێشەی گەورەی بۆ گورچیلەکانی چێ کرد بوو، سەرەنجام ناوبراو لە هاوینی ساڵی (٣٣٧ ز) کۆچی دوایی کرد.

بە بیستنی هەواڵی مردنی قوستەنتین، شاپووری دووەم بڕیاریدا تا ڕۆمەکان لە ئادیابێن دەربکات، فەرمانی ئامادەکردنی لەشکریدا و ئەفسەرێك بە ناوی (مەردان شیرازی) کردە سەرکردەی لەشکرەکە، هەندێك کەس ئەو ناوەیان بە (مەردوم شیرازی) ناوبردووە، بە ڕای ئێمە مەردان راستترە.

پاشاکانی کۆنی ئێران هەر کاتێك ویستبایان هێرش بکەنە سەر دوژمن، ئاگەداریان دەکرد، بێ ئاگەدارکردنەوە هێرشیان نەدەکرد. ئاشکرایە پێش هێرش مەرجەکانیان دەخستەڕوو بۆ دوژمنی داهاتوویان بۆ ئەوەی ئەگەر بەرانبەر رازی بێت، جەنگ ڕوونەدات، بەو شێوەیەش دوژمن نەدەکەوتە جەنگی لە ناکاو.

شاپووری دووەم نامەیەکی بۆ قوستەنتینە نارد و وتی وڵاتی ئادیابێن پێشتر بەشێك بووە لە ئیمپراتۆرییەتەکەی من و رۆم داگیری کردووە، بۆ ئەوەی ماف بۆ خودان ماف بگەڕێتەوە و جەنگ ڕوونەدات، پێویستە سەربازەکانیان لە ئادیابێن بکشێننەوە و ئەو وڵاتە بدەنەوە دەست لەشکری ساسانی. ئەگەر بەم شێوەیە بکەن، پاشای ساسانی رێگر نابێت لە رۆیشتنی سەربازە رۆمیەکان و بردنی ئەو سامان و داراییەی کە لەو وڵاتە هەیانە. بە پێچەوانەشەوە پاشای ئێران بە ڕق و زاڵبوون ئەو وڵاتە داگیر دەکاتەوە، هەر سەربازێکیش بەرگری بکات، دەکوژرێت و ئەگەر بەرگریش نەکات دیل دەکرێت.

ڕۆمەکان کە خۆیان بە خودان ئەو وڵاتە دەزانی، وەڵامیان دایەوە کە ئەو وڵاتە نەتەنیا جێ ناهێڵن و رادەستی ساسانییەکانی ناکەنەوە، بگرە وڵاتی ئادیابێن هی ئەوانە و دانیشتووانی ئەو وڵاتەش نایانەوێت بێنە ژێردەستی ساسانییەکان و هەموویان لە حکوومەتی رۆم رازین.

نامە گۆڕینەوە لە نێوان شاپووری دووەم و حکوومەتی رۆم تا کۆتایی هاوینی ساڵی (٣٣٧ ز) درێژەی هەبوو، لە دوایین نامە کە رۆمەکان بۆ وەڵامی شاپوور ناردیان، هەڕەشەیان کردبوو کە بە ئاگری نەکوژاوە لێیان دەدەن، وەك زانراوە ئەو ئاگرە لە مێژوودا بە ئاگری یۆنانی ناسراوە لە تێکەڵەی چەند مادەیەکی وەك نەوت و فسفۆر چێ کراوە.

شاپووری دووەم لە هەڕەشەی رۆمەکان نەترسا و فەرمانی بە مەردان شیرازی کرد تا دەست بە هێرشەکەی خۆی بکات، ئەویش بە نێزیکەی هەشتا هەزار سەربازی سوارە و پیادە و

ژمارەیەك گالیسکەی جەنگی کە ژمارەکەی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا دیار نەکراوە، بەرەو ئادیابێن کەوتەڕێ.

لە جیهانی کۆن لەشکرێکی هەشتا هەزار کەسی بە لەشکرێکی بەهێز هەژمار دەکرا، بە روواڵەت بۆ داگیرکردنی وڵاتی ئادیابێن زۆر بوو، بەڵام ڕۆمەکان کە بەردەوام بیریان لە هێرش بۆ سەر تیسفون و داگیرکردنی ئەو شارە دەکردەوە، سەربازگەیەکی بەهێزیان لەو وڵاتە هەبوو، شاپووری دووەمیش کە ئەو بابەتەی دەزانی فەرمانی کرد بوو تا بەردەوام سەربازگەیەکی بەهێز لە تیسفون بکەنەوە و هەردەم لە ئامادەباشیدا بێت.

ئاشکرایە کە ڕاگەیاندنی شاپووری دووەم بۆ ڕۆمەکان بەو واتایە دەهات کە سەربازگەکەیان کە لەو وڵاتە بوو، لەوێندەر لابدەن، هەڵبەتە پێش دەسەڵاتیی شاپووری دووەم کەس بە کەس نەبوو، ڕۆمەکان هەندێ وڵاتی دیکەیشیان لە ساسانییەکان داگیرکردبوو، وەك بنەمایەك شاپوور کە دەیویست یەك بە دوای یەك ئەو وڵاتانە داگیر بکاتەوە و بیانگەڕێنێتەوە بۆ سنووری دەسەڵاتیی خۆی، دەبووایە داوایان لێ بکات بۆ کشانەوە و رادەستکردنەوەیان، بەڵام پاشای ساسانی لە کاتی نامە ناردنەکانی بۆ قوستەنتینە بە هیچ شێوەیەك ناوی ئەو شوێنانەی نەهێنا، لە سەرەتادا بە پێویستی دەزانی ڕۆمەکان لە پایتەختەکەی دووربخاتەوە و ئەو مەترسییە هەمیشەیەی ئەوان کە بەردەوام ڕووبەڕووی تیسفون بوو، وەك ئەجەل بوو بۆ ئەو شارە، لەوێندەر دووریان بخاتەوە.

هێرشی لەشکرەکەی مەردان شیرازی لە بەهاری ساڵی (٣٣٨ ز) دەستی پێکرد، ئەو جەنگە بە سەرەتای دووەمین خولی جەنگەکانی ڕۆم و ساسانییەکان دادەنرێت کە وەك زانراوە ماوەیەکی زۆر درێژی خایاند.

ناوچەی ئادیابێن دەکەوتە ڕۆژئاوای ڕووباری فوراتەوە، واتە کەنارەکانی لای راستی ڕووبارەکە و ئەو زێیە لە چەند شوێنێك بواری هەبوو کە ڕێبوارەکان و تەنانەت سوپایەکیش دەیتوانی لێی بپەڕێتەوە. بوارەکان هێندە پان بوون، تەنانەت لە کاتی زۆر بوون و سەرکێشی ئاوی فوراتیش ڕێبوارەکان و کاروانەکان توانای پەڕینەوەیان دەبوو، دانیشتووانی هەردوو لای زێیەکە، شارەزای هەموو بوارەکان بوون و دەبوونە ڕێ پێشاندەری ڕێبوار و کاروانەکان.

هەموو جەنگە گەورەکانی شاپووری یەکەم و ڕۆم لە کەنارەکانی فورات بوون، یەکەمین جەنگی شاپووری دووەمیش لەگەڵ سوپای ڕۆم هەر دەکەوێتە کەناری ئەو زێیە، کەنارەکانی فورات بە دوو هۆکار ببوونە گۆڕەپانی جەنگی شاپووری یەکەم و شاپووری دووەم لەگەڵ ڕۆمدا:

یەکەم: هەر لەشکرێکی رۆم کە ویستبای بەرەو پایتەختی ساسانییەکان بڕوات، دەبووایە بە کەنارەکانی فوراتدا تێپەڕ ببێت.

دووەم: پاشا ساسانییەکان رێگەیان نەدەدا تا لەشکرەکانی دوژمن بگەنە نێزیك کەنارەکانی دیجلە و لە کەناری فورات رێگەیان دەگرتن، چوونکە تیسفونی پایتەخت لە کەنارەکانی دیجلە بوو، ئەگەر دوژمن لە دیجلە نێزیك بکەوتایەوە، ئەو شارە دەکەوتە مەترسییەوە. ئەگەر تەنانەت لەشکری دوژمن لە فوراتیش پەڕیبایەوە نەیان دەهێشت لە نێوانی هەر دوو زێیەکە، زۆرتر بەرەو رۆژهەڵات بڕوات و لە دیجلە نێزیك ببێتەوە.

فەرماندەی ساسانی (مەردان شیرازی) هەموو لەشکرەکەی لە یەکێك لە بوارەکان پەڕاندەوە و لە رۆژئاوای فورات لە ناوچەی ئادیابێن بەرەو پێش رۆیشت. لە نۆزدەمین ڕۆژی مانگی دووەمی بەهاردا لە دوورەوە لەشکری رۆم دەرکەوتن، چوونکە رۆژ بەرەو کۆتایی دەچوو، بە پەسەندی زانی ئەو رۆژە نەجەنگێت و بیستەمین ڕۆژی مانگ بکاتە رۆژی جەنگ.

هەرچەندە لەشکری مەردان لە رۆژئاوای فورات بوون، بەڵام بە کەنارەکانی ئەو زێیەدا نەدەڕۆیشت و لێی دوور دەکەوتەوە. چوونکە فورات لەو ناوچەیە لە رۆژئاواوە دەهات و زانایانی بواری جوگرافیا دەزانن کە فورات بە درێژایی مێژوو چەندین جار دووچاری گۆڕانی ڕێڕەوەکەی بۆتەوە، تا ئێستەش کۆمەڵە پێچی گەورە لە ڕێڕەوەکەیدا هەیە، چوونکە مەردان شیرازی بە کەناری فوراتدا نەدەڕۆیشت، بۆیە کاتێك رۆژ کۆتایی هات و لەشکرەکەی دەبووایە خێوەتگەکەی دابمەزرێنێت، لەشکری ساسانی کەوتە نێوان زێی فورات و لەشکری رۆم.

رۆمەکانیش کە ناچار بوون ئاو ببەن، ئەو رۆژە و بیستەمین شەوی مانگ بۆ بەدەستهێنانی ئاو دووچاری زەحمەتی زۆر بوونە، هەموو جارێك دەبووایە لە مەودای دوورەوە بە دووری لەشکری ساسانیدا بسووڕێنەوە و بەرەو ئاوی فورات بڕۆن.

فەرماندەی رۆمەکان ئەفسەرێك بە ناوی (کێنتۆس درۆتۆس) بوو، کاتێك لە دوورەوە لەشکری ساسانی بینی، زانی کە لەو رۆژەدا دەرفەت بۆ جەنگ نابێت و فەرمانیدا ئەو ئاوەی لە سوپاکەیدا هەیانبوو بۆ چێکردنی دیوار بە دەورەی لەشکرەکەیدا بەکاربێنن.

ئەو دەیزانی ئەگەر لەو ئێوارەیە تا بەیانی نەتوانێت ئاو لە زێیەکە دەستەبەر بکات، بۆ رۆژی دواتر تینویەتیی بۆ سەربازەکان و ئەسپەکانی دەبێتە گەورەترین مەترسی، چوونکە ئەو تەواوی ئەو ئاوەی هەیانبوو، بۆ دروست کردنی قوڕ بەکاری هێنابوو بۆ دیوارەکەی دەورەیان. چوونکە درۆتۆس دەیزانی سەرباز و ئەسپەکانی ئەگەر ئەو شەوە ئاو نەخۆنەوە لە تینوویەتیی

نامرن، بەڵام دەیزانی ئەگەر دیوارێك بە دەورەی خۆیاندا نەکەن و لەشکری ساسانی پەلاماریان بدات، لەوانەیە لەشکرەکەی لەنێو بچێت. شێوازی کاری ئەو بۆ چێکردنی دیوار بە دەورەی لەشکرەکەیدا هەمان شێوازی کاری لژێۆنەکانی رۆم بوو، ئەو دیوارەی لەشکری رۆم لە دەورەی خۆی بینای کرد زۆر بەرز نەبوو، بەڵام بە شێوەیەکی کاریگەر پێشی بە گالیسکە و ئەسپەکان دەگرت، لەوانەیە ئەگەر ئەو دیوارە نەبووایە، لەشکری مەردان ئەو شەوە هێرشی کردبایە، بەڵام مەردان دەیزانی بەربەستێك لەبەردەم ئەسپ و گالیسکەکانی هەیە، بۆیە لە بیرۆکەی هاوچەشن کشایەوە و لەگەڵ بەرەبەیانی بیستەمین ڕۆژی مانگی دووەمی بەهاردا، کەڕەنای جەنگ لەلایەنی ساسانییانەوە لێدرا.

دوای ئەوە دەنگی کەڕەنای جەنگی لەشکری ساسانییەکان هات، دەنگی کەڕەنای لەشکری رۆمیش هات، دواتر مەردان شیرازی بینی دوو سواری رۆمی بە ئاڵای سپییەوە لە لەشکرەکەیان جیابوونەوە و بەرەو لەشکری ئەو هاتن.

سەربازە ساسانییەکان سەرگەرمی کۆکردنەوەی خێوەتگەکەیان بوون تا بۆ جەنگ ئامادە بن و لەو شوێنانە جێگیر بن کە بە فەرمانی مەردان و لەلایەن ئەفسەرەکانیان بۆیان دیار کرا بوو. مەردان بڕیاریدا بوو مەیدانی جەنگ لە باکور بەرەو باشوور بێت، لای راستی لەشکرەکەی دەکەوتنە باکور و لای چەپ لە باشوور و هێزی یەدەگیش لە نێوان دڵی لەشکر (ناوەند) و ڕووباری فورات بێت.

چوونکە ئاڵای سپی هێمای ئاشتی بوو، ئەو دوو سوارەی دەهاتن مایەی مەترسی نەبوون بۆ سەر لەشکرەکەی، مەردان رێگەی پێدان تا نێزیك ببنەوە، بەڵام نەیهێشت بگەنە لەشکرەکەی تا ئاگەداری ژمارەی هێزەکەی نەبن، سوارەکان وەستان یەکیان ئەو نامەیەی دەرهێنا و پێشانی ئەوانیدا و وتی ئەمە نامەی کونتۆس درۆتۆس فەرماندەی لەشکری رۆمە بۆ فەرماندەی لەشکری ئێوە نووسراوە، ئێمە لێرە دەوەستین تا فەرماندەی سوپاکەتان وەڵامی نامەکەمان بداتەوە و بۆ سەرکردەی خۆمانی دەگەڕێنینەوە.

نامەکە بە زمانی رۆمی واتە لاتینی بوو، نەك بە یۆنانی[٢].

---

(٢) پێویست بە باسکردنە کە لە دوای سەدەی چوارەمی زاین و لە سەرەتای سەدەی پێنجەمدا لە رۆمی بچووك زمانی فەرمی رۆم گۆڕا و کرا بە یۆنانی، هەموو نووسینە فەرمییەکان بە یۆنانی دەنووسران، تەنانەت لەو وڵاتە نەتەنها هەمووان، بگرە ئیمپراتۆرەکانیش بە یۆنانی دەدوان و زمانی لاتینی واتە رۆمی بە تەواوەتی

لە سوپای ئێران هەندێ ئەفسەر هەبوون کە توانای خوێندنەوەی زمانی رۆمیان هەبوو، ئەفسەرەکان لەو چینانە بوون کە بۆیان هەبوو لەو قوتابخانانە بخوێنن کە زمانی رۆمیان تێدا دەوترایەوە. درۆتۆس لە نامەکەیدا بۆ فەرماندەی ساسانی نووسی بوو: (من نازانم پاڵنەر بۆ هاتنی تۆ بۆ ئێرە چییە؟، چوونکە ئاشتی لە نێوان رۆم و ساسانیدا هەیە و لەلایەنی رۆمەوە هیچ کارێك بە پێچەوانەی ئاشتی رووی نەداوە تا پاشای ساسانی لەشکر بنێرێتە ئێرە. بۆ ئەوەی ئاشتی نێوان رۆم و ئێران تێك نەچێت، بە لەشکرەکەتەوە بگەڕێوە).

مەردان شیرازی فەرمانی کرد تا ناوەرۆکی نامەکە بەم شێوەیە بنووسن: (ئەگەر رۆم ویستی ئەوەیە کە ئاشتی لە نێوانمان بەردەوام بێت، بۆچی لەشکرەکەی لێرە جێگیر کردووە، ئاخۆ دامەزراندنی لەشکر لەم شوێنە، هیچ هۆکارێکی دیکەی جگە لە هێرشکردن بۆ تیسفون هەیە؟، من دڵنیات دەکەمەوە ئەگەر لەشکری رۆم لە ئادیابێن بڕوات، منیش دەگەڕێمەوە، ئەگەر لەشکرەکەتان بمێنێتەوە، بە فەرمانی پاشای ساسانی جەنگەکە دەست پێدەکەم، ئەگەر دەخوازیت پێم بڵێی بۆ کشانەوە پێویستت بە وەرگرتنی رەزامەندی پاشای رۆم هەیە، من ئەو بیانۆیە وەرناگرم و دەزانم بۆ کات بە سەر بردنە، چوونکە تۆ فەرماندەی لەشکرێکی و کاتێك بووی بە فەرماندە، دەسەڵاتت پێدراوە بەپێی بەرژەوەندیی بڕیار بدەی).

مەردان شیرازی بۆ گەڕاندنەوەی وەڵامی نامەکە، تەنیا دەمژمێرێکی دیار کرد بوو، زانراوە کە کات بە کاتژمێری لم دەپێورا، لە راستیدا ناوی لم خرا بووە سەر دەمژمێرەکان، لە راستیدا لمی تێدا نەبوو، هاڕاوی توێکڵی هێلکەی دەکرایە نێو، کاتێك بە تەواوەتیی هەڵدەڕژایە خوارێ، دەمژمێرەکە سەراوبن دەکرایەوە.

ئەو دوو سوارەی نامەی فەرماندەی لەشکری رۆمیان بۆ مەردان شیرازی هێنابوو، وەڵامی مەردانیان وەرگرتەوە و گەڕانەوە.

---

بەلاوە نرا. کاتێك قوستەنتین هات و ئیستانبوڵی کردە پایتەخت، تەواوی دانیشتوانی ئەو شوێنە و دەوروبەری بە یۆنانی قسەیان دەکرد، تەنیا قوستەنتین و نێزیك سەربازەکانی و ئەوانەی لە رۆمەوە هاتبوون، بە رۆمی دەدوان و بەو زمانەیان دەنووسی. لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی زاینی کە جەنگەکانی رۆمی بچووك و شاپووری دووەم روویاندا، هێشتا زمانی فەرمی بۆ قسەکردن و نووسین لە ئیمپراتۆریەتی رۆمی بچووك، زمانی رۆمی بوو. "زەبیحوڵڵا"

مەردان بێ هیوا بوو کە فەرماندەی رۆم داواکەی پەسەند بکات، بۆیە فەرمانیدا تا ریزەکانی لەشکرەکەی رێك بخرێت. بە فەرمانی ئەو گالیسکە جەنگییەکان لە لای راست و سوارکارەکان لە لای چەپ دامەزران، پیادەکانیش بە تەنیا کەتنە ناوەڕاستی لەشکر. هێزێکی یەدەگ لە سوارە و پیادەش لە پشتی مەیدانی جەنگ دانرا تا لە کاتی پێویست یارمەتی ئەو شوێنە بدەن کە پێویست بکات.

مەردان شیرازی پێی وابوو کە فەرماندەی رۆم تەنیا بۆ دەستەبەرکردنی کات، بابەتی مۆڵەت وەرگرتن لە پاشای رۆم دێنێتە پێشێ، لە پێشدا رێگەی بیانوو هێنانەوەی لە سەرکردەی رۆمەکان گرت بوو و چاوەڕوانی کۆتا هاتنی دەمژمێرەکە بوو، ماوەکە تەواو بوو، هیچ پەیکێك لە لەشکری دوژمن دانەبڕا، بۆیە خۆی بۆ جەنگ ئامادە کرد.

درۆتۆس پێنج لژیۆنی هەشت هەزار کەسی واتە چل هەزار سەربازی هەبوو(٣) کە لە هەر یەکێك لە لژیۆنەکان دوو هەزار سەرباز تیر و کەوانیان هەبوو، ئەوانەی کەوانی کانزاییان هەبوو، تیری سەر باریکیان دەهاویشت کە سەرەکانیان ئاسن بوون.

هەر لژیۆنێك بەپێی ژمارەی مەنجەنیقەکانیان، مەنجەنیق هاوێژیان هەبوو، لای ئەوانیش وەك رۆمی گەورە مەنجەنیق چەکی کاریگەریی بوو. لە هەر لژیۆنێك هەزار و پێنج سەد سەرباز سوارە بوون، تەور و گورز و شمشیریان پێ بوو. چەکی سەرەکیی پیادە رۆمەکان وەك لژیۆنەکانی رۆمی گەورە (پی کا) بوو کە نێزەیەکی درێژ و ئەستوور و قورس بوو، ئەوان لە بەکاربردنیدا زۆر شارەزا بوون.

ریزی لەشکری رۆمیش وەك هی ساسانییەکان لە دوو لای راست و چەپ و ناوەند و یەدەگ پێکهاتبوو، ئەوانیش بە درێژایی باکور بۆ باشوور دامەزرابوون.

هاوکات لەگەڵ جووڵەی لەشکری ئێران، مەنجەنیقچییەکان و تیرهاوێژەکانی رۆمی کەوتنە ئامادە باشی بۆ رێگرتن لە گەیشتنی لەشکری ساسانی و بارانێك لە تیر و بەرد بەسەر گالیسکە و سوار و پیادەکانی ساسانیدا باری.

---

(٣) لە سەرەتای دروست بوونیانەوە لژیۆنەکان تەنیا شەش هەزار کەس بوونە، گومان دەکرێت تەنیا بۆ پتر دەرخستنی ژمارەی لەشکری رۆم، لژیۆنەکان بە هەشت هەزار کەس دیار کراوە تا ئەو نابەرانبەریە زۆرەی لە نێوان دوو لەشکرەکە هەیە، کەم بکرێتەوە، "وەرگێڕی کوردی"

مەردان شیرازی تێگەیشت کە لە هەردوو لای راست و چەپدا، گالیسکە و سوارەکانی دووچاری زەحمەت و ناخۆشی بوون و زیانیان پێ گەیشتووە، وێڕای ئەوەش بەردەوام بوو لە هێرش بردن.

لەو رۆژەی جەنگ و هێرش هاتەکایەوە، رێساکانی بەرگری زانران و بنەمای بۆ دانرا و زانرا کە لەشکر پێویستە چ بکات، لە جەنگدا و لە کاتی هێرشکردن بنەمایەکی گرینگ دەرکەوت و زانرا بۆ بەدەست هێنانی ئامانج، پێویستە گیان بەخشین هەبێت. کاتی بەرگری ئەوەی لە پشت قەڵایەك دانیشتووە یاخۆ لەسەر گردێك دامەزراوە و بەرگری دەکات، لەوانەیە بتوانێت بە بێ گیانبەخشین ئاکامی سەرکەوتن وەربگرێت، بەڵام لە کاتی هێرشکردندا بە پارێزگاریکردن لە گیان، کەس ناتوانێت سەرکەوتن بەدی بێنێت.

فیداکاری تەواو لە کاتی هێرش بردندا لە سەردەمانی جەنگەکانی ئێراندا، هەر کاتێك لەشکرەکە فەرماندەیەکی لێهاتووی هەبوو بێت، نەتەنیا بنەمایەکی خاوەن رێز، بگرە پیرۆز بووە. سەبارەت بە فەرماندەی لێهاتووش ئەو بابەتە هەیە، ئەگەر فەرماندە لێهاتوو نەبێت لە بەرانبەر دوژمنێکی بەهێز ناتوانێت سەرکەوتوو بێت، هەموو سەرکەوتنێکیش بە ناوی فەرماندەکە تۆمار دەکرێت، هەر بە هەمان پێوەریش شکست بە ناوی فەرماندەکە تۆمار دەکرێت.

دوای سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر ئەڵمان و هاوپەیمانەکانی لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا، مارشاڵ فۆشی فەرەنسی کە سەرکردەی هێزی هاوپەیمانەکان بوو بە سەرکەوتوو زانرا، هەندێ لە ژەنەراڵە بەریتانی و ئەمەریکاییەکان وتیان ئەو سەرکەوتنە بە تەنیا هی مارشاڵ نییە، ئێمەش تیایدا بەشدارین. مارشاڵ وتی: (بەڵام ئەگەر شکستمان خواردبایە، ئەوکات تەنیا یەك کەس بەرپرس دەبوو، ئەویش من بووم.)

بەڵێ لە تەواوی جەنگەکاندا کە سوپاکانی ئێرانی فەرماندەی لێهاتوویان هەبوو بێت، لە کاتی هێرشدا ئەو بنەمایە رەچاو کراوە کە پێویستە فیداکاری بە تەواوەتی بێت، هەر سەربازێك بەشداری هێرش دەبوو، لەوانەبوو بکوژرێت و بیری نەدەکردەوە کە خۆی رزگاری ببێت و هاوسەنگەرەکانی بمرن.

لە بیستەمین رۆژی مانگی دووەمی بەهار و لە کاتی ئەو هێرشە، هاوکات لەگەڵ باراندنی تیر و بەرد بۆ سەر سەربازە ئێرانییەکان، ئەو بنەمایە بەرقەرار بوو کە هەمووان دەبێت خۆیان فیدا بکەن لە پێناو سەرکەوتن.

چوونکە گالیسکە جەنگییەکان لە لای ڕاست و سوارەکان لە لای چەپی ساسانییەکان بوون، ئەوەی جەنگەکە دەخوێنێتەوە، لەوانەیە بیربکاتەوە کە ئەوان زووتر لە پیادەکان دەگەنە لەشکری ڕۆم، لە کاتێکدا پیادەکانی ساسانی کە لە دڵی سوپادا بوون زووتر گەیشتنە ڕۆمەکان، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە تا ڕادەیەك بێ زیانتر بوون لە باراندنی بەرد و تیرەکان، لە کاتێکدا گالیسکە و سوارەکان زۆریان زیان بەرکەوت و کوژراویان زۆر بوو.

پیادە ئێرانییەکان وەك هەموو چینە سەربازەکانی دیکەی لەشکری ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان، سەربازی بەردەوام و شارەزا بوون، لە تەمەنێکی دیارکراوی تەمەنیاندا خانەنشین دەبوون و دەبوونە جووتیار و لە زەوییەکانی خۆیاندا کشتووکاڵیان دەکرد. ئەم بابەتە یەکێك بوو لەو بابەتانەی جیاکاری بۆ کرابوو لە سیستەمی چینایەتی لە ئێراندا، تەنیا بۆ سەربازەکان ڕێگە پێدراو بوو کە لە دوای خانەنشین بوونیان دەیانتوانی کاری چینایەتی خۆیان بگۆڕن.

بۆ ئەوەی دوای تەواوکردنی سەربازی و لە تەمەنی خانەنشینیدا، سەربازەکان بتوانن ببنە خودان زەوی، شێوە سەندووقێك چێ کرابوو کە مانگانە بەشێك لە مووچەکەیانی لەنێو دادەنرا، هەندێك پارەش لەلایەن پاشاوە دەدرا بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا بە کڕینی زەوی بدرێت، سەربازەکان لە دوای خانەنشین بوونیان دەبوونە جووتیار، بەڵام کوڕەکانیان لە تەمەنی لاویدا دەبوونە سەرباز.

پلە و پایەی سەرباز و ئەفسەرەکان لە سەردەمی ساسانییەکان وەك پلە و پایەی سەرباز و ئەفسەرەکانی لژیۆنەکانی ڕۆم بوو.

بەرگی ئەوان بە پێچەوانەی بیری هەندێ کەس، کورت و وەك جلوبەرگی سەربازە ڕۆمەکان تا سەر ئەژنۆیان دەهات، بە نیوە پۆش دادەنرا، لە لبادی درێژ نەبوو، شەڵوارێکی تۆزێك بەرینیان هەبوو، کە لەبەرکردنی ئاسانتر بوو،چوونکە لەسەر گۆزینگی لاق دەبەسترا.

کڵاوەکانیان لە کاتی ئاسایی لە لبادی پان بوو، کە بە چوار دەورەیدا بڵاو دەبۆوە و بە ئاسانی دەتوانرا لێوارەکانی کۆ بکرێتەوە. ئەوان لە جەنگ نێوپۆشیان لەبەر بوو، کە وەك نێوپۆشەکانی سەربازە ڕۆمەکان بە پارچە پێکەوە بەستراوە تەختەکانی قەڵا داپۆشرا بوون تا بەری زەبری شمشێر و تەور بگرێت.

چەکی سەرەکیی سەربازی پیادەی ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا شمشێر بوو، بەڵام ئەو چەکە ڕێگر نەبوو لەوەی کە سەربازەکان تەور یاخۆ تیر و کەوان یان نێزە لەگەڵ خۆیاندا هەڵ

بگرن، بەڵام وێڕای شمشێر کاتێك سەرباز قەڵغانیشی بە دەستەوە بێت، هەردوو دەستی بۆ ئەوان پێویست بێت، هەڵگرتنی چەند جۆرێك لە چەکی سەربازی پیادەی ماندوو دەکرد، بۆیە ئەوان جگە لە شمشێر تەنیا یەك چەکی دیکەیان هەڵ دەگرت، بۆ ئەم مەبەستەش مۆڵەتیان لە ئەفسەری بەرپرسی خۆیان وەردەگرت.

لە کاتی جەنگدا سەرباز کۆڵەپشتی خۆی هەڵدەگرت، ئەو کۆڵەپشتەی لە پشتی مەیدانی جەنگ و لە بەشی بار و خۆراکدا جێ دەهێشت، تەنیا قومقومەی ئاوی لەگەڵ خۆی دەبرد تا لە کاتێکدا کە تینووی ببێت ئاو بخواتەوە، لە سەردەمی ساسانییەکاندا قومقومەکانیان بە وردبینی و جوانی لە گڵی رەست چێ دەکرد و لە لبادیان دەگرت تا ئەگەر زەربەی بەرکەوت، نەشکێت.[٤]

زانیاریمان نییە کە ئایا سەربازە ساسانییەکان کاسکێتیان لەسەر بووە یاخۆ نا؟ چوونکە لە هیچ یەکێك لە سەرچاوەکانی بەردەستمان، تەنانەت سەرچاوە ئەرمەنییەکانیش زانیاریی لەو بارەوە نەبوو، بەڵام لە رابردوو سەربازە بە ئەزموونەکان حەزیان نەدەکرد کاسکێت و بازووبەند و ساق بەند و جەوشەن و...هتد ببەستن و بە بێ ئەوان جۆڵەیان ئاسانتر و چۆستتر دەبوون. بۆیە ئەفسەرەکان ئەوانیان ئازاد دەکرد لە ئاسن پۆش یاخۆ نەبوونیان، تەنیا لەکاتی رێورەسمەکان پێویست بووە کە کاسکێت لەسەر بکەن یاخۆ ببنە ئاسن پۆش.

هەردوو لا بە سەختی سەرگەرمی جەنگ بوون و دەرفەتیان نەبوو چاو لە ئاسمان بکەن، ئەگەر چاویان لە باکوری رۆژئاوا کردبایە دەیان بینی کە لای باکوری رۆژئاوا ئاسمان بە رەنگی سپی نێزیك زەردی لێ هات بوو. ئەو ناوچە سپیە نێزیك زەردە لە سەرەتادا تەنیا وەك خاڵێك

---

(٤) ئەو جۆرە قومقومانە لە لەشکری نەتەوە جیاکانی ئێراندا بەردەوام بینراوە، تەنانەت تا ناوەڕاستی سەدەی نوزدەیەمیش لە شاری برۆجەرد چێ دەکران، بەڵام دوای ئەوەی قومقومە لە ئەوروپاوە هات و برەوی سەند، ئەو قومقومە گڵینانە بە تەواوەتی دروست کردنیان وەستا. بە شێوەیەك کە لە برۆجەرد کە ناوەند یاخۆ یەکێك لە ناوەندەکانی چێکردنی ئەو قومقومانە بوو، ئێستە لەوانەیە کەس نەزانێت دروستیان بکات. هەر لە شاری برۆجەرد تا سەدەی رابردووش هەندێ جۆری گۆزەیان چێ دەکرد کە لێوارەکانیان زۆر باریك بوون، ئەگەر لەبەر با داندرا بووانە، ئاوی ناویان دە تا دوازدە پلەی سەدی فێنك دەبۆوە. کونت دۆ گۆبینیۆ وەزیری رێ پێدراوی فەرەنسا لە ئێران، بە وتەی خۆی لە کاتی مانەوەی لە ئێران سوودی لەو گۆزانە بینیوە. ئەو نووسەری پەرتووکی بەناوبانگی (سێ ساڵ لە ئاسیا) بوو، کە لە ڕاستیدا دەبوایە ناوی (سێ ساڵ لە ئێران) بووایە، چونکە نێزیکەی نۆ سەد لاپەرە لە هەزار لاپەرەی پەڕتووکە دوو بەرگییەکەی لە بارەی ئێرانە. "زەبیحوڵڵا"

بوو، تا پتر سەردەکەوت، بە هەمان ڕێژەش پانتاییەکی زۆرتری داگیر دەکرد، بەو خێراییەی کە گەورە دەبوو، بە هەمان خێراییش بەرەو ئاسمانی شەڕگە دەهات، سەرئەنجام یەکەمین هەورە بروسکە هات، دواتر دەنگی بروسکەکە گەیشت و هێندە دەنگەکە بەهێز بوو کە ئەسپی گالیسکە جەنگییەکان ترسان، بەڵام چوونکە ئەسپەکان بە باشی پەروەردە کرابوون، لێخوڕەکانیان توانیان ڕایان بگرنەوە و هەڵ نەهاتن.

کاتێك یەکەمین دەنگی بروسکە هات گالیسکەکانی ساسانی کە لە لای ڕاستی مەیدانی جەنگ بوون، توانی بوویان بگەنە لای چەپ و ڕاستی لژیۆنەکانی دوژمن و چیدی بەرد لە مەنجەنیقەکان نەدەباری و پیادە و سوارەکانی ساسانی توانی بوویان ئەوان بگرنە بەردەستی خۆیان، تەنانەت تیری تیر هاوێژانیش وەك پێشوو تەوژمی نەبوو.

لە نێوەندی سوپاش شمشێری ڕاست و دوو لێوی سەربازە پیادەکانی ساسانی دژی سەربازانی ڕۆم کەوت بووە کار و نێزە قورس و کورتەکانیان کە سەرە پەیکانێکی تیژی هەبوو، ببوو بە چەکێکی کاریگەر، ئەگەر بەر سەربازی دوژمن کەوتبایە دەیدڕی، هەندێك جار لە پشتیانەوە دەردەچوو، سەربازی بەرکەوتوو چەندی بەهێز بووایە توانای نەدەما و دەکەوتە سەر زەوی.

هەندێ لە پیادە ئێرانییەکان زەربەی ڕۆمەکانیان بەردەکەوت و دەکەوتن، بەڵام هاواریان نەدەکرد و نەیان دەناڵاند بۆ ئەوەی بیانبەن بۆ پشتی شەڕگەکەوە.

لە سەردەمانی کۆنەوە سەرکردە و ئەفسەرەکان ڕاهاتبوون کە لێدانی زەربە لە دوژمن نیشانەی پیاوەتی نییە، ئەگەر شمشێر بدرێتە دەست منداڵێکی دە ساڵانیش، توانای زەبر وەشاندنی دەبێت، پیاوەتی ئەوەیە کە وێڕای زەبروەشاندن، توانای زەبر وەرگرتن یاخۆ پێکانیشت هەبێت، کاتێك تیر یاخۆ شمشێرێکت بەردەکەوێت، هاوار نەکەی و بە هاوار کردنەکەت دوژمن ئاگەدار نەکەی کە پێکراوی و وەرەی خۆت دابەزێنی و وەرەی دوژمن بەرز بکەیەوە. وەرەی دوژمن بەپێی وەرەی خەنیمەکەی لە هەڵکشان و داکشان دەبێت، ئەگەر وەرەت بەرز بێت، وەرەی دوژمن دادەبەزێت، هەموو سەربازە ئێرانییەکان ئەوەیان دەزانی، بۆیە دەیانزانی پیاوەتی لە مەیدانی جەنگ ئەوەیە کە کاتی پێکران بە تیر و شمشێر، خۆڕاگر بێت و هاوار نەکات و دوژمن ئاگەدار نەکاتەوە.

هەندێ لە سەربازە ساسانییەکان ماوەیەك بەر لەوەی دەست بکەن بە جەنگ هەندێ کەتیرەیان لە ددانەکانیان دەدا تا پێکەوە بنووسێن، ئەگەر کەتیرەیان دەست نەکەوتبایە،

سوودیان لە شلەی داری هەڵوژە وەردەگرت، چونکە لەو شیلەیە کەتیرە بەهێزتر بوو، ئەوان دوای ئەو کارەیان ئەگەر پێکرابووانە، تەنانەت ئەگەر ویستبایان هاوار بکەن، نەیاندەتوانی و ددانەکانیان پێکەوە دەنووسا، کاتێك نێزە قورس و کورتەکانی سەربازە رۆمەکانیان بەردەکەوت، بێ ئەوەی بکارن هاوار بکەن، دەکەوتنە سەر زەوی. ئەو سەربازە بریندارانەی لە نێوەندی شەڕگە دەکەوتن، نەدەکەوتنە بەرپێی چوارپێ و تایەی گالیسکەکان، یەکسەر دەگوازرانەوە بۆ پشت شەڕگە جا رۆمی بووانە یان ساسانی، چوونکە گالیسکە و ئەسپ لە نێوەندی شەڕگە نەبوو.

دوای بروسکەی یەکەم، بروسکەی دووەم و دواتر سێیەم و چوارەمیش بەدوای یەکدا هاتن، بەڵام دوو سوپاکە بێ گوێدان بە دۆخی کەشوهەوا لە شەڕکردن بەردەوام بوون و پێداگری بۆ درێژەدان بە شەڕکردن لەلایەن ساسانییەکانەوە زۆرتر بوو تا لەلایەنی رۆمەکان، چوونکە مەردان دەیبینی گالیسکە و سوارەکانی لە هەردوو لای مەیدانی جەنگ بە ئارامی بەرەو پێشڤە دەچن و نەیدەویست ئەو بەرەو پێشڤە چوونە ڕابگرێت، ئەو وایدەزانی ئەوە ڕێژنە بارانێکی ئاسایيە و لە ماوەیەکی کەمدا دەوەستێت، لە لایەکی دیکە گەرمای خۆرەتاوەکە دادەبەزێنێت، زەوی تەڕ دەکات و تۆز ناهێڵێت، ئەوەش بۆ پتر پێشڕەویکردنی لەشکرەکەی بە سوود دەبێت.

لەپڕ ڕێژنە بارانێکی بەهێز هات و هەردوو فەرماندەی ساسانی و رۆمی بیریان دەکردەوە کە ماوەیەکی کەم دەخایەنێت و تەواو دەبێت، بەڵام تا دەهات بارانەکە بەخوڕتر دەبوو، هەرچەندە زەوی وشك و تینوو بوو، بەڵام چوونکە بارانەکە زۆر بوو توانای هەڵمژینی نەبوو، تا دەهات ئاو لە زەوی پتر دەبوو، گۆمیلکەی چێ دەکرد، سەرەنجام کار گەیشتە ئەوەی سمی ئەسپەکان لە قوڕدا دەچەقین و تایەی گالیسکەکان گیر دەبوون، تەنانەت هێرشی پیادەکانیش وەك پێشوو توانایان نەما و خەریك بوو بڕستیان لێ دەبڕا.

ئەو دەڤەرەی شەڕەکە لێ هەڵگیرسا بوو، لەو دەڤەرەیلە بوو کە ناوبانگی بە بارانە توند و بەهێزەکان هەبوو، هەردەم لە بەهار و پایزاندا ئەو بارانانە دەبارین.

ئێستەش هەندێ کات لەو دەڤەرە بارانی توند و بەخوڕ دەبارێت، هەندێ کەس دەڵێن تۆفانی نووح لەوێندەر ڕوویداوە، هەندێ کەسی دیکەش دەبێژن لە سەردەمی نووح ئەو دەڤەرە نقوومی ئاو بووە و تۆفانی نووح بەو کاتە دەوترێت کە بە هەندێ وتە باران ماوەی بیست ملیۆن ساڵ و بە وتەیەکی دیکە سەد ملیۆن ساڵی خایاندووە. لەو سەردەمە درێژەدا بەردەوام

باران دەباری، لە ئاکامیشدا ئاوی زەریا و زێیەکانی هەڵکشان بووە هۆی چێ بوونی خەرەندە مەزنەکان.

جگە لە بابەتی تۆفانی نووح، هەندێ جار لەو دەڤەرە رێژنە بارانی بەلێزمە و بەخوڕ دەبارێت، ئەو رۆژەش واتە بیستەمین ڕۆژی مانگی دووەمی بەهار بوو، یەکێك لە ڕێژنە توند و درێژەکانی باران کە هەمووان وایاندەزانی کورتخایەن دەبێت، لێ هێندە بەردەوام بوو تا جەنگی ڕاگرت، سمی ئەسپەکان و تایەی گالیسکەکان و قاچی پیادەکان لە قوڕ دەچەقین، بارانی توند ببوو بە پەردەیەك و بەرچاوی سەربازەکانی تاریك کردبوو و مەودای بینینی کورت کردبۆوە و نەیان دەزانی بۆ کوێ بچن و زەربەکانیان بۆ کام لا بوەشێنن.

فەرماندەکانی هەردوو سوپا تێگەیشتن کە بەردەوام بوونیان لەسەر جەنگ بەو شێوەیە بێ کەڵکە، تەنیا یەکدی کوشتن و خوێن ڕشتنی بێ سوودە، ئەوان دەیانبینی سەربازەکان چاپۆکی خۆیان لە دەست داوە، هەمووان دەزانن کە چاپوکی قاچەکان وەك هی دەستەکان بۆ سەربازانی پیادە پێویستە. بۆیە هەردوو فەرماندە فەرمانیاندا بۆ ئەوەی پێوەندیی هێڵی پێشەوە بپچڕێت و لە دوژمن دوور بکەونەوە.

تەواوی ئەو رۆژە و دواتریش لە شەودا بارانی توند باری و کاری سەربازەکانی زۆر سەخت کرد، ئەوان لەبەر باران نەیانتوانی تەنانەت خێوەتەکانیان لە شوێنی باش هەڵدەن، چونکە باران ئەو دەرفەتەی پێ نەدان. مەبەست لە شوێنی باش ئەوە شوێنەیە کە ئاوی باران تیایدا کۆنەبێتەوە، ئەگەر خێوەتەکانیان لە شوێنی نشێو دانابایە، ئاو دەچووە نێو خێوەتەکانی خوارەوە.

لە سەردەمانی کۆنەوە زانیبوویان کە پێویستە خێوەتەکان لە جۆرە بەنێك بچنن کە ئاو نەدات، لە رۆم خێوەتەکانیان لە کوتاڵێکی تایبەت بە ناوی ئەرخەوان چێ دەکرد، ئەو کوتاڵە چەند جۆرێکی هەبوو، جۆرە گرانەکەی بۆ چێکردنی جلە تایبەتەکانی سیناتۆرەکان و جلی تایبەت بە بۆنەکان بۆ لەگاتەکانی لێ چێ دەکرا، بە جۆرەکەی دیکەیش خێوەتیان چێ دەکرد، چونکە ئاوی نەدەدا.

لە ئێران خێوەتە سەربازییەکان لە خوری و مووی بزن چێ دەکران[٥]، لەبەرئەوەی ئەو خێوەتانە ئاو نادات یاخۆ بە وتەیەکی دیکە ئاو ناچێتە نێو ئەو جۆرە خێوەتانەوە. بۆ

---

(٥) لە کوردەواری خۆمان بە رەشماڵ ناو دەبرێت. "وەرگێری کوردی"

دەسەڵاتدارە ساسانییەکانیش هەمان جۆر کوتاڵیان لە ڕۆژە بارانییەکان دەکردە ڕووپۆشی خێوەتە گرانبەهاکانیان تا بە باران تەڕ نەبن، دوای بارانەکە ئەو ڕووکەشەیان وەلادەنایەوە.

لەو شەوەدا هیچ کام لەو دوو لەشکرە نەیانتوانی ئۆردووگە بۆ خۆیان چێ بکەن، تەنانەت ڕۆمەکان کە بۆ یەك شەویش لە هەر شوێنێك بووانە، خێوەتگە و دواتر دیواریان بە دەوریدا چێ دەکرد، ئەو شەوە نەیانتوانی خێوەتگەکەیان دابمەزرێنن. دوای نیوە شەو باران لێی کردەوە، هەورەکان بڵاوەیان کرد، پەیتا پەیتا ئەستێرەکان دەستیان بە درەوشانەوە کرد، ئەوکات هەردوو لا توانیان شتێك وەك خێوەتگە دابمەزرێنن.

ئاوی ڕووباری فوراتیش تا رادەیەك هەڵکشا بوو، بەڵام هێندە نەبوو کە لە ڕێڕەوی خۆی لا بدات، ئەگەر ئەو بارانە توند و لەپڕە نەبووایە، بە دڵنیاییەوە لەشکری شاپوور سەردەکەوت. چوونکە مەردان شیرازی هەشتا هەزار سەربازی هەبوو، سوپای ڕۆمی بچووك لە سی هەزار کەس تێپەڕ نەدەبوو، لە هەر دوولای مەیدانی جەنگیش لەشکری ساسانی لە پێشڕەویدا بوون.

لەوانەیە بگوترێت ئەگەر مەردان بەسەر درۆتۆس سەرکەوتبایە هیچ ئازایەتیی تێدا نەبووە، هێزی مەردان دوو بەرانبەری هێزی درۆتۆس بووە، بەڵام دەبێت ئەو بنەمایە بزانین کە لەو ڕۆژەوەی هونەری جەنگ هەیە، لێهاتوویی سەرکردەی جەنگ لەوەدایە کە بکارێت هێزێکی بەهێز بەرانبەر بە دوژمنەکەی لە شوێنێکی دیارکراودا کۆبکاتەوە و بتوانێت دوژمن لەنێو ببات.

ئامانجی تاکتیکی جەنگ ئەوەیە کە لەشکرێکی بەهێز لە ناوچەیەك لە دژی لەشکرێکی دیکە بخرێتە گەڕ تا بە تەواوەتیی لەشکرەکە لێك بترازێندرێت، لێکترازاندنی لەشکریش واتای سەرکەوتنە، لەشکرێکیش کە لەبەر یەك هەڵبوەشێت، ئیدی هیچی بۆ ناکرێت.

کەواتە ئەگەر باران نەبووایە هۆی لێك دوورکەوتنەوەی هەردوو لەشکر لە یەکدی، هیچ شارەزایەکی بواری سەربازی لۆمەی مەردان شیرازی نەدەکرد کە لەشکرەکەی پتر لە دوو بەرابەری لەشکری درۆتۆس بووە و مافی شانازی کردنی نییە لە سەرکەوتنی لەو جەنگەدا.

لە کۆتایی سەدەی سێیەمی پێش زایندا (سی پیۆنی ئەفریقایی) بۆ جەنگی کارتاژەکان (قرتاجنەی تونس) ڕۆیشت و ئەوانی بەزاند و بە شێوەیەك نغرۆی کردن کە ئیدی ئەوان نەیانتوانی ژیانیان نوێ بکەنەوە، تەنانەت لە کارتاژ یەك خانووی بە پێوە نەهێشت، هەرچی ئاوایی هەبوو لەنێوی برد، تەواوی درەختەکانی بڕییەوە، کەناڵەکانی کوێر کردەوە، بەنداوەکانیشی وێران کردن. دوای ئەو سەرکەوتنەی ئەو بەسەر کارتاژ و لەنێوبردنیان، هەندێ

کەس لە رۆم ئەو سەرکەوتنەیان بۆ ئازایەتیی ئەو نەگەڕاندەوە و وتیان هەر کەسێکی دیکە لە جیاتی ئەو لە رۆم سەرکردایەتیی ئەو سوپایەی کردبایە، سەرکەوتوو دەبوو، چوونکە هێزەکەی دوو بەرانبەری کارتاژ بوو، بەڵام زانایانی بواری سەربازی لە ئەنجومەنی سیناتی رۆم کە پلەی فەرماندەی لژیۆن یاخۆ لەگاتیان هەبوو، ئەو رەخنەیان رەت کردەوە و وتیان (سی پیۆن) سەرکەوتوو بووە.

لە سەدەکانی رابردوودا ناپلیۆن ئیمپراتۆری فەرەنساش ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە سی پیۆن لە کارتاژ سەرکەوتوو بووە، بە هەمان شێوە (کلۆس وێتز) شارەزای بواری سەربازی و خەڵکی ئەڵمان ئەو بابەتەی پشتڕاست کردەوە و وتی تەنانەت ئەگەر لەشکرەکە سێ بەرانبەریش بێت لە شانازی سەرکردەی سەرکەوتوو کەم ناکاتەوە. لە هاوینی ساڵی (١٨١٢ ز) ناپلیۆنی یەکەم بوو بە پاشای فەرەنسا و بە لەشکرێکی پێنج سەد هەزار کەسی هێرشی بۆ رووسیا کرد، لەشکرەکەی ئەو پێنج هێندەی لەشکری رووسیا بوو، سەرەتا سەرکەوتوو بوو، تا مۆسکۆ رۆیشت و شارەکەی گرت، بەڵام دوایی ناچار بوو پاشەکشە بکات و سوپا گەورەکەی بە سەرمای زستان لەنێو چوو. ئەوکاتەی ئەو سەرکەوت، لەشکرەکەی پێنج بەرانبەری لەشکری رووسیا بوو، کەس رەخنەی لە سەرکەوتنەکەی نەگرت.

دوای ئەوەی باران تەواو بوو، مەردان شیرازی بە هۆی ئەفسەرەکانەوە پەیامێکی بۆ هەموو سەربازەکانی نارد کە ئەمە دەقەکەیەتی: (دەزانم هەمووتان ماندوون و پێویستتان بە پشوودانە، هەرچەندە باران وەستاوە، بەڵام چوونکە زەوییەکە بۆتە قوڕ، کەس ناتوانێت پشوو بدات، ئەمشەو من و ئەفسەرەکان و ئێوە، هەموومان وەك یەك ناتوانین پشوو بدەین. هەر چۆنێك بێت دەبێت ئەمشەو کۆتایی بێت، شەو کورتە و زوو تێپەڕ دەبێت، تەواو بوونی ئاسانە. چوونکە رۆژەکان گەرمن، بەیانی بە زوویی زەوی وشك دەبێتەوە و ئێمە دەتوانین بەیانی لە جەنگ بەردەوام بین، هەرچەندە ئێوە ماندوون و ئەمشەویش ناتوانن پشوو بدەن، بەڵام من داواتان لێ دەکەم بە ئازایەتی و متمانەی هاوشێوەی ئەمڕۆ، بەیانی هێرش بکەنە سەر دوژمن و تێکی بشکێنن. من دڵنیام ئەگەر ئێوە سبەی وەك ئەمڕۆ بجەنگن، دەتوانن دوژمن لەنێو ببەن، من دوای ئەوە پشوویەکی درێژتان پێ دەدەم و بە تەواوەتی دەتوانن پشوو بدەن).

هەروەك مەردان پێشبینی کردبوو سپێدەی بەیانی لەگەڵ رۆژهەڵاتندا زەوی وشك ببووە، هەرچەندە کەمێك تەڕایەتیی مابوو، لێ هێندە نەبوو رێگە لە رۆیشتنی پیادە بگرێت یاخۆ

سمی ئەسپ و تایەی گالیسکەکان گیر بخوات، بەڵام مەردان بەباشی زانی کەمێك هێرشەکە دوا بخات.

لە بەرەبەیانی دووەمین مانگی بەهاردا خۆر  زۆر زوو هەڵدێت، مەردان شیرازی ئاگەداری لەشکرەکەی کردبۆوە، کە لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەمین تیشکی خۆرەتاو هێرش دەکەین، بەڵام سوپای رۆمی بچووك پێش ئەوەی هەتاو دەربکەوێت بلەز دەستیان بە پاشەکشە کرد. رۆژی پێشتر کاتێك هەردوو سوپا لە یەکدی کشانەوە و وازیان لە شەڕکردن هێنا، سوپای رۆم گەیشتنە دەڤەرێك کە کۆمەڵە گردێکی بچووکی لێ بوو، ئەو گردانە رێگر بوون لەوەی ساسانییەکان پاشەکشەی رۆم ببینن. هەورازی گردەکان هێندە نەبوو کە ببنە ئاستەنگ لە بەرانبەر گالیسکە جەنگییەکان بۆ ئەوەی نەکارن دووی رۆمەکان بکەون، بەڵام دەیانتوانی پاشەکشەی ئەو لەشکرە بشارنەوە.

تا ئەو کاتەی باران بەردەوام بوو، بە هۆی ئەو بارانە بە خوڕەوە مەودای بینین کەم ببوو، ئێرانییان نەیان دەتوانی پێشەوە ببینن، دواتریش چوونکە زەوی قوڕ بوو، هەردوولا بەناچاری گەشتی شەوانەیان بۆ پاسەوانی دەرنەکرد، ئەگەر زەوی وشك بووایە بە دڵنیاییەوە هەردوولا پاسەوانیان دەبوو، بەڵام بە هۆی لە یەك نێزیك بوونیانەوە، ناچار بوون بەردەوام ئاگەداری دۆخی یەکدی بن، ئەمەش بە رێگەی پاسەوانەکانەوە دەبوو، بەڵام ئەو شەوە بە رادەیەك هەردوو لەشکرەکە بە هۆی بارانەکەوە گیریان خواردوو بوو، زەویش بە ڕادەیەك قوڕ بوو کە نە رۆمەکان دەیانزانی ئێرانییەکان چ دەکەن، نە ئێرانییەکانیش ئاگەداری رۆمەکان بوون، بەرەبەیان هات و لەشکری ساسانی بە فەرمانی سەرکردەکەیان بۆ هێرش ئامادەبوون. هەرچەندە سەربازەکانی ساسانی پشت گردەکانیان بە باشی نەدەبینی، بەڵام دەبووایە هەندێ شتی وەك دووکەڵی ئاگر و حیلەی ئەسپ و سەری خێوەتەکان و... هتد، سوپای بەرانبەر لەنێو گردەکاندا دیار بێت، بە تایبەتی بەشی سەرەوەی خێوەتی فەرماندەی رۆم کە دەبووایە بە تیشکی خۆر بدرەوشێتەوە. ئەوەی سەربازەکانی مەردان هەستیان پێکرد، مەردان خۆشی هەستی پێکرد و زانی رۆمەکان رۆیشتوون.

مەردان فەرمانی کرد بۆ ئەوەی راوەدووی رۆمەکان بنێن و نەهێڵن بێ زیان و کوژراو رزگاریان ببێت، چوونکە ئەگەر ئەوان بە ئاسانی و بێ زیان ڕزگاریان ببێت، دیسان هێرش دەکەنەوە و هەوڵ دەدەن تیسفون داگیر بکەن.

دوای ئەوەی فەرماندرا تا دووی لەشکری رۆم بکەون، لەشکری ساسانی شێوازی دابەش بوونی خۆیان کە بۆ جەنگ بوو گۆڕی و کردیان بە شێوازی دابەش بوون بۆ رێپێوان، ئەمەش لەشکرەکەی کەمێك بە درەنگتر خست. تا ئەو رۆژە خۆراکی سەربازەکان و ئالیکی ئاژەڵەکان بە شێوەی رۆژانە لە تیسفونەوە دەهات، بەڵام ئەمجار رێگەکە دوورتر دەبوو، مەردان نەیدەزانی تا کوێ دەبێت دووی رۆمەکان بکەوێت، ئەمەش دەبووە هۆی دوورتر بوونی رێگەی گەیاندنی خۆراك و پێداویستییەکان بۆ لەشکرەکەی.

مەردان تا ئەوکات ئەو شتوومەکانەی لە پشتەوە وەردەگرت، رۆمەکان لەکاتی پاشەکشەدا، هەموو خۆراك و پێداویستییەکانیان بەجێ هێشتبوو، ئەوانەش بە تەواوەتیی کەوتنە دەست مەردان و رێژەیەکی باش بوو.

لەشکری رۆم بە درێژایی کەناری راستی ڕووباری فورات لە پاشەکشە بوون، لەسەر رێگەیان گوند و ئاوایی زۆر هەبوون، مەردان دەیزانی ئەوان بگەنە هەر ئاواییەك تەواوی خۆراك و پێداویستییەکانی ئەو ئاواییانە یاخۆ دەکڕن یان دەستی بەسەردا دەگرن بۆ ئەوەی بۆ لەشکری ئەو نەمێنێتەوە، بۆیە پێویستە هێندەی توانی هەیە بلەز بڕوات تا ئەوان لە دەشتەکان دەردەکات، هاوکاتیش پێویستە گرووپەکانی کڕینی خۆراك و ئالیکیش بنێرێت بۆ تەواوی ئاواییەکان بۆ ئەوەی لە ڕووی خواردەمەنییەوە دووچاری کێشە نەبێتەوە.

درۆتۆس فەرماندەی رۆم ئاگەدار بوو کە لەشکری ساسانی، گالیسکە و ئەسپیان هەیە و دەکارن خۆیان بگەیەننەوە لەشکرەکەی، بۆیە هەوڵی دەدا تا بە خێرایی رێ بکات، بۆ ئەوەی لەشکرەکەی بپارێزێت، دەبووایە شەو و رۆژ رێگە ببڕێت.

لژیۆنەکانی رۆمی بچووك لەبەر گیراوەی لژیۆنەکانی رۆمی گەورە بوون و بە یەکەی سەربازی پیادە هەژمار دەکران، ئەوان ڕاهاتبوون کە بە هەنگاوی خێرا برۆن، لە هەر دەمژمێرێکدا لە توانایان بوو نۆ تا دە کیلۆمەتر رێگە ببڕن.

لە رۆژە درێژەکانی بەهاردا، درۆتۆس ئەوانی ناچار دەکرد تا لە چواری بەیانی تا هەشتی ئێوارە بێ پشوودان رێگە ببڕن، بەم شێوەیەش ئەوان هەر رۆژێك لە کاتی وەستانیان لە ئێوارە

بۆ پشوودان، نێزیکەی بیست فەرسەخ (١٦٠ کم)[٦] دوورتر دەبوون لە شوێنی پشووی رۆژی پێشتردا.

ئاشکرایە ئەو سەربازانەی لە کاتژمێر چواری بەرەبەیان تا هەشتی ئێوارە بیست فەرسەنگ رێگە ببڕن، توانایان نامێنێت بۆ ئەوەی وەك جاران هەر شوێنێك پێی دەگەن لە دەورەی خۆیان دیوار چێ بکەن، تەنیا دەیان توانی خواردنەکەیان بخۆن و بخەون تا رۆژی دواتر بتوانن رێگە ببڕن.

مەردان شیرازیش هەوڵی دەدا خێراییەکەی پتر بکات، بەڵام ئەسپی گالیسکە و سوارەکانی رێگر بوون، ئەوان پێویستیان بە پشووی پتر و خۆراکی زۆرتر هەبوو بۆ ئەوەی بکارن بەردەوام بن، چوونکە بە بەراورد بەو سەربازە پیادانەی راهاتوون بۆ رێ رۆیشتن و بەرگەی ماندوو بوون دەگرن، ئەسپ تا رادەیەك ناسکترە.

لە لای راستی ڕووباری فورات لە سوریای ئێستە، ناوچەیەکی نیمچە شاخاوی هەیە، کاتێك لژیۆنەکانی رۆم گەیشتنە ئەو شوێنە ناچار بوون خێراییان کەم بکەنەوە.

درۆتۆس فەرماندەی رۆمەکان دەیزانی لەشکری دوژمنیش ناچارە لەو ناوچەیە بە هێواشی رێگە ببڕێت و ناتوانێت سوود لە گالیسکە جەنگی و سوارەکانی وەربگرێت.

دوای ئەوەی لە دەڤەرە نیمچە شاخاوییەکان دەرچوون، دیسان گەیشتنە ناوچەی دەشتایی، هەر بە هەمان شێواز لە رێگە بڕین بەردەوام بوون بە کەنارەکانی لای ڕاستی فوراتدا تا شەوێك کە لە دوورەوە درۆتۆس ئاگری خێوەتگەی ساسانی بینی، ئەو بە راستی ترسا، چوونکە بواری (تابگە) نێزیك بوو، بڕیاریدا تا لە بوارەکە بپەڕێتەوە و فێڵ لە لەشکری بەرانبەر بکات و ئەوان هەر وابزانن ئەو لە لای راست ماوە و لەوێندەر بە دووی بکەون.

بواری تابگە لە نێزیك شارێك بوو بە ناوی تابگە کە ئێستە لە سووریا ماوە و بە (تابقە) ناو دەبرێت، بەڵام سوودی لێ وەرناگرن بۆ پەڕینەوەی کاروان و لەشکرەکان، چوونکە ئێستە بەنداوێکی لێ چێ دەکرێت کە یەکێکە لە بەنداوە گەورەکانی رۆژئاوای ئاسیا و ئەفریقیایە،

---

(٦) وەك خۆی وەرگێڕدراوە، ئەستەمە مرۆڤ لە رۆژێکدا بتوانێت ئەو مەودایە لە دووری ببڕێت و بۆ ماوەی دە تا دوازدە رۆژ بەو شێوەیە بەردەوام بێت و خێراییەکەی لەو ماوەیەدا لە ئەسپ پتر بێت. بە دڵنیاییەوە مرۆڤ هەرچەندە ئازا و ڕاهاتووش بێت، دوای ئەو ماوەیە دەکەوێت و توانای بەردەوامی نابێت. "وەرگێری کوردی"

تەنانەت لە بەنداوی (سەدولعالی) کە لە میسرە و سێ هەزار و سەد مەترە، درێژترە و دیوارەکەی هێندە ئەستوورە کە ڕێگەیەکی دوو سایدی بەسەردا دەڕوات.

ئەو شوێنەی ئێستە ئەو بەنداوەی لێ چێ دەکرێت بە هۆی هەڵکەوتەی شوێنەکەی و پانی ڕووبارەکە و کەمی قووڵاییەکەی، باشترین بوار بوو بۆ پەڕینەوەی هەموو کاروان و لەشکرێك لە کەنارێك بۆ کەنارەکەی دیکە.

لە سێیەمین ڕۆژی مانگی خەرواتان (سێیەمین مانگی بەهار) لەوکاتەی درۆتۆس سەربازەکانی لە تابگە دەپەڕاندەوە بۆ ئەوبەری ڕووباری فورات، لەشکری ساسانی گەیشتن.

مەردان کاتێك لە ڕێگەی پێشەنگی لەشکرەکەیەوە هەواڵی پەڕینەوەی لەشکری رۆمی بیست بوو، بە پەلە فەرمانی رازانەوەی جەنگی بۆ گالیسکە و سوارەکان دەرکرد تا هێرش بکەنە سەر لەشکری رۆم و ڕایان بگرن تا ئەوکاتەی پیادەکانی لەشکر دەگەن.

هەوڵی رۆمەکان بۆ هەڵاتن و هەوڵی ئێرانییەکان بۆ گەیشتنەوە بە ئەوان گەیشتە لووتکە و لە رۆژانی بارانە لافاوییەکەوە تا ئەو رۆژەی لەشکری رۆم گەیشتە بواری تابگە، هەردوو لەشکر هەموو کۆششی خۆیان کرد تا یەکیان بواری هەڵاتنی ببێت و ئەوەی دیکەیش بتوانێت خۆی بگەیەنێتەوە بە لەشکری دوژمن و لەنێوی ببات یاخۆ تێکی بشکێنێت.

لەو رۆژ و شەوانەی هەردوو لەشکر لە رێپێوان و رۆیشتندا بوون، پشوودانی سەربازەکان زۆرتر بوو لە هی ئەفسەران، ئەفسەران لە کاتی پشووداندا دەبووایە بە هەموو تواناوە سەرگەرمی دابینکردنەوەی خۆراك بۆ رۆژی دواتر بن و ڕێڕەوی رۆیشتنی بەیانی دیاری بکەن، دواجار چاوەدێری دابەشکردنی خۆراك بەسەر لەشکرەکەیاندا بن تا لە کاتی رێڕۆیشتندا بتوانن بیخۆن، چوونکە ئەوان دەرفەتیان نەدەبوو بۆ نانی بەیانی بوەستن.

لە کاتێکدا سەربازە رۆمەکان سەرگەرمی پەڕینەوە لە بوارەکە بوون، گالیسکە و سوارە ساسانییەکان هێرشیان کردنەسەر، بۆ ئەوەی رێگە لە یەکدیی نەگرن، مەردان فەرمانی کرد بۆ ئەوەی گالیسکەکان هێرش بکەنەسەر ئەوانەی هێشتا نەپەڕیونەتەوە، سوارەکانیش هێرش بکەنە سەر ئەوانەی پەڕیونەتەوە بۆ لای چەپ یاخۆ هێشتا لە بوارەکەدان. گالیسکەکان هێندە بلەز گەیشتن کە درۆتۆس نەیتوانی رازاندنەوەی سەربازی بۆ سەربازەکانی بکات، سەربازەکانی لە کەناری راستی فورات بە شێوەیەك بوون کە لەو رێبوارانە دەچوون کە پێداویستییەکانی خۆیان پێیە و دەیانەوێت لە ڕووبار بپەڕنەوە بۆ لایەکەی دیکە.

سەربازە رۆمەکان ئەو پێداویستییانەی پێیان بوو، دەیان گواستەوە بۆ پشتی شەڕگە و خۆیان ئامادە دەکرد و لە پەنا یەکدیی ریزیان دەبەست و رێگەیان بە دوژمن دەگرت، تەنانەت ئەگەر دوژمن گالیسکەشی پێ بووایە، بەڵام لەو کاتەدا تەواوی سەربازە رۆمەکان بە دەست کەلوپەلەکانیانەوە گرفتار بوون و دەرفەتیان نەبوو کە بکارن کەلوپەلەکان لە خۆیان دوور بخەنەوە و ریز بگرن.

هەروەها دارایی سەربازی رۆمی لەنێو کۆڵەپشتەکەیدا بوو، دەیان زانی کە لە خۆیانی دوور بخەنەوە، جارێکی دیکە دەستیان ناکەوێتەوە و بە ئاسانی نەیان دەتوانی دووری هەڵ بدەن، ئەگەر توانیبایان لە خۆیان دووریشی بکەنەوە، نەیان دەتوانی بە خێرایی ریز بگرن و بە نێزە ئەستوور و کورتەکانیان پێش بە گالیسکەکان بگرن، بۆیە سەرباز هەرچەندە ئازا بێت، ئەگەر نەتوانێت ئارایشی جەنگی بگرێت و ریز ببێت، بە زوویی دەکەوێت و بەرگە ناگرێت.

ئەمڕۆ لە سەردەمی چەکی گەرمدا ئەگەر کەسێك بە دۆشکەوە لە شوێنێك بوەستێت دەتوانێت رێ لە ژمارەیەکی زۆر سەرباز بگرێت، بەڵام ئەوکات سەردەمی چەکی سارد بوو، سەرباز بەو چەکەی لە دەستی بوو دەبووایە پێش بە دوژمن بگرێت، ئەوەش پێویستی بە ئارایشی جەنگی پتر دەکرد، هیچ سەربازێك لە دەرەوەی ریزدا، هەرچەندە ئازاش بووایە، بایەخی نەدەبوو، تەنیا بۆ جەنگی تاك بە تاك سوودی دەبوو.

ئەوکات سەربازە رۆمەکان کە لە لای راستی ڕووباری فورات چاوەڕوانی پەڕینەوەیان دەکرد، هەموویان بە سەربازی تاك هەژمار دەکران، کاتێك گالیسکە جەنگییەکان گەیشتنە سەریان، وەك ئەوە بوو کە جووتیاران گوڵەگەنمەکان دەدرونەوە. بە تایبەتی ئەوانەی دەکەوتنە بەر داسی تیژی گالیسکەکان کە زۆر درێژ بوو، لە پێشەوەی گالیسکەبەسترابوو، هەروەسا سەربازانەی دیکەیش دەکەوتنە ژێر تایەی گالیسکەکان و پان دەبوونەوە، تیرهاوێژەکانی نێو گالیسکەکانیش بەردەوام تیریان دەهاویشت و لە رۆمەکانیان دەدا، بەڵام ئەوان ئازا و مەردانە وەستابوون و گیانیان دەبەخشی، تەنانەت داوای یارمەتییان نەدەکرد و هیچ هاوارێکیان لێوە نەدەهات. هەندێ لە رۆمەکان نێزەکانی دەستیان دەهاویشت و ئەسپێکیان دەکوشت، بە شێوەی کاتی گالیسکەیەکیان تێك دەشکاند، هەندێکیشیان نەیاندەتوانی و بەبێ دەنگی دەکوژران.

لەوکاتەدا لە دەمی یەکێکەوە کە نەزانرا کێ بوو، مێژوو ناوی ئەوی نەهێناوە، هاوارێك هەستا و دەنگێك هات کە وتی (ئامنا...ئامنا).

ئەو وشەیە رەگی ئەکەدی و ئارامی هەیە، لە هەموو زمانەکانی ئاسیای رۆژئاوا و ئەورووپای باشوور و ئەفریقیای باکور بڵاوبۆوە، هەر ئەو وشەیەیە بۆ نزاکردن، وەك وشەی وەڵامدانەوە بە (ئامین) بەکار دێت، لە زمانی عارەبان بە هەردوو شێوەی (ئامین و ئەمان) بەکار دێت، لە هەردوو زمانی یۆنانی و لاتینیش ئەو وشەیە هەیە، واتای بنەڕەتی و ڕاستەقینەی ئەو وشەیەش بریتییە لە (ئێمە پەنا بدەن).

ئەگەر ئەو وشەیە لە دەمی سەربازێکی رۆمی نەهاتبایە دەرێ، لەوانە بوو سەربازە رۆمەکان تا دوایین کەس بکوژرێن و خۆبەدەستەوە نەدەن، بەڵام هەر وەك چۆن ئازایەتیی دەگوازرێتەوە، ترس و ڕاچڵەکینیش دەگوازرێتەوە، هەر ترسی سەربازێکیش کاریگەریی دەکاتە سەر سەربازەکانی دیکە و دۆخێك دێتە کایەوە کە بە دەستەواژەی ئەمڕۆ دەوترێت ورەی خۆیان لە دەست داوە ئەو وشەیە بۆوە هۆی ورە لە دەستدانی سەربازە رۆمەکان و توانای بەرگریان نەما.

مەردان شیرازی کە بینیی هەندێ لە سەربازە رۆمەکان دەیانەوێت خۆ بە دەستەوە بدەن، فەرمانی کرد تا ئەوانەی دەیانەوێت خۆیان بە دەستەوە بدەن، خۆ لە کوشتنیان بپارێزن و دیلیان بکەن و بیانگوازنەوە بۆ پشتی شەڕگەکان.

ئەو سەربازە رۆمانەی لە وشکانی و لە لای راستی فورات بوون داوای تەناهیی و ئەمانیان کرد و خۆیان بەدەستەوەدا، بەڵام ئەوانەی لە بوارەکە یان لە لای چەپ بوون لە بەرانبەر سوارەکان بەرگریان دەکرد، هەرچەندە ئەوانیش ئارایشی جەنگیان نەبوو، بەڵام زەبری هێرشی سوارەکان وەك زەبری هێرشی گالیسکە جەنگییەکان نەبوو.

هەروەها بە هۆی دووری مەوداوە، ئەو سەربازانەی لە لای چەپی ڕووبارەکە بوون، دەنگی (ئامەنا...ئامەنا) نەهاتە بەرگوێیان و ئاگەدار نەبوون کە دۆخی سەربازەکانیان لە لای راستی ڕووبارەکە چییە و خۆڕاگریان دەنواند.

مەردان شیرازی کاتێك بینی گالیسکەکانی لە هێرشیان بۆ سەر رۆمەکان سەرکەوتوو بوون، زانی کە بوونی سەربازە پیادەکانی لە کەناری چەپی ڕووبارەکە پێویسترە تا لە کەناری راست، بۆیە فەرمانیدا پیادەکانی بپەڕنەوە بۆ لای چەپ و لەوێندەر بجەنگن و یارمەتی سوارەکان بدەن.

پێش ئەوەی پیادەکان بگەنە نێو بوارەکەوە، سوارەکان هێرشیان کرد بوو، ژمارەیەك لە رۆمەکانیان کوشت و بریندار کرد، بەڵام ئاوی ڕووبارەکە بە رادەیەك قوڕاو ببوو کە شوێنەواری

خوێنی لێ بەدی نەدەکرا، بەڵام تەنها بە هۆی ئەو بەنداوانەی لە تورکیا لەسەر ئەو ڕووبار چێ کراون، ئاوەکە بە رادەیەك ڕوونە، کە تەنیا چەند دڵۆپێك خوێن دەکارێت رەنگی ئاوەکە لەو شوینەدا بگۆڕێت.

کاتێك پیادەکانی ساسانی لە بوارەکە پەڕینەوە و گەیشتنە لای چەپی ڕووبارەکە، ئیدی جەنگ بۆ سەربازە رۆمەکان سەخت و بەرگری ئەستەم ببوو.

هەروەسا بە فەرمانی مەردان شیرازی هەندێ لە دیلە رۆمەکانیان بە ئەسپ پەڕاندەوە بۆ ئەوەی بە هاوسەنگەرەکانیان ڕابگەیەنن کە ئەوان لە لای راست خۆیان بەدەستەوە داوە و پێویست ناکات ئەوانیش بەرگری بکەن، چونکە ئیدی بەرگری بێ کەڵکە.

سەربازە رۆمەکانیش بە بیستن و بینینی ئەو دیمەنە، دەستیان لە بەرگریکردن هەڵگرت و هاواریان کرد (ئامنا ... ئامنا) و خۆیان رادەست دەکرد.

بەڵام دۆرۆتۆس لەگەڵ هەندێ لە سەربازەکانی خۆڕاگریان کرد و گالیسکە جەنگییەکان کە بە هۆی خۆبەدەستەوەدانی رۆمەکان، بێکار مابوونەوە، هێرشیان کردە سەر ئەو دەستە کەمە لە سەربازە رۆمەکان و تا دوایین کەسیان لێ کوشتن، بەم شێوەیە دۆرۆتۆس کوژرا و سەرکەوتن بۆ ساسانییەکان لە ساڵی (٣٣٨ ز) هات.

● * * *

تا پێش سەرکەوتنی لەشکری ساسانی لە بواری تابگە، تاکە کێشە و ئاریشەکە کە ڕووبەڕوویان بۆوە، بابەتی گەیشتنی خۆراك و ئالیك بوو، بە هۆی ئەوەی رۆمەکان لە پێشەوە بوون، نەیاندەهێشت ئەو کەرەستانە بگاتە ئەوان و دەستیان بەسەردا دەگرتن، بەڵام دوای گەیشتنی ئەوان بەو بوارە و سەرکەوتنیان، دەرگیری ئاریشەیەکی دیکە بوون کە نە تەنیا مەردان شیرازی، بگرە هیچ سەرکردەیەکی دیکە بە بیریدا نەدەهات.

بەر لەوەی قسە لەبارەی ئەو ئاریشە مەزنەوە بکەین کە بەسەر لەشکری ساسانیاندا هات، پێمان باشە باس لە یەکێك لە بیر و باوەڕەکانی نەتەوە کۆنە ئارياییەکان بکەین.

نەتەوە ئاریاییە دێرینەکان باوەڕیان وابوو کە دێوێك بە ناوی (شیتەڵ یاخۆ شیتاڵ) هەیە، بەردەوام سواری گوێدرێژێك دەبێت و بە دووی ئەو کەسانە دەگەڕێت کە سەرکەتوون یاخۆ براوەن، هەر کە بینی کەسێك سەرکەوتووە، لێی نێزیك دەبێتەوە و داوای لێ دەکات بۆ ئەوەی لە سەرکەوتنەکەی بەشی بدات، ئەگەر بەشی نەدات، بەو قامچییەی لە دەستی دایە چەند دانەیەکی لێ رادەکێشێت، بەو شێوەیە بەدبەختی بۆ کەسی سەرکەوتوو دەهێنێت. هەر بە

پشت بەستن بەو بیر و باوەڕەوە بوو، ئیدی ئەوان دوای سەرکەتن داوەتی خەڵکیان دەکرد (واتە خواردنیان بە خەڵك دەدا)، گوایە وشەی (شیتەڵ یاخۆ شیتاڵ) ناوی ئەو دێوەیە کە لە کاتی قومارکردندا بەکار دەهێنرێت.

ئێمە مەبەستمان نییە کە بڵێین چوونکە مەردان شیرازی بانگهێشتی خواردنی بۆ خەڵك نەکرد، دەرگیری بویەرێکی چاوەڕوان نەکراو و ناخۆش هات، بەڵام دەبێژین کە مەردان هەر دوا بەدوای سەرکەوتنەکەی نامورادی ڕووی تێ کرد، بەم ئاوایە بوو کە ژمارەیەك لە دیلەکان دووچاری نەخۆشی ئاوڵە هاتن.

مەردان بەپێی نەریتی ئەوکات بۆ چارەسەرکردنیان، تووشبووەکانی لە ئەوانی دیکە جیا کردەوە، هەندێ لە دیلەکانی دیکەیش کە تووشی نەخۆشی نەببوون کران بە پەرستاری ئەوان. ئەو نەخۆشییە لە رابردوودا دەرمانی نەبوو، تووشبووەکانیان چاوەدێری دەکرد تاکو خۆیان چاك ببنەوە یاخۆ بمرن. بەم دواییانەش هەرچەندە لە ڕێگەی کوتانەوە ڕێگری لە هاتنی نەخۆشییەکە دەکرێت، بەڵام دەرمانی نەخۆشییەکە نەدۆزراوەتەوە.(٧)

هۆکاری هاتنی ئەو نەخۆشییە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی مەردان گەیشتبۆوە شوێنێك کە نەخۆشی ئاوڵەی لێ بوو. لە ساڵی (٣٣٨ ز) واتە کاتێ مەردان بۆ داگیرکردنی ئەو شارانەی کەناری مەدیتەرانە دەچوو، نەخۆشی ئاوڵە لەو کەنارانە سەریهەڵدا بوو، تەواوی ئاسیا و ئەو دەڤەرەیلەی ئەفریقیای گرتبۆوە کە دۆزرابوونەوە، بەپێی هەندێ سەرچاوە ئەو نەخۆشییە دوو ساڵی خایاندووە ڤێجا بەکۆتا هاتووە.

---

(٧) لە مێژووی ئێران دیارە کە لەشکری ئێران زۆر جار، تەنانەت دوای ئەوەش کە کوتانی ئەو نەخۆشیە هاتەکایەوە، دووچاری نەخۆشی ئاوڵە بوونە، دواجاریش لە ساڵانی دواییی تەمەنی ناسرەدین شا بووە، دکتۆر ئەعلەمەدین سەقەفی کە دواتر بوو بە پزیشکی تایبەتی ناسرەدین شا، لە بیرەوەری خۆیدا نووسیویەتی کە ئەو دەمە لە تاران هەموو سەربازنی بەتالیۆنێك دووچاری نەخۆشی ئاوڵە بوون. نەخۆشەکانیان لە ژوورەکاندا خەواندبوو، من و دکتۆرێکی دیکە کاتێك دەچووینە نێو هەر ژوورێك، ئەوەندە مێشی لێ بوو کە چاومان هیچی نەدەبینی، بە دەسڕەکانمان مێشەکانمان لە ژوورەکان دەردەکرد، ئەو دەسەڵاتدارەی لەگەڵ ئێمە هاتبوو، بۆ دڵدانەوەی نەخۆشەکان دەیووت: "شازادەی جێنشین دێت و دیاریتان بۆ دێنێت"، دوای ماوەیەك هەندێ لە سەربازەکان مردن و هەندێکیشیان چاك بوونەوە. ڕۆژێکی دیکە کە چوومەوە بۆ ئەو نەخۆشخانەیە، بینیم سەربازەکان بە کۆمەڵ و بە شێوەی لاواندنەوە پێکەوە شتێك دەڵێن، دوای ئەوەی چوومە پێشێ و گوێم بۆ هەڵخستن، بۆم دەرکەوت دەڵێن: "شازادەی جێنشین نەهات و یەك قرۆش دیاریشی نەهێنا. "زەبیحوڵڵا"

بۆچی نەخۆشی ئاوڵە سەرەتا لەنێو سەربازە رۆمەکان بڵاو بۆوە، دواتریش گەیشتە نێو سەربازە ساسانییەکان؟.

دوای شازدە سەدە، هێشتا ناکارین بەرسڤی تەندروستی ئەو پرسیارە بدەینەوە، هەرچەندە نها دەرکەوتووە کە هەندێ جەستە ئامادەییان پترە لە وەرگرتنی نەخۆشییەکی تایبەت لە جەستەکانی دیکە، ڕەنگە رۆمەکان ئامادەییان بۆ پێشوازی ئەو میکرۆبە زۆرتر بوو بێت، لەوانەشە ئەوان پتر پێوەندییان بە دانیشتووانی دەڤەرەکە کردبێت کە ئەو نەخۆشییەیان هەبووە. ئیدی ئەو نەخۆشییە سەرەتا لەنێو دیلە رۆمەکان دەرکەوت، هەرچەندە مەردان تووشبووەکانی لە ئەوانی دیکە جیاکردەوە، بەڵام نەخۆشییەکە گەیشتە سەربازەکانی دیکەی رۆم، دواتر بۆ سەربازەکانی ساسانی، دواجار بووە هۆی رێگرتن لە پێشڕەویکردنی زیاتری مەردان.

نەخۆشی ئاوڵە بە رادەیەك لەنێو لەشکری ساسانیاندا بڵاو بۆوە، کە ئیدی کەس نەما دووچاری نەخۆشی نەبووبێت و ئاگەداری ئەوانی دیکە بێت. ئەسپی گالیسکەکان لە ئەسپە هەرە پڕ بەهاکانی ئێران بوون، کەس نەبوو ئالیك و ئاویان پێ بدات، لێخوڕی گالیسکەکان بە ناچاری بە خورتی لەسەر سك خۆیان دەخشاند و ئالیکیان دەخستنە پێشێ و بەریاندان بۆ ئەوەی خۆیان بچنە کەناری ڕووبار بۆ ئاو خواردنەوە.

مەردان شیرازیش وەك هەموو ئەفسەر و سەربازەکانی دووچاری ئەو نەخۆشییە هات، لەبەر بێ توانایی کەوت، ئیدی کەس نەیدەتوانی تەرمی مردووەکان بنێژێت. مەردان لەو نەخۆشییە چاك بۆوە و نەمرد، بەڵام شازدە هەزار کەس لە ئەفسەر و سەربازەکانی مردن، بەداخەوە ئەمە بوو بە بنەمایەك بۆ ئەو نەخۆشییە، دەوترا لە هەر پێنج تووشبوو بەو نەخۆشییە یەکیان دەمرێت، واتە یەك لەسەر پێنجی لەشکری مردان مرد، بەڵام ئەوانەی چاك دەبوونەوە ئیدی دڵنیا دەبوون کە تا مردن دووچاری ئەو نەخۆشییە نابنەوە.

کاتێك مەردان چاك بۆوە بڕیاریدا ئەو کارەی بەر لە نەخۆشی دەیویست بیکات و بۆی نەکرا، ڤێجا بیکات و بڕوات بۆ داگیرکردنی شارەکانی کەناری دەریای سپی و دەریای مەدیتەرانە. هەرچەندە ئەو شارانە لەو سەردەمەدا هەموویان دووچاری ئاوڵە ببوون، بەڵام مەردان ئیدی لەو نەخۆشییە نەدەترسا و دەیزانی ئەفسەر و سەربازەکانی تا دوارۆژی ژیانیان دووبارە دەرگیری ئەو نەخۆشییە نابن، بەڵام بەر لەوەی بکەوێتەڕێ لەلایەن شاپووری دووەم فەرمانی بۆ هات کە بە زووترین کات بگەڕێتەوە و خۆی بگەیەنێتە تیسفونی پایتەخت.

مەردان شیرازی پێشبینی کرد کە لەوانەیە لەنێو ئێران بویەرێك قەوما بێت و وای پێویست کردبێت ئەو دەستبەجێ لەگەڵ لەشکرەکەی بگەڕێتەوە، بەڵام لە راستیدا هیچ ڕووداوێکی ناوەخۆیی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێت شاپووری دووەمی پاشای ساسانی، بۆیە داوای لەشکرەکەی کرد، چوونکە پێشبینیی جەنگێکی مەزنی دەگەڵ عارەبان کردبوو.

سەردارێکی عارەبان بە ناوی (غەموسی کوڕی کەهامە) بە سوپایەکی بەهێز کە لە کۆمەڵێك خێڵی جیاجیای عارەبان پێکهاتبوو، توانی بووی بەسەر باشووری دورگەی عارەبیدا سەربکەوێت، پاشان وڵاتی حەڕانی رۆژئاوای میزۆپۆتامیای باشووری داگیرکردبوو، دواتر باشووری میزۆپۆتامیاشی خستەژێر دەستی خۆی.

غەموسی کوڕی کەهامە ئاینێکی نوێشی بۆ عارەبان هێنابوو، بە خەڵکەکەی دەوت: ئەو بتانەی ئێوە دەیانپەرستن بێ گیانن و هیچ کاریگەریان لەسەر ژیانتان نییە، تەنیا خوداوەندێك کە کاریگەریی لەسەر ئێوە هەبێت، هەتاوە هەر ئەویشە ژیانی مرۆڤ دەپارێزێت. هەر ئەو گاڤانەی بە شێوەی کاتی دیار نامێنێت، ئێوە لە سەرمان دەلەرزن.

عارەبانی بیابانشینیش پەیڤانی ئەویان بە راست و تەندروست دەزانی، چونکە لە شەودا کاتێك هەتاو نەبوو، بە رادەیەك هەوا سارد دەبوو، کە ناچار دەبوون پەنا ببەنە بەر خێوەتەکانیان و دەرکە و لۆکانی دابخەن بۆ ئەوەی سەرما نەچێتە نێو خێوەتەکانیانەوە، لە بیابانەکانی عارەبستان بە تایبەتی لە (نەجد) کە بیابان بەرزترە، هەندێ کات جیاوازیی نێوان پلەی گەرمی رۆژ و شەو تا چل پلە دەبێت.

هەندێك وا هزریان دەکردەوە کە بە هۆی گەرمای زۆری رۆژەکانی بیابان، عارەبان لە هەتاو بێزارن، ئەوەیان نەدەزانی کە سەرمای شەوان ئەوانی تێدەگەیاند کە بەبێ هەتاو ژیانیان ئەستەم دەبێت.

کاتێك غەموس ئەوانی بانگهێشت کرد تا هەتاوپەرستی بکەن، نەتەنیا حەزەکانی ئەوانی جووڵاند، بگرە دەروونی ئەوانی ئارام و هێوور کردەوە و ئەوان لە دەروونەوە ئامادەییان بۆ پەرستینی هەتاو هەبوو.

چوونکە ئەو ئاینەی ئەو هێنابووی لەگەڵ دەروونی عارەبان یەکی دەگرتەوە، لە ماوەیەکی کەمدا لایەنگر و شوێنکەوتووی زۆری پەیدا کرد، غەموس لە رواڵەتدا بۆ ئەوەی ئاینەکەی لە جیهان برەو پێ بدات، لە راستیشدا بۆ پاوانخوازی زیاتر، دوای ئەوەی باکوری عارەبستان و

وڵاتی حەڕان و باشووری میزۆپۆتامیای داگیرکرد، بەرەو باکوری میزۆپۆتامیا و تیسفون کەوتەرێ بۆ ئەوەی ئەوێش داگیر بکات.

غەموسی کوڕی کەهامە بە سوپاکەیەوە لە میزۆپۆتامیای باشوورەوە بە رێکەوت.

بەپێی هەندێ گێڕانەوە لای راستی لەشکرەکەی بە ئاباداندا رۆیشتن کە لە رابردوودا بە (عبادان) دەخوێندرایەوە، بەڵام ئەو گێڕانەوەیە نابێت راست بێت، چوونکە لەشکرەکەی ئەو هێندە گەورە نەبوو کە بگاتە ئابادان.

غەمووسی کوڕی کەهامە بە درێژایی ڕووباری دیجلە بەرەو باکور کەوتەڕێ، هەر هەمان رێگەی گرت کە قوورەی کوڕی موخلەب لە سەرەتای دەسەڵاتیی شاپووری دووەم پێیدا بەرەو تیسفون هات.

رێگە گەورە و ستراتیجییەکان بەپێی دۆخی جوگرافیایی و ڕووبارەکان دیار دەکران، بۆ نموونە تەواوی ئەو پاوەنخوازییانەی ئاسیا کە لە رێگەی وشکانییەوە بۆ هیندستان دەڕۆیشتن، ناچاربوون بە گەلیی خەیبەردا بڕۆن، هەموو هێرشبەرە ئەورووپاییەکان کە لە ئاسیای بچووکەوە بۆ ئاسیا دەهاتن دەبووایە لە نێزیك ئەنگوریە یاخۆ ئانکارا و لە ڕووباری هالیس بپەڕنەوە کە نها بە (قزا ئایەرماق) ناودەبرێت، ئەوان دەبووایە لە رۆژئاواوە بەرەو تیسفون بە درێژایی ڕووباری فورات بجووڵێن. هەر کەسێکیش لە میزۆپۆتامیای باشوورەوە بۆ تیسفون هاتبایە، دەبووایە بە درێژایی ڕووباری دیجلە و تەریب بەو رێگەکە ببڕێت.

غەموسیش بۆ ئەوەی بەردەوام لەشکرەکەی دەستی بگاتە ئاو بۆ خواردنەوە و بەکارهێنان، دەبووایە تەریب بەو ڕووبارە و لە باشوورەوە بەرەو باکور رێگە ببڕێت.

دەوترێت غەموسی کوڕی کەهامە ئەسپێکی لە رەگەزی عارەبی هەبوو، هەندێك ئالیکی دەخوارد، دواتر کەمێك ئاوی دەخواردەوە و دووبارە ئالیك و دووبارە ئاو، بەم شێوەیە بەردەوام دەبوو تا ئەوکاتەی تێری دەخوارد. ئەگەر وابوو بێت ئەو ئەسپە لە هەموو جیهان بێ هاوتا بووە، چوونکە هەموو ئاژەڵەکان، تەنانەت ئەوانی گۆشت خۆریشن تا تێر نەخۆن، ئاو ناخۆنەوە، بەپێی وتەی زیندەوەرناسان ئاو خواردنەوەی مرۆڤ لەکاتی نان خواردن کارێکی ناسرووشتیە و پێچەوانەی یاساکانی سرووشتە.

غەموس گەیشتە ناوچەیەك لە دیجلە کە بە (دیجلەتولعەورا) ناسرا بوو، ئەو لەو رۆژەی گەیشتە نێو خاکی ئێران و لە وڵاتی حەڕان تێپەڕ بوو، سەر و ماڵی ئێرانییانی بۆ سەربازەکانی

خۆی حەڵاڵ کرد، تا زیاتر لە درێژایی دیجلە ڕێگەی دەبڕی، زیاتر وێرانەی لەدوا خۆی بەجێ دەهێشت.

قوورەی کوڕی موخلەب دە ساڵ پێشتر، ئەو دەمەی شاپوور تەنیا هەژدە ساڵان بوو بەو ڕێگەیەدا هات، هێندەی غەموس وێرانەی لەدوای خۆی جێ نەهێشت، ئەوەش بۆ ئەوە نەبوو کە ئەو نەیدەویست وێرانیان بکات، بگرە ڕێڕەوی ڕۆیشتنی ئەو ناوچەیەك بوو کە لەوێندەر ئاوەدانی کەم بوو، کەهامە بۆ گەیشتن بە تیسفون بە ئاوەدانترین شوێنەکانی ئیمپراتۆرییەتی ساسانیدا دەڕۆیشت، لەوێندەر لە هەردوو لای دیجلە ئاوایی و گوندی زۆر هەبوون.

ڕەنگە پرسیار بکرێت ئاخۆ هیچ سەربازگەیەکی ساسانی لەسەر ڕێگەیان نەبوو کە ئەوان ئاوا بە ئاسانی و بێ بەرگری ڕێگەیان بەرەو تیسفون دەبڕی؟.

وەڵامی ئەو پرسیارە نەخێرە، ساسانییەکان لە سنووری باشووریاندا لەگەڵ وڵاتی حەڕان کە لە مێژووی ڕۆمەکاندا بە (کارە) ناوی هاتووە، سەربازگەی نەبوو، چوونکە پاشاکانی وڵاتی حەڕان پشتاوپشت و نەوە بە نەوە بۆ پاشاکانی ساسانی ئەمەکدار بوون، ساسانییەکانیش هیچ ئاریشەیان نەبووە تا ناچار بن بیر لە دانانی سەربازگە لەو دەڤەرە بکەنەوە، ئەگەر هەندێك جار کێشەیەکیش ڕوویدا بووایە بلەز چارەسەر دەکرا.

کەرەستە جەنگییەکانی قوورەی کوڕی موخلەب کە دە ساڵ زووتر هێرشی کردبوو باشتر بوون لە هی کوڕی کەهامە، ئەو مەنجەنیقی هەبوو، کوڕی کەهامە نەیبوو، وای بە باش دەزانی باری سووکتر بێت تا خێراتر بێت و بڕوات.

بڕوا ناکەین باسکردنی دۆخی سەربازەکانی سوپای کوڕی کەهامە پێویست بێت، بەو پێیەی لە ڕووی بیرکردنەوە عارەبانی بادیە یاخۆ بیابانشین لە ساڵی (٣٣٨ ز) جیاوازیی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە، چونکە دۆخی ئەوان لەگەڵ دۆخی عارەبان لە سەدەی بیستەم هەریەکە، هەرچەندە ئیسلام ئاینی ئەوانی لە بت پەرستی بۆ خواپەرستی گۆڕی، بەڵام ژیانی بیابانیی ئەوان و ورەیان نەگۆڕا، ورەی عارەبانی بادیە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لەگەڵ ورەی سەربازێکی کوڕی کەهامە کە بۆ داگیرکردنی تیسفون دەهات، وەك یەکن.

پێویستە سەرەنجی ئەوە بدەین کە پێش هاتنی ئیسلام عارەبان شارنشین نەبوون، هەرچەندە هەندێ شاری وەك (مەککە، مەدینە و تائیف) هەبوون، بەڵام ئەوانیش وەك عارەبانی بادیە دەژیان، خانووەکانیان وەك خێوەتەکانی بیابانشیان لە تەنیشت یەکدیی چێ دەکران، ئەوانیش شیری وشتریان دەخوارد کە خواردنێکی تەواو و بەهێزە، کەس نانی نەدەخوارد، چوونکە نان

دەست نەدەکەوت، وشەی (خوبز)ی عارەبی کە بە واتای نان دێت، لە بنەڕەتدا بە واتای (شتی دەگمەن).

ئەو عارەبانەی لە ساڵی (٣٣٨ ز) هێرشیان کردە سەر ساسانییەکان بە هەمان شێوەی پێشینان و نەوەکانیان کە دوای ئەوان دەهاتن، سادەبوون، سوێندیان زۆر دەخوارد، چوونکە زۆر سادە بوون و کەم رووی دەدا شتێك بڵێن بە بێ ئەوەی سوێند بخۆن.

عارەبان بەر لەوەی ببنە هەتاوپەرست سوێندیان بە بتەکانیان دەخوارد، دواتریش سوێندیان تەنیا بە هەتاو دەخوارد، بە هەمان شێوازیش دوای بە ئیسلام بوونیان بەردەوام بوون لە سوێند خواردن بە ناوی (الله) کە خودای گەورەیە.

عارەبان یەکجار سادە و ساکار بوون، لە نێوان چاك و خراپ، ناشیرین و جوان، نەرم و رەق لێکدانەوەیان نەبوو هەموو شتان لە لای ئەوان باش یان خراپ بوو، بۆیە لە سزادانیش رێژەی ناوەندیان نەبوو.

بەپێی بیر و باوەڕی عارەبان سزای دزیکردن بڕینی دەست بوو، جا دزەکە یەك دەنکە گەنمی دزی بووایە یاخۆ سەد وشتر، کاتێکش بەسەر دوژمنیاندا سەردەکەوتن، دەیانکوشتن و هەموو سامانیان دەبردن، ژنەکانیشیان دەکردە هی خۆیان و منداڵەکانیان بە کۆیلە دەبردن.

ئەوان بەر لە هاتنی ئیسلام بەزەیی هاتنەوە بەرانبەر بە دوژمنی شکستخواردوویان، بە بێ واتا دەزانی، تەنانەت لە کاتی سەرکەوتندا بەزەییان بەرانبەر بە هاوڕەگەزی خۆیان نەبوو، چجای بەرانبەر بە نەتەوەیەکی دیکە هەیان بێت.

عارەبانی بیاباننشین لە ڕووی توانای جەستەیی و سەربازییەوە بەهێز بوون، ژیانی ئەوان لە منداڵیەوە تا تەمەنی پێگەیشتن بە شێوەیەك بوو کە وەك سەرباز پەروەردە دەبوون، واتە ئەو خەسڵەتانەی کە دەبێت سەربازێکی باش هەیبێت. ئەوان ئەو خەسڵەتانەی سەربازێکی کارامەیان هەبوو کە برێتی بوون لە خۆڕاگری، ماندوو نەبوون، نەترسان لە بریندار بوون، قەناعەتکردن بە بڕە خۆراکێکی کەم و بەرفەرمان بوونیان بەرانبەر بە فەرماندەکەیان.

هەموو ئەو خەسڵەتانەش لە عارەبانی بیاباننشین هەبوو، لەنێو ئەواندا سەرۆك خێڵەکانیان راستەوخۆ دەبوونە سەرکردەی سەربازی، عارەبان هەر لە منداڵیەوە فێرببوون هەموو فەرمانەکانی سەرۆك خێڵ جێبەجێ بکەن، بەم پێیە هەموو فەرمانەکانی سەرکردەکەیان جێبەجێ دەکرد و بە رێکترین سەربازانی جیهان هەژمار دەکران، ئەوان لە مردن نەدەترسان، بۆیە گەورەترین مەترسی بوون بۆ سەر دوژمنەکانیان.

دوای ئەم وتانە ئیدی نابێت بۆمان ببێتە مایەی سەرسوورمان کە لەشکرێکی عارەبان لە ساڵەکانی (١٥ یاخۆ ١٩ی کۆچی هەتاوی) لە چەند جەنگێکی بەدوای یەکدا، توانیان (یەزدگۆردی سێیەم) پاشای ساسانی تێك بشکێنن. ئەو مێژوونووسانەی عارەبانیان بە مرۆڤەیلی بێ توانا و بێ دەسەڵات داناوە، یەکجار هەڵەن، ئەگەر وابوونایە، نەیاندەتوانی چەندان جار یەزدگۆرد بشکێنن.

ئەو سەربازانەی لە دوای هاتنی ئیسلام و لە سەردەمی خەلیفەی سێیەمی ئیسلام هێرشیان بۆ سەر ئێران کرد، هەموویان (ئیعرابی) بوون نەوەك (عارەب)، ئیعرابی بەو کەسانە دەوترا کە لە بیابان دەژیان و عارەبی رەسەن بوون، ژیانێکی زۆر سەختیان بەسەر دەبرد و کاری رۆژانەیان هێندە سەخت بوو کە لە کاتی چوون بۆ جەنگ وایان هەست دەکرد کە دەچن بۆ ڕاوکردن یاخۆ مۆڵەت، بەڵام (عارەبان) ئەوانە بوون کە لە شار دەژیان و کەمتر سەختیان دەبینی، بۆیە دەرکەوتە رەگەزیەکانیان جیاوازییان هەبوو لەگەڵ ئەوانی دیکەدا.

سوپای (غەموسی کوڕی کەهامە) بە درێژایی کەنارەکانی رۆژئاوای ڕووباری دیجلەدا بەرەو باشوور دەڕۆیشت، هەندێ کات بەشێك لە سوپاکەی دەپەڕاندەوە بۆ لای چەپی ڕووباری فورات بۆ تاڵانکردنی گوند و ئاواییەکانی ئەو دەڤەرانە و بانگهێشت کردنیان بۆ ئاینی هەتاوپەرستی، هەرکەسێکیش بانگهێشتەکەی پەسەند نەکردبایە دەکوژرا.

دانیشتووانی ئاواییەکانی ئەمبەر و ئەوبەری ڕووباری دیجلە ئەگەر توانای هەڵاتنیان ببووایە، ئەوا بۆی دەردەچوون، بە پێچەوانەوە دوای ئەوەی سەر وماڵیان تاڵان دەکرا، دەکوژران.

شاپووری دووەم ئەزموونی لە جەنگ لەگەڵ عارەبان لە جەنگەکانی رابردوو وەرگرتبوو، بۆیە شێوازی جەنگی ئەوانی دەزانی، ئەو دەیزانی ئەوان شەڕکەری سەرسەختن، بەڵام کاتێك بزانن لەنێو دەچن، ئیدی بەرگری ناکەن و گیانیان دەپارێزن. بۆ ئەوەی غەموس ڕێگەی پاشەکشەی نەبێت و هەڵ نەیێت، بڕیاریدا لەشکرێك لە کەناری دیجلە بەرەو باشوور بڕوات تا ئەو کاتەی دەگاتە پشت کوڕی کەهامە، دوای ئەوە لە هەردوو کەنارەکانی دیجلەوە بەرەو لەشکری ئەو بڕوات، هەروەها شاپوور بۆ خۆی و لەشکرەکەشی لە بەرانبەریەوە بڕوات و هێرش بکاتە سەر لەشکری عارەبان.

هەموو سەرباز و ئەفسەرەکانی هەردوو سوپای ساسانی بە فەرمانی شاپووری دووەم دەیان زانی نابێت لە کاتی جەنگ هیچ سەربازێك یاخۆ ئەفسەرێکی لەشکری عارەبان بپارێزن، ئەوان

دەیانزانی ئەوە دژی بنەماکانی جەنگە، کاتێك کەسێك ویستی خۆی بەدەستەوە بدات، دەبێت شمشێرەکەی لێ بستێنن و دیلی بکەن. شاپوور ئەو فەرمانەی دەرکرد، دەیزانی دژی بنەماکانی جەنگە، چوونکە عارەبان دانیشتووانی شار و گوندانی سەر ڕێگەیان دەکوشتن و سامان و سەرمایەیان تاڵان دەکردن.

بۆیە سوپایەی دەبووایە بگاتە پشت لەشکری کوڕی کەهامە، بۆیە زۆر بە خۆپارێزی دەبێت بجووڵێت بۆ ئەوەی عارەبان نەزانن ئەو لەشکرە لە ئەوان نێزیك دەبێتەوە، کەواتە ئەو کارەش یەکجار سەخت و دژوار بوو.

فەرماندەی ئەو سوپایە ناوی (پەرۆز) بوو، بۆ لەشکرەکەی پێویستی بە ئاو هەبوو، لەو دەڤەرەی دەبووە ڕێڕەوی ئەو، جگە لە ڕووباری **دیجلە** هیچ سەرچاوەیەکی دیکەی ئاوی لێ نەبوو، تا ئەوان پێداویستیی خۆیانی لێ دەستەبەر بکەن، بۆیە ناچار بوون سوود لە ئاوی ڕشووباری **دیجلە** وەربگرن.

عارەبانیش ناوە ناوە بەشێك لە لەشکرەکەیان بۆ تاڵانی ئاواییەکانی کەناری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری **دیجلە** دەنارد. کاتێك کوڕی کەهامە گەیشتە ناوچەیەك کە بە (نادە) دەناسرا، لە ڕووی هەندێ نیشانەوە زانی لەشکرێك لە نێزیك ئەو هەیە.

سێ سەدە دواتر عارەبان جارێکی دیکە هێرشیان کرد بۆ نادە و ناوەکەیان گۆڕی بە (النجدە) کە بە واتای ئازایەتیی دێت.

یەکەم نیشانە کە دەستەیەك لە سەربازانی عارەبان لە کەناری ڕۆژهەڵات بینییان، جێگەی سمی ئەسپ و شوێن پێی سەربازان بوو، پێڵاوی سەربازانی سوپای شاپوور لەژێریانەوە چوار بزماری چوار سووچی لێدرا بوو، پێڵاوی خەڵکی ئاسایی بەو شێوە نەبوو، پێڵاوەکانیان لەو کارخانانەدا چێ دەکران کە هی سوپا بوون، بە هەمان شێوە چەك و کەرەستە پێویستەکانیش لە کارگەکانی ئاسنی سوپا چێ دەکران. پەرۆز سەرکردەی ساسانی ناچار بوو بۆ ئاو هەڵگرتن لە کەنارەکانی ڕووباری **دیجلە** نێزیك ببێتەوە.

ئاشکراشە کە هەرجارێك پێویستە دەستەیەك لە سەربازانی پیادە و سوارە بۆ ئەو ئەرکە بچن. ئەو لە نادە نەوەستا، تەنیا پێیدا تێپەڕ بوو، بەڵام جێ پێی سەرباز و سمی ئەسپان بەرچاوی عارەبان کەوتن. هەر لەو شەوەدا عارەبان جێ پێکانیان بینی، لە لای باکور و باشووریش ڕووناکی ئاگریان لە چەندان لاوە بینی.

نادە کەوتبووە لای باکور و باشوور و رۆژئاوا و رۆژهەڵاتی دیجلەوە کە، پێدەشتێکی تەخت بوو، لەو پێ دەشتانەدا لەکاتی رۆژ، ئاوەدانی لە دوورەوە وەك دارستانەکان لە مەودای چەند فەرسەخ دیار بوون.

ئەگەر بینەر کەسێکی کەم ئەزموون بێت، وا بیردەکاتەوە کە مەودای نێوانیان تەنیا لەوانەیە یەك فەرسەخ بێت، لەوانشە کەمتر بێت، بەڵام ئەگەر ئەزموونی لەگەڵ دەشتەکانی رۆژهەڵاتی نێزیك و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبێت، دەزانێت ئەگەر بە درێژایی یەك رۆژ رێگە ببڕێت ناگاتە ئەو ئاوەدانییە.

لە کاتی شەودا ڕووناکی ئاگر لە دووری شەش فەرسەخ (٣٦ کم) دیارە و لە مەودای دوورتریش لە درەوشانەوەی ئەستێرەکان دەچێت، بەڵام وەك ئەوەی ئەستێران بە زەوییەوە لکا بن، کەسانی کەم ئەزموون ڕەنگە وا بزانن کە ئەستێرەیە، بەڵام خودان ئەزموونەکانی سەفەر لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نێزیك دەزانن کە ئەوە ئاگرە و ئەستێرە نییە.

عارەبان ئەو شەوە لە باکور و باشووری خۆیان ژمارەیەکی زۆر ڕووناکی ئاگریان بینی، ئەوان زانیان ئەوە ئاگری سوپایە و هی کاروانانی بازرگانی نییە.

کاتێك کوڕی کەهامە ئەو ئاگرانەی بینی، فەرمانی کرد تا ئاگرەکانی خۆیان بکوژێننەوە بۆ ئەوەی ساسانییەکان نەیان بینن، تازە درەنگ بوو، چونکە شاپوور و پەرۆز ئەو ئاگرانەیان بینی بوو. عارەبانی بیاباننشین بۆ ئامادەکردنی خواردن ئاگریان نەدەکردەوە، چوونکە ئەوان گۆشتیان نەبوو تا پێویستیان بە ئاگر بێت، خواردنی ئەوان لە بیابان شیری وشتر بوو، بەڵام سەربازانی کوڕی کەهامە لەسەر رێگەیاندا تەواوی گوند و شارەکانیان تاڵان دەکرد و مەڕی گوندەکانیان دەهێنا و سەریان دەبڕی و شەو لەسەر ئاگر دەیان برژاندن.

ئەو شەوە عارەب و ئێرانییان ئاگری خێوەتگەکانی یەکدییان لە دوورەوە بینی و تێگەیشتن کە لە سپێدەی بەیانییەوە دەبێت خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن، بە گریمانی زۆریش جەنگ ڕوودەدات. شاپووری دووەم و پەرۆزی سەرکردەی ساسانی شێوازی جەنگی عارەبانیان دەزانی و دەیانزانی ئەوان کاتێك خۆیان لە مەترسیدا ببینن، پێوەندییان دەپچڕێنن، هەرچەندە پیاوانی ئازان، بەڵام بێ هۆ خۆیان بە کوشت نادەن، عارەببوونیشیان هاندەر نییە بۆ ئەوەی بێ سوود خۆیان بە کوشت بدەن، چوونکە لەنێو خاکی خۆیان نین کە تا دوایین کەس خۆیان فیدا بکەن.

مەبەستی سەرەکیی ئەوان لە هاتنیان داگیرکردنی تیسفون و دەستکەوت بوو، ئەگەر زانیبایان ناکارن تیسفون بگرن، بە پەلە دەکشانەوە تا ئەو تێشووەی دەستیان کەوتووە لە تالآنکردن، بتوانن دەربازی بکەن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەیان.

کوڕی کەهامە نەیدەزانی ژمارە و توانای ئەو دوو لەشکرەی لە باکور و باشووریەتی چەندە، بەڵام دەیزانی ئەگەر جەنگ ڕووبدات لەوانەیە لە هەردوو لاوە هێرشی بکرێتە سەر، بۆیە لە رێگەی ئەفسەرەکانییەوە ئاگەداری سەربازەکانی کرد تا ئامادە بن بۆ ئەوەی ئەگەر پێویست بکات بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆن و خۆیان لە گەمارۆ بپارێزن. ئەگەر ئەو دووچاری گەمارۆ بووبایە، ناچار بوو بەرەو ڕۆژئاوا بڕوات، ڕۆژهەڵاتی ئەو دیجلە بوو، لەو شوێنەش هیچ بواری بۆ پەڕینەوە نەبوو تا بڕواتە ڕۆژهەڵات و خۆی دەرباز بکات، لای باکور و باشووریشی لەشکری دوژمن بوو، باشترین ڕێگە لای ڕۆژئاوا بوو کە دوای ماوەیەك دەگەیشتە ڕووباری فورات، لەوێندەر بە دواوە ئیدی خۆی بۆ هەر شوێنێك کە ویستبای توانای ڕۆیشتنی دەبوو.

ئاینی هەتاوپەرستی کوڕی کەهامە هێنابووی لەگەڵ پێویستییەکانی ژیانی عارەبانی بیابانشین زۆر دەگونجا، ئەرکی هەر هەتاوپەرستێك بوو تا لە کاتی خۆرهەڵاتدا بێدار بێت، بەڵام ئێرانییان زووتر هەڵدەستان، هەستانی ئەوان هاوکات بوو لەگەڵ یەکەمین قووقەی کەڵەشێری بەربەیان و پێش خۆرهەڵاتن، کەڵەشێر لای ئێرانییان بە پەلەوەرێکی خودان رێز هەژمار دەکرا.

جگە لەوەی ئێرانییان زوو لە خەو هەڵدەستان، لە هەموو لەشکرەکانی جیهان نەریت وابوو کە بەیانی زوو لە خەو ڕابن، هەردوو لەشکرەکەی شاپوور و پەرۆزیش بەر لە خۆرهەڵاتن، دەبووایە تەواوی کاروبارەکانی لەشکرەکەیان ئەنجام بدەن و خێوەتگەکەیان کۆبکەنەوە و خواردنی ڕۆژانەی سەربازەکانیان دابەش بکەن، ئەسپەکانیان زین بکەن و ئەسپی گالیسکەکان ببەستن و ریزەکانی جەنگ ڕێك بخەن، بە شێوەیەك ناوەند و دوو لای سوپا هەبێت، بەمەش هەردوو سوپا هیچ کاریان نەدەما، جگە لە بە جووڵە خستنی سەربازەکانیان.

نادە دەڤەرێکی تەخت بوو، تەنیا هەندێ گردۆڵکە لە لای ڕۆژئاوای هەبوون، ئەگەر کەسێك لێیان ورد ببێتەوە، دەزانێت لە نیشتەکانن، ئەمەش بە هۆی ڕێڕەوی هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات چێ بوون، میزۆپۆتامیا بە گشتیی ناوچەیەکە لە نیشتەنییەکان پێکهاتووە، بە درێژایی ملیۆنان ساڵ ئەو بەرد و نیشتەنیانەی هەردوو ڕووبار هێناویانە، لەو دەڤەرە گردبوونەتەوە، لە سەرەتای چێبوونی ژیان لە زەویدا، جگە لە بەرد هیچی دیکە نەبوو. گردەکانی ڕۆژئاوای دەڤەری نادە، بە ئاوایەك بوون کە ڕێگر نەدەبوون لە بەرانبەر هەڵسووڕانی ئەسپ و گالیسکەکان.

شەوی پێشتر کوڕی کەهامە لە دوورەوە زانی بووی کەوتووەتە نێوان دوو لەشکری باشوور و باکور، بەڵام ژمارە و توانای ئەوانی نەدەزانی. لەگەڵ هاتنی بەرەبەیان، لە دوورەوە ریزەکانی هەردوو لەشکری شاپوور و پەرۆزی بینی و زانی ئەگەر جەنگ ببێت و بەرگری بکات، دەکەوێتە نێوان دوو چەقۆ و سەربازەکانی لەنێو دەچن.

کوڕی کەهامە پیاوێکی ترسنوك نەبوو، شاعیری ناسراوی عارەبان (شەنفەرە) کە دوو سەدە دواتر ژیاوە، دەڵێت: ئەو خودان (ئەتوس، باتوس و لوجوس) بووە و بە یەکێك لە هەڵکەوتووانی عارەبانی داناوە. ئەو سێ وشەیە لە بنەڕەتدا یۆنانین، بۆ یەکەمجار ئەرستۆی مامۆستای ئەسکەندەر سێ سەد ساڵ پێش زاین بەکاری هێناون.

ئەرستۆ وتی: ئەو کەسەی بیەوێت سەرکردەی نەتەوەیەك بێت، پێویستە (ئەتوس، پاتۆس و لۆگۆس) بێت، چوونکە عارەبان پیتی (پ) یان نییە، پاتۆسیان کردە باتوس، لە جیاتی (گ) پیتی (ج)یان دانا و لۆگۆس بوو بە لوجوس. ئەتۆس لە زمانی یۆنانی بە واتای (ڕەوشت) و پاتۆس بە واتای (بوونی جەماوەری) دێت، واتە ئەو کەسەی بکارێت جەماوەر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، لۆگۆسیش بە واتای ئەو کەسە دێت کە هەموو بابەتێك بە بەڵگە وەڵام بداتەوە.

کوڕی کەهامە خەسڵەتی یەکەم واتە ڕەوشتی نەبوو، بەڵام جەماوەری لە خۆی کۆکردبۆوە و دەیتوانی بەڵگەیان بداتێ کە بۆچی پێویستە هەتاو بپەرستن. جگە لەو دوو خەسڵەتە وەك تەواوی عارەبان ئازا بوو، هەروەسا ئەو کەسێکی خودان ئەقڵ بوو، ئەو بەیانییە زانی ئەگەر لەو شوێنە بجەنگێت تا دوا سەربازی لەنێو دەچێت.

کوڕی کەهامە فەرمانی بە سوارەکانی کرد تا هەر سوارێك یەکێك لە سەربازە پیادەکان لەگەڵ خۆی سوار بکات و بڕوات تا پیادەکان نەکەونە سەر ڕێگەی ساسانییەکان، وتی شوێنی بە یەك گەیشتنەوەمان، ڕووباری فورات دەبێت.

ئەسپەکانی لەشکری عارەبان لە رەسەنی ئەسپی عارەبی بوون، عارەبستان سەرەتا ئەسپیان نەبوو، لە شوێنی دیکەوە هاوردە کراون، بە گریمانی زۆر لە ئێرانەوە ئەسپی بۆ رۆیشتووە، بەڵام دوای ئەوەی ئەسپ گەیشتە عارەبستان، لەوێندەر بووە خودان رەسەنایەتی خۆی و ناوی ئەسپی عارەبی لێ نرا.

فەیلەسووف و مێژوونووسی فەرەنسی (ئێرنێست رەنان) کە لە سەدەی نۆزدەیەم ژیاوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر عارەبستان و عارەبان کردووە، خەسڵەتە باش و خراپەکانی عارەبی

بیاباننشینی باس کردووە و لەبارەی عارەبستانەوە دەڵێت: هەر گوڵ و گیا و ئاژەڵێك ببرێتە عارەبستان، دوای ماوەیەك باش و بەهێزتر دەبێت.

گوڵی سوور تا ئەوکاتەی نەبردرایە عارەبستان و ماوەیەك لەوێندەر نەمایەوە و بە ئاو و هەوای ئەویٚ نەژیا، نەبوو بە گوڵێکی بۆن خۆش و بە گوڵی سووری بۆن خۆش ناو نەبرا، هەڵووژەش تا ئەوکاتەی نەچوو بۆ عارەبستان، تامی شیرن و بۆنی خۆش نەبوو، دوای ماوەیەك لە پەروەردەکردنی لەویٚ تام و بوونی خۆشی ئەو ژینگەیەی وەرگرت، هەر میوەیەك کە لە عارەبستان دەست بکەوێت باشتر دەبێت لە هاوتاکەی لە هەر شوێنێکی دیکەی جیهان.

ئەسپی عارەبی کورت و لاواز و سمی ورد و هەناسەی باش بوو، هەروەسا بەرگەی برسییەتی و تینوویەتیی دەگرت.

ئەسپی ئاسایی دوای رۆیشتنی یەرغە بۆ ماوەی تەنیا یەك فەرسەنگ بیٚ توانا دەبوون و دەکەوتن، بەڵام ئەسپی عارەبی توانای بڕینی دە فەرسەنگی بەو شێوەیە هەبوو بۆ بەدووکەوتنی دوژمن یاخۆ غاردان، لە جیهاندا هاوتای نەبوو. کوڕی کەهامە کە توانای ئەسپەکانی خۆی دەناسی، وایدەزانی ئەگەر هەر سوارێك یەك لە پیادەکان ببات ئەوا دەتوانێت لە دەست لەشکری دوژمن هەڵبێت.

شاپووری دووەم و پەرۆزی سەرکردە بە هەمان شێوەی کوڕی کەهامە دەیانزانی لەوانەیە کاتێك ئەو هەست بکات ناتوانێت بەرگری بکات، هەڵدێت و باشترین شوێن بۆ هەڵاتن، لای رۆژئاوا دەبێت، بۆیە شاپوور گالیسکەکانی لە لای راست و پەرۆز لە لای چەپ دانا، لە هەردوو لەشکر گالیسکەکان پانتایی زۆریان داگیرکرد تا بتوانن رێگە لە هەڵاتنی عارەبان بگرن.

سوپای کوڕی کەهامە لەپڕ بەرەو رۆژئاوا کەوتنەڕیٚ و ئەسپە عارەبییەکان وەك تیرێك کە لە کەوان دەردەچێت، کەوتنەڕیٚ، هاوکات گالیسکە جەنگییەکانیش لە لای راستی شاپوور و لە لای چەپی پەرۆز کەوتنەڕیٚ.

کاتێك ریزێك لە گالیسکەی جەنگی ئێرانی دەکەوێتەڕیٚ، جەستەی دوژمن دەخاتە ترسەوە، گالیسکەکان بە چوار ئەسپ دەجوولێن کە وەك ئەژدیهان و لە ئامرازی گواستنەوەی دێو و درەنجەکان دەچن، سەربازە بیٚ ئەزموونەکانیش لە بەرانبەر خێرایی و بەهێزی ئەواندا بە تەواوەتیی دەترسان.

بەم ئاوایە بوون ئەو گالیسکانەی ئەو بەیانییە بۆ رێگرتن لە هەڵاتنی لەشکری کوڕی کەهامە کەوتنەڕیٚ، لە هەریەکەیاندا پاڵەوانێکی ڕاستەقینە دانیشت بوو، هەوساری هەر چوار ئەسپی لە

دەست گرتبوو، گرتنی هەوساری چوار ئەسپ بە راستی پاڵەوانێتی پێویست بوو بۆ ئەوەی بتوانێت چوار ئەسپەکە بخاتەبەر فەرمانی خۆی، لە هەر ئەسپێکدا چەند تیرهاوێژێك دانیشتبوون، دوای ئەوەی کەوتنەڕێ بە خێرایی تیر و بەردیان دەهاویشت.

ئەسپە عارەبییەکانیش بلەز دەڕۆیشتن، بەڵام بە زوویی دەرکەوت ئەوان ناکارن دوو کەسان بە پێکەوە هەڵبگرن و هەمان خێراییان هەبێت کە پێشتر هەیانبوو، هەندێك جار ئەو خێراییە دەگاتە شەست کیلۆمەتر لە دەمژمێرێکدا، بەڵام ئەسپی گالیسکەکان خێرایی خۆیان پاراست، چوونکە هەموویان لە تەنیشت یەکدیی دەڕۆیشتن، بۆیە ئەسپی گالیسکەکان هان دەدران بۆ ئەوەی خێراتر لەوە بڕۆن کە هەیە.

فەرماندەی گالیسکە جەنگییەکان دەیان وت نابێت رێگە بدەن هیچ سوارێکی عارەبان بکارێت لە رێگەکانی باکور یاخۆ باشوورەوە ڕزگاری ببێت، بۆیە بەرەو ئەو لایە گوشاریان دەخستەوە و رێگەی هەڵاتنیان دادەخست.

کاتێك گالیسکەیەك دەگەیشتە عارەبێکی هەڵاتوو، لە پێشەوە داسی گالیسکەکە بەری دەکەوت، سوارەکەی پارچە پارچە دەکرد، ئەوەی پشتیشی بە سەختی بریندار دەبوو یاخۆ ئەسپەکە دەکوژرا و سوارەکان دەکەوتنە ژێر تایەی گالیسکەکان و دەپلیشانەوە، ئەگەر گالیسکەکە لە دواوە بەر ئەسپەکان کەوتبایە، زەبرەکەی زۆر بەهێز نەدەبوو، بەڵام تەنیا پێویست بوو ئەسپەکە بمرێت و سوارەکان بکەونە سەر زەوی، چوونکە دوای کەوتنیان ئەستەم بوو زیندوو بمێنن، ریزەکانی دیکەی گالیسکەکەکانیش لە دوایانەوە هەمدیسان بە سەریان دەکەوتن، ئەوان لەژێر تایەی گالیسکەکان لەتوپەت دەبوون یاخۆ بە شێوەیەك بریندار دەبوون کە توانای هەستانەوەیان نەدەما.

کاتێك ریزی دووەمی گالیسکە جەنگییەکان گەیشتنە ئەسپ سوارانی عارەبان، بە راستی ئەوانی وەك گەڵا هەڵدەوەراند، بۆیە هاواری (ئەمان...ئەمان)یان لێ بەرز دەبۆوە، بەڵام شاپووری دووەم لە تۆڵەی ئەو خەڵکە بێ تاوانانەی بە دەست عارەبانەوە لە ئاوابییەکانی سەر رێگە و دوای خۆبەدەستەوەدان کوژرابوون، فەرمانی کردبوو کەس نەپارێزن و هەموویان بکوژن، بۆیە عارەبان کە ئەوەیان بینی، کەوتنە بەرگریکردن.

شەڕڤانانی عارەبان ئازا بوون، بۆیە بێ سوود خۆیان بە کوشت نەدەدا، کاتێك بیان زانیبایە بەدەستهێنانی سەرکەوتن ئەستەمە، خۆیان بە دەستەوە دەدا، بۆ ئەمەش مەرجیان هەبوو کە نەکوژرێن و هەڵسوکەوتی خراپیان لەگەڵدا نەکرێت و خواردنیان پێ بدرێت، بەڵام شەڕڤانی عارەبان

ئەگەر زانیبای دوژمن مەرجی پەسەند ناکات، تا مردن بەرگری دەکرد و مردنی لا باشتر بوو لە خۆبەدەستەوەدان.

ئەوەشی دەزانی کە لەنێو عارەبستان هەموو دیلەکان دوای ئەوەی وشترەکانیان لێ دەستێندرا، ئازاد دەکران، لەوێندەر نەبووبە نەریت کە دیل بۆ ماوەی درێژ بمێنێتەوە. لە عارەبستان خێڵەکان بەردەوام دژ بەیەك دەجەنگان، زۆرینەی ماڵ و سامان و ئەوەی ئەوان هەیان بوو تەنیا وشتر بوو، ڕاستە خێڵەکان مەڕیشیان هەبوون، بەڵام مەڕ بە سەرمایە هەژمار نەدەکرا، هەموو سزا و خوێنبەهایەك تەنیا بە وشتر دەپێورا و دەدرایەوە.

کاتێك لە نیمچە دوورگەی عارەبان خێڵێك بەسەر خێڵێکی دیکەدا سەردەکەوت، هەموو وشترەکانیان دەبردن و دەبوونە خودان ژنەکانیشیان، بەڵام ئەو دیلانەی لە گەرمەی جەنگدا داوای پارێزگاریان کردبوو، ئازاد دەکران تا بە ئارەزووی خۆیان بۆ هەر شوێنێك دەخوازن بڕۆن کە خۆیان دەیانەوێت، بەڵام هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دیلەکانی نەتەوەکانی دیکەدا بە شێوەیك دیکە بوو، ئەگەر دیلە ناعارەبەکان دەوڵەمەند بووانە، ئازادیان نەدەکردن تا (پارەی خۆکڕینەوە) نەدەن. ئەو دیلانەی توانایان نەبووایە خۆیان بکڕنەوە، دوو شێوە هەڵسوکەوت چاوەڕوانیان بوو، ئەگەر لەنێو خاکی خۆیان پێویستیان پێ بوونایە، کاریان پێ دەکردن، تا کاتی پێویست بوون، دواتر ئازادیان دەکردن، ئەگەر پێویستیشیان بە دیلەکە بۆ کارکردن نەبووایە، ڕاستەوخۆ ئازادیان دەکردن.

سەربازەکانی کوڕی کەهامە کە زانیان ئەوان دەستیان لێ ناپارێزرێت، بڕیاریاندا بەرگری بکەن، بەڵام کات درەنگ بوو، چوونکە ئەوان بلەز ویستبوویان رابکەن، چونکە هەر کەسێك دەیوست تەنیا خۆی دەرباز بکات، بۆیە ئارایشی جەنگیان نەبوو، هەریەکەیان پیادەیەکی لەگەڵ خۆی هەڵ گرت بوو، تەنیا دەیەویست بلەز لە دەڤەری مەترسی دوور بکەوێتەوە، بە هەموو توانا و خێراییەك بەرەو رۆژئاوا دەڕۆیشتن، بۆیە کاتێك بڕیاریاندا بەرگری بکەن، ناچار بوون ریزەکانیان بۆ جەنگ رێك بخەن تا بتوانن خۆیان لە بەرانبەر دوژمن بگرن.

ئاشکرایە بۆ لەشکرێك کە لە هەڵاتندا بێت، ئاسان نییە بکارن بلەز ریزەکانیان یەکبخەن، ئەوە ماوەیەکی زۆری دەوێت. شەڕڤانی عارەبان دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت دەبێت بجەنگن و بەرگری بکەن، زۆر دلێرانە وەستان و کەوتنە جەنگ، بەڵام ئەوان تاك تاك و بێ ریزبوون دەجەنگان، ئەم ئاوایەش بەرگریکردنی نەتەنیا لە پێش گالیسکە جەنگییەکان، بگرە لە پێش هێزی پیادەش سەختە.

بەشێك لە سوارانی کوڕی کەهامە کە فەرمانی بەرگریان پێ نەگەیشت بوو، توانیان خۆیان ڕزگار بکەن، دوای ئەوەی بینیان گالیسکەکانیان بە دووە نییە، بۆ ئەوەی ئەسپەکانیان نەکەون، خێرایی خۆیان کەم کردەوە و بەردەوام بوون لە غاردان تا گەیشتنە فورات، لە ڕێگەی یەکێك لە بوارەکان پەڕینەوە، بەڵام ئەوانەی نەیانتوانی ڕابکەن، دوای ئەوەی زانیان ئەمان نادرێن، هێندە جەنگیان کرد تا کوژران یاخۆ بە سەختی بریندار دەبوون، یەکێك لە بریندارەکانیش، فەرماندەی سوپای عارەبان کوڕی کەهامە بوو.

پێش ئەوەی دنیا تاریك ببێت، جەنگ کۆتایی هات و فەرمانی گەڕانەوەی گالیسکە جەنگییەکان دەرکرا.

مەیدانی جەنگ هێندە شڵەژاو بوو کەس نەیدەتوانی پێی رابگات، ئەسپی بەرەڵای شەڕڤانانی عارەبان زۆر بوون، بەرەو رۆژهەڵات دەڕۆیشتن، چوونکە ئەسپ بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات کە لێی هاتووە، گالیسکەکانیش هەر ئەسپێکیان بینیبایە، هەوسارەکەیان لە گالیسکەکە دەبەست و لەگەڵ خۆیان دەبرد.

وێڕای ئەوەی شاپوور فەرمانی کوشتن و دەست نەپاراستنی بۆ شەڕڤانانی عارەبان دەرکردبوو، بەڵام رۆژی دواتر فەرمانی کرد تا بچن، بریندارەکانیان بهێنن بۆ ئەوەی تیمار بکرێن، یەکێك لە بریندارەکان کوڕی کەهامە بوو.

فەرمانی شاپوور بەرانبەر دیلانی عارەبان بە پێوەرەکانی ئەو سەردەمە نها مایەی ڕەخنە بوو، کاتێك یەکێك خۆی رادەست دەکات، نابێت بکوژرێت، هەروەسا شێوەی هەڵسوکەوتیش لە بەرانبەر دیلەکان دەبێت باش بێت و نابێت کاری بێ مووچەیان پێ بکرێت، بەڵام ئەو فەرمانە بەر لە شازدە سەدە دەرچووە، ئەوکات نەریت و یاساکان وەك ئێستە نەبوون، ئەو فەرمانە بۆ لەشکرێك دەرچوو بوو کە بەپێی یاساکانی جەنگ نەجووڵابۆوە.

تا لە مێژوودا بەرەو دوا بگەڕێینەوە دەبینین لە جەنگەکاندا ئەگەر شارێك جەنگی نەکرد بێت، لەلایەن لەشکری هێرشبەر دەپارێزرا و دوژمن خەڵکی ئەو شارەی دووچاری تاڵان نەدەکرد و پیاوەکانی نەدەکوشتن و دیلی نەدەکردن و بنەماڵەکانیانی لێك دانەدەبڕاندن، تەنانەت دەسەڵاتدارە ئاشوورییەکانیش کە باسی خوێن ڕشتنەکانی ئەوان لە کەتیبەکاندا هاتووە و بە یادگار ماوەتەوە، خەڵکی شارێکیان نەدەکوشت کە بەرگریان نەکردبایە، بەڵام کوڕی کەهامە کاتێك لەشکرکێشیی کرد، وێڕای ئەوەی خەڵکی ئاوایی و شارەکانی سەر ڕێگەی بانگەشەی خۆبەدەستەوەدان و شەڕ نەکردنیان دەدا، بەڵام ئەوانی تاڵان دەکرد و پیاوەکانی دەکوشتن.

لە دووەمین جەنگی جیهانی کاتێك هیتلەر فەرەنسای داگیرکرد، نیشتمانپەروەرە فەرەنسییەکان لە پشتەوە هێرشیان دەکردە سەر سەربازە ئەڵمانییەکان و دەیان کوشتن.

هیتلەر فەرمانی کرد لە بەرانبەر کوژرانی هەر سەربازێك، پێنج پیاوی بێ تاوانی فەرەنسی گوللە باران بکرێت[٨]، کاتێك کوژرانی سەربازەکانی ئەڵمان لەلایەن فەرەنسییەکان دووبارە بۆوە، فەرمانی کرد ژمارەکە بکەن بە پەنجا پیاو لە بری هەر سەربازێك. نابێت دووچاری سەرسووڕمان بین کە رای گشتیی ئەوکات زۆر سەرزەنشی هیتلەری نەکرد بۆ ئەو کارەی، واهەست دەکرا کە هیتلەر لە بەرانبەر کوژرانی سەربازەکانی تووڕە و بێزار بووە و تۆڵە لە نیشتمانپەروەرە فەرەنسییەکان دەکاتەوە. مارشاڵ پیتەن سەرۆکی فەرەنسا بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە داوای لە نیشتمانپەروەرەکان دەکرد تا چیدی سەربازی ئەڵمانی نەکوژن، بۆ ئەوەی پیاوە بێ تاوانەکانی وڵاتەکەی نەکوژرێن.

کاتێك بریندارەکانیان لە مەیدانی جەنگی نادە بۆ دواوە و بۆ نێو لەشکرەکانی ساسانی گواستەوە، دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەوان، بۆ ئەوەی بۆیان دەرکەوێت چییان لەو کەرەستە و پارانە کردووە کە لە ئێرانییانیان بە تالان بردووە، چوونکە ئەوەی لە مەیدانی جەنگ لە عارەبان گیرابوو زۆر کەمتر بوو لەوەی ئەوان بردبوویان، بۆیە شاپوور و پەرۆز وایان بیر دەکردەوە کە ئەوان ئەو کەرەستە و زێڕانەیان یاخۆ بۆ عارەبستان گواستۆتەوە یاخۆ لە شوێنێکی دیکە حەشاریان داوە بۆ ئەوەی دواتر بیانگوازنەوە، چوونکە لێکۆڵینەوەیان لەو بارەوە دەکرد، پێویستیان بە ئەوە بوو ناوی بریندارەکان و خێڵەکانیان بزانن.

کوڕی کەهامە دەیزانی ئەگەر بیناسن، بە دڵنیاییەوە دەکوژرێت، بۆیە ناوی خۆی گۆڕی و وتی شەڕڤانێکی ئاساییە. ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بریندارەکان دەکرد بە شاپووریان ڕاگەیاند کە نابێت ئەو کەسە شەڕڤانێکی ئاسایی بێت، چوونکە زرێیەکی زۆر جوان و ڕازاوەی لە بەردایە، بە دڵنیاییەوە دەبێت لە مەزنانی سوپاکە بێت، شەڕڤانێکی ئاسایی ناکارێت ئەو جۆرە زرێیانە لەبەر بکات. چوونکە هەندێك جار دوو ساڵ ماوەی پێویستە بۆ چێکردنی زرێیەکی لەو شێوەیە،

---

(٨) بە داخەوە زەبیحوڵڵا بەردەوام لە دوای پاساوهێنانەوەیە بۆ کارە خراپەکانی پاشاکانی ئێران لە کاتی ئەنجامدانی تاواندا، بۆ بەرگری لە ئەوان تاوانەکانی هیتلەر باس دەکات، بۆ جوامێریش لەبارەی ئەو پاشایانەوە بەردەوام دەبێت لەسەر درێژدادڕی، لە کاتێکدا هەموومان دەزانین هیتلەر و خەڵکانی وەك ئەو تاوانباری جەنگ و بکوژن. "وەرگێڕی کوردی"

ئەو زرێیانە هەرچەندە زریف بوون، بەڵام بەهێز بوون و بەرگەی زەبری شمشێریان دەگرت و خاوەنەکەیان لەو زەبرانە دەپاراست.

شاپووری دووەم فەرمانی کرد تا بریندارەکە بێنن بۆ لای ئەو، چوونکە ڕووخساری خوێناوی بوو، فەرمانی کرد بیشۆن، دوای ئەوەی ڕووخساری دەرکەوت، ریشی تاشی بوو، شاپوور بەپێی ئەو باسانەی سیخووڕەکانی بۆیان کردبوو، ئەوی ناسی و زانی کوڕی کەهامەیە. ڕەنگە پێویست نەبێت بگوترێت، بەڵام ریش تاشین لەنێو عارەبان پێشتر باوبوو، هەتا ئەو دەمەی جەنگیان لە دژی ئێرانییان بەرپاکرد ریش هێشتنەوە تایبەت بوو بە ئێرانییان، هەر بۆیە ڕیش هێشتنەوە لە ئێرانیانەوە رۆیشت بۆ نێو عارەبان.

رۆژی دواتر دوای ئەوەی شاپوور لە کارەکانی جەنگی رۆژی پێشتر رزگاری بوو، داوای کرد بۆ ئەوەی کوڕی کەهامە بێنن بۆ لای.

پزیشك پێی وت کە ئەو بە هۆی داسی گالیسکەوە بریندار بووە و خوێنی زۆری لەبەر رۆیشتووە و لە دۆخێکی باشدا نییە و تای لێیە، ئەوکات دەوترا ئەگەر بریندارێك تای هەبێت، زیندوو نامێنێت و دەمرێت. پزیشکەکانی ئەوکات نەیاندەزانی ئەگەر بریندار تای بێتێ، نیشانەی هەوکردنییەتی، بەڵام ئەزموون ئەوانی فێر کردبوو کە لەوکاتەدا دەمرێت.

شاپوور پرسیاری کرد: ئەو چەندی دیکە دەژیت؟.

پزیشك وتی: بە باوەڕی من ئەو تا دوو رۆژی دیکە بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

کوڕی کەهامەیان بۆ لای شاپوور هێنا، ئەو لە دۆخێکدا نەبوو کە بکارێت بە تەواوەتیی لەگەڵیدا بپەیڤێت، تەنیا پێی وت: (ئەی کابرای عارەب، من بەپێی نەریت و ئایینی خۆم بەردەوام بەزەییم بە دوژمنە شکست خواردووەکانمدا هاتووەتەوە و نەمکوشتوون، بەڵام تۆ مافی بەزەیی پێدا هاتنەوەت نییە، چوونکە شوێنکەوتووانی من وێڕای ئەوەی لەگەڵ تۆ نەجەنگان و خۆیان بەدەستەوەدا، ئەوانت کوشت، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ بریندااری ناتکوژم).

کوڕی کەهامە هیچ بەرسڤی نەبوو، ئەویان لە لای شاپووری دووەم بردە دەرێ، وەك پزیشك وت بووی، دوو رۆژی دواتر مرد، بەم ئاوایە دووەمین هێرشی مەزنی عارەبان بە شکست کۆتایی هات.

# شکستی قوستەنتینی دووەم

باسمان لە جەنگی ساسانییەکان و ڕۆمی بچووك لە سوریا کرد، وتمان بارانی توند هات و ڕێگر بوو لە لەنێوچوونی لەشکری ڕۆم و دۆخی جەنگی گۆڕی، دواتریش شاپووری دووەم فەرمانی گەڕانەوەی لەشکرەکەی دەرکرد کە لەگەڵ ڕۆمی بچووك دەجەنگان.

ماوەیەکی کەم دوای ئەو ڕووداوە قوستەنتینی دووەم کوڕی قوستەنتینی یەکەم و ئیمپراتۆری ڕۆمی بچووك، لیژنەیەکی دەسەڵات پێدراوی بۆ ئاشتی ناردە لای شاپووری دووەم و دەسەڵاتیی مۆرکردنی پەیماننامەی ئاشتی بە ئەوان بەخشی.

قوستەنتینی دووەم لە پیاوە دیارەکانی سەردەمی خۆی بوو، باڵای نێزیکەی دوو مەتر دەبوو، لە یەکەمینساڵی دەسەڵاتی خۆیدا یۆنانی داگیرکرد، لە دووەمین ساڵی دەسەڵاتەکەیدا تەواوی وڵاتەکانی باشووری ئەورووپای کردە ژێردەستە و باجی لێ وەرگرتن، واتە ئەو وڵاتانەی کەوت بوونە نێوان ڕۆم و یۆنان، بەم ئاوایە سنووری گەیشتە سنووری ئیتاڵیا یاخۆ ڕۆمی مەزن.

قوستەنتینی دووەم وەك باوکی لەسەر ئاینی کریستیان بوو، ئەو سۆزی بۆ تەماشاکردنی سێرك هەبوو، بە فەرمانی ئەو گلادیاتۆرەکانیان لەو سێرکانەدا دەخستە بەرانبەر یەك بۆ جەنگ و لە قوستەنتینە بە فەرمانی ئەو شوێنێکی مەزنیان بۆ پەروەردەی گلادیاتۆرەکان چێ کرد.

ئاخۆ چۆن پیاوێکی ئاوا ئازا و سەرکەوتوو و بە دەسەڵات لە ئەورووپادا ویستیی ئاشتی لەگەڵ شاپووردا بکات؟، وەڵامەکەش ئەوەیە کاتێك ڕۆمی مەزن بینیان ڕۆمی بچووك بۆتە دراوسێیان، زۆر ترسیان لێ نیشت و فەرمانی کۆکردنەوەی لەشکریان بۆ جەنگی ڕۆمی بچووکیان دەکرد، ئیمپراتۆری ڕۆمی بچووك کاتێك زانی جەنگێکی گەورەی لە پێشە، پێشنیازی ئاشتی بۆ شاپووری دووەم کرد، بۆ ئەوەی ڕێگە لە هاوپەیمانیی نێوان شاپوور و ڕۆمی گەورە بگرێت ئەگەر هەوڵی لەنێوبردنی ئەوان بدەن، چوونکە باوەڕی وابوو کە شاپوور

ئەو هاوپەیمانییە پەسەند دەکات، لە راستیشدا شاپوور ئەوەی دەکرد بۆ ئەوەی بە یەکجاری رۆمی بچووك لەنێو بچێت.

قوستەنتینی دووەم بۆ ئەوەی لە پشتەوە هێرشی نەکرێتە سەر و لە مەترسی ئێران ئاسوودە بێت، پێشنیازی ئاشتی کرد و پەسەند کرا، ئاشتی لە تیسفون مۆر کرا، بەڵام هەر کە مەترسی رۆمی مەزن بۆ سەر رۆمی بچووك نەما، رێککەوتننامەکە لەلایەن قوستەنتینەوە پێشێل کرا، ئەو رێبازەی قوستەنتین (رێککەوتننامە لە کاتی ترس و شکاندنی لە کاتی نەمانی هەڕەشەکان) بە میرات بۆ تەواوی پاشاکانی رۆمی بچووك مایەوە تا ڕووخانی ساسانییەکان، دواتر هەمان رێباز لەلایەن رۆمی بچووك بەرانبەر بە عارەبانیش هاتە کایەوە کە ببووە هاوسنووری تازەی ئەوان و بە هەمان شێواز لەکاتی پێویستدا ئاشتییان لەگەڵ عارەبان دەکرد، دواتر بە نەمانی مەترسییەکان رێککەوتننامەکەیان پێشێل دەکرد.

فیردەوسی لە شانامەدا لە باسی بەسەرهاتی پاشای ساسانی (خەسرەوی پێنجەم) ناسراو بە ئەنۆشیروان، بە هێراکلیۆس ئیمپراتۆری رۆمی بچووك دەڵێت:

"تو گر قیصر روم و گر مهتری بر ایرانیان می نکن داوری
ندانی که ایران نشست من است جهان سربەسر زیردست من است
پلنگ ژیان ارچه باشد دلیر نیارد شدن نزد چنگال شیر
تو زان مرز یك رش منه پیش پای چون خوداهی که پیمان بماند بەجای
اگر بگزری زین سخن بگزرم سر و گاه تو زیر پی بسپرم"(٩)

بە وتەی فیردەوسی، ئەنۆشیروان دەیزانی قەیسەری رۆم پێشێلی رێکەوتننامەی ئاشتی دەکات، بۆیە ئەو نامەیەی بۆ ناردووە.

لە پەیماننامەی ئاشتی نێوان قوستەنتین و شاپووردا نووسرا کە وڵاتی ئادیابێن دەبێتە هی ئێران و رۆمی بچووك هیچ داوایەکی لەسەر نابێت. ئادیابێن کەوتبووە میزۆپۆتامیای باکور و بۆ ساسانییەکان زۆر گرینگ بوو، لە تیسفونیش زۆر نێزیك بوو. ئەگەر لە دەست رۆمی

---

(٩) واتە: ئەگەر تۆ قەیسەر یاخۆ مەزنتری، بۆت نییە گەورەی ئێرانییان بی. نازانی ئێران جێگەی منە و هەموو شتێك لەبەردەستی منە. هەرچەندە پڵنگ ئازا بێت، ناکارێت بەرانبەر بە شێر بوەستێت. ئەگەر دەتەوێت پەیماننامەی ئاشتی وەك خۆی بێت، بە ئەندازەی یەك باسکت سنوور مەبەزێنە. ئەگەر سنوور بەزێنی، منیش لە وتەکانم پاشگەز دەبمەوە و لاشەت دەخەمە ژێر پێی فیلەوە. "وەرگێڕی کوردی"

بچووك بووایە، بەردەوام دەبووایە شاپوور بۆ پارێزگاری لە تیسفون، سوپایەکی بەهێز لە سنووری ئەو وڵاتە دابنێت تا مەترسی داگیرکردنی تیسفونی لە ئارادا نەبێت، بەڵام دوای ئەوەی ئەو وڵاتە بوو بە هی ساسانییەکان، لەو بابەتە بێ ترس بوون.

ساڵی (٣٣٩ ز) لە بەشێك لە ئێران باران نەباری، کێڵگە دیمەکارەکان زۆرینەیان بە هۆی نەبوونی ئاو سووتان، پێشبینیی دەکرا بەشێك لە کارێزەکانیش بە هۆی کەمبوونەوەی ئاوی ژێر زەوی وشك بکەن، بەڵام شاپووری دووەم لەو قاتوقڕییە ترسناکەی لە سەردەمی گەنجیدا لە ئێران ڕوویدا بوو، ئەزموون و وانەی باش و پێویستی وەرگرتبوو، بۆیە لە وشکەساڵی نەدەترسا و بەردەوام دانەوێڵەی پێویستی لە ئەمبار و سایلۆکانیدا هەبوو.

هێرتسفێڵد دەبێژێت: (دانەوێڵەی ئەمبار و سایلۆکانی ئێران لە سەردەمی شاپووری دووەم هەر چوار ساڵ جارێك نوێ دەکرانەوە و پێویستیان بە نوێکردنەوەی ساڵانە نەبوو، چوونکە سایلۆکان لە بەردی تاشراو چێ کرابوون، گەنم تیایاندا تێك نەدەچوو و نەدەکەوتە بەر هێرشی مشك و مێرووەکان، بەڵام ئەگەر بە هۆی وشکەساڵییەوە ناچار بە دەرهێنانی هەندێ گەنم ببووانایە، ساڵی دواتر ئەو بەشەیان پڕ دەکردەوە، بە پێچەوانەوە هەر چوار ساڵ جاریچك گەنمەکەیان لە ئەمبارەکان نوێ دەکردەوە.)

هەرچەندە ساڵی (٣٣٩ ز) وشك بوو، بەڵام ئێرانییان دووچاری نەبوونی نان و هەویر نەبوون، هەویر هەر ئەوەی کە ئێستە لە ئەورووپا بە پات[١٠] ناو دەبرێت، هەروەسا لە ئێران و زۆر اشوێنی دیکە بە ماکەرۆنی ناسراوە.

---

(١٠) پێمانوایە یەکەمجارە بگوترێت کە ئێرانییان لە سەردەمی ساسانییەکان پاتیان خواردووە، بەڵام پاتی ئەوان بە شێوەی ماکارۆنی نها نەبووە و لە شێوەی پارچەی بچووك بووە وەك ئەوەی نها لە ئەمەریکا دەخورێت. بە بڕوای هەندێ کەس ماکارۆنی خواردنی نەتەوەیی ڕۆمەکان بووە و خەڵك لە ئەوانەوە ئەو خواردنە فێربوون، ئەو کەسانەی زانیارییان لە بارەی خواردنە ئێرانییە کۆنەکان نییە، پێویستە ئەمە بزانن ئێرانییەکان جۆرە خواردنێکی وەك ماکارۆنی بە ناوی ڕشتەیان (لە کوردی دەبێتە هەڕشتە) هەبوو،کە لەگەڵ خواردەمەنی دیکە ئامادە دەکرا،ب ەڵام پات بە شێوەی جیا ئامادەکراوە و تێکەڵ بە خواردنی دیکە نەکراوە و هەویری پاتیشیان لەگەڵ کەشك یاخۆ پەنیر دەخوارد.

زاراوەناسەکان دەزانن وشەی پات کە لە زمانە ئەورووپاییەکان بە ماکارۆنی دەووترێت، ڕەگی لە فارسییە و ئەگەر لێکۆڵینەوەی ورد بکرێت لەبارەی خواردنێکی دیکەی ئەورووپاییەکان بە ناوی کالْباس، دەزانرێت

لە بەهاری ساڵی (٣٤٠ ز) هەواڵیان گەیاندە شاپووری دووەم کە لەشکرێك لە ئازەربایجان نێزیك دەبێتەوە، لە زانیارییەکاندا وترابوو کە ئەو لەشکرە ژمارەیەکی زۆر ئاڵایان پێیە کە لە شێوەی هەڵۆدان و لەلایەن ئەو سەربازانەوە هەڵگیراون کە پێستەی پڵنگیان لەبەردایە، ئەوەش بە واتای ئەوە بوو کە لەشکرەکە هی رۆمە.

ئاڵای هەڵۆ لە لەشکری رۆم هەڵدەکرا، برێتی بوو لە پەیکەری هەڵۆ کە بە داری درێژەوە دەبەسترا و بەرزدەکرایەوە. ئەو ئاڵایە تایبەت بە لژیۆنەکانی رۆمی مەزن و دوای دروست بوونی رۆمی بچووك، ئەوانیش ئەو ئاڵایەیان کردە هێمای خۆیان و هێماکە لەلایەن کەسێکەوە هەڵدەگیرا کە نیوە باڵاپۆشێکی لە پێستی پڵنگی لەبەردەکرد.

کاتێك ئەو هەواڵە بە شاپوور گەیشت بە تەواوەتیی دووچاری سەرسوورمان هات، چوونکە تا ئەو کات هەر لەشکرێکی رۆمی بچووك یاخۆ گەورە بەرەو ئێرات هاتبا، بەپێی هەڵکەوتەی جوگرافی و بۆ ئەوەی لە ئاوەوە دوور نەبێت، لە رێگەی فوراتەوە دەهات. ئەمە یەکەمجار بوو کە لە رێگەی قەوقاز بەرەو ئازەربایجان بێن. چوونکە شاپوور رێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ قوستەنتین هەبوو، بیری کردەوە کە دەبێت قوستەنتین مردبێت و جێنشینەکەی بەرانبەر بە رێککەوتننامەکە خۆی بە بەرپرس نەزانێت، لەوانەشە جێنشینی قوستەنتین هێندە بلەز جووڵابێتەوە کە دەرفەت نەبووبێت هەواڵی مەرگی قوستەنتین بۆ شاپوور بێت.

شاپوور تێگەیشت پێویستە دەستبەجێ بە لەشکرێك بەرەو قوستەنتین بڕوات و شاندێکیش بۆ رۆم بنێرێت تا ڕوونکردنەوەی بدەنێ لەبارەی لەشکرکێشی ئەوان. پاشای ساسانی کارێکی نەکرد بوو کە پێچەوانەی رێککەوتننامەی ئاشتی بووبێت.

شاپوور شاندەکەی دیار کرد و کەسێکی بە ناوی (فەرهاد سەرد) کردە سەرۆکی ئەو شاندە بۆ ئەوەی لە رێگەی سووریاوە بچنە قوستەنتین و دوای گەیشتنیان بە شاری سوور بە کەشتیی بەرەو قەستەنتین بڕۆن تا زووتر بگەنە ئەو شارە.

دواتر شاپووری دووەم لەگەڵ سوپایەکی بەهێز بەرەو ئازەربایجان رۆیشت و فەرماندە مەردان شیرازیشی لەگەڵ خۆیدا برد کە پیشتر ئەزموونی لە جەنگی رۆمی بچووك وەرگرت بوو، بەڵام قوستەنتینی دووەم بێ بەهەند وەرگرتنی یاسای رێککەوتننامەی ئاشتی، بۆ جەنگ

---

ئەورووپاییەکان نەریتی ئامادەکردنی ئەو خواردنەیان لە ئامادەکردنی قاورمە وەرگرتووە کە لەنێو ریخۆڵە دادەنرا بۆ ئەوەی رێگە لە بۆگەن بوونی لە ماوەی کەمدا بگیرێت. "زەبیحوڵڵا"

دژی شاپووری دووەم بەرێکەوت بوو، بە دوو هۆکار بە ڕێگەی قەوقازیادا لە ئێران نێزیك کەوتەوە کە برێتی بوون لە:

یەکەم: پاشای ئەرمەنستان ببوو بە هاوپەیمانی ئەو و لەشکرەکەی ببوو بە بەشێك لە لەشکرەکەی قوستەنتین، بۆ ئەم یەکگرتنەش پێویست بوو بۆ ئەوەی لە ڕێگەی باکورەوە هێرش بکاتە سەر ئێران.

دووەم: ئەو دەیزانی هەر لەشکرێکی ڕۆم لە ڕێگەی ڕۆژئاوا بەرەو ئێران چووە، نەیتوانیوە سەرکەوتوو بێت یاخۆ لەشکرەکە لێك پرژاوە یان بە ناچاری وەك لەشکری درۆتۆس پاشەکشەی کردووە، چوونکە ساسانییەکان لە جەنگی ڕۆمەکان لە میزۆپۆتامیا بە تەواوەتیی شارەزا بوون و بست بە بستی ئەو پێدەشتەیان دەناسی، بەڵام ئەگەر لەشکرێك لە باکورەوە هێرش بکاتە سەر ئێران، ئەوان لە دەڤەرێك دەگەنە لەشکری ڕۆم کە تواناییان نابێت سوود لەو ئامێر و توانا و کەرەستانەیان وەربگرن کە لە پێدەشتەکان سوودیان لیێ بینی بوون.

یەکەمین ئەزموونی جەنگی ڕۆمی بچووك و ساسانییەکان، بۆ قوستەنتینی ڕوون کردەوە شاپووری دووەم بە لەشکری بەهێزەوە بۆ جەنگ دێت، بۆ سەرکەوتن بەسەریدا پێویستە لەشکری بەهێز هەبێت، بۆیە لە ڕۆم دوازدە لژیۆن سەربازی هێنا و لە ئەرمەنستانیش سی هەزار سەربازی ئەرمەنی کەوتە پاڵ سوپاکەی و سەرجەمی سوپاکەی (١٠٢) هەزار سەرباز بوو.

سەربازەکانی پاشای ئەرمەنستان لە ڕووی ڕێکخستن و پێداویستیی سەربازی هاوشێوەی لژیۆنەکانی ڕۆمی بچووك بوون.

دەبێت ئەو خاڵە بگوترێت کە لژیۆنەکانی ڕۆمی مەزن خۆیان بە خودان مێژووی شکۆمەند دەزانی، هەندێك لە ئەوان شانازی سەربازی زۆریان هەبوو، تەمەنی هەندێکیان نێزیکەی حەوت سەدە بوو، واتە لە چوارسەدەی پێش زاین تا ئەوکات بەردەوام بوون، بەردەوام سەرباز و ئەفسەرەکانیان نوێ کرابوونەوە، لە نێزیکەی سەد و پەنجا جەنگدا ئەو لژیۆنانە بەشدار ببوون، بۆیە کاتێك دەجەنگان هەوڵیان دەدا بەرانبەر بە پێشینانی خۆیان لێهاتوو بن، بەڵام ئەو شکۆمەندییە لە لژیۆنەکانی ڕۆمی بچووك و ئەرمەنستاندا نەبوو، تەنیا فەرماندەی لەشکری قوستەنتینی دووەم کەسێکی لێهاتوو و بە ئەزموون بوو.

شاپووری دووەم هەوڵی دەدا بەر لەوەی قوستەنتین لە ڕووباری ئاراس بپەڕێتەوە پێشی بگرێت، بەڵام کات دەرفەتی پێ نەدا و قوستەنتین لە دووەمین مانگی بەهار و لە وەرزی سەرکێشی و هەڵکشانی ئاودا گەیشتە کەنارەکانی ڕووباری ئاراس.

ڕووباری ئاراس لە ڕۆژئاوا بەرەو ڕۆژهەڵات دێت، بۆیە ئاوەکەی خێرایە، تەنانەت لە وەرزی کەم ئاوی و پاییزدا کە ئاو دەگاتە کەمترین ئاستی خۆی، ئەو ڕووبارە یەکجار بەخووڕەن لە وەرزی بەهاریش خێراییەکەی دەگاتە بەرزترین ئاست، وێڕای هەموو ئەوانە قوستەنتینی دووەم توانی لە هەمان وەرز لەشکرەکەی لە ئاراس بپەڕێنێتەوە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئەو سەردارێکی لێهاتووە.

قوستەنتین دوای ئەوەی لە ئاراس پەڕییەوە، دەیتوانی دوو شاری مەزن و ئاوەدانی ئازەربایجان کە برێتی بوون لە تەورێز و ورمێ داگیر بکات، کە گەورەتر و ئاوەدانتر بوون لە شارەکانی دیکەی ئەو دەڤەرە، بەڵام ئەو وای نەکرد و کاتی خۆی بە داگیرکردنی شارەکانی ئازەربایجان بە فیڕۆ نەدا.

ئەو دەیویست بە زووترین کات بگاتە شاپوور و دووچاری سەر لێشێوانی بکات، ئەگەر سەردارێکی دیکە بووایە، بەشێك لە هێزەکەی وەك پاسەوان لە پشتەوە دەهێشتەوە بۆ ئەوەی پێوەندیی بە ڕێگەی هاتنییەوە نەپچڕێت، بەڵام قوستەنتین دەیزانی لەشکرەکەی بەهێزە و ئەگەر بڕیاری کشانەوە بدات، هیچ لەشکرێك ناکارێت ڕێگەی لێ بگرێت، بۆیە هیچ هێزێکی وەك پاسەوان بەجێ نەهێشت، چوونکە بە لەشکرێکی ١٠٢ هەزار کەسی دەیتوانی هەر ئاستەنگێك لەسەر ڕێگەکەی لاببات، بۆیە بە هێشتنەوەی هێزی پاسەوان، لەشکرەکەی خۆی لاوازتر نەکرد.

ئیمپراتۆری ڕۆمی بچووك باری خۆی بە هێنانی خواردن و ئالیك قورس نەکرد، چونکە دەیزانی ئازەربایجان ناوەندی هەڵگرتنی دانەوێڵەی ئێرانە و دەکرێت لە ئەو دەڤەرە خۆراکی لەشکرێکی ٥٠٠ هەزار کەسی دەست بکەوێت، تەنیا لە پێش خۆیەوە دەستەی ئالیك و خواردنی دەنارد بۆ ئەوەی لە مەوداکانی نێزیکدا کۆگەی بچووك بۆ خواردن و ئالیك دابنێن.

لە کاتی هاتنی قوستەنتین بۆ ئازەربایجان، خەڵکی ئەوێ بە زمانی فارسی دەئاخڤین، لێ بە زاراوەی فارسی ئازەری دەپەیڤین کە زاراوەیەکی خۆجێیی بوو. هەندێك پێیان وایە ئازەری زاراوەیەکی تورکی بووە، تەنانەت دوای هاتنی ئیسلام و تا هاتنی تیرەکانی تورك و

سەلجووقییەکان بۆ سەر تەختی پاشایەتیی ئێران، ئەوان بە زاراوەی فارسی ئازەری دەئاخڤین، دوای هاتنی ئەو دەسەلاتانە، تورکی بوو بە زمانی فەرمی ئەوان.

ئەو سەربازانەی لەگەڵ قوستەنتینی دووەم هاتبوونە نێو ئێران، بە سێ زمان دەئاخڤین، ئەوانەی لە لژیۆنەکانی رۆم بوون بە هەردوو زمانی رۆمی و یۆنانی دەئاخڤین، ئەوانەی بە یۆنانی دەدوان، دانیشتووانی دەڤەرەیلی دەوروبەری بیزەنتیۆم بوون کە نەتەوە رۆژهەلاتییەکان لە مێژووەکانی خۆیاندا بە ئاسیای بچووك ناویان دەبەن.

هێشتا زمانی رۆمی کە قوستەنتینی یەکەم و کوڕەکەی پێی دەئاخڤین لە بەرانبەر زمانی یۆنانی لەنێو نەچوو بوو، بەلام دوای پەنجا ساڵ هیچ شوێنەواری زمانی یۆنانی نەما، هەموو خەڵك تەنانەت پاشاکانیش بەو زمانە دەدوان. سێیەم زمانی نێو لەشکرەکەش زمانی ٣٠ هەزار سەربازی ئەرمەنستان واتە ئەرمەنی بوو کە لەگەڵ لەشکری رۆمی بچووك کەوتبوون.

ئەوکات لە ئازەربایجان خەڵکی خوێندەوار زمانی رۆمەکانیان دەزانی، چوونکە ئەو زمانە تاکە زمانی دەرەکیی بوو کە لە فێرگەکاندا دەخوێندرا، پێویستە ئەوەش بگوترێت کە تەنیا چینە بالاکانی کۆمەڵگە مافی خوێندنیان هەبوو، جووتیار و پیشەوەرەکان بۆیان نەبوو خوێندەوار ببن.

ئەگەر ڕێڕەوی رۆیشتنی سوپای قوستەنتین بخەینە بەرچاومان دەبینین رێك بە ناوەندیی تەورێز و دەریاچەی ورمێدا دەڕۆیشت، ئەگەر کەمێك بەرەو رۆژهەلات رۆیشتبووایە، دەیتوانی تەورێز داگیر بکات، ئەگەر بەرەو رۆژئاواش رۆیشت بووایە، دەیتوانی ورمێ داگیر بکات، بەلام ئەو نە بەرەو رۆژئاوا، نە بەرەو رۆژهەلات نەڕۆیشت.

ئەو شارەی ئێستە بە ورمێ ناسراوە، ئەو کات و لە سەردەمانی کۆن بە ناوی ئەو دەریاچەیەی لە کەناری بوو، واتە (چیچەست) ناودەبرا، بەلام دواتر ناوی شارەکە گۆڕا، بێ ئەوەی ناوی دەریاچەکە بگۆڕێت، دواتر بەرەبەرە بە تێپەڕ بوونی کات، ناوی دەریاچەکەش گۆڕا بە هەمان ناو و بووە ئۆر ـ میە.

قوستەنتین بۆیە رێگەی خۆی بە ناوەندیی تەورێز و ورمێدا هەڵبژارد، چوونکە نەیدەویست لە رێگەی خۆیدا ڕووبەڕووی هیچ یەکێك لە خێڵە کوردەکان ببێتەوە.

ئەو ئەگەر لە ئازەربایجان بەرەو رۆژهەلات یاخۆ رۆژئاوا رۆیشت بووایە، دەگەیشتە ناوچەی خێڵە کوردەکان و بە دەست ئەوانەوە گرفتار دەبوو، ئەوان ئەگەر توانای ڕاگرتنی لەشکری

ڕۆمیشیان نەبووایە، بۆ ئەو لەشکرە دەبوونە مایەی سەختی و زیانی زۆر، بۆیە ئەو بۆ پاراستنی لەشکرەکەی لە دەست کوردەکان ئەو ڕێگەیەی گرتەبەر.

مێژوونووسە ئەرمەنییەکان ژمارەی خێڵەکانی نەتەوەی کوردیان لە ئێران بە (٣٠) خێڵ دیار کردووە کە لە ناوچەکانی ئازەربایجان و کوردستان و کرماشان ژیاون، ئێستە دەزانین ژمارەی ئەو خێڵانە لە (٣٠) پترن[١١]. نها هەرچەندە ئەو ناوچانەی بە دەست کورد ماوەتەوە کەمترە، بەڵام هێشتا لە ٣٠ خێڵ پترن. نەتەوە دەرەکییەکان لە سەردەمانی کۆن بەردەوام لە خێڵەکانی ئێران ترساون، ئەو ترسە تا دووەمین جەنگی جیهانیش بەردەوام بوو، وینستۆن چەرچڵ لە بیرەوەریەکانیدا نووسیویەتی کاتێك ئێرانمان داگیرکرد، هەوڵماندا پەیمانی دۆستایەتی ناسراو بە پەیمانی سێ لایەنە مۆر بکەین تا خێڵەکانی ئێران بزانن دەوڵەتەکەیان دۆستی ئێمەیە و بۆ لەشکرەکانمان نەبنە مایەی سەختی و ڕەنج.

لە ڕۆژی حەفتایەمینی بەهاری ساڵی (٣٤٠) زاینیدا دەستەی پێشەنگ و بەرپرس لە ئالیکی لەشکری شاپوور لە کەناری ڕووباری (تەلخ ڕوود) کە لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا دەڕوات و دەڕژێتە نێو دەریاچەی ورمێ، گەیشتە دەستەی خۆراك و ئالیکی ڕۆمی بچووك کە لە کەناری لای راستی ڕووبارەکە بوون، ئەوانیش لە کەناری چەپ جێگیر بوون. دەست بەجێ فەرماندەی پێشەنگی شاپوور پەیکێکی سوارەی نارد تا هەواڵ بە شاپوور بگەیەندرێت.

فەرماندەی پێشەنگ و دەستەی ئالیك گەێنی لەشکری ڕۆمیش هەمان کاری کرد تا هەواڵی دەرکەوتنی لەشکری شاپوور بە قوستەنتین بدات.

سەربازانی ساسانی بەپێی شوێنی نیشتەجێ بوونیان چەکی تایبەتی خۆیان هەبوو. سەربازانی پارتی (خۆراسان) بە کەوان، سەربازە ئاسینییەکان (یەزدی) بە کەمەند، سەربازانی تالێج (تالێش) بە سەگی دڕندە و سەربازە مازەندەرانییەکان بە گۆپاڵە مەزنەکانیان ئامادەی جەنگ بوون، هەمووشیان جگە لە بوونی چەکەکانی خۆیان، شمشێریشیان پێ بوو، لە کاتی جەنگدا لایان باشتر بوو کە بە چەکی خۆیان بجەنگن. سەربازی مازەندەرانی بەکاربردنی گۆپاڵ

---

(١١) پێویست بە باس ناکات کە کوردستانی ژێردەستی ئێران لەو ناوچانەی نووسەر باسی کردووە پترە و دەڤەرەیلی وەك لووڕستان و هەمەدانیش هەر کوردستان بوون، بەڵام ئەوە شۆڤێنییەتە کە بەردەوام دەیەوێت خاك و قەوارەی کورد کەم و بچووکتر بکاتەوە، بە ناچاری تاو نا تاوێك باسی کورد دەکەن. "وەرگێڕی کوردی"

و سەربازانی کورد لە دوودە (ئەو دیو شاخ) بەکارهێنانی نێزەی بڵندیان لا باشتر بوو، سەربازانی پارتیش بەکاربردنی کەوانیان پێ باشتر بوو، تەنیا لەو کاتەی هەردوو لەشکر تێکەڵ دەبوون، کەوانی دەرفەتی کاری نەدەما.

ئەرتشتارەکان واتە ئەوانەی بە گالیسکە جەنگییەکان دەجەنگان، هەڵگری ئالایەك بوون کە لە سەرەوە وێنەی فرۆهەر و لە خوارێ وێنەی بازنەیەك هەبوو کە نیشانەی تایەی گالیسکەبوو، هەر ئەو نیشانەیەش لەسەر سینگیان هەبوو. بۆ ئەوەی نەوترێت کە داهێنانی (ئارم) بۆ چینە جیاکانی لەشکر لە داهێنانەکانی ئەورووپاییەکانە، ئارم لە بوونە کۆنەکانی لەشکرە و لە سەردەمی هەخامەنشییەکان هەبوو.

ئەو سوپایەی شاپووری دووەم بۆ جەنگی قوستەنتین هێنابووی بە گشتیی لە سەربازی بە ئەزموون پێك هاتبوون، کە (١٢٠) هەزار سەرباز دەبوون، جگە لە گالیسکە جەنگییەکان، بە گشتیی لەشکرەکەی بایەخی جەنگی هەبوو، بەشێك لە سوپاکەی شاپوور سوارە بوون و ئەسپی باشیان هەبوو، بەڵام وەك ئەسپی گالیسکەکان باش نەبوون. هێلکە لەسەر بەشی پشتەوەی سەر پشتی ئەسپی گالیسکەکان دادەنرا، ئەگەر هێلکەکە کەوتبایە، سەرپەرشتیارانی تەویلەکان دووچاری لێپرسینەوە دەبوون کە ئەوانیان باش پەروەردە نەکردووە و کێماسیان بووە، هەرچەندە کەس نەیدەتوانی خواردنی ئەوان کەم بکاتەوە کە کشمیش و جۆ بوو، بەڵام دەکرا لە تیمارکردنی ئەسپەکان تەمبەڵیان نواند بێت، لە کۆنەوە دەزانرا تەمبەڵی نواندن لە تیمارکردنی ئەسپ دەبێتە هۆی لەڕ و لاواز بوونی ئەسپەکان، بۆیە دەبووایە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك تیمار بکرێن، قەڵەوی بۆ ئەو ئەسپانەی باریان هەڵدەگرت یاخۆ گالیسکەیان ڕادەکێشا بابەتێکی پێویست بوو، ئەسپی لەڕ و لاواز توانای ئەو کارانەی نەبوو.

شاپووری دووەم دوای بیستنی هاتنی سوپای دوژمن بۆ کەناری تەلخ ڕوود، دەیتوانی پەلە بکات بۆ گەیشتن بە لای راستی ڕووبارەکە، چوونکە ڕووبارەکە گەورە نەبوو، تەنانەت لە بەهاریش پەڕینەوە لە ڕووباری تەلخ ڕوود ئاسان بوو، بەڵام لە باکوری ئەو ڕووبارە دەڤەرێك هەبوو کە گردۆڵکە و خەرەندی هەبوون و دەبوونە ڕێگر لە جووڵەی گالیسکە جەنگییەکان، شاپوور بە باشتری زانی لە باشووری تەلخ ڕوود چاوەڕوانی ئیمپراتۆری رۆمی بچووك بێت. بە هۆی گۆڕانکارییەکانی زەوی لە شازدە سەدەی رابردوودا ئەو تەپۆڵکە و خەرەندانە نەتەنیا نەماون، بگرە بەشی رۆژئاواکەی بۆتە زەلکاو و ئەو دەڤەرە نەماوە، بەڵام شێوەی زەوییەکە ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کە سەردەمێك ئەو ناوچەیە بەو شێوە بووە.

قوستەنتین پشت ئەستوور بوو بە لەشکرەکەی، بڕیاریدا کە لە لایەکەی دیکەی ڕووبارەکە لەگەڵ شاپووردا بجەنگێت، ڕۆژی دواتر دەستی بە پەڕینەوە بۆ لای چەپی ڕووبارەکە کرد، بۆ ئەوەی شاپوور نەتوانێت ڕێگری بکات و کێشەی بۆ بنێتەوە، پێش پەڕینەوە تەواوی مەنجەنیقەکانی خۆی لە کەناری ڕووبارەکە ریز کرد و ئامادە باشی وەرگرت بۆ هەر ڕێگری یاخۆ کارێکی لە ناکاوی شاپووردا، بەڵام شاپوور هیچ ڕێگری لە پەڕینەوەی قوستەنتین نەکرد، چوونکە دەیزانی لە پێدەشتە تەختەکانی باشووری ڕووبارەکە پتر بەختی تێکشکاندنی سوپای دوژمنی هەیە.

لە سەردەمی ئێستە چەکی ئاگرین و ئۆتۆماتیك کاردەکات، بۆیە زۆر جیاوازیی و گرینگی نییە لە نێوان سەربازانی خۆبەخشی هەمیشەیی و ئەوانەی بۆ خزمەت بانگهێشت دەکرێن، هەموویان ڕاهێنانیان لەسەر ئەو چەکانە پێ دەکرێت، بەڵام لە رابردوو چەکی ئاگرین و ئۆتۆماتیك نەبوو، دەبووایە سەرباز پشت بە هێزی جەستە و بازووی خۆی ببەستێت، تەنانەت لە هاویشتنی مەنجەنیقدا بازووی بەهێزی سەربازەکان زۆر گرینگ بوو، دەبووایە هەموو سەربازەکان بەردەوام ڕاهێنان و وەرزش ئەنجام بدەن تا توانای بەرگەگرتنی ماندوویێتیی جەنگیان ببێت و ببنە سەربازی بە ئەزموون.

ڕێگری نەکردن لە پەڕینەوەی لژیۆنە ڕۆمەکان لە ڕووباری تەلخ ڕوود، کارێکی ئاقڵانەی شاپوور بوو، بە پێچەوانەوەش دەبووە مایەی بەکوشت دانی هەندێ لە سەربازانی لەشکرەکەی بە هۆی بەرد بارانی مەنجەنیقەکانەوە، لە لایەکی دیکەوە ئەو ڕووبارە هێندە گەورە و ستراتیجی نەبوو کە ڕێگر بێت بۆ لەشکری ڕۆم، بۆیە شاپوور بە باشتری زانی کە چاوەڕوان بێت تا دوای پەڕینەوەی لەشکری ڕۆم لە ڕووبارەکە، جەنگ دەست پێ بکات.

لژیۆنەکان زۆر بە ڕێکی پەڕینەوە، کاتێك گەیشتنە ئەوبەری ڕووبارەکە بە تەواوەتی ئارایشی جەنگیان هەبوو، ئامادە بوون بۆ جەنگ. ئەوان لە پێش خۆیان هەندێ بەربەستیان دانابوو کە لە شێوەی سێ پایە بوون، سەربازە ئێرانییەکان پێشتر ئەو جۆرە بەربەستانەیان لە جەنگەکاندا نەبینی بوو.

سێ پایەکان داهێنانی خودی قوستەنتین بوون و سەربازەکانی لژیۆن بە ئاسانی دەیانگواستنەوە، ئەوان سووکبوون و کەرەستەی زۆریان لە چێ کردنیدا پێویست نەبوو، پانی و درێژی و بەرزیان زۆر بوو، دەیانتوانی ئاستەنگ دەهەمبەر گالیسکە جەنگییەکان چێ بکەن.

لە لایەکی دیکەوە گواستنەوە یاخۆ بەجێ هێشتنیان ئاسان بوو، چونکە دەتوانرا جارێکی دیکە بە ئاسانی چێ بکرێنەوە.

ریزی سەربازانی رۆم لە باشووری ئەو ڕووبارە بە رادەیەك پوخت بوو کە لەوە دەچوو ئەو شوێنە بۆ ئەوان مەیدانی راهێنان و مەشق بێت نەك مەیدانی جەنگ.

شاپووری دووەم تا ئەوکات لە مەیدانی جەنگدا سێ پایەی نەبینی بوو کە بۆ پێشگیری لە گالیسکە جەنگییەکان داندرا بوون، بەڵام پەرێشان نەبوو داوای کرد تا فەرماندەی سەربازانی تالێش بێتە لای و فەرمانی کرد تا بچێت و بە سەربازەکانی بڵێت بە تەورەکانیان هەموو سێ پایەکان بشکێنن، هەروەها بۆ ئەوەی سەربازەکانی نەکەونە بەر تیری رۆمەکان، وتی با قەڵغان و زرێ بکەنە بەریان، ئەگەر خۆشیان قەڵغانیان نەبوو با لە بەشەکانی دیکەی لەشکر وەریان بگرن.

سەربازەکانی تالج کە نها بە تالێش ناو دەبرێن لە زستاندا چەرمی مامزیان دەکردە بەریان، ئەو چەرمانە لەو مامزانە بوون کە لە تالێش دەژیان، ئەوێ مەزنترین ناوەندیی پەروەردەکردنی مامز بوو. ئەوان لە هاویندا بەرگێکیان دەکردە بەریان کە لە کەتان بوو، کەتانەکەش لە دەڤەری خۆیان وەبەر دەهات. پیاوانی تالێش زۆر ئازا بوون، وەك هەر پیاوێکی دیکەی ئازا حەزیان نەدەکرد قەڵغان و زرێ بکەنە بەریان، چوونکە لە چوست و چالاکیانی کەم دەکردەوە و قورسی دەکردن، بۆیە زۆرینەیان قەڵغانیان نەبوو، لەسەر فەرمانی شاپوور لە بەشەکانی دیکەی لەشکر، زرێیان بۆ کۆکرایەوە تا بیکەنە بەریان.

سەربازانی تالێش زۆر لاپەرەی تژی لە شانازییان لە جەنگەکاندا تۆمار کرد بوو، بەڵام ئەوەی لەو رۆژە بۆ شکاندنی سێ پایەکان کردیان یەك لە درەوشاوەترین لاپەڕەکانی جەنگەکانی ئەوان بوو.

ئەوان بەردەوام پیادە دەجەنگان و سەگی گەورەیان هەبوو، کە بۆ جەنگ دەیانبردن و سەگەکانیان هێرشیان دەکردە سەر هەر کەسێك کە هێرشی بۆ خاوەنەکەیان کردبایە. ئەو سەگانە لە رەگەزێکی تایبەت بوون کە لە مێژوودا بە سەگی تالێج ناسراوە، ماوەیەك دواتر بە هۆی کوشتاری بە کۆمەڵ، ئەو رەگەزە لە سەگ لەنێو چوو و بوونی نەما. هەرچەندە پیاوانی تالێج دوای سەدەی دووەمی کۆچی (هەشتەمی زاینی) جارێکی دیکە بۆ جەنگ دەستیان بە پەروەردەکردنی سەگ کردەوە، بەڵام ئیدی ئەو سەگە باشانەی جاران نەبوون.

جەنگ بە هێرشی سەربازانی تالێچ کە تەوریان بەدەستەوە بوو، هەروەسا سەگە گەورەکانیان لەگەڵ بوو دەستی پێکرد، لە پشت ئەوانیشەوە سەربازانی پیادە لە لای راست و ناوەندی سوپاوە دەهاتن و گالیسکە جەنگییەکانیش لە لای چەپ کەوتنەڕێ، شاپووری دووەمیش سوارەکانی لە پشتەوە وەك یەدەگ هێشتەوە تا لە کاتی پێویست بکەونە جەنگ.

کاتێك سەربازەکانی تالێچ بەرەو رۆمەکان کەوتنەڕێ، هیچ پۆششێکی بەرگرییان نەبوو، تیر و کەوانچییەکان و بەردهاوێژەکانی لەشکری شاپوور نەیاندەتوانی پالپشتیان بکەن، ئەگەر تیریان هاویشتبایە، بەر سەربازەکانی تالێچ دەکەوتن، ئەگەر ڕێڕەوی تیرەکانیشیان گۆڕی بووایە، ئەوا بێ سوود دوای بڕینی نیمچە بازنەیەك لە ئاسمانەوە بەبێ سوود دەکەوتنە خوارێ.

کاتێك رۆمەکان سەربازانی تالێشیان بینی کە تەوریان لە دەست بوو، زانیان بۆ شکاندنی سێ پایەکان دێن، بۆیە دایاننە بەر ڕێژنەی تیرەکانیان، ئەگەر سەربازەکانی تالێش زرێیان لەبەر نەبووایە زۆرینەیان دەکوژران، بەڵام بە هۆی زرێکانیان زۆریان زیان پێ نەگەیشت و خۆیان گەیاندە سێ پایەکان و تەورە قورسەکانیان بە هێزی بازووەکانیان کەوتنە وێزەی سێ پایەکان و بە هەر لێدانێك لایەکی سێ پایەکانیان دەشکاند و بە سێ تا چوار لێدان سێ پایەیەکیان تێکدەشکاند، بەڵام سەربازە رۆمەکان چاوەڕوان نەبوون تا تالێشیەکان سێ پایەکان لەنێو ببەن و هێرشیان کردنە سەریان تا بیانکوژن.

ئەرکی سەرەکیی سەربازەکانی تالێش تێکشکاندنی سێ پایەکان بوو، ئەوان دەیانزانی ئەگەر سێ پایەکان بمێنن، کاریگەرترین چەکی ئەوان کە گالیسکەکان بوون لەو رۆژە بێ سوود دەبن، بۆیە تەنانەت دوای ئەوەی کەوتنە بەر هێرشی رۆمەکانیش، پارێزگاریان لە خۆیان نەکرد و ئەو ئەرکەیان بە سەگەکانیان سپارد و بۆ خۆیان بەردەوام بوون لە شکاندنی سێ پایەکان.

چەکی سەرەکیی سەربازە لژیۆنەکانی رۆمی بچووك هەروەك لژیۆنەکانی رۆمی مەزن برێتی بوو لە نێزەیەکی بەرز بە ناوی (پیلا) کە ماوەی هەشت سەدە ناوی خۆی پاراست، کە چەکی سەرەکیی ئەو دوو سوپایە بوو، ئەوان زۆر کارامە بوون لە بەکاربردنی ئەو نێزانە.

هەرچەندە تەورەکانی سەربازە تالێشەکان زۆر کاریگەر بوون، هەر تەورێکی بەهێز گەر بەر پیاوێکی بەهێز کەوتبایە دەیخست، بەڵام نێزەکان چوونکە درێژتر بوون بەر لە تەورەکان دەگەیشتنە ئامانجی خۆیان، لە لایەکی دیکە تالێشەکان هێندە سەرگەرمی شکاندنی سێ پایەکان بوون کە دەرفەتی بەرگری کردنیان لە خۆیان نەبوو.

لەوکاتەدا مەیدانی جەنگ بە دەنگی وەڕین و حەپینی سەگە تووڕەکانی تالێشەکان سیخناخ ببوو، سەربازە رۆمەکان کە بینیان کەوتوونەتە بەر پەلاماری ئەو سەگانە، نێزە کورت و بەرز و ئەستوورەکانیان لە ورگ و سینگی ئەو ئاژەڵە بەهێزانە دەچەقاندن ئیدی ئەو ئاژەڵە دوای پێکانی سەخت، دەکەوتە سەر زەوی و تەنیا دەینوزاند.

زەبری نێزەی سەربازە رۆمەکان لە کاتی راوەشاندنیاندا هێندە بەهێز بوو، کە لە کاتی بەرکەوتن بە سینگ یاخۆ سکی سەربازە ئێرانییەکان، لە پشتیان دەردەچوو. لە رۆمی گەورە و بچووك سەری نێزەکان واتە پەیکانەکەیان بە رۆنی زاج تەڕ دەکرد، بەو هۆیەوە پەیکانەکان ژەهراوی دەبوون.

ئێستە و بەپێی یاساکانی جەنگ هیچ ولاتێك رێگە پێدراو نییە تا گوللەکانی ژەهراوی بکات، بەڵام ئەوکات هیچ یاسایەك نەبوو تا رێگری لەو رەفتارە بکات، هەندێ لە نەتەوەکان پەیکانی نێزەکان و پەیکانی تیرەکانیشیان ژەهراوی دەکرد، بۆیە سەربازی برینداری تالێش ئەگەر بە زەبری نێزەکەش نەکەوتبایە، ئەوا بە ژەهرەکە دەکەوت و کاریگەریی ئەو ژەهرە وەك ئەوە بوو کە بە هۆی سرنجێکەوە ژەهر بکەنە نێو جەستەی.

ئەو سەربازانەی تالێش کە ئەرکی شکاندنی سێ پێیەکانیان هەبوو، نێزیکەی هەشت سەد کەس بوون، تا ئەوکاتەی پیادەکانی لەشکرەکەیان بۆ یارمەتی ئەوان گەیشتن نیوەیان کەوتبوون، راستە لەنێو کەوتووەکان هەبوو کە زیندوو بوو، بەڵام دەزاندرا کە نێزەی ژەهراوی رێگرە لە چاك بوونەوەیان، لە ساتەکانی یەکەمی جەنگدا نێزیکەی چوارسەد سەربازی تالێشی لەنێوچوون، لە بەرانبەر ئەوەشدا هەموو سێ پایەکان تێکشکابوون و هیچ رێگرێك لە بەرانبەر گالیسکە جەنگییەکان نەمابوو.

کاتێك جەنگ بە تەواوەتی دەستی پێکرد، سکاکان بە سواری گاکانیان لە کۆتایی لای راستی لەشکری ئێران بوون، شاپوور ئەوانی لە یەدەگ نەهێشتەوە، واتە ئەوان بە سوار هەژمار نەکرابوون. ئەوان بە کۆمەڵ بە سواری گاکانیان ڕووبەڕووی لەشکری رۆم بوونەوە، خێرایی گاکانیان زۆر کەمتر نەبوو لە خێرایی ئەسپەکان، گای نێر لە کاتی راکردن، سەری بەردەداتەوە و بە زۆرترین خێرایی کە لە توانای بوو هێرشی دەبردە سەر رۆمەکان.

سەربازەکانی رۆم تا ئەوکات هێرشی گاسوارەکانیان نەبینی بوو، بە بینینی ئەو دیمەنە نە تەنیا دووچاری شۆك بوون، بگرە دووچاری ترسیش هاتن، هەموویان ترسیان لێ نیشت، یەکێك

لە بنەماکان ئەوەیە کە سەرباز لە بینینی چەکی نوێ لە مەیدانی جەنگ دەترسێت و ورەی دادەبەزێت، سەربازانی ڕۆمیش لەو دەمەدا ئەو ڕەوشەیان بەسەر هات.

ئەو سەربازانەی سواری گاکان ببوون، جۆرە شمشێرێکی کەمێك درێژ و خواریان لە دەست بوو، کە وەك بیور وابوو لە داهاتوودا بە (تەلوار) ناسرا، ئەگەر تەلوار بە دەستی سەربازی بەهێز لە کەسێك درابووایە، بێگومان کەرتی دەکرد. چوونکە ئەوەی تەلواری لابوو، بە گشتیی سواری گا دەبوون، لە کاتی وەشاندنی تەلواردا هێزی دەستیان و هێزی ڕۆیشتنی گاکە پێکەوە دەبوونە یەك هێز، بەڵام سەربازە ڕۆمەکان هێندەی لە گایە نێرەکان دەترسان، هێندە لە تەلوارەکانیان نەدەترسان. ئەوان دەیانزانی ئەگەر لە کاتێکی زۆر کورتدا گایەکان نەکوژن، ڕاگرتنی ئەوان ئاسان نییە، بۆیە ئەگەر ئەو ئاژەڵە تەنانەت برینداریش بێت، بەردەوام دەبێت لە جەنگ و هێرش دەبات.

سەربازانی ڕۆم نێزەکانیان بەرانبەر بە گاکان بە شێوەیەك ڕاگرت کە بە گەیشتنیان لە سەر و سینگیان بچەقێت و بیانکوژێت، بەڵام هەندێك لە گاکان نەکەوتن و بە برینداری کەوتنە نێو ڕۆمەکان و ڕیزەکانیان شکاندن و سوارەکانیشیان بە تەلوارەکان لە سەربازە ڕۆمەکانیان دەدا، ئەوان بە دوو ڕیز هێرشیان کردە سەر ڕۆمەکان، دەیانزانی ڕیزی یەکەم پتر زیانبار دەبێت و زۆریان لێ دەکوژرێت.

لە ڕیزی یەکەم ژمارەیەك گا و سەرباز کوژران، بەڵام لە ڕیزی دووەم ژمارەیەکی کەمتر کوژران و تەلوارەکانی سکاکان سەربازە ڕۆمەکانی پارچە پارچە دەکرد، سکاکان کەوتبوونە لای ڕاستی لەشکری ئێران و لای چەپی لەشکری ڕۆمەکانیان بە تەواوی لێك ترازاند.

سکاکان لە مەیدانی جەنگ دەرچوون و گەیشتنە سەر ڕووبارەکە، ئەوان بێ ئەوەی سەریان لێ بشێوێت، گەڕانەوە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر بەشەکەی تەنیشتیان لە لەشکری ڕۆم و خوازیار بوون هێرشەکەیان بۆ سەر ڕۆمەکان چاوەڕوان نەکراو بێت، چوونکە لە پشتیانەوە دەهاتن. ڕیزەکانی شەڕگەی ڕۆم بە شێوەیەك بوون کە ڕووی سەربازەکانیان لە باشوور بوو، ئەگەر دەرفەتیان هەبووایە لە پشتەوە هێرش بکەن، ئەوا دەیانتوانی هەموو سەربازانی دوژمن لەو سنوورە لەنێو ببەن.

بەڵام فەرماندەی ئەو بەشە لە سەربازە ڕۆمەکان، بە تەواوەتی هۆشیار بوو، کاتێك بینی گاسوارەکان لە کەناری ڕووبارەکە خەریکە دەسووڕێنەوە، فەرمانی کرد تا سەربازان ڕوو لە پشتەوە بکەن و ئامادە بن بۆ جەنگی گاسوارەکان، بەڵام ئەو ئاگەدار نەبوو کە هاوکات لەگەڵ

گاسوارەکاندا، پیادەکانی لەشکری ئێرانییان دەگەنە سەر سەربازەکانی و لە پشتەوە لێیان دەدەن.

لە شەڕگەیەکی گەورەی وەك بەرەی رۆم کە ١٠٢ هەزار سەربازی لێیە، فەرماندەی گشتیی سوپا ناتوانێت ئاگەداری هەموو لایەکی شەڕگەکان بێت و هەموو لایەك نابینێت. خەڵك وا دەزانن کە تەنیا لە سەردەمی ئێستەدا مەیدانەکانی جەنگ گەورەن، نازانن ئەوکاتیش بە هۆی زۆری ژمارەی سەربازەکان، فەرماندەی گشتیی سوپا هەموو لایەکی نەدەبینی.

بۆیە لە سەدەکانی رابردوودا بۆ هەر بەشێك لە سوپا فەرماندەیەکی سەربەخۆیان دیاری دەکرد و ناوی فەرماندەی لای راست یاخۆ چەپ یان ناوەندی سوپایان لێ دەنا و دەسەڵاتیی تەواوی فەرماندەیی لە سنووری خۆی هەبوو، بە چ شێوەیەك ویستبای فەرمانی دەکرد.

قوستەنتینی دووەم لەبەر مەودای نێوانیان ئاگەدار نەبوو کە لە کۆتایی لای چەپی لەشکرەکەی، بە هۆی هێرشی گاسوارەکان کۆمەڵێك لە سەربازەکانی لەنێوچوون و کۆمەڵێکی دیکەیش لە مەترسیدان، بەڵام فەرماندەی ئەو ناوچەیە واتە (ژولیۆس کالینۆس) بینی کە ئەو کۆمەڵەیە لە پێشەوە و لە دواوە کەوتوونەتە بەر هێرش و لەوانەیە تا دوایین کەسیان بکوژرێن، بۆیە بە خێرایی ژمارەیەك لە سەربازەکانی بۆ یارمەتی ئەوان نارد تا بە تایبەتی گاسوارەکان لەنێو ببەن، چوونکە ئەوان مەترسیدارتر بوون لە پیادەکانی لەشکری ساسانی. سەربازە رۆمەکان وەك چۆن سەربازە پیادەکانی ساسانی لە پشتەوە هێرشیان کردبووە سەر رۆمەکان، بە هەمان شێوە لە پشتەوە هێرشیان کردە سەر گاسوارە سکاییەکان و ژمارەیەکی زۆریان لەو پیاوە ئازایانە و گایەکانیان کوشتن.

سەربازە مازەندەرانی و ئارسینییەکان لە نێوەندی شەڕگەی ئێرانییان بوون، هەردوو لا لە رەگەزی پیاوە باڵابەرز و بەهێزەکان بوون. ئەگەر لە سەردەمانێکی دیکە، کە دەبینرا کە ئەوان باڵایان کورتترن لە پێشوو، ئەوە بۆ هۆی تێکەڵ بوونیان بوو بە سامی و مەغۆل یاخۆ لێکچووەکانی مەغۆلەکانەوە واتە (مۆنگۆلۆئید)، ئەوەش بە هۆی ژن و ژنخوازی لەگەڵ ئەوان بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستەش لەو ناوچەیە پیاوانی باڵا بەرز هەر ماون، چوونکە بەپێی زانستی رەگەزناسی هیچ رەگەزێك بە تەواوەتی لەنێو ناچێت و نموونەکان دەمێنن.

سەربازەکانی مازەندەران و یەزد لە تیرە دیارەکانی ئاریا بوون، ڕەنگی ڕووخساریان لە یەك جیا بوو. مازەندەرانییەکان کە لەنێو جەنگەڵە زۆرەکانی مازەندەران دەژیان، رەنگیان سپی بوو، یەزدییەکان کە دانیشتووی دەشتە گەرمەکانی باشووری ئێران بوون، گەنم ڕەنگ بوون.

لە ڕووی ئازایەتییەوە سەربازەکانی هەردوو ڕەگەز وەك یەك بوون، تەنیا جیاوازییان ئەوە بوو کە یەکیان ئارەزووی لە جەنگ بە گۆپاڵ و ئەوی دیکەیان ئارەزووی جەنگی بە کەمەندی هەبوو.[(١٢)]

ورەی سەربازەکانی مازەندەران و یەزد جیاواز بوون، سەربازە مازەندەرانییەکان نەیاندەتوانی هەستەکانیان لەکاتی جەنگ بشارنەوە و نەعرەتەیان لێ دەدا، لە بەرانبەردا سەربازە یەزدییەکان بەبێ دەنگی دەجەنگان.

سەرکردەکانی شاپووری دووەم نەعرەتەی مازەندەرانییەکانیان پێ باش نەبوو، داوایان لە شاپوور کرد تا ڕێگەیان نەدات، کە ئەوان لە گۆڕەپانی جەنگ نەعرەتە لێ بدەن، پاشای ساسانی وتی: من لە جەنگدا ئازایەتی و خۆڕاگریم دەوێت و کارم بە هەستە تایبەتەکانی ئەوانەوە نییە.

هەڵبەتە ئەمە پێکهاتەی ناوەندی لەشکری ساسانی بوو، کاتێك هێرشیان کردە سەر لەشکری رۆم، وەك ئەوە بوو کە هەندێ مرۆڤەیلی زەبەلاح یان عووج یاخۆ باڵابەرز هێرشیان کردبێتە سەر کورتە باڵاکان.

سەربازانی رۆمی بچووك، تەنانەت رۆمی گەورەش کورتە باڵا بوون، بە وتەی خۆیان ئەوان بۆیە دواتر باڵایان بەرز بوو، چوونکە تێکەڵاویەتیان لەگەڵ رەگەزەکانی بەربەری ناوەڕاستی ئەورووپا کرد کە هەموویان ئارییایی و باڵابەرز بوون.

سەربازەکانی لژێۆنەکانی رۆمی بچووك ئازا و بە ئەزموون بوون، بەڵام بەرانبەر بە سەربازە مازەندەرانی و یەزدییەکان وەك منداڵ وابوون، کاتێك نێزەکانیان بۆ لای ئەوان ڕادەوەشاند،

---

(١٢) هەرچەند بە مێژوودا دەگەڕێینەوە بۆ دواوە دەبینین سەربازانی یەزد بەردەوام ئەو زنجیرانەیان هەبووە، کە لە کانزا و بە ئەستوورایی پەنجەی گەورە و بە شێوەی لوول پێچ چێ کراون، وەك ئەوەی ئەوان لە رۆژی سەرەتاوە توانای تواندنەوەی کانزایان هەبوو بێت و زانیبیان دەتوانن لە شەڕگەکان سوود لەو زنجیرە کە کەمەندی پێ دەوترا ببینن. ئێستە ئەو زنجیرە یەزدییە نەماوە و لەوانەیە لە مۆزەخانەکان هەبێت.
تەنانەت ئەوکاتیش کە ئەو زنجیرە لە یەزد سازدەکرا وەك دیاری بوو، بۆ ئەمەش بەڵگەمان ئەوەیە لە ساڵی (٦٢٤ ز) کاتێك هێراکلیۆس ئیمپراتۆری رۆمی بچووك هێرشی بۆ ئازەربایجان کرد و شیزی تالان کرد. کاتێك پێشنیازی ئاشتی بۆ کرا، یەکێك لە داواکانی، پێدانی پێنج هەزار دانەی لەو کەمەندانە بوو. ئاشکرایە کە ئەو ساڵە و ساڵانی دواتر ساسانییەکان توانا جەنگییەکانیان نەمابوو، زەنجیرەی پاشایەتییەکەیان بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت. ئەگەر بووترێت ئەو زنجیرە وەك دیاری بووە راستە و ئێستە بەردەست نییە. "زەبیحوڵڵا"

سەربازی باڵابەرزی مازەندەرانی بەدەم نەعرەتەوە گۆپاڵێکی لە نێزەکە دەدا و ورد وخاشی دەکرد و گۆپاڵی دووەمی لە سەربازەکە دەدا و لەنێوی دەبرد.

زنجیری سەربازە یەزدییەکان وەك مارێکی گەورە بەرەو سەربازە رۆمەکان هەڵدەدرا و بەر رووخساریان دەکەوت، ئازاری ئەو بەرکەوتنە لە سووتان ناخۆشتر بوو، ماوەیەك سڕ و بێ هەستی دەکردن، ئەو ماوەیە بەس بوو تا یەزدییەکان بۆ جاری دووەم زنجیرەکانیان هەڵبدەن و ئەمجارە بیکەن بە کەمەند و لە ئەستۆی سەربازە رۆمەکەی بکەن. هەر سەربازێك دووچاری کەمەند ببووایە مردنی مسۆگەر بوو، چوونکە ئەڵقەی کەمەند بە شمشێر و خەنجەر نەدەپسا و نێزە بەرزەکانی رۆمەکانیش لە بەرانبەر کەمەندە درێژەکانی سەربازە یەزدییەکان، کورت بوون.

قوستەنتینی دووەم کە بۆ خۆی لە نێوەندیی سوپاکەی خۆی بوو لە هێرشی گاسوارەکانی سکایی ئاگەدار کرایەوە، دوای ئەوەی لە رێگەی راپۆرتی ژۆلیۆس کاکی نووسی فەرماندە ئاگەدار کرایەوە لە هێرشی گاسوارەکان بۆ کۆتایی لای چەپی لەشکرەکەی و هاوکات دەیبینی سەربازە کورتە باڵاکانی لە نێوەڕاستی لەشکر بە دەست سەربازە باڵا بەرزەکانی مازەندەران و یەزدییەکانەوە گیریان خواردووە و دەناڵێنن، ئەوان نەدەترسان و نەدەکشانەوە، بەڵام دەکوژران.

بۆیە فەرمانی کرد تا بەشێك لە کەوان هاوێژەکانی بەرەو ئەو شوێنی لەشکر بڕۆن و بە تیر لە مازەندەرانی و یەزدییەکان بدەن، ئەو ئامۆژگاری کردن کە تیر لە رووخسار و سینگیان نەدەن، تەنیا لە گەردن یاخۆ سکیان بدەن، ئەو تیرەی بەر سك دەکەوێت کەسەکە دەخات هەرچەندی بەهێز بێت، هیچ سەربازێك دوای ئەوەی تیر بەر سکی دەکەوێت ناتوانێت بەردەوام بێت لە جەنگ، بەڵام ئەگەر بەر شوێنێکی دیکەیان جگە لە گەردن و سکیان بکەوێت، بریندار دبن، بوڵام لەوانەیە توانای بەردەوام بوون لە جەنگیان هەبێت، ئەو سەربازە ئێرانیانە زرێیان لەبەر نەبوو، دەتوانرا بە زوویی بە زەربەکانی تیر بیان خەن.

شاپووری دووەم کە بینی سەربازەکانی لەو نێوەندە کەوتنە بەر لێشاوی تیری رۆمەکان، بۆ ئەوەی ژمارەی کوژراویان زۆر نەبێت، فەرمانی پاشەکشەی بۆ ئەوان دەرکرد و فەرمانیدا تا سەربازە پارتییەکان جێگەیان بگرنەوە، چوونکە ئەوان وێڕای کارامەییان لە تیرهاویشتن، زرێیان لەبەر بوو.

سەربازە پارتیەکان بێ ترس و دوو دڵی دەستیان کرد بە تیر بارانکردنی سەربازانی رۆمی، بەڵام تیرهاوێژە رۆمەکان نەیان دەتوانی بێ سەرەنجدان تیر بهاوێژن، هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە

تیرهاوێژە پارتییەکان، جگە لە سەربازە ڕۆمەکان کەسی دیکەیان لە بەرانبەر نەبوو، بەڵام تیرهاوێژە ڕۆمەکان، سەربازەکانی خۆیان کەوتبوونە نێوان خۆیان و پارتەکان ،بۆیە دەبووایە وردبن لە هاویشتنی تیر تا بەر سەربازی خۆیان نەکەوێت.

سەربازانی ڕۆم کاتێك بینیان کەوتنە بەر ڕێژنەی تیری ساسانییەکان، بە پەلە قەڵغانەکانیان بەرانبەر سینگ و رووخساریان ڕاگرت و ڕووبەڕووی  تیرهاوێژەکانی دوژمن بوونەوە.

ئەوان لەو شێوە پێشڕەوییە زۆر لێهاتوو بوون، کاتێك لژیۆن دەکەوتە پشت قەڵغانەکانیان وەك ئەوە بوو دیوارێکی گیانلەبەر بەرەو پێش بڕوات، ئەو دیوارە هیچ کونی تێدا نەبوو، قەڵغانەکانیان هێندە گەورە بوون کە بە تەواوەتیی لە بەرانبەر تیرەکان دەیپاراستن. لە دوا لژیۆنەکانیشەوە سەربازە تیرهاوێژەکان بە دەم تیر هاویشتنەوە دەهاتن و تیریان دەگرتە پارتییەکان.

کەوان هاوێژەکانی پارتی لەوکاتەدا تەنیا دەیانتوانی خۆیان بچەمێننەوە و تیر بهاوێژن بۆ قاچی سەربازە ڕۆمەکان، بەم ئاوایە تەنیا توانیان چەند سەربازێك بکەنە نیشانە و لە ماوەیەکی کورتدا سەربانی لژیۆنەکانی ڕۆم خۆیان گەیاندە ئەوان، پارتەکان بە ناچاری کەوانەکانیان لە پشتیان کرد و شمشێرەکانیان دەرهێنا، دوای ئەوە جەنگی قورس لە نێوان شمشێرچییە پارتەکان و نێزە بەدەستە ڕۆمەکان دەستی پێکرد.

نەریتی زۆرێك لە شمشێربازەکان و لەنێویشیاندا پارتییەکان بوو، کە شمشێریان لە راست یاخۆ چەپەوە دەهاویشت، لە هەمان ڕێگەوە دەیانگەڕاندەوە، ئەم کارەیان بە تەواویی هێزیانەوە دەکرد، ئەگەر ئەو کەسەی شمشێرەکەی بەردەکەوت، زرێی لەبەر نەبووایە بە شێوەیەك بریندار دەبوو کە بە پێکانی گەڕانەوەی شمشێرەکە دەکەوت و لەوانە بوو دەست بەجێ بمرێت.

ئێستە لەوانەیە بیر بکرێتەوە کە ئەوە شتێکی ئاساییە، لە راستیشدا بۆ تەنیا چەند جارێك شمشێر وەشاندن ئاساییە، بەڵام بۆ ئەو کەسەی لە مەیدانی نەبەردیدا بۆ ماوەی چەندین دەمژمێر ناچار بە شمشێر وەشاندنە، ئەو کارە وەك ئازارێکی ڕۆحی وایە، نەتەنیا دەست و شانەکانی، بگرە لە هەموو جەستە، تەنانەت قاچەکانی هەست بە ماندوێتیی دەکات، چونکە ئەو ناچارە بەردەوام شمشێر لێ بدات و هیچ کاتی بۆ پشوو نابێت، سەرەنجام هێندە ماندوو

دەبێت کە توانای جووڵەی نابێت و نێزە یاخۆ شمشێری سەربازی بەرانبەر بەری دەکەوت و دەیکوشت.

ئێرانییان بۆ راهێنانی شان و بازوو و کەمەریان لە وەرزشگەکانی خۆیاندا، بە ئاسنێك کە باریك و درێژ بوو یارییان دەکرد، ئەو یارییە زۆر باش بوو تا لە شمشێر لێدان ماندوو نەبن. سەرەڕای ئەو وەرزشە، باشترین وەرزش بۆ راهاتن لەسەر شمشێر وەشاندن، خودی شمشێر وەشاندن بوو. پارتەکان بە تەوریش هەروەك شمشێر دەجەنگان تا لە هەر هاویشتن و گەڕاندنەوەیەکی تەور، دوو زەبر بەر رۆمەکان بکەوێت، بەڵام پۆششی رۆمەکان باش بوو، زەبرەکان بەر کاسکێت یاخۆ قەڵغانەکانیان دەکەوت.

پارتەکان زرێی چەرمیشیان هەبوو کە چوار پارچە کانزای لەسەر بەسترابوو کە کەوتبووە ئاستی سینگ و سکیان، هەندێ لە پارتەکان بە بەرد و خۆڵەمێش ئەو چوار پارچە کانزایەیان دەسوواند تا بدرەوشێتەوە، ئەوان بە رادەیەك جوانیان دەسوواند کە لەبەر تیشکی خۆر وەك چوار ئاوێنە دەردەکەوتن، بۆیە بە زرێی چوار ئاوێنە ناسرابوون. تاکتیکی سەربازە رۆمەکان باش بوو، بە شێوەیەك دەجەنگان کە پارتییەکان نەیاندەتوانی قەڵغانەکان بشکێنن و بچنە نێو ریزەکانیان و لەنێویان ببەن.

دوای ئەوەی بە فیداکاری سەربازەکانی تالێش سێ پایەکانی پێش لەشکری رۆم لەنێو بردران، قوستەنتین بۆی دەرکەوت ئامێری بەرگری لەشکرەکەی لە بەرانبەر گالیسکەکان نەماوە، مەترسی گالیسکەکانیش هێشتا بەردەوامە. ئەوکات شێوازێکی دیکەی هەبوون بۆ رێگریکردن لە هاتنی گالیسکەکان، کە برێتی بوون لە هەڵکەندنی زەوی و چێکردنی قوڵتی لەیەك نێزیك تا ببنە رێگر لە رۆیشتن و خێرایی گالیسکەکان، دانانی قەدی دار و وردە دار و بەرد و شتی هاوشێوە تا نەتەنیا تایەی گالیسکەکان بگرە سمی ئەسپەکانیش توانای رۆیشتنیان بەسەریاندا نەبێت.

رێگەی دیکەیش بۆ قوستەنتین گواستنەوەی خێرای مەنجەنیقەکان بوو بۆ پێشەوەی ریزی لەشکرەکەی لە لای راست، چوونکە گالیسکەکان لە لای چەپی لەشکری ساسانی و بەرانبەر لای راست بوون، بەڵام مەنجەنیقەکان دوور بوون، لەوبەری زێ داندرابوون تا لە کاتی پەڕینەوەی لەشکری رۆم بۆ بەرگری ئامادە بن، چونکە کات رێگەی بە هێنانی ئەوان و شێوازەکانی دیکەی رێگری لە گالیسکەکان نەدەدا.

سەربازەکانی ئیمپراتۆری رۆم تەنیا توانیان هەندێ دار بە خێرایی لە زەوی دابکوتن و پەتیان پێدا ڕایەڵ بکەن، پەتەکان دوو بست بەرز بوون و دەیانتوانی ڕێگر بن، بەڵام ئەوە بەو مەرجە بوو کە چەند رستەیەك بەدوای یەکدا بێن تا ئەگەر رستەیەك پچڕا ئەوانی دیکە ببنە ڕێگر لەبەردەم گالیسکەکان. کەمی کات ڕێگەی بە راکێشانی چەند ڕستەیەکی پەت یاخۆ هێنانی هەموو مەنجەنیقەکان بۆ ئەوبەر نەدا و هێرشی گالیسکەکان دەستی پێکرد.

وەك چۆن قوستەنتین لە ڕایەڵکردنی پەتی زۆرتر بۆ ڕێگرتن لە گالیسکەکان سەرکەوتوو نەبوو، شاپووریش بۆ پچڕاندنی پەتەکان و لادانیان لەسەر ڕێگەی گالیسکەکان سەرکەوتوو نەبوو. لەگەڵ دەستپێکی هێرشکردن، گالیسکەکان کەوتنەبەر بەردبارانی پەراگەندەی هەندێ مەنجەنیق، بەڵام بەردبارانەکە تاك و تەرا و پەراگەندە بوو، خێرایی بەردەکان لە خێرایی تیرەکان کەمتر بوو، ئەوانەی لە پێشەوە دەهاتن سەریان دەکرد و ئەوانەی لە چەپ و ڕاستەوە دەهاتن، بەر گالیسکەکان نەدەکەوتن، بۆیە نەیانتوانی زیانی زۆر لە گالیسکەکان بدەن.

قوستەنتینی دووەم پەتەکەی لە بەرانبەر لای راستی خۆی ڕاکێشابوو تا لە کاتی هاتنی گالیسکەکان، ببێتە ڕێگر لە پێشیان و تا پەتەکان دەپسێندرێن، سەربازەکانی بە تیر و بەردی بەرد هاوێژەکانیان لە گالیسکە و سەرنشینەکان بدەن و تێکیان بشکێنن. لە هەر گالیسکەیەك سەربازێك لەسەر ئەسپی پێشەوەی گالیسکەکە دانیشتبوو تا لەگەڵ وەستانی گالیسکەکە، پەتەکە بپسێنێت، ئەو کەسە زۆرترین مەترسی بۆ مردن چاوەڕێی بوو، دەبووایە فیداکاری بکات و لە جەنگیش هەر لەشکرێك ڕووبەڕووی مەترسی نەبێتەوە ناتوانێت سەرکەوێت.

ئەو کەسەی بۆ پچڕاندنی پەتەکە لەسەر ئەسپی پێشەوەی گالیسکەبوو، دەبووایە پێش گەیشتن بە پەتەکە، خۆی ئامادە کرد بێت بۆ پچڕاندنی و نەدەبوو بوەستێت تا گالیسکەکە بوەستێت و ئەوکات بیپسێنێت، چوونکە لەوانە بوو نەتەنیا بۆ خۆی بگرە هەر چوار ئەسپی گالیسکەکە بە بەرد و تیری سەربازانی رۆمی بچووك بکوژرێن. کوشتنی ئەسپەکان گرینگتر بوو، لەبەرئەوەی دەبووە ڕێگر لە رۆیشتنی گالیسکە، ئەوکات ئەوانە لە گالیسکەکە بوون دەبووایە دابەزن و پیادە بجەنگن، ئەوەش بۆ ئەوان سەخت بوو، لە ئاسکێك دەچوون کە لە دەشت داببڕێت و هیچی بۆ نەکرێت، بەڵام کوشتنی کەسەکە نەدەبوو بە ڕێگر بەتایبەتی ئەگەر دوای پساندنی پەتەکە بووایە.

بۆ پساندنی پەتەکان لە هەموو گالیسکەکان یەکێك بوو بە خۆبەخش، ئەو خۆبەخشە نەدەبوو لێخوڕی گالیسکەکە بێت، چوونکە ئەسپ ئاژەڵێکی زیرەکە، ئەگەر کەسێکی دیکە

جگە لە لێخوڕی خۆی ئاراستەی بکات، ئەوا زۆر ئازار و ماندووبوونی بۆ دەنێتەوە. بۆیە لێخوڕەکان نەکرانە خۆبەخش بۆ پساندنی پەتەکان لە هیچ یەکێك لە گالیسکەکان کە هێرشیان بۆ لای راست دەکرد.

پساندنی پەتەکە لەسەر ئەسپی یاڵەوە زۆر قورس بوو، لەوانە بوو ئەگەر زۆر لێهاتوو نەبێت هەر نەتوانێت ئەو کارە ئەنجام بدات و بە زەبرێك یاخۆ دوو زەبری شمشێرەکەی ئەوك ارە بکات. چوونکە ئەسپەکان زۆر خێرابوون، هەر دوو ئەسپیش بە قایشێکی ئەستوور لە چەرمی گامێش پێکەوە بەسترابوونەوە و سواری یەك لەو دوو ئەسپانەش ئەگەر لێزان نەبووایە لەوانە بوو یەکێك لە قاچەکانی کە دەکەوتە نێوان دوو ئەسپەکە لەدەست بدات و تا هەتایە نەتوانێت بە قاچی خۆی بڕوات. وەشاندنی شمشێرەکە ئاسان بوو، بە ئاراستەی ڕۆیشتنی گالیسکەکە دەبوو تا هێزی گالیسکەکەش بکەوێتە پاڵ شمشێرەکە، لە کاتێك کە کەسە شمشێر بەدەستەکە چەماوەتەوە، دەیتوانی پەتەکە بپسێنێت.

بە گشتیی ئەو پیلانە بۆ پچڕاندنی پەتەکان سەرکەوتوو بوو، هەرچەندە هەندێك لەو کەسانەی بۆ ئەوکارە دانرابوون، کەوتنە بەر تیر یاخۆ بەردی ڕۆمەکان  یان ژێر تایەی گالیسکەکانیان و مردن، بەڵام پەتەکان پسان و گالیسکەکان ئیدی جگە لە ڕێگرە ئاساییەکانی وەك تیری کەوانەکان و بەردی بەردهاوێژ و نێزەی سەربازە ڕۆمەکان پتر، هیچیان لەسەر ڕێگە نەما. قوستەنتین دەیزانی کاریگەرترین چەکی ساسانییەکان، گالیسکە جەنگییەکانن، ئەگەر ئەوان ڕابگرێت دەتوانێت سەرکەوتوو بێت و بە پێچەوانەوە سەرکەوتنی ئاسان نابێت، بۆیە فەرمانی بە فەرماندەی لای راست (کارمەن یۆس) کرد تا ڕێگە نەدات گالیسکەکان تێپەڕ ببن.

لەو ڕۆژەوە کە سوارکار و گالیسکەکان خرانە نێو جەنگەوە، کوشتنی ئەو ئاژەڵانەی ئەوانیان بەڕێدەخست بوو بە ئەرك و لەنێو مەیدانی جەنگدا هیچ کارێك گرینگتر نەبوو لە کوشتنی ئەسپەکان و دەزانرا ئەگەر ئەسپەکان بکوژرێن، ئەوا ئەسپسوار  دەبێتە پیادە و گالیسکەکان دەبنە پارچەیەك ئاسن و تەختە و بێ کەڵك دەمێننەوە، بۆیە بەبێ بەزەییانە دەکەوتنە کوشتنی ئەو ئاژەڵانە. ڕەنگە  هەر لەبەر ئەو هۆیەش هەندێ لەشکر گالیسکەیان نەکردبێتە یەکێك لە چەکەکانیان.

جگە لەوە گالیسکە چەکێکی بە خەرجی بوو، لەشکرە هەژارەکان نەیاندەتوانی گالیسکەکان بەڕێوە ببەن، تەنانەت ئەگەر توانیبایان دروستیشی بکەن، بەڵام چێکردنی

ژمارەی کەم لە گالیسکەبێ سوودە، وەك ئەوەیە ئەوان بنێردرێن بۆ کوشتن. چوونکە لە ماوەیەکی کەمدا سەربازە بەرگریکارەکان دەتوانن ئەسپەکان بە تیر و بەرد بکوژن و ڕایان بگرن. بۆیە دەبووایە گالیسکەکان زۆر بن تا بەرگریکاران نەکارن یەك بە یەك لێیان بدەن و لەنێویان ببەن.

شاپووری دووەم دەیوت: کاتێك گالیسکەکانی من دەکەونەڕێ پێویستە تۆزی ئەوان هێندە بێت کە بەری خۆر بگرێت و تاریکی بکات. دیارە ئەو وتەیەی ئەو لە لووتبەرزی و پیاهەڵدان و ئەو بابەتانە نەبوو، دەبێت بزانین کە سەرکردە مەزنەکانی جەنگ لە دوای وشەی گەورە و جوان نین، ئەوە کاری نووسەر و شاعیرەکانە پاڵەوانێتییەکان باس دەکەن، بەڵام ئەو فەرمانانەی لە سەرکردەکانی جەنگەوە دەردەچن، لە کورتترین فەرمانەکانە تا سەرکەوتوو بێت، چوونکە جەنگ سەروکاری لەگەڵ ڕاستی و کردەوەدایە، خۆی دەپارێزێت لە بەکارهێنانی دەستەواژە و رستەی جۆراوجۆر.

کەواتە شاپوور مەبەستی ئەوەیە پێویستە گالیسکە هێندە زۆر بن کە بەرگریکار نەزانێت لە کامیان بدات و کامیان تێك بشکێنێت و سەری لێ بشێوێت، تا ئەوکاتەش لەپڕ خۆی لە گەمارۆی گالیسکەکان ببینێت و ناچار بێت یاخۆ بمرێت یان خۆی بە دەستەوە بدات. تەنانەت ئەگەر سەربازی بەرگریکار لەو کاتەشدا مەبەستی خۆبەدەستەوەدانی هەبێت، بەپێی بەرژەوەندیی جەنگی گالیسکەکان ناتوانن بوەستن و وەستانیان واتای بە کوشتدانی هەر چوار ئەسپەکەیانە، بۆیە ئەو سەربازانەی خۆیان بەدەستەوە دەدەن، دەکەونە ژێر تایەی گالیسکەکان و پان دەبنەوە.

هیچ دیمەنێك لە جیهانی ئەمڕۆ لێکچوو نییە بە دیمەنی هێرشی گالیسکەکانی شاپوور بۆ کەنارەکانی تەلخ ڕوود، تەنانەت دیمەنی جەنگە جیهانییەکانیش کە هەزاران تانك تیایدا هێرشیان دەکرد نابێتە ئەو دیمەنە. چوونکە تانکەکان بە درێژایی سەدان کیلۆمەتر لە جووڵە دەبن و لە بەرانبەریشیاندا سەربازەکان نابینرێن، چونکە هەموویان خۆیان حەشارداوە و لە تۆپی دژە تانك زیاتر نابینرێت. لە لایەکی دیکە ئەوانەی لە جەنگی تۆپ و تانکن ئەو گەرمییەی جەنگی رۆم و ساسانییەکانیان نییە، ئەوەی لە تانکدایە وردبینی دەکات کە تۆپەکانیان بەر ئامانجەکان بکەوێت و خۆشی بپارێزێت لە بەرکەوتنی دۆشکە یاخۆ تۆپی دژە تانك. ئەوانەی بەرانبەر بە تانکەکانیش وەستاون بە هەمان شێوە خۆپارێزی دەکەن لە بەرکەوتن و هەوڵ دەدەن بە تۆپەکانیان تانکەکان تێك بشکێنن، ئەو هەموو وردبینییەش رێگر

دەبێت لە گەرمی و شەوقی ئەوان. ئەوەش لە مەیدانی تیرهاویشتن دەچێت کە بینەران و تیرهاوێژەکان بە گشتیی بێدەنگن تا تیرەکە هەڵە نەکات لە گەیشتن بە ئامانجەکەی.

بۆیە دیمەنی هاوشێوەی دیمەنی هێرشی گالیسکەکان و بەرگری سەربازە پیادەکانی رۆمی بچووك لە جیهانی ئێستەدا نییە و ناتوانرێت دیمەنێك بدۆزینەوە بۆ زانین و ناسینی دیمەنی ئەو رۆژەی ئەو جەنگە.

سەربازە رۆمەکان زۆرینەیان سەربازی خاوەن ئەزموونی لژیۆنەکان بوون، بەرگریان دەکرد، لە مەرگ نەدەترسان و لەگەڵ زەبروەشاندن، نەعرەتەیان لێ دەدا و ئەفسەرە سێنتۆرییەکانیشیان (واتە فەرماندەی سەد سەرباز) لەگەڵ بەرگری و جەنگدا، بە دەنگی بەرز شیعرەکانی (وێرژیل) شاعیری داستان سەرای یۆنانیان دەوت.

نەعرەتەی سەربازە رۆمەکان تەنیا ئەوکاتە دەبڕا کە دەکەوتنە بەر داس یاخۆ تایەی گالیسکەکان و دەمردن یان بە تیری سەرنشینەکانی نێو گالیسکەکان دەمردن.

بە هەمان شێوەش کە سەربازە رۆمەکان نەعرەتەیان لێ دەدا، سەربازە ئێرانییەکانی سەر گالیسکەکانیش نەیاندەتوانی بێ دەنگ بن و هاوشێوەی رۆمەکان بەردەوام نەعرەتەیان لێ دەدا و دەنگی هەردوو لا بە باشی لە یەك جیادەکرایەوە.

کارمەن یۆس فەرماندەی لای راستی لەشکری رۆم، فەرماندەی پێنج لژیۆن واتە سی هەزار سەرباز بوو، وەك لە بیرەوەرییەکانی خۆی وتوویەتی هیچ یەکێك لە سەربازەکانی رۆم کە ئەو رۆژە لە لای ڕاستی گۆڕەپانی جەنگی رۆم دەجەنگان، لە سێ ساڵ کەمتر خزمەتیان نەبوو، بەشێکیشیان لە سەربازە بە تەمەنەکان بوون کە چاوەڕوان بوون تا خانەنشین بکرێن. وێڕای ئەوەش کاتێك جەنگ لە ئێوارەی ئەو رۆژە وەستا، نێزیکەی شەش هەزار سەربازی رۆمەکان کوژران یاخۆ بە رادەیەك بریندار ببوون کە نەیان دەتوانی ئیدی بوەستن و توانای جەنگیان نەمابوو، جگە لە ئەمەش سێ کەس لە فەرماندەی لژیۆنەکانی رۆم کوژرا بوون.

کارمەن یۆس وەك هەر فەرماندەیەکی دیکە لە کاتی بینینی کوژرانی سەربازەکانی بە تەواوەتی ناراحەت دەبوو، بەڵام مەترسی گەورەتر لە کوژرانی سەربازەکانی هەبوو، ئەویش برێتی بوو لە لێکترازانی ریزەکانی لەشکرەکەی. ئەو دەیزانی سەربازەکانی لە گیان بەخشین ناترسن، بەڵام ناتوانن گالیسکەکان بوەستێنن، هەرچەندە هەندێکیان تێکدەشکێنن، بەڵام گالیسکەی دیکە بە دوویانەوە دێن، هەر بۆیە سەربازەکانی ناکارن بە تەواوەتیی ڕایان بگرن، چونکە دەترسا ریزەکانی لەیەك بترازێن و سەربازەکانی پەرش و بڵاو بن، ئەوکات ئەو

سەربازانە کوشتنیان لەلایەن گالیسکەکان ئاسانتر دەبوو، لەم دۆخەشدا دەبووایە خۆیان بەدەستەوە بدەن، لەبەرئەوەی سەربازی پەرش و بڵاو یاخۆ دەکوژرێت یان دیل دەکرێت، تەنانەت ئەگەر لە مردنیش باکی نەبێت.

ئەو دەیزانی ژۆلیۆسی فەرماندەی لای چەپی لەشکرەکەیان فەرماندەیەکی ئازایە، هەرچەندە خۆی فەرماندەی تەواوی سوپای رۆم نەبوو، بەڵام لە رێگەی ئەو پەیام و زانیارییانەی قوستەنتین بۆی دەنارد، دەیزانی لای چەپی سوپاکەیان گوشاری زۆری ساسانییەکانی لەسەرە. بۆیە زیاتر دەترسا کە گالیسکەکان دۆخی لەشکری ئەو تێکبدەن، ئەمەش دەبووە هۆی شکستی سوپای رۆم، نەتەنیا ئەفسەر و فەرماندەکان، بگرە لەوانە بوو ئیمپراتۆریش دیل بکرێت.

بۆیە پەیامی بۆ ئیمپراتۆر نارد کە لەوانەیە گووشاری گالیسکەکان ببێتە هۆی لێکترازانی لەشکرەکەی ئەگەر پتر بەرگری بکات، یان ڕەنگە ئەگەر ریزەکانی لەبەر یەك بترازێت، لەشکرەکەی بکەوێتە گەمارۆوە، ئەو دەمەش ئیمپراتۆریش ناکارێت هێزی یارمەتیدەری بۆ رەوانە بکات. ئەو بە باشی زانی بۆ رێگرتن لەو دۆخە، پاشەکشە بکات و لە ئیمپراتۆری ویست کە رێگەی پێ بدات بۆ پاشەکشەکرد، بەڵام ئاخۆ ئیمپراتۆر بە باشی دەزانێت کە ئەو پاشەکشە پێ بکات یاخۆ نا؟ ئیمپراتۆریش رەزامەندیی نواند تا ئەو پاشەکشە ئەنجام بدریت

لەلایەن کارمەن یۆس فەرمانی کشانەوە دەرچوو، کشانەوەی سەربازە رۆمەکان بە رێکی ئەستەم بوو، ئەوان لە کاتێکدا کە گالیسکە جەنگییەکان کەوتبوونە ناویان، نەیاندەتوانی بەو ئەرکە هەستن و دەبووایە رێگرێك بۆ گالیسکەکان هەبێت و هیچ رێگرێك لە سینگی سەربازەکان زیاتر نەبوو. بۆیە کارمەن یۆس فەرمانی بە چەند سێنتۆریەنێك کرد تا بچن و بە سەربازەکانیانەوە بەرگری بکەن، تا سەربازەکانیان بە تەواوەتیی دەکشێنەوە، ئەوانیش هەرچەندە دەیانزانی مردنیان مسۆگەرە، بەڵام فەرمانیان بەجێ گەیاند و ئامادەی گیان بەخشین بوون.

پاشەکشەی لای راستی لەشکری رۆم بووە هۆی پاشەکشەی لای چەپ و ناوەندی سوپاش، چوونکە ئەگەر دوای پاشەکشەی لای راست ئەو دوو بەشەکەی دیکەیش پاشەکشەیان نەکردبایە، دەکەوتنە نێو گەمارۆی لەشکری ساسانییەکان.

شاپووری دووەم دوای ئەوەی هەستی بە پاشەکشەی دوژمن کرد دەیتوانی فەرمانی بەردەوامی هێرشی گالیسکەکان بکات، بەڵام ئەگەر گالیسکەکان بێ پشتیوانی پیادە و

سوارەی لەشکرەکەیان بەدووی ڕۆمەکان کەوتبانە، بێگومان لەنێو دەچوون، چوونکە ئەسپەکانیان دوای ڕۆژێك لە جەنگ زۆر ماندوو ببوون و زوو لەنێو دەبران، جگە لە ماندوویەتیی ئەسپەکانی گالیسکەکان، تاکتیکی جەنگیش ڕێگەی نەدەدا گالیسکە جەنگییەکان بە تەنیا بکەونە دووی لەشکری ڕۆم، ئەگەر سەربازە ڕۆمەکان زانیبایان گالیسکەکان لە ڕاوەدوونانی ئەوان بە تەنیان، دەستبەجێ هەندێکیان دەکەوتنە بەرگری تا کات بۆ ئەوانی دیکە دەستەبەر بکەن بۆ ئەوەی بتوانن ئۆردووگەی خۆیان دامەزرێنن و بەربەستیشیان بۆ گالیسکەکان چێ دەکرد، چونکە سەربازەکانی تالێشیش نەمابوون تا بەربەستەکان لەنێو ببەن.

بە تەنیا ڕاوەدوونانی لەشکری ڕۆم لەلایەن گالیسکەکانەوە سوودی نەبوو، شاپوور هەندێ لە بەشەکانی پیادە و سوارەی لەشکرەکەی هەڵبژارد و بە فەرماندەیی ئەفسەرێك بە ناوی (بەرزان مەرد) یاخۆ (بەرزەن مەرد)ی کردە فەرماندەی ئەو لەشکرە بۆ ڕاوەدوونانی دوژمن.

ڕاونانی ئەو لەشکرە لە ڕووی تاکتیك وەك ئەرك جەنگی، بە دەستەواژەی ئەمڕۆ ئەرکێکی تاکتیکی بوو بۆ لەشکری ساسانی، دەبووایە ئەوان ئەو کارە بکەن بۆ ئەوەی ئەگەر توانای شکاندنی ڕۆمەکانیشیان نەبێت، نەهێڵن ئەوان بحەسێنەوە و خۆیان ڕێك بخەنەوە و جێگیر بن، چوونکە ئەگەر جێگیر ببوانە، دەبوونە مایەی سەرئێشەی زۆر بۆ شاپوور و لەشکرەکەی، لەوانە بوو ڕۆمەکان بگەڕێنەوە و سەرکەوتنی شاپووری دووەم بگۆڕن بۆ شکست.

جەنگی تەلخ ڕوود لە مێژووی ئێران جیا لە بابەتی سەرکەوتنی ئێران، لە مێژووی ئەو وڵاتەدا گرینگە، چونکە ئەوە یەکەمجار بوو ئەوان شەڕ لە دژی لەشکرێکی بەهێزی میناك ڕۆمی بچووك بکەن. بەر لەو سەردەمە زۆر جەنگیان لە دژی ڕۆمی گەورە ئەنجام دابوو، ئەزموونیان وەرگرت بوو و سوودیان لەو ئەزموونانە لەو جەنگە وەردەگرت، بەڵام ئەزموونی جەنگییان لەگەڵ ڕۆمی بچووك نەبوو، لەبەرئەوەی تا ئەو دەمە ئەو ئیمپراتۆرییەتە نەهات سەریهەڵنەدا بوو تا ئەوان جەنگی لەشکرەکانی ئەو ئیمپراتۆرییەتە بکەن.

ئەو ئاکامە گەورەیەیی ئێرانییان لەو جەنگە لە ڕوانگەی ئەزموونەوە وەریان گرت، ئەوە بوو کە بۆیان دەرکەوت پیادەکانی لەشکری ڕۆمی بچووك، ئازا و سەرسەختترن لە پیادەکانی لەشکری ڕۆمی گەورە، هەروەها بە هەمان شێوەی لەشکرەکانی ڕۆمی گەورە، لە لەشکری ڕۆمی بچووکیش پێکهاتەی سەرەکیی پیادەکانن، هێزی سوارەش بە پێکهاتەی دووەم

دەزانرێت. ئەو لەشكرە گرینگی بە مەنجەنیق دەدەن، بەڵام وەك رۆمی گەورە گالیسكەی جەنگیان نییە.

ئەوان بۆیان دەركەوت هۆكاری خۆڕاگری پیادەكانی لەشكری رۆمی بچووك بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ئەوان پاشماوەی نەتەوەكانی (هاتی، میتانی و كلیكین) كە لە ئاسیای بچووك دەژین، ئەوان بە راستی خۆڕاگرن لە مەیدانی جەنگ و ئەو خۆڕاگرییەیان بە میرات لە باپیرانیانەوە بۆ ماوەتەوە.

هەروەها خاڵێكی دیكەیش كە لە جەنگی تەلخ ڕوود بۆ ساسانییەكان دەركەوت، ئەوە بوو كە توندوتیژی لە سزادان و ئەو سزا توندانەی لە لەشكری رۆمی گەورە هەبوو، لە لەشكری رۆمی بچووك نابینرێت.

ساسانییەكان لە سەرەتا هۆكاری ئەوەیان نەزانی كە بۆچی سزا توندەكان كە لە رۆمی گەورە هەبوون لە لەشكری رۆمی بچووك نییە، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەوە دەگەڕایەوە بۆ هۆكاری ئاینی، چونكە ئیمپراتۆری رۆم و لەگاتەكانی لەشكرەكەی و بەشی زۆری سەربازەكانیان كریستسان بوون، ئەو ئاینەش رێگرە لە توندوتیژی.

قوستەنتینی دووەم لە سەرەتای منداڵیەوە ژیاننامەی ئەسكەندەری مەكدۆنی خوێندەوە، هەر ئەوە بووە هاندەری بۆ ئەوەی ببێتە پاوانخواز، بەڵام ئەو یەكەمین كەس نەبوو كە خوێندنەوە و زانینی ژیاننامەی ئەسكەندەر هاندەری بوو بێت بۆ ئەوەی ببێتە فرەوانخواز، تەنانەت پێشتر و دواتریش ئەو ژیاننامەیە كاریگەریی هەبووە، لەسەر چەندان كەسایەتیی وەك ناپلیۆنی یەكەمی ئیمپراتۆری فەرەنسا و وێڵ هێڵمی دووەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا، هەروەسا هیتلەریش لە نیوەی یەكەمی سەدەی رابردوودا.

ئانتی پاتێر یەكەمین مێژوونووس بوو كە سەربردەی ژیانی ئەسكەندەری نووسی و ئەو كارەی ئەنجامدا، سێ سەدە دوای ئەویش هەموو ئەوانەی لەبارەی ئەسكەندەرەوە قسەیان كردووە هەر لەو سەرچاوەیەوە وەریان گرتوە. ئانتی پاتێر دەرچووی زانستگە بوو، تاكە سەركردەی زانای نێو لەشكری ئەسكەندەر بوو، كە زۆر هۆگر و شەیدای ئەسكەندەر بوو بێت، دوای ئەوەی ئەسكەندەر لە (٣٢٣ ز) مرد، ئانتی پاتێر سەربردەی ژیانی ئەوی نووسییەوە، چوونكە لە كاتی جەنگەكاندا بەردەوام لەگەڵ ئەسكەندەر بوو، هەر بۆیە نووسینەكانیشی بە باشترین سەربردەی ژیانی ئەسكەندەر دێتە ناسین، ئەسكەندەر لە كاتی سەرەمەرگ پرسیاریان لێكرد كێ بۆ جێگرەوەی تۆ باشە، لە وەڵامدا وتی ئەو نووسەرە (مەبەست ئانتی پاتێرە).

هەر ئانتی پاتێریشە کە نووسیویەتی ئەسکەندەر لە هیندستان لە پێنج ڕووباری گەورە لە دەڤەری پێنجاب پەڕییەوە، "دوای ئەوەی لە ڕووباری (هی فازیس)یش پەڕیینەوە (لقی سەرەکیی ڕووباری سێندی ئێستە) پێمان وابوو گەیشتووینەتە کۆتایی جیهان، بەڵام بە سەرسووڕمانەوە لە خەڵکەکەی ئەوێندەر گوێبیست بووین، کە لەلای ڕۆژهەڵاتی ئەوان هەندێ وڵات هەن، ژمارەی دانیشتووانەکەیان دەگاتە ملیۆنان کەس، ئەسکەندەر وتی ئێمە دەڕۆین تا ئەو وڵاتانەش دەگرین و دەگەینە کۆتایی جیهان، بەڵام بارانێکی هێندە زۆر و بە خووڕ باری و لێی نەکردەوە، بۆیە لە ئاکامی گەرمی هەوا و بارانەوە تەواوی ئەو خواردنەی لامان بوو لەنێوچوو، تەنانەت کەرەستە چەرمیەکانی سوپاکەشمان وەك مۆم نەرم بوونەوە.

ئانتی پاتێر دەبێژێت ئەو بارانە کە سێ مانگی خایاندووە، بارانێکی تایبەتە، لە ڕاستیدا ئەو بارانە هەموو ساڵێك لە وەرزی هاویندا دەبارێت و هیندییەکان بە بارانی (بەرسات) ناوی دەبەن، بەڵام ئەو بارانە بەردەوام ئاوا بەهێز و بە لێزمە نییە، هەندێ ساڵان، وەك ئەو ساڵە بووە کە ئەسکەندەر گەیشتووەتە ئەوێندەر. هەر بۆیە ئەو بارانە زۆر لە ئەفسەر و سەرکردەکان و لەنێویشیاندا ئانتی پاتێری ناچار کرد بۆ ئەوەی گووشار بخەنە سەر ئەسکەندەر تاکو بگەڕێنەوە، پێیان وت ئەگەر بیەوێت پتر بڕوات لەگەڵیدا ناڕۆن، کەواتە پێویستە بگەڕێتەوە. ئەسکەندەر دەگەڕێتەوە و زۆر ناخایەنێت دەمرێت، ئانتی پاتێر دەنووسێت تەرمی ئەومان بە شێوازی میسرییەکان مۆمیا کرد و ناردمانەوە بۆ مەکدۆنیا بۆ ئەوەی بە خاکی بسپێرن، بەڵام هیچ شوێنەوارێك لە گۆڕی ئەسکەندەر لە مەکدۆنیا نییە و نەبووە.

ئانتی پاتێر دوای چوار ساڵ لە مردنی ئەسکەندەر دەمرێت، ژیاننامەکەی ئەسکەندەر، کە لە نووسینی ئانتی پاتێرە تا سەردەمی قوستەنتینی دووەم مایەوە، ژۆستین ئەو کەسایەتییەی ئەکادیمیای داخست، ئەو ژیاننامەیە دەخوێنێتەوە، کەواتەدەکارین بێژین ئەو ژیاننامەیە تا ساڵی (٥٢٩ ز) مایەوە، تا ئەوکات هەر کەسێك بابەتێکی لەبارەی ئەسکەندەرەوە نووسیبێت هەر لە هەمان سەرچاوەی نووسینەکەی ئانتی پاتێرەوە بووە، بەڵام ئێستە ئەو ژیاننامەیە نەماوە، بۆیە هەرچییەك لەبارەی ئەسکەندەرەوە نووسراوە، لەو کەسانەیەوە کە لەسەر زاری ئانتی پاتێرەوە گێڕاویانەتەوە، چونکە بیۆگرافیای سەرەکیی لەنێو چووە.

قوستەنتینی دووەم هێرشی کردە سەر ئێران تا وەك ئەو ئێران داگیر بکات، دواتریش بچێتە هیندستان بۆ ئەوەی ببێتە جیهانگیر، بەڵام دوای ئەوەی لە تەلخ ڕوود شکستی خوارد، ناچار بوو پاشەکشە بکات و نەیدەتوانی دەست لەو ئارەزووەی هەڵبگرێت.

ئەو وای دەزانی دوای ئەوەی لە ڕووباری ئاراس دەپەڕێتەوە و دەگاتە ئەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆ هی تورکیایە و بەشی ناوەند و ڕۆژئاواکەی ئەوکات سەر بە ئیمپراتۆرییەتەکەی قوستەنتین بوو، لەوێندەر داوا لە پاشاکانی ناوچەکە دەکات بۆ ئەوەی هێزی بۆ پێکبهێنن و لەشکرێکی بەهێز چێ دەکات و دەگەڕێتەوە و شاپووری دووەم شکست دەدات و هەموو ئێران دەگرێت و بەرەو هیندستان دەڕوات.

لە سەردەمانی کۆنەوە ڕێگەی باو بۆ پەڕینەوە لە ڕووباری ئاراس شوێنێك بوو بە ناوی (پردی خوداکرد) کە لە سەردەمە جیاوازەکاندا ناوی جیاوازیی هەبووە، لە چەند سەدەی رابردووش تا بە ئێستە دەگات بە ناوی (پردی خوداکرد) ماوە، ئەمڕۆ کەوتووەتە ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات.

ئەو رشووبارە لە کۆنەوە جگە لەو پردە، پردی هەمیشەیی دیکەی نەبووە، بۆیە لە دەڤەرەیلی دیکەدا ئەوانەی دەیان ویست لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە لە ڕێگەی بەلەم یاخۆ لە بوارەکانی ئەو ڕووبارە دەپەڕینەوە، دانیشتووانی هەردوو کەنارەکانی ئەو ڕووبارە شوێنی بوار و پەڕینەوەکانیان دەناسی و سوودیان لێ وەردەگرتن.

قوستەنتینی دووەم لە ناوچەیەك جەنگی کردبوو کە ئازەربایجانی ڕۆژئاوای ئێستە بوو، نەیدەتوانی خۆی بگەیەنێتە ئەو پردە بۆ پەڕینەوە. ئەو دەیەویست زۆر بلەز بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی، بۆیە ئەگەر بە پردەکەدا ڕۆیشتبا، ڕێگەی دوور دەکەوتەوە و دەبووایە بچێتە قەوقاز بەرەو ڕۆژئاوا لە کەناری باکوری ئاراس ڕێگە ببڕێت تا دەگاتەوە، بۆیە قوستەنتینی دووەم بە ڕێگەکانی ناوچەیەکدا ڕۆیشت، کە ئەو دەمە (ماکا) و ئێستەش بە (ماکو) ناسراوە، ناکرێت گومانمان هەبێت لە ئەوەی ئەم گۆڕانکارییە بە هۆی زاراوەی دەڤەرەکەوە هاتووەتە دی.

قوستەنتینی دووەم بۆ ئەوەی زوو بگاتەوە وڵاتی خۆی، دەبووایە بەرەو ڕۆژئاوا بە ناوچەی (سلمس)، کە دواتر بوو بە (سەڵماس)دا بڕوات بۆ ئەوەی خێراتر بگات، بەڵام لەو ناوچەیەدا خێڵە گەورەکان هەبوون کە بۆ ئەو دەبوونە مایەی سەرئێشە و جەنگ، بۆیە تۆزێك سووڕانەوە و دوورخستنەوەی ڕێگەکەی بە پەسەند زانی. ئەو ڕێگەیەی قوستەنین پێیدا ڕۆیشت ئەوی

دەگەیاندە نێزیك ئارارات، ئاشکرایە ئارارات دوو شاخن کەوتوونەتە باکوری ڕووباری ئاراس و پێوەندییان بە شاخەکانی دیکەوە نییە.

سەرداری ساسانی (بەرزان مەرد) کە فەرمانی پێکرا بوو، بەشێك لە پیادە و سوارە و گالیسکە جەنگییەکانی ببات بۆ ڕاوەدوونانی قوستەنتین، تەنانەت یەك ڕۆژ دەرفەتی پشووی بە ئەو نەدا، چوونکە دەیزانی ئەگەر دەرفەتی بدات، دەکارێت خۆی ڕێك بخاتەوە و بگەڕێتەوە و دەستدرێژی و هێرش بکاتەوە.

بەرزان مەرد شەو و ڕۆژ بێ پشوودان و گوێدان بە سەربازەکانی، دووی ئەوان کەوت تا گەیشتە ڕووباری ئاراس و وەرزی هەڵکشان و سەرکێشی ئاوی ئاراس کە دەکەوتە وەرزی بەهار بە کوتا هاتبوو، بەڵام هەندێ کات ڕووباری ئاراس لە وەرزی هاوین و بە هۆی بارانی لەپڕ لە سەرچاوەکەی، دووچاری پڕ ئاوی و هەڵکشان دەبوو، بەڵام ئەو جۆرە سەرکێشیانە کاتی بوون، تەنیا یەك یاخۆ دوو ڕۆژی دەخایاند.

لەشکرە شکاوەکەی قوستەنتین لە سەرەتای هاوین گەیشتنە ئاراس، کاتێك گەیشتن ڕووبارەکە هەڵکشابوو، بۆیە تژی بوو لە ئاو. ئەوانەی لە جوگرافیا دەزانن لەوە تێدەگەن کە ڕووباری ئاراس بە هۆی ڕێڕەوەکەی کە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵاتە، نشێوی زۆری هەیە، بۆیە تەنانەت لە کاتە ئاساییەکاندا ئاوەکەی بەخوڕە، لە بەهاراندا لەکاتی هەڵکشانی ئاوی ڕووبارەکەدا، خەڵك لەسەر ئەو پردەوە یاخۆ لە ڕێگەی بەلەمەوە لەمبەری ڕووبارەکەوە دەپەڕینەوە ئەوبەر، چونکەپەڕینەوە لە بوارەکانی ئەو ڕووبارە یەکجار ئەستەم بوو.

ئیمپراتۆری ڕۆمی ڕۆژهەڵات کاتێك گەیشت، بەو ئومێدەوە بوو، کە بکارێت لەو بوارە بپەڕێتەوە کە بە بواری ئارارات ناسرا بوو، بەڵام هەڵکشانی ڕووبارەکە ببووە ڕێگر لەبەردەم پەڕینەوەیدا. دانیشتووانی دەڤەرەکە پێیان وتن ئەو هەڵکشانەی ڕووبارەکە کاتییە و بە هۆی بارانی لەناکاو لە سەرچاوەکانی ئەو ڕووبارە ڕوویداوە، ئەگەر تا ئێوارە نەنیشێتەوە بۆ سپێدەی بەیانی یاخۆ ئێوارەی ڕۆژی دواتر دەنیشێتەوە و ئەوان دەکارن بە بێ مەترسی لە بوارەکە بپەڕنەوە.

قوستەنتین دەیزانی لەشکرێك بەدووی کەوتووە، بۆیە فەرمانی کرد تا هەرچی بەلەم لە سەرەوە و خوارەوەی ڕووبارەکە هەیە، بیهێنن بۆ ئەوەی لەشکرەکەی بپەڕێتەوە بۆ کەنارەکانی باکوری ڕووبارەکە، بەڵام دە تا پازدە بەلەم لە بەشەکانی سەرەوە و خوارەوەی ئاراس دەست

کەوت، کە ئەوەش بۆ پەڕینەوەی لەشکری ڕۆم بۆ باکور یەکجار کەم بوو، هەرگیزاو هەرگیز بەشی نەدەکرد.

بەرزان مەرد پێشبینیی نەدەکرد کاتی گەیشتنی لەشکری ڕۆم بۆ ئاراس، ئاوی ڕووبارەکە بەو ئاوایە هەڵکشا بێت، بەڵام دەیزانی پەڕینەوەی لەشکرێکی مەزن لە ڕووبارێك بە یەك یاخۆ دوو دەمژمێر ئەنجام نادرێت، قوستەنتینی دووەم بە لانی کەم ڕۆژێکی پێویستە، کەواتە بۆ پەڕاندنەوەی لەشکرەکەی بە درەنگ دەکەوێت، بۆیە پێش ئەوەی بگاتە یەك فەرسەنگی زێی ئاراس، فەرمانی کرد لەشکرەکەی ڕازاندنەوەی جەنگی وەربگرن و بەو ڕازاندنەوەیە بەرەو دوژمن بڕۆن.

پێ دەشتی ڕووباری ئاراس بە درێژایی ملیۆنان ساڵ ڕێڕەوی ئاوەکەی بە هۆی نیشتەنییەکان چێ بووە و پێ دەشتێکە لە هەندێ شوێن لە باکورەوە بەرەو باشوور پانتایی زۆرە، لە هەندێ شوێنی دیکەش لە ئاراستەی باکور بۆ باشوور تەسك دەبێتەوە.

لە دەڤەری هەردوو شاخی ئارارات ئەو پانتاییە کەمە و لەشکری ڕۆم هەوڵیان دەدا بێ ڕازاندنەوەی جەنگی بپەڕنەوە، تا ئەو کاتیش قوستەنتین دوودڵ بوو لە ئەوەی تا سپێدەی بەیانی چاوەڕێ بکات یاخۆ بە هۆی پەتەوە لەشکرەکەی بپەڕێنێتەوە.

ئەمەش بەو شێوەیە دەبوو کە پەتەکان لەلایەن هەندێ ئەسپسوارەوە لە ئاوی ڕووبارەکە دەپەڕێندرانەوە و لە کەناری باشووری زێ دەبەستران، سەرەکانی دیکەیشی لە کەناری باکور بە هەندێ ئەستوون دەبەسترانەوە کە بە قایمی لە زەوی دەچەقێندران و پیادەکان خۆیان بەو پەتانەوە دەگرت و پێیان دەپەڕینەوە، ئەسپ مەلەوانی باش بوو، بە ئاسانی توانای پەڕینەوەی هەبوو و خێراتر بوو، بەڵام ئەگەر دوو کەس بە یەك ئەسپ بپەڕنەوە، ئەوا تەوژمی ئاو بە هۆی قورسییەوە ئەسپ و سەرنشینەکانی دەبرد. بۆیە ئەگەر سی تا چل پەت بە سەر ئاوەکەدا ڕایەڵ کرابووایە، ئەوا لەشکرەکە بە ئاسانی لە ماوەی یەك ڕۆژدا توانای پەڕینەوەیان دەبوو.

سەرکردەی ساسانی بە لەشکرەکەیەوە کە ئامادە ببوو بۆ جەنگ و ناوەند و هەردوو لای سوپای دانابوو، گەیشتە بەرانبەر ڕووبارەکە و هێرشیان کرد.

ئاشکرایە سوپایەك کە لە کەناری ڕووبار و بێ ئامادەیی سەربازی وەستابێت، لەلایەن سوپایەك کە ئارایشی جەنگی هەبێت و لەپڕ هێرشی بکرێتە سەر، دەکەوێتە چ دۆخێك. لە هەموو لەشکری ڕۆم تەنیا یەك لژیۆن نەبوو کە ئامادە بوربێت بۆ جەنگ، ئەوەی زۆر بە خێرایی توانی خۆی خڕبکاتەوە، لژیۆنێك ئامادەی جەنگ بکات، فەرماندە کارمەن یۆس بوو.

ئەو بیرۆکەی پەڕینەوەی وەلانا و فەرمانی کرد تا لژیۆنەکانی پشت لە ڕووبار و ڕوو لە سوپای ساسانی بە شمشێر و پێلاکانیان بکەونە جەنگ.

ئەو ڕۆژەی بەرزان مەرد هێرشی بۆ لەشکری ڕۆم لە کەناری ئاراس کرد، دوارۆژی مانگی یەکەمی هاوین بوو. لەو شوێنەی ساسانییەکان هێرشیان کرد، بناری چیاکانی ئارارات بە باشی دەبینران و لە بناری شاخ، ژمارەیەکی زۆر رەزی کێوی هەبوو، کچە گەنجەگان سەرگەرمی لێ کردنەوەی ترێی رەزەکان بوون، ئەوان دیمەنی یەکدیی کوشتنی سەربازەکانی هەردوو لایان بە باشی دەبینی.

لە بنارەکانی ئارارات دوو وەرز بۆ لێکردنەوەی ترێ هەبوو، یەکیان وەرزی گەیشتنی بەرسیلە و دواتر وەرزی گەیشتن و لێکردنەوەی ترێ. ئەوان برسیلەیان دەچنی تا سرکەی پێ چێ بکەن بۆ ترشیات، ئەو ترشیاتەی لەو سرکەیە دەکرا هۆکاری تەمەن درێژی یەك سەدەیی ژنان و پیاوانی ئەو دەڤەرە بوون ئەوان هەرگیز بە سرکەی ترێ ترشیاتیان نەدەکرد.

لای ئێمە ئاشکرا نییە کە خەڵکی ئەو دەڤەرە چۆن دەیان زانی سرکەی بەرسیلەی ترێ هۆکارێکە بۆ تەمەن درێژی.

ئێستە زانست بۆی دەرکەوتووە، کە ئەو کەسانەی ئاوی بەرسیلە دەخۆنەوە دووچاری هەندێ نەخۆشی وەك (سوودای سەفراوی و سوودای بەڵغەمی. ئۆرە و ئەسید ئۆریك) نابن، ئاوی بەرسیلە ئەو دوو نەخۆشییە بە تەواوەتیی لەو کەسانە دوور دەخاتەوە.

لە هەندێ لە ناوچە گەرمێنەکانی ئازەربایجان لەو وەرزەی ساڵدا ترێ شیرن دەبوو، بەڵام لە بناری ئەو دوو شاخە کە کوێستان بوون تا دوو مانگ دواتر ڤێجا ترێ شیرن دەبوو، چوونکە ئەو شوێنە کوێستانە و ئەوکات سەرگەرمی بەرسیلە چنین دەبوون، دوو مانگ دواتریش واتە لە کۆتایی هاوین بۆ ترێی شیرن دەهاتنەوە. ئێستە هیچ شوێنەواری ئەو رەزانە نەماون بە هۆی سووانی خاکەوە، تەواوی خاکی بە پیتی ئەوێندەرێ، سوواوە و داخوراوە، لە ئێستەدا لەو بنارانە هیچ ڕووەکێکی بە سوود نابینرێت، تەنیا لە نێزیك لووتکەی شاخەکان، هەندێ درەختی کوێستانی هەیە.

ئەو کچانەی ئەو ڕۆژە لەو بنارە بەرسیلەیان دەکردەوە، هەرچەندە کەمێك مەودا لە نێوانیان هەبوو، بەڵام مەیدانی جەنگ و هەردوو کەناری ئاراسیان بە شێوەیەك دەبینی وەك ئەوەی لەژێر قاچەکانیان بێت، هەڵبەتە بەرزی شوێنەکەیان هۆکارێکی گرینگ بوو لەو ڕووەوە، لەو دەڤەرە نەتەنیا هیچ شاخی دیکە نەبوو، بگرە خەرەند و گردوولکەش نەبوون تا مەودای

بینینی ئەوان دوور بکەنەوە. ڕەنگە لە شوێنی دیکە بە هۆی بوونی چیا و خەرەند و گرد و...هتد کە بەرز و نزمیان زۆرە، تەماشاکەر ناکارێت هەموو شوێنەکان ببینێت، بۆیە وا بیربکاتەوە کە جیهان بۆ ئەوە چێ کراوە تا ئەو توانای بینینی هەبێت، تەنانەت ئەگەر کەسێك لە لووتکەی شاخەکانی ئەلپ یاخۆ هیمالایا بێت، ئەو بیرکردنەوەیەی بۆ نایەت، چوونکە لە لای ڕاست و چەپ و لە پێش و لە دواوەی لووتکەی دیکە هەنە، بە زمانی بێ زمانی پێی دەڵێن تەنیا تۆ لە بەرزی نیت، خەڵکی دیکەیش لە بەرزایین، بەڵام لەو ناوچەی ئاراراتی لێیە، هیچ لووتکەی دیکە نییە تا کەس جگە لە خۆت ببینی، ئەم سرووشتەش بۆتە هۆکار بۆ چێ بوونی دەیان ئەفسانە و چیرۆك. ژاك دۆ مۆرگانی فەرەنسی کە خۆی چۆتە سەر هەردوو شاخەکە، لە پەڕتووکە گرانبەهاکەی خۆیدا بە ناوی (مێژووی ئەرمەنستان) نووسیویەتی: ئەگەر بۆ یەکجار سەر ئەو شاخانە بکەون تێدەگەن هۆکاری چێبوونی ئەو هەموو ئەفسانەیە و مانەوەیان تا بە ئێستە دەگات چییە!.

دوای گەیشتنیان بۆ کەناری ڕووبار، سەرداری ساسانی هیچ دوودڵی نەنواند لە بەکارخستنی گالیسکە جەنگییەکان، چوونکە ئەو پێدەشتە وەك ئەوە وابوو کە دەستکرد بێت و بۆ مەیدانی جەنگ ڕێکخرابێت. گالیسکەکان ریزیان یەکخست و بە خێرایی یەکجار زۆر کەوتنەڕێ، ئەگەر شەوبایە بریسکەی لێکخشانی ئەڵقەکانیان و وردەبەردەکان دەردەکەوت.

لە کەناری ڕووبارەکە سەربازە ڕۆمەکان لە چاوەڕوانی پەڕینەوە، بە پەرش و بڵاوی وەستابوون، لە ناکاو گالیسکەکان گەیشتن، وەستاندنی گالیسکەکان ئامراز و ڕێکاری خۆی هەبوو، تازە کات نەمابوو. ریزی یەکەمی گالیسکەکان هێندە خێرابوون کە نەیانتوانی لە کاتی گەیشتن بە ئاوەکە بوەستن، لە ئاویاندا و هەندێکیان تا ئەوبەری ئاو ڕۆیشتن، هەندێکیش بە هۆی تەوژمی ئاو توانیان خێراییان کەم بکەنەوە و لە نێوەڕاستی ئاوەکە بگەڕێنەوە.

لە هەندێ لەو بەشانەی لەشکری ڕۆم کە کەوتبوونە بەر هێرشی گالیسکەکان، هیچ توانایەکی بە بایەخ بۆ جەنگ نەما، بە شێوەیەکی لێهات کە سەربازەکان کەوتن یاخۆ ئەوانەی مابوون، نەیاندەتوانی خۆیان ڕێکبخەن لە چوارچێوەی یەکەی جیادا. هەندێ لەو سەربازانە کاتێك بینییان گالیسکەکان بەرەو ڕوویان دێن و توانای بەرگریان نییە و تەنیا ڕێگەیان هەڵاتنە، ناچار خۆیان لە ڕووبارەکە دەدا، ئەگەر توانای پەڕینەوەیان ببووایە، خۆیان دەگەیاندە ئەوبەری ڕووبارەکە و دەگەیشتنە کەناری باکور و لەوێوە ڕێك دەڕۆیشتن تا دەرنەکەون کە هەڵاتوون، چوونکە هەڵاتن لە لژیۆنەکانی ڕۆمی بچووك هەروەك ڕۆمی گەورە سزای مردن بوو.

قوستەنتینی دووەم کریستیان بوو، بۆ ڕێزلێنان لە عیسای مەسیح کە لە خاچ درابوو، سەربازی خۆی وەك ڕۆمی گەورە لە خاچ نەدەدا، بەڵام فەرمانی دەکرد دەستی لە پشتەوە ببەستن و لەسەر چۆك دوای بەستنی چۆکەکانی دایبنێن، دواجار بە شمشێر یاخۆ بە تەوری قورس سەریان لە لاشەی جیا دەکردەوە.

بۆیە ئەو سەربازانەی دەگەیشتنە ئەوبەر، رایان دەکرد بۆ بناری شاخ و وایاندەزانی لەوێ دەگەنە جەنگەڵ، کە دەگەیشتن دەیان بینیی ئەوە ڕەزی ترێیە و خەڵك لەنێویاندا سەرگەرمی بەرسیلە چنینەوەن. ئەوان بۆ ئەوەی ئاشکرا نەکرێن، یارمەتی بەرسیلە چنەکانیان کرد تا جەنگ تەواو بوو، دواتر بوونە دیلی ساسانییەکان، ئەوانیش بە ناوی (ڕۆمە غورەییەکان) واتە ئەو ڕۆمانەی لەنێو بەرسیلە بوون ناویان دەبردن.

لەنێو بەشەکانی لەشکری ڕۆمی بچووك، بەشەکەی کارمەن یۆس توانیان بە تەواوەتی و بە ڕێکی وەك لژیۆن بکشێنەوە و لە ڕووبار بپەڕنەوە، بەم شێوەیەش ئەو جەنگە لە شکست زیاتری بۆ قوستەنتینی دووەم بەدی نەهێنا.

● ❊ ❊ ❊

شاپووری دووەم لە کاتی جەنگی تەلخ ڕوود تەمەنی سیساڵ بوو، مێژوونووسی ئەرمەنی (سەبە ئەوس) لە باسی ئەودا دەڵێت کە وەك کریستیانەکان تەنیا یەك ژنی هەبوو، پاشا ساسانییەکان ژمارەی زۆریان ژن هێناوە، بەڵام ئەمە لە سەرەتا نەبووە، دواتر سەریهەڵداوە، کارمەن یۆس لە بیرەوەریەکانی خۆیدا نووسیویەتی: ئێرانییان بە هۆی ئاینی زەردەشتەوە نەیاندەتوانی لە ژنێك پتر بێنن، بەڵام شاپووری دووەم و شازادەکانی ساسانی دەکارن هەر ژمارەیەك بخوازن ژن بێنن، چوونکە ڕێسا ئاینییەکان لەو ڕووەوە ئازادی کردوون.

وێڕای ئەوەی زانیارییە مێژووییەکان لەبارەی سەردەمی ساسانییەکان زۆر پترە لە هی سەردەمی ئەشکانییەکان، بەڵام دیسان هەندێ بابەت لامان شاراوەیە و نازانین بابەتی فرە ژنهێنان لە سەردەمی ساسانییەکان لە کەیەوە دەستی پێکردووە و گەیشتووەتە ئەو زێدەڕۆییەی کە تەنانەت خۆشیان بکەونە کێشەوە و خەرجی ئەو هەموو ژنانەیان پێ نەدرێت.

لە مێژووی ڕۆژهەڵاتدا نووسراوە کە خەسرەو پەروێز دوازدە هەزار ژنی هەبووە، ئەو ژمارەیە بە ئاشکرا دیارە کە زێدەڕۆیی تێدا کراوە، چوونکە ئەگەر خەسرەو هەر ژنێکی لەشەوێکدا ببینێت، بۆ ئەمە پێویستی بە پتر لە سی و شەش ساڵ دەبێت، بەڵام ئەگەر لەو ژمارەیە دە هەزار کەم بکەینەوە و پەسەندی بکەین، کە تەنیا دوو هەزار ژنیشی هەبووبێت،

دیسان بە ڕەچاوکردنی ئەوەی ئەوانە هەموویان خۆیان بە شاژن دەزانی، بە هەبوونی ئەو پێگەیە دەیانتوانی وەك شاژن بژین و هەر یەکەیان دەیان ویست لە جوانکاری لە پێش ئەوانی دیکەوە بێت، بەم ئاوایە خەرجی لە رادە بەدەریان پێویست دەبوو کە لە توانای پاشا نەدەما.

بۆیە کاتێك پەڕتووکی (ویدن گێرن) ئێرانناسی سویدی و مامۆستای زانکۆی ئۆپسالا دەخوێنینەوە کە لە کۆتایی سەردەمی ساسانییەکاندا هەندێ کات خەرجی حەرەمسەرا و ژنەکانی پاشا ساسانییەکان لە خەرجی لەشکرەکانیان زۆرتر بووە، نابێت لۆمەی بکەین کە مێژوونووسان سوودیان لە توانای بیرکردنەوەی خۆیان وەرگرتووە و ئەمە راستی نییە.

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی زاینیدا دووجار فەتحعلی شا و ئیمپراتۆرەکانی رووسیا پێکەوە جەنگان، خولی یەکەمی جەنگەکان ماوەی دە ساڵیان خایاند، سەرەنجام بە پەیماننامەی (گوڵستان) کۆتاییان هات، خولی دووەمیش بیست مانگی خایاند و بە پەیماننامەی (تورکمان چای) کۆتایی هات.

لە هەردوو خولی جەنگدا (عەباس میرزای کوڕی فەتحعلی شا) فەرماندەی گشتیی لەشکری ئێران و جێنشینی پاشا بوو.

لە خولی دووەمی ئەو جەنگەدا عەباس میرزا بۆ خەرجی جەنگ و مووچەی سەربازەکان و پێداویستییەکان بە گشتیی پێنج سەد هەزار تمەنی پێویست بوو، ئەم پارەیەی لە باوکی ویست.

فەتحعلی شا ئەو پارەیەی پێ نەدا، هەر بۆیە عەباس میرزا شکستی خوارد و رووسیای تزاری هاتن و تەورێزیان گرت، دواتر عەباس میرزا داوای لە باڵیۆزی بەریتانیا لە ئێران (ئیلچی) کرد تا بکەوێتە نێوانیان، ئیدی جەنگ کۆتایی هات و پەیمانی تورکمان چای بەسترا، هەردوو ویلایەتی (ئێرەوان و نەخچەوان) بوونە هی رووسیا، جگە لەو دوو ویلایەتانەی بە هۆی پەیماننامەی گوڵستان لە ئێران جیا بوونەوە.

ئەگەر فەتحعلی شا ئەو پارەیەی دابووایە، لەوانەیە عەباس میرزا شکستی نەخواردبایە، ئەگەریش شکستی خوارد بایە بەو شێوەیە نەدەبوو کە تەورێزی لە دەست دەربچێت، بە گریمانی بەهێز لە کاتی پەیماننامەی ئاشتی هەردوو ویلایەتی ئێرەوان و نەخچەوان بۆ ئێران دەمانەوە. واتە ئەو ویلایەتانە لە پای خەرج نەکردنی پێنج سەد هەزار تمەن بوو، هاوکات خەرجی حەرەمسەرا و ژنەکانی فەتحعلی شا بریتی بوو لە چوار سەد هەزار تمەن.

ئەو ڕووداوە مێژووییە پاڵپشتە بۆ وتەکەی ویدن گێرن کە دەڵێت خەرجی حەرەمسەراکان لە هی لەشکرەکانیان پتر بوو، ئەوە دەردەکەوێت کە ئەو وتەیە خەیاڵ نەبووە و بەشێکە لە راستی.

شاپووری دووەم یەك ژنی هەبوو، بۆیە خەرجی حەرەمسەرای لە ئەستۆ نەبوو، تواناشی هەبوو کاتی پتر بۆ کاروباری دەوڵەت و لەشکر تەرخان بکات. ئەو لە نێوان هەموو یارییە وەرزشییەکاندا، پتر سەرگەرم و زۆر هۆگری (یاری چۆگان)[١٣] بوو، لە سەردەمی پاشایەتیی ئەودا ئەو یارییە لە تەواوی ئێران پەرەی سەند. ئەو زۆر هۆگری ئەو یارییە بووە و تا ئەو رادەیە رۆیشتووە کە هەندێك وایان بیرکردووەتەوە کە ئەو داهێنەری ئەو یارییەیە.

ئێراننااسان بەو وتەیە ڕازی نین و لە پەڕتووکی (ئاناباس)ی (گزنفۆن) کە لە (٤٠٠ پ. ز) نووسراوە، باس لەو یارییە کراوە و ئەو پەڕتووکە باسی گەڕانەوەی ئەو دە هەزار سەربازە یۆنانییەی کە لە ئێران سەرباز بوون و لەگەڵ گزنفۆن دا گەڕانەوە بۆ یۆنان دەکات. هەرچەندە گزنفۆن باس لە شێوەی یارییەکە ناکات، بەڵام ناوی دەبات، ئەمەش نیشاندەری بوونی ئەو یارییەیە لە سەردەمی هەخامەنشییەکان و بە گریمانی زۆر لە سەردەمی ئەشکانییەکانیش هەبووە، لە دوای سەردەمی شاپووری دووەم زۆر پەرەی سەندووە و بۆتە یاری خانەدان و دەسەڵاتدارەکان.

یاریکردن بە گۆ واتە گۆیێن لەنێو چینەکانی دیکەشدا هەبوو، بەڵام بە دار نەبوو، ئەوانیش وەك لە یاری چۆگان دەبوونە دوو دەستە و هەر دەستەیەك بۆ خۆی گۆڵێکی دادەنا و هەوڵی دەدا گۆیەکە بباتە نێو گۆڵی بەرانبەر. ئەوان تۆپەکەیان بەپێی رێسای تایبەت و بە دەست بۆ یەکدیی دەهاویشت و هەموو ئەندامانی تیمێك هاوکار دەبوون بۆ بەرێوەچوونی یارییەکەیان و بردنەوەی یارییەکە بۆ خۆیان.

---

(١٣) ئەو یارییە لەسەر ئەسپەوە دەکرێت و گۆیەك لە شێوەی تۆپ لە ناوەندی مەیدان دەبێت و دوو دەستە لە سوارەکان یاری بەو گۆیە دەکەن، ناوی چۆگانە، ناوێکی کوردییە. "وەرگێڕی کوردی"

# سەرەنجامی شوومی سێ هاوپەیمانەکە

سەربردە و چۆنییەتی لە دایکبوونی شاپووری دووەمی پاشای ساسانی لەلایەن تەواوی هۆگرانی مێژووی ئێران زانراوە، هەروەها زانیارییان هەیە کە ئەو لەوکاتەی لەنێو سکی دایکیدا دەبێت بوو بە پاشا.

ئەوکات لە ئاگرخانەی شیز کە نها بە تەختی سلێمان ناسراوە، موبیدەك هەبوو مێژوونووسانی رۆمی بە (گاوار) ناویان بردووە، نازانین کە لە زاراوەی پەهلەوی ساسانیش هەمان ناو بووە یاخۆ ئەرمەنییەکان بە شێوە زاری خۆیان ناویان بردووە.

گاوار وتی: (ئەو کۆرپەیەی ئێستە لە سکی خێزانی هورمزی دووەمدایە، بێگومان کوڕە و دەتوانرێت بۆ پاشایەتیی دەستنیشان بکرێت، ئەگەر کۆرپەکە کوڕ نەبوو، من خۆم دەخەمە نێو ئاگری ئاگرخانەکەوە تا بسووتێم.)

هورمزی دووەم، واتە باوکی شاپووری دووەم بەر لە مردن کوڕێکی بەناوی هورمزد هەبوو، ئەگەر ببووایە بە پاشا، بە هورمزی سێیەم دەناسرا، ئەو هەرچەندە لە شاپووری دووەم گەورەتر بوو، بەڵام نەبوو بە پاشا و پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی لاویەتیی لە کۆشکی باوکی هەڵات و رۆیشت بۆ رۆم.

رۆیشتنی ئەو بۆ رۆم لە گەرمەی ئەوکاتە بوو کە دوژمنکاری لە نێوان ئێران و رۆم هاتبووە کایەوە. دیرۆکی ئێمە لەو روانگەوە ونە و زانیاریمان لەو بارەوە نییە، کە هورمزد بۆ رایکرد و رۆیشت بۆ رۆم، ئەوەی لەو بارەوە دەیزانین بە گشتیی لە زمانی مێژوونووسە رۆمەکانە و ئەوانیش لەو بارەوە هیچ نووسینیان نییە.

کاتێك هورمزی دووەم مرد، دەبووایە کوڕەکەی ببێتە جێنشینی، ئەویش نەتەنیا لە کۆشك نەبوو، بگرە بە هۆی هەڵاتنی بۆ رۆم بە وتەی مێژوونووسە رۆمەکان و بە تایبەتی (ئەمانۆس مارسێلی نۆس) لەلایەن باوکییەوە لە میراتی پاشایەتیی شۆرا و بێبەش کرابوو.

هورمزی دووەم بۆ ئێران نەگەڕایەوە، بۆیە براکەی واتە شاپووری دووەم کە لە دایکی ئەو نەبوو گەیشتە سەر تەختی پاشایەتیی. کاتێك شاپووری دووەم منداڵ بوو، نەدەزانرا چەندە لە برا گەورەکەی خۆی دەچێت، بەڵام دوای ئەوەی شاپووری دووەم گەورە بوو، ئەوانەی هورمزیان لە ڕۆم دەبینیی دەیانزانی شاپوور چەندە لە ئەو دەچێت.

لە مێژووی ئێران، دووجار هەڵکەوت بوو کە دوو شازادە بەو رادەیە لێك بچن، کە خەڵك نەیدەتوانی لەیەکیان جیا بکاتەوە. هورمز کە برا گەورە بوو هیچ کات هەوڵی نەدا سوود لە لێکچوونی خۆی و براکەی وەربگرێت، بەو شێوەیەی لە سەردەمی هەخامەنشییەکان لە ئەفسانە دەچوو، دەسەڵات بگرێتە دەست، بەڵام چوونکە ئەو لە شاپووری دووەم گەورەتر بوو، حکوومەتی ڕۆم لە سەردەمی ئیمپراتۆر ژۆلیندا ویستیان بۆ دژایەتی شاپوور سوودی سیاسیی لە ئەو لە دژی شاپووری دووەم وەربگرن.

ناوی ژۆلین لە دەقە لاتینییەکان هەمان (پۆلیانۆس) بووە، بەڵام چوونکە لە سەد و پەنجا ساڵی رابردوودا ناوی ئیمپراتۆرە ڕۆمەکان لەلایەن فەرەنسییەکانەوە گەیشتووەتە ئێران، هەمان ئەو ناوانەی ئەوان نووسیویانە واتە ژۆلین ناسراوترە.

هورمز لە ڕۆم ژیانی باش بوو، کۆمەڵێك کۆیلەی هەبوو کە کشتووکاڵیان بۆ دەکرد، هەروەها ئەو کارگەیەکی دڵۆپاندنی عەتر و بۆنی هەبوو، کۆیلەکانی تێیدا کاریان دەکرد، ئەو لە ڕووی مادی هیچ پێویستی نەبوو تا بیەوێت ڕوو لە سیاسەت بکات، بەڵام ئیمپراتۆری ڕۆم دەیەویست لەگەڵ شاپوور بجەنگێت، بۆیە هانی دەدا تا بێتە نێو سیاسەت.

لەنێو ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم، ژۆلین کەسێکی تایبەت بوو، ئەو زانا بوو و مێژووی ڕۆمی دەناسی و کاریگەریی فەرهەنگی ڕۆمی باستانی لەسەر بوو، ئەو کاریگەرییە بە رادەیەك بوو کە بڕیاریدا ئاینی کریستیان کە ببوو بە ئاینی ڕۆم، لابدات و ئاینە کۆنەکەی ڕۆم کە کۆمەڵێك خوداوەندی هەبوو بکاتەوە ئاینی ڕۆم.

ئیمپراتۆرەکانی ڕۆم بۆ ئەوەی خەڵك باوەڕیان بە ئاینی مەسیح نەمێنت، ئازاریان دەدان و دەیانکوشتن و دەیاندان بە ئاژەڵە دڕندەکان، بەڵام ژۆلین کە خۆی لە ئاینی کریستیان هەڵگەڕا بۆوە، بە ژوولینی مورتەد و هەڵگەڕاو ناو دەبرا، باوەڕی وابوو کە نابێت ئەوان ئازار بدات، بۆ ئەوەی ئەوان لە ئاینەکەیان پاشگەز ببنەوە، پێویستە ئاشنایان بکاتەوە بە فەرهەنگی ڕۆمی کۆن.

ژۆلین بۆ ئەم مەبەستە لە سێرکی گەورەی رۆم کە ناوی (کۆلیزە) بوو، هەموو جۆرە یاری و پێکەوە جەنگانێکی یاساخ کرد، کۆمەڵێك وتاربێژی ڕاسپارد تا لە بەیانییەوە تا ئێواریٚ لەوێندەر بۆ خەڵك بئاخڤن و وتار بدەن، لەسەر دەرگەی کۆلیزە کەتیبەیەکیان هەڵواسی کە تیایدا نووسرا بوو:"بچۆ ژوورەوە و ئاگەدار لە مێژووی باپیرانت ببە".

لە ئاکامدا کەس نەدەچوو سێرك، تەنیا ئەو کەسانە نەبێت کە دەیان ویست وا دەربخەن، کە لایەنگری بیرۆکەی ژۆلینن و باوەڕیان بە ئاین و فەرهەنگی کۆنی رۆم هێناوە، ئەمە لە کاتێك بوو کە هیچ کات بە قەدەر ئەو کات کە سەدەی چوارەمی زاینی بوو، خەڵك رانەهاتبوو بە چوون بۆ سێرك.

لە رۆم ئەوانەی رەگەزنامەی رۆمیان هەبوو، کۆیلە نەبوون، بە درێژایی تەمەن مووچەیان لە حکوومەت وەردەگرت و هیچ کاریان نەدەکرد، ئەوان هەموو کاتەکانی خۆیان بە خۆشگوزەرانی و سەرگەرمی دەبردەسەر. ئەوان رۆژانە بۆ بینینیی یارییەکان دەچوونە سێرك و ئەو کاتانەی سێرك نەبوو، ڕوویان دەکردە گەرماوەکان و لەوێندەر دەمانەوە، وتمان کە گەرماوەکان تەواوی بابەتەکانی سەرگەرمی و لەنێویشیاندا پەڕتووکخانەی لیٚ بوو.

لە کۆمەڵگەیەك کە بەو شێوەیە بێکار و خۆشگوزەران بێت و یارییەکانی سێرك باشترین سەرگەرمی خەڵك بن، ژۆلین ـ یش سێرك و یارییەکانی داخات و بیکاتە شوێنی وتاربێژی و کەسیش ناچار بە کوێگرتن نەکات، کەس ناچار نابێت بچێتە سێرك بۆ گوێگرتن لە وتاربێژەکان.

مێژوونووسانی ئێستە دەڵێن ژۆلین دەروون پاك و مرۆڤ دۆست بوو، بەڵام لە دەروونناسی نەدەزانی، ئەگەر زانیبای سێرکەکانی دانەدەخست و نەیدەگۆڕین بە شوێنی وتاربێژی، هورمزی برای شاپووریشی نەدەنارد بۆ ئێران تا مەسیحی و زەردەشتییەکان بانگهێشت بکات بۆ وازهێنان لە ئاینەکانیان و ڕووکردنە ئاینە کۆنەکەی رۆم.

ژۆلین شارەزای دەروونناسی نەبوو، بەڵام ئایا هورمزیش ئەوندە ناشارەزا بوو کە نەیدەزانی توانای نییە بە بانگەشەکردن، ئێرانییەکان ناچار بە وازهێنان لە ئاینی خۆیان بکەن و هانیان بدات بۆ باوەڕهێنان بە ئاینی فرە خوداوەندیی رۆمی کۆن و هاوبەش چێکردن بۆ خودا؟.

بۆ وەڵامی ئەو بابەتە سیٚ خاڵ هەیە کە باسیان بکەین:

یەکەم: کاتێك هورمز لە وڵاتی خۆی و لە کۆشکی بابی رایکرد، هێشتا لە تەمەنی لاویدا بوو، ئاشکرایە کە کەسێك لەو تەمەنەدا کاتێك دەچێتە وڵاتێکی دیکە، هەموو یاخۆ بەشێك

لە کولتووری وڵاتی خۆی لە بیر دەکات، ئەمە وا دەکات هەڵگری کولتووری ئەو وڵاتە یاخۆ کۆمەڵگەیە بێت، کە ئەوی تێیدادەژی.

دووەم: لە سەدەی چوارەمی زایینیدا ئامرازەکانی پێوەندیی وەك ئێستە نەبوون، هورمز کە لە تەمەنی منداڵی وڵاتی خۆی جێ هێشتبوو، نەیدەتوانی بە ئاسانی پێوەندیی بە وڵاتەکەی خۆی بکاتەوە و بەردەوام لە دۆخی کۆمەڵگەکەی خۆی ئاگەدار بێت، بۆیە لەوە تێ نەدەگەیشت کە ئەستەمە بتوانێت ئاینی هاووڵاتییەکانی خۆی بە رێگەی بانگەشە بگۆڕێت و فرە خوداوەندییان تێدا بڵاو بکاتەوە.

سێیەم: ژۆلین بەڵێنی بە هورمز دابوو ئەگەر ئەو زەردەشتی و مەسیحییەکانی ئێران باوەڕ پێ بهێنێت بۆ سەر ئاینی رۆمی کۆن، ئەو دەکاتە پاشای ئێران.

ئەو کاتەی ژۆلین ویستی لەشکر ببات بۆ سەر ساسانییەکان، تەمەنی شاپووری دووەم پەنجا و دوو ساڵ بوو، بێگومان هورمزیش ئەو کات لە تەمەنی ئەو گەورەتر بووە.

ئێمە زانیاریمان نییە کە هورمز لە چ تەمەنێك بووە، کە لە کۆشکی باوکی هەڵاتووە، تەنیا دەکارین بەپێی لێکدانەوە بڵێین تەمەنی ئەو لەو کاتەی ژۆلین نیازی لەشکرکێشیی هەبوو لە شەست ساڵ پتر بووە.

هورمز ئەوکات لە تەمەنی لاوی نەبوو تا بگوترێت بیری لە گەیشتن بە تەختی پاشایەتیی کردووەتەوە، تەنیا لەبەرئەوەی بە درێژایی تەمەنی خۆی بە خاوەن مافی پاشایەتیی ساسانی زانیوە و ژۆلینیش ئەو بەڵێنەی پێدابوو، بۆیە بیری دەکردەوە کە دەگاتە ئاواتی چەندین ساڵەی خۆی.

هەرچەندە ژۆلین دەیویست مەسیحی و زەردەشتییەکان بێنێتە سەر ئاینی کۆنی رۆم، بەڵام وێڕای ئەوەش جەنگی ئەو لەگەڵ شاپووردا جەنگێکی ئاینی نەبوو.

ئەوانەی وتوویانە هۆکاری سەرەکیی زۆرینەی جەنگەکان ئابوورییە، جگە لە هەندێ ڕووداو و جەنگی تایبەت، وتەیەکی راستیان درووژاندووە. شاپووری دووەم کڕین و فرۆشتنی تەواوی کاڵاکانی رۆمی لە سنووری ئیمپراتۆرییەتەکەی یاساخ کرد، ئەم یاساخکردنەش، دەوڵەمەند و خودان سەرمایەکانی رۆمی زۆر تووڕە کرد.

لە رۆم کرێکار و کۆیلەکان خودان هیچ شتێك نەبوون تا ئەو یاساخکردنە ئەوان تووڕە بکات، بازرگانی رۆم لە دەریا و وشکانی لە دەست ئەو کەسانە بوو کە خودان رەگەزنامەی رۆم بوون.

باسی ئەو خاڵە پێویستە کە لە نێوان بازرگانە ڕۆمەکان چینێك دەبینران کە لە کۆیلە ئازادکراوەکان بوون، بە (ئەفرانشی) ناو دەبران، ئەوان هاووڵاتیی پلە دوو بوون، کۆیلەکان تەنانەت دوای ئازادکردنیشیان بۆیان نەبوو ببنە هاووڵاتیی پلە یەکی ڕۆمی. ئەوان ئەگەر لە کاتی کۆیلایەتیدا توانیبیان کەمێك سەرمایە بۆ خۆیان دابین بکەن، دوای ئازادبوونیان دەستیان دەکرد بە وردە بازرگانی و ئاڵوگۆڕی کاڵا و نەیاندەتوانی کشتووکاڵ بکەن، بۆ کشتوکاڵ پێویستیان بە دەستەبەرکردنی زەوی هەبوو، یاسای ڕۆم ڕێگەی کڕینی زەوی بە ئەوان نەدەدا. بۆیە ئەوان تەنیا بازرگانیان دەکرد، ئەگەر شتێك لە پیشەسازیان زانیبووایە، بۆ خۆیان دووکانێکیان دەکردەوە و بەرهەمی دەستی خۆیان لەو دووکانەدا دەفرۆشت.

بەم شێوەیە بازرگانی وشکانی و دەریایی ڕۆم تەنیا بە دەست ئەوانە بوو کە ڕەگەزنامی ڕۆمیان هەبوو، ئەو یاساخکردنەی کاڵا ڕۆمیەکان کە شاپوور خستبوویەوە زیانی بە ئەوان دەگەیاند.

یەکێك لەو وڵاتانەی نەدەبوو کاڵاکانی ڕۆمی تێدا بفرۆشرێت، ئەرمەنستان بوو، ئەو وڵاتە لە سەردەمی ساسانییەکاندا چەندین جار بووە هۆی ململانێ و جەنگ لە نێوان ڕۆم و ساسانییەکان.

ئەوکاتەی ژۆلین نیازی لەشکرکێشیی بۆ سەر ساسانییەکان هەبوو، پاشای ئەو وڵاتە ناوی (ئاراسکی سێیەم) یاخۆ (ئەشکی سێیەم) بوو، ئەو نەیدەویست فەرمانی شاپووری دووەم سەبارەت بە یاساخی کاڵاکانی ڕۆم جێبەجێ بکات، بەو پێیەی ئەرمەنستان بە وڵاتی ژێردەستی ساسانی هەژمار دەکرا.

ئەو دەیزانی پاشای ساسانی نافەرمانی ئەو نابەخشێت و پێشبینیی دەکرد، کە ئەو لەشکرکێشیی دەکاتە سەر ئەرمەنستان، بۆیە کاتێك بیستی ژۆلین بە نیازی جەنگی ساسانییەکانە، بڕیاریدا تا بە هاوکاری لەشکری ڕۆم بچێتە جەنگ لە دژی ساسانییەکان.

لەشکری ڕۆم بەپێی نووسینی (ئەمیانۆس مارسێلی نۆس) لە دوازدە لژیۆن واتە حەفتا و دوو هەزار کەس پێك هاتبوو.

پاشای ئەرمەنیش سێ لژیۆن و بە گێڕانەوەیەکی دیکە چوار لژیۆنی ئامادە کرد، بەڵام مارسێلی سێ لژیۆنەکە بە ڕاست دەزانێت.

هورمز کە لەگەڵ ئیمپراتۆری ڕۆم بەرەو ئێران کەوتەڕێ، خاوەن لەشکر نەبوو، تەنیا یەك سێنتۆریەن واتە سەد سەربازی سوارەی هەبوو کە لەنێو کۆیلەکانی خۆیدا دیاری کرد بوون.

بەو پێیە لە ئەوەی مارسێلی نۆس نووسیویەتیی دەتوانین بزانین کە پاشاکانی رۆم و ئەرمەنستان پێکەوە نەوەد هەزار سەربازیان بۆ جەنگ دەهێنا.

کاتێك شاپووری دووەم بیستی هێزی هەردوو پاشای رۆم و ئەرمەنستان لە میزۆپۆتامیا نێزیك دەبنەوە داوای لە (ئەنجومەنی پیاوە کۆنەکان) کرد تا فەرمانی جەنگ بەرانبەر بە ئەو دوو وڵاتە دەربکەن. ئایا ئەو ئەنجومەنە کە لە سەردەمی شاپوور دامەزرا، لاسایی کردنەوەی رۆمەکان بوو؟.

گومان نییە ساسانییەکان زۆر بابەتیان لە رۆمەکان وەرگرتووە، هەروەك رۆمەکانیش لە ساسانییەکان هەندێ بابەتیان وەرگرتووە.

ناوی ئەنجومەنە (پیاوە کۆنەکان) یاخۆ (بەتەمەنەکان) تەواو لێك چووە لە ڕووی واتاوە بە ناوی ئەنجومەنی سیناتی رۆم.

وشەی سینات لە وشەی سیناتۆس، ئەویش لە (سێناکس) کە لاتینییە، وەرگیرابوو، هیچ کەس لە رۆمی رابردوو نەدەبوو بە ئەندامی سینات تا تەمەنی نەگاتە شەست ساڵ. دوورنییە ئەنجومەنی پیاوە کۆنەکانی سەردەمی شاپوور، لە رۆمەکان وەرگیرا بێت و دوای دروستبوونی ئەو ئەنجوومەنە، هەرکات شاپوور دەچوو بۆ جەنگ رەزامەندی ئەوانی وەردەگرت.

زانیاریمان نییە کە ئایا ئەو ئەنجومەنە لە ئێران دەسەڵاتیی چ بووە و ئایا وەك ئەنجومەنی سیناتی رۆم یاخۆ پەرلەمانەکانی ئێستە توانای دانانی یاسای هەبووە یان نا، ئەوەی ئێمە دەیزانین تەنیا لەسەر زانیاریی ئەرمەنەکانە، لە سەرچاوە ئێرانییەکان ناوی ئەو ئەنجومەنە نەهاتووە، بۆیە ئێمەش نامانەوێت خۆمان مەزەندە بۆ دەسەڵات و کارەکانی ئەو ئەنجومەنە بکەین.

شاپووری دووەم بۆ رێگرتن لە لەشکری رۆم و لەشکری ئەرمەنستان فەرمانی بە یەك لە فەرماندەکانی گالیسکە جەنگییەکان بە ناوی (مهران) کرد، کە بە ئەرتشتار ناودەبرا و لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بوو، ئەو ڕێڕەوی هاتنی لەشکری ئەو پاشایانەی دەزانی کە هورمزیشیان لەگەڵدا بوو، ئەوکات شاپووری دووەم لە تەمەنی پەنجا و دوو ساڵیدا بوو.

مەبەستی ژۆلین لە رۆیشتن بەرەو میزۆپۆتامیا داگیرکردنی تیسفون بوو، بە باوەڕی ئەو ئەگەر ئەو شارە داگیر کرابووایە، تەنانەت ئەگەر شاپووریش مابایە، نەیدەتوانی بەرگری بکات، بەڵام ئەگەر لە رێگەیەکی دیکەوە هێرش بکات، ئەگەر لە رێگە شکستیش نەخوات، ئەوا زۆر دەخایەنێت تا خۆی بگەیێنێتە تیسفونی پایتەختی شاپووری دووەم. بۆیە بڕیاریدا تا

بچێته تیسفون و پێشبینیی دەکرد، کە دوای داگیرکردنی تیسفون، شاپووری دووەم ئەگەر لە جەنگیشدا نەکوژرێت یاخۆ دیل نەبێت ئەوا بە دڵنیاییەوە ناکارێت بەررەڤانی پتر بکات.

مهران نیازی دوژمنی لە هاتن بەرەو میزۆپۆتامیا دەزانی، بەڵام هەوڵی نەدا پێش ئەوەی ژۆلین و ئەشکی سێیەم بگەنە ئەویٚ، رێگەیان بگرێت، چوونکە پێدەشتەکانی میزۆپۆتامیای بۆ بەکارخستنی گالیسکەکان پیٚ باشتر بوو.

مهران لەو کەسانە بوو کە فەرماندەیی گالیسکە جەنگییەکانی لە بابیەوە بۆ مابۆوە، لە گەنجیەوە ببوو بە ئەرتشتار واتە لێخوڕی گالیسکەی جەنگی.

مهران لە تیرەی سیستان (سەگستان) بوو، خۆی باڵابەرز و چوارشانە بوو، دوای ئەوەی هاتە نێو ریزی سوپای گالیسکەکان، بەهێزتر و ئازاتر بوو. ئەو لە تەمەنی پەنجاساڵی بوو ریشی دادەنا، کاتێك بە جلوبەرگی ئەرتشتارەکانەوە دەوەستا و ئارمی ئەوانی بە کەمەری هەڵدەواسی، زۆر شکۆمەند دەردەکەوت و ئارمی ئەوان برێتی بوو لە گورزێکی سووك و کورت.

ئەوکات مهران سیٚ کوڕی گەیشتبوونە تەمەنی لاوی و هەرسێکیان ئەرتشتار بوون، لەگەڵ باوکیان بۆ ئەو جەنگە دەچوون، بەپێی نەریت هەر یەکەیان پلەیەکی سەربازی ئاستی خوارەوەیان هەبوو.

مهران لە دووەمین مانگی بەهاردا دوای ئەوەی لەشکرەکەی خۆی لە ناوچەی نێوان دوو زێی دیجلە و فورات پەڕاندەوە و گەیشتە بواری فورات کە بە باشی شارەزای بوو، لەو بوارە پەڕییەوە و لە کەناری راستی ڕووبار واتە لای رۆژئاوای زیٚ خۆی بۆ بەرگری ئامادە کرد، وەك خۆپارێزی تا رێگە نەدات دوژمن توانای پەڕینەوە لە یەکێك لە دوو بوارەکانی باکور و باشووری فورات بۆ کەناری رۆژهەڵاتی نەبێت، هەردوو بوارەکەی داگیرکرد.

مهران دڵنیا بوو سوپای رۆم و ئەرمەن ناچارن بە کەنارەکانی فوراتدا بەرەو تیسفون بێن تەنانەت ئەگەر نەشیانەوێت، چوونکە پێویستیان بە ئاو بۆ لەشکرەکەیان هەیە، بۆیە هەردوو بواری باکور و باشووری ئەو زێیەی داگیرکرد. ئەو دەیزانی ئەو لەشکرە تەنیا لە ڕێگەی ئەو بوارانە دەکارێت بپەڕێتەوە یاخۆ پێویستە پرد چیٚ بکات، بۆیە ئەگەر بیانویستبایە پرد چیٚ بکەن، دەیخستنە کێشەی بەردەوام تا نەتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن.

ژۆلین بەردەوام چاوەڕوانی هاتنی هەواڵ و راپۆرت بوو لەلایەن پێشەنگی لەشکرەکەی، کاتێك زانی بواری ناوەندی فورات لەلایەن ساسانییەکانەوە داگیر کراوە، لە پێنج فەرسەخی

فورات چاوەڕوانی کرد تا لە دۆخی دوو بوارەکەی دیکەیش ئاگەدار بێت و زانی ئەوانیش داگیر کراون.

ژۆلین کاتێك زانی بێ جەنگ ناتوانێت لە یەك لەو دوو بوارە بپەڕێتەوە، تێگەیشت کە گرینگتر لە پەڕینەوە لەو بوارانە، بەدەست هێنانی ئاوە بۆ لەشکرەکەی.

لژیۆنە رۆمەکان ئەزموونی هەزار سالەیان هەبوو لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشە و ئاریشەکانی جەنگ، بۆیە دوای راوێژی ئیمپراتۆر بە فەرماندەی لژیۆنەکان، دەستیان کرد بە هەڵکەندنی بیر بۆ ئاو، ئەرمەنییەکانیش لاسایی ئەوانیان کردەوە. لە کەناری زێ ئەگەر بیریان هەڵکەندبووایە تەنیا دوای چەند مەترێك دەگەیشتە ئاو، بەڵام ئەوان لە ئاو زۆر دووربوون و بە ئاسانی نەدەگەیشتنە ئاو.

هورمزی برا گەورەی شاپووری دووەم پێشنیازی بۆ ژۆلین کرد بۆ ئەوەی زوو بگەنە ئاو، بچن لە ئاواییەکان خەڵکی شارەزا لە بواری ئاو بێنن، ئەسپسوارە رۆمەکان بلەز رۆیشتن بۆ شارێك لە پشتەوە کە ناوی (راکا) بوو، کەسێکیان هێنا کە زۆر شارەزا بوو، دەیتوانی شوێنی ئاویان بۆ دیاری بکات. لەکاتێکدا نە رۆم و نە ئەرمەنەکان نەیانتوانی ئاو بدۆزنەوە، ئاشکرایە سەرباز و ئاژەڵەکان لە ئازاری تینوویەتیدا چەندە رەنج و ناخۆشی دەبینن، بۆیە ژۆلین فەرمانی کرد تا لە دوا مەنزڵی نێزیك بە شێوەی زنجیرەیی ئاو بێنن و بیدەن بە کەسانی تینوو و بە تایبەتی بە ئەسپەکان، بەڵام دوای گەیشتنی ئەو کەسەی شارەزای شوێنی ئاوی ژێرزەوی بوو، بە زوویی ئەوان گەیشتن بە ئاو، لە سەرەتادا ئاوەکە لیڵ بوو و سوودی بۆ خواردنەوە نەبوو، هەر بۆیە چەندان چاڵی گەورەیان هەڵکەند تا ئاو بچێتە نێویان، دواتریش ئاوە لیڵەکە بنیشێتەوە، بۆ ئەوەی بە کەڵکی خواردنەوەی مرۆڤەیل و ئاژەڵەکان بێت.

مهران دەیزانی لەشکری دوژمن لە کوێیە، ئەویش لە ڕێگەی ئەو راپۆرتانەوە کە لە پێشەنگی لەشکرەکەیەوە بۆی دەهات، هەر بۆیە دەیزانی ئەوان بۆ دەستکەوتنی ئاو، چەندین بیری ئاویان هەڵکەندووە.

ئەگەر کەسێکی دیکە لە جیاتی مهران بووایە، لەوانە بوو هەوڵیدابایە لە بیابان هێرش بکاتە سەر دوژمن و تێکیان بشکێنێت، چونکە دوژمن ناتوانێت لە بیرە ئاوەکانی دوور بکەوێتەوە و داببڕێت، بەڵام ئەو لە ڕێسای جەنگی رۆم ئاگەدار بوو، دەیزانی لەشکری رۆم لە کاتی ڕێپێوان و رۆیشتن بۆ جەنگ لە هەر شوێنێك بن، تەنانەت ئەگەر بۆ شەوێکیش بمێننەوە،

به دەوری خۆیان دیوارێك چێ دەكەن تا لە دوژمن و پەلاماری لە ناكاو پارێزراو بن، ئەگەر دوژمن لە شەویشدا هێرشی كردە سەریان لەنێو ئۆردووگەدا بپارێزرێن.

مهران دەیزانی بە سەرنجدان لەوەی باس كرا، هێرشكردن بۆ سەر لەشكری هاوبەشی رۆم و ئەرمەن لەو دەڤەرە بێ سوودە، لەشكری ئەوان پازدە لژیۆن واتە نەوەد هەزار كەس و لەشكری خۆی نێزیكەی چل هەزار كەسە، هەندێك لە لەشكرەكەیشی بۆ پارێزگاری دوو بوارەكە دانراون، بۆیە ئەگەر هێرش بكات، هەندێ لە گالیسكە و سەربازەكانی لەدەست دەدات و ناچار بە پاشەكشە دەبێت، ئەوكات لەوانەیە دوژمن دژە هێرش بكات و لەشكرەكەی لەنێو ببات. بۆیە بە ئەفسەرەكانی وت كە پێویستە لە بیابان و ئەوكاتەی لەشكری رۆم لە دەرەوەی خێوەتگەیە، هێرشی بكرێتە سەر، بە پێچەوانەوە هێرش بێ سوودە و وەك مست لێدانە لە پۆڵا، هەر بۆیە ئەفسەرەكانیشی ئەو بیرۆكەیان بە پەسەند زانی.

مێژوونووسە ئەرمەنییەكان نووسیویانە كە لەشكری هاوبەش ماوەی چوار یاخۆ پێنج رۆژ لەو شوێنە مانەوە، دواتر ژۆلین بڕیاریدا لە بواری ناوەڕاستی فورات بپەڕێتەوە.

ژۆلین و ئاراسك خەڵكی ئەو دەڤەرە نەبوون و نەیاندەزانی لەو وەرزە لەوانەیە بارانی بەخوڕ لەو ببارێت، بەڵام مهران لەو بابەتە ئاگەدار بوو، هەركە زانی هەوا فێنك بوو، فەرمانی بە ئەفسەرەكانی كرد تا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ باران ئامادەبن.

كەناری رۆژئاوای فورات كە ئۆردووگەی مهرانی لێ بوو لە شوێنێك بوو كە بەرزتر بوو لە ڕووبارەكە، لە هەمان رۆژدا لەشكری رۆم كەوتنەڕێ تا لە بواری ناوەندی فورات بپەڕنەوە و خۆیان بگەیەنن بە كەناری رۆژئاوای ڕووباری فورات. مهران لە دۆخی كەشوهەوا بۆی دەركەوت كە بارانی ئەو رۆژە درێژە دەكێشێت و تا ئەوكاتیش لەشكری هاوبەش نەگەیشت بووە شوێنێك، كە بكارێت لە ئەوان نێزیك ببێتەوە، هاوكات ئاوی ڕووباری فورات تا رادەیەكی بەرچاو بەرز ببۆوە.

ئەوانەی وڵاتی عێراق بە میزۆپۆتامیا ناو دەبەن، لە راستیدا ناوێكی باشیان بۆ داناوە و بە درێژایی مێژوو، جوگرافیای ئەو وڵاتە لە ڕووی سرووشتییەوە بە دۆخی نێوان ئەو دوو ڕووبارە بەستراوە بووە. ئەو دوو ڕووبارە بە هۆی وشكەساڵی و زۆری باران بارین بە درێژایی هەزاران ساڵی بەدوای یەكدا، دەیان جار ڕێڕەویان تێكەڵ و لە یەك جیابۆتەوە، ئێستە چیدی ئەو تێكەڵ بوون و لەیەك دابڕانە بە هۆی چێكردنی كۆمەڵێك بەنداو لەسەر ڕێڕەوەكانی ئەو ئاوانە، ڕوونادات‌ەوە و ئەو بەنداوانە رێگرن لەو ڕووداوانە. وێڕای ئەوەش بە دوور نازانرێت باران بارینی

دووبارەی زۆر ببێتە هۆی بەرگە نەگرتنی بەنداوەکان و دووبارە زۆر بوونەوەی ئاو و دروست بوونی دەریایەك لە نێوان ئەو دوو ڕووبارەوە. بە باوەڕی هەندێ لەزەویناسان تۆفانی نووح لە ئاکامی یەکێك لە بارانە تووند و بەردەوامەکان و سەرکێشی ئاوی ئەو دوو ڕووبارە بووە.

کاتێك مهران بۆی دەرکەوت ئاوی فورات زیادی کردووە و پێدەچێت باران بارین بەردەوام بێت، فەرمانی بە فەرماندەکانی ڕاست و چەپ و ناوەندی سوپاکەی کرد تا پاشەکشە بکەن بەرەو باشوور، فەرماندەی ڕاست (فەرامەرزی کوڕی) و (خۆر) فەرماندەی لای چەپ و مهرداد فەرماندەی ناوەندی سوپاکەی بوون.

پاشەکشە لەژێر ڕێژنەی باران سەخت و ئازاربەخش بوو، بەڵام سەربازە ساسانییەکان بە فەرمانی ئەفسەرەکانیان خۆیان ئامادە کرد و زۆر بۆیان سەخت نەبوو، بەڵام بۆ ڕۆم و ئەرمەنییەکان ئەو بارانە یەکجار سەخت و دژوار بوو، لە لای ئەوان وەك بەڵایەکی ئاسمانی وابوو.

دوای ئەوەی لەشکری ساسانی بەرەو باشوور ڕۆیشت، ڕێگە بۆ لەشکری هاوبەشی ڕۆم و ئەرمەنستان کرایەوە.

لە ڕۆژانی پێش باران، بە هۆی گەرماوە، هەریەکە لە ژۆلین و ئاراسك بە تەختی ڕەوان سەردانی لەشکری خۆیان دەکرد و یەکەکانیان بەسەر دەکردەوە، ئەو ڕۆژەش کە بۆ جەنگ دەهاتن، بە هۆی باران بارینەوە بە تەختی ڕەوان ڕێگەیان دەبڕی، بەڵام ژۆلین لە تەختێکدا بوو، تەختی تایبەتی خۆی بوو، ئاراسکیش بە تەختی تایبەتی خۆی دەڕۆیشت، ئیمپراتۆری ڕۆم خۆی بە گەورەتر لە ئەوە دەزانی کە لەگەڵ پاشای ئەرمەن بە یەك تەخت بڕۆن، ئەگەر ڕاسپاردەشیان بۆ یەکدیی هەبووایە لە ڕێگەی ئەفسەرەکانەوە بۆ یەکدییان دەنارد.

ئاراسك لە پەیامێك بۆ ئیمپراتۆری ڕۆم کە بە ڕێگەی یەکێك لە ئەفسەرەکانییەوە ناردی، وتی لەشکری ساسانی بەدەست بارانەوە لە ئازاردان و پاشەکشەیان بەرەو باشوور کردووە، ئەگەر قوڕ و لیتە نەبنە ڕێگر، چەند ڕۆژێکی دیکە دەگەنە تیسفون.

ئەگەر سوپای هاوبەش توانیبای لە فورات بپەڕێتەوە، زۆر لە تیسفون نێزیك دەبوونەوە، بەڵام پێشەنگی لەشکری ڕۆم هەواڵی گەیاند کە ئاوی فورات زۆر بەرز بۆتەوە. ژۆلین و ئاراسك ئەو هەواڵەیان بە ڕێگر بۆ پەڕینەوە لە ڕووبارەکە دانەنا و وایان زانی لەشکرەکەیان بە ئاسانی لە بوارەکە دەپەڕێتەوە، بەڵام کاتێك هەردووکیان لەژێر باران باریندا گەیشتنە ڕووبارەکە، بینییان کە ئاو زۆر هەڵکشاوە.

هەرچەندە هەردوو پاشا زۆر لە بابەت بوارەکانیان نەدەزانی، بەڵام ئەوەیان دەزانی کە بوار برێتییە لەو شوێنەی ڕووبار کە پانییەکەی زۆر زیاد دەکات و بەرزی ئاو هێندە کەم دەبێتەوە کە دەگاتە ئەژنۆی مرۆڤ، ئەگەر زۆرتر بێت لەوانەیە بۆ پەڕینەوەی کاروانەکان و سەربازەکان کێشە بنێتەوە. هەرچەندە هەندێ جار ئاو دەگاتە ناوقەدی یاخۆ کەمەری مرۆڤ، هەرچەندە ئەو دەمەش نابێتە کێشە لە بەردەمیدا بۆ پەڕینەوە، بەڵام پێویستە خۆپارێزی بکرێت.

ئەو رۆژە ئەو دوو پاشایە لە رێگەی سەربازەکانەوە قووڵی ئاوەکەیان تاقی کردەوە و بۆیان دەرکەوت نەتەنیا ئاو لە کەمەری مرۆڤ بەرزترە، بگرە لە باڵای مرۆڤی ئاسایی یەکجار بەرزترە، بۆیە نەك تەنیا پیادەکان ناکارن بپەڕنەوە، بگرە ئەسپیش کە مەلەوانە ناتوانێت لەو ئاوە بپەڕێتەوە و خۆی بگەیەنێتە ئەوبەری ڕووبارەکە. ئەوکات ئەوان زانیان بۆچی لەشکری ساسانی کشاوەتەوە، ئەوان بۆیان ڕوون بۆوە کە لەشکری ساسانی بەرەو باشوور رۆیشتوون تا هانی ئەوان بدەن لە ڕووبارەکە نێزیك ببنەوە.

کاتێك لەشکری هاوبەش گەیشتنە کەناری فورات، نیوەڕۆ بوو، وەك هەر ئیمپراتۆرێکی دیکە بۆ ژۆلین، مریشك و کەڵەشێری زیندوویان دەهێنا و لە رێگە و لەکاتی خۆیدا بۆیان سەردەبڕی و لە چێشتخانەی تایبەت بۆیان ئامادە دەکرد. کەڵەشێرەکان لەوکاتەدا بە خوێندنی خۆیان نیشانیاندا کە کاتی نیوەڕۆیە، ئەفسەرانی گالیسکەکانی گواستنەوەش بە دەژمێری لمین زانیان کاتی نیوەڕۆیە.

کاتێك دوو پاشاکە بۆیان دەرکەوت کە ناتوانن بپەڕنەوە و دەبێت چاوەرێ بن تا ئاو دادەکشێتەوە و نەوی دەبێتەوە، فەرمانیان کرد تا خێوەتگەی لەشکر ئامادە بکرێت، ئەو کارەش بۆ سەربازەکانی هەردوو لا لەژێر باران و لە زەوی قوڕاودا زۆر سەخت بوو، بەڵام ئەوان هیچ چارەیان نەبوو، جگە لە بەجێ گەیاندنی فەرمانی ئەفسەرەکانیان.

گالیسکەکانی فەرامەرزی فەرماندەی لای راستی لەشکری ساسانی کە گەیشت بوونە رۆژئاوای لەشکری ئەرمەن و رۆم، رێگەیان نەدا ئەوان بکارن بە ئاسوودەیی و لەژێر باراندا خێوەتگەکەیان ساز بکەن و لە رۆژئاوای ئەوانەوە دەرکەوتن.

زەوی بە هۆی بارانەوە بە تەواوەتی تەڕ ببوو، بەڵام بە شێوەیەك نەبوو، کە تایەی گالیسکەکان لەنێوی بچەقێت یاخۆ رۆبچێت. لە بەرانبەریشدا گالیسکەکان کە لە رۆژئاواوە دەهاتن، دەکەوتنە ئەو نشێوەی خێوەتگەی رۆم و ئەرمەنی لێ ئامادە دەکرا، ئەو نشێوە بە سوود بوو بۆ خێراتر رۆیشتنی گالیسکەکان. ئەسپەکان نەتەنیا بە بارانەکە نەکەوتبوونە

کێشەوە، بگرە بە هۆی گەرمای ڕۆژانی میزۆپۆتامیاوە بە بارانەکە ئاسوودە ببوون و فێنك ببوونەوە.

سەری گالیسکەکان بە کوتاڵێکی چنراو لە مووی بزن داپۆشرا بوون، ئەو کوتاڵە ڕێگر بوو لە هاتنی ئاوی باران بۆ نێو گالیسکەکان و توانای ئەو کوتاڵانە بە شێوەیەك بوو، کە ئەگەر چەند ڕۆژێك باران باریبووایە، ئاویان دانەدەدا و ئەو سەربازانەیان ئازار نەدەدا کە لەنێو گالیسکەکان لە چاوەڕوانی هێرش و دەستپێکی جەنگدا بوون. هاوکات لەگەڵ هێرشی فەرامەرز بۆ سەر لەشکری هاوبەش، مهرانی باوکی کە فەرماندەی گشتیی لەشکری ساسانی بوو بە پیادەکانییەوە لە باشوورەوە هێرشیان کرد.

کەنارەکانی ڕۆژئاوای فورات وەك هەموو شوێنەکانی دیکەی میزۆپۆتامیا بە هۆی نیشتەنییەکانەوە بە ئاوایەك ئاودز بوون، هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات لە رابردوو زۆر پان و پڕ ئاوتر بوون لە ئیستەدا، ئەو قوڕ و لیتانەیان هەردەم دەهێنا و لە میزۆپۆتامیا کەڵەکە دەبوون و دەنیشنەوە. لەو دەڤەرە نیشتەنییە لە بەشێك لە ڕۆژئاوای ڕووباری فورات لە بابلی کۆن تا پەنجا کیلۆمەتر بەرەو باکور، زەوی لە تۆژاڵێك لەقوڕ و لیتە پێکهاتووە کە لە کاتەکانی باران باریندا پێکدێت، کە ئەمەش وا دەکات جووڵە و ڕۆیشتنی ئاژەڵە سمدار و ڕێبواران سەخت و دژوار بکات کە پێڵاویان لە پێیە. لەو دەڤەرە سەختە تەنیا یەك ئاژەڵ بە سانایی دەکارێت ڕێ بکات، ئەویش وشترە، لەوکاتانەدا دەست و قاچەکانی وەك سەرین لەسەر گڵەکە ڕێك دەبێت و ڕۆیشتنی ئاسان دەکات.

سەربازە ساسانییەکانیش لە سەرەتای بەهار و لە کاتی نەورۆز پێڵاوی هاوینەیان بە ناوی (چەمووش) وەردەگرت کە لە قوڕ ڕۆنەدەچوو.

لە سەردەمی ساسانییەکان یاخۆ سەردەمی شاپووری دووەم کە مێژوونووسە ئەرمەنییەکان باسیان کردووە، بۆ هەر سەربازێك لە وەرزی بەهار لەگەڵ جلوبەرگی هاوینەدا، جووتێك پێڵاوی هاوینی و دوو جووت پێڵاوی کەتانیان دەدانێ. کەتان بریتی بوو لە کوتاڵێك کە یەك بست پان و پێنج بست درێژ بوو، سەربازە ئێرانییەکان هەر جووتێك لەو کوتاڵەیان لە پێیەکیان دەبەست و تا سەر گۆزینگی قاچیان دەهات، دوای ئەوە پێیان دەخستە نێو (چەمووش) و بە قایشە باریکەکەی دایان دەخست، چەمووش بریتی بوو لە پارچە چەرمێکی بەهێز و نەرم، کاتێك پێیەکانیان دەنایە نێوی و قایشەکانیان دادەخست، ئەو چەرمە بە تەواوەتی پێیەکانی

دادەپۆشین و دەبوو بە قالبی پێیەکانیان. چوونکە هەریەکە لە پێیەکانی سەرباز بە جووتێك لە کەتانی دادەپۆشران، کاتێك ڕێگەی دەبڕی هەستی بە نارێکییەکانی زەوی نەدەکرد.

نەوەی نوێی لاوانمان کاتێك دەبینن کوتاڵی کەتان لە ئەورووپا و بە تایبەتی لە فەرەنساوە بۆ ئێران دێت، پێیان وایە ئەو کوتاڵە لە داهێنانی ئەورووپاییە. ئەوان نازانن لە سەردەمی هەخامەنشییەکان کەتان بەرهەم هاتووە، دواتر لە سەردەمی ساسانییەکاندا چەند جۆر کوتاڵی کەتان هەبووە، بە هەمان شێوە کە کوتاڵە پشمەکان لە ڕووی زبری و نەرمییەوە چەندان جۆرێکن، بە هەمان شێوازیش کەتان چەند جۆرێك بوو، جۆرە نەرمەکانی لە دەرەوەی ئێران بە نرخی بەرز دەفرۆشران. جگە لەوە تا سەدەیەك بەر لە نها لە ئێران لە کرکی بزن و مەڕ جۆرە کوتاڵێکیان چێ دەکرد بە ناوی (بەرەك) کە لە کوتاڵی ئاوریشم نەرمتر بوو، لە زستاندا لەشی مرۆڤەکانی گەرم دەکردەوە، بەڵام ئێستە لە ئێران و تەنانەت وڵاتانی دیکەش کوتاڵێك نادۆزینەوە کە لە ڕووی نەرمییەوە و جوانییەوە هاوتای بەرەك بێت.

ئەو کەتانەی سەربازەکان لە هاوین دەیان کردە پێیان بە ئاسانی بە هەندێ پاك کەرەوە دەشۆرا و دەخرایە بەر هەتاو، دوای کەمێك هەر زوو وشك دەبۆوە. چەمووش بە مەبەستی پۆششی پێیەکانیان دەدرا بە سەربازانی ساسانی، ئەو ڕۆژە بۆ ئەوان بوو بە مایەی باشی و نەیدەهێشت پێی ئەوان لە قوڕەکە ڕۆبچێت، بەڵام سەربازە ڕۆمی و ئەرمەنییەکان پێڵاوی ئاساییان لە پێ بوو، پێڵاوەکانیان لە قوڕەکە ڕۆدەچوو، تەنانەت هەندێ گاڤان قوڕەکە بە پێڵاوەکانیان دەنووسا و ڕێگر دەبوو لە باش بەکار هێنانی چەکی سەرەکیی ئەوان کە پێڵا یاخۆ نێزەی درێژ بوو.

باران بەردەوام بوو، تا دەهات ڕەوشی سەربازە ئەرمەنی و ڕۆمەکانی ئاڵۆز و ناخۆشتر دەکرد، هەرگیز بیریان نەدەکردەوە لەو وەرزەدا بارانی بەو شێوەیە ببارێت، لێ سەربازانی ساسانی ئاگەدار کرابوونەوە، هێندەی توانایان هەبوو خۆیان بۆ باران ئامادە کردبوو، بۆیە تا رادەیەك ئاسوودەتر بوون لە باران بارینەکە.

کاتێك هێرشی گالیسکەکان بە فەرماندەیی فەرامەرز لە ڕۆژئاواوە دەستی پێکرد، ڕۆمەکان کە مەنجەنیقیان هەبوو، هەوڵیاندا تا لە دژی ئەوان بەکاریان بێنن، بەڵام بە هۆی بارینی باران و قوڕەوە، نەیان دەتوانی مەنجەنیقەکان بە شێوەیەك دابنێن کە بکارن بەردبارانێك بکەن کە لەسەر ئەوان کاریگەر بێت.

کاتێك رۆم و ئەرمەنەکان لە فورات نێزیك بوونەوە، بینیان کە ساسانییەکان لەوێندەر نین، بۆیە ئەوان هیچ ئارایشی جەنگیان نەکرد و ئەو بابەتەیان بە هەند وەرنەگرت، کاتێکیش هێرشی گالیسکەکان کە لە رۆژئاوا و باشوورەوە هاتن بۆ سەریان، خودان هیچ ئارایشێکی سەربازی نەبوون تا بە هۆیەوە رێگر بن لە هاتنی ساسانییەکان.

لەو بەشەی لەشکری هاوبەش کە لەشکری ئەرمەنەکانی لێبوو، کاتێك گالیسکەکان هێرشیان کرد، ئاراسك پاشای ئەرمەنی کە پیاوێکی دلێر بوو لە تەختی رەوان دابەزی و سواری ئەسپ بوو، لەگەڵ سوارەکانی هێرشی کرد بۆ سەر گالیسکەکان.

سوارە ئەرمەنییەکان نێزەی بەرزیان پێ بوو، هێرشیان بۆ سەر ئەسپی گالیسکەکان دەکرد و دەیانکوشتن یاخۆ برینداریان دەکردن.

هەرچەندە ئاراسك و سوارەکانی ئازایانە دەجەنگان، بەڵام ئەو زیانانەی لە گالیسکەکانیان دەدا ئەوە نەبوو کە توانای ڕاگرتنی هێرشی گالیسکەکانیان هەبێت. چوونکە قوڕ و لیتە و گڵی ناوچەکە رۆیشتنی ئەسپەکانی ئەوانی هێواش دەکردەوە، بەڵام زۆر لە خێرایی گالیسکەکانی کەم نەدەکردەوە. چوونکە ئەسپە ئێرانییەکان بێ هاوتا و بە توانا بوون و پێکڕا گالیسکەکانیان رادەکێشا و نەیاندەهێشت لە قوڕ و لیتەدا گیر بخۆن.

هەرچەندە لەشکری رۆم و ئەرمەنەکان لە کەناری ڕووبارەکە بوون، هەروەسا لەشکری ساسانی لە باشوور و رۆژئاواوە هێرشیان دەکرد، هاوکات بارانیش بەردەوام بوو، بەڵام ئێرانییەکان نەیاندەتوانی لەشکری هاوبەش لەیەك بترازێنن.

سەرەتای هێرشی گالیسکەکان بە فەرماندەیی فەرامەرز بوو، زەوی دەڤەرەکەش بە تەواوەتیی قوڕاو بوو، بەڵام بە ئاوایەك نەبوو کە گالیسکەکان لە قوڕەکەدا بچەقن، دوای کەمێك سەرتاپای زەوی ناوچەکە پتر بوو قوڕ و لیتەیەکی سەخت هەر مەپرسە، ئەم دۆخەش وایکرد سمی ئەسپەکان و تایەی گالیسکەکانیش کە تەنیا ڕووپۆشێکی ئاسنی لەسەر بوو، وەك ئەوەی زەوییەکە کێڵرا بێت، بەو ئاوایەی لێ هات.

ئیدی جووڵەی گالیسکەکان دژوارتر بوو، لێخوڕی گالیسکەکان بە دەنگی بەرز و هاوارکردنەوە ڤێجا ئەسپە بەهێزەکانیان ناچار بە جووڵە دەکرد. تا دەهات جووڵەی ئەسپەکان هێواشتر دەبوو، ئەگەر گالیسکەکان لە قوڕ و لیتەکەشدا نەچەقیبووانە، ئەوا هێندە هێواش دەبوونەوە کە زۆرتر دەکەوتنە بەر نووکی نێزەکانی ئەسپسوارە ئەرمەنییەکان، دەوترا کە

سەری ئەو نێزانە لە پۆڵا چێ کراون، بەڵام نووکی پۆڵای نێزەی سوارە ئەرمەنییەکان، هەروەك زێڕی قارۆن پروپاگەندە و ناڕاست بوو.

هەرچەندە ئەو دەمە لە سەدەی چوارەمی زاین پۆڵا هەبوو، بەپێی بەڵگەنامەکان لە ئەرمەنستان لە (٢٠٠٠ پ. ز) پۆڵایان تواندۆتەوە، بەڵام پۆڵا ئەوکات کانزایەکی جوانکاری بووە و لە هیچ شوێنێك بە ڕێژەی زۆر بەرهەم نەهێنراوە.

لە سەردەمانی کۆندا بەو شێوەیە بوو کە نێزیکەی نۆ کیلۆ ئاسنیان لەگەڵ خەڵووز دەکردە نێو قالب و ماوەی چەند شەو و ڕۆژ گڕی کورەکە نێڵە نێڵی بوو، ئاسن و خەڵووزەکەی دەتواندەوە تا بتوانرێت ئەو ڕێژەیە واتە نۆ کیلۆ لە پۆڵا بەدەست بێنن، بۆ نێزیکەی دە تا پازدە سەدەش کەس نەیتوانی لە نۆ کیلۆ پۆڵا پتر لە یەك بۆتە چێ بکات.

لەوانەیە مایەی سەرسووڕمان بێت کە بگوترێت تەنانەت لە سەدەی نۆزدەیەمی زاینی و لە ساڵی (١٨٥٠ ز) لە وڵاتێکی وەك بەریتانیا کە گەورەترین وڵاتی پیشەسازی ئەورووپا بوو، توانایان نەبوو لە سی کیلۆ پۆڵا پتر لە یەك بۆتە دەربهێنن. لە بەریتانیا لە ساڵی (١٨٥٠ ز) ساڵانە پتر لە پێنج ملیۆن تەن ئاسن بەرهەم دەهێنرا، بەڵام نەیاندەتوانی لە هەزار و پێنج سەد تەن پۆڵا پتر بەرهەم بێنن. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەی زاینیش بەریتانیا هەر بە شێوەی سەدەکانی ڕابردوو پۆڵای بەرهەم دەهێنا، چەند ساڵ دوای ئەو بەرواره باڵیۆزی بەریتانیا لە تاران بە بۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونی ناسرەدین شاوە، خەنجەرێکی پۆڵای پێشکێش کرد، ئەگەر ئەو خەنجەرە لە زێڕ بووایە هێندە نەدەبوو بە مایەی دڵخۆشی ئەو. بابەتی چۆنییەتی بەرفرەوانبوونی بەرهەم هێنانی پۆڵا، وەك ئەوەی لە رووسیا ساڵانە نێزیکەی سەد و پەنجا ملیۆن تەن پۆڵا بەرهەم دێت، بابەتی باسەکەی ئێمە نییە.

لە ڕابردوودا خەنجەر و چەقۆ لە ئاسن چێ دەکران، ئەوانەی خودان توانا بوون نووکەکانیان بە پۆڵا دەکردن، بۆیە شاعیری زمان فارسی دەڵێت:"بسازم خنجری نیشش ز فولاد. زنم بر دیده تا دل گردد ازاد" واتە خەنجەرێك لە پۆڵا چێ دەکەم و لە چاومی دەدەم تا دڵم ئازاد بێت، ئەم شاعیرە بە پێچەوانەی تێگەیشتنی خەڵك، برێتی نییە لە بابا تاهیری هەمەدانی.

دەنگۆی نووکی پۆڵاینی نێزەکانی سوارە ئەرمەنییەکان تەنیا پروپاگەندە بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە ئەو نێزانە بە هۆی زۆری باران و هێواشی گالیسکەکان، توانیان بە باشی ئەسپی گالیسکەکان بکوژن. فەرامەرز بینی ئەگەر بەو شێوەیە بەردەوام بێت، هەموو گالیسکەکانی لەنێو دەچن و لە ریزی گالیسکە جەنگییەکان نەببوو بە نەریت کە پاشەکشە بکەن.

فەرماندەی گالیسکەکان پێش ئەوەی هێرش بکرێت بۆ سەر دوژمن، دۆخی دوژمنی دەخستە بەرچاو و لێکدانەوەی بۆ دەکرد، ئەگەر زانیبای سەرکەوتوو دەبێت، هێرشی دەکرد، ئەگەرنا ئەو کارەی جێبەجێ نەدەکرد.

گالیسکە جەنگییەکان لە لەشکری ئێرانیان تەنیا بۆ سەرکەوتن دەجەنگان، ئەگەر سەرکەوتنیان بەدی نەکردبایە، هێرشیان نەدەکرد. ئەفسەرانی ئەو چینە میراتگری مێژووی پڕ شکۆی گالیسکەکان بوون، مردنیان لە جەنگدا زۆر بە ئاسایی دەزانی، بەڵام نەیاندەتوانی شکست پەسەند بکەن، بەڵام فەرامەرز ناچار بوو پاشەکشە بکات، بۆیە هەواڵی بۆ ئەم مەبەستە بۆ باوکی نارد تا ئەو لە بڕیارەکەی ئاگەداربێت و خۆشی کە فەرماندەی گشتیی لەشکرەکە بوو بکارێت پاشەکشە بکات. چوونکە ئەگەر دوای کشانەوەی گالیسکەکان، مهران کە لە باشوورەوە دەهات دەستی بە کشانەوە نەکردبایە، لەوانەبوو هێرشی بەرانبەری بۆ بکرێت و گەمارۆ بدرێت.

دوای گەیشتنی هەواڵی کوڕەکەی، مهران دەستی کرد بە پاشەکشەکردن، بەو ئاوایە باران بارینی بەردەوام و زۆر بوونی قوڕ و لیتە توانی بەرگەگرتن و ئازایەتیی سەربازە ساسانییەکان ڕابگرێت و ببێتە مایەی پاشەکشەکردنیان.

لە دوای پاشەکشەکردن دۆخی ساسانییەکان زۆر باشتر بوو لەو دۆخەی ئەرمەن و ڕۆمەکان هەیانبوو، چوونکە ساسانییەکان دوای پاشەکشەکردن لەو دەڤەرە دوور کەوتنەوە و ڕۆیشتن بۆ شوێنێك کە زەوییەکەی قوڕ و لیتە و ئاودز نەبوو، لەشکری هاوبەشیش ئەو شەوە لە مەیدانی جەنگ کە ببوو بە زۆنکاو، مانەوە و بارانیش هەر بەردەوام بوو.

لژیۆنە ڕۆمەکان لەو شەوەدا نەیانتوانی ئۆردووگە چێ بکەن، هەر بۆیە دیواریشیان چێ نەکرد، ئەو دۆخەی سەربازە ئەرمەنی و ڕۆمەکانی لەو شەوەدا تێدا بوون، پێویستی بە قسەکردن نییە لەبارەیەوە، چوونکە ئەوان نە خێوەتیان هەڵدابوو، کە تێیدا بحەوێنەوە و لە باران پارێزراو بن، نە لە تواناشیاندا بوو کە لەسەر زەوی قوڕاوی بخەون.

هەرچەندە سەربازە ڕۆمی و ئەرمەنەکان وایاندەزانی کەمتیارەکان لە شەوی باراناویدا بۆ خواردنی لاشەی سەربازە کوژراوەکان لە لانەکانیان نایەنە دەرێ، بەڵام ئەو شەوە جگە لە دەنگی باران بارین، گوێبیستی دەنگی لوورەی کەمتیارەکانیش بوون، دەرکەوت باران ڕێگر نییە لە هاتنی کەمتیار بۆ خواردنی لاشەی مردووەکان و جەستەی بریندارەکان. جەنگی ئەو

ڕۆژەش بە شێوەیەك بوو، کە نە ساسانی و نە ڕۆم و نە ئەرمەنەکان نەیانتوانی بە بریندار و مردووەکانیان ڕابگەن.

مهران فەرماندەی لەشکری ساسانی دەیەویست لە بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر هێرش بکات، بەڵام زەوی بە رادەیەك قوڕاوی ببوو، کە ئەگەر جووڵەی کردبایە، سەرباز و گالیسکەکانی لە نێو قوڕدا دەمانەوە.

فەرماندەی لەشکری ساسانی دوای ئەوەی راپۆرتی بەرەبەیانی وەرگرت، بۆی دەرکەوت ئاوی فورات کەم بۆتەوە، ئەمەش نیشانە بوو بۆ ئەوەی لەوانەیە لەشکری دوژمن لە ئاو بپەڕێتەوە، چوونکە ئەوان لە پەنای بوارەکە بوون، مهران نەیدەویست ئەو دەرفەتەیان پێ بدات.

مهران نەیدەویست دەرفەت بە لەشکری دوژمن بدات تا لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە، ئەو دەیزانی ئەگەر ئەوان بپەڕنەوە ئیدی تا دەگەنە تیسفون کەس ڕێگەیان لێ ناگرێت و دەیزانی هیچ هێزێکی بەرگریکار لە ڕێگەیان نییە.

تیسفون شارێکی بێ دیوار و قەڵا بوو، لەمبەر و لەوبەری هەردوو کەناری ڕووباری دیجلە بوو، ئەو ڕووبارە بە ناوەڕاستیدا دەڕۆیشت. لە سەردەمانی دوای شاپووری دووەم ئەو شارە بە رادەیەك گەورە بوو، ئەگەر کاروانێك لە بەرە بەیاندا گەیشتبایە نێو شارەکە تا شەو نەیدەتوانی لەوێندەر دەربچێت و دەبووایە شەو لەو شارە بمێنێتەوە و ئێوارەی ڕۆژی دواتر لە شار دەربچێ، لەبەرئەوەی ئەو شارە لە کۆتایی زنجیرەی پاشایەتیی ساسانییەکان نێزیکەی حەوت فرسەنگ درێژ بوو.

مێژوونووسی سەدەی بیستەم (لۆسترێنج) نووسەری هەردوو پەڕتووکی (بەغدا لە سەردەمی عەباسییەکان) و (سەرزەوییەکانی خەلافەتی ڕۆژهەڵات) دەڵێت: عەباسییەکان بەغدایان لە شوێنی مەداین چێ کرد، ئەو شارەش کەوتبووە هەردوو لای ڕووباری دیجلەوە.

لە ماوەی چوار سەدەی دەسەڵاتیی پاشایەتیی ساسانییەکان کە تیسفون یاخۆ مەداین پایتەخت بوو، هەر یەکە لە دەسەڵاتدارانی ساسانی کە بە پێویستی دەزانی، کۆشکێك یاخۆ خانوویەکی بۆ خۆی چێ دەکرد.

لە ماوەی پێنج سەدە فەرمانڕەوی عەباسییەکانیش بە هەمان شێوە لە بەغدا هەر یەکە لە دەسەڵاتداران بۆ خۆی کۆشکێکی چێ دەکرد، هەر بۆیە بەغدا لە هەردوو لای ڕووباری دیجلە بە رادەیەك گەورە ببوو، کە نەدەکرا دیواری بە دەورەدا چێ بکرێت بۆ پارێزگاریکردن لە هەر

هێرشێك بۆ سەر ئەو شارە. بەڵام عارەبان بێ ئەوەی هیچ دیوارێك رێگریان بكات، هاتن و تیسفونیان داگیركرد، بە هەمان شێوازیش هۆلاكۆ لە كاتی هێرشەكەیدا توانی بەغدا داگیر بكات كە هیچ دیواری لە دەورە نەبوو.

لە سەردەمی شاپووری دووەم، هەرچەندە تیسفون لە هەردوو كەنارەكانی دیجلە بوو، بەڵام هێشتا هێندە گەورە نەببوو.

مێژوونووسی ئەرمەنی مارسێلی نۆس دەڵێت: پایتەختی شاپووری دووەم بە هەردوو لای دیجلەدا دەڕۆیشت و درێژییەكەی لە هەر لایەك چوار فەرسەنگ و پانیشی چوار فەرسەنگ بوو. لە سەردەمی ئێستە كە ئامرازەكانی گواستنەوە زۆر خێرابوونە، شارێك بەو درێژی و پانییە، بە شاری مەزن دەناسرێت، ئەوكات ئامێرەكانی گواستنەوە هێواش بوون و دەبوونە رێگر لە گەورەبوونی شارەكان، بەڵام هەر یەكە لە بەغدا و تیسفون بە هۆی بوونیان لە هەردوو لای دیجلە و هەبوونی ئامێرەكانی گواستنەوەی ئاوی، واتە بەلەم و كەشتیی، گواستنەوە تیایاندا ئاسانتر بوو، هەر بۆیە خەڵك بە رێگە ئاوییەكاندا دەیانتوانی بە ئاسانی بڕۆنە هەموو گەڕەكەكان.

بە سەرەنجدان لەو خاڵانەی باسكران، مهران تێگەیشت ئەگەر لەشكری رۆم و ئەرمەن بتوانن لە فورات بپەڕنەوە و ئەو نەتوانێت رێگریان بكات، چوونكە تا تیسفون هێزی لێ نییە و دیواریشی لە دەورە نییە، ئەوا ئەو شارە دەبێتە شارێكی بێ بەرگری و دووچاری داگیركردن دەبێت.

پێدەچێت مارسلی نۆس زۆر ئاگەداری ڕووداوەكانی كاتی شاپووری دووەم بووبێت، ئەو دەڵێت شاپوور متمانەی زۆری بە مهران هەبووە، دەیزانی بە هەموو شێوەیەك رێگە دەگرێت لە گەیشتنی دوژمن بە تیسفون، بۆیە هەوڵی نەدا هیچ هێزێك بۆ بەرگری لە تیسفون دەستەبەر بكات.

مهران بە هۆی قوڕ و لیتەوە تا كاتی نیوەڕۆ نەیتوانی هێزەكانی بۆ هێرشكردنە سەر رۆم و ئەرمەنەكان بجوڵێنێت، تا ئەوكات بەشێك لە سەربازە رۆمەكان لە بوارەكە پەڕیبوونەوە و گەیشتبوونە كەنارەكانی رۆژهەڵاتی فورات.

خۆرەتاوی ئەو رۆژە هێندە گەرم بوو، كە تا نیوەڕۆ زەوی وشك كردەوە، ئەمە وایكرد رێگری نەبێت لەبەردەم جووڵەی سەرباز و گالیسكەكان.

مهران فەرمانی بە خۆر و فەرامەرز فەرماندەکانی لای چەپ و ڕاست و گالیسکە جەنگییەکان کرد تا بچن بە هەر شێوەیەك بێت لەشکری دوژمن لەنێو ببەن، ئەگەر نەکارن ئەو کارە بکەن، تیسفون دەکەوێتە گەمارۆی دوژمنەوە.

فەرامەرز بە گالیسکەکانی و خۆر لەگەڵ پیادەکانی هێرشیان کرد، فەرامەرز لە ڕێگەی ئەفسەرەکانییەوە فەرمانی باوکی گەیاندە تەواوی گالیسکەکان و وتی: (دریٚغی مەکەن لە گیان بەخشین و دوژمن دەستەوەستان بکەن).

ژۆلین و ئاراسك سەرگەرمی پەڕاندنەوەی لەشکرەکەیان بوولە ڕووبارەکەدا، هەر بۆیە نەیاندەتوانی هەموو سەربازەکانیان بخەنە جەنگەوە لە دژی ساسانییەکان، بەڵام کە هێرشی گالیسکەکان دەستی پێکرد، فەرمانیان بەو سەربازانە کرد کە کەوتبوونە بەرانبەر گالیسکەکان بۆ بەرگریکردن.

بەم شێوەیە بەشێك لە سەربازە ئەرمەنی و ڕۆمەکان ریزیان گرت و کەوتنە نێوان هێرشی گالیسکەکان و ئەو سەربازانەیان کە سەرگەرمی پەڕینەوە بوون، لە بەرانبەر گالیسکەکان کەوتنە بەرگری تا هاوسەنگەرەکانیان بتوانن بپەڕنەوە.

گالیسکەکان بە هێزی ئەسپە بەهێزەکانیان کە شەوی رابردوو تا بەیانی (جۆ و کشمیشیان) پێدرابوو، هێرشیان دەکردە سەر ریزی سەربازە ئەرمەنی و ڕۆمەکان و بە داسە تیژەکانی گالیسکەکانیان ئەوانیان لەنێو دەبرد، بەڵام سەربازەکانی ئەرمەن و رۆم وێڕای ئەوەی دەیانزانی داسەکە لەنێویان دەبات، ریزەکانی خۆیان تێك نەدەدا و هەوڵیان دەدا بە نێزەکانیان ئەسپەکان بکوژن تا گالیسکەکان بوەستێنن.

فەرامەرز وەك هەر ئەفسەرێکی دیکە لەنێو یەکێك لە گالیسکەکان سەرگەرمی هێرش بوو، براکەشی بە ناوی (پاوە) هەر وەك ئەو لە گالیسکەی دواتر بوو، فەرامەرز بەو کارەی دەیەویست بڵێت لە گیان بەخشین ناترسێت و لە تەنیشت سەربازەکانی دیکەی لەشکرەکەی دەجەنگێت.

لەوکاتەدا کە ئەو هەوڵی دەدا تا بەربەستەکان واتە سەربازە رۆمی و ئەرمەنەکان لەسەر ڕێگە لاببات، نێزەیەك هات و بەر قووڕگی کەوت و لە پشت گەردنییەوە دەرچوو، هەر لە جێدا بێ ئەوەی بتوانێت تەنانەت هاوار بکات، بەربۆوە و کەوتە نێو گالیسکەکە.

یەکێك لە سەربازەکانی نێو گالیسکەکە داهاتەوە و نێزەکەی لە قووڕگی دەرکێشا تا برینەکەی ببینێت خوێن فڕکەی کرد، سەربازەکە خۆی خوار کردەوە و بینی سینگی فەرامەرز

به هێواشی دەجووڵێت و سپێنەی چاوی ڕەش بووە، دەردەکەوێت کە مردنی نێزیك بۆتەوە و ئەوی لە کەناری گالیسکەکە دانا. فەرامەرز ئەو ڕۆژە تا ئێوارە بە زیندوویی مایەوە، کاتی ڕۆژئاوابوون مرد، بەڵام توانای قسەکردن و جووڵەی نەبوو و پێش ڕۆژئاوا بوون مرد.

لەو سەردەمەی شاپووری دووەم و پێشینانی ئەو لە ئێران پاشایەتیان دەکرد، لە ڕۆم ئەوانەی بە وتەی ڕۆمەکان دەبوونە ئیمپراتۆر سەرەتا دەبووایە ببنە (لەگات) واتە فەرماندەی لژیۆن دەبوون، ژۆلینیش پێش ئەوەی ببێتە ئیمپراتۆر لەگات بوو، گۆچانێکی لە عاج لە دەست دەگرت، کاتێك ویستبای هەردوو دەستی بخاتەکار، گۆچانەکەی لە بن هەنگڵی دەگرت. ئەو نەریتە لەلایەن ڕۆمەکانەوە بۆ بەریتانیا گوزرایەوە، ئەفسەرانی ئەوان گۆچانی دار بە دەستیانەوە دەگرن، کاتێك بیانەوێت هەردوو دەستیان بەکار بخەن، دەبووایە دارەکە لە بن هەنگڵیان بگرن، لە بەریتانیاشەوە ئەو نەریتە بۆ تەواوی ئەو وڵاتانە ڕۆیشت کە تا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بەردەستە و داگیرکراوی ئەو وڵاتە بوون.

ژۆلین کە پیاوێکی ئازا و دلێر بوو، لە تەختی خۆی دابەزی و سواری ئەسپ بوو. ئەوکاتەی ژۆلین لەگات بووە، لە هاویشتنی تۆڕ زۆر لێهاتوو بووە، تۆڕ هاویشتن کە بە گریمانی زۆر لە یارییەکانی سێرك وەرگیراوە، یەکێك بوو لە یارییە خۆشەکانی ئەفسەرە ڕۆمەکان.

تۆڕی ئەفسەرە ڕۆمەکان لە بەنی ئەستوور و بەهێز چێ دەکرا، هەر لە دوو بەن، یەکیان لە کانزا بوو، بە شێوەیەك چێ دەکرا، کاتێك یەکێك دەکەوتە نێوی، تەنانەت نەیدەتوانی بە چەقۆ یاخۆ شمشێریش پەتەکانی بپسێنێت و بێتە دەرێ. لە پشت ئەویشەوە دوو لە پاسەوانانی هاتن و ئەرکی ئەوان کوشتن یاخۆ دیل کردنی ئەوکەسانە بوون کە ژۆلین بە تۆڕ دەیگرتن.

ئەو تۆڕەی ژۆلین لەو جەنگەدا بەکاری دەهێنا، لە زمانی ڕۆمی لاتینی بە (پریزا) ناو دەبرا، دوای ئەوەی کەسێك دەکەتە نێو تۆڕەکە، تەنیا تۆڕهاوێژ لە لای خۆیەوە لە ڕێگەی ئەو شێوە دوگمەیەی بۆی دانرابوو، دەیتوانی تۆڕەکە بکاتەوە. هەر کە دوگمەکە دادەگیرا تۆڕەکە دەبۆوە و هیچ گرێ یاخۆ خوار و خێچییەکی نەدەکەوتێ. ئێستە لە هەندێ شوێنی ئیتاڵیا تۆڕەکانی ماسی گرتن بە لاسایی ئەو تۆڕانە دروست دەکرێن، بەڵام لە کاتی کردنەوەیدا خێرایی تۆڕی پریزایان نییە، چوونکە هیچ بەنێکی کانزا لە پێکهاتەکەیدا نییە.

ئەو دەڤەرەی ژۆلین هێرشی بۆ کرد، ئەو ناوچەیە بوو، کە هێرشی پیادە ساسانییەکان هێرشیان بۆ ڕۆمەکان کرد بوو، ژوولین تۆڕەکەی هەڵدەدا و پیادەیەکی لە تۆڕەکەیدا دەگرت و بە توانای خۆی یاخۆ بە جووڵەی ئەسپەکەی ئەوی ڕادەکێشا و دەیخستە سەر زەوی و دوو

پاسەوانەکەی بە نێزە قوڕگ و سکیان دەدڕی، جارێکی دیکە تۆڕەکە بۆ گرتنی سەربازێکی دیکە ئامادە دەبوو.

مێژوونووسە ئەرمەنەکان باس لە ژمارەی دەیان کەس دەکەن کە بە تۆڕی ژۆلین گیرا بن، دواتریش ئەوانی داوەتە دەست پاسەوانەکانی تا بکوژرێن، دیارە لەو وتەیە زێدەڕۆیی هەیە، خوێنی ئەو کەسانەی لەنێو تۆڕەکەدا دەکوژران، دوای وشکبوونی بە بەنەکانی تۆڕەکەوە دەبووە مایەی ڕێگریکردن لە ئاسانی کرانەوە و داخرانەوەی تۆڕەکە، هەر بۆیە تا دەهات کار بە تۆڕەکە قۆرستر دەبوو، تەنیا ئەگەر تۆڕەکەیان بۆ ژۆلین گۆڕی بایە یاخۆ بۆیان شووشت بایە و خاوێنیان کردبایەوە، ئەگەرنا خوێنەکە بە تۆڕەکەوە دەمەیت و ئیدی ناتوانرێت سوودی لێ ببینرێت بۆ گرتنی سەربازی دوژمن.

نازانین ژۆلین بە پەریزاکەی (تۆڕەکەی) چەند سەربازی ساسانی گرت و بە پاسەوانەکانی خۆی سپاردن تا بیانکوژن یاخۆ چەندی دیل کردن و گواسترانەوە بۆ پشت مەیدانی جەنگ تا بە دیلی بمێننەوە، بەڵام ئەوە دەزانین کە پاوەی کوڕی دووەمی مهران کە سەردەستەی پشتەوەی گالیسکە جەنگییەکان بوو لە چوار شوێن هێرشی کردە سەر رۆمەکان.

هەر بەپێی وتەی مێژوونووسە ئەرمەنەکان، ژۆلین تۆڕەکەی خۆی بۆ ڕاگرتنی ئەسپەکانی گالیسکەیەك هەڵدا و تۆڕەکە ماڵبەندی گالیسکەکەی گرت و نەیتوانی پێی ئەسپەکان بگرێت، چوونکە قایش و زنجیرە باریکەکانی دوو ئەسپەکە، کە لایەکی گالیسکەکەی بە ماڵبەندەکەوە دەبەستەوە، بووە ڕێگر لە چوونە خوارەوەی تۆڕەکە و گرتنی پێی ئەسپەکان. بۆیە وێڕای ئەوەی سەری هەردوو ئەسپەکە کەوتبووە نێو تۆڕەکەوە، بەڵام گالیسکەکە نەوەستا.

هەر بەپێی وتەی مێژوونووسە ئەرمەنەکان ئەو گالیسکەیە داسی نەبوو، ئەگەر هەیبووایە ژۆلین توانای نەدەبوو تۆڕەکەی خۆی بۆ ئەو هەڵبدات و داسەکە دەیبڕی. دوای ئەوەی تۆڕەکە کەوتە سەر گالیسکەکە و ئەسپەکان نەوەستان، ژۆلینیان ڕاکێشا و ژۆلین و ئەسپەکەی کەوتن و نەیانتوانی لەسەر ڕێگەی گالیسکەکە لابچن و تایەی گالیسکەکە بەسەر کاسکێتی ژۆلیندا رۆیشت و گالیسکەی دواتریش بە سەر ئیمپراتۆردا هات و پاسەوانەکانی نەیانتوانی بە خێرایی ئەو رزگار بکەن، کاتێك رزگاریان کرد، بینیان کە سەری تەقیوە و چاوەکانی بە کراوەیی ماونەتەوە و سینگی جووڵەی نەماوە و مردووە.

جەنگی ئەو ڕۆژە لە نیوەڕۆوە دەستی پێکرد، هەرچەندە ئەرمەنی و ڕۆمەکان ئارایشی تەواوی جەنگیان نەبوو لە کەناری فورات بەرگریان دەکرد، ساسانییەکانیش بەردەوام بوون لە گیان بەخشین، بەڵام لەو ڕۆژەدا کە دووەم ڕۆژی جەنگ بوو، ساسانییەکان نەیانتوانی لەشکری هاوبەش بشکێنن. لە یەکەمین ڕۆژدا ژمارەی ڕۆم و ئەرمەنەکان دوو هێندەی ساسانییەکان بوون، بەڵام بە هۆی پەڕینەوەی سەربازانی ڕۆم و ئەرمەن لە ئاوی فورات، لە دووەمین ڕۆژدا ئەو ڕێژەیە دابەزی و کەم بۆوە، بەڵام دیسان لە ڕووی ژمارەی سەربازەوە، ڕۆم و ئەرمەنەکان بەهێزتر بوون.

ئاکامی دووەمین ڕۆژی جەنگ برێتی بوو لە کوژرانی فەرامەرزی کوڕە گەورەی مهران، هەروەها کوژرانی ئیمپراتۆری ڕۆم.

مهران فەرماندەی سوپای ساسانییەکان دەست بەجێ ئاگەدار بووە لە هەواڵی کوژرانی کوڕەکەی، بەڵام تا شەو بەشی زۆری سەربازانی ڕۆم و ئەرمەنی ئاگەدار نەبوون کە ئیمپراتۆری ڕۆم کوژراوە. لە ڕۆمی کۆن لە دوای کوژرانی هەر ئیمپراتۆرێك، یەکێك لە لەگاتەکان کە زووتر خۆی ئامادە کردبایە یاخۆ بەهێزتر بووایە، سەرکێشی دەکرد و دەبوو بە ئیمپراتۆر و لەسەر تەخت دادەنیشت.

لە لەشکری ژۆلیندا لەگاتێك بە ناوی (یوویانۆس) هەبوو کە فەرماندەی لژیۆنی ناوچەی لۆمباردی بوو، کە یەکێك لە ئیالەتەکانی ناو ئیتاڵیا بوو.

لە رابردوو هەر لژیۆنەك بە ناوی ئەو ناوچەیە ناودەنرا، کە پێکهاتەی سەربازەکانی هی ئەوێ بوون. ئەو ئیالەتە کەوت بووە باکوری ئیتاڵیا و لە باشووری شاخەکانی ئەلپ بوو.

سەربازانی لژیۆنی لۆمباردی لە لەشکری ڕۆم بە یەکەی سەرکەوتنی شاخ ناسرابوون، بۆیە بە یەکەیەکی دیار دادەنران لەو لەشکرەدا، بەڵام لە کەنارەکانی فورات کە پێدەشتی تەخت بوون، ناکرێت سەرکەوتنی شاخ بە شارەزایی دابنرێت و سوودی ببێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوبانگی خۆیان لەنێو لژیۆنەکانی دیکەی ڕۆم پاراست بوو.

دوای ئەوەی دووەمین ڕۆژی جەنگ بە کۆتا هات و هەردوو لایەن بە هاتنی شەو و تاریك بوونی هەوا و بە هۆی ماندووبوونی سەربازەکانیان، ناچاربوون دەست لە جەنگ هەڵبگرن، ئەوکات ئەو بەشە لە سەربازە ئەرمەنی و ڕۆمەکان کە ئاگەداری کوژرانی ئیمپراتۆر نەبوون، لەو هەواڵە ئاگەدار کرانەوە.

هەروەها زانیان ئیمپراتۆر پێش مردنی کەسی نەکردۆتە جێنشین، بۆیە بەپێی نەریت ئەو کەسەی لەنێو لەشکر لە هەموو فەرماندەکانی دیکە دیارتر بوو دەبوو بە جێگرەوەی ئیمپراتۆر، بۆ ئەمەش یوویانۆس بووە ئیمپراتۆر، چوونکە لەنێو فەرماندەکانی دیکەدا، لێهاتوویی زۆرتری هەبوو و ناوبانگی خۆشی پاراست بوو.

یوویانۆس دوای مردنی ئیمپراتۆر، زۆر ئارەزووی ئیمپراتۆر بوونی دەکرد، بۆیە بڕیاریدا بەپەلە بگەڕێنەوە بۆ رۆم بۆ ئەوەی لەسەر تەخت دابنیشێت، ئەو ئارەزووی گرتنی تیسفونی نەدەکرد و بایەخی پێ نەدەدا و دەیەویست لەسەر تەخت دابنیشێت، بۆیە هەر ئەو شەوە پشت بەو دوو هۆکارەی خوارەوە فەرمانی پاشەکشەی لەشکری رۆمی دەرکرد:

یەکەم: ئەو وتی کە لە بریندارەکانی دوژمنی بیستووە کە لەشکرێکی بەهێزی ساسانی لە تیسفونەوە کەوتوونتەڕێ و سبەی یاخۆ دوو رۆژی دیکە دەگەنە ئێرە، ئێمەش کە ژمارەیەك لە سەربازانی خۆمان لە دوو رۆژی رابردوودا لە دەست داوە، ناکارین بە شێوەیەك لەگەڵ ساسانییەکاندا بجەنگین کە بەسەر ئەو لەشکرەدا سەرکەوتوو بین.

دووەم: پێویستە زووتر بگەمەوە بۆ رۆم و تەرمی ئیمپراتۆر لەگەڵ خۆم ببەم بۆ پان تئۆن تا لەوێندەر بنێژرێت، ئەگەر زووتر خۆمان نەگەێنینە رۆم، تەرمی ئیمپراتۆر لەو هەوا گەرمەدا دەڕزێت و بۆگەن دەبێت.[1]

هۆکاری دووەمی یوویانۆس زۆر لاواز بوو، ئەو دەیتوانی تەرمی ئیمپراتۆر بنێژێت یاخۆ بە رێگەی مۆمیایی کردن، رێگە لە بۆگەن و ڕزینی بگرێت.

بۆیە بۆ رازیکردنی ئەفسەرە پایەبەرزەکانی دیکە بە کشانەوەی خێرا هۆکارێکی دیکەی خستەڕوو کە هۆکارێکی کاریگەر بوو. دوای بوونی بە ئیمپراتۆر گەنجینەی حکوومەت

---

(١) ئێستە وادەزانرێت فەرەنسییەکان پان تیۆنیان لە سەدەی هەژدەیەم بۆ مەبەستی ناشتنی گەورەکانیان دامەزراند، بەڵام پان تیۆن سەرەتا لە لایەن یۆنانییەکان چێ کرا و لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە و بە واتای (تەواوی خودایان) دێت. ئەو نەریتە لە یۆنانەوە رۆیشت بۆ رۆم و لەساڵی (٢٧ پ. ز) لە لایەن (ئاگریپا) ئیمپراتۆری دیکتاتۆری رۆم تەلارێك بە مەبەستی ناشتنی گەورەکانی رۆم بەو ناوە چێ کرا و خۆشی لە ساڵی (١٢ پ. ز) لەو بینایە نێژرا. لە سەردەمی هادریان ئیمپراتۆری رۆم کە لە ساڵی (١٣٨ ز) مرد، ئەو تەلارە گەورەتر کرا و تەواوی ئەو کەسانەی بە هۆی سیاسەت بە کەسایەتیی گەورەی وڵات ناو دەبران، لەو بینایە دەنێژران و ئەو بینایە تا ساڵی (٦٠٩ ز) سوودی بۆ ئەو مەبەستە لێ دەبینرا، هەر لەو ساڵەدا کرا بە کڵێسا، فەرەنسییەکانیش دوای شۆڕشی فەرەنسا تەلارێکیان بەو ناوە بۆ ناشتنی مردووەکانیان چێ کرد. "زەبیحوڵڵا"

دەکەوتە بەردەستی ئەو، ئەویش ڕێژەیەکی بەرچاو دراوی خستەبەر دەستی فەرماندەی لژیۆنەکان. سەربازەکانی ڕۆمیش کاتێك گوێبیستی کۆتایی جەنگ و پاشەکشە بوون، بە تەواوەتیی خۆشحاڵ بوون.

بەیانی ڕۆژی دواتر ئاراسکی پاشای ئەرمەن و سەربازەکانی خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد، بەڵام هیچ جموجۆڵێك نەبوو، کە نیشاندەری ئامادەبوونی ڕۆمەکان بێت بۆ جەنگ.

ئاراسك وەك هەمووان ئاگەداری کوژرانی ژۆلین و هاتنەسەر کاری یوویانۆس بوو، گومانی کرد کە ڕۆمەکان نەیانەوێت بەردەوام بن لە جەنگ. ئەو بۆ هاندانی یوویانۆس و بەردەوام بوون لە جەنگ چوو بۆ لای، بەڵام پێداگری ئاراسك بۆ هاندانی ئەو و لەگاتەکانی دیکە بۆ جەنگ بێ سوود بوو. چوونکە لەگاتەکانیش بە وەرگرتنی پارە لە شەوی رابردوو، مەیلیان بۆ جەنگ نەمابوو.

ئاراسك کە بە تەنیا توانای جەنگی لەگەڵ ساسانییەکان لە لەشکری خۆیدا نەدەبینی، ناچار وەك ڕۆمەکان بڕیاری وازهێنان لە بەردەوام بوونی جەنگیدا.

ساسانییەکان کاتێك هێرشیان کرد، لە دوورەوە ئاڵا سپیەکانیان بینی کە نیشانەی وازهێنان لە جەنگ بوو، بۆیە لە سەرەتادا بە تەواوەتیی دووچاری سەرسوورمان بوون، کە چۆن لەشکرێکی بەهێز کە لە پازدە لژیۆن پێکهاتووە، واز لە جەنگ دێنێت، ساسانییەکان ئاگەداری کوژرانی ئیمپراتۆری ڕۆم نەبوون.

یوویانۆس وەڵامی بۆ مهران نارد کە ڕۆژی پێشتر ئیمپراتۆرەکەمان لە جەنگدا کوژراوە و ئێمە پێویستە بە پەلە بگەڕێینەوە تا تەرمەکەی بنێژین، بۆیە داوا دەکەین کە ئێوەش دەست لە جەنگ هەڵبگرن و ڕێگەمان بدەن تا بگەڕێینەوە و ئەو داوایەمان لەبەر لاوازی یاخۆ ترسان لە جەنگ نییە، بگرە ئەرکی ئاینی ئێمە، وا دەخوازێت کە دەستبەجێ بگەڕێینەوە و تەرمی ئیمپراتۆرەکەمان بنێژین.

مهران چاوەڕوانی ئەو پێشهاتە باشە و یارمەتیدەرە نەبوو، وەڵامی دایەوە کە من ڕەزامەندی دەنوێنم بۆ گەڕانەوەی ئێوە، تەنیا ئەگەر مەبەستتان فێڵکردن بێت، بزانن کە ئەفسەر و سەربازانی من هۆشیارن، بەڵام یوویانۆس مەبەستی فێڵکردن نەبوو، بەکردەنی و بە ڕاستی دەیویست بگەڕێتەوە و بلەز لەشکری ڕۆم و ئەرمەن بکشێنەوە.

مهران تێگەیشت کە لەشکری ڕۆم و ئەرمەن بەهێزن، بۆیە داوای ڕاگرتنی جەنگی لەلایەن ئەوانەوە ڕاستەوخۆ پەسەند کرد، بەڵام چوونکە ئەوان داوای ڕاگرتنی جەنگیان کردبوو، هەر

ئەوانیش دەست پێشخەر بوون لە جەنگ و کۆمەڵێك سەرباز و ئەفسەری ساسانی و لەنێویان فەرامەرزی کوڕی گەورەی مهران کوژرا بوون، داوای کرد تا قەرەبووی جەنگ بکەنەوە.

یوویانۆس دوای کوژرانی ئیمپراتۆر، گەنجینەی لەشکری لە بەردەست بوو، هەندێکی دابوو بە لەگاتەکانی دیکە، لە لایەکی دیکە دەبووایە تا دەگاتەوە رۆم خەرجی لەشکر و مووچەی سەربازەکان دابین بکات.

لە لژیۆنەکانی رۆمدا مووچەی سەرباز و ئەفسەران بەپێی یاسا هەر شەش مانگ جارێك دەدرا، ئەوکات شەش مانگەکە هات بوو، بۆیە کاتی مووچە وەرگرتن بووە.

مێژوونووسە ئەرمەنییەکان وتوویانە کە مهران داوای چوار سەد بەردی زێڕی وەك قەرەبوو لە فەرمانده‌ی لەشکری رۆم کرد بوو.(٢)

یۆیانووس کاتێك بیستی مەرجی سەرەکیی بۆ وازهێنان لە جەنگ گەڕانەوەی لەشکری رۆم و ئەرمەن بریتییە لە پێدانی چوارسەد بەردی زێڕ بە مهران، دوای ڕاوێژ بە پاشای ئەرمەنستان وەڵامی ناردەوە کە بەخشینی قەرەبووی جەنگ بە ئەوان تەنیا دەسەڵاتیی ئەنجومەنی سینای رۆمە، ئەو تەنانەت ئەگەر ئەو ڕێژە زێڕەشی هەبێت، ناتوانێت بە ئەوانی بدات.

مهران وتی ئەفسەر و سەربازانی تۆ هێرشیان بۆ کردووین، ئەوا ئەنجومەنی سینا نییە کە هێرشی کردبێت، تۆ ئەمڕۆ فەرماندەی هاوبەشی رۆم و ئەرمەن و میراتگری سەرمایەی رۆمی و پاشای ئەرمەنستانیش لێرەیە. چۆن ناتوانی چوارسەد بەردی زێڕ قەرەبوو بدەی بە ئێمە؟.

ئاراسکی سێیەم پاشای ئەرمەنستانیش کە لە پاشا دەوڵەمەندەکانی جیهان بوو، بێ توانایی خۆی ڕاگەیاند لە بەخشینی ئەو قەرەبووە، کە چوار سەد بەردی زێڕ بوو.

---

(٢) بەردی سەردەمی ساسانی بەرانبەر بوو بە سێ کیلۆ، بەردەوام ئەو کێشە لە شوێنە جیاکانی ئێران جیا بووە، تا سەرەتای سەدەی رابردووش بەردەکانی ساسانی لە شوێنە جیاکانی ئێران بۆ پێوان بەکار دەهاتن. لە تاران کێشی بەرد چوار کیلۆ بوو، لە نەهاوەند دوو مەن بوو، لە باشووری خۆراسان سێ مەن، لە هەندێ شوێنی فارس یەك من و نیو بوو، لە هەندێ بەشەکانی گیلان و مازەندەران دوو مەن بوو، دابەش دەبوو بەسەر بەشی حەفتا و پێنج و پەنجا و بیست و پێنج و کەمتر لەوانە. دوای پەرەگرتنی پێوەندیی بازرگانی نێوان ئێران و رووسیا، لە دەڤەرەیلی گیلان و مازەندەران بەرد ناوی پووت و نیو پووت و گیروانگەی وەرگرت. بە گشتی تا سەرەتای سەدەی پێشووش لە تەواوی ئێراندا، هیچ کات یەك جۆرە بەرد و بەیەك کێشی یەکسان بۆ پێوانە نەبووە. "زەبیحوڵڵا"

یوویانۆس و مهران هەردوو لا دەترسان لە پچڕانی دانووستاندنەکان، یوویانۆس دەترسا ئەگەر دانووستاندن بوەستێت ساسانییەکان هێرش بکەن و ئەوان وەك گوترا ئامادەیی جەنگیان نەمابوو. لە لایەکی دیکە مهران داوای کردبوو چەند ئەفسەرێکی پایەبەرزی ئەرمەن و رۆم بە بارمتە لەلای ئەو بن تا ئەوکاتەی ئەوان قەرەبووەکە دەدەن و ئەوکات ئەوان ئازاد بکات، بەڵام ئەو مەرجە لەلایەن هیچ یەك لە ئاراسك و یوویانۆس پەسەند نەکرا.

مهرانیش کە بۆی دەرکەوت بوو لەشکری هاوبەش بەهێزە و بێ ورەیی ئەوانی نەدەزانی، بیری دەکردەوە کە توانای شکست دانی ئەوانی نییە. بۆیە وەك نیمچە گاڵتەجارییەك مهران داوای کرد تا هورمزد بدەنە دەست ئەوان و وەك بارمتە لە لای بێت.

یوویانۆس وتی: ئەگەر هورمز بۆ خۆی بەو رێگە چارەسەرە ڕازی بێت، ئێمە ئامادەین کە ئەو وەك بارمتە بدەین بە ئێوە.

هورمزدی برا گەورەی شاپووری دووەم لە ڕووی سەربازییەوە بۆ رۆم و ئەرمەنەکان بێ بایەخ بوو، تەنیا دەستەیەکی سەد کەسی لە پاسەوانەکانی خۆی وەك سەرباز هەبوو، هیچ سوپایەکی نەبوو تا بتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ رۆم و ئەرمەنەکان، بەڵام هورمز دەیزانی ئەگەر وەك بارمتە بدرێتە دەست مهران، بێگومان دەکوژرێت.

ئەو بەپێی هەموو رێساکان دەبووایە بکوژرێت، چوونکە لەو رۆژەوە کە هەڵات بوو بۆ رۆم تا ئەو دەمە بەردەوام لە پیلانگێڕاندا بوو لە دژی ساسانییەکان، ئەگەر ئەو تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت یاخۆ بۆ یەك جار پیلانگێڕی کردبایە، ئاسایی بوو، کە بەر لێخۆشبوون بکەوتایە، تەنانەت لەوانە بوو پلەیەکی شیاو بە خۆشی پێ بدرێت، بەڵام پیلانەکانی ئەو یەك و دوو نەبوون، ئەو ساڵانێکی بەردەوام هەوڵی دەدا تا بە هاوپەیمانی لەگەڵ رۆم دژی ساسانییەکان و شاپووری برای بوەستێتەوە.

لە رابردوودا سزای لە دارەدان بەپێی تاوانە جیاکان، جیاواز بوو، ئەگەر هورمزد کەوتبایە دەست شاپوور بە خراپترین و ناخۆشترین شێوە دەکوژرا.

هەر کە هورمز لە یوویانوسی بیست کە مهران ئامادەیە ئەو بکاتە گرێنتی بۆ کۆتایی هاتنی جەنگ و ڕاگرتنی لە بەرانبەر قەرەبووکان، زۆر ترسا و زانی کە رۆم و ئەرمەنەکان لاریان نابێت بۆ دەستەبەرکردنی گەڕانەوەی خۆیان بە سەلامەتی ئەو بکەنە قوربانی خۆیان و بیدەنە دەست مهران.

مێژوونووسە ئەرمەنەکان باسی رازی بوون یاخۆ نەبوونی پاشای ئەرمەن و ئیمپراتۆری نوێی رۆمیان بەو داوایەی مهران نەکردووە و نەزانراوە ئایا ئەو بیرۆکەیە لای ئەوان هەبووە یاخۆ نا؟، چوونکە بەدەستەوەدانی هورمزد بە ساسانییەکان کەمترین بەها بوو بۆ هەریەکە لە رۆم و ئەرمەنەکان.

مهران سەرکردەیەکی بە ئەزموون بوو، دەیزانی بارمتەبوونی هورمزد هیچ نییە و بایەخی نییە، چوونکە هورمزد لەنێو تەرازووی جەنگدا ئەو قورساییەی نییە، کە بایەخی لەو بارەوە هەبێت. تەنانەت لەوانەبوو بارمتەبوونی ئەو نەبووبایە مایەی خۆشحاڵی شاپووری دووەم، هەرچۆنێك بێت ئەو برا گەورەی شاپوور و میراتگری تەختی پاشایەتیی بوو، تا ئەو هەبووایە شاپووری دووەم نەیدەتوانی ببێتە پاشای ساسانی.

ئەگەر مهران ئەوی بە بارمتە هێنا بووایە، دەبووایە بەپێی رێسا و نەریتەکان شاپووری دووەم ئەو بکوژێت، لەوانەش بوو لە ناخەوە شاپوور ئارەزووی کوشتنی ئەوی نەبووایە و تەنیا چاوەڕوان بوو بێت کە لە دەرەوە و بە مردنی ئاسایی خۆی بمرێت، بەڵام مهران ئەگەر ئەوی بە بارمتە بردبایەوە و ڕادەستی شاپووری دووەمی کردبایە، پاشای ساسانی ناچار دەکرد، کە براکەی بکوژێت، ئەو کارە نەدەبوو بە خزمەت بە شاپووری دووەم و مهران زانیاریی هەبوو، کە هەر یەکە لە پاشا ساسانییەکان کە لە رابردوودا برای خۆی کوشت بێت، دوای ماوەیەك پەشیمان دەبۆوە و ڕقی بەرانبەر بەو کەسە دەبوو کە براکەی بۆ گرت بوو و ڕادەستی کرد بوو.

بۆیە ئەگەر ئەویش هورمزد رادەستی شاپوور بکات و فەرمانی کوشتنی هورمزد دەربچێت، لەوانەیە لە سەرەتادا هەندێ خەڵات و پاداشت وەربگرێت، بەڵام ساڵی دواتر یاخۆ دوو ساڵی دواتر، پاشا بە بیری دێتەوە، کە ئەو بۆتە هۆکاری کوژرانی براکەی و لەوانەیە بە رادەیەك تووڕە ببێت، کە ئەگەر فەرمانی کوشتنیشی دەرنەکات ئەوا فەرمانی دوورخستنەوە لە وڵاتی بۆ دەربکات.

هورمزد دوای ئەوەی زانی بۆتە بابەتی دانوستاندنی سێ قۆڵی نێوان پاشاکانی رۆم و ئەرمەن و مهرانی سەرکردەی لەشکری ساسانی، بێ ئەوەی تەنانەت دەستەی پاسەوانە سەد کەسییەکەشی ببات، هەڵات و رۆیشت، ئەو دەیزانی ئەگەر ئەوان ببات هەموو دەیناسن و ناتوانێت خۆی حەشار بدات.

هورمزد سەرەتا بەرەو باکور هەڵات، دواتر رۆیشت بۆ دیاربکر، هەرچەندە لەوێندەر تەنیا بوو، بە تەنیایی کەس نەیدەناسی، بەڵام ترسا لە مانەوە لەو شوێنە و بەرەو ئاناتۆلی ڕۆیشت

لە دەڤەری کاپادۆکی کە ئێستەش لە ئاناتۆلی لە تورکیا ئەو دەڤەرە بەو ناوە هەیە، لە ئەشکەوتێك جێگیر بوو، ئەو ئەشکەوتە سرووشتیانەی کاپادۆکە تا ئێستە ماون، هەندێ جاریش خەڵکانێکیان تێدا دەژیت.

هەندێ لە مێژوونووسە رۆمەکان دەبێژن هورمزد هەر لەو دەڤەرە مایەوە و لەوێندەریش کۆچی دوایی کرد، بەڵام هەندێکی دیکە لە مێژوونووسە رۆمەکان دەڵێن هورمزد گەڕایەوە بۆ رۆم و بەپێی گێڕانەوەیەك دواجار لەوێندەر کوژراوە، چارەنووسی ئەو چارەنووسی شازادەیەکی خاوەن مافی ڕاستەقینەی تەخت و تاجی پاشایەتیی بوو، کە مێژوو بەم شێوەیەی لێ کرد و بێبەشی کرد لە مافەکان و چارەنووسی بەو ئاوایەی لێهات.

دوای هەڵاتنی هورمزد، بابەتی بارمتەگرتنی ئەو کۆتایی هات و مهران گوشاری بۆ ئەرمەن و رۆمەکان هێنا کە ئەو رێژە زێڕەی ئەوان پێیانە بەسە بۆ قەرەبووکردنەوە و پێویستە ئەوان قەرەبووکە بدەن، وێڕای پتربوونی گوشارەکانی، مهران وتەی کۆتایی نەدەدا و نەیدەوێرا باس لە هەڵگیرساندنەوەی جەنگ بکات و لەو دوو دوژمنە بەهێزە دەترسا.

سەرەنجام رۆم و ئەرمەنەکان رازی بوون تا قەرەبووی جەنگ بە رێژەی شەست بەردی زێڕ بدەن بە مهران و ئەوکات پاشەکشە بکەن، ئەگەر ئەنجومەنی سینای رۆم رەزامەند بوو بۆ پێدانی قەرەبووی پتر، ئەو دەمە قەرەبووی دیکەیش دەدەن، بەڵام ئەو بابەتە تەنیا قسە بوو، مهران دەیزانی دوای کشانەوەیان بە سەلامەتی، نە رۆمەکان و نە ئەرمەنەکان هیچ قەرەبوویەك نانێرن.

مهران بۆ رێگرتن لە مەترسی دەست پێکردنەوەی جەنگ، رەزامەندی نواند تا ئەو بەشەی لەشکری ئەرمەن و رۆم کە لە بواری ئاوی فورات پەڕیوونەتەوە و چوونەتە کەنارەکانی چەپی ئەو ڕووبارە، بگەڕێنەوە و پێوەست ببنەوە بە لەشکرەکەی خۆیانەوە، هەروەها ڕەزامەندیشی نواند تا دیلە رۆم و ئەرمەنەکانیش ئازاد بکرێن و لەگەڵ لەشکرەکانیان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان.(٣)

---

(٣) ئەو جەنگە لە ساڵی ٣٦٣ زاینی کۆتایی هاتووە، هەندێ سوودی بۆ ساسانییەکان بووە، لە پەڕتووکی (ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان) لاپەڕە ٢٦٤ هاتووە: "بە زوویی رێککەوتنی ئاشتی بۆ ماوەی سێ ساڵ لە نێوان لایەنەکان مۆرکرا، بەپێی ئەو رێککەوتننامەیە ویلایەتەکانی (نسیبین، شەنگاڵ و ئەرمەنستانی بچووك) کە جێ ناکۆکی بوون، درانەوە بە ئێرانییان، رۆمەکانیش بەڵێنیاندا پشتیوانی لە ئەرشەك یاخۆ

ئێرانییەکان تەنیا ئەوانەیان ببوونە دیلی ڕۆمەکان کە بریندار بوون و توانای جووڵەیان نەبوو، بۆیە ئەوانیش ئازاد کران.

هەڵبەت ئەو بابەت نیشاندەری دلێری و ئازایەتی سەربازە ئێرانییەکانە و نیشتمانپەروەری ئەوان زۆر گرینگ و مایەی بە هەند وەرگرتن بووە، ئەمەش لە سەرچاوە مێژووییە ئێرانییەکاندا نەهاتووە تا بگوترێت دەمارگیری نەتەوەیی ئەو بابەتەی باس کردووە و ئەفسەر و سەربازە ئێرانییەکان لەو جەنگانەدا کە لەگەڵ ڕۆم کردیان و لە هەندێکیان ئەرمەنەکان بەشدار بوون، دیل نەبوونە و هێندە جەنگاون تا کوژراون یاخۆ بە ڕادەیەك بریندار بوونە کە توانای جەنگیان نەماوە یان دوژمنیان ناچار بە پاشەکشە کردووە. هیچ کات ڕووی نەداوە سەربازی ئێرانی لە مەیدانی جەنگ هەڵ بێت، ئێمە بۆ ئەو وتانەمان بەڵگەمان هەیە، جگە لە ئازایەتیی و نیشتمانپەروەری سەربازی ئێرانی، ئەو دەیزانی ئەگەر لە جەنگێکدا هەڵ بێت نە تەنیا لەنێو کەسوکاری بگرە لە هیچ جێگەیەکی ئێران جێی نابێتەوە.

کاتێك مێژووی جەنگەکانی ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان دەبینین، دەردەکەوێت سەربازی ئێرانی لە مەیدانی جەنگ لە هەندێ لە جەنگەکان شکستی خواردووە، بەڵام هەرگیز لە مەیدانی جەنگ هەڵ نەهاتووە، هەر جارێك کە پاشەکشەی کرد بێت بە فەرمانی فەرماندەکانی بووە، هەڵ نەهاتنی سەربازی ئێرانی نیشانەی دلێری ئەوان بووە.

لە مێژوودا دەبینین سەربازە ڕۆم و ئەرمەن و نەتەوەکانی دیکە کە جەنگی ئێرانیان کردووە، سەربازی ئازا و دلێر بوونە، دیسپلین و ڕێساکانی نێو لەشکری ڕۆم و ئەرمەنەکان لە هی ئێرانیان زۆر بەهێزتر بووە، سەربازانی ئەوانی ئازاتر کردووە. وێڕای ئەوەش سەربازانی دوژمن زۆر جار لە بەرانبەر ئێرانییان ڕایان کردووە، بەڵام ئێرانییان هەرگیز ڕایان نەکردووە. ئەم ئازایەتییە بۆ بابەتی چینایەتی نێو کۆمەڵگەی ئێران گەڕاوەتەوە، سەربازان لە ئێران لە

---

ئاراسك نەکەن کە پاشای ئەرمەنستان و لە ڕەچەڵەکی ئەشکانییەکان بوو، لە ئاکامدا ئەو لە لایەن ئەنجومەنی ئەمیندارانی ئەرمەنستان لادرا و ناردرایەوە بۆ ئێران و ناچار لەوێ خۆی کوشت. فەرەندزۆم هاوسەری ئاراسك ماوەیەکی زۆر لە قەڵای ئەرتەگرێس جەنگا، دواجار ئەویشیان بردە ئێران و کوشتیان. هەندێ حکوومەتی وەك ئایبری (گورجستان) و ئەلبانی لە دەست ڕۆم دەرهێنران، بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە بوونە ژێردەستەی ئێران."بەم شێوەیە ساسانییەکان توانیان بەسەر ئەو دۆخە سەختەدا سەربکەون، کە لە سەردەمی نرسی لە لایەن دیۆکلیسیانی ئیمپراتۆری ڕۆم بەسەریاندا سەپابوو، ئەو دەڤەرەیلەیان وەرگرتەوە ،کە بەپێی ڕێککەوتننامەیە بەر لە ٦٥ ساڵ لە دەستیان دەرچوو بوو. "زەبیحوڵڵا"

چینی خۆیان بوونە، هەرکات سەربازێك هەڵاتبێت، نەیتوانیوە لە وڵاتی خۆی بژیت و ناچار بووە ئاوارە بێت، چوونکە لەنێو کەسوکار و خەڵکدا دەبووە جێگەی سەرزەنشت و ئاماژەکردن، کە فلانە سەرباز هی فلانە ماڵباتە هەڵاتووە.

چوونکە لە سەردەمی ساسانییەکان پێکهاتەی ئێران چینایەتی بوو، ئەوانەی لە لەشکر بوون لە چینی جیا بوون و بەپێی ئەو یاسایانەی بە تایبەت بە سەریاندا دەسەپا، بەرە بەرە تێکەڵ بە یەك دەبوون.

هەموو یاساناسان دەزانن یاسا لە نەریت وەرگیراوە، کاتێك دادوەر مادە و بەندێك نەدۆزێتەوە، کە بەپێی ئەو کەسێکی تاوانبار سزا بدات، ئەوا دەبێت پەنا بۆ نەریت ببات. بۆیە چینایەتیی لە ئێران بووە یاسا و پشتاوپشت کوڕەکانی چینی لەشکر دەبووایە ببنەوە سەرباز. ئەو چینە ئازایە، دلێری و پیاوەتیان بە مەرج دەزانی و یەکدییان دەناسی، ئەگەر کەسێك لە مەیدانی جەنگ ڕای کردبایە، نەیدەتوانی بگەڕێتەوە نێو کۆمەڵگە و کەسوکاری خۆی.

چینی سەربازی وەك چینێکی تایبەت تا ساڵی (٥٧٩) زاینی بەردەوام بوون و مەردایەتی و ئازایەتیی لە نەریت و ڕێساکانیان بوون، تاکەکانی ئەو چینە هەر وەك چینەکانی دیکەی ئێرانیان یەکدییان دەناسی، ئەگەر یەکێك لە ئەوان لە گۆڕەپانی جەنگ هەڵ بهاتبایە، ئەو هەواڵە بە هەمووان ڕادەگەیشت و ئەو چیدی نەیدەتوانی بگەڕێتەوە نێو کەسوکاری خۆی.

چینی سەربازی ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان تا ساڵی (٥٧٩) زاینی مانەوە، چینەکانی دیکەی کۆمەڵگەی ئێرانیش هەبوون. لەو ساڵەدا هورمز کوڕی خەسرەوی یەکەم کە بە ئەنۆشیروان ناسرا بوو لە جیاتی باوکی بوو بە پاشا.

مێژووی ئێران ئەوی بە پیاوێکی ئاسایی ناسیوە و کۆمەڵێك ڕەخنەی لێ گیراوە و دوای مردنی ئەو، هورمزی کوڕی بۆتە پاشا و کەسێکی ڕۆشنبیر بوو، دەیەویست جیاوازیی چینایەتیی لە ئێران لەنێو ببات، بەڵام ئەو نەریتە بە درێژایی سێ سەدە هەبوو، بۆیە دووچاری سەختی زۆر بۆوە.

ئەو نەریتە لە ماوەی سێ سەدەدا بۆ هەندێ لە چینەکان کۆمەڵێك ماف و خاوەنداری هێنابوون، ئەوان نەیاندەتوانی چاوپۆشی لێ بکەن. چینەکانی دیکەیش بە ڕادەیەك خوویان پێوەگرتبوو، کە نەیاندەتوانی دەستی لێ هەڵبگرن، تەنانەت هەندێك لەوانەی لە چینەکانی

خواروو بوون وایان دەزانی ئاسایشی ئابووری و کۆمەڵایەتی چینی ئەوان بەستراوەتەوە بەو ڕێسا چینایەتییانەوە.

نامانەوێت باس لە سەربردەی ژیانی هورمزی کوڕی ئەنۆشیروان بکەین، تەنیا مەبەستمان ئەوەیە کە هورمز دوای گەیشتنی بە دەسەڵات، ئەو چینەی کۆمەڵگە کە پشتاوپشت دەبوونە سەرباز، لەنێو برد. ئەو لەو چینە ئازا و چاونەترسە دەترسا، چوونکە تا دەهات ئازایەتیی تیایاندا زۆر دەبوو، دەترسا لە دەسەڵات لای بدەن. هەردەم و لە هەموو سەردەمێکدا ئەگەر دەسەڵاتدارێك یەکەیەکی سەربازی بەهێز و کارامە یاخۆ چینێکی هەڵوەشاندبێتەوە، ئەوا لە مەترسی دەسەڵات بووە، هەروەك پاشای عوسمانی لەبەر ئەو مەترسییە هەموو ئەفسەر و سەربازەکانی سوپای (یەنی چەری) لەنێو بردن.

لە ڕۆمی کۆن ئەنجومەنی سینا وەك ئەنجومەنی یاسادانەری وڵات بوو، لە کاتی سەرکەوتنی یەکێك لە سەرکردەکانی ڕۆم و هاتنەوەی لە دەرەوە بۆ نێو ڕۆم، هەڵوەشاندنەوەی سوپای سەرداری سەرکەوتووی بەر لە هاتنەوەی بۆ نێو ڕۆم کردبوو بە نەریت و یاسا، ئەمەش لەبەر مەترسی ڕوودانی کودەتا و وەرگرتنەوەی دەسەڵات لە ئەنجومەنی سینا بوو. ئەو یاسایە تەنانەت تا سەدەی نۆزدەیەمیش کە بەناو وڵاتانی ئەورووپا سیستەمی دیموکراسیان هەبوو، درێژەی هەبوو.

ئەمەریکا لە کۆتایی دووەمین جەنگی جیهانیدا لە هەردوو سەرکردەی سەرکەوتووی خۆی واتە ئایزنهاوەر کە ئەورووپای ڕزگار کرد و ماك ئارتۆر کە ژاپۆنی گرت دەترسا، کە کودەتا بکەن، تا ئەو ڕۆژەی لەشکری ئایزنهاوەر هەڵنەوەشایەوە و تەواوی سەربازەکانی نەڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەکانیان، ڕێگە بە ئایزنهاوەر نەدرا بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی.

تەنانەت دوای هەڵوەشانەوەی لەشکرەکەشی ئەو ترسەیان نەبڕایەوە، ئایزنهاوەر کە پلە و پایەی بەرزی سەربازی هەبوو، بە ناچاری پلەکەی رادەست کردەوە و شمشێری سەربازی وەلانا و بەرگی مامۆستایی پۆشی و وەك مامۆستایەك بۆ زانکۆ گەڕایەوە و لەوێ سەرگەرمی وانە وتنەوە بوو.

ئەمەریکا پتر لە ئایزنهاوەر لە ئارتۆری داگیرکاری ژاپۆن دەترسا، بە بیانۆی ئەوەی پێویستە ئەو فەرمانڕەوای ژاپۆن بێت، دوای چەندان ساڵ لە تەواوبوونی دووەمین جەنگی جیهانی ڕێگەیان نەدا بۆ نیشتمان بگەڕێتەوە.

کاتێکیش لە کۆریا جەنگ ڕوویدا، لەشکری ئەمەریکا چۆوە نێو جەنگ و فەرماندەیی ئەو جەنگەیان بە ئارتۆر بەخشی.

ئەوکات تروومەن سەرۆك کۆماری ئەمەریکا بوو، ماك ئارتۆر دەبووایە بۆ دانووستاندن بێتە ئەمەریکا و سەرۆك ببینێت، بەڵام تەنانەت ئەوکاتیش رەزامەندیان نەنواند بۆ گەڕانەوەی ئەو بۆ ئەمەریکا، سەرۆك کۆمار خۆی بۆ مەبەستی دانووستاندن چوو بۆ لای ئەو، لە میدیاکان وتیان لەبەرئەوەی ماك ئارتۆر سەرۆکی جەنگی کۆریایە، نابێت لەو وڵاتە دوور بکەوێتەوە.

لە کاتێکدا بە هۆی پێشکەوتنی ئامێرەکانی گواستنەوە، ئارتۆر دەیتوانی بۆ چەند دەمژمێرێك بچێتەوە بۆ ئەمەریکا و راستەوخۆ سەرپەرشتی جەنگیش بکات و دانووستاندنیش لەگەڵ سەرۆك بکات، بەڵام ئەمەریکا نەیویست تەنانەت ئەوکاتەش ئارتۆر بێتەوە، تروومەن کە پیاوی یەکەمی سیاسیی و سەرۆکی ئەمەریکا بوو، رۆیشت و لە یەکێك لە دوورگەکانی زەریای ئارام دا ئارتۆری بینی. ئارتۆر لە بیرەوەریەکانیدا دەڵێت: "تروومەن و ئەندامانی دوو ئەنجومەنی یاسادانانی ئەوکات نەیاندەویست من بۆ ئەمەریکا بگەڕێمەوە"، بە لێکدانەوەی ئەو مەترسیانە، ئەو هەنگاوەی هورمزی کوڕی ئەنۆشیروان هاویشتی بۆ لێك هەڵوەشاندنەوەی ئەو چینە، نابێتە جێگەی سەرسووڕمان.

دوایینساڵەکانی پاشایەتیی شاپووری دووەم برێتی بوو لە ساڵەکانی کێبەرکێی ئێران و رۆم لەسەر هەردوو وڵاتی ئەرمەنستان و گورجستان، گورجستان لەو سەردەمەدا بە (ئایبر) ناو دەبرا. لە ساڵەکانی دوایینی دەسەڵاتی شاپووردا، وێڕای کێشە و ئاریشەی ئەو دوو وڵاتە ناچار بووە هەندێ کات لەگەڵ خێڵە بیابانییەکان بجەنگێت، کە هەندێ مێژوونووسی ئەورووپایی بە (مەغۆلە سپیەکان) و هەندێکی دیکەیش بە (هۆن) یاخۆ (خیۆن) ناویان بردوون.

وێڕای ئەوانە لە ساڵەکانی دواییدا، کێشەکانی نێوان شاپووری دووەم و کریستیانەکان زۆرتر ببوون، بە تایبەت لەسەر ئەوەی ئەوان خاچیان کردبوو بە هێمای سەرەکیی خۆیان و ئەو هێمایەش لەسەر ئاڵای (درەفشی کاویان)ی ئاڵای ناسراوی ئێران هەبوو.

بەر لەوەی خاچ ببێتە هێمای کریستیانەکان، ماسی هێمای ئەوان بوو، بە زمانی یۆنانی (یەکتۆس) بوو. یەکەمین جاریش ئینجیل بە زمانی گریکی نووسراوەتەوە، ئەو وشەیە لە پێنج پیتێك پێکهاتووە، کە هەر یەکەیان کورتکراوەی وشەیەکە، بەسەر یەکەوەش واتای پێنج وشەکە دەبێتە (عیسای مەسیح فریادڕەسی جیهانە).

کەواتە ئەگەر کریستیانەکان ماسی ـ یان کردە هێما بۆ خۆیان، لەبەر بوونی ئەو پێنج پیتە بوو لە پێکهاتەی ناوی ماسی لە زمانی یۆنانی.

کریستیانەکانی رۆژهەلات، کە لە ولاتانی ژێردەستەی ئێران دەژیان، خاچیان کرد بە هێما بۆ خۆیان تا پارێزراو بن، ئەو هێمایە لەنێو درەفشی کاویان دا هەبوو، لە لایەك دەکرێت ئەوە بە وەلامدانەوەیەك بۆ چاکە لەلایەن ئەوانەوە هەژمار بکرێت.

تا ئەو کاتەی ئاینی کریستیان نەببوو بە ئاینی فەرمی رۆم، دەسەلاتدارانی ساسانی کێشەیان نەبوو، کە بۆچی هێمای کریستیانەکان بۆتە خاچ، بەلام دوای ئەوە چیدی لای دەسەلاتدارانی ساسانی پەسەند نەبوو، کە ئەوان خاچ بەکار ببەن، بەو ئاوایە لێك دەدرایەوە، کە هێمای ئێران لەلایەن دوژمنەوە وەرگیراوە و بۆتە هێمای فەرمی ئەوان.

ئێستە ئەگەر بگوترێت خاچ بە هۆی لە خاچدرانی عیسای مەسیحەوە بوو بە هێمای کریستیانەکان، رێی تێدەچێت، بەلام ئەگەر کەسەکە سەبارەت بە مێژووی کریستیانەکان بەرچاوی ڕوون بێت، دەبێت پرسیار بکات، کە بۆچی لە سەدەی یەکەم و دووەمدا ئەو هێمایەیان بەرز نەکردەوە و لە سەدەی سێیەمدا بوو بە هێمای ئەوان و تا ئەوکات بیریان نەبوو عیسا لە خاچ دراوە؟، بەلام خاچ لە مێژووی ئێران زۆر کۆنترە لە کاتی لە خاچدرانی عیسای مەسیح، بەلگەش بۆ ئەم ڕاستییە، بوونی ئەو هێمایەیە بە هەلکەندراوی لەسەر گۆڕەکانی پاشا هەخامەنشییەکان لە باشووری ئێراندا، ئەو گۆڕانە تا رادەیەك بێ کێماسیی ماون و هەمووان دەتوانن بچن و بیانبینن. ئەو گۆڕانە بە لانی کەم پێنج سەد سال پێش زاین هەل کەندراون.

بەو بەلگەیەش کەس ناتوانێت بلێت ئێرانییان ئەو هێمایەیان لە کریستیانەکان بۆ گۆڕی هەخامەنشییەکان وەرگرتووە.

شاپووری دووەم لە تەمەنی حەفتا سالی و دوای حەفتا سال لە دەسەلاتداری لە سالی (**۳۷۹**) زاینیدا مرد، ئەو سەربردانەی لە مێژووی دەسەلاتداری درێژخایەنی ئەو ماونەتەوە، ئەویان گەیاندۆتە ریزی هەر یەکە لە پاشا بەهێز و گەورەکانی وەك (کوروش و داریوشی هەخامەنشیی) و ئەردەشێری بابەکانی دامەزرێنەری زنجیرەی ساسانی و کوڕەکەی واتە شاپووری یەکەم. دوای مردنی ئەو بۆشایی دەسەلات لە ئێران دەرکەوت و شازادە بێ توانا و لاوازەکانیش نە تەنیا نەیان توانی ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە، بگرە تا دەهات بۆشاییەکەیان پتر دەکرد.

# سەبارەت بە (سەرزەوی جاوید)

یەکێك لە کارە گرینگ و  پڕ بایەخەکانی نووسەر، وەرگێڕ و لێتۆژی گەورە (زەبیحوڵڵا مەنسووری) بریێتییە لە (سەرزەوی جاوید)، کە لە ماوەی هەشت ساڵی بڵاوکردنەوەی کە ماوەیەکی درێژخایەن بوو، توانی سەرەنجی خوێنەران بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، هەر لە سەرەتای بڵاوبوونەوەیدا، ژمارەیەکی زۆر لە نامە و داواکاری خوێنەران گەیشت بۆ کۆکردنەوە و چاپی ئەو نووسینانە لە چوارچێوەی پەڕتووکێکدا ئەو بابەتە یەکێك لە ئارەزووەکانی خوالێخۆشبووش بوو، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر تێکۆشا، بەڵام بەداخەوە ئەو بابەتە بە هەندێ هۆکار لە سەردەمی ژیانی ئەودا جێبەجێ نەبوو. گەورەترین کێشە کۆکردنەوەی تەواوی ناوەرۆکی ئەو پەڕتووکە بوو کە بە هەوڵی دەزگەی بڵاوکەرەوە جێبەجێ بوو، ئێستە کەوتووەتە بەر دیدەتان.

سەرزەوی جاوید، ئێرانە و سەربردەی نەتەوە ئێرانییەکانە، کە لە سەردەمانی کۆنەوە ئێرانیان کرد بە نیشتمان. چیرۆکی ژیانی خەڵکێکە، کە لە سەرەتای هاتنیان بۆ ئەو سەرزەوییە، بە بێ ترس لە بەربەست و سەختییەکانی ڕێگە دەستەی داهێنەر و هزر و تێکۆشانیان لە پێناو وڵاتێکی ئاوەدان و ئازاد تەرخان کرد و  بەرەو پێشڤەچوون بە داهێنانی فەرهەنگێکی مەزن و مرۆڤانە، پێنگاڤیان لە پێناو پێشخستنی کۆمەڵگەی مرۆیی هەڵێنا.

لەگەڵ دەرکەوتنی خۆری ئیسلام، گوێیان بۆ بانگەوازی دڵخۆشکەری ئازادی و یەکسانی کردەوە و پێشوازیان لەو ئاینە کرد، وانە و پەندیان لێ وەرگرت و بەتوانا و هێز و ورەی زیاترەوە هاتنەوە نێو مەیدان و لە گۆڕەپانە جیاکانی هزر سەرکەوتن، لە کولتووری مرۆڤایەتیش بەشی تایبەت بە خۆیان هەبوو، ئەمەش هێما بوو بۆ ئەوەی کاری رابردوویان نەتەنیا بێ سوود نەبووە، بگرە بە بایەخیش بووە. بە وتەی مامۆستا مورتەزا موتەهەری لەبارەی رابردووی نەتەوەکانی ئێران: "دوو بابەت پشتڕاست و یەك لایین: یەکەم ئێران پێش هاتنی ئیسلام بۆ خۆی خودان شارستانییەتێکی درەوشاوە و بە ئەزموون بووە، ئەو شارستانییەتە رابردوویەکی زۆری هەبووە. لە لایەکی دیکە ئەو شارستانییەتە لە سەردەمی ئیسلامدا سوودی لێ وەرگیراو، بە وتەی (پ . ژ. موناشە) ئێرانییان پاشماوەی

شارستانییەتێکی پەروەردەکراویان بە ئیسلام بەخشی، کە بە هۆی باندۆری ئەو شارستانییەتە، ئەو ئاینە گیانی نوێی وەرگرت."[1] کەواتە شارەزابوون بەو رابردووە ئەگەر ئەرکیش نەبێت، ئەوا پێویستە، نەشارەزا بوونیش بەرانبەری بە کەم لووتفی دەێتە ناسین.

سەرزەوی جاوید باس لە چیرۆکی نەبردییەکانی نەتەوە ئێرانییەکان دەکات، مێژوو گەواهیدەرە کە ئەو نەتەوانە بۆ پارێزگاری لە ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان و ئەو شارستانییەت و فەرهەنگەی بە ئازار و مەینەتی و نەهامەتییەکان دایان مەزراندووە، بە چنگ و ددان بەرڤانیان لێی کردووە. دەهەمبەر ئەو نەتەوە و وڵاتانەی چاویان بڕیوەتە خاکی ئێران و لە شوێنە دوور و نێزیکەکانەوە، ئەو خاکە بۆتە مەیدانی دەیان جەنگی درێژخایەن و خستوویانەتە بەر هێرش و پەلامار و تاڵان و کوشتوبڕی خۆیان، بەڵام هەندێ لە بەرگری و جەنگەکان ناوەخۆیی بوون، بۆ رێگرتن بووە لە دەسەڵاتدارە خراپ و ستەمکارەکان، کە هاتوونەتە سەر تەختی دەسەڵاتیی ئەو وڵاتە، گەلیش ڕووبەڕوویان بۆتەوە و لە بەرانبەریان خۆڕاگری نواندووە.

پاشماوەی شارە وێران و داڕووخاو و سووتاوەکان کە بەدرێژایی سەدەکانی رابردوو دەرکەوتوون، یاخۆ لە سەدەی رابردوو لەلایەن باستانناسەکان لە خاك هێندراونەتەدەر، گەواهی دەدەن، کە بە داخەوە زۆرجار زەبر و ستەمی دەسەڵاتدارە ناوەخۆییەکان زۆر پتر بووە لە هی دوژمنان، بەڵام ئەو نەتەوانە هەردەم سەربەرزانە خۆیان راست کردووەتەوە، هەنگاوی پتەوتریان بەرەو داهاتوو ناوە و ناخۆشی و سەختییەکانی رابردوویان بەجێ هێشتووە.

لێ چیرۆکی (سەرزەوی جاوید) لە ساتێرەکانەوە دەست پێدەکات و دەگاتە نێو مێژوو، دواجار بە ژیانی شاپووری دووەم (زولئەکتاف) کە زۆرینەی بەشی چوارەمی پەڕتووکەکەی داگیرکردووە، کۆتایی دێت. نووسەر وەك بۆ خۆی ئاماژەی پێداوە بەردەوام بووە لە بەدواداچوون بۆ دابینکردنی پێداویستییەکان بۆ نووسینەوەی بەشی دیکەی پەڕتووکەکە، بەڵام بارودۆخی ئەوکات و داخستنی (٥٣) رۆژنامە و بڵاوکراوە لە ساڵی (١٩٧٤ ز) بوونە رێگر لەبەردەم ئەو ئەرکە.

---

(١) پەڕتووکی (خزمەتەکانی ئێران و ئیسلام بۆ یەکدی) بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕەی ٣٧٥، چاپی حەوتەم ساڵی ١٩٧٥ زاینی، نووسینگەی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگی ئیسلامی.

ئەو نووسینەوانە کە ناوی وەرگێڕانیان لێ نراوە، لە راستیدا زۆرتر نووسین و شیکاری مێژوونووس زەبیحوڵڵایە، هەموو شێوازەکانی نووسینی زەبیحوڵڵا لە سەربردەی بەرچاو و شیرین و خۆش بۆ خوێندنەوەی تێدایە، کە بەردەوام زانیاریی باش و بەسوود لە مێشکی خوێنەر بەجێ دەهێڵێت.

ئەو بەو رێگەیە زانیارییەکانی خوێنەر زیاد دەکات. لەو روانگەوە لێکۆڵینەوەکانی ئەو بۆ لایەنگرانی پەرتووك و خوێندنەوە و بە تایبەتی ئەوانەی مێژوویان خۆش دەوێت، باشە ئەوان لە ماندووبوونی خوێندنەوەی مێژوویەکی وشك دەپارێزێت.

دوایین لاپەڕەکانی ئەم پەرتووکە لە کاتی نێزیکبوونەوەی پێنجەم ساڵی کۆچی دوایی زەبیحوڵڵا(٢) ئامادە دەبێت، بۆیە بەو بۆنەوە بە ئەرکی دەزانین دەستی ماندوو نەبوونی تەواوی ئەو کەسانە بگوشین و سوپاسیان بکەین بۆ ئەو ئەرکە: کە هەمان ویستی خوالێخۆشبووە، بە تایبەتی بەڕێوەبەر و کارمەندانی (دەزگەی بڵاوکردنەوەی زێڕین) بەڕێزان (مورتەزا ریاحی پوور و ئیسماعیل ریاحی پوور)، کە زۆر هەوڵ و هیمەتیان نواند و دریغیان لە هیچ کارێك نەکرد. هەروەسا بەڕێز (هاشم خوارابی) و هاوکارەکانی کە پیت چنینی ئەو ناوەرۆکە سەخت و زۆرەیان لە ئەستۆ گرت، زۆر سوپاسیان بکەم و بەو رێگەیە بەڵێنم بەرانبەر بەو پیاوە مەزنە نوێ بکەمەوە.

زووبێدە جیهانگیری

گوڵانی ١٣٧٠ هەتاوی (مانگی پێنجەمی ساڵی ١٣٩١ ز)

---

(٢) (بەرواری کۆچی دوایی زەبیحوڵڵا (١٣٦٥/٣/١٨ هەتاوی) بەرانبەر بە (١٩٩٠/٦/٨ ز)، سەفەرنامەی ماژەلان. "سەروتار"